# ئینجیلی پیرۆز

## مزگێنی

## پەیمانی نوێی حەزرەتی عیسا

## بە شێوەی کوردی سۆرانی

# پێشەکی

تەنها یەك ئینجیل هەیە ئەویش ئینجیلی حەزرەتی عیسایە، ئەوەش ئەو مزگێنییەیە کە عیسا هێنایو ڕایگەیاند، قوتابیەکانیشی دوای هەستانەوەی لەنێو مردووان بەردەوامبوون لەراگەیاندنی. عیسا خۆی ئینجیلی نەنووسیوە، بەلاَم فێرکردنەکانی بەشێوەیەك بەقوتابیەکاندا کە ئاسان بێ بۆ بیرهاتنەوەو فێرکردنی خەڵکیتر، قوتابیەکانیش هەموو ڕووداوەکانیان بەچاوی خۆیان بینی بەتایبەتی هەستانەوەی لەدوای مردن. لەشەوی پێش مردنی بەڵێنی پێدان کەدوای مردنی ڕۆحی پیرۆز دێتو هەموو ئەو شتانەی پێیووتن وەبیریان دەهێنێتەوەو هەموو شتێکیان فێر دەکات (یوحەننا 14:26، 2پەترۆس 1:19-21). پەنجا ڕۆژ دوای لەخاچدانی ئەم بەڵێنە هاتەدی، بۆیە لەو کاتەوە قوتابیەکانی دەستیان کرد بەراگەیاندنی مزگێنی پادشاهێتی خوداو فێرکردنی خەڵکی بەو شتانەی عیسا فێری کردن. هەندێ لە دوانزە قوتابیەکە لەگەڵ نێرراوانیتر بەڕابەرایەتی ڕۆحی پیرۆز هەستان بەنووسینەوەی ئەم مزگێنییە، مێژووی زۆربەی نووسراوەکانی مەزەندە دەکرێ بە 25-40 ساڵ دوای مردنی عیسا، تیایدا ژیانو فێرکردنەکانو مردنی عیسایان تۆمارکردووە، بەهەستانەوەشی لەنێو مردووان کۆتاییان پێهێناوە. ئەم نووسراوانە بۆ خوێنەری جوراوجۆر نووسراون، بۆ نموونە: یوحەننا، تا خوێنەری بێباوەڕ بۆ باوەڕ بهێنێ (یۆحەننا 20:31)، لۆقا، بۆ چەسپاندنی خوێنەری باوەڕدار لەوەی فێری بووە (لۆقا 1:1-4).

ووشەی ئینجیل لەووشەی (ئیوانجلیۆن)ی یۆنانی هاتووە، بە واتای مزگێنی، ئەم ووشەیە لەسەردەمی عیسا تەنها بۆ مزگێنیدان بە هاتنی پادشا بۆ شارێك بەکاردەهات، بۆیە ئەو

مزگێنییەی عیسا ڕایگەیاند بە ئینجیل ناوبرا، چونکە مزگێنی هاتنی پادشاهێتی خودایە بەهۆی عیساوە، مزگێنی بوونی عیسایە بە پادشا بەسەرکەوتنی بەسەر شەیتاندا، ئەمەش بەمردنی لەسەر خاچ هاتەدی، بەمە مرۆڤایەتی ڕزگارکرد لەکۆیلایەتی گوناە، ئەم سەرکەوتنەش بەهەستانەوەی لەنێو مردووان ئاشکرا کرا، بەم شێوەیە لێخۆشبوونی گوناهی بەخۆڕایی پێدا‌ین، هەروەها بەهۆی ڕۆحەوە ژیانی هەتاهەتایی پێبەخشین، ناوەڕۆکی ژیانی هەتاهەتاییش ئەمەیە: (ناسینی خودای هەتاهەتایی وەك باوکێکی ئاسمانی). باوەڕهێنانو تۆبەکردنو ستایشکردن بەووتەو بەکردار، وەڵامی ئەو کەسانەیە کە گوێ لەمزگێنی خودا دەگرن.

ئیجیلی پیرۆز لە 27 نووسراو پێك هاتووەو بەکۆی هەموویان دەووترێ (پەیمانی نوێ)، ئەمەش بەشی دووەمە لە کتێبی پیرۆز. بەشی یەکەم لەتەوراتی حەزرەتی موساو زەبووری حەزرەتی داودو نووسراوی پێغەمبەران پێکهاتووە، بەکۆی ئەمانیش دەووترێ (پەیمانی کۆن)، هەروەها پەیمانی کۆن بەو پەیمانەش دەووترێ کە خودا لەگەڵ گەلی ئیسرائیلی بەست لەڕێگای موساوە (2کۆرنسۆس 3:14، عیبرانیەکان 8:13)، بەهەمان شێوە بەو پەیمانەی کە خودا لەگەڵ هەموو مرۆڤایەتی بەستی بە خوێنی عیسا، دەووترێ پەیمانینوێ (لۆقا 22:20)، ئەمەش هێنانەدی ئەو بەڵێنانەی خودایە کە بەهۆی پێغەمبەرەکانی ڕایگەیاندبوو (عیبرانیەکان 8:6-12).

دانانی ئەم 27 نووسراوە بەم شێوەیەی ئێستا، دانانێکی زەمەنی نییە بەڵکو بابەتییە، لەسەرەتا چوار پەرتووکی مزگێنییە، لەدوای ئەوان پەرتووکی کرداری نێرراوانە، ئەم پەرتووکە بە دەرکەوتنی عیسا بۆ قوتابیەکانی دەست پێدەکات دوای هەستانەوەی لەنێو مردووان، دوایی بۆمان دەردەکەوێ چۆن لە ماوەی (30) ساڵی دوای ئەمە مزگێنی مەسیح لەقودسەوە تا ڕۆما

بلاودەبێتەوە، ئەم پەرتووکە تەواوکەری پەرتووکی مزگێنییە بەپێی نووسینی لۆقا. ئەم پێنج پەرتووکە بەشی مێژوویی ئینجیلیان پێکهێناوە.

لەدوای ئەمان 21 نووسراو دێت لەشێوەی نامە، یەکەمیان نزیکەی 20 ساڵ دوای هەستانەوەی عیسا نووسراوە. پۆڵس 13 نامەی یەکەمی نووسیوە، هەروەها یاقوب‌و پەترۆس‌و یۆحەنناو یەهوداش هەندێ نامەیان نووسیوە، دوا نووسراویش بینینەکەی یوحەننایە، ئەمەش بەحەوت نامە دەست پێ‌دەکات بۆ کۆمەڵە باوەڕدارەکانی هەرێمی ئاسیای ڕۆمانی، تیایدا لەشێوەی بینینی ڕەمزی خواست‌و کرداری خودا لەسەر زەوی ڕادەگەیێنێ. نامەکانی ئینجیل پڕن لەفێرکردن، بە دەسەڵاتی مەسیح نێرراوەکان پێشکەشی خوێنەرە یەکەمینەکانیان کرد، ئینجا مزگێنی بەکار هێنراو بوو بەژیانی ڕۆژانەی خوێنەران‌و بەخواستی خودا بۆ ئێمەش بە پارێزراوی مایەوە.

هەر 27 نووسراوەکە بە زمانی یۆنانی نووسراون، چونکە زمانی سەرەکی بووە لەئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لەو سەردەمەدا. ئێستا لەمۆزەخانەکانی جیهاندا بەدەیان هەزار دەسنووسی کۆنی ئینجیل هەیە، جا یان بە پارچە پارچەین یان وەرگێڕانە کۆنەکانن‌و یان لە نامەکانی قوتابیە یەکەمینەکانن مێژووی هەندێ لەم دەسنووسانە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی یەکەم. زیاتر لەپێنج هەزار دەسنووس هەیە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ پێش ساڵی 300ز. ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە کە ئەو دەقەی ئەمڕۆ لەبەر دەستمانە هەمان ئەو دەقەیە کە باوەڕداران لەسەرەتاوە بەکاریان هێناوە. ئەم نووسراوە کوردییەش لەوەرگێڕانە عەرەبی‌و ئینگلیزیەکانەوە وەرگیراوە، هەروەها لەسەر دەقی نەژادی یۆنانی چاوی پێ‌خشێنراوەتەوە، تاکو خوێنەری کورد دڵنیابێ کە ئەم نووسراوە وەرگێرانی تەواوی ئەو

دەقەیە کە قوتابیانی عیسا نووسیویانە. بێهەڵەیی و ڕوون و ئاشکرایی دوو ئامانجی سەرەکی بوونە لەوەرگێراندا.

ڕوونکردنەوە

لەوانەیە هەندێ ووشە زانراو نەبێ وەك (کاهین، کەنیشت، لەئاوهەڵکێشان،..هتد)، بۆ ئەمانەش لیستەیەك کراوە لەکۆتایی کتێبەکە بۆ ڕوونکردنەوەی زاراوەکان و ووشەکان، هەر ووشەیەکیش پێویستی بە ڕوونکردنەوە بووە بەم نیشانەیە(*) دیاری کراوە. هەروەها ئەمانەی خوارەوە بۆ زیاتر یارمەتی دانی خوێنەر کراوە:

هەر کتێبێك پێشەکی *بە جۆرە نووسینێکی تایبەتی (بەلاری) بۆ نووسراوە.*

بۆ هەر بڕگەیەکیش ناونیشان بەخەتێکی‌جیاواز نووسراوە بۆ ڕوونکردنەوەی بڕگەکە وەکو: بنەچەی عیسا

هەندێ جار تێبینی لەخوارەوەی لاپەڕەکان بەرچاودەکەوێ.

وەرگێراوەکانی پەیمانی‌کۆن لەنێوان دوو کەوانەی بەم شێوەیە: { } دانراوە.

لیژنەی وەرگێڕانی ئەم دەقە باش دەزانن کە مرۆڤ بێ کەموکوڕی نییە، بەلاّم ئەم دەقە کوردییە دەخەنە بەر دەستی خوێنەران لەگەڵ سوپاسیان بۆ خودای گەورە لەسەر یارمەتیدانی، هەروەها لەخودا دەپاڕێنەوە تاکو ئەم کتێبە ببێتە مایەی پیرۆزکردنی خوێنەرو شکۆدارکردنی خودا. ئامین.

# ناوەڕۆک

## مزگێنی بەپێی نووسینی مەتتا

*مەتتا یەکێك بوو لەدوانزە قوتابیەکەی مەسیح. زۆربەی ئەو ڕووداوانەی باسی دەکات بە چاوی خۆی بینیویەتی. جوولەکەیەکی باجگر بوو بەڵام دوای باوەڕهێنانی وازی لەکارەکەی هێناو دوای عیسا کەوت. بەیارمەتی ڕۆحی پیرۆز ئەم پەرتووکەی نووسییەوە. مێژووی نووسینەوەی دیار نییە، بەڵام مەزەندە دەکرێ بە (60-65)ز. لەسەدەی دووەمی زاینییەوە، نووسراوەکەی مەتتا لەپێشەوەی هەموو نووسراوەکانی پەیمانی نوێ دانراوە. ئەمەش لەبەر دوو هۆ:*

*1-بەپرد دادەنرێ لەنێوان پەیمانی کۆنو پەیمانی نوێ، هەر لەسەرەتاوە ڕەچەڵەکی عیسا دەگەڕێنێتەوە بۆ ئیبراهیمو داود.*

*2-سەرەتا باوەڕداران زۆربەیان جوولەکە بوون، ئەم نووسراوەش ئاراستەی ئەوان کراوە. ئەمەش بەشێوەیەکی ئاشکرا دەردەکەوێ لەبەکارهێنانی هەندێ زاراوە کە لەلای جوولەکەکان نامۆ نەبوون، وەك: پادشاهێتی ئاسمان، شاری پادشای مەزن (قودس)، هەروەها هەوڵی داوە تیشك بخاتە سەر ئەو لایەنەی ژیانی عیسا کە هەموو پێشبینیەکانی پەیمانی کۆن دەربارەی مەسیح لەم هاتۆتە دی. سەلماندویەتی عیسا مەسیحە، ئەو پادشایەی جوولەکەکان چاوەڕێیان دەکرد تا لەژێردەستی ڕزگاریان بکات. بەڵام کە هات زۆربەی جوولەکەکان باوەڕیان پێی نەکردو دەستیان لەکوشتنیدا هەبوو.*

# 1

ئەمەش ناوی ئەوکەسانەن کە دەبنە پشت بۆ عیسای* مەسیحی* ڕۆڵەی داود* ڕۆڵەی ئیبراهیم*: [2]ئیبراهیم باوکی ئیسحاق بوو، ئیسحاق باوکی یاقوب بوو، یاقوب باوکی یەهوزاو براکانی بوو، [3]یەهوزا باوکی فارسو زارح بوو کە سامار دایکیانە، فارس باوکی حەسرون بوو، حەسرون باوکی ئارام بوو. [4]ئارام

بنەچەی عیسا

باوکی عەمیناداب بوو، عەمیناداب باوکی نەحشون بوو، نەحشون باوکی سەلمون بوو، [5]سەلمون باوکی بوعەز بوو کە ڕاحاب* دایکێتی، بوعەز باوکی عوبەید بوو کە ڕاعوس دایکێتی، عوبێد باوکی یەسا بوو، [6] یەسا باوکی داودی پادشا بوو.

داود باوکی سلێمان بوو لەو ژنەی کە ژنی ئوریا بوو، [7]سلێمان باوکی ڕەحەبعام بوو، ڕەحەبعام باوکی ئەبیا بوو، ئەبیا باوکی ئاسا بوو، [8]ئاسا باوکی یەهوشافات بوو، یەهوشافات باوکی یورام بوو، یورام باوکی عەزەیا بوو، [9]عەزەیا باوکی یوسام بوو، یوسام باوکی ئاحاز بوو، ئاحاز باوکی حەزقیا بوو، [10]حەزقیا باوکی مەنەسا بوو، مەنەسا باوکی ئامۆن بوو، ئامۆن باوکی یووشیا بوو، [11]یووشیا باوکی یەکنیاو خوشكو براکانی بوو، لەکاتی ڕاپێچکردنیان بەرەو بابل.

[12]دوای ڕاپێچکردنیان بۆ بابل، یەکنیا باوکی شالتیئل بوو، شالتیئل باوکی زەربابل بوو، [13]زەربابل باوکی ئەبیهود بوو، ئەبیهود باوکی ئەلیاقیم بوو، ئەلیاقیم باوکی عازور بوو، [14]عازور باوکی سادوق بوو، سادوق باوکی ئەخیم بوو، ئەخیم باوکی ئەلیود بوو، [15]ئەلیود باوکی ئەلیعازر بوو، ئەلیعازر باوکی مەتان بوو، مەتان باوکی یاقوب بوو، [16] یاقوب باوکی یوسفی دەزگیرانی مریەم بوو، ئەو مریەمەی عیسای لێ بووە، کە بەمەسیح ناودەبرێ.

[17]ژمارەی نەوەکان لەئیبراهیمەوە بۆ داود چواردە نەوەن، لەداودەوە بۆ ڕاپێچکردنیان بەرەو بابل دیسان چواردە نەوەن، هەروەها لەڕاپێچکردنیان بۆ بابل تا عیسا چواردە نەوەن.

### لەدایك بوونی عیسا

[18]لەدایك بوونی عیسا بەم شێوەیە بوو: لەکاتێکدا مریەم دەزگیرانی یوسف بوو، پێش ئەوەی بگوێزرێتەوە، بەهۆی ڕۆحی پیرۆز سکی پڕبوو. [19]یوسفی دەزگیرانی کوڕێکی چاكبوو نەیویست ئابڕووی ببات، بڕیاریدا بەنهێنی وازی لێبهێنێت. [20]کاتێ بیری لەمە دەکردەوە، فریشتەیەکی خوداوەند لەخەودا بۆی دەرکەوت و پێی ووت: (ئەی یوسفی کوڕی داود، مەترسە لەوەی مریەم بهێنیت، چونکە

ئـەوەی ئـەو سکی پێی هەیە لەرۆحی پـیرۆزە. [21]کوڕێکـی دەبێـت نـاوی دەنێـت عیسـا، چـونکە گەلەکـەی ڕزگـار دەکـات لەگوناهەکانیان) [22] ئەمانـە هەمووی ڕوویدا، تاکو ئەوەی خوداوەنـد لەسـەر زمـانی پێغەمبەری خـۆی ڕایگـەیاند بێـتەدی: [23]{ئـا ئـەوەتا کچـێك سـکی پـڕ دەبێـت، کوڕێکـی دەبێـت نـاوی دەنـرێ (عەمانۆئـێل) واتە خودا لەگەڵمانە.} [24]کـاتێ یوسـف خەبـەری بـووەوە، ئـەوەی فریشـتەکەی خوداوەنـد فـەرمانی پـێدا کـردی، هەسـتاو دەزگیرانەکـەی هێـنایە لای خۆی [25] بێ‌ئـەوەی لەگـەڵی جـووت بێـت تا لـەدایك بوونـی مـنداڵەکە، کـاتێ لەدایك بوو ناوی‌نا عیسا.

## دیدەنی ئەستێرەناسەکان

## 2

دوای لـەدایك بوونـی عیسـا لـەبەیت‌لەحمی یەهودیا* لەسەردەمی هێرۆدسی پادشا، هەندێ ئەستێرەناس لەڕۆژهەڵاتـەوە هاتـنە قـودس، [2] پرسـییان: (پادشـای لـەدایك بـووی جوولەکـە لەکوێـیە؟ ئـێمە لـەڕۆژهەڵاتـەوە ئەسـتێرەی ئـەومان بـینی، هاتووین کڕنوشی بۆ ببەین.) [3] کـاتێ هێرۆدسـی* پادشـا ئەمـەی بیسـت، پەشـۆکاو هـەموو قـودس لەگـەڵی پەشـۆکا. [4]هەرچی سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت هـەبوو هـەمووی کۆکـردنەوە، لێی پرسـین: (ئایا مەسیح لەکوێ لەدایك دەبێـت؟) [5]وەڵامـیان دایـەوە: (لـەبەیت‌لـەحم* لەیەهودیا، چونکە پێغەمـبەر ئـاوای نووسـیوە: [6]{تـۆش ئـەی بەیت‌لـەحمی خـاکی یـەهودیا کـەمتر نیـت لـەشـارەکانی دیکـەی یـەهودیا، چـونکە تـیاتدا دادوەرێـك دەردەکەوێـت، گەلـی ئیسرائیلم بۆ بەڕێوە دەبات.})

[7]دوای ئەمـە هـێرۆدس بەنهێـنی ئەستێرەناسـەکانی بانگکردو لەبارەی کـاتی دەرکەوتـنی ئـەو ئەسـتێرەیە لێکۆڵـینەوەی لەگـەڵ کردن، [8]ئینجا نـاردنی بـۆ بەیت‌لـەحم، پێی ووتن: (بـڕۆن، بـاش بگـەڕێن کـاتێ منداڵەکەتان دۆزیەوە، هەواڵم بدەنێ تاکو منیش بێمو کڕنوشی بۆ ببەم.) [9] دوای ئـەوەی قسەی پادشایان بیست ئەوێـیان بەجێ‌هێشـت، هـەمان ئەستێرەی لەڕۆژهەڵات بینی بوویان، دیسـان دەرکەوت، پێشیان کەوتو

هات لەسەر ئەو شوێنەی منداڵەکەی لێبوو ڕاوەستا. [10]کاتێ ئەستێرەکەیان بینی، زۆر شادومان بوون، [11]چوونە ژوورەوە، منداڵەکەو مەریەمی دایکیان بینی، دانەوینو کڕنۆشیان بۆ بردو گەنجینەکانیان کردەوەو زێڕو بخوردو موڕیان* پێشکەش کرد. [12]ئینجا خودا لەخەودا ئەستێرەناسەکانی ئاگادارکردەوە نەگەڕێنەوە لای هێرۆدس، ئەوسا ئەوانیش بەڕێگایەکی دیکە گەڕانەوە بۆ وولاتی خۆیان.

**هەلاتن بەرەو میسر**

[13]دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن، فریشتەیەکی خوداوەند لەخەوا بەیوسفی ووت: (هەستە منداڵەکەو دایکی ببەو ڕابکە بۆ میسر، لەوێبە هەتا فەرمانی گەڕانەوەت پێدەدەم، چونکە هێرۆدس دەگەرێ بەشوێن منداڵەکە تا بیکوژێ.) [14]یوسفیش هەستاو لەهەمان شەودا منداڵەکەو دایکی بردو بەرەو میسر ڕۆیشت. [15]لەوێ مایەوە تا هێرۆدس مرد، تاوەکو ئەوەی خوداوەند لەسەر زمانی پێغەمبەر ووتویەتی بێتەدی: {ڕۆڵەی خۆم لەمیسرەوە بانگکردووە.}

[16]کاتێ هێرۆدس هەستی بەوەکرد ئەستێرەناسەکان گاڵتەیان پێکردووە تووڕە بوو، هەستا بەکوشتنی هەموو منداڵانی شاری بەیتلەحمو دەوروبەری لەدوو ساڵ بەرەو خوارتر، بەپێی ئەو کاتەی لەئەستێرەناسەکانەوە پێی ووترابوو. [17]بەمەش ئەوەی لەسەر زمانی پێغەمبەر ئیرمیا* ووتراوە هاتەدی: [18] {لەشاری ڕامەوە هاوار دئەبیسترێ، گریانو شیوەنێکی زۆر، ڕاحیل* بۆ منداڵەکانی دەگری. ڕازی نییە سەرەخۆشی لێبکرێ چونکە منداڵەکانی نەماون}.

**گەڕانەوە بۆ شاری ناسیرە**

[19]کاتێ هێرۆدس مرد، فریشتەیەك لەلایەن خوداوەندەوە چووە خەوی یوسف لەمیسر، [20]پێی ووت: (هەستە، منداڵەکەو دایکی

---

*راحیل : یەکێکە لەژنەکانی حەزرەتی یاقوب، دایکی یوسفو بنیامینە، لێرەدا هێمایە بۆ دایکە بنیامینیەکان.

بگەڕێنەوە بۆ ئیسرائیل، ئەوانەی هەوڵی کوشتنیان دەدا مردن.) [21] ئەویش هەستا، منداڵەکەو دایکی گەڕاندەوە بۆ ئیسرائیل. [22] بەڵام کاتێ یوسف بیستی ئەرخیلاوس لەشوێنی هێرۆدسی باوکی حوکمڕانە لەناوچەی یەهودیا، ترسا بڕوا بۆ ئەوێ. ئینجا لەخەودا پێی نیشان درا بڕوا بۆ ناوچەی جەلیل*. [23] لەوێ گەیشتە شارێك بەناوی ناسیرە، تیایدا نیشتەجێبوو. بەمەش ئەوەی لەسەر زمانی پێغەمبەران ووتراوە هاتەدی: { بە ناسیرەیی ناودەبرێ.}

## حەزرەتی یەحیا

## 3

هەر لەو ماوەیەدا، یەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێش، لەدەشتی یەهودیا دەرکەوت و مزگێنی ووشەی خودای دەدا، [2] دەیووت: (تۆبە* بکەن، چونکە پادشاهێتی ئاسمان نزیك بۆتەوە.) [3] ئەم یەحیایەش ئەوەیە کە لەسەر زمانی پێغەمبەر ئەشعیا* دەربارەی ووتراوە: {دەنگێك لەدەشتەودەر بانگەواز دەکات، ڕێگا بۆ خوداوەند ئامادەبکەن، ڕێڕەوی ڕێك بخەن.} [4] بەرگی یەحیا لەتووکی ووشتر چنرا بوو، ناوقەدی بەپشتێنێکی چەرم دەبەست، خواردنیشی بریتی بوو لەکوللەو هەنگوینی کێوی. [5] خەڵکی قودس و ناوچەی یەهودیاو دێیەکانی نزیك ئوردن دەهاتن بۆ لای و [6] لەسەر دەستی دانیان بەگوناهەکانیان دەناو لەڕووباری ئوردن لەئاو هەڵدەکێشران.

[7] یەحیا کە بینی زۆر لە فەریسیەکان* و سەدوقیەکان دێن بۆ لەئاوهەڵکیشان، پێی ووتن: (ئەی بێچوە ماران، کێ ئاگاداری کردن لەدەست تووڕەیی داهاتوو هەڵبێن؟ [8] با بەرووبوومتان هەبێ شایانی تۆبەکردن بێ. [9] بەخۆتان مەڵێن: ئیبراهیم باوکمانە، پێتان بڵێم خودا توانای هەیە لەم بەردانە نەوە بۆ ئیبراهیم دروست بکات. [10] ئەوەتا تەور خراوەتە سەر قەدی دارو هەر دارێك بەرووبوومی چاك نەدات، دەبڕێتەوەو فڕێ دەدرێتە ناو ئاگر. [11] من بۆ تۆبەکردن لەئاوهەڵتاندەکێشم*، بەڵام ئەوەی دوای من دێت، لەمن بەتواناترە، من شایانی ئەوە نیم تەنانەت پێڵاوەکانیشی بۆ هەڵگرم. ئەو

لـــــەڕۆحی پـــــیرۆزو لەئاگـــــر هەڵتاندەکێشـێت. [12] شـەنی خـۆی بەدەسـتەوە دەگرێـتو کاو دانەوێڵە لەیـەك جـیا دەکاتـەوە، دانەوێڵــە لەعەمـباردا کۆدەکاتـەوەو کایەکەش بـە ئاگـرێ دەسوتێنێ کوژانەوەی بۆ نییە.

**لەئاوهەڵکێشانی عیسا**

[13] ئیـــنجا عیســـا لەناوچـــەی جەلـیلەوە بـۆ سەر ڕووباری ئوردن هـــات، تالـەســـەر دەســـتی یەحـــیا لەئاوهەڵبکێشـرێت. [14] بـەڵام یەحـیا بەرامـبەر ئـەم کـارە ڕاوەستاو ووتی: (مـن پێویسـتیم بەوەیە لـەسەر دەستی تـۆدا لەئاوهەڵبکێشـرێم، کەچـی تۆ دێـت بۆ لای من؟) [15] عیسا وەڵامی دایەوە: (با ئێستا ئەمە ببێت، تاهەموو ڕاسـتودروسـتیەك بێتەدی.) ئینجا یەحـیا قـبوڵی‌کرد. [16] کـاتێ عیسـا لەئاوهەڵکێشـــــراو لەئاوەکـــــە بـەرزبووەوە، ئاسمان کرایەوەو ڕۆحی خـــودا لەشـــێوەی کۆتـــرێك هاتـــەخوارەوە بـــۆیو لەســـەری نیشتەوە، [17] ئینجا دەنگێك لەئاسمانەوە هـــات، ووتـــی: (ئەمـــە ڕۆڵـــەی خۆشەویســـتمە ئـــەوەی زۆر پـــێی دڵشادم.)

**تاقیکردنەوەی عیسا**

# 4

عیسـا بـەهۆی ڕۆحی پیرۆزەوە برایە دەشـــتودەر، تـــاکو شـــەیتان* تـــاقی بکاتـــەوە. [2] دوای ئـــەوەی چـــل ڕۆژو چل شەو بەڕۆژوو بوو، برسی بوو. [3] تاقیکەرەوە هاتە پێشەوە، پێی ووت: (ئەگـەر تـۆ ڕۆڵـەی خـودای* بـەو بەردانـە بڵـێ بـبن بـە نـان.) [4] عیسا وەڵامـی دایـەوەو ووتـی: (لـەکتێـبی پـیرۆز نووسراوە: {مرۆڤ تەنها بە نان نـاژی، بەڵکو بەهەموو ووشەیەك کە لــەدەمی خــوداوە دێتەدەر.}) [5] ئینجا لـەلایەن شەیتانەوە بەرەو شاری پیرۆز بـرا، لەقـەراغی سـەربانی پەرسـتگا* ڕایگـرتو [6] پـێی ووت: (ئەگـەر تـۆ ڕۆڵــەی خودای لێرەوە خۆت هەڵدە خوارەوە. چونکە نووسراوە: {فەرمان دەدات بەفریشتەکانی ئاگادارت بنو لەسەر دەستیان هەڵتگرن نەوەك پێت بـەر بـەردێ بکـەوێ.}) [7] عیسـا پێی ووت: (هـــەروەها نووســـراوە: {خوداوەند خودات تاقی مەکەرەوە.}) [8] دیسـان لـەلایەن شەیتانەوە برایە سەر لووتکـــەی شـــاخێکی زۆر بـــەرزو

هـەموو مەزنێتیو پادشاهێتی جیهانی پیشانداو [9]پێی ووت (هەموو ئەمانەت پـێدەدەم گەر سەردانوێنیو کڕنۆشم بۆ بەری.) [10]لێرەدا عیسا پێی ووت: (ئەی شەیتان لێم دووركەوە، چونكە نووسـراوە: {بـۆ خوداوەند خودات كڕنوش بەرەو تەنها ئەو بپەرستە}) [11]دوای ئەمـە شـەیتان وازی لـێهێـنا، ئینجا چەند فریشتەیەك هاتن بۆ لایو دەستیان كرد بەخزمەتكردنی.

**مزگێنیدان لەناوچەی جەلیل**

[12]كـاتێ عیسـا بیسـتی یەحـیا گیراوە، گەڕایەوە بۆ ناوچەی جەلیل. [13]لـــەوێ شـــاری ناســـیرەی بەجێهێشـتو لەشـاری كەفەرناحوم كە كەوتۆتە سەر دەریاچە لەسنووری زەبولـونو نەفتالـیم* نیشتەجێ بوو، [14]تـا ووتـەی پێغەمبەر ئەشعیا بێتەدی كـە دەڵـێ: [15]{ئـەی ناوچـەی زەبولـونو نەفتالـیم، ئـەی ناوچـەی سـەر كـەناری دەریاچـەو پشـتی ڕووبـاری ئـوردن، ئـەی ناوچـەی جەلیـلی ناجوولەكـە، [16]ئەو گەلەی لـەتاریكی دانیشتوون، ڕووناكییەكی مەزنـیان بیـنی، هەموو ئەوانەی لەژێر سێبەری مردنا دانیشتوون ڕووناكییان لـێهەڵهات.}

[17]لـــەو كـاتـەدا عیسـا دەســتی كـرد بــە مـزگێـنیدانو دەیـووت: (تـۆبـە بكـەن، چـونكە پادشـاهێتی ئاسـمان نزیك بۆتەوە.)

**عیسا قوتابییەكانی هەڵدەبژێرێ**

[18]كـاتێ عیسـا بەكـەناری دەریاچـەی جەلـیلدا* دەڕۆیشـت، دوو بـرای بیـنی، شـەمـعون كـە پـێی دەووتـرا پەتـرۆس لـەگـەڵ ئـەندراوس، تۆڕیـان فـڕێ دەدایە ناو دەریا، ئیشیان ڕاوە ماسی بوو. [19]پێی ووتـن: (وەرن دوام كەون، دەتانكەم بەڕاوكـەری مـرۆڤ.) [20]دەست بەجێ تۆڕەكانـیان بەجێهیشـتو دوای كـەوتن. [21]كـە لەوێ تێپەڕی، دوو بـرای تـری بیـنی، یـاقوبی كـوڕی زەبـدیو یۆحەنـنای بـرای، لەبەلەمـێكـدا لـەگـەڵ زەبـدی باوكـیان تۆڕەكـانـیان چـاك

*زەبولـونو نەفتالـیم: دوو ناوچـەی بچـووكن دەكەونە باكووری فەلەستینو ڕۆژئاوای دەریاچەی جەلیل، بە ناوی دووان لە كوڕەكانی حەزرەتی یاقوب ناو نراون

دەكردوە، ئەوانیشی بانگ‌كرد. [22] دەست بەجێ بەلەمەكەو باوكیان بەجێ‌هێشتو دوای كەوتن.

**عیسا خەڵكی فێر دەكات**

[23]عیسا بەهەموو ناوچەی جەلیلدا دەگەڕا، لەكەنیشتەكانیان فێری دەكردنو مزگێنی پادشاهێتی دەدانیو هەموو نەخۆشیو دەردێكی لەناو خەڵكدا چارەسەر دەكرد. [24] بەمە دەنگوباسی عیسا گەیشتە هەموو سوریا. چی نەخۆشو دەردی گران هەبوو، بەجۆرەها ئازارەوە، ئەوانەی رۆحی پیسیان تێدا بوو، هەروەها فێ‌دارەكانو شەلو گۆجەكان هەموویان بۆ لای هێناو چاكی‌كردنەوە. [25]هەروەها خەڵكێكی زۆر كە لەناوچەی جەلیلو دە شارەكە*و قودسو ناوچەی یەهودیەو پشت ئوردنەوە هاتبوون هەموو دوای كەوتن.

**ووتاری سەر چیا**

# 5

عیسا كە خەڵكەكەی بینی، چووە سەر چیا، كە دانیشت قوتابیەكانی لێی نزیك بوونەوە. [2]دەستی كرد بەفێركردنیانو ووتی: [3]( خۆزگەدەخوازرێ بەوانەی هەژارن لەرۆح، چونكە پادشاهێتی ئاسمان بۆ ئەوانە. [4]خۆزگەدەخوازرێ بە لێوبەبارەكان، چونكە دڵنەوایی دەكرێن. [5]خۆزگەدەخوازرێ بە دڵنەرمەكان، چونكە زەوی بۆ ئەوان بەمیرات دەمێنێتەوە. [6] خۆزگەدەخوازرێ بەبرسیو تینوەكان بۆ ڕاستودروستی، چونكە تێر دەبن. [7]خۆزگەدەخوازرێ بە دڵ پڕ لەبەزەییەكان، چونكە بەر بەزەیی دەكەون. [8]خۆزگەدەخوازرێ بە دڵپاكەكان، چونكە خودا دەبینن. [9] خۆزگەدەخوازرێ بەئاشتی خوازان، چونكە بەرۆڵەی خودا ناودەبرێن. [10] خۆزگەدەخوازرێ بەچەوسێنراوان لەپێناوی ڕاستودروستی* چونكە پادشاهێتی ئاسمان بۆ ئەوانە. [11] خۆزگەدەخوازرێ پێتان، كاتێ خەڵكی جنێوتان پێ‌دەدەنو دەتانچەوسێننەوە، لەپێناوی من قسەی خراپتان دەخەنە پاڵ. [12] دڵخۆشو شادومان بن، چونكە پاداشتتان مەزنە لەئاسمان. ئاواش پێغەمبەرانیان پێش ئێوە چەوساندۆتەوە!

**خوێی زەوی‌و ڕووناکی جیهان**

([13]ئێوە خوێی زەوین، بەڵام گەر خوێ سوێریەکەی لەدەست‌دا، چۆن تامە سوێرەکەی بۆ دەگەڕێتەوە؟ بەکەڵکی هیچ نایەت، ئەوە نەبێ فڕێ بدرێتە دەرەوەو خەڵکی پێ‌شێلی بکەن. [14]ئێوەن ڕووناکی جیهان، شارێك لەسەر شاخ دروست‌کرا ناتوانرێ بشاردرێتەوە. [15]هەروەها خەڵکی چرا هەڵناکەن تا بیخەنە ژێر جامو تەشتەوە، بەڵکو لەشوێنێکی بڵند دای‌دەنێن، تاکو ڕووناکی بدات بەهەموو ئەوانەی لە ماڵەکەدان. [16]بەهەمان شێوە با ڕووناکیتان بۆ خەڵکی بدرەوشێتەوە، هەتا ئیشە باشەکانتان ببینن‌و ستایشی باوکتان بکەن کە لەئاسمانە.

**تەواوکردنی شەریعەت**

([17]وابیرنەکەنەوە من هاتووم شەریعەت* یان ووتەی پێغەمبەران* لابەرم، من نەهاتووم لای‌بەرم، بەڵکو تەواوکەرم بۆی. [18]ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: هەتا زەوی‌و ئاسمان لەئارادابێ، ووشەیەك یان خاڵێکی شەریعەت لەناو ناچێ، تاهەمووی دێتەدی. [19]ئەوەی سەرپێچی خاڵێکی بچووکی ئەم ڕاسپاردانەی کردو خەڵکی فێرکرد وابکەن. لەپادشاهێتی ئاسمان بەبچووکترین ناودەبرێ. بەڵام ئەوەی ئیشی پێ‌دەکات‌و خەڵکی فێر دەکات، لەپادشاهێتی ئاسمان بەمەزن ناودەبرێ. [20]من پێتان دەڵێم: گەر ڕاستی‌ودروستیتان لەمامۆستایانی شەریعەت‌و فەریسیەکان زیاتر نەبێت، بە هیچ جۆرێك ناچنە ناو پادشاهێتی ئاسمان.

**تووڕەبوون**

([21]بیستوتانە لەکۆندا بەخەڵکی ووتراوە: {خەڵکی مەکوژن، ئەوەی بکوژێت شایانی حوکم بەسەردانە.} [22]بەڵام من پێتان دەڵێم: هەر کەسێ بەناڕەوا لەبراکەی تووڕە بێت، شایانی حوکم بەسەردانە. ئەوەی بەبراکەی دەڵێ هیچ‌وپوچ شایانی ڕاوەستانە لەبەردەم ئەنجومەنی باڵای جوولەکە*، ئەوەش بەبراکەی دەڵێ بێ‌مێشك شایانی دۆزەخە. [23]ئەگەر قوربانیەکەت هێنا بۆ قوربانگە، لەوێ بیرت کەوتەوە کە براکەت شتێکی بەسەرتەوەیە، [24]قوربانیەکەت لەبەردەم قوربانگەدا بەجێ‌بهێڵەو برۆ

یەکـەمجار بـراکەت ئاشـت بکەرەوە، ئیـنجا وەرە قوربانـیەکەت پێشـکەش بکـە. [25]هەروەها لـەگەڵ ئەو کەسەی ناکۆکـە لەگەڵـت، خـێرا ئاشـت بـەرەوە، هـەر لەو کاتەی بەرێگاوەن بـۆ دادگـا، نـەوەك بـتداتە دەسـت دادپـرس‌و دادپرسـیش بتداتە دەست پۆلـــیس، پۆلیســـیش ڕەوانـــەی بەندیخانـــەت بکـــات. [26]ڕاســـتیت پێ‌دەڵێم: لەوێ دەرناچی تا دوا پوول نەدەیتەوە.

**داوێن پیسی**

([27]بیسـتوتانە ووتـراوە: {داوێـن پیسـی مەکـە}، [28]بـەڵام مـن پێـتان دەڵێم: ئەوەی بە هەوەسبازی سەیری ئافرەتـێکی کـرد، ئـەوا لـەدڵی خۆی داوێن‌پیسی لـەگەڵ کردووە. [29]ئەگەر چـاوی ڕاستت توشی گوناهی‌کردی دەری بهێـنەو فـڕێی‌بدە، چـاکتر وایە ئەندامـێکی لـەشـت نەمێـنێ، لەوەی هـەموو لـەشت بخرێتە دۆزەخەوە. [30]ئەگـەر دەسـتی ڕاسـتت تووشـی گونـاهی کردی، بی‌بڕەوەو فڕێی‌بدە، چاکتر وایە ئەندامێکی لـەشت نەمێنێ، لـــەوەی هـــەموو لەشـــت بخرێـــتە دۆزەخەوە.

**تەڵاق**

([31]دیســـان ووتـــراوە: {ئـــەوەی ژنەکەی تەڵاق دەدات، با تەڵاقنامەی بداتـە دەسـت.} [32]بـەڵام مـن پێتان دەڵـێم: ئـەوەی ژنەکـەی تـەڵاق دەدات بێ‌هـۆی داوێـن پیسـی وای لـی‌دەکـات داوێـن پیسـی بکـات. ئـەوەش تەڵاق دراوێك بهێنێت، ئەوا داوێن پیسی دەکات.

**سوێند خواردن**

([33]بیسـتوتانە لـەکۆندا ووتراوە: {پێچـــەوانەی ســـوێندەکانت مەجولـێرەوە، بەڵکو پەیمانت لەگەڵ خوداوەنـد بەرەسـەر}، [34]بـەڵام من پێتان دەڵێم: هەرگیز سوێند مەخۆن، نـە بەئاسمان، چونکە تەختی شاهانەی خودایـە، [35]نە بەزەوی، چونکە جێی پێ‌دانانێتی، نە بەقودس چونکە شاری پادشای مەزنە، [36]نە بەسەری خۆت، چـونکە توانـای ئەوەت نییە، تالێکی ڕەش یـا سپی بکەیت. [37]با قسەتان: بـە بـەڵێ بێت گەر وابوو، بە نەخێر بێـت گـەر وانـەبوو، لەمـە زیاتـر لـەشەیتانەوەیە.

**تۆڵەسەندن**

(38 بیستوتانە ووتراوە: {چاو بە چاو، ددان بە ددان}. 39 بەڵام من پێتان دەڵێم: بەربەرەکانی خراپە مەکەن بەخراپە، ئەوەی کێشای بە ڕوومەتی ڕاستت، ئەوی کەشی بۆ ڕاگرە. 40 ئەوەی ویستی کراسەکەت ببات، چاکەتەکەشی بدەرێ. 41 ئەوەی ناچاری کردی یەك میل لەگەڵی بڕۆیت، دوو میل لەگەڵی بڕۆ. 42 ئەوەی داوای شتێکی لێ‌کردیت، بی‌دەرێ. ئەوەی داوای قەرزت لێ‌دەکات مەی‌گەڕێنەوە.

### خۆشەویستی دوژمنان

(43 بیستوتانە ووتراوە: {ئەوەی لێت نزیکە خۆشت بوێ، ئەوەی دوژمنتە ڕقت لێی بێت}، 44 بەڵام من پێتان دەڵێم: دوژمنەکانتان خۆش‌بوێ‌و نوێژ بکەن بۆ ئەوانەی دەتانچەوسێننەوە 45 بەمە دەبنە ڕۆڵەی ئەو باوکەتان کە لەئاسمانە، ئەو خۆری خۆی بەسەر چاك‌و خراپدا هەڵدێنی‌و بارانی خۆی بەسەر دادپەروەرو زۆرداریش دەبارێنێ. 46 ئەگەر هەر ئەوانەتان خۆش‌ویست کە ئێوەیان خۆش دەوێ، چ پاداشتێ وەردەگرن؟ ئایا باجگرانیش* ئەمە ناکەن؟ 47 ئەگەر تەنها پێشوازیتان لەبراکانتان کرد، چ شتێکی مەزنتان کردووە ئایا بت پەرستەکانیش ئەمە ناکەن؟ 48 بۆیە ڕاست‌و تەواو بن، هەروەك باوکی ئاسمانیتان ڕاست‌و تەواوە.

### خێرکردن

## 6

(نەکەن لەبەر چاوی خەڵکی کاری چاکە بکەن، بەنیازی ئەوەی بتانبینن. ئەگینا پاداشتتان نییە لای باوکی ئاسمانیتان.

2 گەر خێرەکت کرد، زوڕنا لێ‌مەدە، وەك دووڕووەکان لەکەنیشت‌و سەر شەقامەکان دەیکەن، تاخەڵکی بیانبینن‌و بەشان‌و باهویان هەڵبدەن. ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: بەمە ئەوان پاداشتی خۆیان وەرگرت. 3 بەڵام تۆ کە خێرێکت لەگەڵ یەکێ کرد، نەیەڵیت دەستی ڕاستت بەچەپت بزانێ. 4 با خێرەکەت نەبینراو بێت ئەو باوکەت کەهەموو نهێنیەك دەبینێت، ئەو پاداشتت دەداتەوە.

### نوێژ کردن

([5]کاتێ نوێژ* دەکەن وەك دووڕووەکان مەبن کە حەزدەکەن بە پێوە لەکەنیشتەکانو سووچی شەقامەکان نوێژ بکەن تاخەڵکی بیان بینن. ڕاستیتان پێ دەڵێم: بەمە ئەوان پاداشتی خۆیان وەرگرت. [6]بەڵام تۆ کە نوێژ دەکەی، دەرگا لەسەر خۆت داخە، نوێژ بکە بۆ باوکی نەبینراوت، ئەو باوکەی هەموو نهێنیەك دەبینێت، ئەو پاداشتت دەداتەوە.

[7]کاتێ نوێژ دەکەن، ووشەکان ئەوەندە دووبارە مەکەنەوە، وەك بت پەرستەکان دەیکەن، ئەوان وابیر دەکەنەوە بەدووبارەکردنەوە، وەڵام بەدەست دەهێنن. [8]وەك ئەوان مەبن، چونکە باوکتان دەزانێ پێویستیتان بەچییە، پێش ئەوەی داوای لێبکەن. [9]دەتوانن ئاوەها نوێژ بکەن: (ئەی باوکمان لەئاسمان با ناوت پیرۆز* بێت، [10]با پادشاهی تۆ بێت، باخواستت لەسەر زەوی پەیڕەو بکرێ وەك لە ئاسمان. [11]نانی ڕۆژانەمان ئەمڕۆش بدەری. [12]لە گوناهمان خۆش بە، وەك چۆن ئێمە لەگوناهی ئەوانە خۆش دەبین، کە خراپەمان بەرامبەر دەکەن. [13]مەمان خەرە تاقی کردنەوە بەڵکو ڕزگارمان کە لەشەیتان.) [14]گەر لەهەڵەی خەڵکی خۆش بوون، ئەوا باوکی ئاسمانیتان لەهەڵەکانتان خۆش دەبێت. [15]ئەگەر لەهەڵەی خەڵکی خۆش نەبوون، ئەوا باوکیشتان لەهەڵەکانتان خۆش نابێت.

### ڕۆژووگرتن

([16]کاتێ بەڕۆژوو* دەبن، ڕووگرژ مەبن وەك دووڕووەکان کە ڕووگرژ دەکەن، بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی دەرخەن کە بەڕۆژوون. ڕاستیتان پێ دەڵێم: ئەوانە پاداشتی خۆیان وەرگرتووە. [17]بەڵام تۆ کە ڕۆژوو دەگری، دەمو چاوت بشۆ، بۆنی خۆش لەسەرت بدە، [18]هەتا بۆ خەڵکی دەرنەکەوێ کە بەڕۆژوویت، بۆ باوکی نەبینراوت نەبێت، ئەو باوکەی هەموو نهێنیەك دەبینێت، ئەو پاداشتت دەداتەوە.

### گەنجینەی ڕاستەقینە

([19]لەسەر زەوی سامان کۆمەکەنەوە، کە مۆریانە و ژەنگ خراپی دەکەنو دز بەشوێنی دەگەڕێو دەیدزێ. [20]سامانتان لە

ئاسمـان کۆبکەنـەوە، کـە مۆریانـەو ژەنـگ خراپی ناکاو دزیش بەشوێنی ناگەڕێو نایدزێ. [21]چونکە سامانت لەکوێ بێت، دڵیشت لەوێ دەبێت.

([22]چاو چرای لەشە، گەر چاوت ساغ بێت، ئەوا لەشت هەمووی ڕووناکە، [23]ئەگـەر چـاوت خـراپ بێـت، ئـەوا لەشـت هـەمووی لەتاریکـیدایە، بـەڵام گـەر ئـەو ڕووناکیـیەی تیاتدایە تاریك بێ، ئاخۆ دەبـێ چ تاریکیـیەك بێـت. [24]کـەس نـاتوانێ کۆیلـەی دوو گـەورە بێت، یـان ڕقی لەیەکێکیان دەبێتو ئەوەی دیکـەی خۆش دەوێت یان دڵسۆزی یەکێکـیان دەبێـتو ئـەوەی دیکـە پشـتگوێ دەخـات. ئـێوەش نـاتوانن کۆیلەی پارەو خودا بن بەیەکەوە.

**خودا خەممان دەخوات**

([25]بۆیە پێتان دەڵێم: خەمی ژیانی خۆتـان نەبێـت، ئـەوەندە خـەمی خـواردنو خواردنـەوەو لەبەرکـردن مـەخۆن. ئایـا ژیان لە خواردن زیاتر نیـیە؟ ئایـا لەشـتان لـە جـلوبەرگ گـرنگتر نیـیە؟ [26]سـەیری باڵـندەی ئاسمان بکەن. ناڕوێنێ، دروێنە ناکات، شـت لەعەمبار کۆناکاتـەوە. لەگەڵ ئـەوەش بـاوکی ئاسمانیـتان بەخـێوی دەکـات. ئایـا ئـێوە لـەو باڵـندانە زیاتـرنین؟ [27]کـێ لەئـێوە گەر خەمی ئەمانـەی خـوارد، دەتوانێ یەك کاژێر لـەژیانی زیاتر بکات. [28]بۆچی خەمی بەرگتانە؟ سەیری گوڵی کێڵگە بکەن چۆن گەورە دەبێت، بێئەوەی هیلاك بێـتو بڕێسـێت، [29]بـا پێـتان بڵێم: تەنانـەت سـلێمانی دانـاش لەوپەڕی مەزنـیدا وەك ئـەو گوڵانـەی لەبەرنەکـردووە. [30]گەر بێتو خودا گـیای دەشـت ئاوهـا بپۆشـێت، هەرچـەندە ئەمـڕۆ هـەنو بـەیانی تەنوریان پێ دادەخرێت، ئایا ئێوە ئەی کـەم باوەڕینە، لـەوان زیاتـر نـین تا پۆشـتەتان بکـات؟ [31]خـەم مـەخۆن بڵـێن: چی بخۆین؟ یان چی بخۆینەوە؟ یـان چـی لەبـەر بکەین؟ [32]ئەم شتانە هـەمووی بـت پەرسـتان هـەوڵی بۆ دەدەن. بـاوکی ئاسمانیـتان دەزانـێ پێویسـتیتان بەمانـە هەمووی هەیە. [33] ئـێوە یەکـەمجار داوای پادشـاهێتیو ڕاسـتودروستی خودا بکەن، ئەوانی دیکەتان هەمووی بۆ جێبەجێ دەبێ.

[34]ئـەوەندە خەمی بەیانی مەخۆن، چونکە بەیانی خەمی خۆی دەخواتو هەر ڕۆژێك بەشی خۆی گیروگرفتی

هەیە.

### خەڵكی تاوانبار مەكەن

7

(خەڵكی تاوانبار مەكەن تا تاوانبار نەكرێن، [2]چونكە بەو شێوەیەی خەڵكی تاوانبار دەكەن ئێوەش تاوانبار دەكرێن، بەو پێوانەی بۆ خەڵكی دەپێون، بۆتان دەپێونەوە. [3]بۆچی سەرنج لەپووشی ناوچاوی براكەت دەدەیت، بەڵام ئاگات لەتەختە دارەكەی ناو چاوی خۆت نییە؟ [4]یان چۆن بەبراكەت دەڵێیت: ڕێم بدە با ئەو پووشە لەچاوت دەربهێنم، لەكاتێكدا تەختە دارێك لەچاوی خۆتدایە؟ [5]ئەی دووڕوو یەكەم جار تەختە دارەكەی ناو چاوت دەربهێنە، تا باش ببینیت، ئەوسا پووشی ناوچاوی براكەت دەربهێنە. [6]شتی پیرۆز مەدەن بەسەگ، زێڕیشتان فڕێ مەدەنە بەردەم بەراز، نەوەك بەقاچی پێشێلی بكاتو بەسەرتان هەڵگەڕێتەوەو پارچە پارچەتان بكات.

### داوا بكەن، پێتان دەدرێ

([7]داوا بكەن، پێتان دەدرێ. بگەڕێن، دەدۆزنەوە. لەدەرگا بدەن، لێتان دەكرێتەوە. [8]هەر كەسێ داوا بكات، وەردەگرێ. ئەوەی دەگەڕێت دەدۆزێتەوە. ئەوەش كە لەدەرگا دەدات، لێیدەكرێتەوە. [9]چ مرۆڤێك لەئێوە گەر منداڵەكەی داوای نانی لێكرد، بەردی دەداتێ. [10]یان داوای ماسی لێبكات، ماری دەداتێ؟ [11]گەر ئێوەی خراپ بزانن شتی باش بەمنداڵەكانتان بدەن، ئایا دەبێ باوكی ئاسمانیتان چەند شتی باشتر بدات بەوانەی داوای لێدەكەن. [12]چۆن دەتانەوێ خەڵكی هەڵسوكەوتتان لەگەڵ بكەن، بەهەمان شێوە هەڵسوكەوتیان لەگەڵ بكەن ئا ئەمەیە پوختەی شەریعەتو فێركردنی پێغەمبەران.

### دەرگای تەنگ

([13]لە دەرگای تەنگەوە بڕۆنە ژوورەوە، چونكە ئەو دەرگایەی بەرەو لەناوچوون دەڕوات، پانەو ڕێگاكەی بەرینەو زۆریش لێیەوە دەچنە ژوورەوە. [14]بەڵام تەنگترین دەرگاو نارەحەتترینیان، دەرگاو ڕێگای گەیشتنە بەژیان، ئەوانەی ڕێی

پیٚدەبەن زۆر کەمن.

**ناسین بە بەرووبووم**

([15]ئاگاداری پێغەمبەرە درۆزنەکان بن، ئەوان دێن بۆ لاتان، گورگن لەپێستی مەڕ، [16]بەڵام بەبەرووبوومیان بیان ناسن، ئایا دڕك تریٚ دەگریٚ یان حوشترئالووك هەنجیر دەگریٚ؟ [17]هەموو دارێکی باش بەرووبوومی باش دەدات. داری خراپیش بەرووبوومی خراپ. [18]داری باش بەرووبوومی خراپ نادات، هەروەها داری خراپ بەرووبومی باش نادات. [19]هەر دارێك بەرووبوومی باش نەدات، دەبڕێتەوەو فڕیٚ دەدرێتە ناو ئاگر. [20]کەواتە دەتوانن بە بەرووبوومیان بیانناسن. [21]هەموو ئەوانەی کە دەڵێن: خوداوەند، خوداوەند! ناچنە ناو پادشاهێتی ئاسمان، ئەوانە نەبن کە بەخواستی باوکم دەکەن کە لەئاسمانە. [22]لەڕۆژی لیٚ پرسینەوەدا، زۆر کەس پێم دەڵێن: خوداوەند، خوداوەند، ئایا بەناوی تۆ نەدواین، بەناوی تۆ ڕۆحی پیسمان دەرنەکرد، بەناوی تۆ زۆر کاری سەرسوڕهێنەرمان نەکرد؟ [23]بەڵام لەو کاتەدا پێیان دەڵێم: من هەرگیز ئێوەم نەناسیوە، لێم دوورکەونەوە ئەی بەدکاران!

**داناو گێل**

([24]ئەوەی گوێی لەم وتانەم دەبێتو هەڵسوکەوتی پیٚدەکات، وەك پیاوێکی دانا وایە کە بناغەی خانووەکەی لەسەر بەرد دروست کردبێت. [25]کاتیٚ باران باری، لافاو هەستاو ڕەشەبا هاتو لە خانووەکەیدا، خانووەکەی نارووخێت، چونکە لەسەر زەویەکی بەردین دروستی کردووە. [26]ئەوەش کە گوێی لەم وتانەم دەبێتو هەڵسوکەوتی پیٚناکات، لە کابرایەکی گێل دەکات خانووەکەی لەسەر لم دروست کردبێت، [27]کاتیٚ باران باریو لافاو هەستاو ڕەشەبا هاتو لە خانووەکەیدا، خانووەکەی دەڕووخێنیٚ، بەڵام ڕووخانێکی چاك.)

[28]کاتیٚ عیسا لەم وتانە تەواو بوو، خەڵکەکە لەشێوەی فێرکردنی زۆر سەرسام بوون، [29]چونکە وەك دەسەڵاتدارێك فێری دەکردن، نەك وەك مامۆستایانی شەریعەت.

## پاکبوونەوەی نەخۆشی گولـی

# 8

کـاتێ عیسـا لەسـەر چـیایەکە هاتـە خـــوارەوە، خەڵکـــێکی زۆر دوای کـەوتن. [2]پـیاوێك نەخۆشـی گولـی هـەبوو، هـات کڕنۆشـی بـۆ بـردو ووتـی: (گـەورەم، گـەر بـتەوێ، دەتوانـی پـاکم بکەیـتەوە.) [3]عیسـا دەسـتی بـۆ بـردو دەسـتی لـێداو ووتـی: (مـن دەمەوێ، پاك بەرەوە.) [4]کابرا دەست بەجێ برینی پێوە نەما. عیسـا پێی ووت: (ئاگاداربە، بەکەس مـەڵێ، بـەڵکو بـڕۆ خـۆت نیشـانی کـاهین بـدەو ئـەو قوربانـیەی موسـا فـەرمانی داوە پێشکەشیبکە، با ئەمە ببێتە شایەتییەك بۆ خەڵکی.)

## باوەڕی سەرپەلێك

[5]کـاتێ عیسـا چـووە شـاری کەفـەرناحوم، سـەرپەلـێك هـات بۆ لایو لێی پاڕایەوەو ووتی: [6](گەورەم ئیشکەرێکم هەیە، ئیفلیج بووە لەناو جـێدا کـەوتووەو ئـازارێکی زۆری هەیـە؟) [7]عیسـا پـێی ووت: (وا لەگەڵـت دێـم چاکی دەکەمەوە.) [8]سـەرپەلەکە وەڵامـی دایەوەو ووتی: (گـەورەم مـن شایانی ئەوە نیم خۆت بێیتە ماڵەکەم، بەڵکو تەنها ووشـەیەك بڵـێ ئیشـکەرەکەم چاك دەبێتەوە. [9]چـونکە منـیش مرۆڤـێکم لەژێـر دەسـەلاتی لەخۆم گەورەتر، هەروەها سەربازیشـم هەیـە لەژێـر دەسـەلاتی مـنن، بەیەکێ بلێم: (بڕۆ)، دەڕوات، بـەوی کـە بلـێم: (وەرە)، دێـت، بەکۆیلەکەشـم بلـێم: (ئـەوە بکـە)، دەیکـات.) [10]کاتێ عیسا گوێی لەمە بوو، بەسەرسوڕمانەوە بەوانەی دوای کەوتـبوون، ووتـی: (ڕاسـتیتان پـێ دەڵـێم، لەئیسـرائیلدا کەسـم نەدی بـاوەڕێکی مـەزنی ئاوای هەبێت. [11]پێـــتان دەڵـــێم: خەڵکـــێکی زۆر لەڕۆژهـــەلاتو ڕۆژئـــاواوە دێـــنو لەگـەڵ ئیـبراهیمو ئیسـحاقو یاقوب لەناو پادشاهێتی ئاسمان دادەنیشن. [12]بـەلام ڕۆڵـەکانی پادشاهێتی* خۆیان، فـڕێ دەدرێـنە تـاریکی دەرەوە جـا لەوێیە گریانو چڕکە چڕکی ددان.) [13]ئینجا عیسا بە سەرپەلەکەی ووت: (بـڕۆ بەپـێی بـاوەڕت، با بۆت ببێ.) هـەر لەو کاتەدا لەوێ ئیشکەرەکەی چاكبووەوە.

## چاككردنەوەی خەڵكێكی زۆر

[14]کـاتێ عیسـا بۆ ماڵی پەترۆس

چـوو، خەسوی پەترۆسی بینی لەناو جـێدا کەوتووەو تای لـیٚهاتووە. [15] عیسـا دەسـتی گرت، تایەکەی نەما. ئـیتر ئـەویش هەسـتاو دەسـتی کرد بەخزمەتکردنـیان. [16] کـاتیٚ ئـێوارە داهـات، خـەڵکی ژمارەیـەکی زۆر شـێتیان بـۆ هێـنا، چـی ڕۆحی پیس هـەبوو تـیایان بـە ووشـەیەك دەری کـرد. هەروەها هەموو نەخۆشەکانی دیکەشـی چـاك کـردەوە. [17] تـاکو ئـەوەی لەسەر زمانی پێغەمبەر ئەشعیا هـاتووە بێـتەدی کـە دەڵـیٚ: {ئـەو دەردەکـانی لابردین‌و نەخۆشیەکانی هەڵگرتین.}

## نرخی دوای عیسا کەوتن

[18] کـاتیٚ عیسـا بیـنی خەڵکـێکی زۆر لـــــەدەوری کۆبوونەتـــــەوە فـەرمانیدا بەقوتابیـەکانی تا بپەڕنەوە بـۆ بـەری ئەوبـەری دەریاچـەکە. [19] یـەکیٚ لەمامۆسـتایانی شەریعەت هاتە پێشـەوەو ووتـی: (مامۆسـتا بۆ کویٚ بڕۆیـت دوات دەکـەوم.) [20] عیسـا وەڵامــی دایـەوەو ووتـی: ( ڕێـوی کونـی هەیـەو باڵـندەکانی ئاسمانـیش هـێلانە، بەڵام ڕۆڵەی مرۆڤ، جێی نییە سـەری بخاتە سەر.) [21] هەروەها یەکیٚ لەقوتابیـەکانی پـیٚی ووت: (گەورەم، ڕێگەم بدە جاریٚ بچم باوکم بنێژم.) [22] عیسـا وەڵامی دایەوە: (دوامکەوە، واز لـە مردووان بهێنە مردووەکانیان بنێژن.)

## عیسا ڕەشەبا هێمن دەکات

[23] ئیـنجا عیسـا سـەرکـەوتە سەر بەلـەمێك‌و قوتابیەکانی دوای کەوتن. [24] لـــەناکاو ڕەشـــــەبایەکی بەهـێز هـــەڵی کـــردە سـەر دەریاچـەکە، ئـەوەندەی نـەمابوو شـەپۆڵـی ئـاو بەلـەمــەکــە نقـووم بکـات، بـەڵام عیسـا نووستبوو. [25] قوتابییەکانی خێرا چـوونە لای، هەڵیانسـاندو ووتیان: (گـەورەم ڕزگارمـان کـە وا لـەناو دەچـین.) [26] ئـەویـش پـیٚی ووتـن: (ئــەی کـــەم باوەڕیـــنە، بۆچـــی دەترسـن؟) ئیـنجا هەسـتا فـەرمانیدا بەڕەشـەباو دەریاچـــەکـە، هێمـــنی بـاڵی کێشا بـەو نـاوەدا. [27] هـەموو سـەریان سـوڕماو ووتـیان: (ئەمە چ مرۆڤـــێکە، وا ڕەشـــەباو دەریـــا گویٚڕایەڵی دەکەن؟)

## دەرکردنی ڕۆحی پیس

[28] کـاتیٚ عیسـا گەیشتە ئەوبەری

دەریاچەکە، لەشاری جەدەرین دوو پیاوی بینی ڕۆحی پیسیان تێدا بوو، تازە لە نێوان گۆڕەکانی گۆڕستان هاتبوونە دەرەوە، ئەمانە زۆر درندە بوون، تەنانەت کەس نەیدەتوانی لەو ڕێگەیەوە بڕوات. [29] لەناکاو هاواریان کردو ووتیان: (چیت لێمان دەوێ، ئەی عیسای ڕۆڵەی خودا؟ هاتووی بۆ ئێرە پێش کاتی خۆی، تا ئازارمان بدەی؟) [30] لەو نزیکانە ڕانە بەرازێك دەلەوەڕان، [31] ڕۆحە پیسەکانی ناو دوو مرۆڤەکە لێی پاڕانەوەو پێیان ووت: (ئەگەر دەرمان دەکەیت، بماننێرە ناو ئەو بەرازانەوە.) [32] ئەویش پێی ووتن: (بڕۆن.) ئەوانیش لە مرۆڤەکان چوونە دەرەوەو چوونە ناو بەرازەکانەوە، ڕانە بەرازەکە لەقەدپاڵی گردەکەوە بەرەو دەریاچەکە هەڵدێرانو لەناو ئاوەکە خنکان. [33] شوانەکان کاتێ ئەمەیان بینی، خێرا ڕایان کرد بۆ ناو شار، ئەوەی بینیان لە دوو پیاوەکەی ڕۆحی پیسیان تیا بوو و لەڕانە بەرازەکە، هەموویان بۆ خەڵکی شار گێڕایەوە. [34] ئەوەبوو شارەکە هەمووی هاتە دەرەوە بۆ بینینی عیسا، دوای ئەوەی بینییان، داوایان لێ کرد ئاوایەکەیان بەجێ بهێڵێ.

## چا کردنەوەی ئیفلیجێك

# 9

ئینجا عیسا سواری بەلەم بوو، دەریاچەکەی بڕی‌و گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی ﴿کەفەرناحوم﴾. [2] کابرایەکی ئیفلیجیان هێنایە لای بەجێگەکەیەوە، کاتێ عیسا سەیری باوەڕیانی کرد، بەکابرای ووت: (وورەت بەرزبێ کوڕم، گوناهەکانت بەخشراون.) [3] هەندێ لەمامۆستایانی شەریعەت لەدڵی خۆیان ووتیان: (ئەمە کفر دەکات.) [4] عیسا زانی بیر لەچی دەکەنەوەو لێی پرسین: (بۆچی لەدڵتان بەخراپە بیردەکەنەوە؟ [5] کامیان ئاسانترە بووترێ: (گوناهەکانت بەخشران.) یاخود بووترێ: (هەستەو بڕۆ؟) [6] بەڵام بۆ ئەوەی بزانن ڕۆڵەی مرۆڤ لەسەر زەوی دەسەڵاتی گوناه بەخشینی هەیە.) ئینجا بەئیفلیجەکەی ووت: (هەستە، جێگاکەت هەڵگرەو بڕۆرەوە بۆ ماڵ.) [7] ئەویش دەست بەجێ هەستایە سەرپێ‌و بەپێی خۆی

بەرەو ماڵ گەڕایەوە. [8]کاتێ خەڵکەکە ئەمەیان بینی، ترسانو دەستیان‌کرد بەستایشی ئەو خودایەی ئەم دەسەڵاتەی داوە بەمرۆڤ.

**عیسا بۆ گوناهباران هاتووە**

[9]کاتێ عیسا لەوێ تێدەپەڕی، باجگرێکی دی ناوی مەتتا بوو، لەسەر شوێنی باج وەرگرتن دانیشتبوو. پێی ووت: (دوام کەوە.) [10]ئەویش هەستاو دوای کەوت. لەکاتێکدا عیسا چووە ماڵی مەتتاو لەسەر خوان دانیشت، زۆر لەباجگرەکانو گوناهباران هاتنو لەسەر خوان لەگەڵ عیساو قوتابیەکانی دانیشتن. [11]کە فەریسیەکان ئەمەیان بینی، بەقوتابیەکانیان ووت: (بۆچی مامۆستاتان لەگەڵ باجگرو گوناهباران دادەنیشێتو نان دەخوات؟) [12]کاتێ عیسا گوێی لە ووتەکانیان بوو، ووتی: (مرۆڤی لەش ساغ پێویستی بە پزیشك نییە، بەڵکو نەخۆش. [13]بڕۆنو مانای ئەمە فێربن: {من داوای بەزەیی دەکەم نەك قوربانی}، نەهاتووم بۆ بانگ کردنی ئەوانەی خۆیان بەچاك دەزانن، بەڵکو گوناهباران بۆ تۆبەکردن.)

**لەبارەی ڕۆژووەوە**

[14]ئینجا قوتابیەکانی یەحیا لەعیسا هاتنە پێشەوەو پرسیاریان لێکرد: (بۆچی ئێمەو فەریسیەکان بەڕۆژوو دەبین، بەڵام قوتابیەکانت بەڕۆژوو نابن؟) [15]عیسا پێی ووتن: (ئایا خەڵکی لەشایدا شیوەن دەکەن کاتێ زاوا لەنێوانیان بێت؟ بەڵام ڕۆژانێ دێت زاوا بەرز دەکرێتەوەو لەنێوانیان نامێنێ، ئەوسا بەڕۆژوو دەبن. [16]هیچ کەسێ کراسی کۆن بەقوماشێکی تازە پینە ناکات، چونکە پارچە تازەکە دەچێتەوەیەكو کراسە کۆنەکە ڕادەکێشێتو دڕاویەکە خراپتر دەکات. [17]خەڵکی مەی تازە ناکەنە مەشکەی کۆنەوە، ئەگینا مەشکەکە دەدڕێ، مەیەکە دەڕژێو مەشکەکەش لەناو دەچێ. بەڵکو مەی تازە دەکرێتە مەشکەی تازەوە، تا مەیەکەو مەشکەکەش بەیەکەوە پارێزراو بن.)

**زیندووکردنەوەی کچێك**

[18]لەکاتێکدا عیسا ئەمانەی دەووت، یەکێ لەپێشەوایانی

جوولەکە هاتە پێشەوە، کڕنووشی بۆ بردو ووتی: (کچەکەم ئێستا مرد، بەڵام وەرە دەستی لێ بدە، زیندوو دەبێتەوە)، [19]عیسا هەستاو لەگەڵ قوتابیەکانی دوای پیاوەکە کەوت. [20]هەر لەوکاتەدا ژنێك کە دوانزە ساڵ بوو نەخۆشی خوێن لێچوونی هەبوو، لەعیسا نزیك بووەوەو لەدواوە دەستی بۆ چمکی کراسەکەی بردو لەدڵی خۆیدا ووتی: [21](ئەگەر تەنها دەست لەجلەکانیشی بدەم، چاك دەبمەوە.) [22]عیسا ئاوڕی دایەوە بینیو ووتی: (کچەکە، دڵنیابە، باوەڕت چاکی کردیتەوە.) ژنەکە دەست بەجێ چاك بووەوە. [23]کاتێ عیسا چووە ماڵی پێشەواکە، شیوەنکەرانو کۆمەڵێ خەڵکی بینی بەیەکا دێنو دەچن. [24]ووتی: (لاچن، کچەکە نەمردووە، بەڵکو خەوتووە.) ئەوانیش پێی پێکەنین. [25]کاتێ خەڵکەکەی کردە دەرەوە، هاتە ژوورەوەو دەستی کچەکەی گرت، کچە هەستایە سەرپێ. [26]ئەم هەواڵە لەهەموو وولاتدا بلاوبووەوە.

**چاکردنەوەی دوو کوێر**

[27]کە عیسا لەوێ ڕۆیشت، دوو کوێر دوای کەوتن، هاواریان دەکردو دەیان ووت: (ڕۆڵەی داود، بەزەییت پێمانبێتەوە) [28]کاتێ هاتە ماڵەوە، هەردووکیان هاتنە لای. عیسا لێی پرسین: (ئێوە باوەڕتان بەوە هەیە من دەتوانم ئەمە بکەم؟) ئەوانیش وەڵامیان دایەوە: (بەڵێ گەورەم.) [29]ئەویش دەستی هێنا بە چاویانداو ووتی: (بابۆتان بێ، بەپێی باوەڕتان.) [30]دەست بەجێ چاویان ڕووناکی تێکەوت، عیسا پێی ڕاگەیاندنو ووتی: (ئاگاداربن بەکەس مەڵێن) [31]بەڵام ئەوان ڕۆیشتنو هەواڵیان لەهەموو ناوچەکەدا بلاوکردەوە.

**لاڵێك دەکەوێتە قسەکردن**

[32]کە دوو کابراکە چوونە دەرەوە، چەند کەسێك لاڵێکیان هێنایانە لای، ڕۆحی پیسی تیا بوو. [33]کاتێ عیسا ڕۆحە پیسەکەی لێ دەرکرد، لاڵەکە دەستی کرد بەقسەکردن. خەڵکەکە سەریان سوڕماو ووتیان: (شتی وا بەهیچ جۆرێك لەئیسرائیلدا نەبینراوە.) [34]

بەلاّم فەریسیەکان ووتیان: (ڕۆحی پیس بەهێزی سەرۆکی ڕۆحە پیسەکان دەردەکات.)

## دروێنەی زۆرو کرێکاری کەم

[35] عیسا بەشارو لادێکان دەگەڕا، لە کەنیشتەکان خەڵکی فێردەکردو مزگێنی پادشاهێتی ئاسمانی ڕادەگەیاند. هەموو دەردو نەخۆشیەکی چاك دەکردەوە. [36] کاتێ خەڵکەکەی دەبینی بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە، چونکە پەرێشانو دەربەدەر بوون، وەك مەڕی بێ شوان بوون. [37] جا بە قوتابیەکانی ووت: (دروێنە زۆرە، کرێکار کەمە. [38] کەواتە نوێژ بکەن تا خوداوەندی دروێنە کرێکار بۆ دروێنەکەی بنێرێت.)

## بانگکردنی دوانزە نێرراوەکە

# 10

ئینجا دوانزە قووتابیەکەی* بانگ کرد، دەسەلاّتی دانێ تا ڕۆحە پیسەکان دەر بکەنو هەموو نەخۆشیو دەردێك چاك بکەنەوە. [2] ناوی دوانزە نێرراوەکەش* ئەمەیە: شەمعون کە بە پەترۆس ناودەبرا لەگەڵ ئەندراوسی برای، یاقوبی کوڕی زەبدیو یۆحەنای برای. [3] فیلیپۆسو برتۆلماوس، تۆماو مەتتای باجگر، یاقوبی کوڕی حەلفاو تەداوس، [4] شەمعونی قانەویو یەهوزای ئەسخەریوتی ئەوەی عیسای بەدەستەوەدا.

## عیسا نێرراوەکانی دەنێرێت

[5] عیسا ئەمانەی ناردو ووتی: (ئەو ڕێگەیە مەگرن کە بەناو ناجوولەکاندا دەڕوات، مەچنە شاری سامریەکان*، [6] بەڵکو بەتایبەتی بڕۆنە لای مەڕە وون بووەکانی ماڵی ئیسرائیل. [7] کاتێ دەچن ئەم پەیامە ڕابگەیێنن: (پادشاهێتی ئاسمان نزیك بۆتەوە.) [8] نەخۆش چاك بکەنەوە، مردوو زیندووبکەنەوە، گەڕوگولی پاك بکەنەوە، ڕۆحە پیسەکان دەربکەن. بەخۆڕایی وەرتان گرتووە بەخۆڕایی بیدەن. [9] زێڕو زیو و مس لەگەڵ خۆتان هەڵ مەگرن، [10] تورەکە لەگەڵ خۆتان هەڵمەگرن، دوو کراسو دوو پێلاّوو گۆچان مەبەن، چونکە ئیشکەر شایانی ئەوەیە خۆراکی خۆی بدرێتێ. [11] دەچنە هەر شارو لادێیەك، بگەڕێن بەشوێن

ئەوانەی شایانی ئێوەبن، لەوێ بمێننەوە هەتا کاتی ڕۆیشتنتان دێت. [12]کە چوونە ماڵێك سڵاویان لێبکەن. [13]ئەگەر هاتوو ئەو ماڵە بەڕاستی شایانی ئەوە بوون، با ئاشتیتان بچێتە ناویانەوە ئەگەر شایانی ئەوە نەبوون، با ئاشتیتان بگەڕێتەوە بۆ خۆتان. [14]گەر یەکێك پێشوازی لێ‌نەکردن، یان گوێی لێ‌نەگرتن، ئێوەش کە لەو ماڵو شارە دەچنەدەرەوە، تۆزی پێتان بتەکێنن. [15]ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: لەڕۆژی لێپرسینەوەدا، دۆخی شاری سەدومو عەمورە* باشتر دەبێ لەو شارە.

**چەوسانەوەی داهاتوو**

([16]من ئێوە وەك بەرخ بەناو گورگدا دەنێرم، جا داناو بن وەك مار، نەرمونیان بن وەك کۆتر. [17] ئاگادار بن، خەڵکی دەتان دەنە دەست دادگا، لە کەنیشتەکانیاندا بەقامچی لێتان دەدەن، [18]لەپێناوی من دەبرێنە بەردەم دادوەرو پادشاکان، ئەمەش دەبێتە شایەتیەك بۆ من، لای جولەکەو میللەتانیش. [19]کاتێ دەتاندەن بەدەستەوە، گوێ مەدەنە ئەوەی چۆن قسە بکەن یان چی بڵێن، چونکە لەوکاتەدا پێتان دەووترێ چی بڵێن. [20]ئێوە خۆتان قسە ناکەن، بەڵکو ڕۆحی باوکتانە بەهۆی ئێوەوە قسە دەکات. [21]برا، برای خۆی دەدا بەدەستەوە بۆ مردن، باوك منداڵی خۆی. منداڵان لەباوكو دایك هەڵدەگەڕێنەوەو دەیانکوژن. [22]خەڵکی ڕقیان لێتان دەبێ لەبەر ناوی من، بەڵام ئەوەی تاکۆتایی خۆی ڕاگری، ئەوە ڕزگاری دەبێت. [23]کە لەشارێ دەتان چەوسێننەوە، ڕاکەن بۆ شارێکی دیکە. ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: شارەکانی ئیسرائیل تەواو ناکەن پێش هاتنەوەی ڕۆڵەی مرۆڤ.

**مەترسن**

([24]قوتابی لەمامۆستاکەی بەرزتر نییەو کۆیلەش لەگەورەکەی بەرزتر نییە. [25]بەسە قوتابی وەك مامۆستاکەی بێت وکۆیلەش وەك گەورەکەی بێت. گەر خاوەن ماڵیان بە بەعلەزبول* ناوبردبێت، ئاخۆ دەبێ چی بەئەندامانی ماڵەکەی بووترێ؟ [26]لەوان مەترسن، چونکە

هیچ شتێكی شاراوە نییە دەرنەكەوێتو هیچ نهێنیەك نییە ئاشكرا نەبێت. [27]ئەوەی لە تاریكیدا پێتانی دەڵێم، لەڕووناكیدا بیڵێنەوە، ئەوەی بەچرپە گوێتان لێ‌دەبێ، بەدەنگی بەرز لەسەربانان ڕایبگەیێنن. [28]مەترسن لەوانەی دەتان كوژن بە لەشو ناتوانن دەروونتان بكوژن، بەڵكو ترستان لەوەبێ كە دەتوانێ لەشو دەروون بەیەكەوە لەدۆزەخدا لەناوبەرێ. [29] ئایا دوو چۆلەكە نافرۆشن بە یەك فلس؟ كەچی لەگەڵ ئەوەشدا، یەكێ لەوانە بەبێ خواستی باوكتان ناكەوێتە سەر زەوی. [30]ئێوە تەنانەت قژی سەریشتان ژمێراوە. [31]كەواتە مەترسن، ئێوە زۆر لەچۆلەكە بەنرخترن. [32]ئەوەی دانم پیادەنێ بەرامبەر بەخەڵكی، منیش دانی پیا دەنێم بەرامبەر بەباوكم، ئەوەی كە لەئاسمانە. [33]بەڵام ئەوەی نكۆڵیم لێدەكات بەرامبەر بەخەڵكی، منیش نكۆڵی لێدەكەم بەرامبەر باوكم، ئەوەی كە لەئاسمانە.

**ئاشتی‌نا بەڵكو شمشێر**

([34]لەوباوەڕەدا نەبن من هاتووم بۆ ئەوەی ئاشتی بێنمە سەر زەوی، نەهاتووم بۆ هێنانی ئاشتی، بەڵكو شمشێر! [35]من هاتووم بۆ ئەوەی ناكۆكی بخەمە نێوان، باوكو كوڕ، كچو دایك، بووكو خەسوو. [36]ئا بەم جۆرە مرۆڤ دوژمنی خانەوادەكەی خۆی دەبێت.

[37]ئەوەی دایكو باوكی لەمن زیاتر خۆشویست، شایانی من نییە. ئەوەی كوڕی یان كچی لەمن زیاتر خۆشویست، شایانی من نییە. [38] ئەوەی خاچەكەی هەڵنەگرێو دوام نەكەوێت، شایانی من نییە. [39]ئەوەی خۆی بەژیانیەوە بەستبێتەوە، دەیدۆڕێنێ، ئەوەی ژیانی خۆی لەپێناوی من بدۆڕێنێ، دەیباتەوە. ([40] ئەوەی پێشوازی لەئێوە بكات، ئەوا پێشوازی لەمن دەكات، ئەوەش پێشوازی لەمن بكات، ئەوا پێشوازی لەوە دەكات كە منی ناردووە. [41]ئەوەی پێشوازی لەپێغەمبەرێك بكات، لەبەرئەوەی پێغەمبەرە، ئەوا پاداشتی پێغەمبەرێك وەردەگرێت. ئەوەش پێشوازی لەمرۆڤێكی چاك بكات، ئەوا پاداشتی مرۆڤێكی چاك وەردەگرێت. [42]هەركەسێكیش جامێ ئاوی سارد

بدات بەیەکێ لەم منداڵانە، لەبەرئەوەی قوتابی منن، ڕاستیتان پێ دەڵێم: پاداشتی ئەو هەرگیز وون نابێت.)

## عیساو حەزرەتی یەحیا

# 11

کە عیسا لەئامۆژگاری کردنی دوانزە قوتابیەکەی تەواو بوو، لەوێ ڕۆیشت، چوو بۆ فێرکردنو ڕاگەیاندنی ووشەی خودا لەشارەکانیان.

[2]کاتێ یەحیا لەبەندیخانەدا ئەو کارانەی عیسای بیست، هەندێ لەقوتابیەکانی ناردە لای، [3]لێیان پرسی: (ئایا تۆی ئەوەی کە دێ، یان چاوەڕێی یەکێکی دیکە بکەین؟) [4] عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (بڕۆن، ئەوەی بیستوتانەو بینیوتانە بەیەحیای بڵێن: [5]کوێرەکان دەبینن، گۆجەکان بەڕێکی دەڕۆن، گەڕوگولان پاك دەبنەوە، کەڕان دەبیستن، مردووان زیندوو دەبنەوەو هەژاران مزگێنیان پێ دەدرێ. [6]خۆزگە دەخوازرێ بەوانەی گومانم لێ ناکەن.) [7]دوا بەدوای ڕۆیشتنی قوتابیەکانی یەحیا، عیسا دەستی کرد بەقسەکردن لەبارەی یەحیاوە بۆ خەڵکەکە، ووتی: (بۆ بینینی چی چوونە بیابان؟ بۆ بینینی قامیشێك کە با دەیجوڵێنێتەوە؟ [8]ئەی بۆ بینینی چی چوون؟ بۆ بینینی مرۆڤێك کە بەرگی نایابی لەبەربێ؟ ئەوەتان ئەوانەی بەرگی نایاب لەبەردەکەن، وان لەکۆشکی پادشاکان. [9]ئەی بۆچی چوونە دەرەوە؟ بۆ بینینی پێغەمبەرێك؟ بەڵێ من پێتان دەڵێم، بەڵکو مەزنتر لەپێغەمبەر.) [10]ئەمە ئەوەیە کە دەربارەی نووسراوە: { ئەوەتا من نێرراوی خۆم لەپێشتەوە دەنێرم ئەوەی ڕێگات بۆ ئامادە دەکات. } [11]ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: لەنێو ئەوانەی لەژن لەدایك بوون، نییە مەزنتر لەیەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێش، بەڵام بچووکترینی ئەوانەی لەپادشاهێتی ئاسمانن، لەو مەزنترە. [12]لەڕۆژانی یەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێشەوە تا ئێستا پادشاهێتی ئاسمان پێشکەوتنێکی بەهێز پێش دەکەوێ، هەرچەندە بەهێزەکان هەوڵی ڕاگرتنی دەدەن. [13] شەریعەتو هەموو پێغەمبەران، تاهاتنی یەحیا پێشبینییان کردووە. [14] ئەگەر بڕوا دەکەن، ئەم یەحیایە ئەو

ئەلیاسـەیە* کـە چاوەڕێی گەڕانەوەی دەکرێـت. [15]ئـەوەی گویـیێ هەیە بۆ گوێ گرتن باگوێ بگرێ!

([16]ئـەم نەوەیـە لـەچـی دەکەن؟ لەو منداڵانە دەکەن کـە لـەگۆڕەپانی بـــازاڕە دانیشـــتوونو بـــانگی هاوڕێکانـــیان دەکـــەنو دەڵـــێن: [17]زوڕنامـــان بـــۆ لـــێدان کەچـــی هەڵنەپەڕین، شینمان بۆ کردن کەچی سـنگتان نـەکوتیو لـەخۆتان نەدا. [18]یەحیا هات چونکە ناخواو ناخواتەوە، ووتیان: (ڕۆحی پیسی تیایە.) [19]ئینجا ڕۆڵـــەی مـــرۆڤ هـــات، دەخـــواو دەخواتـەوە ووتـیان: (ئەمـە پیاوێکی زۆرخـۆرو مەستە، هاوڕێی باجگرانو گوناهـبارانە.) بـەڵام ڕاستی دانایی بە بەرووبوومی دەردەکەوێ.)

**شارە گوناهبارەکان**

[20]ئیـنجا عیسـا دەسـتی کـرد بەسەرزەنشت کردنی ئەو شارانەی کە زۆربـــەی نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانی تـیا نوانـدبوون، چـونکـە هێشـتا تـۆبـەیان نەکردبوو، [21]ووتی: (خاك بەسـەرت ئـەی کورزیـن، خـاك بەسـەرت ئەی بەیتسەیدا، ئەو کارە سەرسوڕهێنەرانەی لای ئێوە کرا گەر لـەسـورو سـەیدا بکرایە دانیشتوانی هـەر لـەزووەوە تۆبـەیان دەکـردو خۆیـان لـەخۆڵەمـێش دەگەوزاند. [22]بـەڵام پێـتان دەڵـێم: دۆخـی سـورو سـەیدا لـەڕۆژی لێپرسینەوەدا باشتر دەبـێ لـەدۆخی ئـێوە. [23]تـۆش ئەی کەفـەرناحومی بەرزبووەوە تا ئاسمان؟ دەخرێـتە خـوارەوە تـا بنی دۆزەخ، گـەر لەشـاری سەدومدا ئەوە بکرایە کـە لای تـۆ کـراوە، شـارەکە هـەتا ئەمرۆ دەمایەوە. [24]بەڵام پێت دەڵێم: دۆخی سەدوم لەڕۆژی لـێپرسینەوە باشترە لە تۆ.)

**وەرن بۆ لام، من دەتـان حەسێنمەوە**

[25]عیسـا بـەردەوام بـوو لەسـەر قسـەکانیو ووتی: (سوپاست دەکەم ئـەی بـاوك، خوداوەنـدی ئاسمـانو زەوی، چـــونکە ئـــەم کارانـــەت لـــەداناکان شـاردۆتەوەو ئاشـکرات کـردووە بـۆ مـنداڵان. [26]بەڵێ، ئەی بـاوك، ئەمـە خواستی تۆیە. [27]باوکم هـــەموو شـتێکی پـیێ ســـپاردوم، کـــەس ڕۆڵـە ناناسـیێ بـاوك نەبێ، کەسـیش بـاوك ناناسیێ تەنها ڕۆڵەو ئەو کـەسـانە نـەبێ کە ڕۆڵە دەیەوێ بۆیـانی دەربخـات. [28]وەرن بـــۆ لام

ئەی هەموو ماندووانو بارگرانەکان، من دەتان حەسێنمەوە. [29]نیری من هەڵگرنو لەمنەوە فێربن، چونکە من هێمنو دڵنەرمم. ئەوسا حەسانەوە دەدۆزنەوە بۆ دەروونتان. [30]چونکە نیرەکەم سووکەو بارم ئاسانە.)

### گەورەی ڕۆژی شەممە

## 12

لەڕۆژی شەممەدا، کاتێ عیسا بەنێوان دەغڵەکاندا تێدەپەڕی، قوتابیەکانی برسییان بوو، دەستیان کرد بەگوڵەگەنم پرواندنو خواردنی. [2]کەفەریسیەکان ئەمەیان بینی پێیان ووت: (ئەوەتا قوتابیەکانت کارێك دەکەن لەشەممەدا* دروست نییە.) [3]عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (ئەی نەتان خوێندۆتەوە کە داودو ئەوانەی لەگەڵی بوون چیان کرد، کاتێ برسییان بوو؟ [4]چۆن چوونە ماڵی خوداو نانی قوربانیان* خوارد، ئەو نانەی دروست نەبوو بخورێ، نەلەلایەن ئەوەوە، نەلەلایەن ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون، تەنها بۆ کاهینەکان* نەبێ. [5]ئایا نەتان خوێندۆتەوە لەتەوراتدا کە کاهینەکان لەڕۆژی شەمموان لەپەرستگا یاسای شەممە دەشکێنن کەچی بەتاوانباریش دانانرێن؟ [6]بەڵام من پێتان دەڵێم، یەکێك لێرەیە مەزنترە لەپەرستگا. [7]ئەگەر مانای ووتەکان تێبگەیشتنایە: {من داوای بەزەیی دەکەم نەك قوربانی}، ئەوا حوکمتان نەدەدا بەسەر ئەوانەی بێتاوانن. [8]چونکە ڕۆڵەی مرۆڤ گەورەی ڕۆژی شەممەیە.)

### چاکردنەوەی نەخۆش لەشەممە

[9]ئینجا عیسا لەوێ ڕۆیشتو چووە کەنیشتەکەیان، [10]لەوێ پیاوێکی لێبوو دەستێکی ووشك بوو، فەریسیەکان دەیانوویست عیسا تاوانبار بکەن، بۆیە لێیان پرسی: (ئایا چاکردنەوەی نەخۆش لەڕۆژانی شەممە دروستە؟) [11]عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (کێ لەئێوە گەر مەڕێکی هەبێتو مەڕەکەی لەڕۆژی شەممەدا بکەوێتە ناو چاڵێکەوە، ناچێ دەری بهێنێت؟ [12]باشە! مرۆڤ زۆر لەمەڕ بەنرختر نییە؟ کەواتە لەڕۆژانی شەممەدا کاری باش دروستە.) [13]ئینجا بەپیاوەکەی ووت: (دەستت درێژکە.) ئەویش دەستی درێژ کردو

دەستی چاك بووەوەو وەك دەستەكەی دیكەی لێهات.

**خزمەتكاری هەڵبژێردراو**

[14] بەڵام فەریسیەكان چوونە دەرەوەو تەگبیریان كرد چۆن لەناویبەن. [15] عیساش بەمەی زانیو لەوێ ڕۆیشت، خەڵكێكی زۆر دوای كەوتن، هەموو ئەوانەی نەخۆش بوون چاكی كردنەوە. [16] بەڵام ئاگاداری كردن لای كەس باسی نەكەن، [17] تا ئەوەی لەسەر زمانی ئەشعیا پێغەمبەر ووتراوە بێتەدی كە دەڵێ: [18] {ئا ئەوەتا ئەو خزمەتكارەی هەڵمبژاردووە، ئەو خۆشەویستەی پێی دڵشادم، ڕۆحی خۆمی تیا دادەنێم، تا بەهەموو میللەتان دادپەروەریم ڕابگەیەنێ. [19] شەڕ ناكاتو هاوار ناكات، كەس دەنگی نابیستێ لەشەقامەكان. [20] قامیشێكی كوتراوەو ناشكێ، پلیتەیەكی گڕدارەو ناكوژێنێتەوە، هەتا دادپەروەری بەسەركەوتن دەگەیێنێ. [21] هیوای میللەتان لەسەر ناوی ئەو دەبێ.}

**عیساو سەرۆكی ڕوحە پیسەكان**

[22] ئینجا پیاوێكی لاڵو كوێریان بۆ هێنا ڕۆحی پیسی تیابوو، ئەویش چاكی كردەوە بەجۆرێ دەیتوانی ببینێتو گفتوگۆ بكات. [23] خەڵكەكە هەموو سەرسام بوونو ووتیان: (ئایا ئەمە ڕۆڵەی داود نییە؟) [24] بەڵام فەریسیەكان كە ئەمەیان بیست ووتیان: (ئەو ڕۆحی پیس دەرناكات مەگەر بە بەعلەزبولی سەرۆكی ڕۆحە پیسەكان نەبێت.) [25] عیسا بەبیركردنەوەی ئەوانی زانی، ووتی: (هەر پادشایەتیەك دووبەرەكی تیابێت، وێران دەبێت، هەر شارو ماڵێك دووبەرەكی تیابێت، خۆی ڕاناگرێ. [26] ئەگەر شەیتان، شەیتان دەربكات، ئەوا دوو بەشنو دووبەرەكیان تیایە، كەواتە چۆن پادشایەتیەكەی خۆی ڕادەگرێ؟ [27] ئەگەر من بەبەعلەزبول ڕۆحی پیس دەردەكەم، ئەی ڕۆڵەكانتان بەكێ دەریاندەكەن؟ بۆیە ئەوان حوكم دەدەن بەسەرتان. [28] بەڵام ئەگەر من بەڕۆحی خودا ڕۆحی پیس دەربكەم، ئەوا پادشاهێتی خودا دەچەسپێ بەسەرتان. [29] ئەگینا چۆن یەكێ دەتوانێ بچێتە ماڵی كابرایەكی

بەهێزو شتەکانی تالآن بکات، گەر یەکەم جار نەیبەستێتەوە، ئینجا ماڵەکەی تالآن بکات؟ [30]ئەوەی لەگەڵم نییە دژمە، ئەوەش لەگەڵما کۆناکاتەوە، بلاٌوی دەکاتەوە.

[31]لەبەرئەوە پێتان دەڵێم: هەموو گوناەو کفرکردنێکی مرۆڤ دەبەخشرێ تەنها کفرکردن بەرامبەر بەرۆحی پیرۆز نەبێ نابەخشرێ، [32]ئەوەی ووشەیەك دژی رۆڵەی مرۆڤ بلێت دەبەخشرێ. بەلاٌم ئەوەی ووشەیەك دژی رۆحی پیرۆز بلێت نابەخشرێ، نەلەم زەمانەداو نە لە زەمانی ئایندە.

**دار بەبەرووبوومی دەناسرێ**

[33](وابکەن دار باش بێت، بەرووبوومی باش دەدات. یاخود وابکەن دار خراپ بێت، بەرووبوومی خراپ دەدات، چونکە دار بەبەرووبومی دەناسرێ. [34]ئەی بێچوە ماران، چۆن دەتوانن بەچاکی بدوێن، کە خۆتان خراپ بن؟ دەم ئەوە دەڵێ کە لەدڵ هەڵدەقولێ. [35]مرۆڤی چاك، لەگەنجینەی چاکی ناو دڵی شتی چاك دەردەهێنێ، مرۆڤی بەدیش، لەگەنجینەی بەد، شتی بەد دەردەهێنێ. [36]بەلاٌم من پێتان دەڵێم: هەر ووشەیەکی پووچ کە خەڵکی پێی دەدوێ لەرۆژی لێپرسینەوەدا، لێپرسینەوەی خۆی هەیە. [37]چونکە بەووشەکانی خۆت بێتاوان دەبی، هەروەها بەووشەکانی خۆت تاوانبار دەکرێی.)

**نیشانەی یونس پێغەمبەر**

[38]ئینجا هەندێ لەمامۆستایانی شەریعەتو فەریسیەکان ووتیان: (ئەی مامۆستا، دەمانەوێ نیشانەیەکت لێ ببینین.) [39]عیسا وەلاٌمی دانەوە: (نەوەیەکی بەدکارو بەدرەوشت داوای نیشانە دەکەن، نیشانە نادرێ، تەنها نیشانەی یونس* پێغەمبەر نەبێ. [40]چۆن یونس سێ رۆژو سێ شەو لەناو سکی نەهەنگدا بوو، ئاواش رۆڵەی مرۆڤ سێ رۆژو سێ شەو لەناو دڵی زەویدا دەمێنێتەوە. [41]دانیشتوانی نەینەوا

---

*شاژنی باشوور: مەبەست شاژنە بەلقیسە کە فەرمانڕەوای یەمەن بوو لەسەردەمی حەزرەتی سلێمان.

لەرۆژی لێپرسینەوە، ڕادەوەستن بەرامبەر ئەم نەوەیەو تاوانباریان دەکەن، چونکە تۆبەیان کرد کاتێ یونس ووشەی خودای پێڕاگەیاندن. ئەوەتا لەیونس مەزنتر لێرەیە. [42] شاژنی باشوور* لەرۆژی لێپرسینەوەدا لەگەڵ ئەم نەوەیە ڕادەوەستێو تاوانباری دەکات، لەبەرئەوەی لەوپەڕی زەمینەوە هات بۆ گوێگرتن لەداناییەکانی سلێمان. ئەوەتا لەسلێمان مەزنتر لێرەیە.

**گەڕانەوەی ڕۆحی پیس بۆ لەش**

[43](کە ڕۆحی پیس لەمرۆڤێك چووە دەرەوە، سەرگەردانی پەیداکردنی جێی حەوانەوە دەبێت لەبیابانی ووشکی بێئاو، بەلاّم نایدۆزێتەوە. [44]ئینجا دەڵێ: با بگەڕێمەوە بۆ ئەو ماڵەی بەجێم هێشت، کە دەگەڕێتەوە دەبینێ چۆڵە، گسك دراوەو جوان کراوە. [45]ئەوسا دەڕوات، لەگەڵ خۆی حەوت ڕۆحی خراپتر دەهێنێو هەموویان دەچنە ناو ئەو مرۆڤەوە. ئیتر داهاتووی ئەو مرۆڤە لەجاران خراپتر دەبێت. ئەم نەوە بەدکارەش، ئاوهای بەسەر دێت.) [46]لەوکاتەدا کە عیسا قسەی بۆ خەڵکەکە دەکرد، دایكو خوشكو براکانی لەدەرەوە ڕاوەستا بوون، داوایان دەکرد لەگەڵی بدوێن. [47]یەکێك لەئامادەبووان پێی ووت: (ئەوە دایکتوخوشكو براکانتە لەدەرەوە ڕاوەستاون، دەیانەوێ لەگەڵت بدوێن.) [48]وەلاّمی دایەوە ووتی: (دایکم کێیەو خوشكو براکانم کێن؟) [49]ئینجا دەستی بۆ قوتابیەکانی ڕاکێشاو ووتی: (ئەمانەن دایكو براکانم، [50]ئەوەی کاربکات بەخواستی ئەو باوکەم کە لەئاسمانە، ئەوا ئەو براو خوشكو دایکمە.)

**نموونەی جوتیارێك**

## 13

هەر لەهەمان ڕۆژدا عیسا لەماڵ چووە دەرەوە، لەسەر کەناری دەریا دانیشت. [2]خەڵکێکی زۆر لێی کۆبوونەوە، لەبەر ئەوە چووە ناو بەلەمێك دانیشت، خەڵکەکەش هەمووی لەسەر کەناری دەریاکە بەپێوە ڕاوەستا بوون. [3]بەنموونە لەزۆر بابەت دواو قسەی بۆ کردنو ووتی: (جوتیارێك چووە دەرەوە تۆو بچێنێ. [4]لەوکاتەدا تۆوی دەچاند،

بەشێ لەتۆوەکە کەوتە سەر ڕێگا، باڵندە هاتن و خواردیانن، 5 بەشێکی دیکەشی کەوتە سەر زەویەکی بەردین کە خۆڵەکەی تەنك بوو، خێرا سەریان دەرکرد، چونکە زەویەکە قوڵ نەبوو، 6 بەڵام کە ڕۆژ هەڵهات، ووشك بوون و پڕوکان چونکە ڕەگی تەواویان نەبوو. 7 بەشێکی دیکەشی، کەوتنە نێوان دڕکەوە، کاتێ دڕکەکان سەریان دەرکرد خنکاندیانن. 8 هەندێکیش لەتۆوەکە کەوتە سەر زەوی باش، بەرووبوومیدا. بەشێکی یەك بەسەد بەشێکی دیکەشی یەك بەشەست و یەك بەسی. 9 کێ گوێی هەیە، با گوێ بگرێ!)

**بۆچی عیسا بە نموونە دەدوێ؟**

10 قوتابیەکان هاتنە پێشەوەو پێیان ووت: (بۆچی بەنموونە قسەیان بۆ دەکەیت؟)

11 عیسا وەڵامی دایەوەو ووتی: (لەبەرئەوەی بەئێوە دراوە نهێنی پادشاهێتی ئاسمان بزانن، بەڵام بەوان نەدراوە. 12 چونکە ئەوەی هەیەتی، زیاتری پێ دەدرێ تالێی دەڕژێ، بەڵام ئەوەی نیەتی، ئەوەندەی کە هەیشێتی لێی دەسەنرێتەوە. 13 بەنموونە قسەیان بۆ دەکەم چونکە سەیردەکەن بەڵام نابینن، گوێ دەگرن بەڵام نابیستن و تێناگەن. 14 بەمەش پێشبینی ئەشعیا دەربارەی ئەوان دێتەدی، ئەوەی دەڵێ: { بیستن دەبیستن، بەڵام تێناگەن، سەیرکردن سەیردەکەن، بەڵام نابینن، 15 چونکە دڵی ئەم گەلە بەتەواوی ڕەق بووە، گوێیان قورس بووە بۆ گوێگرتن، چاویان نووقاندوە نەوەك بەچاویان ببینن، بەگوێیان ببیستن، نەوەك بەدڵیان تێ بگەن و بگەڕێنەوە لای من، ئەوسا منیش چاکیان بکەمەوە.} 16 بەڵام ئێوە، خۆزگە دەخوازرێ بەچاوتان چونکە دەبینن، خۆزگە دەخوازرێ بەگوێتان چونکە دەبیستن. 17 ڕاستیتان پێ دەڵێم: زۆر لەپێغەمبەران و پیاوچاکان بەئاواتەوە بوون، ببینن ئەوەی ئێوە دەیبینن، ببیستن ئەوەی ئێوە دەیبیستن بەڵام نەیانبیست و نەیانبینی.

**ڕوونکردنەوەی نموونەکە**

18 (کەواتە گوێبگرن لەواتای نموونەی جوتیارەکە. 19 هەرکەسێ

پەیامی پادشاهێتی ببیستێو تێی نەگات، شەیتان دێتو ئەوەی لەدڵی چاندراوە دەیرفێنێ. ئەمەش ئەوەیە کەکەوتە سەر ڕێگاکە [20]بەڵام ئەوەی لەسەر زەویە بەردینەکە ڕوا، ئەوە ئەوەیە کە ووشەکە دەبیستێو دەست بەجێ بەخۆشیەوە وەری دەگرێ، [21] بەڵام لەناوەڕۆکیدا بێ ڕەگەو بێ بنچینەیە، دەمێنێتەوە تا ماوەیەك، کە تەنگانەو چەوسانەوەی بەسەر هات، لەپێناوی ووشەی خودا، ئەوکاتە دەگۆڕێت. [22]ئەوەش کە لەنێوان دڕکەکاندا ڕوا، ئەوەیە کە گوێ لەووشەکە دەگرێ، بەڵام کاروباری ڕۆژانەو بیری دەوڵەمەندی، ووشەکە دەخنکێنن. ئیتر بەر نادات. [23] ئەوەشیان کە لەسەر زەویە باشەکە ڕوا، ئەوەیە کە ووشەکە دەبیستێو تێدەگات. ئەوەیان بەرووبووم دەدات، یەك بەسەد، یەك بەشەستو یەك بەسی.)

**نموونەی گەنمو زیزانە**

[24]ئینجا نموونەیەکی دیکەی بۆ هێنانەوە، ووتی: (پادشاهێتی ئاسمان* وەك ئەمە وایە، مرۆڤێك تۆوێکی چاك لە کێڵگەکەیدا بچێنێ. [25]کاتی خەوتن، دوژمنەکەی دێتو زیزانە لەنێوان گەنمەکەیدا دەڕوێنێو دەڕوا. [26]کاتێ گەنمەکە بەرز بووەوەو گوڵی گرت، زیزانەکە لەگەڵی دەرکەوت. [27]کۆیلەکانی خاوەن ماڵ هاتنو پێیان ووت: (گەورەم، ئایا لەکێڵگەکەت تۆوی چاکت نەڕواند؟ ئیتر ئەم زیزانەیە لەکوێوە هات؟) [28]وەڵامی دانەوە: (دوژمن ئەمەی کردووە) لێیان پرسی: (گەورەم، دەتەوێ بچین زیزانەکان کۆکەینەوە؟) [29]وەڵامی دانەوە: (نەخێر، نەوەك لەکاتی کۆکردنەوەی زیزانەکەدا، گەنمەکەشی پێوە هەڵکێشن. [30] وازیان لێ بهێنن با هەردووکیان بەیەکەوە پێبگەن، تا کاتی دروێنە، بەدروێنەکەرەکان دەڵێم، یەکەم جار زیزانەکە کۆکەنەوە، بیبەستن بەکۆمەڵ بۆئەوەی بسوتێنرێ بەڵام گەنمەکە بەرن بۆ عەمبارەکەمو لەوێ کۆی بکەنەوە.)

**نموونەی دەنکە خەرتەلە**

[31]هەروەها نموونەیەکی دیکەی بۆ هێنانەوەو ووتی: (پادشاهێتی ئاسمان وەك دەنکە خەرتەلەیەك* وایە، کە یەکێ بیهێنێو لەباخەکەیدا

بیچینیٚ. [32] لەگەڵ ئەوەی بچوکترین تۆوە، کاتیٚ بەرز دەبیٚتەوە دەبیٚتە ڕووەکیٚکی گەورە، تەنانەت باڵندەش دەتوانن لەسەر لقو لاسکەکانی هیٚلانە بکەن.)

**نموونەی هەویرترش**

[33] دیسان نموونەیەکی دیکەی بۆ هیٚنانەوەو ووتی: (پادشاهیٚتی ئاسمان لەهەویرترشیٚك دەکات، ئافرەتیٚك بیهیٚنیٚو تیٚکەڵاوی سیٚ ڕبە ئاردی بکات، تا هەویرەکە هەمووی هەڵ بیٚت.) [34] عیسا بەردەوام ئەم نموونانەی بۆ خەڵکەکە دەهیٚنایەوە کاتیٚ قسەی بۆ دەکردن، هەولیٚ دەدا ووتەکانی بەنموونەوە بن. [35] بەمەش ئەوەی یەکیٚ لەپیٚغەمبەران ووتویەتی هاتەدی: {بە نموونە دەدویٚم تا ئەوەی لەدروستکردنی جیهانەوە شاراوەیە دەریخەم.}

**ڕوونکردنەوەی نموونەی زیزان**

[36] ئینجا عیسا خەڵکەکەی بەڕیٚکردو گەڕایەوە بۆ ماڵ. قوتابیەکانی هاتنە لای، ووتیان: (واتای نموونەی زیزانەی ناو کیٚڵگەکەمان بۆ ڕوون بکەرەوە.) [37] وەڵامی دانەوە: (چیٚنەری تۆوە چاکەکە، ڕۆڵەی مرۆڤە. [38] کیٚڵگەکەش جیهانە. تۆوە چاکەکەش ڕۆڵەکانی پادشاهیٚتین. زیزانەکانیش ڕۆڵەکانی شەیتانن. [39] دوژمنەکەش کە زیزانەکەی چاند شەیتانە. درویٚنەکەش کۆتایی جیهانە. درویٚنەکەرەکانیش فریشتەکانن. [40] هەروەك چۆن زیزانەکە کۆکرایەوەو سوتیٚنرا، لەکۆتایی جیهان هەمان شت ڕوودەدات. [41] ڕۆڵەی مرۆڤ فریشتەکانی دەنیٚریٚت، تا هەموو بەدکارو ئەوانەی خراپەکارن لەپادشاهیٚتیەکەی دەربکەن. [42] ئینجا دەیانخەنە ناو تەنووری گڕدار، جا لەویٚ دەبیٚ بەگریانو چرکە چرکی ددان. [43] ئەوسا ڕاستودروستان لەناو پادشاهیٚتی باوکیان وەك ڕۆژ دەدرەوشیٚنەوە. ئەوەی گویٚی هەیە، با گویٚ بگریٚ!

**نموونەی گەنجینەو مرواری**

[44] (پادشاهیٚتی ئاسمان لەگەنجینەیەك دەکات لەناو کیٚڵگەیەکدا شاردرابیٚتەوە یەکیٚ دەیدۆزیٚتەوەو دیسان دەیشاریٚتەوە

لەوێ، ئینجا لەخۆشیان دەڕوات چی هەیە هەمووی دەفرۆشێو ئەوکێڵگەیەی پێ دەکڕێ. [45] هەروەها پادشاهێتی ئاسمان لەبازرگانێك دەكات دەگەڕێ بەشوێن مرواری چاكو جوان. [46] كاتێ مرواریيەكی زۆر بەنرخ دەبینێ، ئەڕوا هەرچیەكی هەیە دەیفرۆشێو مرواریيەكەی پێ دەكڕێ.

**نموونەی تۆڕ**

([47] هەروەها پادشاهێتی ئاسمان لەتۆڕێك دەكات فڕێدرابێتە دەریاوە، لەهەموو جۆرێ كۆدەكاتەوە. [48] كاتێ پڕدەبێو رادەكێشرێتە كەناری دەریا، ئەوەی باشە كۆی دەكەنەوە لەسەبەتەداو خراپەكانیش فڕێ دەدەن. [49] هەمان شت ڕوودەدا، كاتێ كۆتایی ئەم جیهانە دێت فریشتەكان دێن، بەدكاران دەردەهێنن لەناو ڕاستودروستانداو [50] فڕێیان دەدەنە ناو تەنووری گڕدارەوە. جا لەوێ دەبێ بەگریانو چركەچركی ددان.) [51] عیسا لێی پرسین ئایا ئەمانە هەمووی تێگەیشتن؟ وەڵامیان دایەوە: (بەڵێ.) [52] جا پێی ووتن: (لەبەرئەمە، هەر یەكێ لەمامۆستایانی شەریعەت* بێ بەقوتابی لەپادشاهێتی ئاسمان، لەخاوەن ماڵێك دەچێ لەگەنجینەكەی تازەو كۆن بەیەكەوە دەربهێنێت.) [53] كاتێ عیسا ئەم نموونانەی تەواوكرد لەوێ ڕۆیشت.

**ڕەتكردنەوەی عیسا**

[54] كە گەڕایەوە بۆ شارەكەی خۆی چووە كەنیشتو دەستیكرد بەفێركردنیان، سەرسام بوونو پرسییان: (ئەم هەموو داناییو كارە سەرسوڕهێنەرانەی لەكوێ بوو؟ [55] ئایا ئەمە كوڕی دارتاشەكە نییە؟ دایكی مریەمی ناو نییە؟ یاقوبو یوسفو شەمعونو یەهوزا برای نین؟ [56] ئەوە نییە خوشكەكانی هەمووی لێرە لامانن؟ ئەمانەی هەموو لەكوێ بوو؟ [57] خەڵكەكە لێی بەگومان بوون، بەڵام عیسا پێی ووتن: (هیچ پێغەمبەرێك كەم نرخ نییە، تەنها لەشارو ماڵی خۆی نەبێ.) [58] لەوێ كاری سەرسوڕهێنەری زۆری نەكرد، لەبەر بێ باوەڕیان پێی.

**كوشتنی حەزرەتی یەحیا**

# 14

کـاتیێ هێرۆدسـی پادشـا، ناوبـانگی عیسـای بیست، [2]بەپیاوەکانی ووت: (ئـەوە یەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێشە لـەناو مـردووواندا زیـندووبووەتەوە، بۆیـە کاری وا سەرسوڕهێنەر دەکرێ لەسـەر دەسـتی.) [3]کـاتی خـۆی، هێرۆدس یەحیای گرت، زنجیر بەستی کـردو فـڕێی دایـە نـاو بەندیخانـەوە. ئەمـەش لەبـەر هـێرۆدیای ژنـی فیلۆپسـی برای. [4]چـونکە یەحیا پێی دەووت: (دروسـت نیـیە تـۆ بـراژنەکەت بخـوازی.) [5]ئـەوەبوو هـێرۆدس دەیویسـت یەحیا بکوژێ، بـەلام دەترسـا لـەو خەڵکەی ئەوێ. چـونکە خەڵکەکـە وەك پێغەمبەرێك سـەیری یەحـیایان دەکـرد. [6]بـەلام لـەکاتی ئاهـەنگ گـێڕان، بەبۆنـەی جـەژنی لـەدایك بوونی هێرۆدسەوە، کچـی هـێرۆدیا لەناوەڕاسـتی خەڵکەکە دەستی کرد بەسەماکردن، هـێرۆدس ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو، [7]ئەوەبوو سوێندی بۆ خواردو بەلێنی دایـە، ئـەوەی داوای بکـات بـۆی جێبـەجێ بکـاتو بـیداتێ. [8]کچـە دوای ئـەوەی ڕاوێژی بەدایکی کرد، ووتـی: (لێرە لەسەر سینییەك سەری یەحیام بدەرێ.) [9]هێرۆدس ئەمەی پێ نـاخۆش بـوو، بـەلام لەگـەڵ ئەوەش فـرمانیدا ئـەوەی دەیەوێـت بیدەنێ، چـونکە لەبـەردەمی ئـەو خەڵکـەی لەوێدا بوون سوێندی خواردبوو. [10]بەفـەرمانی ئـەو چـوونە بەندیخانـە، سـەری یەحـیایان بـڕیو [11]لەسـەر سـینییەك پێشکەشی کچەکەیان کرد، ئـەویش وەری گرتو بۆ لای دایکی بـرد. [12]لەدوایـیدا قوتابیەکانی یەحیا هاتن لاشەکەیان هەڵگرتو ناشتیان. ئینجا بۆ لای عیسا چوونو هەواڵیان دایە.

### تێربوونی پێنج هەزارکەس

[13]کە عیسا ئەمەی بیست بە تەنها سـواری بەلەمـێك بـوو، چـوو بـۆ جـێگایەکی چـۆڵەوانی. بـەلام کاتێ خەڵکەکـە ئەمـەیان بیسـت، هـەموو لەشـارەکانەوە بـەپێ بۆ لای چوون. [14]کاتێ عیسا گەیشتە کەناری دەریا، خەڵکـێکی زۆری بـینی. بـەزەیی پیاهاتـنەوەو نەخۆشـەکانی چاككردنەوە. [15]کاتێ ئێوارە داهات، قوتابـیەکانی هـاتنو ووتـیان: (ئـەم شـوێنە چـۆڵەوانیەو کاتیش درەنگە، خەڵکەکـە بەڕێکـە بـا بـڕۆن بـۆ

لادێکانو خواردن بۆ خۆیان بکڕن.) [16] بەڵام عیسا پێی ووتن: (پێویست ناکات بڕۆن، ئێوە نانیان بدەنێ بابیخۆن.) [17] ئەوانیش ووتیان: (لەپێنج نانو دوو ماسی زیاترمان نییە.) [18] عیسا ووتی: (بیهێنن بۆم بۆ ئێرە.) [19] دوایی عیسا فەرمانی بەخەڵکەکەدا هەموو لەسەرگیا دانیشن. ئینجا پێنج نانەکەو دوو ماسییەکەی هەڵگرتو سەری هەڵبڕی بۆ ئاسمانو سوپاسی کردو لەتی کرد، ئەوسا دای بەقوتابییەکان، ئەوانیش دابەشیان کرد بەسەر خەڵکەکەدا. [20] هەموو نانیان خواردو تێر بوون، هەر لەو پارچە نانانەی لێیان مایەوە، دوانزە سەبەتەیان پڕکرد. [21] ژمارەی ئەوانەی کەنانیان خوارد، پێنج هەزار پیاو بوون، بێجگە لەژنو منداڵ.

**عیسا بەسەر ئاودا دەڕوات**

[22] دوای ئەمە فەرمانیدا بەقوتابیەکانی سواری بەلەمەکە بنو بڕۆن بۆ ئەوبەری دەریاچەکە، تا ئەو خەڵکەکە بەڕێ بکات. [23] دوای ئەوەی خەڵکەکەی بەڕێ کرد، سەرکەوتە سەر شاخێك بۆ ئەوەی بەتەنها نوێژ بکات، کاتێ ئێوارە داهات، لەوێ بەتەنهابوو، [24] بەڵەمی قوتابیەکانیش گەیشتبووە ناوەڕاستی دەریاچەکە، شەپۆڵی ئاوەکە پیایدا دەکێشا، چونکە ڕەشەبا بەپێچەوانەی بەلەمەکە بوو. [25] لەبەرەبەیاندا عیسا بۆ لایان هات، بەسەر دەریاچەکەدا بەپێ دەڕۆیشت. [26] کاتێ قوتابییەکان ئەمەیان دی، ترسانو ووتیان: (ئەمە خێوە.) ئینجا لەترسا دەستیان کرد بەهاوارکردن. [27] دەستبەجێ عیسا پێی ووتن: (وورەتان بەرز بێ، ئەوە منم، مەترسن.) [28] پەترۆس ووتی: (گەورەم، گەر تۆی، فەرمانم پێ بدە بەسەر ئاوەکەدا بەپێ بێم بۆ لات.) [29] عیسا پێی ووت: (وەرە)، پەترۆس لە بەلەمەکە دابەزیو بەسەر ئاوەکە بەپێ بەرەو لای عیسا ڕۆیشت. [30] بەڵام کاتێ توندی بایەکەی بینی، ترساو ڕۆچوو، هاواری کرد: (گەورەم ڕزگارم کە.) [31] عیسا دەست بەجێ دەستی درێژکردو گرتیو پێی ووت: (ئەی کەم باوەڕ، بۆچی گومانت کرد؟) [32] کەسەرکەوتنە سەر بەلەمەکە، ڕەشەباکە هێمن بوو. [33] ئەوانەی لەسەر بەلەمەکە بوون، هاتنە پێشەوە

کڕنوشیان بۆ عیسا بردو ووتیان: (بەڕاستی تۆ ڕۆڵەی خودای.)
[34]کاتێ پەڕینەوە بۆ ئەوبەر، لەشاری جەنیسارەت هاتنە خوارەوە. [35]خەڵکی ئەو دەوروپشتە ناسیانەوە، هەواڵیان نارد بۆ ناوچەکانی دیکە، چی نەخۆشیان هەبوو هێنایان بۆ لای. [36]داوایان لێ کرد ڕێیان بدات، هیچ نەبێ دەست لەچمکی جلەکانی بدەن. جا هەموو ئەوانەی دەستیان لێ دا، چاك بوونەوە.

## سەرپێچی کردنی ڕاسپاردەی خودا

# 15

ئینجا چەند کەسێك لەمامۆستایانی شەریعەتو فەریسیەکان لەقودسەوە هاتنە لای عیساو لێیان پرسی: [2](بۆچی قوتابیەکانت سەرپێچی خووڕەوشتی پیران دەکەن، پێش نانخواردن دەستیان ناشۆن؟) [3]عیسا لەوەڵامدا ووتی: (باشە ئەی بۆچی ئێوە سەرپێچی ڕاسپاردەی خودا دەکەن، لەپێناوی پارێزگاری کردنی دابو نەریتتان؟ [4]خودا ڕای سپاردووەو دەڵێ: {ڕێزی باوكو دایكت بگرە. ئەوەی قسەی خراپ بەباوكو دایكی بڵێ، باچارەنووسی مردن بێت.} [5]بەڵام ئێوە دەڵێن: گەر یەکێ ناوی قوربانی بهێنێت، لەو شتانەی کە دەیبەخشێ بە دایكو باوکی، ئیتر ئازادە لەڕێزگرتنیان. [6]ئێوە بەمە لەپێناوی خووڕەوشتتان، ووشەی خودا دەشکێنن. [7]ئەی دووڕووەکان، ئەشعیای پێغەمبەر ڕاستی پێشبینی کردووە سەبارەت بەئێوە کاتێ ووتویەتی: [8]{ڕێزی ئەم گەلە بۆ من هەر بەدەمە، بەڵام دڵیان زۆر لێمەوە دوورە. [9]بێ سوودە پەرستنیان بۆ من لەکاتێکدا ئەوان شتێ فێری خەڵکی دەکەن لە مرۆڤەوەیە.})

## ئەوەی مرۆڤ گڵاو دەکات

[10]ئینجا خەڵکەکەی هەموو بانگکردو پێی ووتن: (گوێ بگرنو تێبگەن. [11]ئەوەی دەچێتە ناو دەمەوە، مرۆڤ گڵاو ناکات، بەڵکو ئەوەی لەدەم دێتە دەرەوە، ئەوە مرۆڤ گڵاو دەکات.) [12]دوایی قوتابیەکانی هاتنە پێشەوەو پێیان ووت: (دەزانی فەریسیەکان کاتێ گوێیان لەم قسەیە بوو زۆر بێزار بوون.) [13]وەڵامی دانەوە: (هەر ڕووەکێك باوکی

ئاسمانیم نەیچاندبێت، هەڵدەکەنرێ. [14]وازیان لێبهێنن، ئەوانە کوێرن دەیانەوێ ڕێگا پیشانی کوێر بدەن، گەر بێتو کوێر ڕێگا پیشانی کوێر بدات، هەردووکیان بەیەکەوە دەکەونە چاڵەوە.) [15]پەترۆس پێی ووت: (ئەم نموونەیەمان بۆ ڕوونبکەوە.) [16]عیسا لێی پرسین: (ئایا ئێوەش هێشتا تێ ناگەن؟ [17]نازانن ئەو خواردنەی دەچێتە ناو دەمەوە، دەڕواتە ناو سكو دوایی فڕێ دەدرێتە دەرەوە؟ [18]بەڵام ئەوەی لەدەم دێتە دەرەوە، لەدڵەوەیەو ئەوەیە مرۆڤ گڵاو دەکات. [19]چونکە بیری خراپ لەدڵەوە هەڵدەقوڵێ بۆ دەرەوە، وەك: کوشتن، داوێن پیسی، بەدڕەوشتی، دزی، شایەتی درۆ، کفرکردن. [20]ئائەمانە مرۆڤ گڵاو دەکەن. بەڵام خواردن بەبێ دەست شوشتن، مرۆڤ گڵاو ناکات.)

**باوەڕی ژنێکی کەنعانی**

[21]دوای ئەمە عیسا ئەو ناوچەیەی بەجێ هێشتو چوو بۆ دەوروپشتی سورو سەیدا. [22]ژنێکی کەنعانی خەڵکی ئەو دەوروپشتە بوو، لەعیسا هاتە پێشەوەو هاواری کرد: (گەورەم، ئەی ڕۆڵەی داود، بەزەییت پێمدا بێتەوە، کچەکەم بەشێوەیەکی زۆر خراپ ڕۆحی پیسی تیایە.) [23]بەڵام عیسا وەڵامی نەدایەوە. قوتابیەکانی هاتن لێی پاڕانەوەو پێیان ووت: (شتێکی بۆ بکە، ئەو بەدوامان هاوار دەکا.) [24]وەڵامی دایەوە: (من تەنها بۆ مەڕە وون بووەکانی ئیسرائیل نێرراوم.) [25]بەڵام ژنەکە لێی نزیك بووەوە، کڕنۆشی بۆ بردو ووتی: (گەورەم یارمەتیم بدە.) [26]عیسا وەڵامی دایەوە: (ناشێ نانی منداڵان ببرێو فڕێ بدرێ بۆ سەگ.) [27]ژنەکە ووتی: (ڕاستە گەورەم، بەڵام سەگیش ئەوە دەخوات کە لەسەر مێزی گەورەکانی دەکەوێتە خوارەوە.) [28]ئینجا عیسا ووتی: (خوشکە، باوەڕی تۆ مەزنە، ئەوەی داوای دەکەیت با بۆت بێت.) ئەوەبوو کچەکەی دەستبەجێ چاك بووەوە.

**نان‌دانی چوار هەزار کەس**

[29]ئینجا عیسا لەو ناوچەیە ڕۆیشت بەرەو دەریای جەلیل، سەرکەوتە سەر شاخێكو دانیشت.

[30]ئەوەبوو خەڵکێکی زۆر هاتنە لای، ئیفلیجو گۆجو کوێرو لاڵو زۆر نەخۆشی کەیان لەگەڵ بوو، لەبەرپێیدا دایانـنان، ئەویش چاکی کردنەوە. [31] کاتێ خەڵکی بینیان لاڵ قسە دەکا، ئیفلیج چاك دەبێتەوە، گۆج بەڕێکی دەڕوا، کوێر دەبینێ، سەریان سوڕماو ستایشی خودای ئیسرائیلیان کرد. [32]عیسا قوتابیەکانی بانگکردە لای خۆیو ووتی: (من بەزەیـیم بەو خەڵکەدا دێتەوە، ئەوە ماوەی سێ ڕۆژە لەگەڵمدانو هیچیان نییە بیخۆن، ناشمەوێ بەبرسێتی بیان نێرمەوە، نەوەك لەڕێگا بڕنەکەن.) [33]قوتابیەکان ووتیان: (لەکوێمان بوو لەم چۆڵەوانیەدا، ئەو نانە زۆرەی بەشی ئەم هەموو خەڵکە بکات؟) [34]عیسا لێی پرسین: (چەند نانتان لایە؟) وەڵامیان دایەوە: (حەوت، لەگەڵ چەند ماسییەکی بچکۆلە.) [35]ئەوەبوو عیسا فەرمانیدا بەهەمووان تا لەسەر زەوی دانیشن. [36]ئینجا ماسیەکانو حەوت نانەکەی بەرزکردەوەو سوپاسی خودای کرد، لەتی کردنو دای بەقوتابییەکان، تا بەسەر هەمووان دابەشی کەن. [37]بەمە هەموو نانیان خوارد تا تێربوون، دوایی حەوت سەبەتەی پڕ لەتە نانیان کۆکردەوە. [38]ژمارەی نان خۆران چوار هەزار پیاو بوون، بێجگە لەژنو منداڵ. [39] ئینجا عیسا خەڵکەکەی بەرێکردو سواری بەلەم بوو چوو بۆ ناوچەی مەجەدان.

### داواکردنی نیشانەی ئاسمانی

## 16

هەندێ لەفەریسیەکانو سەدوقیەکان هاتن بۆ لای عیسا بۆ ئەوەی تاقیبکەنەوە، داوایان لێ کرد نیشانەیەکی ئاسمانیان پیشان بدات. [2] لەوەڵامدا پێی ووتن: (ئەگەر لەکاتی ئێواران ئاسمان سووربێ، دەڵێن بەیانی هەتاو دەبێت. [3]ئەگەر لەبەیانیش ئاسمان سوورو ڕووگرژ بوو، دەڵێن، ئەمڕۆ باران دەبێت، ئەی دووڕووەکان، ئێوە لەڕووی ئاسمانەوە دەزانن ئاو و هەوا بخوێننەوە، بەڵام نیشانەکانی زەمانە نازانن بخوێننەوە. [4] نەوەیەکی بەدکارو بەدڕەوشت داوای نیشانە دەکات، هیچ نیشانەیەکی پێ نادرێ، تەنها نیشانەی یونس پێغەمبەر نەبێت)، ئینجا لەوێ ڕۆیشتو ئەوێی بەجێهێشت.

[5]کاتێ گەیشتنە ئەوبەری دەریاچەکە، قوتابیەکان بیریان چووبوو نان لەگەڵ خۆیان بهێنن. [6] عیسا پێی ووتن: (ووریابن ئاگاداری هەویرترشی فەریسیەکانو سەدوقیەکان بن.) [7]قوتابییەکان لەدڵی خۆیان بیریان کردەوەو ووتیان: (ئەوە بۆیە وادەڵێ، چونکە ئێمە نانمان لەگەڵ خۆمان نەهێناوە.) [8]عیسا بەمەی زانیو پێیانی ووت: (ئەی کەم باوەڕینە، بۆچی لەنێوان خۆتان بیر لەوە دەکەنەوە نانتان نەهێناوە؟ [9]ئایا هێشتا تێنەگەیشتون؟ بیرتان چووەوە پێنج نانەکەی پێنج هەزار کەسی پێ تێر بوو چەند سەبەتەیەکیشی لێ مایەوە؟ [10]حەوت نانەکەتان بیر چووەوە چوار هەزار کەسی تێرکردو چەند سەبەتەکیشی لێمایەوە؟ [11] تێناگەن من مەبەستم نان نەبوو کاتێ ووتم: ئاگاداری هەویرترشی فەریسیەکانو سەدوقیەکان بن!) [12] ئینجا قوتابیەکان تێگەیشتن کەئەو ئاگاداریان ناکاتەوە لەهەویرترشی نان، بەڵکو ئاگاداریان دەکاتەوە لەفێرکردنی فەریسیەکانو سەدوقیەکان.

**دان پیانانی پەترۆس بەمەسیح**

[13]کاتێ عیسا گەیشتە ناوچەی قەیسەری فیلیپۆس، لەقوتابیەکانی پرسی: (بەبیرو ڕای خەڵکی ڕۆڵەی مرۆڤ* کێیە؟) [14]وەڵامیان دایەوە: (بەشێ لەخەڵکی دەڵێن، یەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێش، بەشێکی دیکەش دەڵێن، ئەلیاس پێغەمبەر بەشێکی تریش بەئێرمیا یان بەیەکێ لەپێغەمبەرانی دادەنێن.) [15]ئینجا لێی پرسین: (ئەی ئێوە، دەڵێن من کێم؟) [16]پەترۆس کەشەمعونیشی پێ دەووترا، وەڵامی دایەوە، ووتی: (تۆ مەسیحی، ڕۆڵەی خودای زیندووی.) [17]جا عیسا پێی ووت: (خۆزگەت پێدەخوازرێ، ئەی شەمعونی کوڕی یۆنا، ئەم زانینە لەگۆشتو خوێنەوە نییە. بەڵکو لەو باوکەمەوەیە کە لەئاسمانە. [18]منیش پێت دەڵێم، تۆ پەترۆسیو لەسەر ئەم بەردە کۆمەڵەی خۆم دروست دەکەمو هێزەکانی مردنیش پێی ناوێرێت. [19]کلیلی پادشاهێتی ئاسمانت دەدەمێ، ئەوەی دایدەخەیت لەسەر زەوی، داخراو دەبێت لەئاسمان، ئەوەی دەیکەیتەوە لەسەر زەوی، کراوە دەبێت لەئاسمان.) [20]

ئینجا قوتابییەکانی ئاگادارکردەوە جارێ بەکەس نەڵێن کە ئەو مەسیحە.

## یەکەم باسی مردنی عیسا

[21] ئیتر عیسا لەو کاتەوە دەستی کرد بەڕوونکردنەوە بۆ قوتابییەکانی سەبارەت بەوەی کە دەبێت بڕوات بۆ قودس، لەوێ ئازار بدرێ بەدەستی پیران* و سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت، ئینجا بکوژرێو لەڕۆژی سێهەمدا زیندووبێتەوە. [22] پەترۆس عیسای هێنایە ئەم لاوەو سەرزەنشتی کردو پێی ووت: (خوا نەکات گەورەم، هەرگیز ئەمەت بەسەر نەیەت.) [23] عیسا ئاوڕی دایەوەو بە پەترۆسی ووت: (وون بە لەبەرچاوم ئەی شەیتان، ئێستا تۆ کۆسپی لەبەردەمم، چونکە تۆ هێشتا بیرت لای کاروباری خودانییە، بەڵکو لای کاروباری مرۆڤە.)

## خۆئامادەکردن بۆ مردن

[24] ئینجا عیسا بەقوتابییەکانی ووت: (ئەوەی دەیەوێ بەدوامەوە بڕوات، با واز لەخۆی بهێنێت و خاچی خۆی هەڵگرێو دوام کەوێت. [25] چونکە ئەوەی بیەوێ ژیانی ڕزگار بکات، ژیان دەدۆڕێنێت، بەڵام ئەوەی ژیانی خۆی بدۆڕێنێت لەپێناوی من، ژیانی ڕزگار دەکات. [26] چونکە چی بەکەڵکی مرۆڤ دێت گەر هەموو جیهان بەرێتەوەو خۆی بدۆڕێنێت؟ یاخود مرۆڤ بۆ کڕینەوەی ژیانی خۆی چی پێشکەش دەکات. [27] ڕۆڵەی مرۆڤ بەشکۆی باوکیەوە لەگەڵ فریشتەکان دەگەڕێتەوە، ئینجا هەر کەس بەپێی کرداری خۆی، پاداشت وەردەگرێ. [28] ڕاستیتان پێ دەڵێم: هەندێك لەوانەی لێرەدا ڕاوەستاون، مردن نابینن تا هاتنەوەی ڕۆڵەی مرۆڤ نەبینن بە پادشاهێتیەکەیەوە.)

## شێوە گۆڕانی عیسا

17

دوای ئەمە بەشەش ڕۆژ عیسا پەترۆسو یاقوبو یۆحەنای برای یاقوبی لەگەڵ خۆی بردو بەیەکەوە چوونە سەر چیایەکی بەرز. [2] کاتێ لەبەرچاویان بەتەواوی شێوەی گۆڕا، دەموچاوی دەدرەوشایەوە وەك ڕۆژو جلەکانی سپی هەڵگەڕا وەك

ڕووناکی. [3]لەپڕ موساو ئەلیاس دەرکەوتن بۆیانو لەگەڵ عیسادا کەوتنە گفتوگۆ. [4]ئینجا پەترۆس بەعیسای ووت: (گەورەم، شتێکی خۆشە لێرە بمێنینەوە، گەر دەتەوێت سێ چادر هەڵدەدەین یەکێ بۆ تۆو یەکێ بۆ موساو یەکێکیش بۆ ئەلیاس.) [5]لەوکاتەدا پەترۆس ئەمەی دەووت، هەورێکی ڕۆشن باڵی کێشا بەسەریان، دەنگێك لەهەورەکەوە بانگی کرد: (ئا ئەوەتا ڕۆڵەی خۆشەویستم، ئەوەی پێی دڵشادم. گوێی بۆ ڕاگرن.) [6]کاتێ قوتابیەکان گوێیان لەدەنگەکە بوو، لەترسا کەوتن بەدەمدا. [7]بەڵام عیسا لێیان نزیك بووەوەو دەستی لێدانو ووتی: (هەستن، مەترسن.) [8]ئینجا چاویان هەڵبڕی، لەعیسا زیاتر کەسیان نەدی.

[9]کاتێ لەچیاکە دەهاتنە خوارەوە، عیسا فەرمانی پێدان: (ئەمە بەکەس ڕامەگەیەنن، تا ڕۆڵەی مرۆڤ لەناو مردووان هەڵدەستێتەوە.) [10]ئینجا قوتابیەکانی لێیان پرسی: (ئەی باشە بۆچی مامۆستایانی شەریعەت دەڵێن، دەبێ ئەلیاس یەکەمجار بێت؟) [11]عیسا وەڵامی دانەوە ووتی: (ئەمە ڕاستە، ئەلیاس دێتو هەموو شتێ دەخاتەوە شوێنی خۆی. [12]بەڵام پێتان دەڵێم: ئەلیاس هاتو نەیان ناسی، چیان ویست پێیانکرد، هەروەها ڕۆڵەی مرۆڤیش بەدەستیانەوە دەکەوێتە بەر ئازار.) [13]ئەوسا قوتابیەکان تێگەیشتن، عیسا سەبارەت بەیەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێش دەدوێ.

**دەرکردنی ڕۆحی پیس**

[14]کاتێ گەیشتنە لای کۆمەڵە خەڵکەکە، کابرایەك هاتە بەردەمیو لەبەرپێی کەوت، [15]ووتی: (گەورەم، بەزەییت بەم کوڕەم بێتەوە، هەندێ جار فێ دەیگرێتو تووشی ئازارێکی زۆر دەبێت، زۆر جاریش دەکەوێتە ناو ئاگرو ئاوەوە. [16]بردمە لای قوتابیەکانت بەڵام نەیانتوانی چاکیبکەنەوە.) [17]لێرەدا عیسا ووتی: (ئەی نەوەی بێباوەڕو خوار، تاکەی لەگەڵتان بم؟ تاکەی بارتان هەڵگرم؟ ئەو کوڕە بهێنن بۆ لام.) [18]عیسا هەڕەشەی لەو ڕۆحە کرد کە لەکوڕەکەدا بوو، ئەویش لەلەشی هاتە دەرەوە، کوڕە دەستبەجێ چاك بووەوە. [19]دوای ئەمە، قوتابیەکان

بەتەنها لەعیسایان پرسی: (بۆچی ئێمە نەمانتوانی ئەو ڕۆحە پیسە لەو کوڕە دەربکەین؟) [20]وەڵامی دانەوە، ووتی: (لەبەرکەمی باوەڕتان. ڕاستیتان پێ دەڵێم: گەر هێندەی دەنکە خەرتەلەیەك باوەڕتان هەبێت، بەو کێوە دەڵێن لێرە بڕۆ بۆ ئەوێ، دەڕوات‌و هیچ شتێك نییە لەدەستتان یاخی بێت. ﴿[21]بەڵام ئەم جۆرە ڕۆحانە دەرناکرێ، بەنوێژو ڕۆژوو نەبێت.﴾)

**دووەم باسی مردنی عیسا**

[22]کاتێ عیساو قوتابیەکانی بە ناوچەی جەلیلدا دەگەڕان، عیسا بە قوتابیەکانی ووت: (ڕۆڵەی مرۆڤ ئەوەندەی نەماوە بدرێ بەدەستی خەڵکەوە، [23]دەیکوژن‌و لەڕۆژی سێهەمدا زیندوودەبێتەوە.) جا قوتابیەکانی بەمە زۆر دڵگران بوون.

**باجی پەرستگا**

[24]کاتێ گەیشتنە کەفەرناحوم*، باجگرانی پەرستگا هاتنە لای پەترۆس‌و لێیان پرسی: (ئەرێ مامۆستاکەتان باجی پەرستگا نادات؟) [25]ووتی: (بەڵێ، دەیدات.) کە پەترۆس چووەماڵەوە بۆ لای عیسا بۆ ئەوەی لەم بارەیەوە لەگەڵی بدوێ، یەکسەر عیسا لێی پرسی: (ڕات چییە شەمعون؟ پاشایانی سەر زەوی سەرانەو باج لەکێ وەردەگرن لەڕۆڵەی وولاتەکەی خۆیان یاخود لە بێگانە؟) [26]پەترۆس وەڵامی دایەوە: (لەبێگانە.) ئینجا عیسا پێی ووت: (کەواتە هاوولاتیان سەربەستن. [27]بەڵام بۆ ئەوەی تەگەرە نەخەینە ڕێگایانەوە، بڕۆ بۆ دەریاچەکەو تۆڕەکەت هەڵدە، یەکەم ماسی کەدەیگریت، دەمی بکەرەوە، دەبینی چوار درهەمی تیایە، بیهێنەرە دەرەوەو باجی خۆم‌و خۆتی لێ‌بدە.)

**کێ مەزنترینە ؟**

# 18

لەو کاتەدا قوتابیەکان هاتنە لای عیساو لێیان پرسی: (کێ مەزنترینە لەپادشاهێتی ئاسماندا؟) [2]عیسا منداڵێکی بانگکردو لەناوەراستیاندا ڕای‌گرت‌و [3]ووتی: (ڕاستیتان پێ‌بڵێم: گەر نەگۆڕێن‌و وەکو ئەو منداڵەتان لێ‌نەیەت، هەرگیز ناچنە پادشاهێتی ئاسمانەوە. [4]ئەوەی توانی

وەك ئـەم مـنداڵە خـۆی بەسـاكاری ڕاگـــریێ، لەپادشـــاهیتی ئاسمـــاندا بەمەزنترین دادەنریێ. [5]ئەوەی بەناوی مـنەوە پێشـوازی لەمنداڵـێكی وەك ئەمـە بكـات، ئـەوا پێشـوازی لـەمن كـردووە. [6]بەڵام هەر كەسێك یەكێ لــــەوباوەڕدارە بچــــووكـانەی كـەباوەڕیان بەمن هەیە تووشی گوناه بكـات، باشـتر وایـە بـۆی بـەردی دەستار بەملیەوە هەڵواسریێو نوقمی دەریـا بكریێ. [7]قوڕ بەسەر ئەم جیهانە كەوا خەڵكی تووشی گوناه دەكات! تـووش بوونـی گوناهـیش دەبـێ ڕووبـدات، بەڵام قوڕ بەسـەر ئەوەی دەبێـتە هۆی ڕوودانی! [8]گەر دەستت یـاخود قاچـت تووشـی گونـاهی كـردی، بیبڕەو* فڕێیدە، باشتروایە بـێ دەسـت یا بێقاچ بچیتە ژیانەوە، لــەوەی بەدەسـتو قاچـی سـاغەوە بخرێـتە ئاگری هـەتاهـەتاییەوە، [9]گەر چاوت تووشی گوناهیكردی، دەری بهێـنەو فڕێیدە: باشتروایە بەیەك چاو بچیتە ژیانەوە لەوەی بەدوو چاوەوە بخرێیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

**نموونەی مەڕی وونبوو**

([10]ئاگاداربن ڕقتان لـەم باوەڕدارە منداڵانە نەبێت، چونكە فریشتەكانیان لـەئاسمان گشـت كـات ڕووی ئـەو باوكـەم دەبیـنن كـە لەئاسماندایە. [11] ﴿چـونكە ڕۆڵـەی مـرۆڤ، هاتووە بۆ ڕزگاركـردنی وون بووان.﴾ [12]ڕاتان چییە؟ گـەر یەكێك سەد سەر مەڕی هەبێتو دانەیەكی لـیێوون بێت، ئایا نـــەوەدو نۆكـــەی تـــر لەچـــیا بەجیێاهێڵێتو ناگەڕیێ بەدوای مەرە وون بووەكـەدا تـا دەیدۆزێـتەوە؟ [13] ڕاسـتیتان پیێدەڵـێم: گـەر دۆزییەوە، زیاتـر لـەنـەوەدو نۆكـەی تر كە وون نـەبوون، پـێی دڵخـوش دەبـیێ! [14] بەهـــەمان شـــێوە بـــاوكی ئاسمانـــیم نایەوێت یەكێ لەو باوەڕدارە منداڵانە لەناوبچن.

**گلەیی برایانە**

([15]گـــەر بـــراكەت خـــراپەی بەرامـبەر كـردی، بـڕۆ لایو بەتەنها لەنێوان خۆتان گلەیی لـیێ بكە. گەر گوێـی لـیێگـرتی، ئـەوا بـراكەت

---

*بیبڕە : لێرە مەبەست بڕینی ئەندامی لەش نییە، بەڵكو وازهێنان لە گوناه.

دەستگیر دەبێتەوە. [16]خۆ ئەگەر گوێی لێ ڕانەگرتی، برایەك یاخود دوو برای کە لەگەڵ خۆت بەرە، هەتا لەهەموو شتێ بدوێن، بەشایەتی دوو یاسێ کەس. [17]ئەگەر بەمەش ڕازی نەبوو، مەسەلەکە بخەرە بەردەمی کۆمەڵی باوەڕداران، ئەگەر لەوانیش گوێی ڕانەگرت، ئەوا وەك یەکێکی خوانەناسو باجگر هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکە. [18]ڕاستیتان پێدەڵێم: ئەوەی ئێوە لەسەر زەوی بیبەستن، ئەوا لەئاسمانیش بەستراو دەبێت، ئەوەش کە لەسەر زەوی ئێوە بیکەنەوە، ئەوا لەئاسمانیش کراوە دەبێت. [19]هەروەها باپێتان بڵێم: گەر دووان لەئێوە ڕیکەوتن لەسەر داواکردنی شتێك، هەرچییەك بێت، باوکی ئاسمانیم بۆتان دەهێنێتە دی. [20]چونکە لەهەر شوێنێکدا دووان یاخود سیان بەناوی منەوە کۆببنەوە ئەوا من لەنێوانیاندا دەبم.)

**لێبووردنی برایان**

[21]ئینجا پەترۆس هاتە لایو لێی پرسی: (گەورەم، دەبێ چەند جار لەبراکەم خۆشبم کاتێ هەڵەم بەرامبەر دەکات؟ تا حەوت جار؟) [22]عیسا وەڵامی دایەوە: (من نالێم حەوت جار، بەڵکو حەفتا کەرەت حەوت جار! [23]لەبەرئەمە پادشاهێتی ئاسمان لە پادشایەك دەکات ویستی لێپرسینەوە لەگەڵ کۆیلەکانی بکات. [24]کاتێ دەستی کرد بەلێپرسینەوەی قەرزەکانی یەکێکیان بۆ هێنا دە هەزار بەشە زیو قەرزاری بوو. [25]جا لەبەرئەوەی هیچی نەبوو قەرزەکەی پێبداتەوە، پادشاکە فەرمانیدا خۆیو ژنوماڵو منداڵی بفرۆشرێ تا قەرزەکەی پێبدرێتەوە. [26]بەلام کۆیلەکە لەبەردەمی چۆکیداداو لێی پاڕایەوەو ووتی: گەورەم لەسەرم ڕاوەستە، چی قەرزم لەسەرە دەیدەمەوە. [27]پادشاکە بەزەیی بەکۆیلەکەی هاتەوە، ئازادی کردو لەقەرزەکەی خۆش بوو. [28]کاتێ ئەم کۆیلەیە لەوێ ڕۆیشت، کۆیلەیەکی تری بینی کە هاوڕێی بوو، سەد بەشە زیو قەرزی لابوو، ملی گرتو پێی ووت: ئەوەی بەسەرتەوەیە بمدەرەوە! [29]هاوڕێیەکەی لەبەرپێی کەوتو لێیپاڕایەوە ووتی: لەسەرم ڕاوەستە، قەرزەکەت دەدەمەوە. [30]بەلام کابرا

بەمە ڕازی نەبوو، بردیو بەگرتنیدا، تا ئەوەی بەسەریەوەیە بیداتەوە. [31] کاتێ کۆیلەکانی تر ئەمەیان بینی، زۆریان پێناخۆش بوو، هەموو شتێکیان بەپادشاکەیان ڕاگەیاند. [32] پادشا بانگی کردو پێی ووت: ئەی کۆیلەی بەدکار، ئەو هەموو قەرزەت لابوو، لێت خۆش بووم، چونکە لێم پاڕایتەوە. [33] ئایا نەدەبوایە تۆش کەمێك بەزەییت بەهاوڕێکەت بهاتایەوە، وەك من چۆن بەزەیم پیاتا هاتەوە؟ [34] پادشاکە لەمە زۆر ڕقی هەستاو ناردی بۆ ئەوەی دارکاری بکرێ، تا دوا پوولی قەرزەکەی دەداتەوە. [35] هەروەها باوکی ئاسمانیشم، بەهەمان شێوە هەڵسوکەوتتان لەگەڵ دەکات، گەر لە دڵەوە لە هەڵەی براکانتان خۆش نەبن.)

## ژن هێنانو تەلاق دان

# 19

دوای ئەوەی عیسا ئەم ووتەیەی تەواوکرد، لەناوچەی جەلیلەوە ڕۆیشت بۆ ناوچەی یەهودیا کە دەکەوێتە پشت ڕووباری ئوردونەوە. [2] خەڵکێکی زۆر دوای کەوتن، لەوێ نەخۆشەکانیانی چاککردەوە. [3] هەندێ لەفەریسیەکان هاتنە لای عیسا بۆ ئەوەی تاقیبکەنەوە، لێیان پرسی: (دروستە پیاو ژنەکەی لەسەر هەر هۆیەك بێت تەلاق بدات؟) [4] عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (ئەی نەتان خوێندۆتەوە، کە {دروستکەر لەسەرەتاوە مرۆڤی بەنێرو مێ دروستکردووە؟} [5] ئەوسا پێیووتن: {لەبەرئەوە پیاو دایكو باوکی خۆی بەجێ دەهێڵێت، لەگەڵ ژنەکەی جووت دەبێتو هەردووکیان دەبنە یەك لەش. [6] ئیتر دوو نین بەڵکو یەك لەشن. ئەوەی خودا بەیەکی گەیاندووە، مرۆڤ جیای ناکاتەوە}) [7] دیسان لێیان پرسی: (ئەی بۆچی موسا ڕایسپاردووە کە تەلاقنامە بەژن بدرێتو تەلاقی بکەوێت؟) [8] لەوەلامدا ووتی: (لەبەر دڵڕەقیتان، موسا ڕێیدان ژنەکانتان تەلاق بدەن، ئەگینا لەسەرەتاوە وانەبوو. [9] بەلام من پێتان دەڵێم: ئەوەی ژنەکەی بێهۆی داوێن پیسی تەلاق دەداتو یەکێکی دیکە دەهێنێت، ئەوا داوێن پیسی دەکات. [10] ئینجا قوتابیەکانی پێیان ووت: (ئەگەر حاڵی پیاو لەگەڵ ژنەکەی وابێت، کەواتە ژن نەهێنان

باشترە!) [11] وەڵامی دانەوە: (ئەم ووتەیە هەموو خەڵکی پێی ڕازینین، تەنها ئەوانە نەبێت کەپێیان دراوە. [12] جا بەشێك خەساو هەن کە بەخەساوێتی لەدایك دەبن، بەشێکی دیکەشیان خەڵکی خەساندوویانن، هەروەها خەساویش هەن خۆیان خەساندووە لەپێناوی پادشاهێتی ئاسمان. کێ دەتوانێت بەمە ڕازی بێت، باڕازی بێت.)

### پادشاهێتی ئاسمان بۆ منداڵانە

[13] ئینجا هەندێ منداڵی بچووکیان هێنایە پێشەوە تاکو دەست بخاتە سەر سەریانو نوێژیان بۆ بکات، قوتابیەکان لێیان گرژ بوون. [14] بەڵام عیسا ووتی: (واز لەمنداڵان بهێنن، هاتنە لای منیان لێ قەدەغە مەکەن، چونکە پادشاهێتی ئاسمان هی ئەم جۆرە کەسانەیە.) [15] ئینجا دەستی لەسەریان داناو لەوێ ڕۆیشت.

### گەنجە دەوڵەمەندەکە

[16] کوڕێکی گەنج هاتە لایو پرسی: (ئەی مامۆستا چ چاکەیەك بکەم تاکو ژیانی هەتاهەتایی بەدەست بهێنم؟) [17] وەڵامی دایەوە: (بۆچی لەبارەی چاکەوە پرسیارم لێدەکەیت؟ تەنها یەکێك هەیە چاکە. بەڵام ئەگەر دەتەوێت ژیان بەدەست بهێنی، کار بەڕاسپاردەکانی شەریعەت بکە.) [18] ئەویش لێی پرسی: (چ ڕاسپاردەیەك؟) عیسا وەڵامی دایەوە: (مەکوژە، داوێن پیسی مەکە، مەدزە، شایەتی درۆ مەدە، [19] ڕێزی دایكو باوکت بگرە، ئەوەی لێت نزیکە وەك خۆت خۆشت بوێت.) [20] ئینجا کوڕە گەنجەکە پێی ووت: (ئەمانەم هەموو لەمنداڵیەوە کردووە، ئیتر کەم وکوڕیم چیە؟) [21] عیسا وەڵامی دایەوە: (ئەگەر دەتەوێت تەواوبیت، بڕۆ چیت هەیە بیفرۆشەو بەسەر هەژاران دابەشی کە، بەم شێوەیە گەنجینەیەکت لەئاسماندا دەبێت، ئینجا وەرە دوامکەوە.) [22] کاتێ کوڕە گەنجەکە ئەمەی بیست، بە دڵتەنگیەوە ڕۆیشت، چونکە سامانێکی زۆری هەبوو. [23] ئینجا عیسا بەقوتابیەکانی ووت: (ڕاستیتان پێدەڵێم: شتێکی گرانە بۆ دەوڵەمەند بچێتە پادشاهێتی ئاسمانەوە. [24] دیسان دەڵێم: چوونە ژوورەوەی ووشترێك لەکونی دەرزیەوە ئاسانترە لەچوونە

ژوورەوەی دەوڵەمەندێك بۆ ناو پادشاهێتی ئاسمان.) [25] کاتێ قوتابیەکانی گوێیان لەمەبوو زۆر سەرسام بوون، پرسییان: (کەواتە کێ دەتوانێ ڕزگاری بێت؟) [26] بەڵام عیسا سەیری کردن و پێی ووتن: (ئەمە لای مرۆڤ مەحاڵەو نابێت، بەڵام لای خودا، هەموو شتێك دەبێت.) [27] ئینجا پەترۆس ووتی: (ئەوەتا ئێمە وازمان لەهەموو شتێك هێناوەو دوات کەوتووین، بەشمان چی دەبێت؟) [28] عیسا وەڵامی دانەوە: (ڕاستیتان پێ دەڵێم، کاتێ ڕۆڵەی مرۆڤ لەسەر تەختی شکۆمەندی خۆی دادەنیشێت و ئێوە کەدوام کەوتوون لەکاتی نوێبوونەوەدا لەسەر دوانزە تەخت دادەنیشن، تاکو دوانزە هۆزەکەی ئیسرائیل تاوانبار بکەن. [29] هەر کەسێکیش ماڵ، برا، خوشك، باوك، دایك، منداڵ و زەوی لەبەر ناوی من بەجێی هێشتووە، سەد ئەوەندە وەردەگرێتەوەو ژیانی هەتاهەتاییش بەمیرات بۆی دەمێنێتەوە. [30] بەڵام زۆر لەیەکەمینەکان دەبنە دواهەمین، زۆر لەدواهەمینەکان دەبنە یەکەمین.)

## نموونەی کرێکارانی ناو ڕەز

# 20

(پادشاهێتی ئاسمان لەگەورەی ماڵێك دەکات، بەیانی زوو دەڕواتە دەرەوە تاکرێکار بۆ ڕەزەکەی بگرێت. [2] ڕۆژی بەدینارێك لەگەڵ کرێکارەکان ڕێکەوت، ئینجا ناردنی بۆ ڕەزەکەی. [3] دوای ئەوە نزیکی کاتژمێری نۆ چووە دەرەوە، لەمەیدانی شار کرێکاری بێ ئیشی دیکەی دی، [4] پێی ووتن: بڕۆن ئێوەش لەڕەزەکەمدا کار بکەن، کرێتان چەندە دەتان دەمێ. ئەوانیش ڕۆیشتن. [5] ئینجا کاتژمێری دوانزەی نیوەڕۆ ڕۆیشتەوە بۆ مەیدان، دوای ئەوە کاتژمێری سێی پاش نیوەڕۆ هەمان کاری کردەوە. [6] دیسان نزیکی کاتژمێری پێنجی ئێوارە چووە دەرەوە، کرێکاری دیکەی بێ ئیشی بینی، پرسی: بۆچی بەدرێژایی ڕۆژ بێ ئیش وەستاون؟ [7] وەڵامیان دایەوە: چونکە کەس بەکرێی نەگرتووین. ئەویش ووتی: ئێوەش بڕۆن بۆ ڕەزەکەم! [8] کاتێ ئێوارە داهات خاوەن ڕەزەکە بەسەرکارەکەی ووت: کرێکارەکان بانگ بکەو کرێکەیان بدەرێ، دەست پێ بکە

بەوانەی کە دواجار هاتوونو کۆتایی پیێ بهێنە بەوانەی یەکەمجار هاتن. [9] جا ئەوانـەی کـە کاتژمـێر پێنج هاتبوون هاتـنە پێشەوە، هەر یەکی دیناریێکیان وەرگـرت. [10] کـاتیێ نۆرەی ئەوانەی یەکـــەمجار هـــات وایانـــزانی زیاتـــر وەردەگـرن، بەلاَم هەر یەك لەوانیش دیناریێکـیان وەرگـرت. [11] لەوکاتەدا دەسـتیانکرد بە بۆلەبۆلکردن بەسەر خـــاوەن ڕەزەکـــەداو [12] ووتـــیان: ئەوانـەی دواجار هاتن تەنها کاژێریێك ئیشـیان کـردووە. کەچی تۆ ئەوانت وەك ئـێمە دانا کە بەدرێژایی ڕۆژەکە لەژێـر تیشکی ڕۆژ ئیشمان کردووە. [13] وەلاَمـی یەکێکیانی دایەوەو ووتی: هـاوڕێم، من غەدرم لـیێ نەکردویت، ئایـا لەگـەلَ مـن بەیـەك دیـنار ڕێك نەکەوتوویـــت؟ [14] بەشـــی خـــۆت وەرگـرەو بەڕێگـەی خۆتدا بڕۆ. من دەمـەویێ بـەوەی دواجـاریش هـات وەك تـۆی بدەمـیێ. [15] ئایا سەربەستی ئـەوەم نیـیە هەلَسـوکەوت بـەمالَی خۆمـەوە بکـەم بـەو شـێوەیەی خۆم دەمەوێـت؟ یـان چاوت پیسە چونکە من چاوتێرم؟ [16] بەم شێوەیە دواهەمین دەبـنە یەکـەمینو یەکەمینـیش دەبـنە دواهـەمین. چـونکە زۆرن ئەوانـەی بـانگ دەکـرێنو کـەمن ئەوانـەی هەلَدەبژێرێن.)

**سێهەم باسی مردنی عیسا**

[17] کـاتیێ عیسـا بـەرەو قـودس دەڕۆیـی، هـەر دوانـزە قوتابـیەکەی لـەڕێگا جـیاکردەوە، پێی ووتن: [18] (ئـەوا ئێمە دەڕۆین بۆ قودس، لەویێ ڕۆلَەی مرۆڤ دەدرێتە دەست سەرۆك کاهیـنەکانو مامۆستایانی شەریعەت، بـڕیاری مـردن بەسەریدا دەدەن. [19] دەیدەنـە دەسـت ناجوولەکـەکان، گالَـتەی پیێدەکـەنو بـە قامچی لێی دەدەنو لـە خاچـی دەدەن. بـەلاَم لەڕۆژی سێهەمدا زیندوودەبێتەوە.)

**خزمەتکار مەزنترینە**

[20] ئیـنجا دایکـی دوو کوڕەکەی زەبـدی لـێی هاتە پێشەوەو هەردوو کوڕەکەشـی لەگەلَ بوو، کڕنووشی بـۆ بـردو داوایـەکی لـیێکـرد. [21]

*جـام : مەبەستی لەو ئازارەیە کە کاتیێ لەسەر خاچەکەی بوو بینی، ئەمەش بەپیێی پلانی خودا.

ئــەویش بەژنەکــەی ووت: (چــیت دەویٚ؟) وەلاٚمــی دایــەوە: (بلٚــیٚ باهەردوو کوڕەکەم لەپادشاهیەکەتدا دابنیشــن، یەکێکـیان لای ڕاستتەوە، ئــەوی دیکــەیان لای چــەپتەوە.) [22] عیســا وەلاٚمــی دایــەوە، بــەیاقوب‌و یۆحەننای ووت: (ئێوە نازانن داوای چــی دەکەن. ئایا دەتوانن ئەو جامە* بخۆنەوە کە من دەیخۆمەوە؟ وەلاٚمیان دایــەوە: (بەلٚیٚ، دەتوانین.) [23]ئەویش ووتــی: (جــامی من دەتوانن بخۆنەوە، بــەلاٚم دانیشــتن لــەلای ڕاســت‌و چەپمەوە، ناتوانم بیدەم تەنها بۆ ئەوانە نەبێــت کــە بــاوکم بــۆی ئامادەکــردوون.) [24]کــاتیٚ دە قوتابیـەکەی ترگوێیان لەو دوو برایە بــوو، لێـیان دلٚگران بوون. [25]عیسا هــەموویانی بانگ‌کردو ووتی: (ئێوە دەزانــن ســەرۆك نەتــەوەکان فەرمانڕەوایی دەکــەن، گەورەکانیان دەسەلاٚتیان بەسەریاندا هەیە. [26]بەلاٚم ئــێوە بــا ئــەوە لەنێوانــتاندا نەبێــت، ئــەوەی دەیــەویٚ لــەناوتاندا مــەزن بێــت، با وەك خزمەتکار بێت بۆتان. [27]ئــەوەش کەدەیــەویٚ لــەناوتاندا یەکــەم بێت، با وەك کۆیلەتان بێت. [28]هــەر وەك چــۆن ڕۆلٚــەی مــرۆڤ نــەهاتووە تــا خزمەت بکریٚ، بەلٚکو هــاتووە تــا خــزمەت بکــات‌و خۆی بەخــت‌بکــات بــۆ کڕینــەوەی زۆر کەس.)

**چاکردنەوەی دوو کوێر**

[29]لەوکاتــەدا عیســاو قوتابیەکانی ئــەریحایان بەجیٚ‌دەهێشت. خەلٚکێکی زۆر دوایــان کــەوتن. [30]دوو کوێــر لەتەنیشــتی ڕێگاکــەدا دانیشــتبوون، کــاتیٚ گوێـیان لــیٚ‌بــوو عیسا بەوێدا دەڕوا، هاواریــان‌کــرد: (بەزەییــت پــیــامــاندا بێــتەوە گــەورەم، ئــەی ڕۆلٚــەی داود.) [31]جــا خەلٚکەکــە سەرزەنشــتیان‌کردن تاوەکو بیٚ‌دەنگ بــن، بەلاٚم ئەوان زیاتر هاواریان‌کرد: (ئەی گەورە، بەزەییت پیاماندابێتەوە، ڕۆلٚــەی داودا) [32]عیســا ڕاوەســتا، بانگی‌کــردن‌و لــێی پرســین: (چــیتان دەویٚ بۆتــانی بکــەم؟) [33]وەلاٚمــیان دایــەوە: (چــاومان چــاك‌بکەیــتەوە، گەورەم.) [34]ئیتر بەزەیی پێیانداهاتەوە، دەســتی هێــنا بەچاوی هەردووکیان، دەســـتبەجیٚ چـــاویان ڕۆشـــنایی تیٚ‌کەوت، جا ئەوانیش دوای‌کەوتن.

**عیسا بۆ قودس دەڕوات**

# 21

کاتێ لەقودس نزیك بوونەوە، گەیشتنە دێی بەیتفاجی لای شاخی زەیتون، عیسا دووان لەقوتابیەکانی ناردو [2]پێی ووتن: (دەچنە ئەو دێیەی بەرامبەرتان، یەکسەر ماکەرێك دەبینن، لەگەڵ جاشکەکەی بەستراونەتەوە، دەیان کەنەوەو دەیانهێنن بۆم. [3]گەر یەکێ شتێکی پێووتن، بڵێن: گەورەمان پێویستی پێیانە، دەست بەجێ دەیان نێرێت.) [4] ئەمەش تاکو ئەوەی لەسەر زمانی پێغەمبەرێك ووتراوە بێتەدی: [5] {بڵێن بەکچەکەی شاری داود، ئەوا پادشاکەت بەساکاریو بەسواری ماکەرو جاشکێك دێتە لات.} [6]دوو قوتابیەکە ڕۆیشتن، ئەوەی عیسا پێی ڕاسپاردبوون، کردیان. [7]ماکەرو جاشکەکەیان هێنا، کراسەکانی خۆیان لەسەر پشتی ڕاخست، جا عیسا سواری بوو. [8]خەڵکێکی زۆر، دەستیانکرد بەڕاخستنی ڕێگاکە بەجلەکانیان. ئەوانی دیکەش لقە داریان دەبڕیو ڕێگاکەیان پێ ڕادەخست. [9]ئەو خەڵکەی پێش عیسا کەوتبوون، هەروەها ئەو خەڵکەش کە لەدوایەوە دەڕۆیشتن هاواریان دەکرد دەیان ووت: (هۆسانا* بۆ ڕۆڵەی داود*، پیرۆزە ئەوەی بەناوی خوداوەندەوە دێت، هۆسانا لەبەرزایی!) [10]کاتێ عیسا چووە ناو قودس، هەموو شارەکە خرۆشا، دانیشتوانی پرسییان: (ئەمە کێیە؟) [11]خەڵکەکە وەڵامیان دایەوە: (ئەمە عیسای پێغەمبەرە، خەڵکی شاری ناسیرەی ناوچەی جەلیلە.)

### پاکردنەوەی پەرستگا

[12]ئینجا عیسا چووە گۆڕەپانی پەرستگاو هەموو ئەوانەی خەریکی کڕینو فرۆشتن بوون، دەری کردن، دەزگاو جێگای دانیشتنی پارەگۆڕەوەکانو کۆترفرۆشانی سەروژێرکرد. [13]پێی ووتن: (خودا لەکتێبی پیرۆز فەرموویەتی: { ماڵەکەم بە ماڵی نوێژ ناودەبرێ}، بەڵام ئێوە کردوتانە {بەئەشکەوتی دزان!}) [14]کاتێ لەپەرستگا بوو، کوێرو شەل لێیهاتنە پێشەوە ئەویش چاکی کردنەوە. [15]کاتێ سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت ئەم کارە سەرسوڕهێنەرەیان بینی ڕقیان هەستا، گوێیان لەمنداڵانی ناو پەرستگا بوو هاواریان دەکرد:

(هۆسانا بۆ ڕۆڵەی داود!) [16]جا لێیان پرسی: (گوێت لێیە ئەوانە چی دەڵێن؟) عیسا وەڵامی دانەوە: (بەڵێ، نەتان خوێندۆتەوە: {لەسەر زاری منداڵانو شیرەخۆران ستایشت ڕێکخستووە؟}) [17]ئەوسا بەجێی هێشتنو چووە دەرەوەی شار بەرەو دێی بەیتعەنیا، بەنیازی ئەوەی لەوێ بمێنێتەوە.

[18]بەیانی ڕۆژی داهاتوو، کاتێ دەگەڕایەوە بەرەو شار برسی بوو. [19]دار هەنجیرێکی لەتەنیشت ڕێگاکە بینیو چوو بۆی، بەڵام لەگەڵا زیاتر هیچی تری پێوە نەدی، ئینجا بەدارەکەی ووت: (با تاهەتایە بەرنەگریت!) دارەکە دەستبەجێ ووشک بوو. [20]کاتێ قوتابیەکان ئەمەیان دی، سەریان سوڕماو ووتیان: (چ زوو دارەکە ووشک بوو!) [21] وەڵامی دانەوە: (ڕاستیتان پێدەڵێم: گەر باوەڕتان هەبێتو گومان نەکەن، نەك هەروەك ئەوەی بەم دارەم کرد دەتوانن بیکەن، بەڵکو ئەگەر بەو شاخە بڵێن هەڵکەنرێو بکەوە ناو دەریاوە، بەم شێوەیە دەبێت. [22]جا هەموو ئەو شتانەی لەنوێژدا بەباوەڕەوە داوای دەکەن، وەریدەگرن.)

**دەسەڵاتی عیسا**

[23]کاتێ گەیشتە پەرستگاو دەستی بەفێرکردن کرد، سەرۆك کاهینەکانو پیرانی گەل لێی هاتنە پێشەوەو پرسییان: (بە چ دەسەڵاتێك ئەمانە دەکەیت؟ کێ ئەم دەسەڵاتەی داوە پێت؟) [24]عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (منیش پرسیارێکتان لێدەکەم، گەر وەڵامتان دامەوە، ئەوسا پێتان دەڵێم بە چ دەسەڵاتێك ئەمانە دەکەم. [25]پێم بڵێن: لەئاوهەڵکێشانی یەحیا لەکوێوە بوو؟ لەئاسمانەوە بوو یان لەخەڵکی؟) ئەوانیش لەنێوان خۆیان کەوتنە ڕاوێژکردنو ووتیان: (ئەگەر بڵێین لەئاسمانەوە بوو، پێمان دەڵێ، باشە بۆ باوەڕتان پێنەکرد؟ [26]وە ئەگەر بڵێین لەخەڵکەوە بوو، ترسی ئەوە هەیە خەڵکەکە هەڵگەڕێنەوە بەسەرماندا، چونکە هەموویان یەحیا بەپێغەمبەر دادەنێن.) [27]ئینجا وەڵامیان دایەوە، ووتیان: (نازانین.) ئەویش ووتی: (کەواتە منیش پێتان ناڵێم بە چ دەسەڵاتێك ئەمە دەکەم.)

**نموونەی دوو کوڕەکە**

([28]ڕاتان چییە؟ پیاوێك دوو کوڕی هەبوو. چووە لای یەکەمیانو پێیووت: کوڕم ئەمڕۆ بڕۆ لەڕەزەکەمدا کار بکە. [29]لەوەڵامدا ووتی: نامەوێ بچم. بەڵام دوای ئەوە پەشیمان بووەوەو ڕۆیشت. [30]ئینجا پیاوەکە چووە لای کوڕی دووهەمیو هەمان داواکاری لێکرد. کوڕە وەڵامی دایەوەو ووتی: بەڵێ گەورەم! بەڵام لەدواییدا نەڕۆیشت. [31]ئایا کامیان لەو دووانە بەخواستی باوکیان کرد؟) وەڵامیان دایەوە: (یەکەمیان.) ئینجا عیسا پێی ووتن: (ڕاستیتان پێدەڵێم: باجگرانو داوێن پیسان پێشتان دەکەون لەچوونە ناو پادشاهێتی خوداوە. [32] یەحیا ڕێگای ڕاستودروستی گرتو بۆ لاتان هات، کەچی باوەڕتان پێنەکرد، بەڵام باجگرانو داوێنپیسان باوەڕیان پێهێنا. تەنانەت دوای بینینی ئەمە باوەڕتان پێنەکردو تۆبەتان نەکرد.)

**نموونەی باخەوانەکانی ڕەز**

[33]گوێ بگرن بۆ نموونەیەکی دیکە: (گەورە پیاوێك ڕەزێکی چاند، دەورووبەرەکەی پەرژینکرد، بابەتی ترێ گوشینی تیادانا، شوێنی ئێشکگرتنی تیا دروستکرد ئینجا دایە دەست باخەوانانو بۆ گەشت ڕۆیشت. [34]کاتێ ڕەزەکە بەریگرت، کۆیلەکانی نارد بۆ لای باخەوانەکان تاکو بەرووبوومی ڕەزەکەی بۆ بهێنن. [35]باخەوانەکان کۆیلەکانیان گرت، لەیەکێکیان داو ئەویدیکەیان کوشتو سێیەمیشیان بەرد بارانکرد. [36]ئینجا گەورە پیاوەکە لەجاری پێشوو کۆیلەی زیاتری نارد، باخەوانەکان چیان لەوانەی یەکەمجارکرد واشیان لەمان کردەوە. [37]لەدواییدا کوڕەکەی نارد بۆ لایان، ووتی: ڕێز لەکوڕەکەم دەگرن! [38]باخەوانەکان کەکوڕەکەیان بینی بە یەکتریان ووت: ئەمەیە میراتگر! وەرن بابیکوژین تادەست بگرین بەسەر میراتەکەیدا. [39]ئینجا کوڕەکەیان گرتو بردیانە دەرەوەی ڕەزەکەو کوشتیان! [40]باشە کاتێ خاوەن ڕەزەکە دەگەڕێتەوە دەبێ چی لەباخەوانەکان بکات؟ [41]وەڵامیان دایەوە: (ئەو بەدکارانە لەناودەبا. دوایی ڕەزەکە دەداتە دەست

باخەوانانی دیکە تا لەکاتی خۆیدا بەرووبوومی بدەنێ.) [42]عیسا پێی ووتن: (ئایا لەکتێبی* پیرۆزدا نەتان خوێندۆتەوە: {ئەو بەردەی وەستاکان پەسەندیان نەکرد، هەر ئەو بەردەبوو بووە بەردی بناغە؟ ئەمە لەلایەن خوداوەندەوە بوو، چەند سەرسوڕهێنەرە لەبەرچاومان!} [43]لەبەرئەوە پێتان دەڵێم: پادشاهێتی خوداتان لێ‌دەسەندرێتەوەو دەدرێتە دەست گەلێك كە بەرووبوومی دەدات. [44]ئەوەی بکەوێ بەسەر ئەم بەردەدا تێك‌دەشکێ، ئەوەش کە بەردەکە بەسەریدا بکەوێت پانوپلیشی دەکاتەوە.) [45]کاتێ سەرۆك کاهینەکانو فەریسیەکان ئەو دوو نموونەیان بیست زانیان مەبەستی ئەوانە. [46]بۆیە هەوڵی گرتنیان دەدا، بەڵام لەخەڵکەکە دەترسان چونکە عیسایان بەپێغەمبەر دادەنا.

## نموونەی داوەتی پادشا

## 22

دیسان عیسا گەڕایەوە سەر نموونەکانیو ووتی: [2](پادشاهێتی ئاسمان لەپادشایەك دەکات، شایی بۆ کوڕەکەی بگێڕێ. [3]کۆیلەکانی دەنێرێ تاکو بانگکراوان بۆ شاییەکە بانگ بکەن، بەڵام ئەوان نایەن. [4]پادشاکە جارێکی دیکە کۆیلەکانی دەنێرێتو پێیان دەڵێ: بەبانگکراوان بڵێن، ئەوەتا من خوانم ئامادەکردووە، گاو دابەستەکانم سەر بڕیوەو هەموو شتێ ئامادەیە، کەواتە وەرن بۆ شاییەکە! [5]بەڵام بانگکراوان گوێیان نەدایە، یەکێ دەڕوا بۆ کێڵگەکەی، ئەوی دیکە بۆ بازرگانیەکەی. [6]ئەوانەی کە لەوێیا دەمێننەوە، کۆیلەکانی پاشا دەگرن، قسەیان پێ‌دەڵێن، ئینجا دەیانکوژن. [7]جا پادشا بەمە زۆر تووڕە دەبێو لەشکر دەنێرێ، هەموو ئەوانەی تاوانبارن لەناویان دەباتو شارەکەیان دەسووتێنێ. [8]دوای ئەمە بەکۆیلەکانی دەڵێ: وا نانی شایی ئامادەیە، ئەو بانگکراوانە شایستەی ئەوە نەبوون، [9]کەواتە بڕۆنە سەری ڕێگاکانو هەرکەسێ دەبینن بانگی کەن بۆ شاییەکە. [10]ئینجا کۆیلەکانی چوون بۆ سەر ڕێگاکان، ئەوەی بینیان لەخەڵکی خراپو باش کۆیان کردەوە، هەتا هۆڵی شاییەکە بەتەواوی پڕ بوو لەمیوان. [11]ئینجا

پادشا خۆی دەکات بەهۆڵەکەدا تامیوانەکان ببینێت، یەکێ دەبینێت کەجلی شایی لەبەرنەکردووە. [12]پێی دەڵێت: ئەی دۆست، چۆن هاتیتە ژوورەوەو جلی شاییت لەبەرنەکردووە؟ کابرا هیچ وەڵامی نەدایەوە. [13]ئینجا پادشا فەرمان دەدا بەکۆیلەکانیو دەڵێ: دەستو قاچی ببەستنەوەو فڕێیدەنە تاریکی دەرەوە، جا لەوێ دەبێت بەگریانو چرکە چرکی ددان! [14]چونکە بانگکراوان زۆرن، بەڵام هەڵبژێرراوان کەمن.)

**باج دان بە قەیسەر**

[15]ئینجا فەریسیەکان ڕۆیشتنو تەگبیریان کرد، چۆن عیسا بەقسەی خۆی تووش بکەن. [16]چەند قوتابیەکی خۆیان لەگەڵ پیاوانی هێرودس ناردە لای، پێیان ووت: (مامۆستا، دەزانین تۆ ڕاستگۆیتو بەڕاستی خەڵکی فێری ڕێگەی خودا دەکەیت، لەکەس سڵ ناکەیتەوە، چونکە پلەو پایە نرخی نییە لات. [17]کەواتە پێمان بڵێ: دروستە سەرانە بدرێ بەقەیسەر یان نا؟) [18]عیسا بەفێڵەکەیانی زانیو ووتی: (ئەی دووڕووەکان، بۆچی تاقیم دەکەنەوە؟ [19]ئا پارەیەکی ئەو سەرانەیەم بدەنێ.) ئەوانیش دیناریکیان* دایە. [20]لێی پرسین: (ئەم وێنەو نووسراوە هی کێیە؟) [21]ووتیان: (هی قەیسەرە.) ئینجا پێی ووتن: (کەواتە ئەوەی هی قەیسەرە، بیدەن بە قەیسەر، ئەوەش کەهی خودایە بیدەن بە خودا.) [22]کە گوێیان لەم وەڵامە بوو سەرسام بوونو بەجێیان هێشتو ڕۆیشتن.

**زیندووبوونەوەی مردووان**

[23]لەهەمان ڕۆژدا، چەند سەدوقیەك* کەباوەڕیان بەزیندووبوونەوە نییە، هاتنە لای عیسا پرسیاریان لێکرد، [24]ووتیان: (ئەی مامۆستا، موسا دەڵێ، گەر پیاوێکی وەجاخ کوێر مرد، پێویستە لەسەر براکەی، براژنەکەی بخوازێتو بۆ براکەی نەوە دروست بکات. [25]جا لای ئێمە حەوت برا هەبوون، یەکەمیان ژنی هێناو بێوەچە مرد، ژنەکەی بۆ براکەی بەجێهێشت، [26]دووەمیش هەروەها [27]ئینجا سێهەم تاگەیشتە حەوتەم. [28]لەدوای هەموویان ژنەکەش مرد. ئایا لەکاتی زیندووبوونەوەدا ئەو ژنە دەدرێ بەکامیان، چونکە ژنی

هەموویان بووە؟) [29]عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (ئێوە بەهەڵەدا چوونە، چونکە نەکتێب تێدەگەن، نەهێزی خودا. [30]لەبەرئەوەی خەڵکی لەکاتی زیندووبوونەوەدا نەژن دەهێنن نەشوو دەکەن، بەڵکو لەئاسمان وەك فریشتە دەبن. [31]ئایا نەتان خوێندۆتەوە ئەوەی لەبارەی زیندووبوونەوە پێتان ووتراوە لەلایەن خوداوە؟ [32]{منم خودای ئیبراهیمو خودای ئیسحاقو خودای یاقوب. خودا، خودای مردووان نییە، بەڵکو خودای زیندووانە.} [33]کەخەڵکەکە گوێیان لەمەبوو، سەرسام بوون لەشێوەی فێرکردنی.)

**گەورەترین ڕاسپاردە**

[34]کاتێ فەریسییەکان بیستیان عیسا سەدوقیەکانی بێدەنگ کردووە، یەکیانگرت بۆ ئەوەی پرسیاری دیکەی لێبکەن، [35]یەکێ لەوانەی زانابوو لەشەریعەت ویستی تاقیبکاتەوەو پێی ووت: [36](مامۆستا، چ ڕاسپاردەیەك مەزنترین ڕاسپاردەیە لەشەریعەت؟) [37]عیسا وەڵامی دایەوە: (خوداوەند خودات خۆش بوێ بەهەموو دڵو هەموو گیانو هەموو بیرتەوە. [38]ئەمە مەزنترینو یەکەم ڕاسپاردەیە. [39]دووەمیشیان وەك ئەو وایە: ئەوەی لێت نزیکە وەك خۆت خۆشت بوێ. [40]جا شەریعەتو پێغەمبەران هەموو بەم دوو ڕاسپاردەیە بەندن.)

**مەسیح و داود**

[41]کاتێ فەریسییەکان بەیەکەوە کۆبوونەوە، عیسا لێیپرسین: [42](ڕاتان چییە دەربارەی مەسیح* ئەو ڕۆڵەی کێیە؟) ووتیان (ڕۆڵەی داودە.) [43]لێیپرسین: (کەواتە، چۆن داود بەهۆی ڕۆحی پیرۆزەوە بەخوداوەند بانگی دەکاو دەڵێ: [44]{خوداوەند بەخوداوەندمی فەرموو: لەلای دەستی ڕاستمەوە دانیشە تادوژمنانت بخەمە ژێر پێتەوە.} [45]ئەگەر داود پێیبڵێ خوداوەند، ئیتر چۆن دەبێ بەڕۆڵەی؟) [46]جا کەسیان نەیانتوانی تەنانەت بەووشەیەکیش وەڵامی بدەنەوە. ئیتر لەو ڕۆژەوە کەس نەیدەتوانی هیچ پرسیارێکی لێبکات.

**هەمووتان برای یەکترین**

# 23

ئینجا عیسا لەگەڵ خەڵکەکەو قوتابییەکانی دواو ووتی: [2](ئەوەتا مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیەکان لەسەر کورسییەکەی موسا دانیشتوون. [3]ئەوەی پێتانی دەڵێن کاری پێبکەن! بەڵام بەکرداری ئەوان مەکەن، چونکە ئەوان باسی شتێك دەکەن، خۆیان کاری پێناکەن. [4]باری قورسو ئەوەی لەتوانادا نییە دەیپێچنەوەو دەیخەنە سەر شانی خەڵکی، بەڵام خۆیان نایانەوێ پەنجەیان بەری بکەوێت.

[5]هەموو ئەوەش کە دەیکەن، بۆ ئەوەیە سەرنجی خەڵکی بۆ خۆیان ڕابکێشن. بەبەستنی ئایەتەکانیان بەناوچەوانو قۆڵیانەوەو بەجلی پانو پۆڕیانەوە، [6]حەز لەجێی سەروو لەمیوانداریو ڕیزی پێشەوە لەکەنیشتەکان دەکەن، [7]هەروەها حەز دەکەن، لەگۆڕەپانی شاردا سڵاویان لێبکریو خەڵکی بەگەورەم، گەورەم، بانگیان بکەن.

[8]بەڵام ئێوە ڕازی مەبن بەمامۆستا بانگتان بکەن! چونکە مامۆستاتان هەر یەکێکەو هەمووشتان برای یەکن. [9]هەروەها کەس بەباوك بانگ مەکەن لەسەر زەوی! چونکە باوکتان هەر یەکێکە، ئەویش ئەو باوکەیە کە لەئاسمانە. [10]ڕازیش مەبن بەگەورە بانگتان بکەن! چونکە گەورەتان هەر یەکێکە، ئەویش مەسیحە. [11]باگەورەتان، نۆکەرتان بێت. [12]ئەوەی خۆی بەرزکاتەوە، نزم دەکرێتەوەو ئەوەش خۆی نزم بکاتەوە، بەرز دەکرێتەوە.

### دووڕوویی فەریسیەکان

([13]بەڵام خاك بەسەرتان ئەی مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیانی دووڕوو! چونکە دەرگای پادشاهێتی ئاسمان بەڕووی خەڵکی دادەخەن، نەخۆتان دەچنە ژوورەوە نە دەهێڵن خەڵکیدیکە بچێت. [14]خاك بەسەرتان ئەی مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیانی دووڕوو، ئێوە ماڵی بێوەژن دەخۆنو بەخۆڕایی درێژە دەدەن بەنوێژەکانتانو دەپاڕێنەوە، لەبەرئەوە سزای زیاتر وەردەگرن. [15]خاك بەسەرتان ئەی مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیانی دووڕوو، ئێوە لەدەریاو بیاباندا دەگەڕێن تا یەکێ بکەن بەجوولەکە، کاتێ کردتان بە جوولەکە، ئەوسا دوو ئەوەندەی خۆتان بەلای

دۆزەخدا دەبیەن.

[16] خاك بەسەرتان ئەی ڕابەرە کوێرەکان! ئێوە دەڵێن: ئەوەی سوێند بەپەرستگا بخوا، ئەوا هیچی لەسەر نییە، بەڵام ئەوەی بەزێڕی پەرستگا سوێند بخوا ئەوا دەبێ سوێندەکەی بباتەسەر. [17] ئەی نەفامینە، ئەی کوێرینە، کامیان لەم دووانە مەزنترن، زێڕەکە یا ئەو پەرستگایەی زێڕەکە پیرۆز دەکات؟ [18] هەروەها ئێوە دەڵێن: ئەوەی سوێند بە قوربانگا بخوا، ئەوا هیچی لەسەر نییە، بەڵام ئەوەی سوێند بەقوربانی سەر قوربانگە بخوا، ئەوا دەبێ سوێندەکەی بباتەسەر. [19] ئەی کوێرینە کامیان لەم دووانە مەزنترن، قوربانی یان ئەو قوربانگەیەی قوربانیەکە پیرۆز دەکات؟ [20] چونکە ئەوەی سوێند بەقوربانگە دەخوا، ئەوا سوێند دەخوا بەقوربانگەو ئەوەش کە لەسەریەتی. [21] ئەوەی بەپەرستگا سوێند دەخوا، ئەوا سوێند دەخوا بەپەرستگاو بەوەش کە تیایدا نیشتەجێیە. [22] ئەوەی بەئاسمان سوێند دەخوا، ئەوا سوێند دەخوا بەتەختی خوداو بەوەش کە لەسەری دانیشتووە!

[23] خاك بەسەرتان ئەی مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیانی دووڕوو! چونکە ئێوە دەیەکی نەعناعو شویتو زیرە دەدەنو گرنگترین بابەتی شەریعەت وەك ڕاستیو بەزەییو باوەڕ پشتگوێ دەخەن، پێویست بوو لەسەرتان ئەمە بکەنو ئەویش لەیاد نەکەن. [24] ئەی ڕابەرە کوێرەکان! ئێوە شت پاك دەکەنەوە لەمێشوولە، بەڵام وشتر قوت دەدەن!

[25] خاك بەسەرتان ئەی مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیانی دووڕوو! ئێوە دەرەوەی پیاڵەو قاپەکانتان پاك دەکەنەوە، بەڵام ناوەکەی پڕە لەوەی بەدزیو بەرەڵڵایی دەستتان کەوتووە! [26] ئەی فەریسی کوێر، یەکەمجار ناو پیاڵەکەت پاك کەرەوە، تادەرەوەشی پاك بێتەوە.

[27] خاك بەسەرتان ئەی مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیانی دووڕوو! چونکە ئێوە وەك گۆڕێکی بەگەچ سواخ دراو وان، کە دەرەوەی جوان دیارە، بەڵام ناوەوەی پڕە لەئێسقانی مردووانو هەموو پیسییەك! [28] ئێوەش هەروەها، لای

خەڵك خۆتان چاك دەردەخەن، بەلاّم ناوەوەتان پڕە لەدووڕوویی‌و خراپە.

[29]خاكبەسەرتان ئەی مامۆستایانی شەریعەت‌و فەریسیانی دووڕوو! ئێوە گۆڕی پێغەمبەران هەڵدەبەستن‌و ئارامگای پیاوچاكان دەڕازێننەوە، [30] ئینجا دەڵێن: گەر لەسەردەمی باپیرانماندا بژیایینایە، بەشداری خوێن ڕشتنی پێغەمبەرانمان لەگەڵیاندا نەدەكرد. [31]ئا بەمە شایەتی لەسەر خۆتان دەدەن، كە باپیرانتان خوێن ڕێژی پێغەمبەران بوون! [32]جا ئەوەی باپیرانتان دەستیان پێ‌كرد ئێوە تەواوی كەن، باجام پڕبێت.

[33]ئەی مارەكان، نەوەی ئەژدیها، چۆن لەسزای دۆزەخ هەڵدێن؟ [34]ئا لەبەرئەمەیە من پێغەمبەرو پیاوی داناو مامۆستاتان بۆ دەنێرم. هەندێكیان دەكوژن‌و لەخاچیان دەدەن، هەندێكی تریشیان لەكەنیشتەكانتان بەر قامچی دەدەن‌و لەشارێكەوە بۆ شارێكی دیكە دەربەدەریان دەكەن. [35]بەم جۆرە چی خوێنی پیاوچاكان لەم سەر زەمینەدا ڕژاوە دەكەوێتە ملتان لەخوێنی هابیلی بێ‌تاوانەوە تا خوێنی زەكەریا* كوڕی بەرخیا كە ئێوە لەنێوان پەرستگاو قوربانگەدا كوشتتان. [36]ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: ئۆبالّی ئەمانە هەموو دەكەوێتە ملی ئەم نەوەیە.)

### غەمباری عیسا سەبارەت بە قودس

[37](ئەی قودس، ئەی قودس، بكوژی پێغەمبەران‌و بەردبارانكەری ئەوانەی نێرران بۆ لات! چەند جار ویستم منداڵەكانت كۆبكەمەوە، هەروەك چۆن مریشك جوجەڵەكانی لەژێر باڵی كۆدەكاتەوە، بەلاّم نەتانویست. [38]ئا ئەوەتا ماڵەكەتان بە كەلاوەیی بۆتان بەجێ‌دەهێڵرێ! [39]چونكە پێتان دەڵێم، ئیتر ئێوە من نابیننەوە، هەتا نەڵێن: {پیرۆزە ئەوەی بەناوی خوداوەندەوە دێت.})

### پێشبینی وێرانبوونی پەرستگا

## 24

دوای ئەوەی عیسا لەپەرستگا هاتەدەرەوە، قوتابیەكانی لێی نزیك بوونەوە هەتا سەرنجی بۆ خانووەكانی پەرستگا ڕابكێشن. [2]جا عیسا پێی ووتن: (ئا ئەم هەموو خانووە دەبینن؟ ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: بەردی بەسەر بەردەوە نامێنێ، بەڵكو هەمووی دەڕوخێنرێ.)

## نیشانەکانی کۆتایی زەمانە

[3]کاتێ لەسەر کێوی زەیتون دانیشتبوو، قوتابیەکانی بەتەنها لێی نزیك بوونەوەو پێیان ووت: (پێمان بڵێ کەی ئەمە ڕوودەدات؟ هەروەها نیشانەی گەڕانەوەت‌و کۆتایی زەمانە چییە؟) [4]عیسا وەڵامی دایەوە: (ئاگاداربن، کەس هەڵتان نەخەڵەتێنێ. [5]چونکە زۆر کەس بەناوی منەوە دێن‌و دەڵێن، من مەسیحم‌و زۆر کەس هەڵدەخەڵەتێنن. [6]هەروەها جەنگ‌و دەنگوباسی جەنگ دەبیستن، ئاگاداربن، نەترسن، پێویستە ئەمانە هەمووی ڕووبدات، بەلاّم هێشتا کۆتایی نییە. [7]چونکە میللەتان دەچن بەگژ یەکتریداو پادشاهێتی بەگژ پادشاهێتی دیکەدا، برسێتی‌و بومەلەرزە لەزۆر شوێن ڕوودەدات. [8]بەلاّم ئەمانە هەمووی ژانی یەکەمە. [9]ئینجا خەڵکی دەتان دەن بەدەستەوە بۆ ئازاردان‌و دەتانکوژن، هەموو گەلان لەپێناو ناوی من ڕقیان لێتان دەبێتەوە. [10]هەروەها زۆر کەس لەباوەڕیان وەردەگەڕێن‌و یەکتری دەدەن بەدەستەوەو ڕقیان لەیەکتری دەبێت. [11]زۆر پێغەمبەری درۆزن دەردەکەون، زۆر کەس هەڵدەخەڵەتێنن. [12]ئینجا کەگوناه بلاّوبووەوە، خۆشەویستی لەدڵی زۆر کەس نامێنێ. [13]بەلاّم ئەوەی تا کۆتایی خۆی ڕادەگرێ، ڕزگاری دەبێت. [14]مزگێنی ئەم پادشاهێتییە لە هەموو جیهان ڕادەگەێندرێ، وەك شایەتییەك* بۆ من لای هەموو میللەتان، ئینجا کۆتایی دێ.

## گەورەترین تەنگانە

[15](کاتێ پیسی کاولبوون لەشوێنی پیرۆزدا دەبینن، (ئەوسا باخوێنەر تێبگات،) ئەوەی لەسەر زمانی پێغەمبەر دانیال ووتراوە، [16]ئینجا ئەوانەی لەناوچەی یەهودیان با ڕابکەن بۆ چیا، [17]ئەوەش کە لەسەربانە، با نەیەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی شتێك لەماڵەکەی ببات. [18]هەروەها ئەوەی لەکێڵگەیە با نەگەڕێتەوە. هەتا جلەکەی لەگەڵ خۆی ببات. [19]خاك بەسەر سك‌پڕو شیردەر لەوڕۆژانەدا! [20]نوێژ بکەن با ڕاکردنتان لەزستاندا یان لەشەممەدا نەبێت. [21]چونکە تەنگانەیەکی واگەورە ڕوودەدات، کە لەدروستکردنی جیهانەوە

تائێستا شتی وا نەبوویێتو هەرگیز ناشبێت. [22]گەر بێتو ئەو ڕۆژانە کەم نەکرێتەوە، کەس ڕزگاری نابێت. بەلاّم لەپێناوی ئەوانەی هەلّبژێرراون، ئەو ڕۆژانە کەم دەکرێتەوە. [23]جا ئەو کاتە گەر یەکێك پێیووتن: ئەوەتا مەسیح لێرەیە یان لەوێیە، باوەڕ مەکەن، [24]چونکە چەند مەسیحێکی فێلّبازو پێغەمبەری درۆزن دەردەکەون، نیشانەی گەورەو شتی سەرسوڕهێنەر دەکەن، بەشێوەیەك گەر بتوانن تەنانەت هەندێ لەهەلّبژێراوەکانیش هەلّدەخەلّەتێنن. [25]ئەوەتا من پێشتر ئاگادارتان دەکەمەوە، [26]گەر خەلّکی پێیان ووتن: ئەوەتا مەسیح لەدەشتە! مەڕۆن بۆ دەشت، یان ئەوەتا لەژوورەوەیە! باوەڕ مەکەن. [27]چونکە چۆن هەورە تریشقە لەرۆژهەلاّتەوە بریسکە دەدات، لەڕۆژئاواوە ڕووناکی دەردەکەوێ، گەڕانەوەی ڕۆلّەی مرۆڤیش ئاوها دەبێت. [28]جا هەرشوێنێك کەلاکی لێبێت، دالّ لێی کۆدەبێتەوە.

**هاتنەوەی عیسا**

([29]دوای ڕۆژانی ئەو تەنگانەیە، ڕۆژ تاریك دەبێت، تیشکی مانگ دەگیرێ، ئەستێرەکان لەشوێنی خۆیان دەکەونە خوارەوەو هێزی ئاسمان تێك دەچێت. [30]ئینجا نیشانەی ڕۆلّەی مرۆڤ لەئاسماندا دەردەکەوێ، هەموو خێلّەکانی سەر زەمین دەست دەکەن بەگریان، جا ڕۆلّەی مرۆڤ دەبینن، لەسەر هەوری ئاسمان بەهێزو شکۆیەکی مەزنەوە دێت. [31]فریشتەکانی بەکەرەنایەکی گەورەوە دەنێرێ، تاکو هەلّبژێرراوانی خودا لەهەر چوار گۆشەی جیهانو لەم سەرو ئەوسەری ئاسمانەوە کۆبکەنەوە.

**لە دار هەنجیر فێربن**

([32]ئەم نموونەیە لەدار هەنجیر فێربن، کاتێ لقەکانی نەرم بوونو گەلاّیان دەرکرد، ئەوا دەزانرێ هاوین نزیك بووتەوە. [33]هەرووەها کە ئەم هەموو شتانەتان بینی ڕوودەدات، بزانن ئەو نزیکە بەلّکو لەبەر دەرگایە. [34]ڕاستیتان پێدەلّێم: ئەم نەوەیە بەسەر ناچێ، هەتا ئەم شتانە هەمووی ڕوونەدات. [35]ئاسمانو زەوی بەسەر دەچن، بەلاّم ووتەکانم هەرگیز بەسەر ناچن.

**ئەو كاتەی كەس نایزانێ**

(36ئەو ڕۆژو ئەو كاتە، كەس نایزانێ، نەفریشتەكانی ئاسمان، نەڕۆڵە، تەنها باوك نەبێ. 37سەردەمی نوح چۆن بوو، گەڕانەوەی ڕۆڵەی مرۆڤیش هەروا دەبێت. 38خەڵكی پێش ڕۆژانی لافاوەكە دەیانخواردو دەیانخواردەوە، ژنیان دەهێناو شوویان دەكرد، تا ئەو ڕۆژە هات كە نوح چووە ناو كەشتیەكەوە، 39بە خۆیان نەزانی هەتا لافاوەكە هاتو هەموویانی برد. هاتنەوەی ڕۆڵەی مرۆڤیش هەروا دەبێت. 40لەو كاتەدا دوو پیاو لەكێڵگە دەبن، یەكێكیان دەبرێو ئەوی‌كە بەجێدەهێڵرێ. 41دوو ژن دەستار دەكەن، یەكێكیان دەبرێو ئەوی‌كە بەجێ دەهێڵرێ. 42لەبەرئەوە ئێشك بگرن، چونكە نازانن لەچ كاتێكدا خوداوەندتان دەگەڕێتەوە. 43ئەوەش بزانن، گەر گەورەی ماڵ بزانێ شەو لەچ كاتێك دز دێتە سەری، ئێشك دەگرێو نایەڵێ ماڵەكەی ببرێت. 44كەواتە ئێوەش ئامادەبن، چونكە ڕۆڵەی مرۆڤ لەكاتێكدا دەگەڕێتەوە كە نایزانن.

**نموونەی كۆیلەی سەرڕاست**

(45كەواتە كێیە ئەو كۆیلە سەرڕاستو دانایەی گەورەی ماڵ دایدەنێ بەسەر ئەوانەی لەماڵەكەیدان تاكو لەكاتی خۆیدا خواردنیان بۆ ئامادە بكات؟ 46خۆزگە دەخوازرێ بەو كۆیلەیە كاتێ گەورەكەی دەگەڕێتەوە دەبینێت وا بەكاری خۆی هەڵدەستێت. 47ڕاستیتان پێدەڵێم: ئینجا گەورەی ماڵ هەموو ماڵەكەی خۆی دەخاتە بەردەست ئەو كۆیلەیە. 48بەڵام گەر بێتو كۆیلەكە لەدڵی خۆی بڵێت: گەورەم لەهاتنەوەدا دوادەكەوێ، 49ئینجا دەست بكات بەلێدانی كۆیلەكانی دیكە، بخواو بخواتەوە لەگەڵ سەرخۆشان. 50ڕۆژێ دەبێت گەورەی ماڵ تیایدا بگەڕێتەوە كە ئەو نایزانێت، كاتێك ئەو دركی پێناكات، 51ئەوسا كۆیلەكەی سزا دەدات، بەشی لەگەڵ دووڕوواندا دەبێت، جا لەوێ دەبێت بەگریانو چرکە چرکی ددان.)

**نموونەی كچە داناكانو كچە نەفامەكان**

# 25

(پادشاهێتی ئاسمان وەك دە کچ وایە، چرایان هەڵگرتبێت‌و بەرەو پیری زاوا هاتبن. [2]پێنج لەوان دانا بوون، پێنجیش نەفام. [3]نەفامەکان چراکانیان لەگەڵ خۆیان برد، بی‌ئەوەی نەوتی زیادە بەرن. [4]بەڵام داناکان لەگەڵ چراکانیان نەوتی زیادەیان خستە قووتوویەکەوەو لەگەڵ خۆیان بردیان. [5]کاتێ زاوا دواکەوت هەموو خەو بردنیەوەو نووستن. [6]لەنیوە شەودا دەنگ بەرزبووەوە: ئەوەتا زاوا هات، هەموو چوون بەرەو پیری! [7]کچانیش هەستان تا چراکانیان ئامادە بکەن. [8]نەفامەکان بەداناکانیان ووت: تۆزێ نەوتمان بدەنێ لەوەی خۆتان، چونکە چراکانمان دەکوژێتەوە! [9]داناکان وەڵامیان دایەوە: لەوانەیە بەشی ئێمەو ئێوەش نەکات. وا چاکترە بچنە لای نەوت فرۆش، نەوت بۆ خۆتان بکرن! [10]لەکاتێکدا نەفامەکان رۆیشتن بۆ نەوت کرین، زاوا گەیشت، ئەوانەی ئامادەبوون لەگەڵی چوونە ناو هۆڵی شاییەکە، ئینجا دەرگا داخرا. [11]دوای ماوەیەك ئەوانی دیکە گەڕانەوەو ووتیان: گەورەم، گەورەم، دەرگامان لێبکەرەوە. [12]زاوا وەڵامی دایەوە: راستیتان پێ دەڵێم، من ناتان ناسم. [13]کەواتە ئێشك بگرن، چونکە رۆژو کاتی گەڕانەوەی رۆڵەی مرۆڤ نازانن.

**نموونەی دواکەوتنی گەورەی ماڵ**

([14]هەروەها پادشاهێتی ئاسمان لەپیاوێك دەکات کە دەیەوێ گەشت بکات، کۆیلەکانی بانگ دەکاو ماڵەکەیان دەداتە دەست. [15] بەیەکێکیان پێنج بەش‌و بەوی‌کە دوو بەش و بەسێهەم یەك بەش زیویان پێ‌دەدات. هەریەکە بەپێی توانای خۆی، ئینجا دەڕوات. [16]ئەوەی پێنج بەشە زیوەکە وەردەگرێ، یەکسەر دەڕوات‌و دەست دەکات بەبازرگانی پێوەی، ئەوسا پێنج بەشی دیکەش بەدەست دەهێنێ. [17]هەروەها ئەوەی دوو بەشەکە وەردەگرێ هەمان شت دەکات، ئەویش دوو بەشی دیکە بەدەست دەهێنێ. [18]بەڵام ئەوەی یەك بەشەکە وەردەگرێ، دەڕوات لەزەویدا چاڵێك هەڵدەکەنێ و زیوی گەورەکەی تیا دەشارێتەوە. [19]دوای ماوەیەکی زۆر کاتێ گەورەی ئەو کۆیلانە دەگەڕێتەوە، بانگیان دەکات

بۆ لێپرسینەوە. [20]ئەوەی پێنج بەشەکەی وەرگرتبوو، دێتە پێشەوە پێنج بەشی کەش لەبەردەمی دادەنێو دەڵێ: گەورەم تۆ پێنج بەشت دامێ، ئەمەش پێنج بەشی کەیە کە بەدەستم هێناوە. [21]گەورەکەی پێی دەڵێت: باشت کرد ئەی کۆیلەی چاکو دەست پاك. دەست پاك بوویت لەکەمدا، زۆرت پێدەسپێرم. وەرە ژوورەوە بۆ خۆشی گەورەکەت [22] هەروەها ئەوەی کە دوو بەشەکەی وەرگرتبوو دێتو دەڵێ: گەورەم تۆ دوو بەشت دامێ، ئەمەش دوو بەشی دیکەیە کە بەدەستم هێناوە.

[23]گەورەکەی پێی دەڵێت: باشتکرد ئەی کۆیلەی چاکو دەستپاك! دەستپاك بوویت لەکەمدا، زۆرت پێدەسپێرم. وەرە ژوورەوە بۆ خۆشی گەورەکەت. [24] ئینجا ئەوەی یەك بەشەکەی وەرگرتبوو دێتو دەڵێت: گەورەم، زانیم تۆ پیاوێکی دڵرەقی دروێنە دەکەی لەشوێنێك کە نەت رواندووە، کۆدەکەیتەوە لەشوێنێك کە نەت چاندووە، [25]ترسام، رۆیشتم بەشە زیوەکەم لەناو زەویدا شاردەوە. ها ئەوەماڵەکەتە. [26]گەورەکەی پێی‌دەڵێت: ئەی کۆیلەی خراپو تەوەزەل! زانیت من دروێنە دەکەم بێ رواندنو کۆدەکەمەوە بێچاندن، [27] جا باشتر وابوو ماڵەکەمت لای پارەگۆڕەوەکان دابنایە، تا دوای گەڕانەوەم لەگەڵ سوودەکەی وەرم بگرتایەوە. [28]ئا ئەو بەشەی لێبسەننەوە بیدەن بەوەی دە بەشەکەی پێبوو. [29]هەر کەسێ هەیبێ، زۆرتری پێدەدرێ، تا لێی دەڕژێ، بەلام ئەوەی کە نییەتی ئەوەندەی کەهەشییەتی لێی دەسەندرێتەوە. [30]ئا ئەم کۆیلە بێسوودە، فڕێ بدەنە تاریکی دەرەوە، جا لەوێ دەبێ بەگریانو چرکەچرکی ددان.

**عیسا حوکم بەسەر جیهان دەدات**

[31](کاتێ رۆڵەی مرۆڤ لەگەڵ فریشتەکانی بەشکۆمەندی دەگەڕێتەوە، دادەنیشێ لەسەر تەختی شکۆمەندی خۆی. [32]هەموو نەتەوەکان کۆدەبنەوە لەبەردەمیدا، ئەویش هەندێکیان لەوی دیکەیان جیا دەکاتەوە وەك چۆن شوان مەڕ لەبزن جیادەکاتەوە. [33]جامەڕەکان لەلای راستی خۆی رادەگرێو

بزنەکانیش لەلای چەپیەوە. [34]ئینجا پادشا بەوانەی لای ڕاستیەوەن دەڵێ: وەرن ئەی ئەوانەی باوکم پیرۆزی کردوون، ئەو پادشاهیەتیە وەرگرن کە لەدروستکردنی جیهانەوە بۆتان ئامادەکراوە. [35]چونکە برسی بووم تێرتان کردم، تینوو بووم ئاوتان داپێم، نامۆ بووم جێگەتان کردمەوە. [36]ڕووت بووم جلتان لەبەرکردم، نەخۆش بووم سەرتان لێدام، دیل بووم هاتن بۆ لام. [37]ئەوسا ڕاستودروستان وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن: ئەی گەورە، کەی تۆمان بەبرسێتی دیوە نانمان داویتێ؟ یان بەتینوێتی ئاومان داویتێ؟ [38]کەی تۆمان بەنامۆیی دیوەو جێگەمان کردویتەوە یان بەڕوتی جلمان لەبەرکردویت؟ [39]کەی تۆمان دیوە بەنەخۆشی یان دیلی سەرمان لێداوی؟ [40]ئینجا پادشا وەڵامیان دەداتەوە: ڕاستیتان پێدەڵێم: هەرشتێك ئێوە بۆ یەکێ لەم برا بچوکانەم کردووتانە، بۆ منتان کردووە. [41]دوای ئەوە بەوانەی لەلای چەپیەوە ڕاوەستاون دەڵێت: دوورکەونەوە لێم ئەی نەفرەت لێکراوینە بۆ دۆزەخی هەتاهەتایی، ئەوەی بۆ شەیتانو دەستو پێوەندەکەی ئامادەکراوە. [42]چونکە برسی بووم تێرتان نەکردم، تینوو بووم ئاوتان نەدامێ، [43]نامۆ بووم شوێنتان نەکردمەوە، ڕوت بووم جلتان لەبەرنەکردم، نەخۆش بووم سەرتان لێنەدام، دیل بووم نەهاتنە لام. [44]ئینجا ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە، دەڵێن: ئەی گەورە، کەی تۆمان دیوە بەبرسێتی، بەتینوێتی، بەنامۆیی، بەڕوتی، بەنەخۆشی، بەدیلیو یارمەتیمان نەداوی؟ [45] وەڵامیان دەداتەوە: ڕاستیتان پێدەڵێم: هەر شتێکتان بۆ یەکێ لەم برا بچووکانەم نەکردووە، بۆ منتان نەکردووە. [46]ئینجا ئەوانە بۆ سزای هەتاهەتایی دەچنو ڕاستودروستەکانیش بۆ ژیانی هەتاهەتایی.)

### پلانێك بۆ کوشتنی عیسا

## 26

کاتێ عیسا ئەم ووتانەی هەموو تەواوکرد، بەقوتابیەکانی ووت: [2] (ئێوە دەزانن کەدوو ڕۆژیکە جەژنی تێپەڕبوون دێت. ئەوسا ڕۆڵەی مرۆڤ، دەدرێ بەدەستەوە تاکو لەخاچ

بدریێ.) [3]ئینجا سەرۆك كاهینەكانو پیرانی گەل لەماڵی یەكێ لەسەرۆك كاهینەكان* كەناوی قەیافا بوو كۆبوونەوە، [4]تەگبیریان لەعیسا دەكرد بەفێڵێ بیگرنو بیكوژن. [5]بەڵام ووتیان: (ئەمە لەجەژندا ناكەین، نەوەك گەل بشلەژێت.)

**ئامادەكردنی عیسا بۆ ناشتنی**

[6]لەوكاتەی عیسا لەبەیتعەنیا لەماڵی شەمعونە گول بوو، [7]ژنێك هات بۆ لای بەشوشەیەك بۆنی گرانبەهاوە، بۆنەكەی ڕژاند بەسەریدا كاتێ لەسەرخوان بوو. [8]قوتابیەكان كە ئەمەیان بینی، زویر بوونو ووتیان: (ئەم دەست بلاویەی بۆچییە؟ [9]دەتوانرا ئەو بۆنە گرانبەهایە بفرۆشرایەو پارەكەی بەهەژاران بدرایە؟) [10]عیسا بەمەی زانی، پێی ووتن: (بۆچی ئەم ژنە زویر دەكەن؟ [11]ئەو شتێكی چاكی بۆ من كرد. هەژاران گشت كاتێ لای ئێوەن، بەڵام من گشت كاتێ ئاوا لاتان نابم. [12]ئەو بۆنەكەی بەسەرمدا ڕژاند، ئەمەی كرد بۆ ئامادەكردنم بۆ ناشتن. [13]ڕاستیتان پێدەڵێم: كاتێ بانگەوازی ئەم مزگێنییە* لەهەموو جیهاندا دەكرێ، یادی ئەوەش دەكرێ، كە ئەم ژنە بۆ منی كردووە.)

**ناپاكی یەهوزا**

[14]ئینجا یەكێك لەدوانزە قوتابیەكەی كە ناوی یەهوزای ئەسخەریوتی بوو ڕۆیشت بۆ لای سەرۆكی كاهینەكان، [15]ووتی: (چەندم پێدەدەن تا بیدەمە دەستتان؟) ئەوانیش سی دراوی زیویان بۆ دانا. [16]ئیتر لەوكاتەوە یەهوزا دەگەڕا بۆ هەلێك كەوا عیسا بدا بەدەستەوە.

**نانی جەژنی تێپەڕبوون**

[17]لەیەكەم ڕۆژی جەژنی فەتیرەدا*، قوتابیەكان هاتنە لای عیساو پرسییان: (لەكوێ دەتەوێت نانی جەژنی تێپەڕبوونت بۆ ئامادەبكەین؟) [18]وەلامی دانەوە: (بڕۆنە ناو شار، بۆ لای فلان كەس، پێی بلێن: مامۆستا دەڵێ كاتم نزیك بووتەوە، لەگەڵ قوتابیەكانم لای تۆ جەژنی تێپەڕبوون دەكەم.) [19]قوتابیەكان فەرمانی عیسایان جێبەجێ كرد، لەوێ نانی جەژنی تێپەڕبوونیان ئامادەكرد.

[20] عیسا ئێوارە لەگەڵ دوانزە قوتابیەکەی لەسەر خوان دانیشت. [21] لەکاتێکدا کە نانیان دەخوارد، عیسا ووتی: (ڕاستیتان پێ‌ئەڵێم: یەکێ لەئێوە دەمدات بەدەستەوە.) [22] قوتابیەکان بەمە خەمێکی قورس دایگرتن، هەریەك لەوان پرسیاریان لێکرد: (گەورەم، ئەوە منم؟) [23] وەڵامی دایەوە: (ئەوەی لەگەڵم دەست درێژ دەکات بۆ قاپەکە، ئەو دەمدات بەدەستەوە. [24] ڕۆڵەی مرۆڤ پێویستە بەو شێوەیە بڕوات، وەك لەکتێبی پیرۆز لەسەری نووسراوە. بەڵام خاك‌بەسەر ئەو کەسەی ڕۆڵەی مرۆڤ بەدەستەوە دەدات. باشتر بوو بۆ ئەو کەسە هەر لەدایك نەبووایە.) [25] ئینجا یەهوزا ئەوەی کە دەیدات بەدەستەوە، پرسیاری لێ‌کرد: (مامۆستا، ئایا ئەو کەسە منم؟) وەڵامی دایەوە: (خۆت ووتت.)

**دوا نان خواردن**

[26] لەکاتی نان خواردن عیسا نانێکی هەڵگرت، دوای سوپاس کردن، پارچە پارچەی‌کردو دای بەقوتابیەکانو ووتی: (بگرن، بخۆن، ئا ئەمە لەشی منە.) [27] ئینجا جامێکی هەڵگرت، سوپاسی خودای کرد، دای پێیانو ووتی: (هەموو لێی بخۆنەوە! [28] چونکە ئەمە خوێنی منە بۆ پەیمانی نوێ* ئەو خوێنەی لەپێناوی زۆر کەس دەڕژێ، بۆ گوناە بەخشین. [29] پێتان دەڵێم: من لەمڕۆ بەدواوە لەبەرووبوومی مێو ناخۆمەوە، تا ئەو ڕۆژە دێت کە سەر لەنوێ لەپادشاهێتی باوکم لەگەڵتان دەی‌خۆمەوە.) [30] دوای ئەوەی گۆرانی ڕۆحیان ووتەوە، چوونەدەرەوە بۆ کێوی زەیتون.

**نکۆڵی‌کردنی پەترۆس**

[31] ئینجا عیسا پێی ووتن: (ئەمشەو هەمووتان لەمن دەکەونە گومانەوە، چونکە لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە: {لەشوانەکە دەدەم، مەڕی مێگەلەکە پەرش‌و بڵاودەبنەوە. } [32] بەڵام ئەوە بزانن کە دوای زیندووبوونەوەم پێشتان دەکەوم بۆ جەلیل.) [33] پەترۆس وەڵامی دایەوە: (گەر هەموو لێت بکەونە گومانەوە، من گومانت لێ‌ناکەم.) [34] عیسا پێی ووت: (ڕاستیت پێ‌دەڵێم: هەر ئەمشەو پێش ئەوەی کەڵەشێر بخوێنێ تۆ سێ جار نکۆڵیم لێدەکەیت.) [35]

پەتـرۆس ووتی: (گەر لـەگەڵت بمرم، نکۆڵیـــت لیـّــناکەم.) هـــەروەها قوتابیەکانیش هەموو وایان ووت.

**نوێژی عیسا لە باخی جەسیمانی**

[36]دوای ئـەوە عیسـاو قوتابیەکان چـوون بۆ باخێك پێیدەووترێ باخی جەسیمانی، پێیووتن: (لێرە دانیشن، دەچـم نوێژ دەکەم.) [37]لەگەڵ خۆی پەتـرۆس و دوو کورەکـەی زەبـدی بـرد، پـەژارەو دڵتەنگی دایگرتبوو. [38]پـێیووتن: (ئـەوەندە دڵم تەنگە تا مردن، لێرە بمێننەوەو لـەگەڵم شەوارە بگــــرن.) [39]کەمـــێك لیـّــیان دوورکەوتەوە، بەسەر ڕوودا کەوتو دەسـتی کـرد بەنوێژکـردن، ووتـی: (ئـەی بـاوك، گەر دەبێت ئەم جامەم لـیّدووربخـەرەوە. بـەڵام نـەك وەك ئـەوەی خـۆم دەمەوێت، بەڵکو وەك ئـــەوەی تـــۆ دەتـــەوێ.) [40]ئیـــنجا گەڕایەوە بۆ لای قوتابیەکان، کە بینی نووسـتوون، بەپەترۆسـی ووت: (ئـا ئاوهــا نەتانــتوانیکاژێرێك لـەگــەڵم ئێشـك بگرن؟ [41]ئێشك بگرنو نوێژ بکەن نەوەك بکەونە تاقیکردنەوەوە. ڕۆح چالاکە، بەڵام لەش لاوازە.) [42]بـۆ جـاری دووەم ڕۆیشـتەوە نوێـژ بکـات، ووتـی: (ئـەی باوکی خۆم، گـــەر خواردنـــەوەی ئـــەم جامـــەم لـیّدوورناخەیـــتەوەو هەردەبێـــت ببێـت. بـا وابێتو بەخواستی تۆبیّ.) [43]ئینجا گەڕایەوە بۆ لای قوتابیەکانو بیـنی دیسـان نووستون، چونکە خەو چاوی قورس کردبوون. [44]ئیتر وازی لـیّهێنان، بۆ جاری سێهەم گەڕایەوە تـا نوێــژ بکــات، هــەمان ووتــەی دووبارەکـردەوە. [45]دوایـی گەڕایەوە بـۆ لای قوتابـیەکانو ووتـی: (ئـەوە هێشـتا نووسـتوونو پشـوو دەدەن؟ ئـەوەتا کـاتی ئەوە نزیك بووتەوە کە ڕۆڵــەی مــرۆڤ بدرێــتە دەســت گوناهباران. [46]هەسـتن بابڕۆین! ئەوا ئـەوەی دەمـدات بەدەسـتەوە نزیـك بووەوە.)

**گرتنی عیسا**

[47]لەوکاتـەی دەدوا، یـەهوزا کە یەکیّ بوو لـەدوانزە قوتابیەکە، لـەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر بەشمشێرو کوتەکەوە گەیشـتنە ئەویّ، کە لـەلایەن سەرۆك کاهینو پیرانی گەلـەوە نێرابوون. [48]ئـــەوەی عیســـا دەدات بەدەســـتەوە نیشانەیەکی دابوونیّو پێیانی ووتبوو: (ئـەوەی ماچی دەکەم، ئەوە خۆیەتی،

بیگرن.) [49]لەعیسا نزیك بووەوەو ووتی: (سلاو ئەی مامۆستا.) ئینجا ماچی‌کرد. [50]ئەوسا عیسا ووتی: (ئەی دۆستی من، ئەوەی بۆی هاتووی بیکە.) ئینجا ئەوانەی لەگەڵی هاتبوون لەعیسا هاتنە پێشەوەو گرتیان. [51]یەکێ لەوانەی لەگەڵ عیسادا بوو دەستی بۆ شمشێرەکەی درێژکرد، دەری هێناو لەیەکێ لەکۆیلەکانی سەرۆك کاهینەکانی‌داو گوێی بڕی. [52]عیسا پێی ووت: (شمشێرەکەت بگەڕێنەوە ناو کێلانەکەی خۆی، چونکە ئەوانەی شمشێر هەڵدەگرن، بە شمشێر لەناو دەچن. [53]ئایا وا دەزانیت ناتوانم داوا لەباوکم بکەم زیاتر لەدوانزە لەشکر فریشتەم بۆ بنێرێت؟ [54]بەلام ئیتر چۆن ئەوەی لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە بێتەدی، کە دەڵێ دەبێ بەوشێوەیە ڕوو بدات؟) [55]ئینجا عیسا ووتەکانی ئاراستەی خەڵکەکە کردو ووتی: (هەروەك چۆن بە شمشێرو کوتەکەوە دەچن بۆ دزێك، ئاوها دەتانەوێ بمگرن؟ هەموو ڕۆژ لەنێوانتان بووم لەپەرستگا خەریکی فێرکردن بووم، کەچی نەتان گرتم. [56]بەلام، ئەمانە هەمووی ڕوویدا، هەتا پەرتووکی پێغەمبەران بێتەدی))، لەو کاتەدا قوتابیەکانی هەموو بەجێیان هێشت‌و ڕایان‌کرد.

**دادگایی‌کردنی عیسا**

[57]ئەوانەی عیسایان گرت، بردیان بۆ لای قەیافا کە سەرۆك کاهین بوو. لەوکاتەدا مامۆستایانی شەریعەت‌و پیران لای کۆبووبوونەوە. [58]پەترۆس دوور بەدوور دوایان‌کەوت بۆ ماڵی سەرۆکی کاهینەکان، ئینجا چووە ژوورەوەو لەناو پاسەوانەکان دانیشت تاکۆتایی مەسەلەکە ببینێت. [59]سەرۆك کاهینەکان‌و ئەنجومەنی بالای جوولەکەو پیران هەموویان دەگەڕان بەدوای شایەتییەکی درۆدا دژی عیسا، تاوەکو بیکوژن، [60]بەلام هیچی وایان نەدۆزیەوە، زۆر لەوانەی کە بەدرۆ تاوانیان دەخستە پاڵ عیسا ئامادەبوون لەوێ. لەدواییدا دووان هاتنە پێشەوە، [61]ووتیان: (ئا ئەمە ووتی: من دەتوانم پەرستگای خودا بڕوخێنم‌و لەماوەی سێ ڕۆژ دروستی بکەمەوە.) [62]لەوێ سەرۆکی کاهینەکان هەستاو لێی‌پرسی: (ئایا وەلامت چییە

دەربارەی ئەوەی ئەم دووانە پێت دەڵێن؟) [63] بەڵام عیسا بەبیٚدەنگی مایەوە، دیسان سەرۆك كاهین پرسیاری لیٚكردو ووتی: (سوێندت دەدەم بە خودای زیندوو، پێمانبڵیٚ، ئایا تۆ مەسیحی ڕۆڵەی خودای؟) [64] عیسا وەڵامی دایەوە: (خۆت ووتت. هەروەها پێشتان دەڵێم، لەئێستەوە ڕۆڵەی مرۆڤ دەبینن لەلای دەستە ڕاستی خودای بەتواناوە دادەنیشێت، ئینجا لەدواییدا لەسەر هەوری ئاسمانەوە دەبینریٚ دیٚتەوە.) [65] سەرۆكی كاهینەكان كراسی خۆی دادڕیو هاواریكرد: (ئەوەتا كفر دەكات! ئیتر پێویستمان بەشایەت نییە. ئا ئەوەتا ئێوە گوێتان لەكفرەكەی بوو. [66] ڕاتانچیە؟) وەڵامیان دایەوە: (شایانی مردنە!) [67] ئینجا تفیان لەڕووی كردو لێیاندا. هەندێكیشیان بەزللە لێیان دەداو دەیان ووت: [68] (ها ئەی مەسیح پێمان بڵیٚ، كیٚ بوو لێیدایت؟)

**پەترۆس نكۆڵی لەعیسا دەكات**

[69] لەو كاتەدا پەترۆس لەحەوشەی خانووەكەدا دانیشتبوو. یەكیٚ لەكارەكەرەكانی ئەویٚ هاتە لایو پێیووت: (تۆش لەگەڵ عیسای جەلیلی بوویت.) [70] پەترۆس ڕەتیكردەوەو ووتی: (من نازانم تۆ چی دەڵێیت!) [71] ئینجا پەترۆس چووە لای دەروازەی خانووەكە، كارەكەرێكی كەش ناسیەوەو بەوانەی لەویٚ بوون ووتی: (ئا ئەمەش لەگەڵ عیسای ناسری بوو!) [72] بۆ جاری دووەم پەترۆس نكۆڵی لیٚكردو سوێندی خوارد: (من ئەو پیاوە ناناسم!) [73] دوای ماوەیەك ئەوانەی لەویٚ ڕاوەستابوون لەپەترۆس هاتنە پێشەوەو پێیان ووت: (لەڕاستیدا تۆ یەكێكیت لەوان، شێوەی قسەكردنت ئەوە دەردەخات.) [74] پەترۆس دەستیكرد بەناڕەزایی دەربڕینو سوێند خواردنو ووتی: (من ئەو پیاوە ناناسم!) دوای ئەمە دەستبەجیٚ كەڵەشێری بەیانی خوێندی. [75] ئەوسا پەترۆس قسەكانی عیسای بیركەوتەوە كاتیٚ ووتی: (پێش ئەوەی كەڵەشێر بخوێنیٚ سیٚجار نكۆڵیم لێدەكەیت.) ئینجا چووە دەرەوەو گریانێكی بەكوڵ گریا.

## عیسا دەدرێتە دەست پیلاتۆس

# 27

کاتێ ڕۆژ بووەوە، سەرۆك کاهینەکانو پیرانی گەل تەگبیریان لەعیسا کرد تابیکوژن. 2جا بەدەست بەستراوی بۆ لای پیلاتۆسی* فەرمانڕەوایان برد.

## یەهوزا خۆی دەکوژێ

3کاتێ یەهوزا، ئەوەی کە دابووی بەدەستەوە، بینی حوکم بەسەر عیسادا درا، پەشیمان بووەوە، سی پارچە زیوەکەی بۆ سەرۆك کاهینو پیران گەڕاندەوەو 4ووتی: (هەڵەم کرد کاتێ بێتاوانێکم دابەدەستتانەوە.) وەڵامیان دایەوە: (ووتیان، ئەمە پەیوەندی بە ئێمەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەخۆتەوەیە.) 5ئینجا یەهوزا پارچە زیوەکانی لەپەرستگادا فڕێداو ڕۆیی، دوای ئەوە چوو خۆی هەڵواسیو خۆی خنکاند. 6سەرۆك کاهینەکان پارچە زیوەکانیان هەڵگرتەوەو ووتیان: (ئەمە نرخی خوێنە، ناشێ بۆمان بیخەینە گەنجینەی پەرستگاوە.) 7دوای تەگبیرکردن، بەو پارەیە زەوی کابرایەکی گۆزە دروستکەریان کڕی، تاکو بیکەن بەگۆڕستان بۆ بێگانەکان. 8لەبەر ئەمە هەتا ئێستاش پێیدەووترێ زەوی خوێن. 9ئەوسا هاتەدی ئەوەی لەسەر زمانی ئیرمیای پێغەمبەرەوە ووتراوە: {سی پارچە دراوە زیوەکەیان وەرگرت، کەنرخی ئەوە، ئەو نرخەی لەلایەن ڕۆڵەکانی ئیسرائیل دانرا. 10ئینجا دایان بەو زەوییەی هی گۆزە دروستکەر بوو، هەروەك خوداوەند فەرمانی پێدابووم.}

## پیلاتۆس پرسیار لەعیسا دەکات

11عیسا بەرامبەر پیلاتۆسی فەرمانڕەوا ڕاوەستا، فەرمانڕەوا لێی پرسی: (ئایا تۆ پادشای جوولەکەی؟) وەڵامی دایەوە: (خۆت ووتت.) 12بەڵام کاتێ سەرۆك کاهینەکانو پیران تاوانیان ئاراستەیکرد هیچ وەڵامی نەدانەوە. 13پیلاتۆس ووتی: (ئایا گوێت لێنییە شایەتی لەدژت دەدەن؟) 14بەڵام عیسا تەنانەت بەووشەیەکیش وەڵامی نەدایەوە، فەرمانڕەوا لەمە زۆر سەرسام بوو.

## بڕیاری لەخاچ دانی عیسا

[15]فەرمانڕەوا کردبوویە پیشە، هەموو جەژنیّ گیراویّك ئازاد بكات لەوانەی کە گەل خۆی هەڵیدەبژێریّ. [16]لەو کاتەدا گیراویّکی بەناوبانگ لایان بوو، ناوی باراباس بوو. [17]کاتیّ خەڵکەکە کۆبووبوونەوە، پیلاتۆس لێیپرسین: (کێتان دەویّ بۆتان ئازادکەم، باراباس، یان عیسا ئەوەی کە پێیدەووتریّ مەسیح؟) [18]چونکە دەیزانی لەچاوپیسی عیسایان داوە بەدەستەوە. [19]کاتیّ فەمانڕەوا لەسەر تەختی حوکمڕانی دانیشتبوو، ژنەکەی هەواڵی بۆ ناردو ووتی: (هیچ شتی خراپ بەرامبەر ئەو کابرایە مەکە، ئەو بیّتاوانە بەهۆی ئەوەوە دوێنیّ شەو خەوێکی زۆر خراپم بینی.) [20]بەڵام سەرۆك کاهینەکانو پیران هانی خەڵکەکەیان دەدا بۆ ئەوەی داوای ئازادکردن بۆ باراباس بکەنو کوشتنیش بۆ عیسا. [21]دیسان پیلاتۆس پرسیەوە: (دەتانەویّ لەم دووانە کامیان ئازاد بکەم؟) وەڵامیان دایەوە: (باراباس.) [22]ئینجا پرسی: (ئەی چی لەعیسا بکەم کە بە مەسیح ناودەبریّ؟) هەموو وەڵامیاندایەوە: (با لە خاچ بدریّ!) [23]فەرمانڕەوا پرسیاریکرد: (باشە چ خراپەیەکی کردووە؟) زیاتر هاواریان کرد: (با لەخاچ بدریّ!) [24]کاتیّ پیلاتۆس بینی سوودی نییەو خەریکە ئاژاوە دروست دەبێت، ئاوی هێناو لەبەردەمیان دەستی شوشتو ووتی: (من بیّتاوانم لەخوێنی ئەم مرۆڤە، خۆتان ئەم کارە جیّبەجیّ بکەن!) [25]گەل هەموو وەڵامیان دایەوە: (باخوێنی بەملی ئێمەو منداڵمان بیّ!) [26]ئینجا ئەویش باراباسی بۆ ئازادکردن، بەڵام عیسا قامچی لیّدراو درایە دەست سەربازەکان بۆ لەخاچدان.

## سەربازەکان گاڵتە بەعیسا دەکەن

[27]سەربازەکان عیسایان بۆ خانووی فەرمانداری برد، لەشکریان هەموو لیّکۆکردەوە. [28]جلەکانیان لەبەرداکەندو جلێکی سووریان لەبەرکرد. [29]هەروەها تاجێکی دڕکیان چنیو لەسەر سەریان دانا، قامیشێکیان دایە دەستی ڕاستی، لەبەردەمی چۆکیان داداو گاڵتەیان پیّدەکردو دەیان ووت: (سڵاو لەتۆ ئەی پادشای جوولەکە!) [30]ئینجا تفیان لیّکرد، قامیشەکەیان

لیوەرگرتو بەسەریان کێشا. [31] دوای ئەوەی بەتەواوی گاڵتەیان پێکرد، کراسەکەیان لەبەر داکەندو کراسەکەی خۆیان لەبەرکردەوەو بردیان بۆ لەخاچدان.

**لەخاچدانو مردنی عیسا**

[32]لەوکاتەدا سەربازەکان عیسایان بۆ لەخاچدان دەبرد، پیاوێکی قەیرەوانییان بینی ناوی شەمعون بوو، ناچاریان کرد خاچەکەی* عیسا هەڵگرێ. [33]کاتێ گەیشتنە ئەو شوێنەی پێیدەووترێ گولگۆسە واتە شوێنی کاسەسەر، [34] شەرابی تێکەڵاو بە تاڵاویان دا بە عیسا تا بیخواتەوە، کە تامی کرد نەیویست بیخواتەوە. [35]ئینجا کاتێ لەخاچیان دەدا، کراسەکەیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکرد، دوای شیروخەتکردن لەسەری. [36]دوایی هەر لەوێ لەبەر خاچەکە دانیشتنو ئێشکیان گرت. [37]ئینجا لەژوورسەریەوە، ئەو تاوانەی پێیان تاوانبار کردبوو هەڵیانواسی کە نووسرابوو: (ئەمە عیسایە پادشای جوولەکە.) [38]لەگەڵیدا دوو دزیش لەخاچدران یەکێ لەدەستی ڕاستیەوەو یەکێکیش لەدەستی چەپیەوە. [39]هاتوچۆکەران جنێویان پێدەدوا سەریان ڕادەوەشاندو [40] دەیان ووت: (ئەی ڕووخێنەری پەرستگاو دروستکەرەوەی لەسێ ڕۆژدا، خۆت ڕزگار بکە، ئەگەر ڕاستە تۆ ڕۆڵەی خودای لەخاچەکە وەرە خوارەوە!) [41]هەروەها سەرۆک کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەتو پیرانی گەل گاڵتەیان پێدەکردو دەیانووت: [42](خەڵکی دیکەی ڕزگارکرد، بەڵام ناتوانێ خۆی ڕزگار بکات! ئایا ئەمەیە پادشای ئیسرائیل؟ دەبا ئێستا بێتەخوارەوە لەخاچەکە! هەموو باوەڕی پێدەهێنین. [43]پشتی بەخودا* بەست، گەر بەڕاستی خودا ئەمی بوێت ڕزگاری دەکات، چونکە دەیووت: من ڕۆڵەی خودام.) [44]دوو دزەکەش هەمان شت گاڵتەیان پێکرد.

**مردنی عیسا**

[45]لەکاژێری دوانزەی نیوەڕۆوە تا کاژێری سێی پاش نیوەڕۆ، تاریکایی بەسەر هەموو زەویدا هات. [46]لەدەوری کاژێری سێدا عیسا بەدەنگێکی بەرز هاواریکرد:

(ئـیلۆی، ئـیلۆی، لەما شەبەقتەنی؟) مانـای: (خودای‌مـن، خودای‌من، بۆ وازت لـیّ‌هێـنام؟) [47]کـاتیّ هـەندیّ لەوانـەی کـە ڕاوەسـتابوون گوێـیان لەمەبوو، ووتیان: (ئەوە ئەلیاس بانگ دەکـات!) [48]یـەکیّ لـەوان ڕای‌کرد ئەسـفەنجێکی هەڵگـرت، خسـتیە ناو سـرکەوەو کـردی بەسـەر قامیشـێکەوەو پیّی‌دا تا بیخواتەوە، [49]بـەڵام ئـەوانی دیکـە ووتیان: (وازی لـیّ‌بهێـنە، بـا بـزانین ئەلـیاس دێـت ڕزگـاری بکـات.) [50]ئێـنجا عیسـا جـارێکی دیکـە بەدەنگـێکی بـەرز هاواری‌کردو ڕۆحی سپارد. [51]ئەوسا دەسـتبەجیّ پـەردەی پەرسـتگا* لەسـەرەوە تـاخوارەوە دڕاو بـوو بـە دوو بەشـەوە، هەموو زەوی لەرزی‌و بـەردیش درزیـان بـرد، [52]گـۆڕ کـرایەوە، زۆر لەخوشـك‌و بـرا پیرۆزەکـان کە مردبوون هەستانەوە، [53]لـەگۆڕ هاتنەدەرەوە چوونە شاری پـیرۆز دوای زیـندووبونەوەی عیسا، زۆر کەسـیش ئـەوانی بیـنی. [54]بەڵام سـەرپەلەکەو ئـەو سـەربازانەی ئێشـکگری عیسـابوون، ترسـێکی زۆریـان لـیّ‌نیشـت، کـاتیّ زەوی لـەرزی‌و ئەمانـەیان دی، ووتـیان: (بەڕاسـتی ڕۆڵـەی خـودا بـوو!) [55]لـەدوورەوە چـەند ژنـێك سـەیریان دەکـرد چـی ڕوودەدات، ئەمانـیش ئەوانـە بـوون کە لەجەلیلەوە دوای عیسا کەوتبوون هەتا خزمەتی بکەن، [56]لەنێوانـیاندا مـریەمی مـەجدەلی‌و مـریەمی دایکـی یـاقوب‌و یوسـف، هـەروەها دایکـی هەردوو کوڕەکەی زەبدی تیابوو.

**ناشتنی عیسا**

[57]کـاتیّ ئـێوارە داهـات پیاوێکی دەوڵەمـەند نـاوی یوسـف بـوو، دانیشـتووی شاری ڕامە بوو، یەکێك بـوو لەقوتابـیەکانی عیسـا. [58]چووە لای پـیلاتۆس داوای تەرمەکـەی عیسـای لـیّ‌کـرد، ئـیتر پـیلاتۆس فـرمانی‌دا بیدرێـتیّ. [59]یوسـف تەرمەکـەی هێـناو بەکـەتانی پـاك پێچـای‌و [60]لـەگۆڕێکی تـازەدا کـە لەبـەرد هەڵکەنـرا بـوو ناشتی، ئینجا بـەردێکی گەورەی گلۆر کردەوە بۆ سـەر دەرگای گۆڕەکەو ئەوێی بەجیّ هێشـت. [61]هـەر لـەوناوە مـریەمی مـەجدەلـی‌و مـریەمەکەی دیکەیشی لـیّ‌بوو، بەرامـبەر گۆڕەکـە دانیشتبوون.

### ئێشکگرتنی گۆڕی عیسا

[62]بـــۆ بـــەیانی، دوای ڕۆژی خۆئامادەکـردنی شـەموان، سـەرۆك کاهینەکانو فەریسیـەکان بەیەکـەوە چـوونە لای پـیلاتۆس، [63]ووتـیان: (گـەورەم، بیرمان کەوتەوە ئەو گێرە شـێوێنە لـەکاتـێکدا زیـندوو بـوو ووتـی: مـن دوای سێ ڕۆژ زیندوو دەبمـەوە. [64]جـا فـەرمان دەربکـە بۆ پاس‌کردنی گۆڕەکەی بەچاکی نەوەك ڕۆژی سـێهەم قوتابـیەکانی بـێنو بـیدزن، ئەوسـا بەگـەل بلـێن ئـەو لەنـێوان مـردووان زیـندووبووتەوە. چونکـە گێرە شێوێنی دوایی لـەیەکەم خـراپتر دەبێـت.) [65]پیلاتۆس وەڵامی دایەوە: (پاسەوانتان هەیەو بڕۆن چۆن بەچـاکی دەزانن وا پاسی بکەن.) [66]ئەوانـــیش ڕۆیشـــتنو دەرگـــای گۆڕەکـەیان بـاش داخسـت، مۆریان لێداو پاسەوانییان کرد.

### زیندووبوونەوەی عیسا

## 28

لـــەڕۆژی یەکـــەمی هەفـــتەدا دوای شـــەممە، مـــریەمی مـــەجدەلـیو مـریەمەکەی دیکـە چـوون تەماشای گۆڕەکـە بکـەن. [2]بومەلـەرزەیـەکی بەهـێز ڕوویـدا، فریشـتەیەك لـەلایەن خوداوەنـــدەوە* لـــەئاسمان هاتـــە خـوارەوە، هاتو تلی بەبەردەکە داو لەســـەری دانیشـــت. [3]شـــێوەی فریشـــتەکە وەك بروســـکە وابـــوو. جلـــەکانی وەك بەفـــر ســـپیبوو. [4]ئـــەوەبوو پاســـەوانەکان ترســـیان لـێتیشتو وەك مردوویان لـێهات. [5]فریشـتەکە بـەدوو ژنەکـەی ووت: (مەترسـن، مـن دەزانم ئـێوە بەشوێن عیسای لەخاچدراودا دەگەڕێن. [6]ئەو لـێرە نیـیەو هەسـتاوەتەوە، هـەروەك خۆی ووتی، وەرن سەیری ئەو شوێنە بکـەن کـە ئـەو تـیایدا نـێژرابوو. [7]بەخـێرایی بڕۆنو هەواڵ بەقوتابیەکانی بـدەن، کـە ئـەو لەنـێوان مـردووان هەسـتاوەتەوە، ئـەوەتا ئـەو پێشـتان دەکـەوێ بـۆ جەلیل، لەوێ دەیبینن. ئـــەوا پـــێم ووتـــن.) [8]دوو ژنەکـــە بەخـێرایی ڕۆیشـتن، ترسـێکی زۆرو خۆشـییەکی گـەورە لەدڵـیانبـوو، ڕایـان‌کـرد بـۆ لای قوتابـیەکان بـۆ ئـەوەی پێـیان ڕابگەێنن. [9]لـەو کاتەی بـەڕێوە بـوون بـۆ بردنی ئەم هەواڵە، عیسـا خـۆی پێیان گەیشتو ووتی: (سـڵاو.) ئەمانـیش چـوونە پێشەوەو قاچیان گرتو کڕنوشیان بۆ برد. [10]

عیسا پێی ووتن: (مەترسن، بڕۆن بەبراکانم بڵێن بێن بۆ جەلیل، لەوێ دەمبینن.) [11]لەوکاتەدا دوو ژنەکە دەڕۆیشتن، هەندێ لەپاسەوانەکان چوون بۆ ناو شارو ئەوەی ڕووی دابوو بۆ سەرۆك کاهینەکانیان گێڕایەوە. [12]ئینجا سەرۆك کاهینەکانو پیران کۆبوونەوە تا لەم ڕووداوە بدوێن. پارەیەکی زۆریان دا بەسەربازەکانو [13]پێیان ووتن: (ئێوە بەخەڵکی بڵێن لەکاتێکدا خەوتبووین، قوتابیەکانی هاتوونو تەرمەکەی عیسایان دزیوە. [14]گەر هەواڵەکەش بەفەرمانڕەوا گەیشت، ئێمە لەسەرتان دەکەینەوە، بەم شێوەیە گیروگرفتتان بۆ نابێت.) [15]سەربازەکان پارەکەیان وەرگرت، چیان پێووترا کردیان، جا بەم شێوەیە هەواڵەکە لەنێوان جوولەکەدا بڵاوبووتەوە تا ئەمڕۆ.

### دەرکەوتنی عیسا بۆ قوتابیەکان

[16]ئیتر یانزە قوتابیەکە چوون بۆ ناوچەی جەلیل، بۆ ئەوکێوەی عیسا بۆی دەست نیشان کردبوون. [17]کاتێ بینیيان کڕنووشیان بۆ برد، بەڵام هەندێکیان گومانیانکرد. [18]عیسا لێیان نزیك بووەوەو ووتی: (هەموو دەسەڵاتێکی زەویو ئاسمانم پێبەخشراوە. [19]کەواتە بڕۆن، هەموو گەلان بکەن بە قوتابی. بەناوی باوکو ڕۆڵەو ڕۆحی پیرۆز لەئاویان هەڵکێشن. [20]فێریان بکەن با کار بکەن بەهەموو ئەو شتانەی ڕامسپاردون، ئەوەتا هەموو ڕۆژێك لەگەڵتانم هەتا کۆتایی زەمانە.)

*کاتێ مەرقۆس یاوەرو یارمەتیدەری پەترۆس بوو لەڕۆمای پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، بەڕێنمایی ڕوحی پیرۆز ئەم پەرتووکەی نووسی .مەرقۆس سەربردەی ژیانی عیسا بەشێوەیەکی کورت باس دەکات. زیاتر تیشکی خستۆتە سەر کردارەکانی نەك ووتەو فێرکردنەکانی. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەم نووسراوە زیاتر ئاڕاستەی ئەو باوەڕدارانە کراوە کە بەڕەگەز ڕۆم بوون. بۆیە بەکورتی باسی پەیمانی کۆن دەکات، هەروەها هەوڵی داوە ئەو شتانە ڕوون بکاتەوە کە تایبەت بوون بە ئاینی جولەکەوە. عیسا لەم نووسراوە وەك ڕزگارکەرێك دەردەکەوێت کە هاتووە خزمەت بکات نەك خزمەت بکرێ هەروەها ژیانی خۆی بەخت بکات تاوەکو مرۆڤ ڕزگاربکات لە گوناهەکانی (مەرقۆس10:45)، بەخوێنی خۆی پەیمانی نوێو پەیوەندی دروستکردووە لەنێوان خوداو مرۆڤ (مەرقۆس14:24).*

**دەرکەوتنی حەزرەتی یەحیا**

# 1

ئەمە سەرەتای مزگێنی عیسای مەسیحی ڕۆڵەی خودایە: بەپێی ئەوەی لەپەرتووکی ئەشعیای پێغەمبەردا نووسراوە: [2] {ئا ئەوەتا من نێرراوی خۆم لەپێشتەوە دەنێرم، ئەوەی ڕێگات بۆ ئامادە دەکات. [3] دەنگێك لەدەشتودەر بانگەواز دەکات، ڕێگا بۆ خوداوەند ئامادەبکەن، ڕێڕەوی ڕێك بخەن.} [4] ئەوەبوو یەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێش لەدەشت دەرکەوت، لەئاوهەڵکێشانی تۆبەکردنی ڕاگەیاند بۆ گوناە بەخشین. [5] دانیشتوانی وولاّتی یەهودیاو قودس، هەموو هاتنە لای یەحیا، تا لەڕووباری ئوردون لەسەر دەستی ئەو لەئاوهەڵکێشرێنو دان بەگوناهەکانیان بنێن. [6] جلو بەرگی یەحیا بریتیبوو لەمووی ووشتر، ناوقەدی بەپارچە چەرمێك بەسترا بوو، خواردنیشی بریتی بوو لەهەنگوینی کێویو کوللە. [7] ئەمەش ڕاگەیاندنەکەی ئەو بوو: (لەدوای من یەکێك دێت زۆر لەمن بەتواناترە، یەکێکە تەنانەت شایانی

ئەوەنیم قەیتانی پێڵاوەکانیشی بکەمەوە. [8]من لەئاو هەڵتان دەکێشم، بەڵام ئەو لەرۆحی پیرۆز هەڵتان دەکێشێت.)

### لەئاوهەڵکێشانی عیسا

[9]لەو ڕۆژانەدا، لەشاری ناسیرەی ناوچەی جەلیل عیسا هات، لەسەر دەستی یەحیا لەرووباری ئوردن لەئاوهەڵکێشرا. [10]کاتێ لەئاوەکە بەرزبووەوە، بینی ئاسمان کرایەوە، رۆحی پیرۆز لەشێوەی کۆترێك لەسەری نیشتەوەو [11]دەنگێك لەئاسمانەوە ووتی: (تۆی رۆڵەی خۆشەویستم، ئەوەی پێی دڵشادم.)

[12] دوای ئەمە عیسا لەلایەن رۆحی پیرۆزەوە برایە دەشتودەر. [13]چل رۆژ لەوێدا لەناو مارو مێرووەدا مایەوە، شەیتان هەر لەگەڵی خەریك بوو تاکو تاقی بکاتەوە، فریشتەی ئاسمانیش لەو کاتەدا خزمەتیان دەکرد.

### عیسا قوتابیەکانی هەڵدەبژێرێ

[14]دوای ئەوەی یەحیا گیرا، عیسا گەڕایەوە بۆ ناوچەی جەلیل، مزگێنی خودای ڕادەگەیاندو دەیووت: [15](کاتەکە هاتووەو پادشاهێتی خودا نزیكبووەتەوە، تۆبەبکەنو باوەڕبهێنن بەم مزگێنییە.)

[16]لەکاتێکدا عیسا لەسەر کەناری دەریای جەلیل دەڕۆیشت شەمعونو ئەندراوسی برای بینی، خەریکی ئەوەبوون تۆڕی ماسی فڕێ بدەنە دەریاچەکەوە، هەردووکیان ماسیگر بوون. [17]عیسا پێی ووتن: (وەرن دوام بکەون، دەتانکەم بەڕاوکەری مرۆڤ.) [18]ئەوانیش دەستبەجێ تۆڕەکانیان بەجێهێشتو دوایکەوتن. [19]ئینجا هەندێك لەوێ دوورکەوتەوە، یاقوبی کوڕی زەبدیو یۆحەنای برای بینی، لەبەلەمێکدا خەریکی چاككردنی تۆڕەکانیان بوون. [20]یەکسەر بانگی کردن تا دوای کەون، ئەوانیش زەبدی باوکیان لەگەڵ ئیشکەرەکانیتر لەبەلەمەکەدا بەجێهێشتو دوایکەوتن.

### دەرکردنی رۆحی پیس

[21]ئینجا هەموو ڕۆیشتن بۆ شاری کەفەرناحوم. لەڕۆژی شەممەدا عیسا چووە کەنیشتو دەستیکرد

بەفێرکردن. [22]ئەوانەی لەوێ بوون هەموو سەرسام بوون، چونکە وەك دەسەڵاتدارێك فێری دەکردن، نەك وەکو مامۆستایانی شەریعەت. [23]لەکەنیشتەکە پیاوێکی لێبوو ڕۆحی پیسی تیابوو، هاواری کردو [24]ووتی: (ئەی عیسای ناسیری چیت دەوێ لێمان؟ هاتووی بمانکوژیت؟ من دەزانم تۆ کێیت. تۆ پیرۆزی خودای!) [25]عیسا هەڕەشەی لێکردو ووتی: (بێدەنگ بەو لەو کابرایە وەرە دەرەوە!) [26]ئینجا ڕۆحە پیسەکە کابراکەی کوتا بەزەویداو هاوارێکی بەرزی کردو لێی هاتەدەرەوە. [27]خەڵکەکە هەموو سەریان سوڕماو کەوتنە پرسیار لەیەکتری: ئەمە چییە؟ ئەم فێرکردنە تازەیە بەدەسەڵاتەوەیە، تەنانەت ڕۆحە پیسەکانیش ملکەچن بۆی کاتێ فەرمانیان بەسەر دەدات). [28]دەستبەجێ ناوبانگی عیسا، لەهەموو ناوچەی جەلیلو دەوروپشتی بڵاوبووەوە.

**چاکردنەوەی خەڵکێکی زۆر**

[29]کاتێ کەنیشتەکەیان بەجێهێشت، چوون بۆماڵی شەمعون، ئەندراوسو یاقوبو یۆحەنناشیان لەگەڵدا بوو. [30]خەسووی شەمعون لەناو جێ کەوتبوو لەرزوتای هەبوو، خێرا ئەمەیان بەعیسا ووت. [31]عیساش لێی نزیك بووەوە، دەستی گرتو هەڵیساندەوە سەرپێ. دەستبەجێ لەرزوتاکەی نەماو هەستا بۆ خزمەتکردنیان. [32]کاتێ ئێوارە داهاتو ڕۆژئاوا بوو، خەڵکەکە چی نەخۆشیان هەبوو لەگەڵ ئەوانەی ڕۆحی پیسیان تێدابوو، هەموویان هێنایە لای. [33]خەڵکی شارەکە هەموو بەردەرگای ماڵەکەیان لێگرتبوو، [34]خەڵکێکی زۆری چاك کردەوە لەجۆرەها نەخۆشی، هەروەها ڕۆحی پیسی لەزۆریان دەرکرد، بێئەوەی بهێڵێ قسە بکەن، چونکە دەیانزانی کێیە.

**مزگێنیدان لەناوچەی جەلیل**

[35]بۆ ڕۆژی دوایی، بەرەبەیان پێش دەرکەوتنی ئاسۆ هەستاو چووە شوێنێکی چۆڵەوانیو دەستی کرد بەنوێژکردن. [36]شەمعونو هاوڕێکانی بەشوێن عیسادا گەڕان، [37]کە دۆزییانەوە پێیان ووت: (هەموو خەڵکەکە داوات

دەکەن.) [38] ئەویش پێی ووتن: (وەرن بابڕۆین بۆ ئەم دێیانەی دەوروپشت، تا لەوێش ووشەی خودا ڕابگەێنم، چونکە لەبەر ئەمە هاتووم.) [39] ئینجا ڕۆیشت تاوەکو لەکەنیشتەکانی ناوچەی جەلیل ووشەی خودا ڕابگەێنێو ڕۆحی پیس لەخەڵکی دەربکات.

**پاکبوونەوەی نەخۆشی گولی**

[40] یەکێك نەخۆشی گولی هەبوو، هاتو لێی پاڕایەوە، کەوتە سەرچۆك لەبەردەمیەو ووتی: (گەر بتەوێ پاکم دەکەیتەوە) [41] عیسا بەزەیی پیاهاتەوە، دەستی لێیداو ووتی: (دەمەوێ، پاكبەرەوە.) [42] هەر کە ئەمەی ووت، [43] کابرا برینەکانی نەماو پاك بووەوە. عیسا دەستبەجێ ڕەوانەی کردو بەتوندی ئاگاداری کردەوەو [44] ووتی: (ئاگاداربە، ئەمە بەکەس مەڵێ، بەڵکو برۆ خۆت نیشانی کاهین بدە، ئەو قوربانییە پێشکەش بکە کە موسا فەرمانی پێداوە، بۆ پاکبوونەوەکەت، وەك شایەتییەك بۆیان.) [45] بەڵام کابرا، ڕۆیشتو ئەم هەواڵەی لەهەموو لایەك بڵاوکردەوە، ئیتر عیسا لەوناوە نەیتوانی بەئاشکرا بچێتە شارەکان، لەشوێنی چۆڵەوانی دەمایەوەو خەڵکی لەهەموو لایەکەوە دەهاتنە لای.

**چاکردنەوەی ئیفلیجێك**

# 2

پاش چەند ڕۆژێك عیسا گەڕایەوە بۆ کەفەرناحوم، خێرا هەواڵ بڵاوبووەوە کە عیسا لەماڵەوەیە. [2] خەڵکێکی زۆر لێی کۆبوونەوە، بەشێوەیەك شوێنی کەس نەمابوو، تەنانەت لەبەر دەرگاکەش. ئینجا عیسا دەستی کرد بەباسکردنی ووشەی خودا بۆیان. [3] هەر لەوکاتە کابرایەکی ئیفلیجیان هێنایە لای بەچوار کەس هەڵیان گرتبوو. [4] بەڵام بەهۆی زۆری خەڵکەکەوە نەیانتوانی لێی نزیك ببنەوە، ئینجا چوون سەربانی ئەو شوێنەی کە عیسای تیابوو کونیان کردو کابرایان بەنوێنەکەیەوە شۆڕکردە خوارەوە بۆ بەردەمی. [5] کاتێ عیسا بەم شێوەیە باوەڕیانی بینی بەکابرای ووت: (کوڕم، گوناهەکانت بەخشران.) [6] لەنێوان دانیشتووەکان هەندێ مامۆستای

شەریعەت هەبوون، لە دڵی خۆیاندا ووتیان: [7](بۆچی ئەم پیاوە بەم شێوەیە دەدوێ؟ بەمە کفر دەکات! کێ دەتوانێ لەگوناه خۆشبێت تەنها خودا نەبێ؟) [8]دەستبەجێ عیسا بە ڕۆحی خۆی زانی لەدڵیاندا چۆن بیری لێدەکەنەوە، پێیووتن: (بۆچی ئاوها بیردەکەنەوە لەدڵتاندا؟ [9]کامیان ئاسانترە، بەئیفلیج بووترێ: گوناهەکانت بەخشرا، یاخود پێی بووترێ: هەستە، نوێنەکەت هەڵگرەو بڕۆ؟ [10]بەڵام ئەمەم ووت بۆ ئەوەی بزانن، ڕۆڵەی مرۆڤ لەسەر زەوی توانای گوناه بەخشینیشی هەیە.) [11]ئینجا بەکابرا ئیفلیجەکەی ووت: (پێت دەڵێم: هەستە جێگاکەت هەڵگرەو بڕۆ بۆ ماڵەوە.) [12]دەستبەجێ کابرا هەستاو جێگاکەی هەڵگرتو لەبەردەم خەڵکەکەدا بەپێی خۆی ڕۆیشت. بەمە هەموو سەرسام بوون، ستایشی خودایان کردو ووتیان: (هەرگیز شتی وامان نەدیوە!)

### عیسا بۆ گوناهباران هاتووە

[13]عیسا دووبارە ڕۆیشتە سەر کەناری دەریاچە، خەڵکەکە هەموو لێی کۆبوونەوەو ئەویش دەستی کرد بە فێرکردنیان. [14]هەروەها لەکاتی ڕۆیشتندا، لاوی کوڕی حەلفی بینی دانیشتبوو لەشوێنی باجوەرگرتن، پێی ووت: (دوامکەوە.) ئەویش هەستاو دوایکەوت.

[15]کاتێ عیسا لەماڵی ئەو لەسەر خوانبوو زۆر لەباجگرانو گوناهباران لەوانەی دوای کەوتبوون لەگەڵ قوتابیەکانی لەگەڵیبوون، [16]کە مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیەکان بینیان عیسا لەگەڵ باجگرانو گوناهباران نان دەخوات، بەقوتابیەکانیان ووت: (بۆچی لەگەڵ باجگرانو گوناهباران نان دەخوات؟) [17]کاتێ عیسا گوێی لەمە بوو وەڵامی دانەوە: (لەشساغ پێویستی بەپزیشك نییە، بەڵکو نەخۆش. نەهاتووم بۆ بانگکردنی ئەوانەی خۆیان بەچاك دەزانن، بەڵکو گوناهباران.)

### دەربارەی ڕۆژوو

[18]کاتێ قوتابیەکانی یەحیاو فەریسیەکان بەڕۆژوو بوون، چەند کەسێ هاتنە لای عیساو لێیان پرسی: (بۆچی قوتابیانی یەحیاو قوتابیانی

فەریسییەکان بەڕۆژوو دەبن، بەڵام قوتابیەکانی تۆ بەڕۆژوو نابن؟)
[19]لەوەڵامدا ووتی: (ئایا ئەوانەی شایی دەگێڕنو لەگەڵ زاوادان، بەڕۆژوو دەبن؟ نەخێر ئەوەندەی زاوایان لەگەڵدایە ناتوانن بەڕۆژوو بن. [20]بەڵام ڕۆژانێ دێت زاوا بەرزدەکرێتەوەو لەنێوانیان نامێنێ، ئەوسا بەڕۆژوو دەبن. [21]هیچ کەسێ کراسی کۆن بەقوماشی تازە پینە ناکات، چونکە پارچە تازەکە دەچێتەوە یەکو کراسە کۆنەکە ڕادەکێشێتو دڕاویەکە خراپتر دەکات. [22]خەڵکی مەی تازە ناکەنە مەشکەی کۆنەوە، ئەگینا مەشەکەکە دەدڕی، مەیەکە دەڕژێو مەشکەکەش بەکەڵك نامێنێ. بەڵکو مەی تازە دەکرێتە مەشکەی تازەوە.)

### گەورەی ڕۆژی شەممە

[23]لەڕۆژی شەممەدا، کاتێ عیسا بەنێوان دەغڵەکاندا تێدەپەڕی، قوتابیەکانی برسییان بوو، دەستیانکرد بەگوڵەگەنم پرواندنو خواردنی. [24]کە فەریسییەکان ئەمەیان بینی پێیان ووت: (بۆچی قوتابیەکانت شتێك دەکەن کە لەڕۆژانی شەممەدا دروست نییە؟) [25]عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (ئەی نەتان خوێندۆتەوە داودو ئەوانەی لەگەڵی بوون چیانکرد، کاتێ برسییان بوو؟ [26]چۆن چوونە ماڵی خودا، لەسەردەمی ئەبیئاسری سەرۆك کاهین، نانی قوربانیان خوارد، ئەو نانەی دروست نەبوو بخورێ، تەنها بۆ کاهینەکان نەبێ، بەڵام ئەو نانەکەیدا بەوانەی کە لەگەڵیشی بوون.)
[27]ئینجا عیسا پێیووتن: (شەممە بۆ مرۆڤ دروستکراوە، نەوەك مرۆڤ بۆ شەممە. [28]کەواتە ڕۆڵەی مرۆڤ گەورەی ڕۆژی شەممەشە.)

### چاکردنەوەی نەخۆش لەشەممە

## 3

دیسان عیسا گەڕایەوە بۆ کەنیشت. لەوێ پیاوێکی لێبوو دەستی ووشك بوو، [2]هەندێ لەوان سەیریانکرد بۆ ئەوەی بزانن ئایا عیسا لەڕۆژی شەممە ئەو پیاوە چاكدەکاتەوە، تاکو بەمە تاوانباری بکەن. [3]جا عیسا بەپیاوەکەی ووت ئەوەی کەدەستی ووشك بوو بوو: (وەرە ئێرە.)
[4]ئینجا لێیپرسین: (ئایا لەڕۆژانی

شەممەدا، کامەیان دروستە، کاری چاك یاخود کاری خراپ؟ ڕزگارکردن یاخود کوشتن؟) هەموو بەبێدەنگی مانەوە.
[5]عیسا بەتووڕەییەوە سەیری کردنو غەمباربوو لەبەر دڵ ڕەقییان، بەپیاوەکەی ووت: (دەستت درێژکە.) ئەویش دەستی درێژکردو دەستبەجێ دەستی چاك بووەوە. [6]ئینجا فەریسیەکان لەگەڵ پیاوانی هیرۆدس لەخەڵکەکە دوورکەوتنەوەو تەگبیریان لێکرد بیکوژن.
[7]دوای ئەمە عیساو قوتابیەکانی بەرەو دەریاچەکە کشان، خەڵکێکی زۆر لەناوچەی جەلیلو یەهودیەو [8]قودسو ئادومیەو پشتی ئوردونەوە دوای کەوتن. هەروەها ژمارەیەکی زۆر لەناوچەی سورو سەیدا، کاتێ هەواڵی ئەو کارانەیان بیست کە عیسا کردوویەتی، هاتن بۆ لای. [9]عیسا فەرمانیدا بەقوتابیەکانی، بەلەمێکی بچووکی بۆ ئامادەبکەن، بۆ ئەوەی خەڵکەکە پاڵەپەستۆی لەسەر نەکەن. [10]چونکە خەڵکێکی زۆری چاك کردبووەوە، وای لێهاتبوو هەر کەسێ نەخۆشییەکی هەبووایە، خێرا دەچوو بۆ لای تادەستی لێبدات [11]ئەوانەی ڕۆحی پیسیان تیابوو کاتێ دەیانبینی کڕنووشیان بۆ دەبردو هاواریان دەکرد : (تۆ ڕۆڵەی خودای.) [12]ئەویش بەتوندی فەرمانی پێدەدان کە ئاشکرای نەکەن.

**دوانزە نێرراوەکە**

[13]دوایی عیسا چووە سەر شاخێك، ئەوانەی دەیویست بانگیکردن، ئەوانیش چوونە لای. [14]دوانزە قوتابی لێ دیاریکردن، بۆ ئەوەی لەگەڵی بنو بیاننێرێ بۆ بلاۆکردنەوەی ووشەی خودا. [15]هەروەها دەسەلاٚتی پێدان بۆ دەرکردنی ڕۆحە پیسەکان. [16]ئەو دوانزە قوتابیەی دیاریکرد ئەمانەن: شەمعون کە بەپەترۆس ناوی دەبرد، [17]یاقوبی کوڕی زەبدیو یۆحەنای برای، کە ناوی لێنابوون (بوانرجس) واتە کوڕانی هەورەگرمە، [18]ئەندەراوسو فیلیپۆسو بەرتۆلماوسو مەتتاو تۆماو یاقوبی کوڕی حەلفیو تەداوسو شەمعونی قانەوی، [19]هەروەها یەهوزای ئەسخەریوتی ئەوەی عیسای

دا بەدەستەوە. ئینجا عیسا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

### عیساو سەرۆکی شەیتان

[20]دیسان لەوێش خەڵکێکی زۆریان لێکۆبووەوە، بەشێوەیەك نەیانتوانی نان بخۆن. [21]کاتێ کەسوکاری ئەمەیان بیست، هاتن لەگەڵ خۆیان بیبەن، چونکە وا بڵاوبوو بووەوە کە مێشکی تێکچووە. [22]هەندێ لەمامۆستایانی شەریعەت لەقودسەوە هاتبوون، ووتیان: (بەعلەزبولی تێدایە، بەسەرۆکی ڕۆحە پیسەکان، ڕۆحە پیسەکان دەردەکا.) [23]ئینجا عیسا بانگی کردنو بەنموونە قسەی بۆکردنو ووتی: (شەیتان چۆن دەتوانێ شەیتان دەربکا؟ [24]هەر ووڵاتێك دووبەرەکی تیابێت، ناتوانێت خۆی ڕابگرێ، [25]هەر ماڵێکیش دووبەرەکی تیابێت، خۆی ڕاناگرێ. [26]گەر شەیتان بەسەر خۆی هەڵگەڕایەوەو بوو بەدوو بەشەوە، خۆی ڕاناگرێت، بەڵکو بەرەو کۆتایی دەچێ. [27]کەس ناتوانێ بچێتە ماڵی کابرایەکی ئازاو شتەکانی تاڵان بکا، گەر لەپێشا کابرای ئازای نەبەستێتەوە، ئینجا ماڵەکەی تاڵان بکات.

[28]ڕاستیتان پێدەڵێم: هەموو گوناهێكو کفرکردنێکی ئەوەی مرۆڤ دەبەخشرێ، [29]بەڵام ئەوەی کفر بکات بەرامبەر بەڕۆحی پیرۆز، هەرگیز نابەخشرێ، بەڵکو دەکەوێتە ژێر حوکمی هەتاهەتاییەوە.) [30]ئەمەی ووت، چونکە بەعیسایان ووت: ڕۆحی پیسی تیایە.

### خێزانی ڕاستەقینەی عیسا

[31]دوای ئەوە دایكو براکانی عیسا هاتن، لەدەرەوە وەستانو ناردیان بەشوێنی. [32]لەوکاتەدا خەڵکێکی زۆر لەدەوروبەری دانیشتبوون، یەکێ هات پێیووت: (ئەوەتا دایکتو براکانت لەدەرەوە ڕاوەستاون بانگت دەکەن.) [33]عیساش ووتی: (دایکم کێیەو براکانم کێن؟) [34]ئینجا سەیرێکی ئەوانەی کرد کە لەدەوروپشتی دانیشتبوونو ووتی: (ئا ئەمانەن دایكو برای من، [35]هەر کەسێ بەخواستی خودا هەڵسوکەوت بکات، ئەو براو خوشكو دایکمە.)

## نموونەی جوتیار

## 4

دیسان عیسا لەسەر کەناری دەریاچەکە دەستی‌کرد بەفێرکردنی خەڵکەکە، ژمارەیەکی زۆر خەڵك لێی‌کۆبوونەوە، بەشێوەیەکی وا عیسا دەبووایە بچووایە ناو بەلەمێك کە لەناو ئاوەکەدا بوو، خەڵکەکەش لەسەر ووشکایی بوون. [2]بەنموونە زۆر شتی فێرکردن، لەفێرکردنەکەیدا پێی ووتن: [3](گوێ‌بگرن، جوتیارێك چووە دەرەوە تۆو بچێنێ. [4]لەوکاتەدا کە تۆوی دەچاند، بەشێ لەتۆوەکە کەوتە سەر ڕێگا، باڵندە هاتن‌و خواردنی، [5]بەشێکی کەشی کەوتە سەر زەویەکی بەردین کەگڵەکەی تەنك‌بوو، خێرا سەریان دەرکرد، چونکە زەویەکە قوڵ‌نەبوو. [6]بەڵام کەڕۆژ هەڵهات، ووشك بوون‌و پرووکان، چونکە ڕەگی تەواویان نەبوو. [7]بەشێکی کەشی، کەوتنە ناو دڕکەوە، کاتێ دڕکەکان سەریان دەرکرد خنکاندنی‌و بەرووبوومیان‌نەدا. [8]هەندێکیش لەتۆوەکە کەوتە سەر زەوی باش، بەرووبوومیاندا. بەشێکی یەك بەسەد بەشێکی‌کەشی یەك بەشەست‌و یەك بەسی.) [9]هەروەها ووتی: (کێ گوێی هەیە بۆ گوێ‌گرتن، با گوێ بگرێ.)

[10]کاتێ عیسا بەتەنها بوو، ئەوانەی دەورووپشتی لەگەڵ قوتابیەکانی لێیان پرسی، ئاخۆ واتای ئەم نموونەیە چییە؟ [11]پێی‌ووتن: (بەئێوە دراوە نهێنی پادشاهێتی ئاسمان بزانن، بەڵام بۆ ئەوانەی لەدەرەوەن هەموو شتێ بەنموونە پێیان دەدرێ. [12]چونکە ئەوان سەیر دەکەن بەڵام نابینن، گوێ‌دەگرن بەڵام تێ‌ناگەن، تانەگەڕێنەوەو گوناهەکانیان ببەخشرێ!)

## ڕوونکردنەوەی نموونەکە

[13]ئینجا پێی‌ووتن: (ئایا ئەم نموونەیە تێ‌نەگەیشتن؟ باشە ئەی چۆن نموونەکانی‌تر تێ‌دەگەن؟ [14]جوتیارەکە ووشەکە دەچێنێ. [15]هەندێ کەس وەك ئەو تۆیەن کە دەکەوێتە سەر ڕێگا، ئەوانە گوێ لەووشەی خودا دەگرن، ئینجا شەیتان دێت‌و ووشەکە لەدڵیان دەردەهێنێت. [16]تۆوەکەی کەوتە سەر زەویە بەردەلانەکە، ئەوانەن کە ووشەی خودا بەخۆشیەوە وەردەگرن، [17]بەڵام لەناویاندا هیچ

ڕەگــی نیــیە، خۆیــان ڕادەگــرن تاماوەیـــەك، کـــاتێ دەکەونـــە چەوسـانەوەو گیروگرفـتەوە بـەهۆی ووشـەی خودا، دەستبەجێ دەکەون. [18]تۆوەکەی کەوتە جێگا دڕکاویەکە، ئەوانـەن کەگوێیان لەووشەی خودا دەبێـت، [19]بەڵام نیگەرانی دەربارەی ژیـانو تەفـرەدانی دەوڵەمـەندیو ئـارەزووی شـتی دونـیایی دەچـێتە ناویانـەوەو دەبێـتە هـۆی خـنکاندنی ووشـەی خـودا، ئـیتر ووشەکە هیچ بەرناگـرێ. [20]بـەڵام ئـەوەی کەوتـە سـەر زەوی بـاش، مەبەسـت لـەو مرۆڤانەیە کە گوێیان لەووشەی خودا دەبێـتو وەریدەگـرنو بـەرووبوم دەدەن، یەکێکـیان سـی ئـەوەندە، یەکـێکی کـەش شەسـت ئـەوەندەو یەکێکیتریشیان سەد ئەوەندە.)

**نموونەی چرا**

[21]عیسـا پـێیووتن: (ئایا خەڵکی چرا هەڵدەکەنو دەیخەنە ژێر تەشتو نوێـنەوە؟ ئایـا لەسـەر شوێنێکی بەرز دای نـــانێ؟ [22]چـــونکە هـــیچ شـــاراوەیەك نیـیە ئاشکرا نەبێ، هیچ نهێـنییەك نییە دەرنەکەوێ. [23]ئەوەی دوو گوێـی هـەیـە بۆ بیستن، باگوێ بگرێ.)

**نموونەی پێوانە**

[24]هـــەروەها پـــێیووتـــن: (ووردببنەوە لەوەی گوێتان لێدەبێ، بـەچ پـێوانەیەك بـۆ خەڵکی دەپێون بەهـەمان پـێوانە بۆتـان دەپێورێتەوەو زیاتریشـتان پـێدەدرێ. [25]چـونکە ئەوەی کە هەیەتی زیاتری پێدەدرێ، ئـەوەش کـە نییەتی، تەنانەت ئەوەش کە هەیەتی لێی دەسەنرێتەوە.)

**نموونەی ڕووەك**

[26]عیسـا بـەردەوام بوو و ووتی: (پادشاهێتی ئاسمان لەمرۆڤێك دەکات لەزەویەکـەی تـۆو بچـێنێ. [27]شـەو دەخـەوێ، بەیانی هەڵدەستێ، دەبینێ تۆوەکە ڕوواوەو نەشونمای کردووە، [28]ئـەو نـازانێ ئەمـە چـۆن دەبێت. زەوی لەخۆیـەوە بەرووبووم دەدات، گەنم یەکەمجار لەشێوەی گیا دەڕوێ، ئینجا لاسكو گوڵەگەنم دەردەکات، پاشان گوڵەگەنمەکە پڕ دەبێ لەگەنم. [29]بـەڵام کـاتێ بەرەکـە دێتە بەرهەم، داسـی لێ گـیر دەکرێ. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کاتی دروێنەی هاتووە.)

### نموونەی دەنکە خەرتەلە

[30]دیسان پێی‌ووتن: (پادشاهێتی ئاسمان لەچی دەکات، بەچ نموونەیەك ڕوونی‌کەینەوە؟ [31]وەك دەنکە خەرتەلەیەکە، کاتی چاندنی بچووکترین تۆوی سەر زەوییە، [32]بەڵام کاتێ ڕوواو نەشونمای کرد، دەبێتە گەورەترین ڕووەکو لقی گەورە دەردەکات، بەشێوەیەك باڵندەی ئاسمان دەتوانێ لەژێر سێبەریدا بحەسێتەوە.) [33]عیسا بەزۆر نموونەی ئاوا دەدوا بۆ خەڵکەکە، تا ئەو ئاستەی دەیانتوانی گوێی لێبگرن. [34]هەمیشە نموونەی بەکاردەهێنا لەقسەکانی، بەڵام کاتێ بەتەنها دەبوو لەگەڵ قوتابیەکانی، واتای هەموو شتێکی بۆ ڕوون دەکردنەوە.

### هێمن کردنی ڕەشەبا

[35]کاتێ ئێوارە داهات، بەقوتابیەکانی ووت: (بابپەڕینەوە بۆ ئەوبەری ئاوەکە.) [36]دوای ئەوەی خەڵکەکەیان بەرێ‌کرد، قوتابییەکان چوونە ناو ئەو بەلەمەی عیسای تێدابوو، هەر لەو کاتەدا چەند بەلەمێکی‌تر شوێنیان کەوتن. [37]لەدوایدا ڕەشەبایەکی زۆر بەهێز هەڵی‌کرد، شەپۆلی ئاو بەتوندی دەیدا بەملاو ئەولای بەلەمەکەدا، بەشێوەیەك خەریك بوو پڕ بێ لەئاو. [38]عیساش لەپشتی بەلەمەکەوە سەری خستبووە سەر سەرینێك‌و خەوتبوو. هەڵیانساندو پێیان ووت: (مامۆستا، چییە دەڵێی هیچ گوێی نادەیتێ، ئەوا ئێمە لەناو دەچین؟) [39]ئەویش یەکسەر هەستاو هەڕەشەی لەڕەشەباکەکردو بەدەریاچەکەی ووت: (بێ‌دەنگ‌بە! هێمن‌بە!) دەست‌بەجێ ڕەشەباکە بێ‌دەنگ‌بوو و ئارامی‌یەکی تەواو باڵی بەسەر دەریاچەکەدا کێشا. [40]ئینجا پێی‌ووتن: (بۆچی بەم شێوەیە ترسان؟ باوەڕتان نییە؟) [41]قوتابیەکان ترس چوو بووە دڵیانەوە، بەیەکتریان دەووت: (ئەمە کێیە، تەنانەت ڕەشەباو دەریاش ملکەچن بۆی؟)

### دەرکردنی ڕۆحی پیس

## 5

ئینجا گەیشتنە شاری جەراسین کە کەوتۆتە ئەوبەری دەریاچەکەوە. [2]هەرکە عیسا لەبەلەمەکە هاتەخوارەوە، لەناو گۆڕستانی ئەو

ناوچەیەدا، کابرایەك کە ڕۆحی پیسی تیابوو لێی هاتە پێشەوە، [3] ئەو کابرایە لەگۆڕستاندا دەژیاو کەسیش نەیدەتوانی بیبەستێتەوە. تەنانەت بەزنجیریش. [4] زۆرجار بەکۆت‌و زنجیر دەیانبەستەوە، بەڵام زنجیری دەپچڕاندو کۆتی دەشکاند، کەسیش نەیدەتوانی بیگرێ. [5] شەو و ڕۆژ یا لەگۆڕستان بوو یا لەشاخ، هاواری دەکردو لەشی خۆی بەبەرد بریندار دەکرد. [6] بەڵام کاتێ لەدوورەوە عیسای بینی، [7] ڕای‌کردە لای‌و کڕنۆشی بۆ برد، بەدەنگی بەرز هاواری‌کرد: (چیت لەمن دەوێ، ئەی عیسای ڕۆڵەی خودای گەورە؟ سوێندت دەدەم بەخودا ئازارم مەدە!) [8] چونکە عیسا پێی ووتبوو: (ئەی ڕۆحی پیس لەم پیاوە وەرە دەرەوە!) [9] ئینجا عیسا لێی‌پرسی: (ناوت چییە؟) وەڵامی دایەوە: (ناوم لیجیۆنە، چونکە ئێمە لەشکرێکی گەورەین.) [10] زۆر لەعیسا پاڕایەوە دەریان نەکات بۆ دەرەوەی ناوچەکە. [11] لەو ناوەدا ڕانە بەرازێکی گەورە دەلەوەڕان لەقەراغی شاخێکدا، [12] ڕۆحە پیسەکان لێی‌پاڕانەوە ڕێیان بدات بچنە ناو بەرازەکانەوە. [13] ئەویش ڕێی‌دان. ڕۆحە پیسەکان لەپیاوەکە هاتنەدەرەوەو چوونە ناو بەرازەکانەوە، ئینجا ڕانە بەرازەکە کە ژمارەیان نزیکەی دوو هەزار دەبوو، کەوتنە ڕاکردن‌و لەقەراغی ئەو شاخەی بەقەدیەوە بوون، هەڵدێران بۆ ناو دەریاچەکەو هەموو خنکان.

[14] شوانی بەرازەکان خێرا چوون بۆ ناو شارو کێڵگەکان تا ئەم هەواڵە بڵاوبکەنەوە، جاخەڵکەکە هاتنەدەرەوە بۆ بینینی ئەوەی ڕوویداوە. [15] کاتێ هاتنە لای عیسا، ئەو پیاوەیان بینی کە لەشکرێ ڕۆحی پیسی تێدابوو لای عیسادا دانیشتووە بەپۆشتەیی‌و ئەقڵێ تەواوییەوە. بەمە خەڵکەکە ترسیان لێی‌نیشت. [16] هەروەها ئەوانەی ڕووداوەکەیان بینی‌بوو، بۆ خەڵکەکەیان گێڕایەوە چی ڕوویدا سەبارەت بەو پیاوەی ڕۆحە پیسەکانی تێدا بوو هەروەها بەرازەکان. [17] ئیتر هەموو داوایان لەعیسا کرد لەناوچەکەیان بڕوات.

[18] ئینجا عیسا سواری بەلەم بوو، پیاوەکەی ڕۆحە پیسەکانی لێ‌دەرکرا بوو، لەعیسا پاڕایەوە ڕێی بدات

لەگەڵی بێت. [19]بەڵام عیسا ڕێگەی نەداو پێی ووت: (بگەڕێوە بۆ ناوماڵو کەسوکارت، بۆیان بگێڕەوە خوداوەند چی بۆت کردوەو چۆن بەزەیی پیاتداهاتەوە.) [20]جا کابرا بەهەموو دە شارەکەدا گەڕاو ئەوەی عیسا بۆی کردبوو بۆخەڵکی گێڕایەوە. خەڵکەکەش بەمە زۆر سەرسام بوون.

**زیندووکردنەوەی کچێك**

[21]کاتێ عیسا گەڕایەوە ئەوبەری دەریاچەکە، ژمارەیەکی زۆر خەڵك لەکەناری دەریاچەکەدا لێی کۆبوونەوە، [22]پیاوێك ناوی یایرۆس بوو، پێشەوایەکی کەنیشت بوو، کاتێ عیسای بینی، هاتو لەبەرپێی کەوتو [23]لێی پاڕایەوەو پێی ووت: (کچە بچووکەکەم لەسەرەمەرگدایە، وەرە دەستی لێبدە تا چاك بێتەوەو زیندووبێتەوە.) [24]عیسا لەگەڵی ڕۆیشت، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکیش بەدوایدا ڕۆیشتنو پاڵەپەستۆیان دەکرد.

**چاکردنەوەی ژنێك**

[25]هەر لەوێدا ژنێك هەبوو، ماوەی دوانزە ساڵبوو خوێن لێچوونی هەبوو، [26]لەسەر دەستی چەند پزیشکێك ئازاری زۆری چەشتبوو، ئەوەی هەیبوو دابووی بە پزیشك، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو، بەڵکو هەتا دەهات خراپتر دەبوو. [27]ژنە باسی عیسای بیستبوو، بۆیە هاتە ناو خەڵکەکەوەو لەدواوە دەستی لەچمکی کراسەکەیدا، [28]لەبەرئەوەی ژنەکە ووتی تەنها بەدەست لێدانی چمکی کراسەکەی چاكدەبێتەوە. [29]ژنەکە دەستبەجێ خوێن لێچوونەکەی ڕاوەستاو هەستی بەچاكبوونەوە کرد لەنەخۆشیەکەی. [30]کاتێ عیسا هەستی کرد هێزێك لێیهاتەدەرەوە، سەیری خەڵکەکەی کردو پرسی: (کێ دەستی لەجلەکانمدا؟) [31]قوتابیەکانی پێیان ووت: (هەموو دەورووپشتیان گرتوویتو پاڵەپەستۆت دەکەن، کەچی تۆ دەپرسی کێ دەستی لێدام؟) [32]بەڵام ئەو سەیری دەورووپشتی کرد، بۆ ئەوەی بزانێ ئەو کەسە کێبوو. [33]ژنەکەش بەڕووداوەکەی خۆی زانی،

بەتـرس‌و لــەرزەوە هاتـە پێشـەوە، چۆکی داداو هەموو شتێکی بەڕاستی پـیـووت. [34]ئینجا عیسـا بەژنەکەی ووت: (کـچـم، باوەڕت‌بوو چـاکی کـردیـتەوە، بـڕۆ دڵنـیابە، چــاك بوویتەوە لـەنەخۆشیەکەت.)

[35]لـەو کاتـەی عیسـا قسـەی دەکـرد، هــەندیـکــەس لــەماڵی پێشــەوای کەنیشـتەکەوە هــاتن، ووتـیان: (کچـەکەت مرد، ئیتر ئەرك مەخـەرە بـەر مامۆسـتا بۆ هاتن.) [36]کـاتیـ عیسـا ئەمـەی بیسـت، قسەی لەگـەڵ باوکەکـە کـردو ووتـی: (مەترسە، تەنها باوەڕت هەبیـ.) [37]کە ڕۆیـی بـۆ ماڵەکـە نەیهێشـت کەس لەگـەڵی بـڕوات تـەنها پەتـرۆس‌و یـاقـوب‌و یۆحەنـنای بـرای یـاقوب نەبێـت. [38]کـاتیـ گەیشـتنە مـاڵی پێشـەوای کەنیشـتەکە، سـەیری‌کرد خەڵکەکـە دەگرین‌و شیوەن دەکەن، [39]ئــەویش پــێیووتــن: (بۆچـــی شــڵەژاون‌و دەگــرین؟ ئــەم کچــە نەمـردووە، بەڵکو نووستوە.) [40]بەمە خەڵکەکـە پێی پیـکەنین، بەڵام عیسا خەڵکەکـەی هـەموو کردە دەرەوەی ژوورەکـەو دایـك‌و باوکی کچەکەو ئـەوانی‌تر کە لـەگەڵی بوون بردنی بۆ سـەر جـێگای کچـەکە. [41]دەسـتی کچەکەی گرت، بانگی کردو ووتی: (ئـەی کـیژۆڵە، پێت دەڵێم هەستە!) [42]کچـەکە تەمـەنی دوانـزە ساڵبوو، یەکسەر هەستایە سەرپیـو دەستی‌کرد بە ڕۆیشتن، خەڵکەکەش هەموو لەمە زۆر ســەریان ســوڕما. [43]جــا ڕای‌سپاردن، ئەوەی ڕوویداوە جاریـ بەکەسی نەڵێن، ئینجا پێی‌ووتن شتێك بهێنن بۆ کچەکە تابیخوات.

## ڕێز نەگرتن لە عیسا

# 6

عیسـا ئەوێی بەجیـهێشت‌و گەڕایەوە بـۆ وولاتـی خـۆی، قوتابیەکانـیش دوای‌کــەوتن. [2]کــە ڕۆژی شــەممە هــات، لەکەنیشــت دەســتی‌کــرد بەفــێرکردنی خەڵکەکــە، کــاتیـ خەڵکەکـە گوێیان لیـگرت، سەریان سـوڕما، ووتـیان: (ئەمانـەی هـەموو لـەکویـ بـوو؟ ئـەم دانایـیە چییە پێی دراوە؟ ئـەم کـارە سەرسـوڕهێنەرانە چییە لـەسـەر دەسـتی دەکریـ؟ [3]ئایا ئـەوە دارتاشەکەی کوڕی مریەم نییە؟ بـرای یـاقوب‌و یوسـی‌و یـەهوزاو شــەمعون نیــیە؟ خوشکەکانیشــی لەگەڵمان نین لێرە؟) بەم شێوەیە لێی

کەوتنە گومان. [4] بەلاَم عیسا پێیووتن: (هیچ پێغەمبەرێك بێڕێز نییە، تەنها لەوولاَتی خۆیو لەنێوان خزمو کەسوکارو ماڵی خۆی نەبێ.) [5] بەم شێوەیە نەیتوانی هیچ کارێکی سەرسوڕهێنەر بکات، تەنها ژمارەیەکی کەمی لەخەڵکی چاککردەوە. ئەویش بەدەست دانان لەسەریان. [6] سەری سوڕما لە بێباوەڕییان. ئینجا گەڕا بەلاَدێیەکانی دەوروپشتو دەستی کرد بەفێرکردنیان.

**عیسا نێرراوەکانی دەنێرێت**

[7] دوای ئەوە عیسا هەر دوانزە قوتابییەکەی بانگکردو دوو دوو ناردنی بەملاو ئەولاداو دەسەلاَتی پێدان بەسەر ڕۆحە پیسەکان، [8] ئینجا ڕایسپاردنو ووتی: (بۆ ڕێگا هیچ لەگەڵ خۆتان هەڵمەگرن، تەنها دارێك، نەنان، نەتورەکە، نەپارە لەگیرفانتان، [9] پێلاَوێك لەپێ بکەنو جلی زیادە لەگەڵ خۆتان مەبەن. [10] هەروەها ووتی: (چوونە هەر ماڵێك، لەوێ بمێننەوە تا ئەو شوێنە بەجێ دەهێڵن. [11] بەلاَم گەر لەشوێنێك، کەسێك نەبوو ئێوەی بوێو گوێ لەقسەکانتان بگرێ، لەوێ بڕۆنو تۆزی پێتان بتەکێنن تاببێ بەشایەتی بەسەریانەوە. [12] ئیتر قوتابیەکان دەستیانکرد بەڕاگەیاندنی ووشەی خودا تاخەڵك تۆبە بکەن. [13] هەروەها ڕۆحی پیسیان دەردەکردو ژمارەیەکی زۆر نەخۆشیان بەڕۆن چەور دەکردو چاکیان دەکردنەوە.

**کوشتنی حەزرەتی یەحیا**

[14] ناوی عیسا دەنگیدایەوە تاکو گەیشتە لای هیرۆدسی پادشا، هەندێکیان ووتیان: (ئەوە یەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێشە لەناو مردووان زیندووبووەتەوە، بۆیە کاری سەرسوڕهێنەر لەسەر دەستی دەکرێ.) [15] هەروەها هەندێکیان ووتیان: (ئەوە ئەلیاسە.) هەندێکیشیان ووتیان: (ئەوە پێغەمبەرێکە، وەك پێغەمبەرانی کۆن.) [16] بەلاَم هیرۆدس کاتێ ئەمەی بیست، ووتی: (ئەوە کەسیکە نییە، جگە لەو یەحیایەی سەرم بڕیو ئێستاش زیندووبووەتەوە!) [17] ئەم هیرۆدسە کاتی خۆی ناردیو یەحیای گرتوو فڕێیدایە بەندیخانە لەسەر ئەو

هیرۆدیایەی کە خواستی، هیرۆدیاش ژنی فیلیپۆسی برای خۆی بوو. [18] چونکە یەحیا بەهیرۆدسی دەووت: (دروست نییە براژنەکەت بخوازیت.) [19] هیرۆدیاش بەمە رقی هەڵسا لەیەحیاو حەزی دەکرد بیکوژێ، بەڵام نەیدەتوانی. [20] هیرۆدسیش لەیەحیا دەترساو دەیپاراست، چونکە دەیزانی یەحیا کابرایەکی چاكو پیرۆز بوو. کاتێ گوێی لەقسەکانی دەبوو زۆر دڵگران دەبوو، لەهەمان کاتیشدا حەزی دەکرد گوێی لێبگرێ. [21] جا هەل ڕێکەوت، کاتێ هیرۆدس بەبۆنەی جەژنی لەدایك بوونیەوە ئاهەنگێکی گەورەی گێڕابوو، تیایا سەرپەلو ناودارەکانی ناوچەی جەلیلی بانگکردبوو، [22] کچەکەی هیرۆدیا هاتو دەستی کرد بەسەماکردن، هیرۆدسو میوانەکان بەمە زۆر پێخۆشحاڵبوون. ئینجا هیرۆدسی پادشا بەکچە دەڵێ: (هەرچییت دەوێ داوای بکە، دەتدەمێ.) [23] هەروەها سوێندی بۆ دەخواو دەڵێت: (ئەوەی داوای دەکەیت پێتی دەدەم گەر نیوەی پادشاهیەتەکەشم بێت.) [24] کچەش چووە دەرەوەو لەدایکی پرسی: (چی داوا بکەم؟) ئەویش وەڵامی دایەوە: (داوای سەری یەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێش بکە.) [25] کچە دەستبەجێ هاتە ژوورەوەو داوای لەپادشا کردو پێیووت: (دەمەوێ ئێستا، سەری یەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێشم لەسەر سینییەك بدەیتێ.) [26] پادشا بەمە زۆر دڵتەنگ بوو. بەڵام لەبەر ئەو سوێندەی خواردبووی، هەروەها لەبەر ئەو بانگکراوانەی لەگەڵیدا بوون، نەیویست سەرپێچی ئەو سوێندە بکات کە بۆ کچەکەی خواردبوو. [27] پادشا یەکسەر شمشێر بەدەستی ناردو فەرمانیدا سەری یەحیای بۆ بهێنرێ. شمشێر بەدەست ڕۆیشتو لە بەندیخانەدا سەری یەحیای بڕی، [28] ئینجا خستیە سەر سینییەكو هێنای بۆکچەکە، ئەویش دای بەدایکی. [29] کاتێ قوتابیەکانی یەحیا ئەمەیان بیست، هاتن تەرمەکەیان هەڵگرتو ناشتیان.

**تێربوونی پێنج هەزارکەس**

[30] نێرراوەکان گەڕانەوە بۆ لای عیسا، هەواڵی هەموو شتێکیان دایە، لەوەی کردبوویانو فێریان کردبوو.

[31]ئینجا عیسا پێیووتن: (هەر خۆتان وەرن بۆ ئەم شوێنە چۆڵە، کەمێ پشوو بدەن.) خەڵکەکە ئەوانەی دەهاتنو دەچوون ئەوەندە زۆر بوون نەیانهێشت تەنانەت نانەکەشیان بخۆن. [32]جا عیساو قوتابیەکانی بەبەلەم چوون بۆ شوێنێکی چۆڵ. [33]لەوکاتەدا زۆر خەڵك ئەوانیان بینیو ناسیانن، لەشارەکانەوە هاتن بەپێ، رایان دەکرد بەرەو ئەو شوێنەو پێش ئەوان لەوێ ئامادە بوون. [34]کاتێ عیسا لەبەلەمەکە هاتەخوارەوە، خەڵکێکی زۆری بینی، بەزەیی پێیان هاتەوە، چونکە وەك مەڕی بێ شوان وابوون. یەکسەر دەستی کرد بەفێرکردنیان سەبارەت بەزۆر شت. [35]پاش ماوەیەکی زۆر، قوتابیەکانی هاتنو پێیان ووت: (ئەم شوێنە چۆڵەو ڕۆژیش ئەوەندەی نەماوە. [36]خەڵکەکە بەرێ بکە، با برۆن بۆ ئەم کێلگەو لادێ نزیکانەو شتێك خواردن بۆ خۆیان بکڕن.) [37]ئەویش پێی ووتن: (ئێوە خواردنیان بدەنێ.) جا پێیان ووت: (ئایا برۆین بایی دوو سەد دینار نانیان بۆ بکڕینو بیاندەینێ تا بیخۆن؟) [38]عیسا لێیپرسین: (سەیرکەن بزانن چەند نانتان هەیە؟) ئەوانیش پێیان ووت: (پێنج نانو دوو ماسی.) [39]ئەوسا ئەویش فەرمانیدا بەقوتابیەکانی، خەڵکەکە کۆمەڵ کۆمەڵ لەسەر سەوزە گیا دانیشێنن، [40]ئینجا خەڵکەکە بەکۆمەڵی بازنەیی دانیشتن، هەر کۆمەڵەی سەد تا پەنجا کەسێك دەبوون. [41]عیسا پێنج نانو دوو ماسیەکەی هەڵگرت، ڕووی کردە ئاسمانو سوپاسی کرد، ئیتر نانەکانی لەتکردو دای بەقوتابیەکانی تا دابەشی کەن بەسەر خەڵکەکەدا. هەروەها دوو ماسیەکەشی دابەش کرد. [42]خەڵکەکە هەموو نانیان خوارد تا تێربوون. [43]پاشان دوانزە سەبەتە لەتە نانو هەندێ پاشماوەی ماسییان کۆکردەوە. [44]ژمارەی ئەوانەی نانیان خوارد پێنج هەزار پیاو دەبوون.

### عیسا بەسەر ئاودا دەڕوات

[45]دوای ئەمە عیسا فەرمانیدا بەقوتابیەکانی، دەستبەجێ سواری بەلەمەکە بنو بچنە ئەوبەری دەریاچەکەوە، بۆ شاری بەیتسەیدا، بەلام خۆی لەوێ مایەوە بۆ ئەوەی خەڵکەکە بەرێبکا. [46]دوای ئەوەی خەڵکەکەی بەرێکرد چووە

سەرشاخ بۆ نوێژکردن. [47]کاتێ ئێوارە داهات، بەلەمەکە لەناوەڕاستی دەریاچەکە بوو، عیساش بەتەنها لەووشکانیدا بوو. [48]بینی قوتابیەکانی ماندوون بەهۆی سەوڵ لێدان، چونکە ڕەشەباکە ڕوو بەڕوویان بوو، لەبەرەبەیاندا بەپێ بەسەر ئاوی دەریاچەکەدا چوو بۆ لایانو خەریك بوو لێیان تێپەڕێ. [49]کاتێ قوتابیەکان بینیان بەسەر ئاوەکەدا دەڕوات، وایانزانی خێوە، هەموو هاواریان کرد، [50]چونکە پەشۆکان کاتێ بینیان، بەڵام ئەو دەستبەجێ قسەی لەگەڵ کردنو پێی ووتن: (وورەتان بەرز بێت، ئەوە منم مەترسن!) [51]ئینجا عیسا چووە ناو بەلەمەکەیان، ڕەشەباکەش ڕاوەستا. قوتابیەکانیش زۆر سەرسام بوونو سەریان سوڕما. [52]چونکە ئەوان لەکارە سەرسوڕهێنەرەکەی پێنج نانەکە تێنەگەیشتن دڵیان هێشتا هەر ڕەق بوو.

## عیسا نەخۆشیتر چاك دەكاتەوە

[53]کاتێ عیساو قوتابیەکانی پەڕینەوە ئەوبەری ئاوەکە، بەلەمەکەیان لەنگەرداو چوونە ناوچەی جەنیسارەت. [54]هەر لەبەلەمەکە دابەزین خەڵکەکە عیسایان ناسیەوە. [55]دوای ئەوە گەڕان بەو ناوچەو دەورووپشتەدا. عیسا لەهەر کوێ بووایە، خەڵکەکە نەخۆشەکانیان بەجێگەوە دەبرد بۆ لای. [56]بۆ هەر کوێ بڕۆیشتایە، لادێ، شار، کێڵگە، خەڵکەکە نەخۆشەکانیان دەهێناو لەشەقامەکان دایاندەنان، ئەوانیش دەپاڕانەوەو داوای ئەوەیان دەکرد دەستی لێ بدەن، تەنانەت گەر لەچمکی کراسەکەشی بێت، ئەوەی دەستی لێدەدا چاك دەبووەوە.

## سەرپێچیکردنی ڕاسپاردەی خودا

# 7

هەندێ فەریسیو مامۆستایانی شەریعەت کە لەقودسەوە هاتبوون چوونە لای عیسا. [2]بینیان هەندێ لەقوتابیەکانی بێدەست شوشتن نان دەخۆن واتە بەدەستی پیس. [3]چونکە فەریسیەکانو جولەکە هەموو نانیان نەدەخوارد بێئەوەی بەباشی دەستیان نەشۆن، ئەمەش وەك خۆبەستنەوەیەكبوو بەخووڕەوشتی پیرانیان. [4]هەروەها گەر لەبازاڕ

بهاتنایەوە نانیان نەدەخوارد تاخۆیان نەشۆردایە، خووڕەوشتی کەشیان هەبوو وەریان گرتبوو، لەسەری دەڕۆیشتن، وەك شوشتنی کاسەو مەسینەو قاپو قاچاغی مس. [5]لێرە فەریسیەکانو مامۆستایانی شەریعەت لێیان پرسی: (باشە بۆچی قوتابیەکانت لەسەر خووڕەوشتی پیران نارۆنو بەدەستی نەشۆراوەوە نان دەخۆن؟) [6]ئەویش وەلامی‌دانەوە ووتی: (ئەی دووڕووەکان ئەشعیا باشی پێشبینی کردووە دەربارەتان کاتێ ووتویەتی: {ڕێزی ئەم گەلە بۆ من هەر بەدەمە، بەلام دڵیان لەمنەوە دوورە. [7]بە خۆڕایی دەمپەرستن، ئەوان شتێ فێری خەڵکی دەکەن کە ڕاسپاردەی خەڵکیە.} [8]ئێوە ڕاسپاردەکانی خوداتان پشت گوێ خستووەو خۆتان بەستۆتەوە بەخووڕەوشتی مرۆڤەوە.) [9]دیسان پێی‌ووتن: (لەڕاستیدا ئێوە باش دەزانن چۆن ڕاسپاردەکانی خودا ڕەتبکەنەوە تا پارێزگاری لەخووڕەوشتی مرۆڤ بکەن. [10]چونکە موسا ووتویەتی: { ڕێزی دایكو باوکت بگرە، ئەوەی دایكو باوکی ڕیسوا بکات، بامردن سزای بێت.} [11]بەلام ئێوە دەڵێن: (گەر یەکێ بەدایكو باوکی بڵێت ئەوەی لەمنەوە دەستتان دەکەوێ دەیکەمە قوربانی. [12]ئیتر ئێوە داوای لێ‌ناکەن خزمەتی دایكو باوکی بکات. [13]ئابەم شێوەیە، بەو دابو نەریتانەی وەرتان گرتووە، ووشەی خودا لەکار دەخەن . هەروەها زۆر شتی کەش لەم بابەتە کە دەیکەن.)

### ئەوەی مرۆڤ گلاو دەکات

[14]ئینجا جارێکی‌کە هەموویانی بانگ‌کردو پێی‌ووتن: (هەموو گوێم بۆ ڕاگرنو تێ‌بگەن. [15]شت نیيە لەدەرەوەی مرۆڤەوە بێتە ناویو گلاوی بکات. بەلام ئەوەی لەمرۆڤەوە دەردەچێ، ئەوەیە گلاوی دەکات. [16]﴿ئەوەی دوو گوێی هەیە بۆ بیستن با گوێ بگرێ.﴾ [17]کاتێ خەڵکەکە هەموو ڕۆیشتن عیسا هاتە ماڵەوە، قوتابیەکان دەربارەی ئەو نموونەیە پرسیاریان لێ‌کرد. [18]پێی‌ووتن: (ئایا ئێوەش تێ‌ناگەن؟ نازانن ئەوەی لەدەرەوەی مرۆڤەوە دێتە ناویەوە ناتوانێ گلاوی بکات؟ [19]چونکە ناچێتە دڵیەوە، بەڵکو دێتە ناو سکیەوە ئەوسا لەلەشی دێتە

دەرەوە.) بەمەش ڕایگەیاند هەموو خواردنێك پاكە. [20]ئینجا ووتی: (ئەوەی لەمرۆڤەوە دەردەچێ، ئەوەیە مرۆڤ گلاو دەكات. [21]چونكە لەناوەوەو دڵی مرۆڤەوە، بیری خراپ دێتەدەرەوە وەك: بەڕەڵڵایی، دزی، كوشتن، داوێن پیسی، [22] چاوچنۆكی، خراپەكاری، هەڵخەڵەتاندن، بەدڕەوشتی، چاوپیسی، كفر، لووتبەرزیو گێلی، [23]ئەم شتانە هەموو لەناوەوەی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێو مرۆڤ گلاو دەكات.)

**باوەڕی ژنێكی كەنعانی**

[24]دوای ئەمە عیسا ئەو ناوچەیەی بەجێهێشتو چوو بۆ هەرێمی سورو سەیدا. چووە ماڵێك نەیویست ئاشكرابێت، بەڵام نەیتوانی بەشاراوەیی بمێنێتەوە. [25]ئینجا ژنێك كچەكەی ڕۆحی پیسی تیابوو، كاتێ زانی ئەو لەوێیە هاتو كەوتە بەرپێی. [26]ژنەكەش یۆنانی بوو، خەڵكی فینیقیەی سوریا بوو، لێیپاڕایەوە تاكو ئەو ڕۆحە پیسە لەكچەكەی دەربكات.

[27]بەڵام عیسا پێیووت: (جارێ بامندالەكان تێربن، چونكە دروست نییە نان لەمان بسەنرێتو فڕێبدرێ بۆ سەگ.) [28]ژنەكەش لەوەڵامدا ووتی: (ڕاستە گەورەم! بەڵام سەگیش لەژێر مێزدا لەبەرماوەی مندالەكان دەخوات.)

[29]ئینجا عیسا پێیووت: (ئا لەبەر ئەم قسەیە، بڕۆ وا ڕۆحە پیسەكە لەكچەكەت دەرچوو.)

[30]كاتێ ژنە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، كچەكەی بینی لەسەر جێگاكەیو ڕۆحە پیسەكەی لێ دەرچوو بوو.

**چاكبوونەوەی كەڕو لاڵێك**

[31]دوای ئەمە عیسا ناوچەی سوری بەجێهێشتو گەڕایەوە بۆ دەریاچەی جەلیل، بەشاری سەیداو سنووری دە شارەكە تێپەڕی. [32] یەكێكی كەڕو لاڵیان بۆ هێنا، لێیپارانەوە دەستی لەسەر دانێ. [33] عیسا هێنایە ئەم لاوە تۆزێ دوور لەخەڵكەكە، سەری پەنجەی خستە ناو گوێی كابراوە، تفی كردو زمانی گرت. [34]ڕووی خۆی كردە ئاسمانو هەناسەیەكی هەڵكێشاو بەكابراكەی ووت: (ئیفەسا!) واتە بكرێوە. [35]دەستبەجێ گوێو

گـرێی زمـانی کـرانەوە، بـەرێك‌و ڕەوانی دەستی‌کرد بەقسە کردن، [36] ئینجا ڕای‌سپاردن بەکەس نەڵێن بەڵام چەند ڕای‌دەسپاردن ئەوان زیاتر هەواڵیان بڵاودەکردەوە. [37] خەڵکەکە زۆر سەرسام بوون بەشێوەیەك دەیان ووت: (هەموو کردەوەکانی بەباشی ئەنجامدا! تەنانەت وا دەکات کەڕ ببیسێت‌و لاڵ قسە بکات.)

## تێربوونی چوار هەزار کەس

# 8

لەو ڕۆژانەدا خەڵکێکی زۆر لای عیسا کۆبووبوونەوە، شتێکی واشیان نەبوو بیخۆن، عیسا قوتابیەکانی بانگ‌کردو پێی ووتن: [2](من بەزەییم بەو خەڵکەدا دێتەوە، وا بۆ سێ ڕۆژ دەچێ لەگەڵمدان، شتێکی وایان نییە بیخۆن. [3]ناشمەوێ بەبرسێتی بیان‌نێرمەوە بۆ ماڵەوە، نەوەك لەڕێگا بەر نەکەن، چونکە هەندێکیان لەشوێنی دوورەوە هاتوون.)

[4]ئینجا قوتابیەکانی پێیان ووت: (کێ دەتوانێ لەم چۆڵەوانیە ئەم هەموو خەڵکە نان بدات؟)

[5]عیسا لێی‌پرسین: (چەند نانتان لایە؟) وەڵامیان دایەوە: (حەوت.) [6] ئەوسا فەرمانی‌دا بەخەڵکەکە لەسەر زەوی دانیشن. حەوت نانەکەی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، سوپاسی خودای کرد، لەتی‌کردن‌و دای بەقوتابیەکان تا دابەشی بکەن بەسەر هەمووان، ئەوانیش دابەشیان کرد. [7] هەروەها چەند ماسییەکی بچکۆلەشیان پێبوو ئەویشی پیرۆزکردو فەرمانی‌دا بەقوتابیەکانی ئەوانەش دابەش بکەن بەسەر خەڵکەکەدا. [8]ئیتر هەموو نانیان خوارد، هەتا تێربوون. پاشان لەو پارچە نانانەی لەخەڵکەکە مابووەوە، حەوت سەبەتەیان پڕکرد. [9]ژمارەی ئەوانەی نانیان خوارد، نزیکەی چوار هەزار کەس دەبوون. [10]دوای ئەوە عیسا خەڵکەکەی بەڕێ‌کردو دەست‌بەجێ لەگەڵ قوتابیەکانی سواری بەلەمێك بوو، بۆ ناوچەی دەلمانووسە چوو.

## داواکردنی نیشانەی ئاسمانی

[11]هەندێ لەفەریسیەکان هاتن بۆ لای عیسا بۆ ئەوەی تاقی‌بکەنەوە، داوایان لێ‌کرد نیشانەیەکی ئاسمانیان نیشان بدات. [12]ئەویش هەناسەیەکی

هەڵکێشاو ووتی: (بۆچی ئەم نەوەیە داوای نیشانە دەکەن؟ ڕاستیتان پێ دەڵێم: بەم نەوەیە نیشانە نادرێ.) [13]ئینجا بەجێی هێشتن. دووبارە سواری بەلەم بوو، پەڕییەوە ئەوبەری دەریاچەکە.

**فێرکردنی فەریسیەکان**

[14]لەوکاتەدا قوتابیەکانی بیریان چووبوو لەگەڵ خۆیان نان بهێنن، تەنها یەك نانیان پێ بوو. [15]عیسا ڕای سپاردنو پێیووتن: (ئاگاتان لەخۆتان بێ. ئاگاداری هەویرترشی فەریسیەکانو هیرۆدس بن.) [16]قوتابیەکان لەدڵی خۆیان بیریان کردەوەو بەیەکتریان ووت: (بۆیە وا دەڵێت چونکە نانمان لەگەڵ خۆمان نەهێناوە.) [17]عیسا بەمەی زانیو پێیووتن: (بۆ لەدڵی خۆتان وا بیردەکەنەوە، لەبەرئەوەی نانتان پێ نییە؟ ئایا هێشتا فێرنەبوون، تێنەگەیشتون؟ ئایا هێشتا دڵتان هەر ڕەقە؟ [18]خۆ چاوتان هەیە، ئەمانە نابینن؟ گوێتان هەیە، ئەمانە نابیستن؟ هەروەها بیریشتان نایەتەوە؟ [19]کاتی پێنج نانەکەی لەتکرد بۆ پێنج هەزار کەس، چەند سەبەتە پارچە نانی لێمایەوە؟) ووتیان: (دوانزە سەبەتە.) [20]هەروەها حەوت نانەکەی لەتکرد بۆ چوار هەزار کەس، چەند سەبەتەی پڕ پارچەی لێمایەوە؟) ووتیان: (حەوت.) [21]ئینجا پێیووتن: (ئەی چۆن تائێستا تێناگەن؟)

**چاکبوونەوەی کوێرێك**

[22]عیسا لەگەڵ قوتابیەکان بۆ شاری بەیتسەیدا چوو، خەڵکەکە کابرایەکی کوێریان هێنایە لایو لێیپاڕانەوە دەستی لەسەر دانێت. [23]ئەویش دەستی کوێرەکەی گرتو بردیە دەرەوەی دێیەکە پاش ئەوەی تفی لەسەر چاوی کابرادا، دەستی لەسەر داناو لێیپرسی: (هیچ دەبینی؟) [24]کابرا سەیری کردو ووتی: (خەڵك دەبینم، وەکو درەخت دەڕۆن.) [25]عیسا جارێکی کەش دەستی خستەوە سەر چاوی، بەمە کابرا چاکبووەوەو هەموو شتێکی بەباشو بەڕوونی دەبینی. [26]ئینجا عیسا کابرای بەرەو ماڵەوە ڕەوانەکردو پێی ووت: (جارێ مەڕۆ بۆ ناو دێ.)

**دانپیانانی پەترۆس بەمەسیح**

[27]دوای ئەمە عیساو قوتابییەکانی ڕوویان کردە دێیەکانی قەیسەری فیلیپۆس، لەڕێگا لەقوتابییەکانی پرسی: (خەڵکی من بەکێ دادەنێن؟) [28]وەڵامیان دایەوە: (بەشێ لەخەڵکی دەڵێن، تۆ یەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێشی، بەشێکی کەش دەڵێن، تۆ ئەلیاسی، هەندێکی کەش دەڵێن یەکێ لەپێغەمبەرانی.) [29]دیسان لێی‌پرسین: (ئەی ئێوە، من بەکێ دادەنێن؟) پەترۆس وەڵامی‌دایەوە: (تۆ مەسیحی*.) [30]عیسا ئاگاداری کردنەوە ئەمە لای کەس باس نەکەن.

### یەکەم باسی مردنی عیسا

[31]ئینجا عیسا دەستی‌کرد بەفێرکردنیان، کە ڕۆڵەی مرۆڤ دەبێت ئازار بچێژیو پیرانو سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت ڕەتی‌بکەنەوە، هەروەها بکوژرێو دوای سێ ڕۆژ زیندووبێتەوە. [32]عیسا ئەم باسەی زۆر بەئاشکرا بۆ باسکردن، پەترۆسیش بردیە لاوەو سەرزەنشتی کرد. [33]ئینجا عیسا ئاوڕی لەقوتابییەکانی دایەوە، سەیری‌کردنو سەرزەنشتی پەترۆسی کرد، ووتی: (لاچۆ لەبەردەمم ئەی شەیتان، تۆ بیرت لای شتی خودایی نییەو بیر لەشتی مرۆڤانە دەکەیتەوە.)

### خۆئامادەکردن بۆ مردن

[34]ئینجا عیسا قوتابییەکانیو خەڵکەکەی بانگ‌کردو پێی‌ووتن: (ئەوەی دەیەوێ بەدوامەوە بڕوات، با واز لەخۆی بهێنێتو خاچی خۆی هەڵگرێو دوام‌کەوێت. [35]چونکە ئەوەی بیەوێ ژیانی ڕزگاربکات، دەی‌دۆڕێنێت، بەڵام ئەوەی ژیانی خۆی دەدۆڕێنێت لەپێناوی منو مزگێنی، ئەوە ژیانی ڕزگار دەکات. [36]چونکە چی بەکەڵکی مرۆڤ دێت، گەر هەموو جیهان بەرێتەوە، بەڵام خۆی بدۆڕێنێت؟ [37]یان مرۆڤ چی پێشکەش بکات بۆ کڕینەوەی خۆی؟ [38]چونکە ئەوەی شەرمی بەمنو ووشەکانم بێ، لای ئەم نەوە بەدرەوشتو گوناهبارە. ڕۆڵەی مرۆڤیش، شەرمی پێوە دەکات، کاتێ لەشکۆمەندی باوکی لەگەڵ فریشتە پیرۆزەکان دەگەڕێتەوە.)

### شێوە گۆڕانی عیسا

## 9

ئینجا عیسا پێی ووتن: (ڕاستیتان پێدەڵێم: هەندێ لەوانەی لێرەدا ڕاوەستاون، تامی مردن ناچێژن تا پادشاهێتی خودا* نەبینن کاتێ بەتواناوە دێت.

[2]دوای ئەمە بەشەش ڕۆژ، عیسا پەترۆس و یاقوب و یۆحەنای لەگەڵ خۆی بردو بەیەکەوە چوونە سەر چیایەکی بەرز. کاتێ لەبەرچاویان شێوەی خۆی بەتەواوی گۆڕی، [3] جلەکانی بەشێوەیەك سپی‌بوو بریسکەی دەدایەوە زیاتر لەهەموو ڕووناکی ئەم سەر زەویە. [4]لەو کاتەدا موساو ئەلیاس دەرکەوتن بۆیان، لەگەڵ عیسادا دەدوان. [5]ئینجا پەترۆس بەعیسای ووت: (گەورەم، شتێکی خۆشە لێرە بمێنینەوە گەر دەتەوێت سێ چادر هەڵدەدەین یەکێ بۆ تۆ، یەکێ بۆ موسا، یەکێکیش بۆ ئەلیاس.) [6]پەترۆس نەیدەزانی چی دەڵێ، لەو کاتەدا هەر سێ قوتابیەکە ترسیان لێ نیشتبوو، [7]ئینجا هەورێك باڵی کێشا بەسەریان‌و دەنگێك لەهەورەکەوە بانگی کرد: (ئا ئەوەتا ڕۆڵەی خۆشەویستم، ئەوەی پێی دڵشام، گوێی بۆ ڕاگرن.) [8]دوای ئەمە قوتابیەکان خێرا سەیری دەورووپشتیان کرد، بەڵام لەعیسا زیاتر کەسیان نەبینی.

[9]کاتێ لەشاخەکە هاتنە خوارەوە، عیسا ئاگاداری کردنەوە: (ئەمەی بینیان جارێ بەکەسی ڕانەگەیەنن، تا ڕۆڵەی مرۆڤ لەناو مردووان هەڵدەستێتەوە.) [10]ئەوانیش ڕاسپاردەکەیان جێبەجێ کرد، بەڵام لەناوخۆیان پرسیاریان کرد: (باشە مەبەست لەهەستانەوە لەنێو مردوواندا چییە؟) [11]ڕووی پرسیاریان کردە عیساو ووتیان: (باشە بۆچی مامۆستایانی شەریعەت دەڵێن، دەبێ یەکەمجار ئەلیاس بێتەوە؟) [12]عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (ئەمە ڕاستە، ئەلیاس دێت‌و هەموو شتێ دەخاتەوە شوێنی خۆی. سەرەڕای ئەمە بۆچی لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە، ڕۆڵەی مرۆڤ دەبێت ئازار بکێشێت‌و بەچاوی نزم سەیر بکرێ؟ [13]بەڵام پێتان دەڵێم ئەلیاس هات، چیان‌ویست پێیان‌کرد، بەو شێوەیەی لەکتێبی پیرۆز دەربارەی نووسراوە.)

### دەرکردنی ڕۆحی پیس

[14]کاتێ عیساو قوتابیەکانی

هاتنەوە لای قوتابیەکانی‌کە، بینییان خەڵکێکی زۆریان لیٚ‌کۆبووەتەوە، لەوانە هەندێ لەمامۆستایانی شەریعەت خەریکی گفتوگۆ کردنن لەگەڵیان. [15]کە خەڵکەکە عیسایان بینی هەموو سەرسام بوون، خێرا بۆ لای چوون تاسلاَوی لیٚبکەن. [16] ئەوسا عیسا لیٚی‌پرسین: (دەربارەی چی دەدوێن؟) [17]یەکیٚ لەنێوان خەڵکەکەوە هاواری‌کرد، ووتی: (مامۆستا کورەکەم هێناوەتە لات رۆحی پیسی تێدایە، لالی‌کردووە. [18]کاتیٚ دەیگریٚ، دەیدا بەزەویداو کەف لەدەمی دیٚتو ددانە چرکێی پیٚدەکەویٚت. داوام لەقوتابیەکانت کرد رۆحەکە دەرکەن، بەلاَم نەیانتوانی. [19]عیسا لەوەلاَمدا ووتی: (ئەی نەوەی بیٚباوەر! تاکەی لەگەڵتان بم؟ تاکەی بارتان هەڵگرم؟ ئا بیهێنن بۆ لام.) [20]ئەوانیش کورەکەیان هێنایە لای عیسا. هەر کە رۆحە پیسەکە عیسای بینی، منداڵەکە فیٚی لیٚهاتو کەوتە سەر زەوی، کەف لەدەمی هاتو دەستی‌کرد بەگەوزینو خۆ خولانەوە. [21]عیسا لەباوکی کورەکەی پرسی: (لەکەیەوە وای لیٚدیٚت؟) ئەویش لە وەلاَمدا ووتی: (لەمنداڵییەوە. [22]زۆر جار رۆحە پیسەکە خستویەتیە ناو ئاو و ئاگرەوە تابیکوژیٚ. گەر بتوانی شتێکمان بۆ بکەیت، بەزەییت پیٚمان بیٚتەوەو یارمەتیمان‌بدە.) [23]عیسا پیٚی ووت: ((گەر بتوانی)؟ ئەوەی باوەربهێنیٚ هەموو شتێکی بۆ دەبیٚت.) [24] دەستبەجیٚ باوکی منداڵەکە هاواری کرد: (باوەرم هەیە، یارمەتی بیٚباوەریم بدە.) [25]عیسا کە بینی خەڵکەکە لیٚیان کۆدەبنەوە، بەرۆحە پیسەکەی ووت: (ئەی رۆحی کەرو لاڵ، فەرمانت پیٚدەدەم برۆ دەرەوە لەو کورەو جارێکی کە نەگەرێیتەوە بۆ لای!) [26]دوایی رۆحەکە هاواری‌کردو کورەکەی بەتوندی خستو هاتە دەرەوە. کورە وەك مردووی لیٚهات، کەسانێکی زۆر ووتیان: (مرد.) [27]بەلاَم کاتیٚ عیسا دەستی‌دایە دەستی‌و هەڵی‌ساند، ئەویش هەستایە سەرپیٚ. [28]کاتیٚ عیسا گەرایەوە بۆ ماڵ، قوتابیەکان بەتەنها لیٚیان پرسی: (بۆچی ئێمە نەمانتوانی ئەو رۆحە دەرکەین؟) [29] وەلاَمی دایەوە: (ئەم جۆرە رۆحە دەرناکریٚ بەنویٚژ نەبیٚت.)

**دووەم باسی مردنی عیسا**

[30]دوای ئەمە لەوێ ڕۆیشتن‌و بەناوچەی جەلیل تێپەڕین، عیساش نەیدەویست کەس پێی بزانێ، [31]چونکە خەریکی فێرکردنی قوتابیەکانی بوو، پێی‌ووتن: (ڕۆڵەی مرۆڤ، دەدرێ بەدەستی خەڵکیەوە، دەکوژرێ، دوای کوشتنی بەسێ ڕۆژ هەڵدەستێتەوە). [32]بەڵام ئەوان ئەم قسەیە تێ‌نەگەیشتن‌و ترسان لێی‌بپرسن.

**کێ مەزنترینە ؟**

[33]ئینجا عیسا چوو بۆ شاری کەفەرناحوم. کاتێ گەیشتە ماڵەوە، لەقوتابیەکانی پرسی: (ئەوە لەڕێگا باسی چیتان دەکرد؟) [34]قوتابیەکان هیچ وەڵامیان نەدایەوە، چونکە لەڕێگە مشت‌ومڕی ئەوەیان بوو، کامیان مەزنترە. [35]ئینجا عیسا دانیشت، هەر دوانزە قوتابیەکەی بانگ‌کردە لای خۆی‌و پێی‌ووتن: (گەر یەکێ ویستی یەکەمین بێت. باخۆی بخاتە دوای هەمووانەوەو ببێتە خزمەتکار بۆ هەمووتان.) [36]هەر لەوێدا منداڵێکی بانگ‌کرد، گرتیە باوەشیەوەو لەناوەڕاستیان ڕای‌گرت‌و پێی‌ووتن: [37](ئەوەی بەناوی منەوە پێشوازی لەیەکێ لەم منداڵانە بکات، ئەوا پێشوازی لەمن دەکات، هەروەها ئەوەی پێشوازی لەمن دەکات، ئەوا پێشوازی لەمن ناکات، بەڵکو لەوەی ناردوومی.)

**ئەوەی دژمان نییە لەگەڵمانە**

[38]ئینجا یۆحەننا ووتی: (مامۆستا، یەکێکمان بینی بەناوی تۆوە ڕۆحی پیسی لەخەڵکی دەردەکرد، ڕێمان لێ‌گرت، چونکە دوامان ناکەوێت.) [39]عیسا ووتی: (ڕێی لێ‌مەگرن. کەسێ نییە بەناوی منەوە کاری سەرسوڕهێنەر بکات‌و بتوانێ بەخراپە باسم بکات. [40]جا ئەوەی دژمان نییە لەگەڵماندایە. [41]چونکە ئەوەی بەناوی منەوە جامێ ئاوی پێدان، لەبەرئەوەی سەر بە مەسیحن، ڕاستیتان پێ‌دەڵێم ئەو کەسە پاداشتی وون نابێت.

**کۆسپ دروستکردن**

[42](ئەوەی ببێتە کۆسپ بۆ یەکێك لەم بچووکانەی باوەڕیان بەمن هەیە، ئەوا باشترە بۆ ئەو بەردی دەستار بەملیەوە هەڵواسرێ‌و فڕێ

بدرێتە ناو قوڵایی دەریاوە. [43] هەروەها گەر دەستت تووشی گوناهی کردی، بیبڕەوە، باشترە بڕۆیتە ناو ژیانی هەتاهەتایی بەیەك دەستەوە لەوەی بەهەردوو دەستەوە بڕۆیت بۆ دۆزەخ، بۆ ناو ئاگریَ کوژانەوەی بۆ نییە. [44]﴿چونکە لەویَ کرمەکانیان مردنیان بۆ نییەو ئاگریان ناکوژێتەوە.﴾ [45] هەروەها گەر قاچت تووشی گوناهی کردی، بیبڕەوە، باشترە بەیەك قاچەوە بڕۆیتە ناو ژیانی هەتاهەتاییەوە لەوەی بەهەردوو قاچەوە بڕۆیتە ناو دۆزەخەوە. بۆ ناو ئاگریَ کوژانەوەی بۆ نییە. [46] ﴿لەویَ کرمەکانیان مردنیان بۆ نییەو ئاگریان ناکوژێتەوە.﴾ [47] هەروەها گەر چاوت تووشی گوناهی کردی دەریبهێنە، باشترە بڕۆیتە ناو پادشاهێتی خوداوە بەبیَ چاو لەوەی بەدوو چاوەوە بڕۆیتە ناو دۆزەخەوە. [48] لەویَ کرمەکانیان مردنیان بۆ نییەو ئاگریان ناکوژێتەوە. [49] چونکە هەموو بەئاگر سوێر دەکرێن. [50] خویَ باشە، بەڵام گەر خویَ سوێرییەکەی نەما، چی سوێرییەکەی بۆ دەگەڕێنێتەوە؟ با لەدەرونتان گشت کات خویَ هەبێت، هەروەها ئاشتی خوازبن بەرامبەر بەیەکتری.)

### تەلاق دان

## 10

ئینجا عیسا ئەو ناوچەیەی بەجیَهێشتو چوو بۆ هەرێمی یەهودیاو پشتی ئوردون. دیسانەوە خەڵکەکە لێی کۆبوونەوە، ئەویش هەروەك لێیڕاهاتبوو دەستیکرد بەفێرکردنیان.

[2] هەندیَ لەفەریسیەکان لێیهاتنە پێشەوە تا تاقیبکەنەوە، لێیان پرسی: (ئایا دروستە پیاو ژنەکەی تەڵاق بدات؟) [3] لێرەدا عیسا لێیپرسین: (موسا چ ڕاسپاردەیەکی پیَداون؟) [4] ووتیان: (موسا ڕێیداوە تەڵاقنامە بنووسریَ، بەمەش ژن تەڵاق دەدریَ.) [5] عیسا وەڵامیدانەوە: (موسا ئەم ڕاسپاردەیەی بۆ نووسیون، لەبەر دڵڕەقیتان. [6] بەڵام لەسەرەتای دروست بوونەوە خودا مرۆڤی بەنێرو میَ دروست کرد. [7] لەبەر ئەو هۆیە پیاو باوکو دایکی بەجیَ دەهێڵێتو لەگەڵ هاوسەرەکەی یەکدەگریَ، [8] ئەوسا هەردووکیان دەبن بەیەك لەش. ئیتر دوو نین بەڵکو یەك

لەشن. [9]ئەوەی خودا بەیەکی گەیاندووە، مرۆڤ جیای ناکاتەوە.) [10]که گەڕانەوە بۆ ماڵ، قوتابیەکانی لەم بارەیەوە لێیان پرسی. [11]ئەویش پێیووتن: (ئەو پیاوەی ژنەکەی تەلاق دەداو یەکێکی که دەهێنێ، ئەوا داوێن پیسی لەگەڵ دەکات. [12]هەروەها ئەو ژنەی واز لەمێردەکەی دەهێنێتو شوو بەیەکێکی که دەکات، ئەوا داوێن پیسی دەکات.)

**پادشاهێتی ئاسمان بۆ منداڵانە**

[13]هەندێ کەس منداڵیان هێنا بۆ لای عیسا، بۆ ئەوەی دەستیان لێبدات، بەڵام قوتابیەکان نەیانهێشت. [14]کاتێ عیسا ئەمەی بینی، تووڕەبوو، پێیووتن: (واز لەمنداڵان بهێنن با بێن بۆ لام، ڕێگەیان لێمەگرن، چونکه پادشاهێتی خودا بۆ ئەوانەیە. [15]بەڕاستی پێتان دەڵێم: ئەوەی وەك منداڵێك پادشاهێتی خودا وەرنەگرێ، ناچێتە ناویەوە.) [16]ئینجا منداڵەکانی لەباوەش کردو دەستی خستە سەر سەریانو پیرۆزی کردن.

**گەنجە دەوڵەمەندەکە**

[17]کاتێ عیسا خەریك بوو دەڕۆیشت، پیاوێك خێرا هات، کڕنووشی بۆ بردو لێی پرسی: (ئەی مامۆستای باش، چی بکەم بۆ ئەوەی ژیانی هەتاهەتایی بەدەست بهێنم؟) [18]عیسا پێیووت: (بۆچی بەباش ناوم دەبەیت؟ ئەوە بزانە کەس باش نییە یەکێك نەبێت، ئەویش خودایە. [19]تۆ ڕاسپاردەکان دەزانیت: مەکوژە، داوێن پیسی مەکە، مەدزە، شایەتی درۆ مەدە، زۆرداری لەکەس مەکە، ڕێزی باوکو دایکت بگرە.) [20]کابراش ووتی: (مامۆستا لەمنداڵیەوە هەموو ئەمانەم کردووە.) [21]عیسا سەیری کردو خۆشیویست، پێیووت: (شتێکت ماوە بیکەیت بڕۆ ئەوەی هەتە بیفرۆشەو دابەشی کە بەسەر هەژاران، بەمە گەنجینەیەکت دەبێت لەئاسمان، دوای ئەمە وەرە دوام بکەوە.) [22]کابرا بەمە زۆر دڵگران بوو، ئەوێی بەجێهێشت، چونکه سامانێکی زۆری هەبوو.

[23]ئینجا عیسا سەیری دەورووپشتی خۆی کردو بەقوتابیەکانیووت: (چەند گرانە بۆ

ئەوانەی دەوڵەمەندن بچنە ناو پادشاهێتی خوداوە!) [24]قوتابیەکان سەریان سوڕما لەقسەکانی، بەلاّم عیسا جارێکی کە وەلاّمی‌دانەوەو پێی‌ووتن: (ڕۆڵەکان چەند سەختە چوونە ناوەوەی پادشاهێتی خودا! [25]ڕۆیشتنی حوشترێك بەکونی دەرزیەکدا ئاسانترە لەچوونە ژوورەوەی دەوڵەمەندێك بۆ پادشاهێتی خودا.) [26]قوتابیەکان زیاتر سەریان سوڕماو بەیەکتریان ووت: (کەواتە کێ ڕزگاری دەبێت؟) [27]عیسا سەیری کردنو ووتی: (بەلای مرۆڤەوە ئەمە نابێت، بەلاّم بەلای خوداوە نا، چونکە هەموو شتێك لەلایەن خوداوە دەبێت.) [28]ئینجا پەترۆس پێی ووت: (ئەوەتا ئێمە هەموو شتێکمان بەجێ‌هێشتووەو دوات‌کەوتوین.) [29]عیسا لە وەلاّمدا ووتی: (ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: کەس نییە براو خوشكو دایكو باوكو منداڵو ماڵو کێڵگەی بەجێ‌هێشتبێ لەپێناوی منو لەپێناوی مزگێنی، [30]لەم زەمانەدا سەد ئەوەندە وەرنەگرێتەوە لەماڵو براو خوشكو دایكو منداڵو کێڵگە لەگەڵ چەوسانەوە، لەداهاتووش ژیانی هەتاهەتایی. [31]بەلاّم زۆر لەیەکەمینەکان دەبنە دواهەمینو دواهەمینەکانیش دەبنە یەکەمین.)

### سێهەم باسی مردنی عیسا

[32]کاتێ هەموو بەڕێگاوەبوون بەرەو شاری قودس، عیسا لەپێشیانەوە دەڕۆیشتو قوتابیەکانیش بەسەرسوڕماویەوە بەدوایەوە، خەڵکەش بەترسەوە. عیسا دوانزە قوتابیەکەی جارێکی کە بردە لاوە، پێی‌ووتن چی بەسەردێ: [33](ئەوا بۆ شاری قودس دەڕۆین، لەوێ ڕۆڵەی مرۆڤ دەدرێتە دەست سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت، بڕیاری مردنی بەسەردا دەدەن، دەیدەنە دەست ناجوولەکەکان، [34]گاڵتەی پێ‌دەکەن، تفی لێ‌دەکەن، بەقامچی لێی‌دەدەن، ئینجا دەیکوژن. ئەویش دوای سێ ڕۆژ هەڵدەستێتەوە.)

### خزمەتکار مەزنترینە

[35]لێرە یاقوبو یۆحەننا دوو کوڕەکەی زەبدی لێی‌هاتنە پێشەوەو پێیان ووت: (مامۆستا، دەمانەوێ ئەوەی داوات لێ‌دەکەین بۆمانی

جێبەجێ بکەی.) [36]ئەویش لێی‌پرسین: (چیتان دەوێت بۆتانی بکەم؟) [37]پێیان ووت: (بهێڵە لەشکۆمەندیەکەتدا یەکێکمان لەلای ڕاستت‌و ئەوی ترمان لەلای چەپت دانشین.) [38]عیسا پێی‌ووتن: (ئێوە نازانن داوای چی دەکەن، دەتوانن ئەو جامە بخۆنەوە کەمن دەیخۆمەوە، یا بەو شێوەیە لەئازار هەڵکێشرێن کە من هەڵدەکێشرێم؟) [39]ووتیان: (دەتوانین.) ئینجا عیسا پێی‌ووتن: (ئەو جامەی من دەی‌خۆمەوە، لەدوایدا ئێوەش دەی‌خۆنەوە، بەو شێوەیەی من لەئازار هەڵدەکێشرێم، ئێوەش هەڵدەکێشرێن. [40]بەلاَم دانیشتن لەلای ڕاست‌و چەپمەوە من ناتوانم بیدەم، تەنها بەوانە نەبێ کە بۆیان دانراوە.) [41]کاتێ دە قوتابیەکە ئەمەیان لەیاقوب‌و یۆحەنا بیست لێیان تووڕەبوون. [42]ئەوسا عیسا بانگی کردن‌و پێی‌ووتن: (دەزانن سەرۆك نەتەوەکان کە فەرمانڕەوایی دەکەن گەورەیان هەیە لەسەروویانەوە، هەروەها گەورەکانیان دەسەلاَتیان هەیە بەسەریان. [43]بەلاَم ئێوە بائەمە لەناوتان نەبێت، ئەوەی دەیەوێ مەزن بێت لەناوتان، با ببێت بەخزمەتکارتان. [44]ئەوەش کە دەیەوێت لەناوتان ببێتە یەکەمین، بابێتە کۆیلە بۆ هەمووان. [45]تەنانەت ڕۆڵەی مرۆڤیش نەهاتووە بۆ ئەوەی خزمەت بکرێ، بەڵکو بۆ ئەوەی خزمەت بکات‌و خۆی پێشکەش بکات‌و بەخت بکات لەپێناوی خەڵکێکی زۆر.

**عیسا کوێرێك چاكدەكاتەوە**

[46]ئینجا گەیشتە ئەریحا، کاتێ ئەریحایان بەجێ‌هێشت قوتابیەکان‌و خەڵکێکی زۆری لەگەڵ بوو، کوڕی تیماوس کە بارتیماوسی پێ‌دەووترا کوێر بوو، لەسەرە ڕێگادا دانیشتبوو سواڵی دەکرد. [47]کاتێ بیستی عیسای ناسیرییە لەوێوە دەڕوا، دەستی‌کرد بەهاوارکردن‌و ووتی: (ئەی عیسای ڕۆڵەی داود، بەزەییت پێمدابێتەوە!) [48]لەوێدا زۆر کەس سەرزەنشتیان‌کرد تا بێ‌دەنگ بێت. بەلاَم ئەو زیاتر هاواری‌کرد: (ڕۆڵەی داود، بەزەیت پیامدابێتەوە!) [49]عیسا ڕاوەستاو ووتی: (بانگی بکەن.) ئەوانیش کابرای کوێریان بانگ‌کردو ووتیان: (بە وورەبە! هەستە! بانگت

دەکات.) [50]ئەویش کەواکەی بەری فڕێداو ڕۆیشت بەرەو لای عیسا. [51]عیسا لێی پرسی: (دەتەوێ چیت بۆ بکەم؟) کابرای کوێر وەڵامی دایەوە: (گەورەم، دەمەوێ چاوم چاکەیتەوە.) [52]ئینجا عیسا پێی ووت: (بڕۆ! باوەڕت چاکی کردیتەوە.) دەستبەجێ کابرا چاوی ڕووناکی تێکەوت و لەدوای عیسا ڕۆیی بەڕێدا.

### عیسا دەڕوات بۆ قودس

## 11

کاتێ لەقودس نزیك بوونەوە، گەیشتنە دێی بەیتفاجی و بەیتعەنیا کەنزیك کێوی زەیتونن. عیسا دووان لەقوتابیەکانی نارد، [2] پێی ووتن: (بڕۆنە ئەو دێیەی بەرامبەرتان، کە دەگەنە ئەوێ، دەبینن جاشکێك بەستراوەتەوە، تا ئێستا کەس سواری نەبووە، بیکەنەوەو بیهێنن بۆ ئێرە. [3]گەر یەکێك پێی ووتن: بۆ ئەمە دەکەن؟ بڵێن: گەورەمان پێویستی پێیەتی، ئینجا دەستبەجێ دەینێرێ بۆ ئێرە.) [4]قوتابیەکان ڕۆیشتن و لەکۆڵانێك بینیان جاشکەکە بەدەرگای دەرەوە بەستراوەتەوە، ئەوانیش کردیانەوە، [5]هەندێ کەس لەویدا ڕاوەستابوون ووتیان: (چی دەکەن؟ بۆ ئەو جاشکە دەکەنەوە؟) [6]بەو شێوەیەی عیسا پێی ووتبوون وەڵامیان دایەوە، ئیتر وازیان لێهێنان. [7]ئینجا کراسەکانیان خستە سەر پشتی جاشکەکەو هێنایان بۆ عیسا، ئەویش سواری بوو. [8]زۆر لەخەڵکەکە ڕێگەکەیان ڕاخستبوو بەجلەکانیان و هەندێکیکەش بەلقی دار کە لەباخەکانیان کردبووەوە. [9] ئەوانەی لەدوایەوە دەڕۆیشتن و ئەوانەش لەپێشیەوە بوون، هاواریان دەکرد: (هۆسانا! پیرۆزە ئەوەی بەناوی خوداوەندەوە دێت! [10]پیرۆزە ئەو پادشاهێتییەی دێت، پادشاهێتی داودی باوکمان! هۆسانا لەبەرزایی!) [11]دوای ئەمە عیسا گەیشتە شاری قودس، چووە ناو پەرستگاکەوە تەمشای هەموو شتێکی کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی کات دەمەو ئێوارە بوو، لەگەڵ دوانزە قوتابیەکەی ڕۆیشتەوە بۆ دێی بەیتعەنیا.

### دار هەنجیری بێ بەر

[12] بەیانی کاتێ عیسا دێی بەیتعەنیای بەجێهێشت، برسی بوو. [13] لەدوورەوە دار هەنجیرێکی بینی باش گەڵای کردبوو، ڕووی تێکرد بەڵکو بەری پێوە بێت. کاتێ گەیشتە لای لەگەڵا زیاتر هیچی پێوە نەدی، چونکە کاتەکە وەرزی هەنجیر نەبوو. [14] عیسا پێی ووت: (ئیتر کەس لەبەرت ناخوات تاهەتایە.) قوتابیەکانیش گوێیان لەمەبوو.

### پاککردنەوەی پەرستگا

[15] هاتنەوە بۆ قودسو عیسا چووە ناو پەرستگاکەوە، دەستی کرد بەدەرکردنی ئەوانەی خەریکی کڕینو فرۆشتن بوون. مێزی پارە گۆڕەوەکانی وەرگێڕا لەگەڵ شوێنی دانیشتنی کۆتر فرۆشان. [16] ئیتر نەیهێشت کەس بەناو پەرستگاکەدا بڕوات لەوانەی شتو مەکیان بەسەر کۆڵەوە بوو. [17] دەستی کرد بەفێرکردنی خەڵکەکەو ووتی: (ئایا خودا لەکتێبی پیرۆز نەیفەرمووە: {ماڵم بەشوێنی نوێژ ناودەبرێ لەلای هەموو گەلان؟} کەچی ئەوەتا ئێوە کردووتانە بە {ئەشکەوتی دزان!})

[18] هەر کە سەرۆک کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت گوێیان لەمە بوو، بیریان کردەوە لەوەی چۆن بیکوژن. چونکە لێی دەترسان لەبەرئەوەی خەڵکەکە هەموو سەرسام بووبوون لەفێرکردنەکانی. [19] کاتێ ئێوارە داهات، عیساو قوتابیەکانی چوونە دەرەوەی شار.

### دەربارەی هێزی باوەڕ

[20] ڕۆژی دوایی بەیانی زوو کاتێ بەلای دار هەنجیرەکەدا ڕۆیشتن، سەیریان کرد هەمووی ووشك بووە لەڕەگەوە. [21] پەترۆس بیری کەوتەوەو ووتی: (مامۆستا، سەیری ئەو دار هەنجیرە بکە کە نەفرەتت لێکرد، ووشك بووە!) [22] ئینجا عیسا بەهەموویانی ووت: (باوەڕتان بەخودا بێت.) [23] بەڕاستی پێتان دەڵێم: ئەوەی بەو شاخە بڵێ هەڵکەنرێو بڕۆ خۆت بخەرە ناو دەریاوە، بەمەرجێ گومان نەکات لەدڵی، بەڵکو باوەڕ بکات ئەوەی دەیڵێ دەبێت، ئەوا بۆی دەبێت. [24] جا لەبەرئەوە پێتان دەڵێم: ئەوەی داوای دەکەنو نوێژی بۆ دەکەن، باوەڕتان هەبێ کە وەرتان

گرتووە، ئەوا بۆتان دەبێ. [25] کاتێکیش کە نوێژ دەکەن گەر شتێکتان هەبوو بەسەر یەکێکەوە لێی خۆش‌بن، هەتا باوکی ئاسمانیتان لەهەڵەکانتان خۆش‌بێت. [26]﴿بەڵام ئێوە گەر لێ‌بوردنتان بۆ خەڵکی نەبێت، باوکی ئاسمانیشتان لێ‌بووردنی نابێت بۆهەڵەکانتان.﴾)

### دەسەڵاتی عیسا

[27] عیساو قوتابیەکانی دیسان هاتنەوە بۆ قودس، کاتێ بەپەرستگادا دەڕۆیشت، سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەتو پیران لێی‌هاتنە پێشەوە، [28]لێیان پرسی: (ئەوەی کردووتە بەچ دەسەڵاتێ دەیکەیت؟ کێ دەسەڵاتی پێت داوە ئەم شتانە بکەی؟) [29]عیسا وەڵامی دانەوە ووتی: (منیش شتێکتان لێ‌دەپرسم، گەر وەڵامم بدەنەوە، ئەوسا پێتان دەڵێم بەچ دەسەڵاتێك ئەم شتانە دەکەم: [30] ئایا یەحیا لەئاسمانەوە دەسەڵاتی پێ‌درابوو خەڵك لەئاوهەڵکێشێت یان لەخەڵکیەوە؟ وەڵامم بدەنەوە!) [31] ئەوانیش کەوتنە تەگبیرو ڕاوێژ لەنێو خۆیان، ووتیان: (گەر بڵێین لەئاسمانەوە بوو، دەڵێت باشە بۆچی باوەڕتان پی‌نەکرد؟ [32]یان ئەگەر بڵێین لەخەڵکیەوە بوو، ...) ئەوان لە گەل دەترسان، چونکە گەل یەحیایان بەپێغەمبەر دادەنا. [33]ئەوسا بەعیسایان ووت: (نازانین.) عیساش پێی‌ووتن: (منیش پێتان ناڵێم بەچ دەسەڵاتێك ئەمانە دەکەم.)

### نموونەی باخەوانەکانی ڕەز

## 12

عیسا بەنموونە قسەی‌کرد بۆ خەڵکەکە، ووتی: (کابرایەك باخێکی مێوی چاندو دەورووپشتەکەی پەرژین کرد، لەناویدا بابەتی ترێ گوشینی تێدا داناو شوێنی پاسەوانی تێدا دروست‌کرد. ئینجا ڕەزەکەی دایەدەست باخەوانانو خۆی بۆ وولاتێکی‌کە ڕۆیشت. [2]کاتێ وەرزی بەرووبووم هات، ئیشکەرێکی نارد بۆ لای باخەوانەکان تاکو لەبەری ڕەزەکە بەشی خۆی بۆ بنێرن. [3] بەڵام باخەوانەکان کابرایان گرتو لێیان‌داو بەدەستی بەتاڵ ناردیانەوە. [4] کابرا دیسانەوە ئیشکەرێکی کەی نارد بۆ لایان، باخەوانەکان ئەمیشیان بەلێدانو سووکایەتی پێ‌کردنو

سەرشکاویەوە بۆ ناردەوە. [5]ئینجا کابرا ئیشکەرێکی کەی نارد، باخەوانەکان ئەمجارە ئیشکەرەکەیان کوشت. کابرا دیسان چەند کەسێکی تری نارد بۆ لایان، باخەوانەکان ئەمجارەشیان هەستان بەلێدانی هەندێکیانو کوشتنی ئەوانی کەیان. [6]کابرا کوڕێکی تاقانەی خۆشەویستی هەبوو، لەدواییدا هەستاو کوڕەکەی نارد بۆ لایان، ووتی: هەر چۆنێك بێت لەکوڕەکەم سڵدەکەنەوە. [7]بەڵام باخەوانەکان بەیەکتریان ووت: ئەوەتا ئەوە میراتگرە، وەرن بابیکوژین ئەوسا میراتەکە بۆ خۆمان دەمێنێتەوە. [8]ئینجا کوڕەکەیان گرت، کوشتیانو فڕێیاندایە دەرەوەی ڕەزەکە. [9]باشە دەبێ خاوەنی ڕەزەکە چیبکات؟ ئەو دێتو باخەوانەکان لەناو دەباتو ڕەزەکە دەدا بەباخەوانانی تر. [10]ئایا لەکتێبی پیرۆزدا ئەم ئایەتەتان نەخوێندۆتەوە: {ئەو بەردەی وەستاکان ڕەتیانکردەوە، بوو بە بەردی بناغە. [11]ئەمەش لەخوداوەندەوەیەو شتێکی سەرسوڕهێنەرە لەبەر چاومان.}؟ [12]دوای ئەمە ویستیان عیسا بگرن، چونکە دەیانزانی نموونەکە ئەوان دەگرێتەوە، بەڵام لەخەڵکەکە ترسان، ئیتر وازیان لێهێناو ڕۆیشتن.

**باج دان بە قەیسەر**

[13]ئینجا هەندێ لەفەریسیەکانو پیاوانی هیرۆدسیان ناردە لای عیسا، تاکو بەووشەیەکی خۆی تووشیبکەن. [14]هاتنو پێیان ووت: (مامۆستا ئێمە دەزانین تۆ ڕاستگۆیت، گوێش نادەیت بەکەس، چونکە پلەو پایەت بەخەیاڵدا نایەت، تەنها فێرکردنی ڕێگەی خودا نەبێت بەشێوەیەکی ڕاست. باشە ئایا سەرانە دان بەقەیسەر دروستە یان نا؟ سەرانە بدەین یان نەیدەین؟) [15]بەڵام عیسا بەدووڕوویی ئەوانی زانیو پێیووتن: (بۆچی تاقیم دەکەنەوە؟ ئا دینارێکم بدەنێ باتەماشای بکەم.) [16]ئەوانیش دینارێکیان پێیدا، ئینجا عیسا لێی پرسین: (باشە ئەم وێنەو نووسراوە هی کێیە؟) ووتیان: (هی قەیسەرە.) [17]پێیووتن: (کەواتە ئەوەی هی قەیسەرە بیدەن بە قەیسەر، ئەوەش هی خودایە بیدەن بەخودا.) ئەوان

بەم وەڵامە زۆر سەریان سوڕما.

**زیندووبوونەوەی مردووان**

[18]ئینجا هەندێ لەسەدوقیەکان کەباوەڕ بەزیندووبوونەوە ناکەن، لێیهاتنە پێشەوەو پرسیاریان لێکردو وتیان: [19](مامۆستا، موسا بۆی نووسیوین، گەر یەکێ براکەی مردو ژنەکەی بێ منداڵ بەجێما، پێویستە لەسەری براژنەکەی بهێنێتو وەچە بەناوی براکەیەوە دروست بکات. [20]حەوت برا هەبوون، یەکەمیان ژنی هێناو مرد بێ ئەوەی منداڵی هەبێ. [21]دووەم براژنەکەی خواست، ئەویش مرد بێئەوەی منداڵی لەپاش بەجێ بمێنێ، سێهەمیش هەمان شت. [22]ئا بەم شێوەیە هەر حەوت براکە مردن، بێئەوەی هیچ منداڵیان لەپاش بەجێ بمێنێ. لەپاشان ژنەکەش مرد. [23]باشە لەڕۆژی زیندووبونەوەدا، ژنەکە بۆ کامیان دەبێت؟ چونکە ژنی هەموویان بووە.)

[24]عیسا وەڵامی دانەوە ووتی: (ئایا ئێوە گومڕا نین، چونکە نە لەکتێب دەزانن نە لەهێزی خودا؟ [25]کاتێ خەڵکی زیندوودەبنەوە، نەژن دەهێننو نەشوو دەکەن، بەڵکو وەك فریشتەی ئاسمان دەبن. [26]بەڵام دەربارەی مردووان کە زیندوودەبنەوە، ئایا لەتەوراتدا نەتانخوێندۆتەوە چۆن خودا لەناو دەوەنەکەدا لەگەڵ موسا دواو پێیووت: (من خودای ئیبراهیمو خودای ئیسحاقو خودای یاقوبم؟) [27]ئەو خودای مردووان نییە، بەڵکو خودای زیندووانە، کەواتە ئێوە خراپ گومڕابوون!)

**گەورەترین ڕاسپاردە**

[28]یەکێ لەمامۆستایانی شەریعەت کە گوێی لەقسەکانیان بوو هەروەها بینی عیسا باش وەڵامیدانەوە، لێیپرسی: (چ ڕاسپاردەیەك یەکەمی هەموو ڕاسپاردەکانە؟) [29]عیسا وەڵامیدایەوە: (یەکەمی هەموو ڕاسپاردەکان ئەمەیە: {گوێ بگرە ئیسرائیل، خوداوەند خودای ئێمە یەك خوداوەندە، [30]جا دەبێ خوداوەند خودات خۆش بوێ بەهەموو دڵو هەموو گیانو هەموو بیرو هەموو تواناتەوە.} ئەمە ڕاسپاردەی یەکەمە. [31]دووەمیشیان وەك ئەم وایە، (ئەوەی لێت نزیکە وەك خۆت خۆشت بوێ، ئیتر هیچ

ڕاسپاردەیەك نییە مەزنتر لەم دوو ڕاسپاردەیە.) [32]ئینجا مامۆستاکەی شەریعەت پێیووت: (مامۆستا ئەمە ڕاستەو تۆ ڕاستت فەرموو. خودا هەریەکەو هیچ خودایێکی کە نییە تەنها ئەو نەبێ، [33]هەروەها خۆشەویستی ئەو بەهەموو دڵو بەهەموو تێگەیشتنو بەهەموو تواناوەیە، هەروەها خۆشەویستی ئەوەی لێت نزیکە وەك خۆت باشترە لەهەموو قوربانیەكو قوربانی سوتاندنێك.) [34]کاتێ عیسا بینی کابرا بەژیرانە دوا، پێیووت: (تۆ ئەوەندە دوور نیت لەپادشاهێتی خوداوە.) دوای ئەمە ئیتر کەس نەیوێرا هیچ پرسیارێکی کەی لێبکات.

**مەسیح و داود**

[35]لەکاتێکدا عیسا لەناو پەرستگاکە خەڵکی فێردەکرد، ووتی: (مامۆستایانی شەریعەت چۆن دەڵێن مەسیح* کوڕی داودە؟ [36]کاتێ داود خۆی بەهۆی ڕۆحی پیرۆزەوە دواو ووتی: {خوداوەند بەخوداوەندمی فەرموو: لەلای دەستی ڕاستمەوە دانیشە تادوژمنانت بخەمە ژێر پێتەوە.} [37]کە داود خۆی مەسیح بەخوداوەند بانگ بکات، ئیتر چۆن مەسیح دەبێت بەکوڕی؟) خەڵکەکە زۆر بەشادومانیەوە گوێیان بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو. [38]عیسا لەفێرکردنەکەیدا پێی ووتن: (ئاگاداری مامۆستایانی شەریعەتبن، ئەوانەی بەجلی پانو پۆڕو درێژەوە دەگەڕێنو حەز دەکەن لەگۆڕەپانە گشتیەکاندا سڵاویان لێبکرێ، [39]لەکەنیشتەکان ڕیزی پێشەوە دەگرن، ڕیزی یەکەمیش لەکاتی داوەتەکاندا. [40]هەروەها ماڵی بێوەژن دەخۆن، وەك خۆدەرخستن درێژە بەنوێژەکانیان دەدەن. ئەوانە سەختترین سزا وەردەگرن.)

**بەخشینی بێوەژن**

[41]عیسا بەرامبەر سەندوقی پەرستگاکە دانیشتو سەیری ئەوەی دەکرد چۆن خەڵکی پارەیان تێدەکرد، زۆر لەدەوڵەمەندەکان پارەی زۆریان خستە ناو سەندوقەکە. [42]ئینجا بێوەژنێکی هەژار هاتو دوو پولی خستە ناو سەندوقەکە، کە چارەك چارەکی دینارێکی نەدەکرد. [43]عیسا قوتابیەکانی بانگ کردو پێیووتن: (ڕاستیتان پێدەڵێم، ئەو

بێوەژنە هەژارە، لەهەموو خەڵکەکە زیاتر پارەی خستە ناو سەندوقەکە. [44]چونکە هەموو ئەوانیتر پارەیاندا لەوەی لەپێویستی خۆیان زیاتربوو، بەلاّم ئەوەی ژنەکە دای، لەپێویستی خۆیبوو، تەنها هەر ئەوەش گوزەرانی ئەو بوو.)

## نیشانەکانی کۆتایی زەمانە
## 13

لەکاتێکدا عیسا پەرستگاکەی بەجێ دەهێشت، یەکێ لەقوتابیەکانی پێیووت: (مامۆستا، سەیری ئەم بەردو خانووە سەر سوڕهێنەرانە بکە!) [2]عیساش پێیووت: (ئەم خانووە مەزنانە دەبینیت؟ بەردی بەسەر بەردیەوە نامێنێو هەمووی دەڕوخێت.) [3]کاتێ عیسا لەسەر چیای زەیتون بوو بەرامبەر پەرستگاکە، پەترۆسو یاقوبو یۆحەناو ئەندەراوس بەتەنها لێیان پرسی: [4](پێمان بڵێ کەی ئەم شتانە ڕوودەدات، پێش ئەوەی ئەمانە ببێت چ نیشانەیەك دیاری دەدات؟) [5]عیسا وەلاّمیدانەوەو ووتی: (ئاگاداربن، کەس هەڵتان نەخلەتێنێ. [6]زۆر هەن بەناوی منەوە دێنو دەڵێن، ئێمە ئەوین. بەمەش زۆر کەس هەڵ دەخەڵەتێنن. [7]کاتێ باسو هەواڵی جەنگ دەبیستن مەترسن، ئەمە دەبێ ڕووبدات، بەلاّم ئەمە جارێ کۆتایی نییە. [8]میللەتان دەچن بەگژ یەکتر داو وولاّت بەگژ وولاّتیکەدا، بوومەلەرزە لەزۆر شوێن ڕوودەدات، هەروەها برسێتیو نەبوونی، بەلاّم ئەمە جارێ پێچو ژانی یەکەمە. [9]ئاگاداری خۆتان بن، چونکە دەتانبەنە بەر دادگاو کەنیشتەکان، لێتان دەدەنو لەپێناوی من لەبەردەم حوکمڕانو پادشاکان ڕادەوەستێنرێن، تا شایەتی بۆ من بدەن لەبەردەمیان. [10]هەروەها یەکەمجار دەبێ مزگێنی بەهەموو میللەتان ڕابگەیەنرێ. [11]کاتێکیش دەتانبەن بۆئەوەی بتاندەن بەدەستەوە، نارەحەت مەبن بەوەی چی بڵێن، بەڵکو لەوێدا چیتان بۆ دەوترێ پێیبدوێن، چونکە ئێوەنین دەدوێن، بەڵکو ڕۆحی پیرۆزە دەدوێت. [12]برا، برا دەدا بەدەستەوە بۆ مردن، باوك كوڕ، منداڵان لەباوكو دایك هەڵدەگەڕێنەوەو دەیانكوژن. [13]هەموو خەڵكی ڕقیان لێتان دەبێتەوە لەپێناوی ناوی من، بەلاّم ئەوەی تاكۆتایی خۆی

ڕادەگرێ ئەوە ڕزگاری دەبێت.

### گەورەترین تەنگانە

[14]کاتێ پیسیو کاولبوون دەبینن لەو جێگایەی کە نابێ لێی بێ، ئەوەی پێغەمبەر دانیال باسی کردووە، (باخوێنەر تێبگات)، دوایی با ئەوانەی لەناوچەی یەهودیادان ڕاکەن بۆ شاخەکان، [15]ئەوەش لەسەربانە، بابۆ بردنی هیچ شتێك نەیەتە خوارەوەو نەچێتە ژوورەوە، [16]هەروەها ئەوەی لەکێڵگە بوو، با نەگەڕێتەوە تاکو جلەکانی لەگەڵ خۆی ببات. [17]خاك بەسەر سكپڕو شیردەر لەوڕۆژانەدا! [18]نوێژ بکەن با ئەمە لەزستاندا نەبێت. [19]چونکە تەنگانەیەك ڕوودەدات کە هێشتا لەدروستکردنی جیهانەوە، ئەوەی خودا دروستیکردووە، تا ئەمڕۆ شتیوا نەبووەو نابێت. [20]گەر بێتو خوداوەند ئەو ڕۆژانە کەم نەکاتەوە، هیچ مرۆڤێك ڕزگاری نابێت. بەڵام لە پێناوی ئەوانەی هەڵبژێرراون، ئەو ڕۆژانە کەم دەکرێنەوە. [21]گەر هاتوو ئەو کاتە یەکێك پێیووتن: ئەوەتا مەسیح لێرەیە! یا ئەوەتا لەوێیە! باوەڕ مەکەن. [22]چونکە چەند مەسیحێکی فێڵبازو پێغەمبەری درۆزن دەردەکەون، نیشانەی گەورەو شتی سەرسوڕهێنەر دەکەن، تاکو تەنانەت گەر بتوانن هەڵبژێراوانیش هەڵبخەڵەتێنن. [23]بەڵام ئاگاداربن، ئەوا من ئاگاداری ئەم هەموو شتانەم کردن، پێش ئەوەی ڕووبدات.

### هاتنەوەی عیسا

[24]بەڵام لەو ڕۆژانەدا، دوای ئەو تەنگانەیە، ڕۆژ تاریك دەبێتو تیشکی مانگ دەگیرێ، [25]ئەستێرەکان لەئاسمانەوە دەکەونو هێزی ئاسمان تێكدەچێت. [26]ئەوسا دەبینن ڕۆڵەی مرۆڤ لەناو هەورەوە بەتواناو شکۆیەکی مەزنەوە دێت. [27]ئینجا فریشتەکانی دەنێرێتو هەڵبژاردەی خۆی لەهەر چوار لاوە لەمسەرو ئەوسەری زەویو ئاسمانەوە کۆدەکاتەوە.

[28]ئەم شتە لەدار هەنجیرەوە فێربن: (کاتێ لقەکانی نەرم دەبێتو گەڵا دەکات، دەزانرێ هاوین نزیك بووەتەوە. [29]هەروەها ئێوەش، کاتێ دەبینن ئەمانە ڕوودەدات، بزانن ئەو نزیکەو لەبەر دەرگایە. [30]ڕاستیتان

پیّدەڵێم، ئەم نەوەیە بەسەر ناچێت هەتا ئەمانە هەموو ڕوونەدات. [31] ئاسمانو زەوی لەناودەچن، بەڵام ووتەکانم هەرگیز لەناوناچێت.

### کەس ئەوکاتە نازانێ

[32]ئەو ڕۆژەو ئەو کاتە کەس نایزانێت، نەفریشتەی ئاسمان نەڕۆڵە، تەنها باوك نەبێت. [33]کەواتە ئاگاداربنو ئێشك بگرن چونکە نازانن کەی ئەو کاتە دێت. [34]ئەمە لەوە دەکات کابرایەك بچێ بۆ گەشت، ماڵەکەی بەجێبهێڵێ، بیداتە دەست چەند ئیشکەرێكو هەر یەکە ئیشێکیان بداتێ، دەرگاوانیش ڕاسپێرێ ئێشك بگرێ. [35]ئیتر ئێشك بگرن، چونکە نازانن گەورەی ماڵ کەی دەگەڕێتەوە، ئێوارە یاخود نیوەی شەو، یا لەگەڵ خوێندنی کەڵەشێر، یا بەیانی. [36]نەوەك لەناکاو بگەڕێتەوەو بتانبینێت لەخەودان. [37] جا ئەوەی بەئێوەی دەڵێم، دەیڵێم بە هەمووان: ئێشك بگرن!)

### پلانێك بۆ کوشتنی عیسا

## 14

جەژنی تێپەڕبوونو فەتیرە دوو ڕۆژی مابوو، سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت بەدوای فێڵێك دەگەڕان تا عیسای پێ بگرنو بیکوژن. [2]بەڵام ووتیان: (بائەمە لەجەژنا نەبێت، نەوەك لەناو خەڵکەکەدا ئاژاوە ڕووبدات.)

### ئامادەکردنی عیسا بۆ ناشتن

[3]کاتێ عیسا لەشاری بەیتعەنیا بوو، لەماڵی شەمعونە گول لەسەر خوان دانیشتبوو، ژنێك هات شوشەیەك بۆنی ناردینی سافی گرانبەهای بەدەستەوەبوو، شوشەکەی شکاندو بۆنەکەی کرد بەسەر عیسا. [4]بەڵام هەندێك لەوانەی لەوێبوون زویربوونو لەدڵی خۆیان ووتیان: (ئەم بۆنە بۆ بەو شێوەیە خەسارکرا؟ [5]دەتوانرا بۆنەکە بەزیاتر لەسێسەد دینار بفرۆشرایەو پارەکەی بدرایە بەهەژاران.) جا دەستیانکرد بەسەرزەنشت کردنی ژنەکە. [6]بەڵام عیسا ووتی: (وازی لێبهێنن. بۆ بێزاری دەکەن؟ ئەو کارێکی چاکی بەرامبەر کردم. [7]چونکە هەژاران هەموو کاتێ لاتان هەن، هەر کاتێکیش ویستتان دەتوانن چاکەیان

بەرامبەر بکەن، بەلاّم من هەموو کاتێك لاتان نیم. [8]ئەو ئەوەی لەدەستی هات کردی، دەستپێشخەری خۆی کرد لەبۆن لێدانی لەشمو ئامادە کردنی بۆ ناشتن. [9]ڕاستیتان پێ دەڵێم: لەهەر شوێنێك لەم جیهانەدا بانگەوازی ئەم مزگێنییە بلاّوبکرێتەوە، یادی ئەمە دەکرێ کە ئەم ژنە کردی.)

## ناپاکی یەهوزا

[10]ئینجا یەهوزای ئەسخەریوتی کەیەکێبوو لەدوانزە قوتابیەکە، ڕۆیشت بۆ لای سەرۆك کاهینەکان تاکو عیسا بدات بەدەستەوە. [11]کاتێ گوێیان لەمە بوو، زۆر پێخۆشحاڵ بوونو بەڵێنی ئەوەیان پێدا پارەی بدەنێ، بەم شێوە ئەو دەگەڕا بۆ هەلێك تا عیسا بدات بەدەستەوە.

## نانی جەژنی تێپەڕبوون

[12]لەیەکەم ڕۆژی جەژنی فەتیرە، ئەوەی قوربانی تێپەڕبوونی تێدادەکرێ، قوتابیەکان لەعیسایان پرسی: (دەتەوێ بۆ کوێ بڕۆین نانی جەژنت بۆ ئامادەکەین تا بیخۆیت؟) [13]ئەویش دووان لەقوتابیەکانی نارد، پێیووتن: (بڕۆن بۆ ناو شار، لەوێ پیاوێکتان پێدەگات گۆزەیەك ئاوی هەڵگرتووە، دوای بکەون. [14]کاتێ چووە ژوورەوە، ئێوە بەخاوەن ماڵ بڵێن: مامۆستا دەڵێت: کوا دیوەخانەکەم کە لەگەڵ قوتابیەکانم نانی جەژنی تێپەڕبوونی تیا دەخۆم؟) [15]ئینجا ئەویش ژوورێکی گەورەتان پیشاندەدات لەنهۆمی دووەمی ماڵەکە، ڕاخراوەو ئامادەکراوە، ئالەوێدا بۆمانی ئامادە بکەن.) [16]ئیتر دوو قوتابیەکە ڕۆیشتنو ژوورەکەیان بەم شێوەیە بینی کە عیسا پێی ووتبوون، جا لەوێدا نانی تێپەڕبوونیان ئامادەکرد. [17]کە ئێوارە داهات، عیسا لەگەڵ دوانزە قوتابیەکەی هات. [18]کاتێ لەسەر خوان دانیشتبوون نانیان دەخوارد، عیسا بەقوتابیەکانی ووت: (ڕاستیتان پێدەڵێم، یەکێ لەئێوە کەئێستا لەگەڵم نان دەخوات، دەمدات بەدەستەوە. [19]قوتابیەکان غەم دایگرتن، یەك لەدوای یەك دەستیانکرد بەپرسیار لێی: (ئایا منم؟) [20]ئەو وەلاّمیدانەوەو ووتی: (ئەو یەکێکە لەم دوانزەیە، ئەوەی لەگەڵم دەستی بەنانەوە

لەقاپەکەدایە. [21]چونکە ڕۆڵەی مرۆڤ، دەبێت بەو شێوەیە بڕوات کە لەکتێبی پیرۆزدا لەسەری نووسراوە، بەڵام خاكبەسەر ئەوەی ڕۆڵەی مرۆڤ دەدات بەدەستەوە، باشتر بوو ئەو کەسە هەر لەدایك نەبووایە.)[22]هەر لەوکاتەی نانیان دەخوارد، عیسا نانێکی هەڵگرت، پیرۆزی کرد، لەتی کردو دای پێیان، ووتی: (وەگرن، ئەمە لەشمە.) [23]ئینجا جامێکی هەڵگرتو سوپاسی خودای کردو پێیانی‌دا، هەموو لێیان‌خواردەوە. [24]پێی‌ووتن: (ئەمە خوێنی منە، خوێنی پەیمانی نوێیە، ئەوەی دەڕژێ لەپێناوی زۆر کەس. [25]ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: ئیتر لەبەری مێو ناخۆمەوە تا ئەو ڕۆژەی لەپادشاهێتی خودا جارێکی‌کە بە نوێی لەوبەرە دەخۆمەوە.) [26]ئینجا بەگۆرانی ستایشی خودایان‌کردو بۆ شاخی زەیتون ڕۆیشتن.

**نکۆڵی‌کردنی پەترۆس**

[27]عیسا پێی‌ووتن: (هەمووتان دەکەونە گومانەوە، چونکە نووسراوە: {لەشوان دەدەم، ئیتر مەڕەکان بلاّودەبنەوە}. [28]بەلاّم دوای هەستانەوەم، پێشتان دەکەوم بۆ جەلیل.) [29]پەترۆس پێی‌ووت: (گەر هەموو گومان بکەن، من گومان ناکەم.) [30]عیساش پێی‌ووت: (ڕاستت پێ‌دەڵێم: تۆ ئەمڕۆ هەر ئەمشەو، پێش ئەوەی کەڵەشێر دووجار بخوێنێ، سێ‌جار نکۆڵیم لێدەکەی.) [31]بەلاّم پەترۆس بەپشت ئەستوریەوە ووتیەوە: (گەر بشمرم لەگەڵت نکۆڵیت لیّ‌ناکەم.) هەروەها قوتابیەکانی‌کەش هەموو وایان ووت.

**نوێژی عیسا لەباخی جەسیمانی**

[32]ئینجا چوون بۆ شوێنێك پێی‌دەوترا جەسیمانی، بەقوتابیەکانی ووت: (ئا لێرەبن تا نوێژ دەکەم.) [33]ئەوسا پەترۆس‌و یاقوب‌و یۆحەنای لەگەڵ خۆی‌بردو لەوێدا هەستی بەدڵگرانی‌و دڵتەنگی کرد. [34]پێی‌ووتن: (زۆر دڵگرانم تامردن، بمێننەوە لێرەو ئێشك بگرن.) [35]ئینجا کەمێك لێیان دوورکەوتەوە، چۆکی‌داداو دەستی‌کرد بەنوێژکردن‌و داوای ئەوەی کرد کاتەکەی بەسەر تیّ‌پەڕێت، گەر دەبێت. [36]ووتی: (ئەی باوك، تۆ دەتوانی هەموو شتێك

بکەی، ئەم جامەم لەسەر لابەرە، بەڵام با وانەبێت وەك ئەوەی من دەمەوێت، بەڵکو بەو شێوەیە بێت کەخۆت دەتەوێت.) [37]دوای ئەمە گەڕایەوە بینی قوتابیەکانی نووستون، بەپەترۆسی ووت: (ئەی شەمعون نووستویت؟ نەتتوانی کاژێرێك ئێشك بگری؟ [38]نوێژ بکەن‌و ئێشك بگرن، نەوەك تاقی بکرێنەوە. ڕۆح چالاکە بەڵام لەش لاوازە.) [39]دیسان ڕۆیشتەوە جارێکی‌تر نوێژی‌کردو هەمان ووتەی دووبارەکردەوە. [40]کاتێ گەڕایەوە، سەیری‌کرد دیسان نووستوون، چونکە خەو چاوی قورس‌کردبوون، نەیانزانی بەچی وەڵامی بدەنەوە. [41]کاتێ بۆ سێهەم جار گەڕایەوە بۆلایان پێی‌ووتن: (تائێستا نووستون‌و پشوودەدەن؟ ئیتر بەسە! کاتەکە هاتووە، ئەوا ڕۆڵەی مرۆڤ دەدرێتە دەست گوناهباران. [42]هەستن با بڕۆین، ئەوا نزیك بووەوە ئەوەی دەمدات بەدەستەوە.)

**گرتنی عیسا**

[43]هەر لەو کاتەدا عیسا قسەی دەکرد، یەهوزا کە یەکێك بوو لەدوانزە قوتابیەکە، لەگەڵ کەسانێکی زۆر کە شمشێرو داریان هەڵگرتبوو گەیشتنە ئەوێ، ئەمانەش لەلایەن سەرۆك کاهینەکان‌و مامۆستایانی شەریعەت‌و پیرانەوە نێررابوون. [44]ئەوەی عیسای دابەدەستەوە، نیشانەیەکی دانێ، ووتی: (ئەوەی ماچی دەکەم، خۆیەتی، بیگرن‌و بیبەن.) [45]هەر کە یەهوزا گەیشتە ئەوێ، لەعیسا هاتەپێشەوەو ووتی: (مامۆستا!) ئینجا بەگەرمی‌یەوە ماچی‌کرد. [46]ئیتر دەستبەجێ دەستیان لەسەرداناو گرتیان. [47]بەڵام یەکێ لەوانەی لەوێدا لەگەڵ عیسا ڕاوەستابوون، شمشێرەکەی دەرهێناو کێشای بەیەکێ لەکۆیلەکانی سەرۆك کاهین‌و گوێی بڕی. [48]عیساش پێی‌ووتن: (وەك ئەوەی بۆ دەستگیرکردنی یاخی‌بوویەك بەدارو شمشێرەوە هاتوون؟ [49]هەموو ڕۆژێ لەپەرستگا لەناوتان بووم خەڵکم فێر دەکرد نەتان‌گرتم، بەڵام باکتێب بێتەدی.) [50]دوای ئەمە هەموو ڕایان کردو بەجێیان هێشت. [51]کوڕێکی گەنج نەبێ کەهیچی لەبەر نەبوو جگە لەپارچەیەك خامی تەنك کە خۆی پێ‌داپۆشی بوو، کوڕە دوای عیسا کەوت، ئەویشیان گرت. [52]

بەڵام ئەو جلەکەی بەجێ هێشتو بەڕووتی لەدەستیان ڕای کرد.

**دادگاییکردنی عیسا**

[53]ئینجا عیسایان بردە لای سەرۆک کاهین، پیرانو مامۆستایانی شەریعەتو سەرۆک کاهینەکانی تریش هەموو کۆبوونەوە. [54]پەترۆس دوور بەدوور دوای عیسا کەوت هەتا ماڵی سەرۆک کاهین، لەگەڵ ئێشکگرەکان دانیشت لەبەردەم ئاگر خۆی گەرم دەکردەوە. [55] سەرۆک کاهینەکانو هەموو ئەنجومەن دەستیان کرد بەگەڕان بەدوای شایەتییەك تا سزای کوشتن بەسەر عیسادا بدەن، بەڵام هیچی وایان نەدۆزیەوە. [56]کەسانێکی زۆر بەدرۆ شایەتییان دژی ئەودا، بەڵام قسەکانیان بەپێچەوانەی یەکترەوە بوو. [57]ئینجا هەندێکیان بەدرۆ شایەتییان لەسەرداو ووتیان: [58] (گوێمان لێبوو دەیووت: ئەم پەرستگایەی دەست دروستیکردووە من دەیڕوخێنم، دوایی لەماوەی سێ ڕۆژدا پەرستگایەك دروستدەکەم کە بەدەست دروست نەکرابێت.) [59] بەڵام لەمەش دیسان قسەکانیان بەپێچەوانەی یەکترەوە بوو. [60]ئینجا سەرۆک کاهین لەناوەڕاستی ئەنجومەنەکەدا ڕاوەستاو لەعیسای پرسی: (هیچ ناڵێیت دەربارەی ئەو شایەتییانەی دژت دەدرێ؟) [61]بەڵام عیسا بەبێدەنگی مایەوەو هیچ وەڵامی نەدایەوە. دیسانەوە سەرۆك کاهین لێیپرسی، ووتی: (ئایا تۆ مەسیحی، ڕۆڵەی خودای پیرۆز؟) [62] عیسا ووتی: (من ئەوم. لەدواییشدا دەبینن چۆن ڕۆڵەی مرۆڤ دادەنیشێت لەلای ڕاستی خودای بە توانـاوە، ئینجا لەسەر هەورەکانی ئاسمان دێتەوە.) [63]سەرۆک کاهین جلەکانی خۆی دادڕیو ووتی: (ئیتر پێویستمان بەشایەتی نییە. [64]خۆ گوێتان لەکفرەکەی بوو، بڕیاری ئێوە چییە؟) هەموو بڕیاریاندا کە عیسا شایانی کوشتنە. [65]هەندێکیان دەستیان کرد بەتف لێکردنیو هەندێکی کەشیان دەمو چاویان داپۆشیو پیایان دەکێشاو پێیان دەووت: (هەڵیبهێنە کێیە؟) دوای ئەمە پاسەوانەکانیش بە زللە پێیان کێشا.

### نکۆڵی پەترۆس لە عیسا

[66]لەکاتێکدا پەترۆس لەخوارەوە لەحەوشەی ماڵەکە دانیشتبوو، یەکێ لەو ئافرەتانەی لەلای سەرۆك کاهین کاری دەکرد هاتە ئەوێ. [67]کاتێ پەترۆسی بینی خۆی گەرم دەکاتەوە، سەیری کردو پێیووت: (تۆش لەگەڵ عیسای ناسیری بوویت.) [68]بەڵام پەترۆس نکۆڵی لێکردو ووتی: (نازانم، تێناگەم دەڵێی چی.) ئینجا چووە دەرەوە بۆ لای دەرگاکە. ﴿لەوکاتەدا کەڵەشێری بەیانی خوێندی.﴾ [69]لێرە ئافرەتێکی کە لەوانەی لەوێ کاریان دەکرد بینی، ووتی بەوانەی لەوێدا ڕاوەستابوون (ئەمەش یەکێکە لەوان.) [70]پەترۆس دیسان نکۆڵی لێکرد. پاش ماوەیەك ئەوانەی لەوێدا ڕاوەستابوون، دیسانەوە پێیان ووت: (ڕاستە تۆ یەکێکی لەوان، چونکە تۆش جەلیلیت.) [71]بەڵام پەترۆس دەستی کرد بەقسە بەخۆ ووتن‌و سوێند خواردن‌و ووتی: (ئەم کابرایەی باسیدەکەن، من نایناسم.) [72]لەوکاتەدا کەڵەشێری بەیانی جارێکی کەش خوێندی، ئەوسا پەترۆس بیری کەوتەوە ئەوەی عیسا پێیووت: (پێش ئەوەی کەڵەشێری بەیانی دوو جار بخوێنێ، سێجار نکۆڵیم لێدەکەی.) ئینجا خۆی پێنەگیراو دەستی کرد بەگریان.

### عیسا دەدرێتە دەست پیلاتۆس

## 15

کاتێ ڕۆژ بووەوە، سەرۆك کاهینەکان‌و پیران‌و مامۆستایانی شەریعەت‌و هەموو ئەنجوومەن بەیەکەوە کۆبوونەوە. ئینجا عیسایان بەدەستی بەستراوەوە بردو دایانە دەستی پیلاتۆس. [2]پیلاتۆس لێیپرسی: (تۆی پادشای جوولەکە؟) عیسا وەڵامی دایەوە: (تۆ ووتت.) [3]لێرە سەرۆك کاهینەکان تاوانی زۆریان خستەپاڵی. [4]پیلاتۆس دووبارە لێیپرسی: (چییە، هیچ وەڵام نادەیتەوە؟ بزانە چیت پێدەڵێن!) [5]بەڵام عیسا هیچ وەڵامی نەدایەوە، پیلاتۆس بەمە سەرسام بوو.

### بڕیاری لەخاچ دانی عیسا

[6]پیلاتۆس لەهەموو جەژنێك یەکێك لەو بەندانەی ئازاد دەکرد کەگەڵ داوای دەکرد. [7]یەکێك کە ناوی باراباس بوو، لەو کاتەدا

لەبەندیخانەی پیلاتۆس بەندبوو لەگەڵ هاوڕێکانی کە گێرەشێوێن‌و پیاوکوژ بوون. [8]ئینجا خەڵکەکە هەموو داوایان لەپیلاتۆس کرد ئەوەی هەموو کاتێك بۆیانی دەکات، جێبەجێ بکات. [9]پیلاتۆسیش قسەی لەگەڵ کردن‌و لێی‌پرسین: (دەتانەوێ پادشای جوولەکەتان بۆ ئازادکەم؟) [10]چونکە دەیزانی سەرۆك کاهینەکان لەرِقا ئەمیان داوە بەدەستەوە. [11]بەڵام سەرۆك کاهینەکان خەڵکەکەیان هاندا تاکو داوای ئازادکردنی باراباس بکەن. [12]پیلاتۆس دیسان لێی‌پرسین: (ئەی باشە چی‌بکەم لەوەی کە بەپادشای جوولەکە ناوی دەبەن؟) [13]یەك لەدوای یەك هاواریان‌کرد: (لەخاچی بدە!) [14]پیلاتۆس لێی‌پرسین: (باشە چ خراپەیەکی کردووە؟) کەچی ئەوان زیاتر هاواریان‌کرد: (لەخاچی بدە!) [15]جا چونکە پیلاتۆس دەیویست خەڵکەکە رِازی بکات، هەستا باراباسی بۆ ئازادکردن، دوای ئەمە عیسا درایە بەر قامچی‌و نێررا بۆ لەخاچدان.

### سەربازەکان گاڵتە بەعیسا دەکەن

[16]سەربازەکان بردیانە ناو خانوویەك کە هی ئیمپراتۆریەت بوو، لەوێ هەموو لەشکرەکەیان بانگ‌کردو لێی‌کۆبوونەوە. [17]کراسێکی ئەرخەوانی گرانبەهایان لەبەرکرد، لەسەر سەری تۆقێکیان دانا لەدرِك دروستکرابوو. [18]دەستیان‌کرد بەسڵاو لێ‌کردنی‌و دەیانووت: (سڵاوت لێ‌بێت ئەی پادشای جوولەکە!) [19]ئینجا بەقامیش کێشایان بەسەری‌و خۆیان بۆ چەماندەوەو چۆکیان بۆداداو تفیان لێ‌کرد. [20]دوای ئەوەی بەباشی گاڵتەیان پێ‌کرد، کراسە ئەرخەوانییەکەیان لەبەرداکەندو جلەکانی خۆییان لەبەرکردەوەو بردیانە دەرەوە بۆ لەخاچدان.

### مردنی عیساو لەخاچدانی

[21]کابرایەك کە لەوێوە دەرِۆیشت، بانگیان‌کردو ناچاریان‌کرد تاکو خاچەکەیان بۆ هەڵگرێت. ئەو کابرایەش ناوی شەمعونی قەیرەوانی بوو، باوکی ئەسکەندەرو رِوفوس، تازە لەکێڵگە دەهاتەوە. [22]ئینجا عیسایان برد بۆ

شوێنێك پێی دەوترا گولگۆسە واتە (کاسەسەر). [23]ئینجا مەییان داپێی تێکەڵکرابوو لەگەڵ تاڵاو، بەڵام نەیخواردەوە. [24]دوای ئەوەی لەخاچیاندا کراسەکەیان دابەش کرد، شێروخەتیان لەسەرکرد بۆئەوەی بزانن هەریەکەیان چی بەردەکەوێت. [25]ئەو کاتەی لەخاچیاندا کاژێری نۆی بەیانی بوو، [26]تاوانەکەشی بەسەر سەریەوە نووسرابوو: پادشای جولەکە. [27]لەگەڵ دوو دز لەخاچیاندا، یەکێ لەدەستی ڕاستیەوە، ئەوی کەش لەدەستی چەپیەوە. [28]﴿بەمە نووسراوی کتێب هاتەدی کەدەڵێت: لەریزی تاوانباران دانرا.﴾ [29]ئەوانەی بەوێدا تێدەپەڕین، قسەیان پێدەووت و گاڵتەیان پێدەکرد، سەریان بادەداو دەیانووت: (ها! ئەی ڕوخێنەری پەرستگاو دروستکەرەوەی بەسێ ڕۆژ، [30]لەسەر خاچەکە وەرە خوارەوەو خۆت ڕزگار بکە.) [31]بەهەمان شێوە سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت گاڵتەیان پێدەکردو بەیەکتریان دەووت: (بزانە خەڵکی کەی ڕزگارکرد، بەڵام ناتوانێ خۆی ڕزگار بکات. [32]با ئێستا مەسیحی پادشای ئیسرائیل لەسەر ئەو خاچە دابەزێت، تا هەموو ببینینو باوەڕبهێنین.) تەنانەت دزەکانیش کە لەگەڵی لەخاچدەدران گاڵتەیان پێدەکرد.

[33]کاتێ بوو بەدوانزەی نیوەڕۆ، تاریکی باڵی کێشا بەسەر زەویداو زەوی هەموو تاریك‌بوو، تا کاژێری سێی پاش نیوەڕۆ. [34]لەکاژێری سێی پاش نیوەڕۆدا عیسا بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد: (ئیلۆی، ئیلۆی، لەما شەبەقتەنی؟) بەواتای (خودای من، خودای من، بۆ وازت لێهێنام؟) [35]هەندێ کەس کە لەوێ ڕاوەستابوون، کاتێ گوێیان لەمە بوو ووتیان: (ئەوە بانگی ئەلیاس پێغەمبەر دەکات.) [36]یەکێ خێرا ڕای‌کردو ئەسفنجێکی لەسرکە هەڵکێشاو کردی بەسەر قامیشێکەوەو دای‌پێی، تاکو لێی بخواتەوەو ووتی: (بابزانین ئەلیاس دێت دای‌بگرێت!)

[37]ئینجا عیسا بەدەنگێکی بەرز هاواری کردو ڕۆحی دابەدەستەوە. [38]پەردەی پەرستگاش لەسەرەوە تاخوارەوە دڕاو بوو بەدوو بەشەوە. [39]کاتێ ئەو سەرپەلەی بەرامبەری ڕاوەستابوو، بینی عیسا چۆن ڕۆحی

سپارد، ووتی: (بەڕاستی ئەم مرۆڤە ڕۆڵەی خودا بوو!) 40 ژنێکی زۆر لەدوورەوە تەماشای ڕووداوەکەیان دەکرد، لەنێوانیاندا مریەمی مەجدەلیو مریەمی دایکی یاقوبی بچووکو یوسفو سالومەیان لەگەڵ بوو، 41 ئەمانیش ئەوانە بوون کەبەدوای عیسادا دەڕۆیشتنو خزمەتیان دەکرد کاتێ لەجەلیل بوو، هەروەها زۆر ژنی تریش لەگەڵی هاتبوون بۆ قودس.

### ناشتنی عیسا

42 کاتێ ئێوارە داهات، ئەو ڕۆژە ڕۆژی خۆئامادەکردن بوو، مانای ڕۆژێك پێش ڕۆژی شەممە، 43 یوسف کەخەڵکی شاری ڕامە بوو، ئەندامێکی بەرزی ئەنجوومەنی باڵای جوولەکەبوو، ئەویش لەوانەبوو کە چاوەڕێی پادشاهێتی خودایان دەکرد، هاتو بێترس چووە لای پیلاتۆسو داوای تەرمەکەی عیسای کرد. 44 پیلاتۆس سەری سوڕما لەوەی کە عیسا مردووە، سەرپەلەکەی بانگ کردو لێیپرسی: (ئایا دەمێکە مردووە؟) 45 کاتێ سەرپەلەکە باسەکەی بۆ گێڕایەوە، فەرمانیدا تەرمەکەی عیسا بدەن بەیوسف. 46 ئینجا یوسف کەتانی کڕی، لاشەکەی داگرتو بەکەتان کفنی کردو لەگۆڕێکدا ناشتی کە لەبەرد هەڵکەنرا بوو. دوایی بەردێکی گلۆر کردەوە بەر دەرگای گۆڕەکە. 47 مریەمی مەجدەلیو مریەمەکەیتر کە دایکی یوسف بوو، سەیریان دەکرد بۆ ئەوەی بزانن لەکوێ دەنێژرێ.

### زیندووبوونەوەی عیسا

## 16

کە ڕۆژی شەممە بەسەرچوو، مریەمی مەجدەلیو مریەمی دایکی یاقوبو سالومە، بۆنو ڕۆنیان کڕی بۆ چەورکردنی تەرمەکەی عیسا. 2 ڕۆژی یەکەمی هەفتە بوو، ئەوان بەیانی لەگەڵ ڕۆژهەڵات بۆ سەر گۆڕەکە هاتن. 3 بەیەکتریان دەووت: (باشە کێ بەردی دەرگای گۆڕەکەمان بۆ لادەدات؟) 4 بەڵام کە سەیریان کرد، بینییان بەردی سەر دەرگای گۆڕەکە لاچووە، لەگەڵ ئەوەی زۆر گەورەش بوو. 5 کاتێ چوونە ناو گۆڕەکە، کوڕێکی گەنجیان بینی بەکراسێکی سپییەوە لەلای ڕاستەوە دانیشتووە، ئەوانیش

تاسان. [6]پێی‌ووتن: (مەترسن، ئێوە بەشوێن عیسای ناسری‌دا دەگەڕێن، ئەوەی لەخاچدرا. ئەو زیندووبووەوە! لێرە نییە. ئا ئەوەتا ئەو شوێنەی تیایدا دانرابوو. [7]بەڵام ئێوە بڕۆن‌و هەواڵ بەقوتابیەکانی‌و بەپەترۆس بدەن، ئەو پێشتان دەکەوێت بۆ جەلیل، ئینجا وەك پێی‌ووتن لەوێ دەیبینن.) [8]ئەوانیش بەڕاکردن لەگۆڕەکە هاتنە دەرەوە. ترس‌و سەرسامیەکی زۆر دایگرتبوون، هیچیان بەکەس نەووت لەبەرئەوەی دەترسان.

﴿[9]عیسا دوای هەستانەوەی لەیەکەم ڕۆژی هەفتەدا، یەکەمجار بۆ مریەمی مەجدەلی دەرکەوت ئەوەی عیسا حەوت ڕوحی پیسی لێ دەرکردبوو. [10]ئەویش ڕۆیشت‌و مژدەی‌دا بەوانەی لەگەڵ عیسادا بوون، ئەوانەی خەریکی شیوەن‌و گریان بوون. [11]کاتێ بیستیان عیسا زیندووەو مریەم خۆی بینیویەتی، باوەڕیان نەکرد. [12]دوای ئەمە عیسا بەشێوەیەکی تر بۆ دووان لەمان دەرکەوت، لەکاتێکدا بەڕێوەبوون بەرەو یەکێ لە لادێکان. [13]ئینجا ڕۆیشتن‌و مژدەیاندا بەوانی‌کە، بەڵام دیسان باوەڕیان بەمانیش نەکرد. [14]ئینجا لەدواییدا، عیسا بۆ هەر یانزە قوتابیەکەی دەرکەوت، لەکاتێك لەسەر خوان بوون، ئاگاداری‌کردنەوە لەبەر کەم باوەڕی‌و دڵڕەقیان. چونکە باوەڕیان نەکرد بەوانەی ئەویان بینی‌بوو دوای هەستانەوەکەی. [15]ئەوسا پێی‌ووتن: (بڕۆن بۆ هەموو لایەکی جیهان، ئەم مزگێنیە بەهەموو خەڵکی ڕابگەیەنن: [16]ئەوەی باوەڕی هێناو لەئاوهەڵکێشرا ئەوا ڕزگاری بووە، ئەوەش کە باوەڕ ناهێنێ ئەوا تاوانبار دەکرێت. [17]ئەوانەی باوەڕ دەهێنن ئەم نیشانانە لەگەڵیان دەبێ، بەناوی من ڕوحی پیس دەردەکەن، هەروەها بەزمانی ڕۆحی تازە دەدوێن، [18]دەتوانن مار بگرن، گەر خواردنەوەیەکی کوشندەش بخۆن هیچ تووشی ئازار نابن، دەست دادەنێن لەسەر نەخۆش‌و چاکی دەکەنەوە.)

[19]دوای ئەوەی عیسای خوداوەند ئەمانەی پێ‌ووتن، بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان‌و لەلای دەستە ڕاستی خوداوە دانیشت. [20]ئەوانیش ڕۆیشتن، مزگێنیان

لەهـــەموو لایـــەك بڵاوكـــردەوە، خـــوداوەندیـــش لـەگەڵیان كـاری دەكـردو پشـتگیری ووشـەكـانی خـــۆی دەكـــرد بەنیشـــانەكـانی. ئامین.

# مزگێنی بە پێی نووسینی لۆقا

*لۆقا پزیشك‌و مێژوونووسێكی یۆنانی بوو، یاوەرو یارمەتیدەری پۆڵسی نێرراو بوو، هەروەها لۆقا نووسەری پەرتووكی كرداری نێرراوانە، كە تەواوكەری ئەم پەرتووكەیە.*

*لەم پەرتووكەدا لۆقا لێكۆڵینەوەیەكی كردووەو بەدوای سەرچاوەی ڕاستدا گەڕاوە بۆ زانیاریەكانی سەبارەت بەژیانی عیسا لەسەر زەوی، بۆ ئەوەی خوێنەر ڕاستی زانیاریەكانی لەبەر دەست بێ (4-1:1). ئەم پەرتووكەش بەشی یەكەمی لێكۆڵینەوەكەیەتی، مەسیح لەم پەرتووكەدا مرۆڤێكە ڕزگاركەری هەموو جیهانە. لۆقا باسی هەندێ ڕووداو و نموونە دەكات تیایدا دەری دەخات كەمەسیح مرۆڤێكی تەواو و بێ‌كەم‌وكوڕییە، هەروەها پزیشكی نەخۆشیەكانە بەدوای لەناوچووەكاندا دەگەڕێ تا ڕزگاریان بكات.*

*ئەم پەرتووكە لەسەرەتادا بەلەدایك بوون‌و كاتی منداڵی مەسیح دەست‌پێ دەكات، ئینجا هەموو خزمەتەكانی. پاشان لە(9:51)ەوە باسی ئەوە دەكات چۆن مەسیح چاوی دەخاتە سەر قودس‌و مردنی لەوێ، دواتر بەباسی ئازارو مردن‌و هەستانەوەی نێو مردووان‌و بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان كۆتایی دێت. ئەوەی جێی سەرنجیشە ئەوەیە كە لۆقا زۆر گرنگی بەفێركردنەكانی مەسیح دەدات كە بەنموونەوە بوون.*

### چۆن ئەم مزگێنییە نووسرا

# 1

ئەی پایەبەرز ساوفیلۆس*، كاتێ زۆر كەس هەستان بەنووسینی ئەو ڕووداوانەی لای ئێمە ڕوویدابوو، [2]بەپێی ئەوەی بەدەستمان گەیشتبوو، لەوانەی لەسەرەتاوە بینەری ڕووداوەكان‌و خزمەتكاری ووشەكە بوون. [3]دوای ئەوەی هەموو شتێكم بە ووردی لەسەرەتای باسەكەوە پشكنی، وام بەباش زانی بەرێك‌وپێكی‌و یەك لەدوای یەك بۆتی بنووسم، [4]تاكو ڕاستی ئەو شتانە بزانی كە ڕاگەیەندراوە.

**مزگێنی لەدایكبوونی یەحیا**

[5]لەسەردەمی هێرۆدسی پادشای ناوچەی یەهودیا، کاهینێك* هەبوو ناوی زەکەریا* بوو لەکۆمەڵەی ئەبیا، ژنەکەشی ناوی ئەلیسابات بوو لەنەوەی هارون*، [6]هەردووکیان مرۆڤی چاك بوون لەبەرچاوی خودا، پەیڕەوی ڕاسپاردەکانو فێرکردنەکانی خوداوەندیان دەکرد بەبێ کەموکوڕی. [7]منداڵیان نەبوو، چونکە ئەلیسابات نەزۆك بوو، هەردووکیشیان زۆر بەساڵدا چووبوون.

[8]لەکاتێکدا زەکەریا لەنۆرەی کۆمەڵەکەی خۆیدا کاروباری کاهینایەتی جێبەجێ دەکرد. [9]بەپێی نەریتی ئەوسای کاهینایەتی نۆرەی هات بچێتە ناو پەرستگای خوداوەند*و بخورد بسووتێنێ. [10]لەکاتی سووتانی بخوردەکەدا، خەڵکی هەموو لەدەرەوە نوێژیان دەکرد. [11]لەلای ڕاستی قوربانگەی* بخوردەکەوە فریشتەیەکی خوداوەند دەرکەوت. [12]کاتێ زەکەریا ئەمەی بینی، تێك چوو، ترسی لێنیشت. [13]بەلام فریشتەکە پێی ووت: (ئەی زەکەریا مەترسە، چونکە نوێژەکەت بیسترا، هەروەها ژنەکەت ئەلیسابات لە تۆ کوڕێکی دەبێتو ناوی دەنێیت یەحیا. [14]پێی شادومان دەبیتو زۆر کەس بە لەدایك بوونی دڵخۆش دەبن. [15]چونکە لای خوداوەند مەزن دەبێت. شەرابو مەی ناخواتەوە، هەر لەسکی دایکیەوە پڕ دەبێت لەڕۆحی پیرۆز. [16]هەروەها زۆر لەڕۆڵەکانی ئیسرائیل بۆ لای خوداوەندی خۆیان دەگەڕێنێتەوە. [17]بەڕۆحو توانای ئەلیاسەوە پێش خوداوەند دەکەوێت، تا باوکان لەگەڵ منالآندا ئاشتبکاتەوەو یاخیبووان بگەڕێنێتەوە بۆ دانایی ڕاستودروستان، ئینجا گەل بۆ خوداوەند ئامادەبکات.) [18]زەکەریاش بەفریشتەکەی ووت: (بەچی ئەمە بزانم، چونکە من پیاوێکی بەتەمەنمو ژنەکەشم بەساڵدا چووە؟) [19]فریشتەکە وەلآمیدایەوە: (من ئەو جبرائیلەم لەبارەگای خودا ڕادەوەستم، نێرراوم بۆ ئەوەی لەگەڵت بدوێمو ئەم مژدەیەت بدەمێ. [20]جا ئەوەتا تۆ لاڵ دەبیتو توانای قسەکردنت نامێنێ تا ئەو ڕۆژەی ئەمەی تیا دەبێت، چونکە باوەڕت بەووتەکانم نەکرد، ئەوەی

لەکاتی خۆی دێتەدی.) [21]خەڵکەکە چاوەڕوانی زەکەریا یان دەکردو سەرسام بووبوون لەدواکەوتنی لەناو پەرستگادا. [22]بەڵام کاتێ هاتەدەرەوە نەیتوانی لەگەڵیان بدوێ، ئینجا زانییان کە لەپەرستگادا بینینی خودایی دیوە. بەئیشارەت لەگەڵیان دەدواو هەر بەلاڵی مایەوە. [23]کاتێ ڕۆژانی خزمەتکردنی لەناو پەرستگادا تەواوبوو، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

[24]دوای ئەوە، ئەلیساباتی ژنی سکی پڕبوو، ماوەی پێنج مانگ ئەم شتەی شاردەوەو دەیووت: [25](خوداوەند وای لێکردم، لەم ڕۆژانەدا ئاوڕی لێدامەوە بۆ ئەوەی شورەییو سەر شۆڕیم لەناو خەڵکی لەسەر لابەرێ.)

**مزگێنی لەدایكبوونی عیسا**

[26]کاتێ ئەلیسابات سکی شەش مانگبوو، جبرائیلی فریشتە لەلایەن خوداوە نێررا بۆ شارێك لەناوچەی جەلیل ناوی ناسیرە بوو، [27]بۆ لای کچێکی نیشانکراو لەپیاوێك ناوی یوسف بوو، لەبنەماڵەی داود، ناوی ئەم کچەش مریەم بوو. [28]فریشتەکە هاتە لایو پێی ووت: (ئەی ئەو کەسەی بەرەکەتی خودات بەسەردا ڕژاوە، سڵاوت لێبێ، خوداوەندت لەگەڵە.) [29]مریەم بەووتەی فریشتەکە شێواو بیری کردەوە دەبێ ئەم جۆرە سڵاوکردنە چیبێت. [30]فریشتەکە پێی ووت: (مەترسە ئەی مریەم، خودا بەرەکەتی پێت داوە، [31]ئا ئەوەتا سکت پڕ دەبیو کوڕێکت دەبێ ناوی دەنێیت عیسا. [32]ئەو مەزن دەبێت، بەڕۆڵەی خودا ناودەبرێت، خوداوەند خوداش تەختی داودی باوکی پێدەبەخشێ. [33]هەروەها تاهەتایە بەسەر ماڵی یاقوبدا فەرمانڕەوایەتی دەکات، پادشاهێتیەکەشی کۆتایی بۆ نییە.) [34]مریەم بەفریشتەکەی ووت: (چۆن شتیوا ڕوو دەدا کە من شووم نەکردبێ؟) [35]فریشتەکە وەڵامی دایەوە: ( ڕۆحی پیرۆز دێ بەسەرتاو هێزی خودا سایەی سەرت دەبێت. چونکە ئەو پیرۆزەی لێت دەبێت بەڕۆڵەی خودا ناودەبرێت. [36]ئەوەتا ئەلیساباتی خزمیشت بەو تەمەنە بەساڵدا چووەوە سکی پڕە بە کوڕێك. ئا ئەوەی پێیان دەووت نەزۆك سکی شەش مانگە. [37]چونکە

هیچ شتێك نییە لای خودا نەبێت.)
38 مریەم ووتی: (من خزمەتكاری خوداوەندم. ئەوەی دەیلێیت ڕازیم بەبوونی.) جا فریشتەكە بەجێی‌هێشت.

**دیدەنی مریەم‌و ئەلیسابات**

39 هەر لەو ڕۆژانەدا، مریەم بەخێرایی بەرەو شاخ ڕۆیشت، بەمەبەستی شارێك لە شارەكانی ناوچەی یەهوزا. 40 چووە ماڵی زەكەریاو سڵاوی لەئەلیسابات كرد. 41 كاتێ ئەلیسابات گوێی لەسڵاوی مریەم بوو، منداڵەكە لەسكیدا جوڵا، ئینجا ئەلیسابات پڕبوو لەڕۆحی پیرۆز.
42 بەدەنگێكی بەرز هاواری‌كردو ووتی: (تۆ لەناو ژناندا پیرۆزیت، پیرۆزە ئەوەی لەسكتدایە. 43 من‌كێم هەتا دایكی گەورەكەم بێت بۆ لام؟ 44 كە سڵاوی تۆ گەیشتە گوێم، لەخۆشیدا منداڵەكە لەسكمدا جوڵایەوە. 45 خۆزگە دەخوازرێ بەوەی باوەڕی هێناوە بەوەی چی لەخوداوەندەوە پێی ووتراوە دێتەدی.)

**ستایشی مریەم**

46 مریەم ووتی: (گیانم ستایشی خوداوەند دەكات، 47 ڕۆحم دڵشادە بەخودای ڕزگاركەرم. 48 چونكە سەیری ساكاری كارەكەرەكەی‌كرد، ئەوەتا لەئێستا بەدواوە هەموو نەوەكان خۆزگەم پێ‌دەخوازن. 49 چونكە توانادار كاری مەزنی بەمن ئەنجامدا، پاك‌وپیرۆزە ناوی ئەو، 50 بەزەیی بۆ ئەوانەیە كە نەوە دوای نەوە لێی‌دەترسن. 51 هێزی دەستی دەرخست، خواستی لووت بەرزەكانی تەفرووتونا كرد لەبۆچوونەكانی دڵیان، 52 توانادارەكانی لەتەختەكانیان هێنایە خوارەوەو ساكارەكانی بڵند كردەوە. 53 برسییەكانی لەخێرو بەرەكەتی خۆی تێركرد، دەوڵەمەندەكانی بەدەستی بەتاڵ ڕەوانەكرد. 54 یارمەتی ئیسرائیلی خزمەتكاری خۆی داو بەزەیی خۆی یادكەوتەوە، 55 هەر وەكو چۆن قسەی لەگەڵ باپیرانمان كردبوو، لەگەڵ ئیبراهیم‌و نەوەكانی بۆ هەتاهەتایە.) 56 دوای ئەوەی مریەم لای ئەلیسابات نزیكەی سێ مانگ مایەوە، گەڕایەوە بۆ ماڵەكەی.

**له دایکبوونی حەزرەتی یەحیا**

[57]ئەلیسابات کاتی منداڵ بوونی هات‌و کوڕێکی بوو. [58]دراوسێکانی‌و خزمانی بیستیان کە خوداوەند بەزەیی مەزنی خۆی بەسەردا ڕژاندووە، لەگەڵی شادومان بوون. [59]لەڕۆژی هەشتەمدا ئامادەبوون، بۆ ئەوەی کوڕەکە خەتەنە بکەن، خەریك بوو ناوی بنێن زەکەریا، لەسەر ناوی باوکی. [60]بەلاّم دایکی ووتی: (نەخێر، بەڵکو ناوی دەنرێ یەحیا.) [61]پێیان ووت: (کەس نییە لەخێڵەکەتدا بەم ناوە ناونرابێت.) [62]بەئیشارەت بەباوکیان ووت: (چ ناوێکی ئەوێ ناوبنرێ؟) [63]تەختەیەکی داواکردو لەسەری نووسی: (ناوی یەحیایە.) هەموویان لەمە سەرسام بوون. [64]دەست‌بەجێ زەکەریا زمانی کرایەوەو دەستی کرد بەستایش کردنی خودا. [65]هەموو دراوسێکانی ترسیان لێ‌نیشت، ئەم کارانەش لەناوچەی چیای یەهودیا، بوو بەقسەو باسی ناو خەڵکی. [66]هەموو ئەوانەی ئەمەیان بیست، ئەم باسەیان خستە دڵیانەوە، ووتیان: (ئایا ئەم منداڵە دەبێ بەچی؟) چونکە دەستی خوداوەندی لەگەڵ بوو.

**ستایشی زەکەریا**

[67]زەکەریای باوکی پڕبوو لەڕۆحی پیرۆز، بەووشەی خودا دواو ووتی: ([68]ستایش بۆ خوداوەند خودای ئیسرائیل، چونکە گەلەکەی بەسەرکردەوەو بەخوێن کڕییەوە. [69]هێزیکی بۆ ڕزگاریمان هەڵساندەوە لەماڵی داودی بەندەی خۆی. [70]هەرووەك لەکۆنەوە دواوە بەزمانی پێغەمبەرە پیرۆزەکانییەوە. [71]بۆ ڕزگاریمان لەدوژمنانو لەدەستی ناحەزانمان. [72]بۆ دەرخستنی بەزەیی خۆی بەرامبەر باپیرانمان. بۆ یادکردنەوەی پەیمانی پیرۆزی. [73]ئەو سوێندەی بۆ ئیبراهیمی باوکمانی خوارد. [74]بۆ فریاکەوتنمان لەدەستی دوژمنان، تا بێ‌ترس بیپەرستین، [75]بەپیرۆزی‌و ڕاست‌ودروستی بەرامبەر ئەو هەموو ڕۆژانی ژیانمان. [76]تۆش ئەی منداڵ پێغەمبەری خودات پێ‌دەووترێ، چونکە پێش خوداوەند دەکەوی تا ڕێگای بۆ ئامادە بکەیت. [77]تاکو گەلەکەی فێر بکەیت کەوا ڕزگاری بەلێخۆش‌بوونی گوناهیان دەبێت. [78]چونکە بەهۆی بەزەیی‌و میهرەبانی خودامان، خۆری بەرەبەیان لەئاسمانەوە بۆمان دەردەکەوێ. [79]تا

ڕووناكی بدات بەوانەی لەناو تاریكیو لەسێبەری مەرگدا دانیشتوون، تا قاچەكانمان بەرەو ڕێگای ئاشتی ببات.) [80]منداڵەكە گەشەی دەكردو لەڕۆح بەهێز دەبوو، لەدەشتودەر مایەوە تا ئەو ڕۆژەی خۆی بۆ ئیسرائیل دەرخست.

## لەدایك بوونی عیسا

# 2

لەو سەردەمەدا لە ئوغستۆسی قەیسەرەوە فەرمان دەرچوو تا هەموو دانیشتوانی وولآتەكەی ناونووس بكرێت. [2]ئەم ناونووس كردنەش یەكەمجاری بوو، لەكاتێكدا كیرینیۆس فەرمانڕەوای سوریا بوو. [3]خەڵكی ڕۆیشتن، هەر یەكە بۆ شاری خۆی هەتا ناونووس بكرێن. [4]جا یوسف لەشاری ناسیرەوە كە لەناوچەی جەلیل بوو، بەرەو شارەكەی داود ڕۆیشت كە ناوی بەیت لەحم بوو لەناوچەی یەهودیا. چونكە ئەو لەبنەماڵەو هۆزی داود بوو. [5]تاكو لەگەڵ مریەمی دەزگیرانی كە لەو كاتەدا سكی هەبوو، لەوێ ناونووس بكرێن. [6]هەر لەو كاتەدا ئەمان لەوێ بوون، كاتی منداڵ بوونی هات. [7]لەبەرئەوەی لەمیوانخانە شوێنیان دەست نەكەوت چوونە تەویلەیەك لەوناوە، ئینجا لەوێدا كوڕە نۆبەرەكەیبوو، پێچایەوەو لەئاخوڕی تەویلەكەدا خەواندی.

## فریشتەیەك مزگێنیی دەدا

[8]لەو ناوچەیە شوان هەبوون لەدەشت دەمانەوەو بەنۆبە ئێشكی مێگەلیان دەگرت. [9]فریشتەیەك لەلایەن خوداوەندەوە هاتە لایان، شكۆمەندی خودا درەوشایەوە لەدەورو پشتیان، بەمە ترسێكی زۆریان لێنیشت. [10]فریشتەكە پێی ووتن: (مەترسن، ئەوا من مژدەیەكی خۆشو مەزنتان پێدەدەم كە بۆ هەموو گەلە. [11]ئەمڕۆ لەشاری داود ڕزگاركەرێك بۆ ئێوە لەدایكبوو، ئەویش مەسیحی خوداوەندە. [12]ئەمەش نیشانە بێ بۆتان، لەوێ منداڵێكی پێچراوەی نووستو لەئاخوڕێكدا دەبینن.) [13]لەپڕێكدا لەگەڵ فریشتەكە كۆمەڵێ هێزی ئاسمانی دەركەوتن، ستایشی خودایان دەكردو دەیان ووت: [14](شكۆمەندی

بۆ خودا لەبەرزایی، بۆ سەر زەویش ئاشتی، بۆ ئەوانەی جێی ڕەزامەندی ئەون.)
[15]کاتێ فریشتەکە لای شوانەکان بەرەو ئاسمان ڕۆیشت، بەیەکتریان ووت: (کەواتە بابڕۆین بۆ بەیتلەحم تا ئەو ڕووداوە ببینین کەوا خوداوەند پێیڕاگەیاندین.) [16] بەخێرایی هاتن شوێنەکەیان دۆزیەوە، منداڵەکەیان بەنووستویی لەئاخورەکەدا بینی لەگەڵ مریەمو یوسف. [17]کاتێ ئەمەیان بینی، دەستیانکرد بەبڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵەی لەبارەی ئەو منداڵەوە پێیان ووترابوو. [18]هەموو ئەوانەی گوێیان لەمەبوو، سەریان سوڕما لەوەی شوانەکان دەیان ووت. [19]بەڵام مریەم ئەم شتانەی هەموو لەبیری خۆی دادەناو لەدڵی خۆی لێکیدەدایەوە. [20]دوای ئەوە شوانەکان گەڕانەوە شوێنی خۆیان، دەم بەستایشی خوداوە بۆ هەموو ئەوەی بیستیانو بینیان، بەو شێوەیەی پێیان ووترا بوو.

**خەتەنەکردنی عیسا**

[21]کاتی خەتەنەکردنی منداڵەکە، دوای بەسەرچوونی هەشت ڕۆژ بەسەر لەدایك بوونی، ناوی‌نرا عیسا هەروەك چۆن لەسەر زمانی فریشتەکە پێشتر ناونرا، پێش ئەوەی دایکی سکی پێی هەبێ.
[22]دوای ئەوەی ڕۆژانی پاکبوونەوەی تەواوبوو، بەپێی شەریعەتی موسا، یوسفو مریەم بردیان بۆ قودس، تاکو پێشکەشی خوداوەندی بکەن. [23]هەروەك چۆن لەشەریعەتی خوداوەند نووسراوە: { هەموو کوڕێکی نۆبەرە کە سکی دایك دەکاتەوە پێی دەووترێ پیرۆزی خوداوەند.} [24]هەروەها بۆ پێشکەش کردنی قوربانی، وەك لەشەریعەتی خوداوەند ووتراوە: {جووتێ کوکوختی یان جووتێ بێچووە کۆتر.
}

[25]لەقودس پیاوێك هەبوو ناوی شەمعون بوو، پیاوێکی چاكو لەخواترس بوو، چاوەڕێی دڵدانەوە بوو بۆ ئیسرائیل، ڕۆحی پیرۆزیشی تێدابوو. [26]ڕۆحی پیرۆز ئاگاداری کردبوو، کە نامرێ تا مەسیحی خوداوەند نەبینێ. [27]بەهۆی ڕۆحەوە هاتبوو بۆ پەرستگا. کاتێ دایكو باوکی عیسا منداڵەکەیان هێنا تا

بەپێی شەریعەت ئەوەی پێویستە بیکەن بۆی. [28]شەمعون منداڵەکەی خستە سەر هەردوو دەستیو ستایشی خودای کردو ووتی:

[29](ئەی خوداوەند ئێستا بەندەی
خۆت با بەئاشتی چاولێك بنێ
بەپێی بەڵێنی خۆت.
[30]ئەوا چاوم ڕزگاری تۆی بینی،
[31]ئەوەی ئامادەت کردووە بۆ هەموو
گەلان،
[32]ڕووناکی بێت بۆ نەتەوەکانو
شکۆمەندی بێت بۆ ئیسرائیل.)

[33]دایكو باوکی سەرسام بوون لەوەی دەربارەی منداڵەکە ووترا. [34] شەمعون داوای پیرۆزی بۆ کردنو بە مریەمی دایکی منداڵەکەی ووت: (بەهۆی ئەم منداڵەوە کەسانێکی زۆر لەئیسرائیل دەکەونو زۆریش هەڵدەستنەوە، دەبێ بەنیشانەیەك بەربەرەکانی دەکرێ، [35]تا نیازی دڵی زۆرکەس ئاشکرابێ. شمشێرێکیش جەرگی تۆ دەبڕێ.) [36]ژنێك بەووشەی خودا دەدوا ناوی حەننە بوو کچی فەنوئیلی پێ دەوترا، سەر بەتیرەی ئەشیر بوو، زۆر بەساڵدا چوو بوو، تەنها حەوت ساڵ لەگەڵ مێردەکەی ژیابوو. [37]پاشان بەبێوەژنی مابووەوە تا تەمەنی گەیشتبووە هەشتاو چوار ساڵێ. پەرستگاکەی بەجێ نەدەهێشت، شەو و ڕۆژ خودای دەپەرست، بەنوێژو ڕۆژوگرتن. [38]لەوکاتەدا ئامادەبوو، دەستی کرد بەسوپاس کردنی خوداو باسی عیسای لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کرد کە لەقودس چاوەڕوانی ڕزگارکەربوون. [39]دوای تەواوبووی هەموو ئەوانەی شەریعەتی خوداوەند داوای دەکات، دایك و باوکی عیسا گەڕانەوە بۆ شارەکەیان کە ناوی ناسیرە بوو لەجەلیل. [40]منداڵەکە نەشونمای دەکردو بەهێز دەبوو، پڕدەبوو لەداناییو بەرەکەتی خودای لەسەر بوو.

### عیسا لە پەرستگادا

[41]دایكو باوکی هەموو ساڵێك لەجەژنی تێپەڕبوون دەچوون بۆ قودس. [42]کاتێ عیسا تەمەنی گەیشتە دوانزە ساڵ، وەك هەموو ساڵانی تر لەجەژندا بەرەو قودس ڕۆیشتن. [43]دوای تەواوبوونی ڕۆژانی جەژن گەڕانەوە، عیسای منداڵ لەقودس مایەوە بێ ئەوەی ئەوان بزانن. [44]وایان دەزانی کە لەگەڵ

هاوڕێکانیاندایە بەڕێگاوە، ڕۆژە ڕێگایەك ڕۆیشتن، دوای ئەوە دەستیان کرد بەگەڕان بەدوایدا لەنێوان خزمو ناسیاوەکانیان. [45]کاتێ نەیان دۆزیەوە گەڕانەوە بۆ قودس تا بەدوایدا بگەڕێن. [46]دوای سێ ڕۆژ گەڕان لەپەرستگادا دۆزیانەوە، سەیریان کرد دانیشتووە لەنێوان مامۆستایانی شەریعەت، گوێی بۆ ڕاگرتوونو پرسیاریان لێدەکات. [47]هەموو ئەوانەی گوێیان لێبوو، سەرسام بوون لە تێگەیشتنو وەڵامدانەوەی. [48]کاتێ بینییان سەریان سوڕما، ئینجا دایکی پێی ووت: (کوڕم بۆ وات لێکردین؟ منو باوکت بە بێ ئارامی بەدواتدا دەگەڕاین.) [49]وەڵامی دانەوە، ووتی: (بۆچی بەدوامدا دەگەڕان؟ ئایا نەتانزانی پێویستە لەسەرم، لەماڵی باوکم بم؟) [50]بەڵام ئەوەی ئەو ووتی، ئەوان تێی نەگەیشتن. [51]ئینجا لەگەڵیان گەڕایەوە بەرەو شاری ناسیرەو گوێڕایەڵیان بوو، مریەمی دایکیشی ئەمانەی هەموو دەخستە دڵیەوە. [52]عیساش لەدانایی‌و بەژنو باڵا گەورە دەبوو، جێی ڕەزامەندی خوداو خەڵکی بوو.

## یەحیای لەئاوهەڵکێش

# 3

لەساڵی پانزەهەمینی فەرمانڕەوایی تیباریۆسی قەیسەر، کاتێ بونتیۆس پیلاتۆس لێپرسراوی یەهودیا بوو، هەروەها هێرۆدس لێپرسراوی جەلیل و براکەشی فیلیپۆس لێپرسراوی ئیتۆریەو تەراخونیتس بوو، لیسانیوسیش لێپرسراوی ئیبیلیە بوو، [2]لەسەردەمی حەنان و قەیافای سەرۆك کاهینەکان، کاتێ یەحیا لەدەشتودەر بوو ووشەی خودای بۆ هاتە خوارەوە. [3]ئینجا هات بۆ هەموو ناوچەکانی سەر ڕووباری ئوردن تا لەئاوهەڵکێشانی تۆبەکردن بۆ گوناە بەخشین ڕابگەێنێ. [4]هەروەك لە پەرتووکی ئەشعیا پێغەمبەر نووسراوە: {دەنگێك لەدەشتودەر بانگەواز دەکات، ڕێگا بۆ خوداوەند ئامادەبکەن، ڕێڕەوی ڕێك بخەن. [5]هەموو دۆڵێك پڕ دەکرێتەوەو هەموو چیاو گردۆلکەیەکیش نزم دەبێتەوە، هەموو شوێنە پێچاوپێچەکان ڕاست دەبنەوەو شوێنە چاڵەکان دەبنە ڕێگای ڕێكوڕەوان، [6]هەموو کەسێ ڕزگاری خودا دەبینێ!}

[7]یەحیا بەهەموو ئەوانەی هاتبوون

بۆ لەئاوهەڵکێشان لەسەردەستی، دەیووت: (ئەی بێچووە ماران، کێ فێری هەڵاتنی کردوون لەدەست تووڕەیی داهاتوو؟ [8]بەرووبوومێ بدەن شایانی تۆبەکردن بێت، بەخۆتان مەڵێن: (ئێمە ئیبراهیمی باوکمان هەیە.) من پێتان دەڵێم، خودا توانای ئەوەی هەیە ئا لەم بەردانە نەوە بۆ ئیبراهیم دروست بکات. [9]ئەوا تەور خراوەتە سەر قەدی دار، هەر دارێك بەرووبوومی باش نەدات دەبڕێتەوەو فڕێ دەدرێتە ناو ئاگر.) [10]خەڵکەکە پرسیاریان لێکرد: (کەواتە چی بکەین؟) [11]وەڵامی دانەوە: (ئەوەی دوو کراسی هەیە، با یەکێکیان بدا بەوەی کە نییەتی، ئەوەش کە نانی هەیە، با هەمان شت بکات.) [12]هەندێ لەباجگرانیش هاتبوون بۆ لەئاوهەڵکێشان، پرسیاریان لێکرد: (مامۆستا، ئەی ئێمە چی بکەین؟) [13]پێی ووتن: (لەوەی بۆتان دانراوە زیاتر وەرمەگرن.) [14]هەروەها هەندێ سەرباز پرسیاریان لێکرد: (ئەی ئێمە چی بکەین؟) وەڵامی دانەوە: (زۆرداری لەکەس مەکەن، بەدرۆ کەس تاوانبار مەکەن، بەمووچەکانتان ڕازیبن.)

[15]لەبەرئەوەی گەل چاوەڕێی مەسیحیان دەکرد، هەموو لەخۆیان دەپرسی: (تۆ بڵێی یەحیا، مەسیحی چاوەڕێ کراو بێ؟) [16]یەحیا وەڵامی خەڵکەکەی دایەوە: (من لەئاو هەڵتاندەکێشم، بەڵام ئەوەی دێت لەمن بەتواناترە، ئەوەی من تەنانەت شایستەی کردنەوەی قەیتانی پێڵاوەکانی نیم، ئەو لەڕۆحی پیرۆزو لەئاگر هەڵتاندەکێشێ. [17]ئەو شەنی بەدەستەوەیە بۆ پاككردنەوەی خەرمانەکەی بەتەواوی، گەنمەکە لەعەمباردا کۆدەکاتەوەو کایەکەش دەسوتێنێ بەئاگرێك کە ناکوژێتەوە.) [18]دیسان بەزۆر شتی تر، ئامۆژگاری گەلەکەی دەکردو مژدەی دەدانێ. [19]بەڵام هێرۆدس کە فەرمانڕەوای ناوچەکە بوو، لەلایەن یەحیاوە سەرزەنشت کرا بەهۆی هێرۆدیای براژنییەوە، هەروەها لەبەر هەموو ئەو خراپانەی کە دەیکرد، [20]خراپەیەکی تریشی خستە پاڵ خراپەکانی پێشووی ئەویش بەزیندانکردنی یەحیا.

**لەئاوهەڵکێشانی عیسا**

[21]کاتێ گەل هەموو

لــــەئـــاوهەڵکێشــــران، عیســـاش لــەئـاوهەڵکێشـرا، لەکاتێکدا نوێژی دەکـرد، ئاسمـانکـرایەوە، [22]ڕۆحـی پـیرۆز لـەشـێوەی لـەشی کـۆترێك لەســــەری نیشـــتەوە، دەنگــێك لـــەئاسمانـەوە هــاتو ووتـی: (تۆی ڕۆڵـەی خۆشەویسـتم، مـن پێـت دڵشاد بووم.)

### بنەچەی عیسا

[23]کــــاتێ عیســــا دەســـتی بەخـزمەتەکەی کرد، تەمەنی نزیکەی سـی سـاڵ بـوو، خەڵکی وایاندەزانی کوڕی یوسفی کوڕی هالی، [24]کوڕی مەتسـات کـوڕی لاوی، کـوڕی مولکی کوڕی یەننا، کوڕی یوسف. [25]کـوڕی مەتتاسـیا، کـوڕی عاموس کوڕی ناحوم، کوڕی حەسلی کوڕی نـەجای، [26]کـوڕی مـاس کـوڕی مەتاسـیا، کـوڕی شـەمعی کـوڕی یوسـف، کـوڕی یـەهوزا، [27]کـوڕی یۆحەننا، کوڕی ڕیسا کوڕی زەربابل، [28]کـوڕی شـالتیئیل کـوڕی نـیری، کـوڕی مولکی کوڕی ئادی، کوڕی قوسەم کوڕی ئەلمودام کوڕی عیری، [29]کـوڕی یوسـی، کـوڕی ئەلیعازەر کـوڕی یوریـم، کـوڕی مەتسـات کـوڕی لاوی، [30]کـوڕی شـەمعون کـوڕی یەهوزا، کوڕی یوسف کوڕی یۆنـان، کـوڕی ئەلیاقـیم، [31]کـوڕی مەلـیا کـوڕی مەینان، کوڕی مەتاسا کـوڕی ناسـان، کـوڕی داود، [32]کوڕی یەسـا، کـوڕی عوبێد کوڕی بوعـەز، کـوڕی سـەلمون کـوڕی نەحشـون، [33]کـوڕی عەمیـناداب کـوڕی ئـارام، کـوڕی حەسـرون، کـوڕی فـارس کـوڕی یـەهوزا، [34]کـوڕی یـاقوب کـوڕی ئیسـحاق، کـوڕی ئیبراهیم کوڕی تارح، کوڕی نـاحور، [35]کـوڕی سـەروج، کوڕی ڕەعـو کـوڕی فـالج، کـوڕی عابـر کـوڕی شالح، [36]کوڕی قینان کوڕی ئەرفەکشاد، کوڕی سام کوڕی نوح، کـوڕی لامـەك، [37]کوڕی مەتوشالح، کـوڕی ئەخنوخ کوڕی یارد، کوڕی مـەهلل‌ئـیل کـوڕی قینان، [38]کوڕی ئـەنوش کـوڕی شـیت، کوڕی ئادەم کە لە خودایە.

### شەیتان عیسا تاقی‌دەکاتەوە

## 4

کـاتێ عیسـا لـەئوردون گەڕایـەوە، لەشـی پـڕبـوو لەڕۆحی پیرۆز، ڕۆح لەبـیابان دەیـبردبەڕێوە. [2]ماوەی چل

ڕۆژ شـــــەیتان تاقیدەکــــــردەوە. بەدرێژایی ئەو ڕۆژانە هیچی نەخوارد، کـاتێ ماوەکە تەواوبوو برسی بوو. [3] شـەیتان پـێی ووت: (گـەر ڕاستە تۆ ڕۆڵەی خودای بەو بەردە بڵێ بابێت بـەنان.) [4]عیسا وەڵامی دایەوە ووتی: (لەکتێـبی پـیرۆزدا نووسراوە: {مرۆڤ هـەر بـەنان نـاژی.}) [5]ئـینجا شەیتان بـردیە سـەر شـاخێکی بەرزو هەموو پادشـــــاهێتیەکانی جـــــیهانی بەچـاوتروکانێك پیشـانداو [6]ووتـی: (دەسـەڵاتی فەرمانـڕەوایی ئەم هەموو پادشـاهیانەت دەدەمـێ بـەهـەموو شـکۆیەکەوە، چـونکە دراوە بەمنو منیش دەیدەم بەهەر کەسێ بمەوێ. [7] گەر کڕنۆشت بۆ بردم ئەوا هەمووی دەبـێ بـەهـیتـۆ.) [8]عیسـا وەڵامـی دایەوەو ووتی: (نووسراوە: {تەنها بۆ خوداوەنـد خـودات کڕنووش بەرەو هـەر ئـەو بپەرسـتە.}) [9]ئینجا شەیتان بـردی بـۆ قـودس، لەسـەر قـەراغی سەربانی پەرستگاکە ڕایگرت و پێی ووت: (گـەر ڕاسـتە تـۆ ڕۆڵـەی خـــودای لـــێرەوە خـــۆت فـــڕێدە خــوارەوە، [10]چـونکە نووسـراوە: { بــــەفریشــــتەکانی دەڵـــــێ پارێزگاریـتکەنو [11]لەسەر دەستیان هەڵـت دەگرن نەوەك قاچت بەربەرد بکەوێـت.}) [12]عیسا وەڵامی دایەوەو ووتـــی: (ووتـــراوە: {خوداوەنـــد خـودات تـاقی مەکەرەوە.}) [13]کاتێ شـــەیتان هـــەموو تاقیکـــردنەوەکانی تـەواوبوو، بەجـێی هێشـت تاکاتێکی تر.

**عیسا لەناسیرە دەردەکرێ**

[14]عیســـــا بـەهـــــێزی ڕۆح گەڕایەوە بــۆ جـەلـیل، نـاوبـانگـی لەهـــەموو دێـیەکانی دەورروپشـــت بلاوبـــــووەوە. [15]لـەکەنیشـــــتەکان خـەڵکی فێردەکرد، هەموو ستایشیان دەکرد.

[16]ئـینجا هـات بـۆ ناسـیرە، ئـەو شوێنەی لێی پەروەردە بوو، هەروەك جاران ڕۆژی شەممە چووە کەنیشت، ڕاوەسـتا بۆ خوێندنەوە. [17]پەرتووکی ئەشـعیا پێغەمبەریان دایە دەستی کاتێ کردیەوە ئەو شوێنەی بەرچاو کەوت کـە تـیایـدا نووسـراوە: [18]{ڕۆحـی خوداوەنـــدم لەســـەرە، چـــونکە دەسـتنیشـانیکردووم تا مژدە بدەم بەهـــەژاران، نـــاردوومی هـــەتا بـــۆ دیـلکـراوان داوای ئازادی بکەم، بۆ کوێـران داوای ڕووناکی بکەم، تاکو

پیٚشێلکراوان ڕزگاربکەم، [19]ساڵی ڕەزامەندی خوداوەند ڕابگەیێنم.} [20] ئینجا پەرتووکەکەی داخست و دایە دەست ئیشکەری ئەو شوێنەو دانیشت. هەموو ئەوانەی ئامادەبوون لەکەنیشتەکە چاویان تیٚبڕیبوو. [21] قسەی بۆ کردنو ووتی: (وا ئەمڕۆ ئەوەی گوێتان لیٚبوو هاتەدی.) [22] هەموو بەباشی باسیان دەکردو سەریان سوڕما لەو ووشە بەرەکەتدارانەی لەدەمی دەهاتە دەرەوە، دەیان ووت: (ئایا ئەمە کوڕەکەی یوسف نییە؟) [23]عیسا پێی ووتن: (بیٚگومان ئێوە پێم دەڵێن، ئەی پزیشك جاریٚ چارەسەری خۆت بکە، ئەوەی بیستمان لەکەفەرناحوم کردت لێرەش لەشارەکەت بیکە.) [24]دیسان بەردەوام بوو ووتی: (ڕاستیتان پیٚ دەڵێم، هیچ پێغەمبەرێك لەشارەکەی خۆی پەسەند ناکریٚ. [25]لەڕاستیدا پێتان دەڵێم، لەسەردەمی ئەلیاس لەئیسرائیل بێوەژنی زۆر هەبوون، کاتیٚ باران بڕا سیٚ ساڵو شەش مانگ، هەتا برسێتییەکی گەورە لەهەموو سەر زەویدا ڕوویدا، [26] بەڵام ئەلیاس نەنێررا بۆ کەس لەوانە، بەڵکو بۆ ئافرەتێکی بێوەژن لەسەرفە لەناوچەی سەیدا. [27]لەئیسرائیل لەسەردەمی ئەلیشەع پێغەمبەر زۆر کەس تووشی نەخۆشی گولی هاتبوون، هیچیانی چاك نەکردەوە، تەنها نوعمانی سوری نەبیٚ.) [28] هەموو ئەوانەی لەکەنیشتەکە بوون، کە ئەمەیان بیست ڕقیان هەڵسا. [29] دەریان کردە دەرەوەی شارەکە، بردیانە قەراخ ئەو چیایەی شارەکەیانی لەسەر دروستکرابوو، تاکو لەوێوە فڕێی بدەنە خوارەوە. [30] بەڵام ئەو دەرباز بوو لەناویانو لەویٚ ڕۆیشت.

**دەرکردنی ڕۆحی پیس**

[31]جا عیسا بەرەو کەفەرناحوم ڕۆیشت، شارێك بوو لەناوچەی جەلیل، لەویٚ لەشەممەاندا خەڵکی فێر دەکرد. [32]زۆر سەریان سوڕما لەفێرکردنەکانی، لەبەرئەوەی ووشەکانی بەدەسەڵاتەوە بوو. [33] لەکەنیشتەکەدا پیاوێك هەبوو ڕۆحی پیسی تێدا بوو. بەدەنگێکی بەرز هاواریکرد : [34](ئەی عیسای ناسیری چیت لێمان دەویٚ؟ هاتوویت لەناومان ببەی؟ من دەزانم

تۆکێیت، تۆ پیرۆزی خودای.) [35] عیسا هەڕەشەی لێکردو ووتی: (بێدەنگبە! لەلەشی وەرە دەرەوە.) ئینجا ڕۆحە پیسەکە کابرای کوتا بەزەویداو لەلەشی هاتە دەرەوە، بێئەوەی زیانی‌کەی پێبگەیەنێ. [36] هەموو سەرسام بوون، لەنێوان خۆیان پرسیاریان دەکرد: (ئەمە چ ووشەیەکە؟ ئاوها بەدەسەلاتە، فەرمانەدەدا بەڕۆحە پیسەکان تا لەخەلکی بێنە دەرەوە.) [37] ناوبانگی عیسا لەهەموو شوێنێك لەو ناوچەیە بلاوبووەوە.

### چاککردنەوەی خەلکێکی زۆر

[38] دوای ئەمانە کەنیشتەکەی بەجێهێشت‌و چووە مالی شەمعون. خەسووی شەمعون تایەکی توندی لێهاتبوو، داوایان لێکرد یارمەتی‌بدات. [39] ئەویش لای جێگاکەی ڕاوەستاو تایەکەی لێ دوور خستەوە. ژنە یەکسەر هەستایە سەرپێ‌و دەستی‌کرد بەخزمەتکردنیان. [40] کاتێ ڕۆژ ئاوابوو، هەموو ئەوانەی نەخۆشییان هەبوو، لەهەموو جۆرێك، هێنایانە لای عیسا یەکە یەکە دەستی لەسەر دانانو چاکی کردنەوە. [41] ڕۆحی پیسی لەزۆریان دەرکرد، لەکاتێکدا ڕۆحەکان هاواریان دەکرد (تۆ ڕۆلەی خودای!) ئەویش دەری‌دەکردنو نەی‌دەهێشت زۆر بلێن، چونکە زانییان ئەو مەسیحە. [42] کاتێ ڕۆژهەلات، هەستاو ڕۆیشت بۆ جێگایەکی چۆلەوانی، خەلکەکە بەدوایدا گەڕان تادۆزیانەوە، گرتیان تاکو لایان نەڕوات. [43] بەلام ئەو پێی ووتن: (پێویستە لەسەرم، مژدەی پادشاهێتی خودا بەشارەکانی تریش بدەم، چونکە من بۆ ئەمە نێرراوم.) [44] ئیتر لەوێ ڕۆیشت‌و دەستی‌کرد بەمزگێنی‌دان لەکەنیشتەکان.

### عیسا قوتابییەکانی بانگدەکات

## 5

لەکاتێکدا عیسا ڕاوەستابوو لەسەر کەناری دەریاچەی جەنیسارت، خەلکەکە هەموو کۆمەلێ بووبوون لەدەوری تاکو گوێ لەووشەی خودا بگرن. [2] دوو بەلەمی بینی لای دەریاچەکەوە ڕاوەستابوون، ماسیگرەکان بەجێیان هێشتبوو، تۆڕەکانیان دەشوشت. [3] چووە ناو یەکێکیان، کە هی شەمعون‌بوو،

داوای لیٚ‌کرد هەندیٚ لەکەناری دەریاچەکە دووری بخاتەوە ئینجا دانیشت‌و لەناو بەلەمەکەوە دەستی‌کرد بە فێرکردنی خەڵکەکە.

[4]کاتیٚ ووتەکانی تەواوکرد بەشەمعونی ووت: (دووری‌کەرەوە بۆ قوولایی، جا تۆڕەکانتان فڕیٚ بدەن بۆ ڕاوکردن.) [5]شەمعون وەلامی دایەوە: (گەورەم هەرچەندە بەدرێژایی شەو هەوڵماندا کەچی هیچمان ڕاونەکرد. بەلام لەبەر قسەی تۆ ئەوا تۆڕێك فڕیٚ دەدەم) [6]کاتیٚ ئەمەیان کرد ماسییەکی زۆریان گرت، بەشێوەیەك تۆڕەکەیان خەریك‌بوو بدڕیٚ. [7]جا بانگی هاوڕێکانیان کرد کە لەبەلەمەکەی تردا بوون، تاکو بێن‌و یارمەتییان بدەن، ئەوانیش هاتن‌و هەردوو بەلەمەکەیان پڕکرد تا وای لیٚ هات خەریك بوو نوقوم ببن. [8]کاتیٚ شەمعون کە بەپەترۆس ناودەبریٚ ئەمەی بینی چۆکی‌دادا لەبەر پێی عیساداو ووتی: (گەورەم لێم دوورکەوە، چونکە من مرۆڤێکی گوناهبارم.) [9]پەترۆس‌و ئەوانەی لەگەڵی بوون سەریان سوڕمابوو لەزۆری ئەو ماسییانەی گرتبوویان، [10]هەروەها یاقوب‌و یۆحەنای کوڕی زەبدی کە شەریکی پەترۆس بوون.

عیسا بەپەترۆسی ووت: (مەترسە ئیتر تۆ لەئێستاوە ڕاوی مرۆڤ دەکەیت.) [11]دوای ئەوەی گەڕانەوە کەناری دەریاچەکە وازیان لەهەموو شتێك هێناو دوای عیسا کەوتن.

**نەخۆشی گولی پاك‌دەبێتەوە**

[12]کاتیٚ عیسا لەیەکێك لەشارەکان بوو، لەویٚ مرۆڤێکی لیٚ‌بوو هەموو لەشی برینی گولی داپۆشی‌بوو، هەر کە عیسای بینی، لەبەردەمی خۆی بەدەمداداو لێی پاڕایەوەو ووتی: (گەورەم، گەر بتەوێت توانای ئەوەت هەیە پاکم بکەیتەوە.) [13]عیسا دەستی درێژکردو دەستی لیٚ‌دا، ووتی: (دەمەویٚ، پاك بەرەوە.) ئیتر دەست‌بەجیٚ کابرا پاك بووەوە. [14]عیسا ڕای‌سپاردو پێی ووت: (ئەمە بەکەس نەڵێی، بەڵکو بڕۆ خۆت نیشانی کاهینەکان بدە لەباتی پاك‌بوونەوەکەشت، ئەو قوربانییەی موسا فەرمانی‌داوە پێشکەشی بکە، ئەمە دەبێتە شایەتییەك لایان.) [15]جا بەمە دەنگوباسی عیسا زیاتر بلاوبووەوە، لەبەرئەمە

خەڵکێکی زۆر هاتنە لای بۆ گوێگرتنو چاك بوونەوە لەنەخۆشیەکانیان. [16] بەلاَم ئەو دووردەکەوتەوە بۆ شوێنە چۆڵەکان هەتا نوێژ بکات.

### دەسەڵاتی گوناه بەخشین

[17] ڕۆژێ لەڕۆژان عیسا خەریکی فێرکردن بوو، لەنێوان دانیشتوان هەندێ لەفەریسیەکانو مامۆستایانی شەریعەت هەبوون. خەڵکی لەهەموو دێیەکانی جەلیلو یەهودیاو قودسەوە هاتبوون. توانای خوداوەند دەرکەوت بۆ چاك کردنەوەیان. [18] هەندێکیان مرۆڤێکی ئیفلیجیان هێنا بەجێگەکەیەوەو ویستیان بیبەنە ژوورەوە بۆ بەردەمی. [19] کاتێ ڕێیان نەبوو بەهۆی زۆری خەڵکەوە، سەرکەوتنە سەربانو شۆڕیان کردەوە بەجێگەکەیەوە بۆ ناوەڕاستی خەڵکەکە، بۆ بەردەمی عیسا. [20] عیسا کە باوەڕی ئەوانی بینی، ووتی: (کابرا، گوناهەکانت بەخشرا.) [21] مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیەکان لەدڵی خۆیان ووتیان: (ئەمە کێیە بەم شێوەیە کفر دەکات؟ کێ دەتوانێ گوناه ببەخشێ تەنها خودا نەبێ؟)

[22] بەلاَم عیسا زانی بیر لەچی دەکەنەوە، وەلاَمی دانەوە، ووتی: (بۆ وا بیر دەکەنەوە لەدڵتان؟ [23] کامیان ئاسانترە، بڵێم: (گوناهەکانت بەخشرا، یان بڵێم هەستە بڕۆ؟ [24] بەلاَم ئەمەم ووت، تاکو بزانن ڕۆڵەی مرۆڤ لەسەر زەوی دەسەڵاتی گوناه بەخشینی هەیە.) ئینجا بەئیفلیجەکەی ووت: (هەستە، جێگەکەت هەڵگرەو بڕۆوە بۆ ماڵ.) [25] ئەویش دەستبەجێ هەڵساو جێگەکەی هەڵگرتو کەوتەڕێ بەرەو ماڵەوەو ستایشی خودای دەکرد. [26] خەڵکەکەش هەموو سەرسامبوونو ستایشی خودایان کرد، ترس دایگرتنو ووتیان: (ئەمڕۆ کاری سەرسوڕهێنەرمان بینی.)

### عیسا بۆ گوناهباران هاتووە

[27] دوای ئەمە عیسا لەوێ هاتە دەرەوە، باجگرێکی دی ناوی لاوی بوو، لەشوێنی باجگران دانیشتبوو، پێی ووت: (دوامکەوە.) [28] لاویش هەستاو هەموو شتێکی بەجێهێشتو دوای کەوت.

[29] لاوی میوانداریەکی گەورەی بۆ کرد لەماڵی خۆی، زۆر

لەباجگرانو خەڵکی تر لەگەڵیان دانیشتبوون لەسەر خوان. [30] مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیەکان نارەزایی خۆیان دەربڕی لای قوتابیەکانی عیساو ووتیان: (بۆچی لەگەڵ باجگرانو گوناهباران دەخۆنو دەخۆنەوە؟) [31]عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (مرۆڤی لەش ساغ پێویستی بەپزیشك نییە، بەڵكو نەخۆش. [32]نەهاتووم بۆ بانگ‌کردنی ئەوانەی خۆیان بەچاك دەزانن، بەڵكو گوناهباران بۆ تۆبەکردن.)

### لەبارەی ڕۆژوو

[33]ئینجا پێیان ووت: (قوتابیەکانی یەحیا زۆر ڕۆژوو دەگرنو نوێژ دەکەن، هەروەها قوتابی فەریسیەکان، بەڵام قوتابیەکانی تۆ دەخۆنو دەخۆنەوە.) [34]عیساش پێی ووتن: (ئایا دەتوانن لەشاییدا وا لەکەسوکاری زاوا بکەن بەڕۆژوو بن، لەکاتێکدا زاوا لەناویان بێت؟ [35]بەڵام ڕۆژانێك دێ کە زاوا لەنێوانیان بەرزکرابێتەوە، ئەوسا لەو ڕۆژانەدا بەڕۆژوو دەبن.) [36] نموونەیەکی بۆ هێنانەوە، ووتی: (کەس پارچە لەجلی تازە ناکاتەوە تاوەکو جلێکی کۆنی پێ پینەکات، چونکە جلە تازەکە دەدڕێ و پارچەکەش کە وەرگیراوە لەجلە تازەکە ناگونجێ لەگەڵ کۆنەکەدا. [37] هەروەها کەس مەی تازە ناخاتە ناو مەشکەی کۆنەوە، چونکە مەیە تازەکە مەشکەکە دەدڕێنێ، مەیەکە دەڕژێو مەشکەکەش لەناو دەچێ. [38]کەواتە پێویستە مەی تازە بکرێتە مەشکەی تازەوە. [39]کەسیش نییە مەی کۆن بخواتەوەو ئارەزووی تازە بکات، چونکە دەڵێ: (کۆنەکە خۆشترە.))

### دەربارەی ڕۆژی شەممە

## 6

لە ڕۆژێکی شەممەدا، عیسا بەناو دەغڵێك تێدەپەڕی، قوتابیەکانی گوڵەگەنمیان لێ دەکردەوەو لەبەری دەستیان دەیان پرواندو دەیان خوارد. [2]هەندێ لەفەریسیەکان پێیان ووتن: (بۆچی کارێك دەکەن لەشەممەدا دروست نییە؟) [3]عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (ئەی نەتان خوێندۆتەوە داود چی کرد کاتێ برسیبوو، لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵی بوون؟ [4]چۆن چووە ماڵی خوداو نانی

قوربانی خواردو دای بەوانەش کە لەگەڵی بوون، لەگەڵ ئەوەش خواردنی ئەو نانە دروست نییە تەنها بۆ کاهینەکان نەبێت؟[5] ئینجا پێی وتن: (ڕۆڵەی مرۆڤ خۆی گەورەی ڕۆژانی شەممەیە).

**چاکردنەوەی نەخۆش لەشەممە**

[6] لەشەممەیەکی تردا، عیسا چووە کەنیشتو دەستی کرد بە فێرکردن. پیاوێکی لێبوو دەستی ڕاستی ووشك بووبوو. [7] مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیەکان سەیری عیسایان دەکرد، تاکو بزانن ئایا لەڕۆژانی شەممەدا خەڵکی چاك دەکاتەوە، هەتا شتێك بدۆزنەوە، بۆ ئەوەی تاوانباری بکەن، [8] بەڵام ئەو بەمەبەستی زانین، بەپیاوەکەی ووت: (هەستە، ڕاوەستە لەبەردەم خەڵکەکەدا، ئەویش هەستاو لەوێ ڕاوەستا. [9] عیسا پێی ووتن: (من پرسیارێکتان ئاراستە دەکەم، ئایا لەڕۆژانی شەممەدا چی دروستە، کردنی کاری باش یان کاری خراپ؟ ڕزگارکردن یاخود لەناوبردن کامیان باشترە؟) [10] دوای ئەوەی چاوی بەهەموویان گێڕا، بەپیاوەکەی ووت: (دەست درێژکە.) ئەویش ئەمەی کردو دەستی وەك جاری جاران چاك بووەوە. [11] بەڵام ئەوان زۆر تووڕە بوونو کەوتنە ڕاوێژو تەگبیر لەگەڵ یەکتری بۆ ئەوەی شتێك لەعیسا بکەن.

**دوانزە نێرراوەکە**

[12] لەورۆژانەدا عیسا بەرەو شاخ ڕۆیشت تاکو لەوێ نوێژ بکات، ئەو شەوەی بەنوێژکردن بۆ خودا بەسەربرد. [13] کاتێ ڕۆژ بووەوە، قوتابیەکانی بانگکرد، دوانزەی لێ هەڵبژاردنو ناوی لێنان نێرراوان ئەوانەش ئەمانە بوون. [14] شەمعون کەناوی نا پەترۆس، ئەندەراوسی برای، یاقوب، یۆحەننا، فیلیپۆس، بەرتولماوس، [15] مەتتا، تۆما، یاقوبی کوڕی حەلفی، شەمعون کە ناسراوبوو بەدڵگەرم، [16] هەروەها یەهوزای کوڕی یاقوب لەگەڵ یەهوزای ئەسخەریوتی کە لە دواییدا بەناپاك دەرچوو. [17] ئینجا عیسا لەگەڵیان هاتەخوارەوە، لەشوێنێکی تەختایی ڕاوەستا. لەوێ ژمارەیەکی زۆر لەقوتابیەکانی لێبوو لەگەڵ زۆر لەخەڵکی، کە لەناوچەی

یەهودیاو قودسو سوورو سەیدا هاتبوون. تاکو گوێیان لێی بێتو لەنەخۆشییەکانیان چاکبنەوە. [18] ئەوانەش کە ڕۆحی پیس ئازاری دەدان چاکبوونەوە. [19] ئیتر هەموو خەڵکەکە هەوڵیان دەدا دەستیان پێی بکەوێت، چونکە هێزو توانایەکی مەزنی لێدەهاتە دەرەوەو هەمووانی چاك دەکردەوە.

[20] ڕوانیە قوتابیەکانیو ووتی: (خۆزگەتان پێدەخوازرێ ئەی هەژارەکان چونکە پادشاهێتی ئاسمان بۆ ئێوەیە. [21] خۆزگەتان پێ دەخوازرێ ئەی ئەوانەی ئێستا برسین چونکە تێردەبن. خۆزگەتان پێدەخوازرێ ئەی ئەوانەی ئێستا دەگرین، چونکە پێدەکەنن. [22] خۆزگەتان پێدەخوازرێ کاتێ خەڵك ڕقیان لێتان دەبێتەوە، جیاتان دەکەنەوە، جنێوتان پێدەدەن، بەبەدکار ناوتان دەبەن، لەپێناوی ڕۆڵەی مرۆڤ. [23] شادومانو دڵخۆشبن چونکە پاداشتتان مەزنە لەئاسمان، باو باپیرانیان بەو شێوەیە هەڵسوکەوتیان کردووە لەگەڵ پێغەمبەران. [24] بەڵام خاك بەسەرتان ئەی دەوڵەمەندەکان، چونکە دڵنەواییکران. [25] خاك بەسەرتان ئەی ئەوانەی ئێستا تێرن، چونکە دوایی برسی دەبن. خاك بەسەرتان ئەی ئەوانەی ئێستا پێدەکەنن، چونکە دوایی دەگرینو غەمبار دەبن. [26] خاك بەسەرتان کاتێ هەموو خەڵك ستایشتان دەکات، چونکە باوباپیرانیان هەمان شتیان کرد لەگەڵ پێغەمبەرە درۆزنەکان.

### دوژمنەکانتان خۆش بوێ

([27] بەڵام ئەی گوێگران، پێتان دەڵێم: دوژمنەکانتان خۆش بوێ، چاکە بکەن لەگەڵ ئەوانەی ڕقیان لێتان دەبێتەوە. [28] داوای پیرۆزی بکەن* بۆ ئەوانەی نەفرەتتان لێدەکەن، نوێژ بکەن بۆ ئەوانەی خراپەتان بەرامبەر دەکەن [29] ئەوەی کێشای بە لایەکی ڕوومەتت، لایەکەی تریشی بۆ ڕاگرە. گەر یەکێ چاکەتەکەی لەبەرداکەنیت، ڕێی لێمەگرە باکراسەکەشت ببات. [30] ئەوەی داوای شتێکت لێ دەکات، بیدەرێ، ئەوەش کە شتێکت لێ داگیر دەکات لێی داوامەکەوە.

[31]چـــۆن دەتانـــەوێ خـــەڵکی هەڵسـوکەوتتان لـەگەڵ بکەن، لـەپێشا ئێوە بەو شێوەیە هەڵسوکەوتیان لـەگەڵ بکەن.

[32](گـەر هـاتوو بـەتـەنها هـەر ئەوانـەتان خۆشویسـت کـە خۆشیان دەوێن، چ چاکەیەك دەکەن؟ تەنانەت گوناهبارانـیش ئەوانەیان خۆشدەوێ کەخۆشیان دەوێن. [33]ئەگەر کرداری باشـتان هـەر لـەگەڵ ئەوانەداکرد کە کـرداری بـاش بەرامـبەرتان دەکەن، ئایـا چ چـاکەیەك دەکـەن؟ تەنانـەت گوناهبارانـیش ئەمە دەکەن. [34]ئەگەر تـەنها قـەرز بـدەن بەوانـەی دەزانـن قەرزەکـە دەگەڕێـنەوە، چ چاکەیەك دەکـەن؟ تەنانەت گوناهبارانیش قەرز دەدەن بەوانـەی دەزانـن قەرزەکانیان دەدەنەوە. [35]بەڵام ئێوە دوژمنەکانتان خـۆشبـوێ، چاکەیان لـەگەڵ بکەن، قـەرزیان بدەنـێ بێ‌ئـەوەی هـیوای وەرگرتـنەوەتان هەبێ، بەمە پاداشتتان گـەورە دەبـێو دەبنە ڕۆڵەی خودای مـەزن، چـونکە ئەو میهرەبانە لـەگەڵ بەدنمـەكو بەدکاران. [36]بەبەزەیی بن، هەروەك چۆن باوکتان بەبەزەییە.

**خەڵکی تـاوانبار مەکەن**

[37](خـەڵکی تاوانـبارمەکەن، تـا تاوانـبارنەکرێن. کـەس سەرزەنشـت مەکـەن، سەرزەنشـت ناکـرێن. لـەخـەڵکی خـۆش بـن، لێتان خۆش دەبـن. [38]بـەخـەڵکی بـدەن، پێتان دەدرێـت، پـێوانەیەکی چـاکی پەسـتێنراوی هەژێـندراوی پـڕی لێ ڕژاوتـان پـێدەدرێ لەباوەشـتان، چـونکە بـەو پێوانەیەی بـۆ خەڵکی دەپێون بۆتان دەپێونەوە.)

[39]نموونەیەکی بۆ هێنانەوەو ووتی: (ئایـا کوێـرێك دەتوانێ کوێرێکی‌کە بـەڕێدا بـبات؟ ئایـا هەردووکـیان ناکەونـە چـاڵەوە؟ [40]قوتـابی لەمامۆستاکەی مەزنتر نییە، بەڵام هەر کەسـێ تـەواو و ڕێـك بێـت، وەك مامۆسـتاکەی لـێ دێـت. [41]بۆچـی سەرنج لەپووشی ناو چاوی براکەت دەدەیتو گوێ‌نادەیتە تەختەدارەکەی نـاو چـاوی خـۆت؟ [42]یـان چـۆن دەتوانـی بـەبراکەت بڵێیت: (ئا برا، بهـێڵە بـا ئـەو پووشـە لەچـاوت دەربهێـنم.) لـەکاتـێکدا تـۆ خـۆت تەخـتەدارەکەی نـاو چـاوی خـۆت نابینیـت؟ ئـەی دووڕوو، جـارێ تـۆ یەکـەمجار تەخـتەدارەکەی ناو چاوی خـۆت دەربهێنە، ئینجا باش دەبینیت

بۆ ئەوەی پووشەکەی ناوچاوی براکەت دەربهێنیت.)

**ناسین بە بەرووبووم**

[43](داری چاك نییە بەری خراپ بدات، داری خراپیش بەری چاك نادات [44]لەبەر ئەوە هەموو دارێك بە بەرەکەی دەناسرێ. لەدڕك هەنجیر ناکرێتەوە لەتووتڕکیش ترێ ناکرێتەوە. [45]مرۆڤی باش، لەگەنجینەی باشی دڵی، چی باش بێت دەری‌دەهێنێ، مرۆڤی خراپیش، لەگەنجینە خراپەکەی، چی خراپ بێت دەری‌دەهێنێ، چونکە ئەوەی لەدڵ هەڵدەقوڵێ دەم پێی دەدوێ.

**ئەو خانووەی بناغەکەی لە بەردە**

[46](چۆن بانگم دەکەن گەورەم، گەورەم، کەچی کار ناکەن بەوەی من دەیڵێم؟ [47]ئەوەی دێ بۆلام، گوێ لەووتەکانم دەگرێت‌و کاری پی‌دەکات، پێتان دەڵێم لەکێ دەکات. [48]لەمرۆڤێك دەکات خانوویەك دروست دەکات، زەویەکەی هەڵدەکەنێ بەقووڵی، تابناغەکەی لەسەر زەویەکی بەردین دابنێ، ئینجا بارانێکی زۆر دەبارێ‌و لافاو لەخانووەکەی دەدا، بەلام لەشوێنی خۆی نای‌جوڵێنێ. لەبەرئەوەی لەسەر زەویەکی بەردین دارێژراوە. [49]بەلام، ئەوەی گوێی لێ بوو و کاری پی‌نەکرد، لەمرۆڤێك دەکات خانووەکەی لەسەر زەوییەکی بی‌بناغە دروست بکات. کاتێ لافاو لەخانووەکەی دەدا، دەست‌بەجێ دەڕوخێ، ڕوخانێکی تەواو.)

**چاکردنەوەی خزمەتکاری سەرپەلێك**

**7**

دوای ئەوەی عیسا هەموو ووتەکانی دا بەگوێی خەڵکەکەداو تەواوی کرد، چووە شاری کەفەرناحوم. [2]کابرایەکی سەرپەل خزمەتکارێکی نەخۆشی هەبوو لەسەرە مەرگدا بوو، لای خۆشەویست بوو. [3]کاتێ بەهەواڵی عیسای زانی، چەند پیرێکی جوولەکەی ناردە لای بپاڕێنەوە لێی تابێت‌و خزمەتکارەکەی چاك بکاتەوە. [4]کاتێ گەیشتنە لای عیسا بەگەرمی داوایان لێ‌کردو ووتیان: (ئەو پیاوە شایانی ئەوەیە [5]داواکارییەکەی جی‌بەجێ بکەیت، ئەو گەلی ئێمەی خۆش دەوێت‌و

کەنیشتیشی بۆ دروست کردووین.) [6] عیسا لەگەڵیان چوو. هێشتا نەگەیشتبووە نزیكماڵەکە، سەرپەلەکە هەندێ هاوڕێی خۆی نارد کە پێی بڵێن: (گەورەم ئەرك مەکێشە، من شایانی ئەوەنیم، تۆ خۆت بێیتە ماڵەکەم، [7] هەروەها شایانی ئەوە نیم ڕووبەڕووت بمەوە. هەر لەوێوە ووشەیەك بڵێ، ئیشکەرەکەم چاكدەبێتەوە. [8] منیش مرۆڤێکم لەژێر فەرمانی لەخۆم گەورەتر، هەروەها سەربازیشم هەیە لەژێر فەرمانمدان، بەیەکێ دەڵێم، بڕۆ، دەڕوا، بەوی تر دەڵێم، وەرە، دێت، بەئیشکەرەکەم دەڵێم، ئەوە بکە، دەیکات.) [9] کاتێ عیسا گوێی لەمەبوو، سەرسام بوو، ئینجا ڕووی کردە هەموو ئەوانەی دوای کەوتبوون، ووتی: (پێتان دەڵێم، لەهەموو ئیسرائیلدا باوەڕێکی مەزنی وەك ئەمەم نەدیوە) [10] کاتێ ئەوانەی نیرابوون گەڕانەوە، بینیان نەخۆشەکە چاك بووەتەوە.

### زیندووکردنەوەی مردوو

[11] بۆ ڕۆژی پاشتر، عیسا ڕۆیشت بۆ شارێك ناوی نایین بوو زۆربەی قوتابیەکانیو خەڵکێکی زۆری لەگەڵ بوو. [12] کاتێ لەدەروازەی شار نزیك بووەوە، تەرمێکی بینی بەسەر شانەوە، ئەویش کوڕی تاقانەی بێوەژنێك بوو، خەڵکێکی زۆری لەگەڵ بوو. [13] کاتێ خوداوەند ژنەکەی بینی، بەزەیی پیاهاتەوە، پێی ووت: (مەگری.) [14] ئینجا هاتە پێشەوەو دەستی لەدارمەیتەکەدا ، هەڵگرانی تەرمەکە ڕاوەستان. ووتی: (ئەی کوڕی گەنج، بەتۆ دەڵێم، هەستە.) [15] مردووەکە ڕاست بووەوەو دەستی کرد بەقسەکردن، ئیتر عیسا دایەوە دەست دایکی. [16] خەڵکەکە هەموو ترسیان لێنیشت، ئینجا ستایشی خودایانکردو ووتیان: (لەناوماندا پێغەمبەرێکی مەزن دەرکەوتووە، خودا گەلەکەی بەسەرکردەوە!) [17] ئەم هەواڵە لەهەموو ناوچەی یەهودیاو دەوروپشتی بڵاوبووەوە.

### عیساو حەزرەتی یەحیا

[18] قوتابیەکانی یەحیا هەموو ئەم هەواڵانەیان بۆ یەحیا برد. [19] یەحیاش دووان لە قوتابیەکانی بانگ کردو ناردنی بۆ لای خوداوەند، تا لێی بپرسن: (ئایا تۆی ئەوەی کە دێت،

یاخود چاوەڕێی یەکێکیتر بکەین؟)
[20] کاتێ دوو قوتابیەکە هاتنە لای عیسا، ووتیان: (یەحیای لەئاوهەڵکێش ئێمەی ناردۆتە لات، دەپرسێ، تۆی ئەوەی کە چاوەڕێی هاتنی دەکرێ، یاخود چاوەڕێی یەکێکیتر بکەین؟)
[21] لەوکاتەدا عیسا زۆر نەخۆشی چاك کردبووەوە، ڕۆحی پیسی دەرکردبوو، ڕووناکی خستبووە چاوی زۆر لەکوێرەکان. [22] ئینجا عیسا وەڵامی دوو نێرراوەکەی دایەوەو ووتی: (بڕۆن هەواڵ بدەن بەیەحیا، ئەوەی گوێتان لێیبووەو بینیوتانە، کوێر دەبینن، شەلو گۆج دەڕۆنو گولەکان پاكدەبنەوە، کەڕەکان دەبیستن، مردووان زیندوودەبنەوەو هەژاران مژدەیان پێدەدرێ. [23] خۆزگەدەخوازرێ بەوانەی گومانم لێناکەن.)
[24] کە نێرراوانی یەحیا ڕۆیشتن، عیسا دەستیکرد بەقسەکردن دەبارەی یەحیا بۆ خەڵکەکە، ووتی: (چوونە دەشتودەر بۆ بینینی چی؟ قامیشێك با دەیجوڵێنێتەوە؟ [25] ئەی چوون چی ببینن؟ مرۆڤێك بەبەرگی نایابەوە؟ ئەوەتا ئەوانەی بەرگی نایاب دەپۆشن و دەوڵەمەندن وان لەکۆشکی پادشاکانن [26] کەواتە چوون بۆ بینینی چی پێغەمبەرێك؟ بەڵێ پێتان دەڵێم مەزنتر لەپێغەمبەرێك. [27] یەحیا ئەوەیە کە لەکتێبی پیرۆزدا دەربارەی نووسراوە: {من نێرراوی خۆم لەپێشتەوە دەنێرم، ئەوەی ڕێگات بۆ ئامادە دەکات.}) [28] من پێتان دەڵێم لەنێوان ئەوانەی لەئافرەت لەدایك بوون لەیەحیا مەزنتری تیا نییە، بەڵام بچووکترین کەسی پادشاهێتی ئاسمان مەزنترە لەو.) [29] هەموو ئەوانەی گوێیان لێبوو، تەنانەت باجگرانیش دانیاننا بەدادپەروەری خودا، چونکە لەسەر دەستی یەحیا لەئاوهەڵکێشرا بوون. [30] بەڵام فەریسیەکانو مامۆستایانی شەریعەت، بەلووتبەرزیەوە ڕازینەبوون بەخواستی خودا بۆیان، چونکە لەسەر دەستی یەحیادا لەئاوهەڵنەکێشرابوون.
[31] (ئایا ئەم نەوەیە بەچی بەراورد بکەم؟ ئایا لەچی دەکەن؟ [32] ئەوان لەو منداڵانە دەکەن کە لەمەیدانی گشتی دانیشتوون، یەکتری بانگ دەکەنو دەڵێن: (زورنامان بۆ لێدان

کەچی هەڵنەپەڕین، شینمان بۆکردن کەچی نەگریان.) 33یەحیا هات نەنان دەخواو نەمەی دەخواتەوە، ووتتان: (ئەمە ڕۆحی پیسی تیایە.) 34ئینجا ڕۆڵەی مرۆڤ هات دەخواو دەخواتەوە وەك هەموو مرۆڤێك، ووتتان: (ئەمە کابرایەکی زۆرخۆرو سەرخۆشە هاوڕێی باجگرانو گوناهبارانە.) 35بەڵام ڕاستی دانایی بە بەرووبوومی دەردەکەوێ.)

### لێخۆشبوونو خۆشەویستی

36یەکێ لەفەریسیەکان داوای لەعیسا کرد لەماڵەکەی نان بخوات. ئەویش چووە ماڵی فەریسیەکەو لەسەر خوان دانیشت. 37 لەشارەکەدا ئافرەتێکی گوناهبار هەبوو، هەرئەوەندە زانی عیسا لەماڵی فەریسیەکە دانیشتووە، هات بەقاپێ ڕۆنی بۆن خۆشەوە، 38لەبەرپێیدا بەگریانەوە ڕاوەستاو پێیەکانی بەفرمێسك تەڕکردو بەقژی بۆی سڕیەوە، پێی ماچکردو بەڕۆنەکە چەوری کرد.

39کاتێ فەریسیەکە ئەمەی بینی، بەخۆی ووت: (گەر ئەم کابرایە بەڕاستی پێغەمبەر بێت، ئەوا دەزانێ ئەم ئافرەتەی دەستی لێدەدات کێیەو چییە، چونکە گوناهبارە.)

40عیسا وەڵامی دایەوەو پێی ووت: (شەمعون، دەمەوێ شتێکت پێبڵێم.) شەمعون ووتی: (بڵێ مامۆستا.) 41ئەویش ووتی: (یەکێ لەوانەی پارە دەدەن بەخەڵکی، پارەی لای دوو کەس هەبوو، لای یەکێکیان پێنج سەد دینار، لای ئەوی کەشیان پەنجا. 42بەڵام هیچیان نەبوو لەباتی بیدەنەوە، کابرا لەهەردووکیان خۆش بوو. کامیان زیاتر کابرایان خۆش دەوێت؟) 43 شەمعون وەڵامی دایەوە: (لەو باوەڕەدام ئەوەی پارە زۆرەکەی لابوو.) پێی ووت: (بۆ چوونەکەت ڕاستە.) 44ئینجا ڕووی کردە ئافرەتەکەو بەشەمعونی ووت: (ئەم ئافرەتە دەبینیت، من هاتمە ماڵەکەت، کەچی ئاوت نەدامێ پێمی پێبشۆم، بەڵام ئەم بەفرمێسك پێی بۆ شوشتمو بەقژی سەری بۆی سڕیم. 45تۆ ماچت نەکردم، بەڵام ئەم لەوەتەی هاتووم لەماچکردنی پێم ڕانەوەستاوە. 46تۆ سەرت بەڕۆن چەور نەکردم، بەڵام ئەم بەو ڕۆنە گرانبەها بۆن خۆشە پێی چەورکردم.

[47]بۆیـه پێـت دەڵێم: (گوناهی زۆری بەخشـرا، چـونکە زۆر خۆشەویستی دەربـڕی، بـەڵام ئەوەی خۆشەویستی کەمـە، کـەم دەبەخشـرێ.) [48]ئیـنجا بـەئافـرەتەکەی ووت: (گوناهەکانت هەمووی بەخشران.) [49]بەڵام ئەوانەی لـەوێ دانیشـتبوون لـەدڵـی خۆیان ووتـیان: (ئـەمــە کـێـیە تـەنانـەت گوناهــیش دەبەخشــێ؟) [50]لـــەو کـاتــەدا عیسا بە ئافرەتەکەی ووت: (بـــاوەڕت ڕزگـاری کـردی، بــڕۆ بـەدڵـنیـایی.)

## نموونەی جوتیار

# 8

دوای ئەمـە دەسـتی‌کـرد بـە گـەڕان بــەهــەموو شــارو دێهاتــەکان، بــۆ ئامۆژگـــاری‌کـــردنو مزگـــێنی‌دان لــەبارەی پادشاهێتی خوداوە. دوانزە قوتابیەکەشـی لەگەڵدابوو. [2]هەروەها چــەند ئافرەتـێکی لەگـەڵ بـوو کـە لەنەخۆشـــیو ڕۆحـــە پیســـەکان ڕزگاریـان بووبـوو، ئەوانـەش ئەمانە بـــوون، مـــریەم کـــەناودەبـــرا بــەمــەجدەلـی، حــەوت ڕۆحــی شــەیتانی لـــێ دەرکـردبوو، [3]یۆنا ژنــی خــوزی جــێگری هــێرۆدس، لەگـەڵ سـۆســەنو زۆری تریش کە بەماڵو سامانیان یارمەتیان‌دەدا.

[4]کــــاتێ خەڵکـــــێکی زۆر لـــەدەورو پشـــتی عیســا کۆبوونــەوە، لەوانـەی لـەناوچـەکانەوە هاتبوون بۆ لای بەنموونە قسەی بۆ کردنو ووتی: [5](جوتـیار هاتـە دەرەوە بۆ تۆوکردن، لــەکـاتی چـاندندا هـەندێ لەتۆوەکە کەوتــنە ســەر ڕێگــا باریکــەکانی ناوکـێڵگەکە، پێ‌شێل بوونو باڵندەی ئاســمــان خواردنــی. [6]هەندێکیشــیان کەوتـنە سـەر زەوی بـەردەڵان، کاتێ ســەریان دەرکــرد، ووشــك بــوون چــونکە ئاویــان نــەبوو. [7]هــەندێکی کەشیان کەوتنە ناو دڕکەوە دڕکەکان لەگەڵــیان نەشـــونمایان کـــردو خـنکاندیانن. [8]هـەندێ لـەتۆوەکـەش کەوتـە سـەر زەوی چاك، کاتێ ڕووا، سـەد ئـەوەندەی خۆیان بەروبوومیان دا.) ئەمانـەی ووتو هـاواری‌کـرد: (ئەوەی دوو گوێی هەیە بۆ گوێگرتن، باگوێ بگرێت.)

## ڕوونکردنەوەی نموونەی جوتیارەکە

[9]قوتابــیەکانی لێــیان پرســی: (مامۆســتا مەبەســت لــەم نموونەیــە چــییە؟) [10]ئــەویش ووتی: (ئێوە پێتان

دراوە نهێنی پادشاهێتی خودا بزانن، بەڵام ئەوانی تر، بەنموونە بۆیان دەدوێم، چونکە ئەوان سەیردەکەن بەڵام نابینن، گوێ دەگرن بەڵام تێناگەن. [11]ئەمەش مەبەستی نموونەکەیە: تۆوەکە ووشەی خودایە. [12]ئەوەی کەوتە سەر ڕێگا باریکەکان، ئەوانەن کە گوێ لە ووشەی خودا دەگرن، ئینجا شەیتان دێتو ووشەکە لەدڵیان دەردەهێنێت، نەوەك باوەڕبهێننو ڕزگاریان بێت. [13]ئەوەش کە کەوتە سەر زەوییە بەردەڵانەکە، ئەوانەن کە ووشەی خودا بەخۆشییەوە وەردەگرن، ئەمانە ڕەگیان نییە، باوەڕدەهێنن تا ماوەیەك، کاتێ دەکەونە تاقیکردنەوە، هەڵدەگەڕێنەوە. [14]ئەوانەی کەوتنە جێ دڕکاویەکە، ئەوانەن کە گوێیان لەووشەی خودا دەبێتو دەڕۆن، ئینجا دەردەسەری ژیانو هەوڵی بەرزبوونەوەو خۆشی ژیان دەیان خنکێنێو هیچ بەرووبوومێکی چاك دەرناکەن. [15]بەڵام ئەوانەی کەوتە سەر زەویە چاکەکە، ئەوانەن کە ووشەکە دەخەنە دڵی چاكو باشیانەوەو لەسەری دەڕۆن، کۆشش دەکەن تابەرووبووم دەدەن.)

**چرا وەك نموونەیەك**

[16](خەڵکی چرا هەڵناکاو بەتەشت دایپۆشێ، یان بیخاتە ژێر نوێنەوە، بەڵکو لەسەر بەرزاییەك دایدەنێ، تاکو ئەوانەی دێنە ژوورەوە ڕووناکییەکە ببینن. [17]چونکە هیچ شاراوەیەك نییە ئاشکرا نەبێ، هەروەها هیچ نهێنییەك نییە نەزانرێو نەووترێ. [18]کەواتە بزانن چۆن گوێ دەگرن. ئەوەی هەیەتی زیاتری پێ دەدرێ، ئەوەش کە نیەتی، تەنانەت ئەوەش کە بەهی خۆی دەزانێ لێی دەسەنرێتەوە.)

[19]ئینجا دایكو براکانی عیسا هاتن بۆ لای، بەڵام لەبەر زۆری خەڵکەکە نەیانتوانی بگەنە لای. [20]پێیان ووت: (دایکتو براکانت لەدەرەوە ڕاوەستاون، دەیانەوێ بتبینن.) [21]وەڵامی دانەوە، ووتی: (دایك و برام ئەوانەن کە گوێ لەووشەی خودا دەگرنو کاری پێدەکەن.)

**عیسا ڕەشەبا هێمن دەکات**

[22]ڕۆژێ لەڕۆژان عیساو

قوتابییەکانی سواری بەلەمێك بوون، پێی ووتن: (با بپەڕینەوە بۆ ئەوبەری دەریاچەکە.) ئەوانیش دەستیان کرد بەجولاَن بۆ ئەوبەر. [23]لەکاتێکدا بەناو ئاوەکەدا دەڕۆیشتن، عیسا نووست. لەپڕ ڕەشەبایەك هەڵیکردە سەر دەریاچەکە، بەلەمەکە پڕبوو لەئاو، کەوتنە بارێکی ترسناکەوە. [24] چوونە لای عیساو خەبەریان کردەوەو ووتیان: (گەورەم، گەورەم، وا ئێمە تیا دەچین!) ئەویش هەستاو سەرزەنشتی شەپۆڵەکانی کرد، دەستبەجێ هەموو شتێ ئارام بووەوەو بێدەنگ بوو. [25]ئینجا پێی ووتن: (کوا باوەڕتان؟) ئەوانیش زۆر سەرسام بوونو ترسان، یەك بەیەکیان ووت: (ئەمە کێیە تەنانەت بەڕەشەباو شەپۆڵەکان فەرمان دەداو گوێڕایەڵن بۆی؟)

**دەرکردنی ڕۆحی پیس**

[26]ئینجا گەیشتنە هەرێمی جەراسین، کە کەوتۆتە بەرامبەر جەلیل. [27]کاتێ عیسا دابەزیە سەر ووشکانی، پیاوێکی ئەو شارەی بینی، ماوەیەکی زۆر بوو ڕۆحی پیسی تێدا بوو، جلی لەبەر نەدەکردو لەخانوو نەدەژیا، ژیانی لەناو گۆڕستان بەسەردەبرد. [28]کاتێ عیسای بینی، هاواری کردو لەبەردەمی کەوت، بەدەنگی بەرز ووتی: (چیت لەمن دەوێ ئەی عیسای ڕۆڵەی خودای گەورە؟ لێت دەپاڕێمەوە ئازارم مەدە.) [29]چونکە عیسا فەرمانی بە ڕۆحە پیسەکە دابوو، تاکو لەپیاوەکە بێتە دەرەوە. لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆربوو دەستی بەسەرداگرتبوو، هەرچەندە بەزنجیر دەبەسترایەوەو ڕادەگیرا، بەڵام زنجیری دەپچڕیو لەلایەن ڕۆحە پیسەکەوە دەبرایە چۆڵەوانی. [30]عیسا لێی پرسی: (ناوت چییە؟) ووتی (لیجیۆن.) چونکە لەشکرێکی شەیتانی تێچوو بوو، [31]ئینجا ڕۆحە پیسەکان لە عیسا پاڕانەوە کە دەریان نەکاو نەیان نێرێت بۆ بیری بێبن. [32]لەوناوەدا ڕانە بەرازێکی گەورە دەلەوەڕان لەقەراغی شاخێکدا، ڕۆحە پیسەکان لێیپاڕانەوە کەڕێیان بدات بچنە ناو بەرازەکانەوە، ئەویش ڕێیدان. [33] ڕۆحە پیسەکان لە پیاوەکە هاتنە دەرەوەو چوونە ناو بەرازەکانەوە، ئینجا ڕانە بەرازەکە کەوتنە ڕاکە ڕاکەو لە قەراغی شاخەکەوە

هەڵدێـران بـۆ نـاو دەریاچـەکەو خـنکان. [34]کـاتێ شـوانەکان ئـەم ڕووداوەیان بینی، ڕایان کرد بۆ شارو بـۆ کـێڵگەکان تـا ئـەم هەواڵـە بڵاوبکەنـەوە. [35]خەڵکەکـە هاتـنە دەرەوە تـا ئەوەی ڕووی داوە ببینن، هاتن بۆ لای عیسا، ئەو پیاوەی ڕۆحە پیسـەکانی تـیابوو بینیـیان لەبـەر پێی عیسـادا دانیشـتووە بـە پۆشـتەییو بەهێمنییەوە گوێی گرتووە، دوای ئەمە خەڵکەکە ترسیان لـێ نیشت.

[36]ئەوانـــەی ڕووداوەکـــەیان بینیبوو، بۆ خەڵکەکـەیان گێڕایەوە، چـی ڕوویـداوەو چـۆن ئـەو کابرایە چـاك بووەتـەوە. [37]ئینجا دانیشتوانی هـەرێمی جەراسـین بەگشتی، داوایان لـە عیسـا کرد، وازیان لـێ بهێنێتو بـڕوات، چـونکە ترسـێکی زۆریان لـــێ نیشـتبوو، ئـەویش سـواری بەلەمـێك بـوو تاکو بگەڕێتەوە بەری ئەوبەر. [38]پیاوەکەی ڕۆحە پیسەکانی لـێ دەرکـرا بـوو، لـەعیسـا پاڕایەوە ڕێی بـدات لەگەڵی بڕوات، بەڵام ئەو ڕەوانـەی کردو ووتی: [39](بگەڕێوە بۆ ماڵـەوەو ئـەوەی خودا بۆی کردی، بیگـێڕەوەو باسـی بکە.) ئـەویش بەهـەموو شـارەکەدا گـەڕاو ئـەوەی عیسا بۆی کردبوو، دەیگێڕایەوە.

**دوو کاری سەرسووڕهێنەر**

[40]کـاتێ عیسـا گەڕایـەوە بـەری ئەوبـەر، هـەموو پێشـوازییان لێ کرد، لەبەرئـەوەی هـەموویان چـاوەڕێیان دەکرد. [41]پیاوێك ناوی یایرۆس بوو، سـەرۆکی کەنیشـتبـوو، هـاتو لەبەرپـێی عیسـادا کـەوتو لـێی پاڕایـەوە تـا لەگـەڵی بـڕوات بـۆ ماڵەکـەی، [42]چـونکە تاقە کچەکەی کـەتەمـەنی دوانـزە سـاڵ بـوو لـەسـەرەمەرگدابـوو. کـاتێ عیسـا دەڕۆیشت بۆ ئەوێ هەموو کۆمەڵێیان لـێ دابوو. [43]لـەوێدا ژنـێك هەبوو، مـاوەی دوانـزە سـاڵ بـوو خوێـن لـێ چـوونی هـەبوو، ئـەوەی هەیبوو دابـووی بـەپزیشـك، بـەڵام لەسـەر دەستی کەس چاك نەبووبووەوە. [44]چـووە پێشـەوە لـەعیسـاو لـەدواوە دەسـتی دا لەچـمکی کراسـەکەی، دەسـتبـەجێ خوێـن لێ چوونەکەی ڕاوەسـتا. [45]عیسـا ووتـی: (کێ بوو دەسـتی لـــێ دام؟) کـاتێ هـەموو نکۆڵـیان کـرد، پەتـرۆس ووتـی: (گـەورەم هـەموو لەدەورووپشـتتن‌و پاڵەپەستۆ دەکەن، کەچی تۆ دەپرسی

کێ دەستی لێدام؟) [46]عیسا ووتی: (یەکێ بەمەبەستەوە دەستی لێدام، چونکە هەستم بە هێزێك کرد لێم چووە دەرەوە.) [47]کاتێ ژنەکە زانی کارەکەی ناشاردرێتەوە، بەلەرزەوە هاتە پێشەوە، چۆکی داداو لەبەرچاوی هەمووان پێی ووت، بۆچیو لەبەرچی دەستی لێوە داوەو چۆن دەستبەجێ چاك بووەتەوە، [48] ئینجا عیسا بەژنەکەی ووت: (خوشکە باوەڕت بوو چاکی کردیتەوە، بڕۆ بەدڵنیایی.) [49] کاتێ عیسا قسەی دەکرد یەکێ لەماڵی سەرۆکی کەنیشتەوە هات، بە سەرۆکی کەنیشتەکەی ووت: (کچەکەت مرد، ئیتر ئەرك مەخەرە بەر مامۆستا.) [50]عیسا کە ئەمەی بیست، قسەی لەگەڵ کردو ووتی: (مەترسە تەنها باوەڕت هەبێ، کچەکەت چاك دەبێتەوە.) [51]کاتێ عیسا گەیشتە ماڵەکە نەیهێشت کەس لەگەڵی بێتە ژوورەوە تەنها پەترۆسو یۆحەناو یاقوبو باوکو دایکی کچەکە نەبێت. [52]خەڵکەکە دەگریانو شینو شەپۆڕیان بۆ دەکرد، ئەویش ووتی: (مەگرین ئەو نەمردووە، بەڵکو نووستوە.) [53] خەڵکەکە پێی پێکەنین، چونکە دەیانزانی مردووە. [54]بەڵام دوای ئەوەی هەموویانی دەرکردە دەرەوە دەستی کچەکەی گرت، بانگی کردو ووتی (ئەی کیژۆڵە، هەستە!) [55]ئیتر ڕۆحی هاتەوە بەرو دەستبەجێ هەستا، ئەوسا فەرمانیدا نانی بۆ بێنن. [56]باوکو دایکەکە زۆر سەریانسوڕما، بەڵام عیسا ڕایسپاردن، ئەوەی ڕوویداوە جارێ بەکەسی نەڵێن.

## عیسا دوانزە نێرراوەکە دەنێرێ

# 9

دوای ئەوە عیسا هەردوانزە قوتابییەکەی کۆکردەوە، هێزو دەسەڵاتی چاکبوونەوەی دانێ بەسەر هەموو نەخۆشیو ڕۆحە پیسەکان، [2] ئینجا ناردنی تا مزگێنی پادشاهێتی خودا بدەنو نەخۆش چاك بکەنەوە. [3]پێی ووتن: (بۆ ڕێگا هیچ لەگەڵ خۆتان هەڵمەگرن، نەتوورەکە، نەداردەست، نەخواردن، نەنانو نەپارە، کەسیش دوو دەست جل نەبات لەگەڵ خۆی. [4]چوونە هەر ماڵێك لەوێ بمێننەوەو هەر لەوێشەوە بکەونە ڕێگا. [5]لەهەر شوێنێك

پێشوازیان لێ‌نەکردن، لەوێ بڕۆن‌و تۆزی پێتان بتەکێنن تا شایەت بێ بەسەریانەوە.) [6]ئەوانیش بە لادێکاندا گەڕان، مزگێنیان‌دەداو نەخۆشیان لەهەموو لایەك چاك دەکردەوە.

**سەرسامی هێرۆدس**

[7]هێرۆدس کە فەرمانڕەوای ناوچەکە بوو، ئەمانەی هەموو بیستەوەو سەری سوڕما، چونکە هەندێ کەس دەیان ووت، یەحیا لەناو مردووان زیندووبۆتەوە، [8]هەندێ کەسی تریش دەیان ووت، ئەلیاسەو گەڕاوەتەوە، کەسانی تریش دەیان ووت، یەکێ لەپێغەمبەرانی کۆنەو زیندووبۆتەوە. [9]ئینجا هێرۆدس ووتی: (من خۆم سەری یەحیام لێ‌کردەوە، بەڵام ئەمە کێیە ئەم شتانەی لێ دەبیستم؟) لەبەرئەوە زۆر حەزی دەکرد بە چاوی خۆی بیبینێت.

**عیسا پێنج هەزار کەس نان‌دەدا**

[10]کاتێ نێرراوان گەڕانەوە، هەموو ئەوکارانەی کردبوویان بۆ عیسایان گێڕایەوە، ئەویش بەتەنها ئەوانی لەگەڵ خۆی برد بۆ شارێك ناوی بەیت‌سەیدا بوو. [11]بەڵام خەڵکەکە پێیان‌زانی‌و دوای کەوتن، ئەویش پێشوازی‌کردن‌و باسی پادشاهێتی خودای بۆ کردن، ئەوانەش کە نەخۆشیان هەبوو، پێویستیان بەچاك‌کردنەوەبوو، چاکی‌کردنەوە. [12]کاتێ ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەچوو، هەر دوانزەکە هاتن‌و پێیان ووت: (خەڵکەکە بەرێکە بابڕۆن بۆ ئەم کێڵگەو لادێ نزیکانە، تاکو لەوێ بمێننەوەو خواردنیش بۆ خۆیان پەیدا بکەن، چونکە ئێمە لێرەدا لەچۆڵەوانین.) [13]ئەویش پێی ووتن: (ئێوە نانیان بدەنێ.) وەڵامیان دایەوە: (لەپێنج نان‌و دوو ماسی زیاترمان نییە، مەگەر بڕۆین بۆ ئەم هەموو خەڵکە نان بکڕین.) [14]لەوێدا خەڵکەکە نزیکەی پێنج هەزار کەس دەبوون، ئینجا بەقوتابیەکانی ووت: (کۆمەڵ کۆمەڵ دایان نیشێنن، با هەر کۆمەڵەی پەنجا کەس بێت.) [15]ئەوانیش ئەمەیان‌کرد، هەموو دانیشتن. [16]عیسا پێنج نان‌و دوو ماسیەکەی هەڵگرت‌و چاوی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە، سوپاسی خودای‌کردو نانەکانی لەت‌کرد، دای بەقوتابیەکانی تابیدەن

بەخەڵکەکە. [17]ئیتر هەموو نانیان خواردو تێربوون. لەدواییدا دوانزە سەبەتە لەتەنانیان لێ‌مایەوە.

**پەترۆس ڕاستی عیسا دەردەخات**

[18]لەکاتێکدا عیسا بەتەنها نوێژی دەکرد لەگەڵ قوتابییەکان، لێی‌پرسین: (خەڵکەکە دەڵێن من کێم؟) [19]وەڵامیان دایەوە: (هەندێکیان دەڵێن یەحیای خەڵك لەئاوهەڵکێشیت، هەندێکی تریش دەڵێن ئەلیاسیت، کەسانی تریش دەڵێن، یەکێکی لەپێغەمبەرانی کۆنو زیندووبویتەوە.) [20]لێی‌پرسین: (ئەی ئێوە، دەڵێن من کێم؟) پەترۆس وەڵامی دایەوە: (تۆ مەسیحی خودای.) [21]بەڵام عیسا ئاگاداری کردنەوەو ڕای‌سپاردن جارێ ئەمە بەکەس نەڵێن.

**باسی مردنو هەستانەوەی عیسا**

[22]هەروەها ووتی: (پێویستە ڕۆڵەی مرۆڤ زۆر ئازار بکێشێ، پیرانو سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت ڕەتی‌بکەنەوە، بکوژرێو لەڕۆژی سێهەمدا هەستێتەوە.)

[23]ئینجا بەهەمووانی ووت: (گەر یەکێك ویستی بەدوامەوە بڕوات، باواز لەخۆی بهێنێو هەموو ڕۆژێ خاچەکەی بەکۆڵەوە بێتو بەدوامەوە بڕوات. [24]ئەوەی دەست بەژیانیەوە بگرێ، دەیدۆڕێنێ، ئەوەش ژیانی لەپێناوی من دەدۆڕێنێ، ئەو دەیباتەوە. [25]چونکە چی بەکەڵکی مرۆڤ دێت، گەر هەموو جیهان بەرێتەوەو خۆی بدۆڕێنێ؟ [26]هەر کەسێك شەرمی بەمنو بەووتەکانم بێت، ئەوا ڕۆڵەی مرۆڤیش شەرمی پێی‌دەبێت، کاتێ دەگەڕێتەوە بەشکۆمەندی خۆیو باوكو فریشتە پیرۆزەکانەوە. [27]بەڵام واپێتان دەڵێم بەڕاستی، ئا لێرەدا لەنێوان ئەوانەی ڕاوەستاون هەندێکی تێدایە مردن ناچێژن هەتا پادشاهێتی خودا دەبینن. )

**شێوە گۆڕانی عیسا**

[28]نزیکەی هەشت ڕۆژ دوای ئەم ووتانە، عیسا پەترۆسو یۆحەنناو یاقوبی لەگەڵ خۆی بردو سەرکەوتنە سەرکێوێك بۆ نوێژکردن. [29]لەکاتێکدا عیسا نوێژی دەکرد، ڕەنگی دەموچاوی گۆڕاو جلەکانی سپی‌و بریسکەداربوو. [30]دووان

لەگەڵی دەدوان، یەکێکیان موساو ئەوی کەشیان ئەلیاس بوو. [31] بەشکۆوە دەرکەوتن و لەبارەی دەرچوونی لەجیهان دوان کە ئەوەندەی نەمابوو ڕووبدات لەقودس. [32] پەترۆس و هاوڕێکانی خەویان لێکەوتبوو، بەڵام کاتێ خەبەریان بووەوە شکۆی عیساو ئەودوو پیاوەیان بینی کە لەگەڵی وەستابوون. [33] لەکاتێکدا خەریك بوو موساو ئەلیاس لەعیسا جیاببنەوە، پەترۆس بە عیسای ووت: (ئەی مامۆستا، باشتر وایە لێرە بمێنینەوە. با سێ چادرتان بۆ هەڵبدەین، یەکێ بۆ تۆ، یەکێکیش بۆ موسا، ئەوەی کەش بۆ ئەلیاس.) ئەمەی ووت بێئەوەی بزانێ چی دەڵێ. [34] کاتێ پەترۆس لەم قسانەدابوو، هەورێك هات و کشا بەسەریان، ئەمانیش کاتێ هەورەکە دەوروپشتی لێگرتن، ترسان. [35] دەنگێ لەناو هەورەکەوە هات و ووتی: (ئەوەتا ڕۆڵەی من ئەوەی هەڵبژاردەی خۆمە، گوێی بۆ ڕابگرن.) [36] دوای ئەوەی دەنگەکە ئەمەی ووت، قوتابیەکان بەتەنها هەر عیسایان بینی. ئەم هەواڵەیان بەنهێنی هێشتەوەو چیان بینیبوو لەو ڕۆژانەدا بەکەسیان نەووت.

**دەرکردنی شەیتان**

[37] بۆ بەیانی، کە لەکێوەکە هاتنە خوارەوە، خەڵکێکی زۆر بەرەو پیریان هات. [38] لە نێوان خەڵکەکەدا پیاوێك دەنگی بەرزکردەوەو ووتی: (مامۆستا، لێت دەپاڕێمەوە سەیری کوڕەکەم بکە، ئەمە تاقە کوڕمە. [39] ئەوەتا ڕۆحێکی پیسی تیایەو دەستی بەسەرداگرتووە، لەپڕ هاوار دەکات، ئینجا ڕۆحەکە ڕایدەتەکێنێ و کەف لەدەمی دەردەکا تا نەیکوتێ بەزەویدا وازی لێناهێنێ. [40] لەقوتابیەکانت پاڕامەوە تادەریکەن، بەڵام نەیانتوانی.) [41] عیسا وەڵامیدایەوەو ووتی: (ئەی نەوەی بێ بڕواو لارو چەوت، تاکەی لەگەڵتان بمێنمەوەو بارتان هەڵگرم؟) بەپیاوەکەی ووت: (کوڕەکەت بهێنە ئێرە.) [42] لەکاتێکدا کوڕەکە دەهات، ڕۆحە پیسەکە کوتای بەزەویدا بەتوندی ڕایتەکاند، دوای ئەمە عیسا ڕۆحە پیسەکەی دەرکرد، کوڕەکە چاك بووەوەو دایەوە دەست باوکی. [43] خەڵکەکە هەمووی لەتوانای مەزنی خودا سەرسام بوون.

کاتێ خەڵکەکە سەرسام مابوون، لە هەموو ئەو شتانەی عیسا کردی، عیسا بەقوتابیەکانی ووت: [44](با ئەم ووشانە بچێتە گوێتانەوە، ڕۆڵەی مرۆڤ خەریکە بدرێتە دەستی خەڵکی.) [45]بەلاّم ئەوان ئەمە تێنەگەیشتن، شاراوەبوو لێیان، هەروەها ترسان پرسیاری لێبکەن.

**گەڕان بەدوای پلەو پایەدا**

[46]گفتوگۆیەك لەنێوانیان پەیدا بوو سەبارەت بەوەی کامیان مەزنترە. [47]عیسا بەنیازی دڵیانی زانی، منداڵێکی بچکۆڵەی لای خۆیەوە ڕاگرت‌و [48]پێی ووتن: (ئەوەی بەناوی منەوە پێشوازی لەم منداڵە بکات، ئەوا پێشوازی لە من دەکات، ئەوەش پێشوازی لەمن دەکات، ئەوا پێشوازی لەوە دەکات کە ناردوومی. چونکە بچووکترینی هەمووتان مەزنترینتانە.)

**ئەوەی دژمان نییە لەگەڵمانە**

[49]یۆحەننا دەستی کرد بەقسەکردن‌و ووتی: (گەورەم، یەکێکمان بینی بەناوی تۆوە ڕۆحی پیسی دەردەکرد، ئێمەش نەمانهێشت لەبەرئەوەی لەگەڵمان دوات ناکەوێ.) [50]عیسا پێی ووت: (ڕێی لێمەگرن، گەر یەکێك بەربەرەکانی نەکردن ئەوا لەگەڵتانە.)

[51]کاتێ خەریك بوو ڕۆژانی لەخاچدانی نزیك بێتەوە، بڕیاری دا بەرەو قودس بڕوات. [52]لەپێشییەوە چەند نێرراوێکی نارد، ڕۆیشتن‌و چوونە لادێیەکی سامریەکانەوە تاکو شوێنێکی بۆ ئامادە بکەن. [53]بەلاّم ئەوان بەپێشوازیکردنی ڕازی نەبوون، چونکە بەرەو قودس دەچوو. [54]کاتێ یاقوب‌و یۆحەننای قوتابیانی ئەمەیان بینی، ووتیان: (گەورەم، دەتەوێ داوا بکەین تا ئاگر لەئاسمانەوە بێتە خوارەوە لەناویان بەری؟) [55]ئەویش ئاوڕی لێ دانەوەو سەرزەنشتی کردن. [56]ئینجا ڕۆیشتن بۆ دێیەکی تر.

**نرخی دواکەوتنی عیسا**

[57]کاتێ بەرێدا دەڕۆیشتن، یەکێ پێی ووت: (گەورەم بۆ هەرکوێ بڕۆیت دوات دەکەوم.) [58]عیساش پێی ووت: (ڕێوی کونی هەیەو باڵندەی ئاسمان هێلانە، بەلاّم ڕۆڵەی مرۆڤ تەنانەت جێگایەکی نییە سەری

بخاته سەر.) [59] بەیەكێكی كەی ووت: (دوام كـەوە.) ئەمـەیان ووتـی: (گـەورەم ڕێگـەم بـدە بابرۆم باوكم بنـێژم.) [60] عیسـاش پێی ووت: (واز لەمـردووان بهێـنە بـا مردووەكانیان بنـێژن، بـەلاّم تـۆ بـڕۆ مزگێـنی پادشـاهێتی خودا بدە.) [61] یەكێكی‌تر پـێی ووت: (گـەورەم، من لـەگەڵت دێـمو دوات دەكـەوم، بەلاّم ڕێگەم بـدە یەكەمجار ماڵئاوایی لەخێزانەكەم بكـەم.) [62] عیسـاش پێی ووت: (هەر كەسـێك دەسـت لەسـەر گاسـن دابـنێ‌و ئاوڕبداتـەوە بـۆ دواوە، بەكەڵكی پادشاهێتی خودا نایەت.)

## عیسا حەفتا كەسی‌تر دەنێرێ

# 10

پـاش ئەمـە خوداوەنـد حەفـتا كەسـی‌كـەی دەست‌نیشان‌كرد، دوو دوو ناردنی، تاكو پێش ئەو بڕۆن بۆ هـەموو شـارو جـێگایەك كە خەریك بوو بۆی دەڕۆیشت. [2] جا پێی ووتن: (دروێـنە زۆرە بـەلاّم كـرێكار كەمە، داوا لەگـەورەی دروێـنە بكـەن تـا كرێكار بۆ دروێنەكەی بنێرێ. [3] بڕۆن ئـەوا من دەتان‌نێرم وەك بەرخ بۆ ناو گـورگ. [4] نەكیسـەی پـارە لـەگـەڵ خۆتـان بـەرن نەتوورەكـە نەپـێڵاو، لـەڕێگا سـلاّو لـەكـەس مەكـەن. [5] چوونە هەر ماڵێكیش، یەكەمجار سلاّو بكەن‌و بڵێن: با ئاشتی لەم ماڵە بێت، [6] گـەر لەماڵەكـەدا ئاشـتی‌خـوازی تیابێـت، ئـەوا شـایانی ئەو ئاشتیەن. گەر نەشبێت ئەوا سلاّوەكە بۆ خۆتان دەگەڕێـتەوە. [7] لـەو ماڵـە بمێنـنەوەو لەوەی هەیانە بخۆن‌و بخۆنەوە، چونكە كـرێكار شـایانی ئەوەیـە كرێی خۆی وەرگـرێ. ئـەوەندە ماڵـەو ماڵـیش مەكـەن. [8] چـوونە هـەر شارێك، كە دانیشـتوانی پێشـوازی لـێ‌كـردن، ئـەوەی دەتـاندەنێ بـیخۆن. [9] ئـەو نەخۆشـانەی تیایەتی چاكی بكەنەوەو پێـیان بڵـێن پادشـاهێتی خـودا نزیك بووەتـەوە، [10] لـەهـەر شـارێكیش خەڵكەكـەی نەیانویسـتن بـڕۆنە سەر شـەقامەكانی‌و بڵـێن: ([11] وا ئـێمە تەنانـەت تـۆزی شـارەكەتان كـە بـەپێمانەوەیە دەیتەكێنینەوە بەسەرتان، بـەلاّم ئـەوە بـزانن: پادشاهێتی خودا نزیك بووەتەوە.)، [12] من پێتان دەڵێم: (شـاری سـەدوم* لـەڕۆژی دوایـیدا ناخۆشـیو ئـازاری كـەمترە لـەو شارانەی كە ئێوەی لێ دەردەكرێن.

([13] خاك بەسەرت ئەی كورەزین!

خاك بەسەرت ئەی بەیتسەیدا! گەر لە سورو سەیدا ئەو كارە سەرسوڕهێنەرانە بكرایە كە لەلای ئێوە كرا، خەڵكەكەی هەر لەزووەوە تۆبەیان دەكردو خۆیان لەخۆڵەمێش وەردەداو جلی ماتەمداریان لەبەردەكرد. [14] بەڵام لەرۆژی لێپرسینەوەدا چارەنووسی سورو سەیدا لەئێوە باشتر دەبێ. [15] تۆش ئەی كەفەرناحوم، دەتەوێ بڵند بیتەوە تا ئاسمان؟ نەخێر، تۆ دەكەویتە قوولاییی دۆزەخەوە.

([16] ئەوەی گوێتان بۆ رادەگرێ، گوێ بۆ من رادەگرێ، ئەوەی رەتتاندەكاتەوە ئەوا من رەتدەكاتەوە، ئەوەش من رەتدەكاتەوە، ئەوە رەتدەكاتەوە كە منی ناردووە.)

### گەڕانەوەی نێرراوان

[17] دوای ئەمە هەر حەفتا كەسەكەی ناردبوونی بەشادیەوە گەڕانەوەو ووتیان: (گەورەم، تەنانەت رۆحە پیسەكانیش بەناوی تۆوە ملكەچمانن.) [18] ئەویش پێی ووتن: (شەیتانم دی وەك بروسكە لەئاسمانەوە هەڵدێرا بۆ خوارەوە. [19] ئەوەتا من دەسەڵاتم داونەتێ پێ بنێن بەمارو دووپشكو هێزی دوژمن، هیچ شتێكیش ئازارتان نەدات. [20] بەڵام دڵخۆش مەبن بەوەی رۆحەكان ملكەچتانن، بەڵكو دڵخۆش بن بەوەی ناوتان لە ئاسماندا نووسراوە.)

### دەرخستنی نهێنی بۆ هەژاران

[21] لەوكاتەدا عیسا بەرۆحی پیرۆز زۆر شادومانبوو، ووتی: (سوپاسدەكەم ئەی باوك، خوداوەندی ئاسمانو زەوی، چونكە ئەم كارانەت لەداناو زانایان شاردۆتەوە بۆ منداڵانت ئاشكراكردووە. بەڵێ ئەی باوك لەبەرئەوەی بەلاتەوە واباشترە!

[22] (هەموو شتێك لەلایەن باوكمەوە دراوە پێم، كەس نازانێ رۆڵە كێیە باوك نەبێ، كەسیش نییە بزانێ باوك كێیە تەنها رۆڵەو ئەوە نەبێ، كە رۆڵە دەیەوێ بۆی ئاشكرا بكات.) [23] ئینجا ئاوڕی لەقوتابییەكانی دایەوەو بەتەنها بەوانی ووت: (خۆزگەدەخوازرێ بە چاوتان، بەوەی ئێستا دەیبینن. [24] من پێتان

دەڵێم، زۆر لەپێغەمبەرانو پادشایان، ئاواتەخوازی بینینی ئەوە بوون کە ئێوە ئێستا دەیبینن، بەڵام نەیان بینی، هەروەها بیستنی ئەوەی ئێوە ئێستا دەیبیستن، بەڵام نەیانبیست.)

**سامریە دڵ پڕ لەبەزەییەکە**

[25] یەکێ لەزانایانی شەریعەت لێی هاتەپێشەوە، بۆ ئەوەی تاقیبکاتەوە، ووتی: (مامۆستا چی بکەم بۆ ئەوەی ژیانی هەتاهەتایی بەدەست بهێنم؟) [26] ئەویش پێی ووت: (چی نووسراوە لەتەورات، چۆن دەیخوێنیتەوە؟)

[27] وەڵامی دایەوە: ({خوداوەند خودات خۆشبوێ بەهەموو دڵو هەموو گیانو هەموو تواناو هەموو بیرتەوە، هەروەها ئەوەی لێت نزیکە وەك خۆت خۆشت بوێ.}) [28] عیسا پێی ووت: (وەڵامەکەت ڕاستە. گەر هاتوو کارت پێکرد ژیانی هەتاهەتایی بەدەست دەهێنی.)

[29] بەڵام پیاوەکە ویستی خۆی بە کابرایەکی ڕاستودروست دەرخات، دیسان لەعیسای پرسی: (باشە کێیە ئەوەی لێم نزیکە؟) [30] عیسا وەڵامی دایەوە ووتی: (مرۆڤێك لەقودسەوە بۆ ئەریحا دەچوو، کەوتە دەست چەند دزێکەوە، پارەو جلەکانیان لێسەندو ئازاریان داو برینداریان کرد، ئینجا بە نیوە مردوویی بەجێیانهێشتو ڕۆیشتن. [31] وا ڕێکەوت کاهینێك لەهەمان ڕێگەوە بڕوات، کاتێ ئەوی بینی، چووە ئەوبەری ڕێگاکە دوور لەبریندارەکەو بەجێیهێشت. [32] هەروەها کابرایەکی لاویش، لەوێوە تێپەڕی، کاتێ گەیشتە ئەو شوێنە، سەیری کرد، ئەویش چووە ئەوبەری ڕێگاکەو بەجێیهێشت. [33] بەڵام کابرایەکی سامری کە لەوێوە دەڕۆیی، هاتەسەری، کاتێ بینی بەزەیی پیاهاتەوە، [34] چووە پێشەوە لێی، دوای ئەوەی ڕۆنو شەرابی بەسەر برینەکانیکردو تیماریکرد، سواری وولاخەکەی خۆیکردو گەیاندیە میوانخانەیەكو لەوێ چاودێریکرد. [35] ڕۆژی دووەم کاتێ میوانخانەکەی بەجێ دەهێشت، دوو دیناری دەرکردو دای بەخاوەن میوانخانەکەو پێی ووت: (چاودێری بکە چەندی تریشی پێویست بوو، کە گەڕامەوە دەیدەم.) [36] کامیان لەم سیانە بەنزیك دەزانی بۆ ئەوەی

کەوتە دەست دزەکان؟) 37 وەڵامی دایەوە: (ئەوەی بەبەزەییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردو یارمەتیدا.) ئینجا عیسا پێی ووت: (تۆش برۆ هەمان شت بکە.)

38 کاتێ بەڕێگاوە بوون چوونە دێیەك، ژنێك ناوی مەرسا بوو، پێشوازی لێ‌کردو بردییە ماڵەکەی خۆی. 39 خوشکی ئەم ژنە ناوی مریەم بوو، لەبەرپێی دانیشت بۆ ئەوەی گوێ لەووتەکانی بگرێت، 40 بەڵام مەرسا سەرقاڵیشت ئامادەکردن بوو، هاتو ووتی: (گەورەم سەیر ناکەیت خوشکم بەجێیهێشتووم کارەکان بەتەنها بکەم؟ پێی بڵێ با بێت یارمەتیم بدات.) 41 بەڵام عیسا وەڵامی دایەوەو ووتی: (مەرسا، مەرسا، تۆ سەرقاڵو شێواوی دەربارەی زۆر شت. 42 بەڵام تەنها یەك شت پێویستە، مریەم شتە باشەکەی هەڵبژاردووە، ئەوەی لێی ناسەنرێتەوە.)

## فێرکردن دەربارەی نوێژ

## 11

عیسا لەشوێنێکی دیاریکراو نوێژی دەکرد، کاتێ تەواوبوو یەکێ لەقوتابیەکانی پێی ووت: (گەورەم نوێژکردنمان فێربکە هەروەك یەحیا قوتابیەکانی فێرکرد.) 2 ئەویش پێی ووتن: کاتێ نوێژ دەکەن بڵێن: (ئەی باوکمان لەئاسمان با ناوت پیرۆز بێت، با پادشاهێتیەکەت بێت، 3 نانی رۆژانەمان هەموو رۆژێك بدەرێ. 4 لەگوناهمان خۆش بە، چونکە ئێمەش لە گوناهی ئەوانە خۆش دەبین، کە هەڵەمان بەرامبەر دەکەن. مەمانخەرە تاقیکردنەوە.)

5 ئینجا پێی ووتن: (گەر یەکێ لەئێوە هاوڕێیەکی هەبێت لەنیوە شەودا بڕوا بۆ لایو پێی بڵێ هاوڕێم، سێ نانم بەقەرز بدەرێ، 6 هاوڕێیەکم لەدوورەوە هاتووە بۆ لام، هیچم نییە بیدەمێ، 7 بەڵام هاوڕێیەکەی لەدیوی ژوورەوە وەڵامی بداتەوە: (هەراسانم مەکە دەرگام داخستووە، ئەوەتا خۆمو منداڵم لەناو جێگادابین ناتوانم هەستمو بتدەمێ.) 8 من پێتان دەڵێم: (گەر بێتو ئەو کەسە هەڵنەستێ بیداتێ لەبەر هاوڕێیەتی، لەپاشان هەر هەڵدەستێو بەپێی پێویست دەیداتێ، لەبەر سووربوونی کابرا لەسەر

داواكارييەكەی.

([9]لەبەرئـــەوە پێـــتان دەڵـــێم، داواكـــەن، پێـتان دەدریٚ، بگـــەڕێن دەدۆزنـەوە، لـەدەرگـا بدەن، لێتان دەكرێتەوە. [10]هەركەسێك داواكات دەیدرێـــــتیٚ، ئـــــەوەی بگـــــەڕیٚ دەدۆزێتەوە، ئەوەش لەدەرگا دەدات لێیدەكرێـتەوە. [11]چ باوكێك لەئێوە گـــەر كوڕەكـــەی داوای ماســـی لـیٚبكـات لـــەباتی ماســی مـاری دەداتـــیٚ؟ [12]یـــان داوای هـــێلكەی لـیٚبكات دووپشكی دەداتیٚ؟ [13]گەر بێـتو ئێوەی بەدكار، بزانن ئاوها بە منداڵەكانـتان شـتی بـاش بـدەن، كەواتـە دەبـیٚ بـاوكی ئاسمـانی چەند باشترتان پیٚ بدات؟ كە ڕۆحی پیرۆزە دەیدات بەوانەی داوای لـیٚدەكەن.)

**عیساو سەرۆكی شەیتان**

[14]عیسـا ڕۆحی پیسی دەردەكرد لـەكابـرایەك كـە لاڵ بـوو بوو پێی، كـاتیٚ ڕۆحـە پیسـەكەی دەركـرد پیاوەكە دەسـتیكـرد بە قسەكردن، هـەموو سەرسام بوون، [15]هەندێكیان نـەبیٚ ووتـیان: (ئـەو ڕۆحـی پـیس دەردەكات بە بەعلەزبولـی سەرۆكی ڕۆحـە پیسـەكان.) [16]ئیـنجا داوای نیشـانەیەكی ئاسمانـیان لـــیٚكـرد بۆ ئـەوەی تـاقی بكەنەوە. [17]بەڵام عیسا زانی بیر لـەچی دەكەنەوە، پێی ووتن: (هــەر وولاٌتــێك دوو بـــەرەكی تیٚبكــەویٚ وێــران دەبێــت، هــەر ماڵێكـیش بـبیٚ بە دوو بەشەوە خۆی ڕاناگـریٚو تێكدەچیٚ. [18]گەر بێتو شـەیتان ئاوهـا بووبیٚ بەدوو بەشەوە، ئـیتر پادشـاهێتیەكەی چـۆن خـۆی ڕادەگـریٚ؟ ئـێوە ووتـتان مـن بـە بەعلـەزبول ڕۆحـی پیس دەردەكەم، [19]گەر من بەو ڕۆحی پیس دەربكەم، ئایـا دەبـیٚ نەوەكانـتان بەكیٚ دەریان بكـەن؟ بۆیـە ئەوان حوكمتان بەسەر دەدەن. [20]بـەڵام گـەر مـن بەپەنجەی خـودا ڕۆحـی پـیس دەركـەم، ئـەوا پادشاهێتی خوداتان بەسەر دەچەسپیٚ. [21]كـاتیٚ مـرۆڤی بەهـێزو بـەتوانـا بە هـــەموو چـــەكێكەوە پارێـــزگاری لەماڵەكـەی دەكـات، نـاو ماڵەكەی پارێـزراوە. [22]بـەڵام گـەر یەكـێكی لـەخۆی بەهـێزتر بێـتە سـەری ئەوا ســـەردەكەویٚ بەســـەریداو ئـــەو چـــەكانەی پشـــتی پــیٚ بەســـتووە لێیدەسێنیٚ، دەسكەوتەكانیش دابەش دەكـات. [23]ئەوەی لـەگەڵم نییە دژی مـنە، ئـەوەش لـەگـەڵم كۆناكاتـەوە،

بڵاوی دەکاتەوە.

**گەڕانەوەی ڕۆحی پیس بۆ لەش**

[24]کاتێ ڕۆحێکی پیس لەیەکێك دێتە دەرەوە، بەشوێنە بێئاوەکان دەگەڕێ بەدوای حەسانەوەو دەستی ناکەوێ، ئینجا دەڵێ با بگەڕێمەوە بۆ ئەو ماڵەی بەجێمهێشت. [25]کاتێ دێتەوە، دەبینێت گسكدراوەو ڕازاوەیە. [26]ئەوسا دەڕوا لەگەڵ خۆی حەوت ڕۆحی پیسی تر دەهێنێ کە خراپترن لەخۆی، دەچنە ئەو مرۆڤەوەو تیایدا جێگیردەبن، ئینجا باری ئەو مرۆڤە لەجاران خراپتر دەبێ.)

[27]کاتێ عیسا ئەمانەی دەووت، ژنێك لەناو خەڵکەکەوە دەنگی بەرزکردەوەو ووتی: (خۆزگەدەخوازرێ بەو دایکەی لێی بوویو بەو مەمکەی شیری پێداوی.) [28]بەڵام ئەو ووتی: (با خۆزگە بەوانە بخوازرێ، کە گوێ لەووشەی خودا دەگرنو کاری پێ دەکەن.)

**داواکردنی نیشانەی ئاسمانی**

[29]کاتێ خەڵکێکی زۆر لێی کۆبوونەوە، ووتی: (ئەم نەوەیە نەوەیەکی بەدکارە، داوای نیشانە دەکەن، بەڵام هیچ نیشانەیەکیان پێنادرێت تەنها نیشانەی یونس پێغەمبەر نەبێت. [30]چۆن یونس نیشانە بوو بۆ دانیشتوانی نەینەوا، ڕۆڵەی مرۆڤیش نیشانەیە بۆ ئەم نەوەیە. [31]شاژنی باشوور* لەڕۆژی لێپرسینەوەدا بەرامبەر ئەم نەوەیە ڕادەوەستێتو تاوانباری دەکات، چونکە لەوپەڕی جیهانەوە هات بۆ ئەوەی گوێ لەدانایی سلێمان بگرێ. ئەوەتا مەزنتر لەسلێمان لێرەیە. [32]هەروەها دانیشتوانی نەینەوا لەڕۆژی لێپرسینەوەدا لەگەڵ ئەم نەوەیە ڕادەوەستنو تاوانباری دەکەن، چونکە تۆبەیانکرد کاتێ ئاگادارکردنەوەی یونسیان بیست، جا ئەوەتا مەزنتر لەیونس لێرەیە.

**چاو چرای لەشە**

[33](کەس چرا هەڵناکاو

---

*شاژنی باشوور: مەبەست شاژنە بەلقیسە کە فەرمانڕەوای یەمەن بوو لەسەردەمی حەزرەتی سلێمان.

لەجێیەکی شاراوەدا داینێ، یاخود لەژێر تەشتێك، بەڵکو دەیخاتە سەر شوێنێکی بەرز، تاکو ئەوانەی دێنە ژوورەوە ڕووناکیەکە ببینن. [34]چاو چرای لەشە، گەر چاوت باش بێت لەشت هەمووی ڕووناکییە، بەڵام گەر چاوت تروسکایی تیا نەبێت، ئەوا لەشت هەمووی تاریکیە. [35]کەواتە ئاگاداربە ئەو ڕووناکییەی تیاتدایە نەبێت بەتاریکی. [36]گەر بێتو لەشت هەمووی ڕووناکی بێتو هیچ تاریکی تێدا نەبێ، ئەوا هەمووی وەك چرایەك کە ڕووناکی دەدات، دەدرەوشێتەوەو ڕووناکە.)

**سەرزەنشتکردنی فەریسیەکان**

[37]کاتێ عیسا قسەی دەکرد، فەریسیەك داوای لێکرد نانی نیوەڕۆ لای ئەو بخوا. ئەویش چووە ماڵەکەیو لەگەڵی لەسەر خوان دانیشت. [38]بەڵام فەریسیەکە سەری سوڕما لەوەی عیسا پێش نان دەست ناشوات. [39]خوداوەند پێی ووت: (ئێوەی فەریسی دەرەوەی پیاڵەو قاپتان پاك دەکەنەوە، بەڵام ناوەوەتان پڕە لەچەتەیی‌و پیسی. [40]ئەی بێمێشکینە، ئایا ئەوەی دەرەوەی دروست کردووە ناوەوەشی دروست نەکردووە؟ [41]جا ئەوەی لەناو قاپو قاپچاختانداية بەهەژارانی ببەخشن، تاکو هەموو شتێکتان پاك بێتەوە.

[42]جا قوڕ بەسەرتان ئەی فەریسیەکان ئێوە دەیەکی نەعناعو ڕازیانەو سەوزەواتی تر دەدەن، بەڵام دادپەروەریو خۆشەویستی خودا پشت گوێ دەخەن، پێویستە ئەمانە بەجێبهێنن‌و ئەوانەی تریش لەیادنەکەن. [43]قوڕ بەسەرتان ئەی فەریسیەکان، چونکە ئێوە حەز لەڕیزی پێشەوەی کۆبوونەوەو کۆڕەکان دەکەن‌و دەتانەوێ لەشوێنە گشتیەکان سڵاوتان بەگەرمی لێبکرێ. [44]قوڕ بەسەرتان، ئێوە لەو گۆڕە وونبووانە دەکەن کە خەڵکی بێ ئەوەی بزانن بەسەریاندا دەڕۆن.)

[45]لێرە یەکێك لەمامۆستایانی شەریعەت پێی ووت: (ئەی مامۆستا، ئەم قسانەت ئێمەش دەگرێتەوە.) [46]ئینجا عیسا ووتی: (قوڕ بەسەر ئێوەش زانایانی شەریعەت، ئێوە باری قورس‌و گران دەخەنە سەر شانی خەڵکی، بەڵام خۆتان سەری پەنجەیەکی لێنادەن بۆ یارمەتیدانیان. [47]قوڕ

بەسەرتان، چونکە ئێوە گۆڕ بۆ ئەو پێغەمبەرانە هەڵدەبەستن، کە باوباپیرتان کوشتوویانن. 48کەواتە ئێوە شایەتی دەدەن لەسەر باوباپیرانتانو ڕازین بە کردەوەکانیان، ئەوان پێغەمبەرانیان کوشتو ئێوەش گۆڕەکانیان بۆ هەڵدەبەستن. 49هەر لەبەر ئەمەشە خودا دەفەرمووێو دەڵێ: {من پێغەمبەرو نێرراویان بۆ دەنێرم، بەڵام ئەوان دەیانکوژنو دەیان چەوسێننەوە.} 50تاکو خوێنی ڕژاوی هەموو پێغەمبەران لەسەرەتای دروست بوونی جیهانەوە بچێتە ملی ئەم نەوەیە، 51هەر لەخوێنی هابیلەوە تا خوێنی زەکەریا کە لەنێوان قوربانگاو پەرستگادا کوژرا. بەڵێ پێتان دەڵێم: (ئەوانە هەمووی لەم نەوەیە داوادەکرێ.) 52قوڕ بەسەرتان ئەی زانایانی شەریعەت، چونکە ئێوە کلیلی زانیاریتان هەڵگرتووە، بەڵام نەخۆتان دەچنە ژوورەوە نە ڕێدەدەن خەڵکی تر بچێتە ژوورەوە.)

53کاتێ عیسا بەم شێوەیە قسەی لەگەڵ دەکردن، مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیەکان بەتەواوی ڕقیان لێهەڵگرت، زۆر بابەتی تریان هێنایە پێشەوە، بۆ ئەوەی لێی بدوێ، 54تا بە ووشەیەك بیگرنو تووشی بکەن.

## راستگۆییو بێ دووڕوویی

## 12

لەوکاتەدا کە خەڵکی بەهەزاران کۆبووبوونەوە، بەجۆرێ یەك یەکی پێشێل دەکرد، عیسا دەستی کرد بەقسەکردنو یەکەمجار بەقوتابیەکانی ووت: (ئاگاداری هەویرترشی فەریسیەکان بن، کە دووڕوویە. 2هیچی شاراوە نیە، ئاشکرا نەبێتو هیچ نهێنیەك نیە نەزانرێ. 3هەموو ئەوانەی لەتاریکی ووتوتانە، لەڕووناکی دەبیسترێ، ئەوەش کە لەماڵ بەچرپە ووتوتانە، لەسەربانەکان بانگەوازی پێدەکرێ.)

4لەبەرئەوە ئەی خۆشەویستەکانم، مەترسن لەوانەی بەلەش دەتانکوژن، چونکە لەوە زیاتر ناتوانن هیچ بکەن. 5بەڵام من پێتان دەڵێم لەچی بترسن، لەوە بترسن کە توانای هەیە لەدوای مردن بتانخاتە دۆزەخەوە، بەڵێ پێتان دەڵێم لەوە بترسن. 6ئەوە نیە پێنچ چۆلەکە بە دوو فلس دەفرۆشن؟

لەگەڵ ئەوەشدا خودا یەکێك لەوانی بیرناچێ، [7]تەنانەت قژی سەریشتان ژمێرراوە. کەواتە مەترسن، ئێوە باشترن لەچۆلەکە. [8]بەڵام پێتان دەڵێم: ئەوەی لەبەردەم خەڵکی دانم پیابنێ، ڕۆڵەی مرۆڤیش لەبەردەم فریشتەکانی خودا دانی پیادەنێ. [9] ئەوەش کە لەبەردەم خەڵکی دانم پیانانێ، بەهەمان شێوە لەبەردەم فریشتەکانی خودا دانی پیانانرێ. [10] ئەوەی قسەیەك بەڕۆڵەی مرۆڤ بڵێ، دەبەخشرێ، بەڵام ئەوەی کفربکات بەرامبەر ڕۆحی پیرۆز، نابەخشرێ. [11]کاتێ دەتانهێننە بەردەم کەنیشتەکانو لێپرسراوانو دەسەڵاتداران، گوێ مەدەن بەوەی چی یاخود چۆن وەڵام دەدەنەوە. [12] چونکە ڕۆحی پیرۆز ئەوەی کە پێویستە بیڵێن دەیدا بەگوێتان.) [13] ئینجا لەناو کۆمەڵەکەدا یەکێك پێی ووت: (مامۆستا، بە براکەم بڵێ ئەوەی بۆمان بەجێماوە بەشی بکات لەگەڵم.) [14]بەڵام ئەو پێی ووت: (ئەی مرۆڤ، کێ منی کردووە بە دادوەر یاخود بەشکەر بە سەرتان؟) [15]بە خەڵکەکەی ووت: (ئاگاداربنو خۆتان بپارێزن لەچاوبرسێتی، چونکە ژیانی مرۆڤ بەزۆری سامانەکەی نییە.)

**نموونەی دەوڵەمەندی بێمێشك**

[16]ئینجا نموونەیەکی بۆ هێنانەوەو ووتی: (مرۆڤێکی دەوڵەمەند زەوییەکەی بەرووبوومێکی زۆریدا. [17]بیری کردەوەو ووتی: چی بکەم کە من شوێنی تەواوم نەبێ بۆ کۆکردنەوەی بەرووبوومەکەم؟ [18]جا ووتی: وا دەکەم، عەمبارەکانم تێکدەدەمو لەوان گەورەتر دروستدەکەم، ئیتر لەوێدا هەموو بەرووبوومەکەم دادەنێمو کۆی دەکەمەوە. [19]ئەوسا بەخۆم دەڵێم، ئەی دڵ ئەوەتا بەشی چەندینساڵت هەیە، کەواتە بحەسێوەو بخۆو بخۆوەو دڵشادبە. [20]بەڵام خودا پێی ووت: ئەی بێ مێشك، هەر ئەم شەو ڕۆحت دەردەچێ، ئەوەی کۆتکردەوە بۆ کێ دەبێ؟ [21]بەهەمان شێوە دەبێ ئەو کەسەی گەنجینە بۆ خۆی کۆدەکاتەوەو لای خودا دەوڵەمەند نییە.)

**خودا خەممان دەخوات**

[22]بەقوتابیەکانی ووت: (جا

لەبەرئەمە پێتان دەڵێم، گوێمەدەن بەژیان چی بخۆن، بەلەش چی لەبەر بکەن، [23] ژیان گرنگترە لەخواردنو لەشیش گرنگترە لەجل. [24] سەیری قەلەڕەش بکەن، نەدەچێنێو نەدروێنە دەکات. عەمباریشی‌نیەو هیچ کۆناکاتەوە، بەڵام خودا دەیژیێنێ. ئایا ئێوە لەباڵندە باشترنین؟ [25] بەڵام کێ لەئێوە گەر زۆر بایەخ بەم شتانە بدات، دەتوانێ تەنانەت ڕۆژێك لەژیانی درێژتر بکات؟ [26] جا کە ئێوە تواناتان بەسەر بچووکترین شت نییە، بۆچی بایەخ دەدەن بەشتی تر؟ [27] سەیری گوڵاڵە سوورە بکەن، چۆن نەشونما دەکات، نە هیلاك دەبێتو نە دەڕێسێ. بەڵام پێتانی دەڵێم: تەنانەت سلێمانیش لەو پەڕی مەزنیدا بەرگی وەك یەکێك لەوانی لەبەرنەکردووە. [28] گەر بێتو خودا ئاوا بەرگ بکاتە بەری گژوگیا هەرچەندە ئەمڕۆ لەکێڵگەدایەو بەیانی فڕێ دەدرێتە تەنوورەوە. ئایا دەبێ چەند زیاتر جلی باشتان لەبەر بکات ئەی کەم باوەڕینە؟ [29] داوای ئەوە مەکەن چی بخۆنو چی بخۆنەوە، مەپەشۆکێن. [30] ئەمانە هەمووی بێ باوەڕەکانی ئەم جیهانە هەوڵی بۆ دەدەن، بەڵام ئێوە باوکتان دەزانێ کە پێویستتان بەمانە هەیە. [31] بەڵکو داوای پادشاهێتی خودا بکەن، ئەوانەی دیکەتان هەموو بۆ دەبێت. [32] مەترسە ئەی مێگەلی بچووك، چونکە باوکتان دڵشادە پادشاهێتیتان بداتێ. [33] ئەوەی هەتانە بیفرۆشنو ببەخشن بەهەژاران، بۆ خۆتان لەئاسمان سامانێك دروستبکەن کە نافەوتێو گەنجینەیەك کە لەبن نایەت، نەدز لێی نزیك دەبێتەوە نەمۆریانە لێی دەدات. [34] چونکە مرۆڤ گەنجینەی لەهەر کوێ بێت دڵی لەوێ دەبێت.

**نموونەی کۆیلە دەست پاکەکان**

[35] ئامادەبن با پشتێنتان بەستراو بێتو چراتان ڕۆشن بێت، [36] وەك ئەوانەبن کە چاوەڕوانی گەورەکەیان دەکەن تا لەسەر شایی بگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی کە هاتەوەو لە دەرگای‌دا، دەستبەجێ دەرگای لێبکەنەوە. [37] خۆزگەدەخوازرێ بەو ئیشکەرانەی کە گەورەکەیان لەکاتی گەڕانەوەیدا دەیانبینێ بەخەبەرن. ڕاستیتان پێ دەڵێم، ئینجا گەورەکەی لەسەر

خـوان دایـانده‌نێـت‌و قـۆڵ هه‌ڵده‌كا تـاكو خزمه‌تـیان بكـات. [38]هه‌روه‌ها خۆزگـه‌ده‌خوازرێ پێیان، گه‌ر هاتوو گه‌ڕانـه‌وه‌ی گه‌وره‌كـه‌یان له‌كاتێكدا بێت، كه‌ دوو به‌ش یاخود سێ به‌شی شـه‌و ڕۆیشـتبێ‌و ئـه‌وان هێشـتا هه‌ر به‌خه‌بـه‌ربن. [39]به‌ڵام ئه‌وه‌ بزانن، گه‌ر بێـت‌و خـاوه‌ن‌مـاڵ بزانێـت لـه‌چ كاتێكدا دز دێته‌ سه‌ری، ئه‌وا به‌خه‌به‌ر ده‌مێنێـته‌وه‌و ماڵه‌كـه‌ی بـه‌جێ‌ناهێڵێ تـابـدزرێ. [40]كه‌واتـه‌ ئـێوه‌ش ئـاوا ئامـاده‌بن، چـونكه‌ ڕۆڵـه‌ی مـرۆڤ له‌كاتێكدا ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ كه‌ نایزانن.)

[41]په‌تـرۆس لێی‌پرسی: (گه‌وره‌م، ئه‌م نموونانه‌ به‌ئێمه‌ ده‌ڵێی یان به‌هه‌موو خـه‌ڵكی؟) [42]عیسـای خوداوه‌نـد ووتی: (كێیه‌ ئه‌و جێگره‌ ده‌ستپاك‌و ژیـره‌ی كـه‌ گـه‌وره‌ی مـاڵ به‌سـه‌ر خاووخێزانی دایده‌نێ هه‌تا خواردنیان لـه‌كاتی خۆیـدا بۆ ئاماده‌ بكات؟ [43] خۆزگـه‌ده‌خوازرێ بـه‌و ئیشـكه‌ره‌، كاتێ گه‌وره‌كه‌ی ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ ده‌یبینێ هه‌ڵده‌سـتێ بـه‌و كـاره‌. [44]ڕاسـتیتان پـێ‌ده‌ڵـێم: ئـینجا گـه‌وره‌ی ماڵه‌كه‌ ئیشـكه‌ره‌كه‌ی داده‌نێ له‌سه‌ر هه‌موو مـاڵ‌و سـامانێكی كه‌ هه‌یه‌تی. [45]به‌ڵام گـه‌ر ئـه‌م ئیشـكه‌ره‌ لـه‌دڵی خۆیـدا ووتـی: گه‌وره‌كـه‌م دواده‌كـه‌وێ له‌گه‌ڕانـه‌وه‌ی، ده‌سـت بكـات به‌لـێدانی ئیشـكه‌ره‌كانی تـر بـه‌ژن‌و به‌پیاوه‌وه‌، هـه‌روه‌ها بخواو بخواته‌وه‌و خـۆی سـه‌رخۆش‌بكـات، [46]ئه‌وسـا گه‌وره‌كه‌ی له‌ڕۆژێك ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ كه‌ چـاوه‌ڕێی ناكـات‌و له‌كاژێـرێك كـه‌ نایـزانێ، ئیـنجا گه‌وره‌كـه‌ی سـزای‌ده‌دات‌و ده‌یخاتـه‌ ڕیـزی ناپاكانـه‌وه‌. [47]ئـه‌و ئیشـكه‌ره‌ی داواكاریـیه‌كانی گـه‌وره‌ی مـاڵ ده‌زانێـت، بـه‌ڵام به‌ده‌ستی ئه‌نقه‌ست كـاری پێ‌ناكـات، سـزا ده‌درێ. [48] ئـه‌وه‌ش كـه‌ داواكاریه‌كان نازانێت‌و هه‌ڵـه‌ ده‌كـات، سـزاكه‌ی كـه‌متره‌. ئـه‌وه‌ی زۆری پێدراوه‌، داوای زۆری لێ‌ده‌كـرێ، ئه‌وه‌ش زۆری لادانراوه‌، داوای زیاتری لـێ‌ده‌كرێ.

**عیساو جیهان**

[49](من هاتووم تاكو له‌سه‌ر زه‌وی ئاگـرێك بكه‌مـه‌وه‌، چـه‌ند دڵخۆشم بـه‌وه‌ی ده‌ستبكات به‌سوتاندن! [50] بـه‌ڵام جـارێ ده‌بـێ لـه‌ئازار هه‌ڵبكێشـرێم، چـه‌ند ناڕه‌حـه‌تم تـا دێته‌دی. [51]واده‌زانن من هاتووم ته‌نها ئاشـتی بهێـنمه‌ سـه‌ر زه‌وی؟ پێـتان

دەڵـێم: نەخێر، بەڵكو دووبەرەكیو جـیابوونەوەم هێـناوە. [52]هـەر لـەئێستاوە، گـەر لـەماڵـێكدا پێنج كەسـی تـێدا بێـت، سـیانیان لەدووانـیان، یان دووانیان لەسیانیان جیادەبـنەوە. [53]بـاوك لـەكوڕ، كوڕ لـەباوك، دایك لەكچ، كچ لەدایك، خەسـوو لـەبـووك، بووك لەخەسوو جیادەبنەوە.) [54]دیسان بەخەڵكەكەی ووت: (كاتێ ئێوە لەڕۆژئاواوە هەور دەبیـنن، خـێرا دەڵـێن: ئـەم هـەورە بارانی بەدەمەوەیە، هەر بەو شێوەیەش دەبێـت. [55]كاتێكـیش بـای باشـوور دێـت، دەڵـێن گـەرما دەسـت پێدەكـات، هـەر بـەو شـێوەیەش دەبێـت. [56]ئـەی دووڕووەكان، ئێوە دەزانـن ڕووی زەویو ئاسمـان بخوێنـنەوە، چۆن نازانن ئەم سەردەمە بخوێننەوە؟ [57]هەروەها بۆچی بەخۆتان دادپەروەرانـە حوكـمنادەن؟ [58]كاتێ یەكـێك شـتێكی بەسـەرتەوەیەو دەیـەوێ بۆ دادگات ببات، هەوڵبدە هـەر لـەڕێگـا لەگەڵی ئاشتبیتەوە، ئەگینا ڕاتدەكێشێت بۆ لای دادوەرو دادوەریـش دەتداتـە دەست پۆلیس، پۆلیسـیش ڕەوانـەی بەندیخانـەت دەكـات. [59]پێت دەڵێم: لەوێ نایەیتە دەرەوە هەتا دوا پول نەدەیتەوە.)

## پێویستی تۆبەكردن

# 13

لـەمكاتـەدا، هـەواڵی ئـەوەیان بـەعیسـادا، كـە پـیلاتۆس* هـەندێ لەپیاوانی شـاری جەلیـلی لـەكاتی پێشـكەشكـردنی قوربانیەكانـیان كوشـتووەو خوێـنی لـەگـەڵ خوێنی قوربانـیەكان تـێكەڵاو كـردوون. [2]عیسا پێی ووتن: (ئایا بەڕای ئێوە، ئەو جەلیلـیانەی كـوژران گوناهـیان زیاتـربوو لەو خەڵكەی تری جەلیل، بۆیـە وایـان بەسـەرهات؟ [3]مـن پێتان دەڵـێم: نەخـێر، گـەر بێـتو ئـێوەش تۆبەنەكەن هەمووتان ئاوها تیادەچن. [4]یـاخود ئـەو هەژدە كەسەی تاوەری سیلوام بەسەریاندا كەوتو كوشتنی، گوناهـبارتر بـوون لەدانیشـتوانی قـودس؟ [5]مـن پێتان دەڵـێم: نەخێر، بـەڵام گـەر ئـێوەش تۆبەنەكـەن هەمووتان ئاوها تیادەچن.)

### نموونەی هەنجیری بێبەر

[6]ئیـنجا ئەم نموونەیەی باس كرد: (كابـرایەك لـەباخەكـەیدا دار هـەنجیرێكی هـەبوو، هات تاكو بزانێ

بەری گرتووە، سەیری کرد هیچی پێوە نییە. [7]بانگی باخەوانەکەی کردو ووتی: من ماوەی سێ ساڵە دێم، تاکو لەبەرەکەی ببەم، کەچی هیچی پێوە نابینم، بیبڕەوە، بۆچی زەویشمان لێبگری؟ [8]بەلاّم باخەوانەکەی ووتی: گەورەم، ئەم ساڵیش وازی لێبهێنە، زەویەکەی دەوروبەری هەڵدەگێڕمەوەو کەمێ بابەتی بەهێزبوونی تێدەکەم. [9]بەڵکو بەر بگرێ، گەر نەبوو ئەوسا بیبڕەوە.)

**چاککردنەوەی ژنێك لەشەممە**

[10]عیسا رۆژێکی شەممە لەکەنیشت خەریکی فێرکردنبوو، [11]ئافرەتێکی لێبوو ماوەی هەژدە ساڵ بوو رۆحی لاواز دەستی بەسەریدا گرتبوو، پشتی قەمبوور بوو بوو، نەیدەتوانی بەرێکی راوەستێ. [12]کاتێ عیسا ژنەکەی بینی، بانگی کردو پێی ووت: (خوشکە، با رزگارت بێ لەلاوازییەکەت.) [13]ئینجا دەستی خستە سەر ئافرەتەکە، دەستبەجێ ئافرەتەکە پشتی راست بووەوەو دەستی کرد بەستایشی خودا. [14]بەلاّم سەرۆکی کەنیشت توورە بوو، چونکە عیسا لەرۆژی شەممەدا خەڵکی چاك کردەوە، بەخەڵکەکەی ووت: (تەنها شەش رۆژ لەهەفتەیەکدا رۆژی کارکردنە لەو رۆژانەدا وەرن بۆ چاکبوونەوە، نەك لەرۆژی شەممەدا.) [15]عیسای خوداوەند وەلاّمیدایەوە: (ئەی دووڕووەکان! ئایا هەر یەك لەئێوە، لەرۆژی شەمماندا ناڕوات گاکەی یاخود گوێدرێژەکەی بکاتەوەو بیبات ئاوی بدات. [16]ئەوەتا ئەم ژنە کە یەکێکە لەنەوەی ئیبراهیم، ماوەی هەژدە ساڵە بەستراوی دەستی شەیتانە نابێ ئازادبێ لەرۆژی شەممەدا؟)

[17]کاتێ عیسا ئەمەی ووت، بەرهەڵستکەرانی شەرمەزاربوون. ئینجا هەموو خەڵکەکە دڵشاد بوون بەگشت ئەو کارە مەزنانەی کردی.

**نموونەی دەنکە خەرتەلە**

[18]عیسا پرسیاری کردو ووتی: (پادشاهێتی خودا لەچی دەکات، وەك چی وایە؟ [19]لەدەنکە خەرتەلەیەك دەکات، کابرایەك هێنایو لەکێڵگەکەی رواندی، رواو بوو بەدارێکی گەورە، بەشێوەیەك کە

بالندەی ئاسمان لەسەر لق‌و چلەکانی حەسانەوە.)

## نموونەی هەویرترش

[20] دیسان ووتی: (پادشاهێتی خودا لەچی دەکات؟ [21] لەهەویرترشێك دەکات، کە ئافرەتێك پارچەیەکی لێ‌دەهێنێ، دەیخاتە ناو چەند ڕبە ئاردێکەوە تا هەموو هەویرەکە هەڵدێت.)

## دەرگای تەنگ

[22] کاتێ عیسا بۆ قودس دەچوو، بەشارو لادێکان تێ‌دەپەڕی‌و خەڵکی فێردەکرد. [23] یەکێك لێی‌پرسی: (گەورەم ئایا ژمارەی ئەوانەی ڕزگاریان دەبێت کەمە؟) ئەویش پێیانی ووت: [24] (هەوڵ بدەن لەدەرگای تەنگەوە بچنە ژوورەوە، من پێتان دەڵێم: زۆر کەس هەوڵ‌دەدەن بچنە ژوورەوە، بەلام ناتوانن. [25] دوای ئەوەی گەورەی ماڵ هەڵدەستێت‌و دەرگا دادەخات، ئێوەش لەدەرەوە دەمێننەوە، لەدەرگادەدەن‌و دەڵێن: گەورەم، لێمان بکەوە! ئەویش پێتان دەڵێ: من ناتانناسم، ئێوە لەکوێوە هاتوون؟ [26] ئەوسا ئێوەش دەڵێن: لەگەڵتدا خواردمان‌وخواردمانەوە، لەشەقامەکانمان فێرت دەکردین. [27] ئینجا ئەویش دەڵێ: پێتان دەڵێم من نازانم ئێوە کێن‌و لەکوێوە هاتوون، وون‌بن لەبەرچاوم ئەی بەدکاران! [28] جا لەوێدا دەبێت بەگریان‌و چرکەچرکی ددان، کاتێ دەبینن ئیبراهیم‌و ئیسحاق‌و یاقوب‌و هەموو پێغەمبەران لەپادشاهێتی خودان، بەلام ئێوە دەرکراونەتە دەرەوە. [29] ئینجا خەڵکی لەڕۆژهەلات‌و لەڕۆژئاواوە، لەباکوورو لەباشوورەوە دێن، لەسەر خوان دادەنیشن لەپادشاهێتی خودا. [30] زۆر لەوانەی دواهەمینن دەبنە یەکەمین‌و یەکەمینەکانیش دەبنە دواهەمین.)

## عیساو هیرۆدس

[31] لەو کاتەدا هەندێ لەفەریسیەکان هاتنە لای عیساو پێیان ووت: (ئێرە بەجێ‌بهێڵەو برۆ، چونکە هیرۆدس دەیەوێ بتکوژێ.) [32] ئەویش پێی ووتن: (برۆن بەو ڕێویە بڵێن، من ئەمڕۆ و بەیانی ڕۆحە پیسەکان دەردەکەم‌و نەخۆشەکان چاك دەکەمەوە، ئینجا لەڕۆژی

سێهەم هەموو شتێك تەواو دەكەم. 33بەڵام ئەمڕۆ و بەیانیو ڕۆژانی داهاتوو، دەبێت بەردەوام بم لەڕۆیشتن، بەڕێگای خۆم، چونكە پێغەمبەر لەناونابرێت لەقودس نەبێت.)

### عیسا دڵتەنگە بۆ قودس

34(ئەی قودس، ئەی قودس، ئەی بكوژی پێغەمبەرانو بەردبارانكەری ئەوانەی بۆت نێردران، چەند جار ویستم منداڵەكانت بەیەكەوە كۆ بكەمەوە، هەروەك چۆن مریشك جوجەڵەكانی لەژێر باڵی كۆدەكاتەوە، بەڵام نەتانویست. 35ئەوەتا ماڵەكەتان بەوێرانكراوی دەمێنێتەوە. با پێتان بڵێم، ئیتر نامبیننەوە، تا ئەو كاتەی هاواردەكەن، پیرۆزە ئەوەی بەناوی خوداوەند دێت.)

### چاكردنەوەی نەخۆش لەشەممە

## 14

عیسا لەڕۆژی شەممەدا، چووە ماڵی یەكێك لەسەركردە فەریسیەكان بۆ نانخواردن، ئەوانەی لەوێ بوون چاویان لەعیسا نەدەتروكاندو بەباشی سەرنجیان دەدا. 2چونكە بەرامبەری كابرایەك كە نەخۆشی ئاوبەنی هەبوو دانیشت بوو. 3عیسا ڕووی‌كردە مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیەكانو ئەوانەی لەوێدا بوون، لێیپرسین: (ئایا نەخۆش چاكردنەوە، لەڕۆژی شەممەدا دەبێ یان نا؟) 4كاتێ ئەوان هیچ وەڵامێكیان نەدایەوە. ئەویش كابرای بانگ‌كردو چاكی كردەوەو بەڕێیكرد. 5گەڕایەوە پرسیاری لێ‌كردن: (كێ لەئێوە كوڕەكەی یان گاكەی لەڕۆژی شەممەدا بكەوێتە بیرەوە ناچێ یەكسەر دەری بهێنێ؟) 6لێرەش نەیانتوانی هیچ وەڵامێكی بدەنەوە.

### خۆت بەبەرز مەگرە

7دوای ئەوەی سەیریكرد، چۆن هەندێ لەدانیشتوان ڕیزی پێشەوەیان گرتووە، نموونەیەكی بۆ هێنانەوە، ووتی: 8(كاتێ یەكێك بانگتان دەكات بۆ سەر شایی، باشتر وایە نەچیتە ڕیزی پێشەوە، چونكە لەوانەیە ئەو شوێنە بۆ یەكێكی گرنگتر لەتۆ دانرابێ. 9ئینجا ئەوەی بانگی كردوون، دێتو پێت دەڵێ: ئەو شوێنە چۆڵكە بۆ ئەم پیاوە، تۆش

تەریق دەبیتەوە، ئینجا لەریزی دواوە دەگەرێیت بۆ شوێنێك لێی دانیشی. [10]کاتێ بانگ دەکرێیت، هەوڵبدە لەدواوە دانیشە، تا ئەوەی بانگی کردوویت، بێت و پێت بڵێ: هاورێم، هەستە وەرە پێشەوە، لەم کاتە رێزت لای دانیشتووان زیاتر دەبێ. [11]ئەوەی خۆی بەگەورە دانێ نزم دەکرێتەوە، ئەوەش خۆی بەبچووك دادەنێ بەرزدەکرێتەوە.) [12]ئینجا بەوەی بانگی کردووە، وتی: (کاتێ نانی نیوەرۆ یان ئێوارە دەکەیت، هاورێو براو خزم و دراوسێ پارەدارەکانت بانگ مەکە، نەوەك ئەوانیش دوایی بانگت بکەنەوەو چاکەت بدەنەوە. [13]بەڵکو ئەگەر نانخواردنێکت سازکرد، هەژارو پەککەوتەو شەلو کوێر بانگ بکە، [14]خۆزگەت پێدەخوازرێ گەر ئەمەت کرد، چونکە ئەوان ناتوانن پاداشتت بدەنەوە، چونکە لەرۆژی زیندووبوونەوەی راستودروستاندا پاداشتت دەدرێتەوە.)

**نموونەی میواندارییەك**

[15]یەکێك لەدانیشتووان، کاتێ ئەمەی بیست، وتی: (خۆزگەم بەوەی لەپادشاهێتی خودا نان دەخوات.) [16]ئینجا عیسا وتی: (کابرایەك داوەتێکی گەورەی کردو خەڵکێکی زۆری بۆ بانگ کرد. [17]کاتی نانخواردن ئیشکەرێکی نارد، بۆ ئەوەی بەمیوانەکان بڵێ: فەرموون هەموو شتێك ئامادەیە. [18]بەڵام هەموو یەك لەدوای یەك داوای لێبووردنیان کرد، یەکەمیان وتی ئەمرۆ کێڵگەیەکم کڕیووەو ئێستا دەبێ بڕۆم بۆ ئەوێ، تکایە لێم ببورە. [19]ئەوی کەیان وتی: پێنج جووت گام کڕیوە دەمەوێ بچم بزانم چۆنن، تکایە لێم ببوورە. [20]یەکێکی کەشیان وتی: ژنم هێناوە لەبەرئەوە ناتوانم بێم. [21]ئینجا ئیشکەرەکە گەرایەوەو هەمووی بەگەورەکەی راگەیاند. ئینجا گەورەی ماڵەکە زۆر توورەبوو، بەئیشکەرەکەی ووت: برۆ دەرەوە، بۆ شەقامی ناو شارو کۆڵانەکان، چی هەژارو پەککەوتەو شەلو کوێر هەیە بانگیان بکە بۆ ئێرە. [22]پاش ماوەیەك ئیشکەرەکە گەرایەوەو ووتی: گەورەم ئەوەی فەرمانتدا کرا، هێشتا هەر شوێن ماوە. [23]

گـەورەی مـاڵ ووتی: دیسان بڕۆ بۆ ڕێگـاو مەیدانـەکان بـەزۆر خـەڵك بهێـنە ماڵەوە، تاکوماڵەکەم پڕبێ. [24] پێتان دەڵێم: لەوانەی بانگکرابوون هیچیان تامی نانی ماڵم ناکەن.)

### ئەوەی لەقوتابییان داوادەکرێ

[25]خەڵکـێکی زۆر لەگـەڵی دەڕۆیشـتن بەرێدا، ئاوڕی لێ دانەوەو پـێی ووتـن: [26](گـەر یەکێك بیەوێ لەگـەڵم بێـت، پێویسـتە مـنی زیاتـر خـۆش بـوێ، تەنانـەت لـەدایـكو بـاوکی، ژنو مـندالّی، خوشـكو براشـی، بگـرە لەخۆشی زیاتر، تەنها بەم شێوەیە دەتوانێ ببێتە قوتابی من. [27]هەروەها ئەوەی ناتوانێ خاچەکەی هەڵگرێـتو دوام بکەوێـت، ناتوانێ ببێـتە قوتابیم. [28]کێ هەیە گەر بیەوێ تـاوەرێك دروسـت بکات، دانانیشێ پارەکـەی بژمـێرێو بـزانێ پـارەی ئـەوەی هەیـە کارەکـەی پـێ تـەواو بکـات؟ [29]نـەوەك دەسـتبکـات بـەدانانی بـناغەو لـەدوایـیدا نەتوانێ تـەواوی بکـات، ئەوسـا خـەڵکی گاڵتەی پێدەکەن، [30]دەڵێن ئەوە چی بـوو! دەسـتی بە دروستکردن کردو نەیـتوانی تـەواوی بکـات؟ [31]یان چ پادشـایەك، بیەوێ شەڕ بکات لەگەڵ پادشایەکی‌کەدا، یەکەمجار دانانیشێت هەتا ڕاوێژی ئەوە بکات، چۆن بە دە هـەزار کەسـە سـەربکەوێ بەسـەر بیسـت هـەزار کـەس، کـە خەریکن بـەرەو ڕووی دەکشێن، [32]ئەگینا خۆ هەتا لەشکرەکە دوورە، خێرا خەڵك دەنێرێ بۆ ڕێککەوتن. [33]کەواتە هەر بـەم شـێوەیە، گەر یەکێك لەئێوە واز لەهـەموو شـتێك نەهێـنێ کەهەیەتی، ناتوانێ ببێتە قوتابی من.)

### نموونەی خوێ

[34](خوێ شتێکی زۆر باشە، بەڵام کە سوێری نەما، چی سوێریەکەی بۆ دەگەڕێنێـتەوە؟ [35]ئەوسـا بـەکـەڵکی هـیچ نایـەت، نـە بـۆ زەوی نـە بـۆ بەهێزکردنی زەوی، ئینجا ناچار فڕێ دەدرێـت. کـێ گوێـی هەیە با گوێ بگرێ.)

### گەڕان بەدوای وونبووان

## 15

هەموو باجگرانو گوناهباران دەهاتن بـۆ گوێگـرتن لەووتەکانی عیسا. [2] فەریسـیەکانو مامۆستایانی شەریعەت بەمـە تـووڕە دەبـوونو دەیان ووت:

(ئەم کابرایە پێشوازی لەگوناهباران دەکات‌و لەگەڵیان نان دەخوات.) [3] عیساش نموونەیەکی بۆ هێنانەوەو ووتی: ([4] کێ لەئێوە گەر سەد سەر مەڕی هەبێت‌و دانەیەکی لێ وون بێت، نەوەدو نۆیەکەی تر لەدەشت بەجێ ناهێڵێت‌و ناگەڕێ بەشوێن مەڕە وون بووەکەدا، تا دەیدۆزێتەوە؟ [5] ئینجا کە دۆزیەوە، بەخۆشیەوە دەیخاتە سەرشانی‌و [6] دەیهێنێتەوە بۆ ماڵەوە، هاوڕێکانی‌و دراوسێکانی بانگ دەکات‌و پێیان دەڵێت: دڵشاد بن لەگەڵم چونکە ئەو مەڕەی وون بووبوو، دۆزیمەوە. [7] من پێتان دەڵێم هەر بەم شێوەیەش، لەئاسمان دەبێ بەشادی گەر یەکێك لەگوناهباران تۆبە بکات، زیاتر لەنەوەدو نۆ کەسی ڕاست‌ودروست کە پێویستیان بە تۆبەکردن نییە.

**کاتێ پارەت وون دەبێ**

[8] (یان چ ئافرەتێ گەر دە پەنجایی هەبێ، یەکێکیانی لێ بکەوێت، هەڵناسێ، چرا هەڵبکاو دەست بکات بەگەسك دانی ماڵەکە بە ووردی، تا دەیدۆزێتەوە؟ [9] کاتێ کە دۆزیەوە، بۆ هاوڕێ‌و دراوسێکانی دەگێڕێتەوەو پێیان دەڵێ: دڵشادبن لەگەڵم چونکە پارە وون بووەکەم دۆزیەوە. [10] من پێتان دەڵێم: هەر بەم شێوەیە، بەتۆبەکردنی گوناهبارێك، دەبێتە شادی لەنێوان فریشتەکانی خودا.)

**نموونەی کوڕی وون‌بوو**

[11] ئینجا ووتی: (کابرایەك دوو کوڕی هەبوو. [12] بچووکەکەیان بە باوکی ووت باوکە چیم بەردەکەوێ لەبەشی خۆم بمدەرێ، کابراش چی سامانی هەبوو کردی بەدوو بەشەوەو بەشێکی دانا بۆ کوڕە بچووکەکەی. [13] دوای چەند ڕۆژێك، کوڕی بچووك چی هەبوو هەمووی کۆکردەوە، ئینجا کەوتە ڕێ بۆ وولاتێکی دوور، لەوێ چی هەبوو هەمووی لەڕابواردن خەرج‌کرد. [14] کاتێ کوڕە هیچی بەدەستەوە نەما، گرانی کەوتە ئەو ناوچەیە، ئینجا هەستی بەوەکرد کە پێویستی بەشتێك هەیە پێی بژی. [15] دوای ئەوەی چووە لای کابرایەك لەدانیشتوانی ئەو ناوچەیە، کابرا ناردی بۆ کێڵگەکەی تاکو بەرازەکانی بۆ بلەوەڕێنێ. [16] برسێتی وای لەکوڕەکرد حەزبکات

لەخرنووكی بەرازەكان بخوات، بەلام ئەوەشـــی بەتـــەواوی دەســـت نەدەكـەوت. [17]ئینجا بیری كردەوەو ووتـی: ئاخۆ چەند نان بمێنێتەوە لەبەر ئـەو كەسـانەی لای بـاوكم ئـیش دەكـەن، ئەوەتا منیش لێرەدا خەریكە دەمـرم لـەبرسـا. [18]با بگەڕێمەوە بۆ لای بـاوكم، پـێی دەڵـێم: بابـە من بەرامـبەر بـەئاسمانو بەرامـبەر بـەتـۆ هەڵـەم كـرد. [19]ئیتر شایانی ئەوە نیم بـەكـوڕی تـۆ بـانگ بكـرێم، بمكـە بـەیەكێك لەئیشكەرەكانت. [20]ئەوسا كـوڕە هەڵسـاو گەڕایـەوە بـۆ لای باوكی كاتێ باوكی لەدوورەوە بینی، دڵـی پـێ‌سـووتا، ڕای‌كـرد بۆ لایو دەسـتی‌كردە ملـی، بـەگەرمـیەوە ماچی‌كرد. [21]ئینجا كوڕە پێی ووت: بابـە مـن بەرامـبەر بەئاسمانو بەرامبەر بـەتۆ هەڵەم‌كرد، ئیتر من شایانی ئەوە نیم بەكوڕی تۆ بانگ بكرێم. [22]بەلام باوكەكـە، بانگی ئیشكەرەكانی‌كردو ووتـی: بـڕۆن خـێرا باشـترین جـلو بـــەرگ بهێـــنن‌و لەبەری‌كـــەن، ئەنگوسـتیلەی بكەنـە پەنجـەو پـێلاو بكەنـە پـێی. [23]ئینجا بڕۆن گوێرەكە دابەسـتەكەش سـەربڕن، تـا بیخۆین‌و دڵخـۆش بین. [24]ئەم كوڕەم مردبوو، زیـــندووبووەتەوە، وون بـــووبـــوو، دۆزراوەتەوە، بادڵخۆش بین.

[25]كـوڕی گەورەی كابرا، دوای ئـــەوەی لـــەكێڵگە گەڕایەوەو نزیك مـاڵ بـووەوە، گوێـی لـە دەنگـی مۆسـیقاو هەڵـپەركێ بوو. [26]یەكێك لـــەئیشـــكەرەكانی بـــانگ كـــردو لێی‌پرســـی، ئـــەوە چـــیە، چـــی ڕووی‌داوە؟ [27]ئـــەویش وەلامـــی دایەوەو ووتی: براكەت گەڕاوەتەوە، باوكیشـت گوێرەكە دابەستووەكەی سەربڕیوە بۆی، چونكە بەزیندوویەتی گەڕاوەتـــەوە. [28]بـــرای گـــەورە تـــووڕەبـــوو، نەیویســـت بچـــێتە ژوورەوە. بـاوكی هاتە دەرەوەو لێی پاڕایـەوە. [29]بەلام ئەو وەلامی باوكی دایەوەو ووتی: ئەوەتا من ئەو هەموو سـاڵە ئیشت بۆ دەكەم، بەرهەڵستی هـــیچ فەرمانـــێكم نەكردوویـــت، تەنانـەت بزنێكیشـت نـەدامێ تـاكو لەگـەڵ هاوڕێكـانم دڵـم پـێی خۆش بێـــت. [30]بـــەلام بـــۆ گەڕانـــەوەی كوڕەكـەت، ئـەوەی بـە ڕابـواردن لەگـەڵ داوێـن‌پیسان گوزەرانی تۆی خـوارد، گوێرەكەی دابەستراوی بۆ سـەردەبڕی. [31]ئینجا باوكەكـە پێی ووت: كـوڕم، تـۆ گشـت كـات

لەگەڵم دای، ئەوەی هەمە هی تۆیە، [32]بەڵام پێویستە دڵشاد بینو کەیفخۆش بین، چونکە براکەت مردبوو زیندووبووەوە، وونبوو بوو دۆزراوەتەوە.)

### نموونەی جێگری ناپاك

## 16

دیسانەوە عیسا بەقوتابیەکانی ووت: (سەرکاری کابرایەکی دەوڵەمەند کە دارایەکەی بۆ بەڕێوە دەبرد، تاوانبارکرا بەدەست بلاوی. [2]کابرای دەوڵەمەند بانگی کردو لێیپرسی: ئەمە چیە دەیبیستمەوە لێت؟ برۆ حیسابەکانت بکەو بیخە بەردەستم، ئیتر نامەوێ سەرکارم بیت. [3]کابرا لەدڵی خۆی ووتی: باشە ئیتر من چی بکەم، دوای ئەوەی گەورەکەم ئەم ئیشەم لێدەسێنێتەوە؟ نە دەتوانم زەوی بکێڵم نەسواڵیشم پێدەکرێ. [4]بەلاَم دەزانم چی دەکەم، ئەگەر دەرکرام لەکارەکەم هەتا هاوڕێیان پێشوازیم لێبکەن لەماڵەکانیان. [5]چوو قەرزارەکانی کابرای دەوڵەمەندی یەکە یەکە بانگکرد. لەیەکەمیانی پرسی: چەند قەرزاری؟ [6]وەلاَمی دایەوە: سەد پێوانە رۆن. ئینجا پێی ووت: قەیناکە تەنها پەنجا پێوانە دەنووسم. [7]لەوی تری پرسی: ئەی تۆ چەندت لەسەرە؟ ووتی سەد فەردە گەنم. پێی ووت: ئەوا هەشتا فەردەت بۆ دەنووسم. [8]لەدواییدا کاتێ کابرای دەوڵەمەند بەمەی زانی، ئافەرینی لەئیشکەرەکەی کرد، چونکە بۆ داهاتووی خۆی بەژیرانە بیری کردبووەوە. لەڕاستیدا ئەو مرۆڤانەی ئەم جیهانەیان هەڵبژاردووە، لێزانترن بۆ ژیانی سەر زەویان لەڕۆڵەکانی ڕووناکی. [9]هەروەها پێتان دەڵێم: سامانی لەناوچوو بۆ بەدەستهێنانی هاوڕێ بەکاربهێنن، تا ئەگەر پارەت نەما پێشوازیت لێبکرێ لەماڵی هەتاهەتایی.

[10](ئەوەی لەکەم دەستپاك بێت لەزۆریش دەستپاکە، ئەوەش لەکەم ناپاکە، لەزۆریش ناپاکە. [11]گەر ئێوە دەستپاك نەبن لەسامانی لەناوچوو، ئیتر کێ سامانی ڕاستی دەداتە دەستتان؟ [12]گەر ئێوە دەستپاك نەبن لەشتی خەڵکی کە، ئیتر کێ شتی خۆتان دەداتێ؟ [13]هیچ ئیشکەرێك ناتوانێ ملکەچی دوو گەورە بێت: بێگومان یەکێکیانی

لەوی تر زیاتر دەوێت، یان دەچێتە لای یەكێكیانو ئەوی تر بەجێدەهێڵێ. بەم شێوە ئێوەش ناتوانن، لەیەك كاتدا ملكەچی خوداو پارە بن.) [14]فەریسیەكان كە زۆر پارەیان خۆشدەویست، دوای ئەوەی گوێیان لەهەموو ئەمانە بوو، پێی پێكەنین. [15]ئینجا عیسا پێی ووتن: (ئێوە خۆتان لای خەڵكی بەچاك دەردەخەن، بەڵام خودا دڵتان باش دەناسێ. ئەوەی خەڵك پایەداری دادەنێ، لای خودا بێ پایەیە. [16]شەریعەتو فێركردنی پێغەمبەران كاری پێكرا هەتا هاتنی یەحیا، لەو كاتەوە مزگێنی پادشاهێتی خودا دەدرێو هەموو كەسێك هەوڵ دەدات بۆی. [17]بەڵام ئەمە لەیادمەكەن، نەمانی زەویو ئاسمان زۆر ئاسانترە، لەلابردنی خاڵێ لەخاڵەكانی شەریعەت.

**تەڵاق دان**

[18](ئەوەی ژنەكەی تەڵاق دەداتو یەكێكی كە دەهێنێ، ئەوا داوێنپیسی دەكات. ئەوەش كە تەڵاقدراوێك دەهێنێ بەهەمان شێوە داوێنپیسی دەكات.

**نموونەی هەژارێكو دەوڵەمەندێك**

[19]پیاوێكی زۆر دەوڵەمەند هەبوو، هەموو ڕۆژێك خەریكی ئاهەنگ گێڕان بوو، گرانبەهاترینو جوانترین جلی لەبەردەكرد. [20]كابرایەكیش ناوی لەعازر بوو، لەبەر دەرگاكەی كەوتبوو، برین لێی دابوو. [21]لەو بەر ماوەیەی دەخوارد كە فڕێ دەدرایە بەر دەرگا. زۆر جاریش سەگ دەهاتنو زمانیان بەبرینەكانی لەشیدا دەهێنا.

[22]كابرای هەژار مردو فریشتەكان بردیانە لای ئیبراهیم، پاشان كابرای دەوڵەمەندیش مردو نێژرا. [23]كاتێ سەری هەڵبڕی، سەیریكرد لەدۆزەخدایەو ئازار دەچێژێ. لەدوورەوە ئیبراهیمی بینیو لەعازر لەباوەشیدا بوو. [24]ئینجا هاواریكرد: ئەی ئیبراهیمی باوك، بەزەییت پێمدابێتەوە، لەعازر بنێرە تا پەنجەكانی بەئاو تەڕ بكاتو سەری زمانمی پێ ساردكاتەوە، ئەوەتا لەم ئاگرەدا ئازارم زۆرە. [25]ئیبراهیم پێی ووت: كوڕم، لەبیرتە تۆ چی خۆشی هەیە هەموویت كردو بینیت، لەعازریش چی دەردەسەری هەبوو بین، بەڵام ئێستا ئەو دڵنەوایی

دەكرێـتو تۆش ئازار دەچێژیت. [26] سەرەڕای هەموو ئەمانە لەنێوان ئێمەو ئێوە بۆشاییەكی گەورە هەیەو دانراوە، ئـەوەی بـیەوێ لـێرەوە بێـتە لاتـان ناتوانێـت، هـەمان شـت ئـەوەش كە دەیـەوێ لای ئـێوەوە بێـتە لامـان نـاتوانێ. [27]ئینجا كابرا ووتی: كەواتە لێـت دەپاڕێمـەوە لـەعازر بنێرە بۆ مـاڵی بـاوكم، [28]لـەوێ پێـنج بـرام هەیـە، تـاكو ئاگاداریـان بكاتـەوە، نـەوەك ئەوانیش بێنە ئەم دۆزەخەوە. [29]بـەڵام ئیـبراهیم پـێی ووت: ئەوان ﴿نووسینەكانی﴾ موساو پێغەمبەرانیان هەیـە، دەبـا گوێیان بـۆ ڕاگرن. [30] ئەمـیش پـێی ووت: نەخـێر، ئەگـەر یەكـێك لـەناو مـردووانەوە چوو بۆ لایـان، ئـیتر تۆبە دەكەن. [31]ئیبراهیم ووتـی: كـە ئـەوان گوێیان لەموساو پێغەمـبەران نەگـرت، ئـەوا بـاوەڕ بە مردووی زیندووبووەوەش ناكەن.)

## لـێخۆشبوون سنووری نییە

## 17

ئیـنجا عیسـا بـەقوتابـیەكانی ووت: (كۆسـپو گرفـت هـەر دێتە ڕێتان، بـەڵام قوڕ بەسەر ئەو كەسەی لەسەر دەسـتی دروسـت دەبـێ. [2]باشترە بۆ ئـەوكەسـە، بـەردی دەسـتاڕ بكرێتە مـلـیو فـڕێ بدرێتە دەریاوە، لەوەی ئـەم بچووكانە تووشی گوناە بكات. [3]ئاگاداری خۆتان بن، گەر براكەت هەڵەیكـرد، گلـەیی لـێبكـە، گەر تۆبـەیكـرد لـێیبـبورە. [4]ئەگـەر لـەڕۆژێكدا حـەوت جـار هەڵـەی بەرامـبەركردیـتو هـەر حـەوت جارەكەش گەڕایەوە لاتو ووتی: من تۆبـە دەكـەم، تـۆ لەسـەرتە لـێی بـبووری.) [5]ئیـنجا نـێرراوەكان بـەخوداوەندیان ووت: (باوەڕمـان زیادكـە!) [6]خوداوەندیش پێی ووتن: (ئەگـەر تـەنها ئـەوەندەی دەنكـە خەرتەلـەیێك باوەڕتـان هەبووایـە، بە دارتووتـان دەووت هەڵكەنـرێ لەو زەویـیە، بـڕۆ نـاو دەریـاوە ئەوسـا ئەویش بەقسەی دەكردن.

[7]كـێ لـەئێوە، گەر ئیشكەرێكی هـەبێو خـەریكی كـاری كـێڵگەو لـەوەڕاندن بێـت، دوای ئـەوەی كە دەگەڕێـتەوە، پـێی دەڵـێ: یەكسـەر وەرە سـەرخوان؟ [8]ئایـا پـێی نـاڵێ شـتێكم بـۆ بهێنە با نانی ئێوارە بخۆم، دان بەخۆت بگرەو بەردەستیم بكە تا لـەنانەكـەم دەبمەوە. ئینجا نۆرەی تۆ دێـت بـۆ خواردنو خواردنەوە. [9]ئایا

ئیشکەر شایانی سوپاسە گەرکارێکی سەرشانی خۆی جیٚبەجیٚ بکات؟ [10] ئێوەش بەم شێوەیە، کاتیٚ ئەو فەرمانەی پێتان دراوە دەیکەن، بلێن ئێمە ئیشکەری بیٚسوودین کاری سەرشانی خۆمان جیٚبەجیٚکردووە.)

**چاکردنەوەی دە نەخۆش**

[11]کاتیٚ عیسا بەرەو قودس دەچوو، بەسامیرەو جەلیلدا ڕۆیشت. [12]کاتیٚ چووە یەکێك لەدێیەکان تووشی دە پیاوی گول بوو، کە لەدوورەوە وەستابوون، [13] هاواریان کردو وتیان: (ئەی عیسا، ئەی مامۆستا، بەزەییت پیاماندا بێتەوە.) [14]ئەویش سەیری‌کردنو پێی ووتن: (بڕۆن خۆتان پیشانی کاهینەکان بدەن.) کاتیٚ ڕۆیشتن لەڕێگا چاكبوونەوە. [15]یەکێك لەوانە کە سەیری خۆیکرد وا پاك بووتەوەو برینی پێوە نەماوە، گەڕایەوە بەدەنگی بەرز ستایشی خودای‌کرد، [16]لەبەرپێی عیسا خۆی بەدەمدا خستو سوپاسیکرد، ئەم کابرایەش سامری بوو.

[17]ئینجا عیسا ووتی: (ئایا ئەوانەی پاكبوونەوە دە کەس نەبوون، کوا نۆیەکەیتر؟ [18] کەسیٚکە نەبوو لەوانە بگەڕێتەوەو ستایشی خودا بکات، تەنها ئەم بێگانەیە نەبیٚ؟) [19]ئینجا پێی ووت: (هەستە بڕۆ، باوەڕت ڕزگاری‌کردی.)

**هاتنی پادشاهێتی خودا**

[20]کاتیٚ فەریسیەکان لێیان پرسی: (پادشاهێتی خودا کەی دێت؟) وەلاٚمی دانەوەو ووتی: (پادشاهێتی خودا شتیٚ نییە بەچاو ببینریٚ، [21] کەس ناتوانیٚ بەپەنجە نیشانیداو بلیٚ ئەمەتا یان ئەوەتا، چونکە پادشاهێتی خودا لەناوەڕۆکتاندایە.)

[22]ئینجا بەقوتابیەکانی ووت: (ڕۆژانێك دێت، هیوا دەخوازن تەنها ڕۆژێك لەڕۆژانی ڕۆڵەی مرۆڤ ببینن، بەلاٚم نایبینن. [23]ئینجا هەندیٚ هەن پێتان دەلێن، ئەوەتا لەوێیە یاخود وەرن ئەمەتا لێرەیە، مەڕۆنو دوایان مەکەون. [24]وەك بروسکە چۆن لەئاسمان گەر لەلایەکەوە بێت، لایەکەی تریش ڕووناك دەکاتەوەو دەبینریٚ، هاتنەوەی ڕۆڵەی مرۆڤیش بەو شێوەیە دەبێت. [25]بەلاٚم پێویستە جاریٚ پێش ئەوە، زۆر ئازار بکێشیٚو

ئەم نەوەیەش ڕەتیبکەنەوە. [26]چی لەسەردەمی نوح ڕوویدا، هەمان شت لەسەردەمی ڕۆڵەی مرۆڤدا ڕوودەدات. [27]خەڵکی خەریکی خواردنو خواردنەوەو شووکردنو ژنهێنانی خۆیان بوون، تا ئەو ڕۆژەی نوح چووە ناو کەشتیەکەو باوباران دەستی پێکردو هەموویانی لەناوبرد. [28]دیسان وەك سەردەمی لوت کەخەڵکی هەموو خەریکی خواردنو خواردنەوەو کڕینو فرۆشتنو چاندنو دروستکردن بوون، [29]بەڵام لەو ڕۆژەی کە لوت لەشاری سەدوم چووە دەرەوە، خودا ئاگرو گۆگردی لەئاسمانەوە بەسەر شارەکەیان باراندو هەمووی لەناوبردن، [30]لەگەڕانەوەی ڕۆڵەی مرۆڤیشدا هەمان شت ڕوودەدات. [31]ئەوەی لەو ڕۆژەدا لەسەربانە پێویست ناکات ڕاکاتە خوارەوە بۆ بردنی شتەکانی. ئەوەش کە لەکێڵگەدا کاردەکات ئیتر پێویست ناکات بگەڕێتەوە. [32]بیهێنەوە بەرچاوی خۆتان ئەوەی بەسەر ژنەکەی لوت* هات. [33]ئەوەی بیەوێ ژیانی بپاتەوە دەیدۆڕێنێ، ئەوەش ژیانی دەدۆڕێنێ دەیباتەوە.

[34]پێتان دەڵێم: لەو شەوەدا دوو کەس لەناو جێگایەکدان، یەکێکیان دەبردرێو ئەوی کەیان بەجێدەمێنێ. [35]یان دوو ژن بەیەکەوە دەستاڕ دەکەن، یەکێکیان دەبردرێو ئەوی کەیان بەجێدەمێنێ. ﴿[36]هەروەها دوو کەس لەکێڵگەیەکدا بەیەکەوە کار دەکەن، یەکێکیان دەبردرێو ئەوی کەیان بەجێدەمێنێ.﴾ [37]قوتابیەکان لەعیسایان پرسی: (ئەمە لەکوێ دەبێ گەورەم؟) ئەویش وەڵامی دانەوە: (لەکوێ کەلاك هەبێت داڵ لێی کۆدەبێتەوە.)

## نموونەی بێوەژنێكو دادوەرێك
## 18

عیسا نموونەیەکی بۆ باسکردن، بۆ ئەوەی بەبەردەوامی نوێژبکەن بەبێ بێزاری، [2]ووتی: (لە شارێکدا دادوەرێك هەبوو نە لەخوادەترسا نە لەمرۆڤ. [3]هەر لەو شارەش بێوەژنێك هەبوو زۆر دەچووە لای بۆ داواکردنی مافێکی خۆی لەناحەزەکانی. [4]ئەویش داواکاریەکەی بەردەوام پشتگوێ دەخست. بەڵام دادوەرەکە دوای

ماوەیەك لەدڵی خۆی ووتی: باشە من وەك لەخوداو لەكەس ناترسم، [5]با هیچ نەبێ لەبەرئەوەی ئەو بێوەژنە ئەوەندە بێزاری كردووم، با مافی بۆ وەرگرم، ئەگینا وازناهێنێو هەردێتو سەرم دەهێنێتە ئێش.)

[6]خوداوەند ووتی: (گوێبگرن ئەم دادوەرە زۆردارە چی دەڵێ، [7]چۆن خودا ماف وەرناگرێ بۆ هەڵبژێراوانی ئەوانەی شەوو ڕۆژ لێیدەپاڕێنەوە؟ ئایا درەنگ وەلامیان دەداتەوە؟ [8]پێتان دەڵێم: ئەو خێرا مافیان بۆ وەردەگرێ. بەلام كاتێ ڕۆلەی مرۆڤ دەگەڕێتەوە، ئایا باوەڕ دەبینێ لەسەر زەوی؟)

### نموونەی فەریسیو باجگر

[9]ئەم نموونەیەی هێنایەوە بۆ ئەوانەی خۆیان بەپیاوچاك دادەنێنو ڕقیان لەخەڵكی دیكەیە. [10]ووتی: (دوو كەس چوونە پەرستگا بۆ نوێژكردن یەكێكیان فەریسی بوو، ئەوی كەشیان باجگر بوو. [11]فەریسیەكە لەدڵی خۆی ووتی: سوپاس بۆ تۆ ئەی خودا من وەك خەڵكیتر نیم، ئەوانەی چاوبرسیو گوناهبارو داوێن پیسن، هەروەها وەك ئەم باجگرەش نیم. [12]لەهەفتەیەكدا دووجار بەڕۆژوو دەبم، دەیەكی ئەوەی دەستم دەكەوێ دەیبەخشم.

[13]بەلام باجگرەكە لەدوورەوە ڕاوەستاو نەیتوانی ڕوو بەرزكاتەوە بۆ ئاسمان، بەڵكو لەسنگی خۆیداو ووتی: ئەی خودا تووڕەیی خۆت لەسەر منی گوناهبار لادە. [14]با من پێتان بڵێم، ئەم باجگرە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بە بێتاوانی، بەپێچەوانەی كابرای فەریسی. ئەوەی خۆی بەرز بگرێ نزم دەكرێتەوە، ئەوەش خۆی نزم دەكاتەوە بەرزدەكرێتەوە.)

### منداڵ شتێكی پیرۆزە

[15]ئینجا هەندێ كەس منداڵانیان هێنا بۆ لای عیسا، تاكو دەستیان لێدات، بەلام قوتابیەكان ڕێیان لێگرتن. [16]جا عیسا منداڵەكانی بانگكرد بۆ لای خۆیو ووتی: (واز

---

* ژنەكەی لوت: كاتێ ژنەكەی لوت لەگەڵ مێردەكەی سەدومی جێهێشت دڵی هەر لای ئەو شتانەبوو كە جێیهێشتبوو لەڕێ سەیری دواوەیكرد بۆیە دەستبەجێ بوو بەپەیكەرێكی خوێو لەشوێنی خۆی ڕەق بوو.

لەمـندالاَن بهێنن با بێن بۆ لام، ڕێیان لـیٚمەگـرن، چونکە پادشاهێتی خودا بـۆ ئەوانەیـە کـە وەکـو ئـەمانن. [17] ڕاســتیتان پیٚدەڵــێم: ئــەوەی وەك منداڵێك پادشاهێتی خودا وەرنەگریٚ ناچێتە ناوی.)

**دەوڵەمەندیو ژیانی هەتاهەتایی**

[18]دوای ئەمــــە، کابــــرایەکی دەســـەلاَتدار، پرسـیاری لـیٚکــردو ووتــی: (ئــەی مامۆســتای بــاش، چـیبکـەم هـەتا ژیـانی هەتاهــەتایی بەدەســــت بهێـــــنم؟) [19]عیســــا وەلاَمیدایـــەوە: (بۆچـــی بـــانگم دەکەیـت باش؟ کەس باش نییە تەنها خـودا نـەبیٚ. [20]تـۆ ڕاسـپاردەکان دەزانیـــت: داوێـــن پیســـی مەکـــە، خـــەڵکی مــەکوژە، دزی مەکـــە، شـایەتی درۆ مـەدە، ڕێـزی دایـكو باوکت بگرە.) [21]ئینجا کابرا ووتی: (ئەمانــە هــەمووی لـــەمنداڵـــیەوە زانـیومەو لەسـەری ڕۆیشتووم.) [22] کــاتیٚ عیســا گوێــی لەمــە بــوو، بــەکابــرای ووت: (کەواتــە تــەنها شـتێکت ماوە، چیت هەیە بیفرۆشەو بەشـیکە بەسـەر هـەژاران، تـاکو لـەئاسمـان گەنجیـنەی خۆت دانێیت، ئینجا وەرە دوامکەوە.) [23]بەلاَم کاتیٚ کابــرا ئەمــەی بیســـت، خەفەتـیٚکی زۆری خـــوارد لەبەرئـــەوەی زۆر دەوڵەمەند بوو. [24]کاتیٚ عیسا ئەمەی لــەکابــرا بـینی، ووتـی: (ئـای چەند گـــــرانە، چــــــوونە ژوورەوەی دەوڵەمــەندەکان بـۆ نـاو پادشاهێتی خــــودا. [25]چــــوونە ژوورەوەی حوشتریٚ لەکونی دەرزیەوە، ئاسانترە لەچوونە ژوورەوەی دەوڵەمەندیٚ بۆ پادشـاهێتی خودا.) [26]ئەوانەی لەویٚ بـوونو گوێـیان لەمـە بوو، ووتیان: (کەواتـە کـیٚ ڕزگـاری دەبێت؟ [27] عیساش ووتی: (ئەوەی لای خەڵکی نایێــت، لای خودا دەبێت.) [28]ئینجا پەتـرۆس ووتـی: (ئەوەتا ئێمە هەموو شــــتێکمان بەجیٚهێشــــــتووەو دواتکـەوتووین.) [29]ئـەویش پـێی ووتـن: (ڕاسـتیتان پـیٚ دەڵێم: کەس نیـیە مـاڵ یـاخود ژن، یـاخود براو بـاوكو دایکـی یان منداڵی لەپێناوی پادشـاهێتی خـودا بەجیٚهێشتبیٚو [30] دوو ئـــــــەوەندەی ئـــــــەوەی بەجێیهێشـتووە هـەر لـەم جیهانەدا وەرنەگرێتەوەو لە جیهانی داهاتووش ژیانی هەتاهەتایی.)

**باسی مردنو هەستانەوەی عیسا**

[31]عیسـا دوای ئەمە، هەر دوانزە قوتابیەکەی بـانگ کـردو پێی ووتن: (ئـەوا ئـێمە بـەرەو قـودس دەڕۆین، هەرچـی پێغەمـبەران لەبارەی ڕۆڵەی مـرۆڤەوە نووسـیویانە، هـەمووی دێـتەدی. [32]ئـەو دەدرێـتە دەسـتی ناجوولەکەکانو گاڵتەی پێدەکرێو جوێـنی پـێدەدرێو تفیشـی لـێدەکەن. [33]دوای ئەوەی بەقامچی لـێی دەدەن، دەیکـوژن. ئیـنجا لـەڕۆژی سێهەمدا زیندوودەبێتەوە.) [34]بـەڵام ئەوان هیچ لـەمە نەگەیشتن، چـونکە ئەم باسە جارێ لایان شاراوە بوو.

**عیسا کوێرێك چاك دەکاتەوە**

[35]کـاتێ عیسـا گەیشـتە دەورووپشـتی ئـەریحا، کابـرایەکی کوێـری بینی لەسەر ڕێگا دانیشتبوو، سـواڵی دەکرد. [36]کابراکە کە گوێی لـەڕۆیشتنی خەڵکەکە بوو، پرسیاری کـرد، ئەمـە چـیە؟ [37]پێـیان ووت: (عیسـای ناسـیری لـێرەوە تێدەپـەڕێ.) [38]ئیـنجا کابـرا خێرا هـاواریکـردو ووتی: (ئەی عیسای ڕۆڵەی داود، بەزەییت پێمدابێتەوە.) [39]ئەوانـەی لەپێشـەوەبوون سەرزەنشـتیانکردو داوایان لـێکرد بێدەنـگ بێـت، بـەڵام ئـەو زیاتـر هـاواری دەکـردو دەیقیڕاند: (ئەی ڕۆڵـەی داود، بەزەییت پێمدابێتەوە.) [40]عیسا ڕاوەستاو فەرمانیدا بیهێنن بۆ لای. کاتێ نزیك بووەوە، لێیپرسی: [41](چیت لـەمن دەوێ بۆتی بکەم؟) کابـرا ووتـی: (گـەورەم ڕوونـاکی بگەڕێـنەوە بـۆ چاوم.) [42]ئینجا عیسا پـێی ووت: (چاوت بکەوە، باوەڕت چـاکی کردیـتەوە.) [43]دەسـتبەجێ کابـرا چـاوی کـردەوەو ڕوونـاکی تێکەوت، دوای ئەمە کابرا بەستایش کـردنی خـوداوە دوای کـەوت. خەڵکەکـەش کـە ئەمـەیان بـینی، دەستیانکرد بەستایشکردنی خودا.

**عیسا دەبێتە میوانی زەکا**

# 19

ئیـنجا عیسـا چـوو بـۆ ئەریحاو بەناو شـارەکە تێدەپەڕی. [2]لەوێ کابرایەك هـەبوو نـاوی زەکـا بـوو. گـەورەی باجگـرەکان بـوو، کابـرایەکی پـارەداریش بـوو. [3]دەیویسـت عیسا ببینێـتو بـزانێ چۆنە، بەڵام نەیتوانی چـونکە بـاڵای کـورت بـوو. [4]

بەڕاکـردن ڕۆیشـتو بـەدارێکی ئەو ناوەدا هەڵگەڕا بەهیوای ئەوەی لەناو خەڵکەکـەدا عیسـا ببینێـت، کـاتێ بەوێدا دەڕوات.

[5]کـە عیسـا گەیشـتە ئەو شوێنە، چـاوی هەڵـبڕیو زەکـای بینی، پێی ووت: (زەکـا، خێرا وەرە خوارەوە، چـونکە مـن ئەمـڕۆ مـیوانی تۆم.) [6] زەکـاش بەخـێرایی هاتـە خـوارەوەو بەخۆشـیەوە پێشـوازی لـیێکـرد. [7] کـاتێ خەڵکەکـە ئەمـەیانبیـنی، دەسـتیانکـرد بـە بۆڵـەبۆڵکـردنو وتـیان: (ئـەوەتا دەچـێتە مـاڵی کەسـێکی گوناهـبار.) [8]زەکـا لـەبـەردەمی عیسـادا ڕاوەسـتاو پێی ووت: (گـەورەم من دەمەوێ نیوەی سـامانم دابەشـکەم بەسـەر هەژارانو ئـەوەی زۆرم لـیێسـەندوەو شـتێکم لـێـیداگیرکردووە بەچوار قات بۆی دەگەڕێـنمەوە.) [9]ئێـنجا عیسـا پـێی ووت: (ئـەوا ئەمـڕۆ ئەم ماڵو خێزانە ڕزگاریـان بـوو، لەبەرئـەوەی ئـەم پیاوەش لەنەوەی ئیبراهیمە. [10]چونکە ڕۆڵـەی مرۆڤ هاتووە بۆ دۆزینەوەی ونبووەکانو ڕزگارکردنیان.)

**نموونەی بەشە زیو**

[11]کـاتێ خەڵکەکـە گوێـیان گرتـبوو، باسی نموونەیەکی بۆ کردن چـونکە خەریك بوو لەشاری قودس نـزیك دەبـووەوە، زۆریـش باوەڕیان بەوەبوو کە پادشاهێتی خودا خەریکە وا دەردەکـەوێ. [12]عیسـا ووتـی: (گـەورە پیاوێك ڕۆیشت بۆ شارێکی دوور، بۆ وەرگرتنی حوکمڕانی ئینجا بگەڕێـتەوە. [13]پێش ئەوەی بڕوات دە ئیشـکەری خـۆی بـانگکردو بەهەر یەکێکـیان دە بەشـە زیـوی دانـیێو ووتی: (بازرگانی بەم دراوانەوە بکەن تـا دەگەڕێمـەوە. [14]دانیشـتوانی ئەو ناوچـەیە کابرایان خۆش نەدەویست، دوابـەدوای ئـەو خەڵکیان نارد تاکو لـەوێ بڵـێن: ئـێمە نامانـەوێ ئـەم کابـرایە فەرمانـڕەوایمان بەسـەردا بکـات. [15]بـەڵام ئـەو فەرمانـڕەوایی ناوچـەکەی وەرگـرت. کـاتێ گەڕایـەوە، فەرمانیدا ئەو دە کەسەی پارەکـەی دابوونـێ بێنە لای، تابزانێ هـەر یەکـە لـەو پارەیـەی کە لایەتی چـەندی قازانج کردووە. [16]یەکەمیان هاتـە پێشـەوەو ووتـی: گـەورەم دە بەشە زیوەکەت دە بەشی تری قازانج کـردووە. [17]ئـەویش پـێی ووت:

ئافــەرین ئــەی ئیشــکەری چــاك، لەبەرئــەوەی لــەم پـارە کەمە دەست پـاك بوویت، برۆ فەرمانڕەوابە بەسەر دە شــاری ناوچــەکەم. [18]دووەمــیان هاتــە پێشــەوەو ووتــی: گــەورەم دە بەشــە زیوەکــەت پێــنج بەشــیتری قازانج کردووە. [19]بەمەشیانی ووت: بـرۆ ببە بـە فـەرمــانڕەوا بــەســەر پێنــج شاردا.

[20]ئیـنجا یەکـێکیتریان هاتە پێشەوەو ووتــی: گــەورەم ئـا ئـەوەتا دە بەشە زیوەکــەت بــەپێچــراوەیی لـــەم دەستەسڕەدا پارێزگاریم کردووە، [21]لەڕاستیدا لێـت دەترسـم چونکە تۆ مرۆڤـێکی تونـدوتـیژی، دەیبەیـت لـەوەی داتنەناوەو دروێنە دەکەیت لـەوەی نەتچاندووە. [22]ئەویش پێی ووت: ئـەی ئیشـکەری بـەدکار هەر بەقسەکانت تاوانبارت دەکەم، تۆ کە زانیـت مـن کابـرایەکی تونـدوتیژم، ئـەوەی دام نـەناوە دەیـبەمو ئـەوەی نـەمچـاندووە درویـنەی دەکـەم. [23]بۆچـی نەچوویت پارەکەم ببەیتە لای پـارە گۆڕەوەکـان، تـاکو لـەکـاتی گەڕانــەوەم خــۆیو قازانجەکەشــیم وەربگـرتایە. [24]ئیـنجا بەوانەی ووت کـە لەوێدا ڕاوەستاون. هەر دە بەشە زیوەکـەی لێبسەننەوەو بیدەن بەوەی دە بەشــەکەی قــازانج کــردووە. [25]ئەوانیش پێیان ووت: گەورەم ئەو دە بەشــە زیــوی تریشی پێیە، [26]ئەویش ووتــی: مـــن پێتان دەڵـێم ئــەوەی هەیەتی زیاتری پێدەدرێ، ئەوەش کە نــــیەتی، ئــــەوەی لایـــــەتـی لێیدەسـەنـرێتەوە. [27]دوژمنەکانیشم، ئەوانـەی نـەیان دەویسـت بەسـەریان فەرمانـڕەوایی بکەم، بیانهێنن بۆ ئێرەو لەبەردەمم بیانکوژن.)

### عیسا بۆ قودس دەڕوات

[28]دوای ئەوەی عیسا ئەم قسانەی تەواوکرد، کەوتە ڕێ بەرەو قودس. [29]کـاتێ لـەدێـی بەیتفاجیو لەدێی بەیـتعەنـیا نـزیك بووەوە، لای ئەو شـاخە بەناوبانگـەی شـاخی زەیتونی پێدەوتـرێ، دووان لــەقوتابـیەکانی نـاردو [30]پـێی ووتـن: (بـڕۆن بۆ ئەو دێـیەی بەرامـبەر، کـاتێ دەچـنە نـاو دێکە دەبینن جاشکێك بەستراوەتەوە، ئـەو جاشـکە تـا ئێستا هیچ کەسێك سـوارى نـەبووە، گوریســەکەی بکەنـەوەو بیهێـنن بـۆ ئـێرە. [31]گـەر یـەکێ پرسـیاری لـێکـردن، بۆچـی گوریســەکەی دەکەنـەوە؟ پێی بڵێن،

گەورەمان پێویستی پێی هەیە.) [32]دوو قوتابیەکە ڕۆیشتن، عیسا چی پێ ووتبوون بینییان. [33]کاتێ گوریسی جاشکەکەیان دەکردەوە، خاوەنەکەی لێیانی پرسی: (بۆچی گوریسی ئەو جاشکە دەکەنەوە؟) [34]ووتیان: (گەورەمان پێویستی پێیەتی.) [35]ئینجا هێنایان بۆ عیساو کراسەکانیان خستە سەر پشتیو عیسایان سوارکرد. [36]لەوکاتەدا کە عیسا بەڕێوەبوو، خەڵکەکە کراسیان دادەکەند، لەسەر ئەو ڕێگایەی کە پیایدا دەڕۆیشت ڕایان دەخست. [37]کاتێ لەلێژایی شاخی زەیتون نزیك بووەوە، قوتابیەکانی هەموو زۆر بەشادیەوە بەدەنگی بەرز ستایشی خودایان دەکرد بۆ ئەو هەموو کارە سەرسوڕهێنەرانەی کە لەعیسایان بینی بوو، [38]دەیان ووت: (پیرۆزە ئەو پادشایەی بەناوی خوداوەندەوە دێت، ئاشتی لەئاسمانو شکۆ لەبەرزایی.) [39]بەڵام فەریسیەکانو هەندێ لەخەڵکەکە، بەعیسایان ووت: (مامۆستا قوتابیەکانت بێدەنگ بکە.) [40]ئەویش ووتی: (با پێتان بڵێم: ئەگەر ئەوانیش بێدەنگ بن، بەردەکان دێنە هاوارکردن.)

### عیسا بەزەیی بە قودس دێتەوە

[41]کاتێ عیسا لەشاری قودس نزیك بووەوەو بینی، بۆی گریاو [42]ووتی: (خۆزگە بتزانیبایە تەنانەت ئەمڕۆش، چییە ئاشتیت بۆ دەهێنێت. بەڵام نەخێر، ئەمە شاراوەیە لەبەرچاوت. [43]ڕۆژێ دێت، دوژمنەکانت بەچەکو تفاقەوە، لەهەموو لایەکەوە ئابلۆقەت دەدەنو چاوت تێدەبڕن. [44]دەتڕوخێنن بەسەر دانیشتوانتو بەردت بەسەر بەردتەوە ناهێڵن، چونکە نەتزانی خودا کەی بەسەرت دەکاتەوە.)

### عیسا پەرستگا پاك دەکاتەوە

[45]کاتێ عیسا چووە پەرستگا، دەستی کرد بەدەرکردنی ئەو کەسانەی تیایدا خەریکی کڕینو فرۆشتن بوون. [46]پێی ووتن: (خودا لەکتێبی پیرۆزدا فەرموویەتی: {ماڵم، ماڵی نوێژکردنە }کەچی ئێوە کردووتانە بە {ئەشکەوتی دزان.})

[47]دوای ئەمە عیسا هەموو ڕۆژێ لەپەرستگادا، خەریکی فێرکردن بوو، هەرچەندە سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەتو گەورە پیاوانی گەل دەیانویست بیکوژن. [48]

بەلام نەیانتوانی، چونکە خەڵکێکی زۆر لەدەورویشتی بوون بۆ گوێگرتن.

## پرسیاری بێ وەڵام

# 20

ڕۆژێکیان عیسا لەپەرستگادا خەڵکی فێردەکردو مزگێنی دەدانێ، سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەتو پیرانی گەل هاتنە لای، [2]ووتیان: (پێمان بڵێ، بەچ دەسەڵاتێك ئەم کارانە دەکەیت؟ یان کێیە ئەم دەسەڵاتەی داوەپێت؟)

[3]عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (منیش پرسیارێکم هەیە لێتان، وەڵامی بدەنەوە، [4]خەڵك لەئاوهەڵکێشانی یەحیا، لەئاسمانەوە بوو یان لەخەڵکەوە؟) [5]ئینجا ئەوان لەنێوان خۆیاندا کەوتنە ڕاوێژو ووتیان: (ئەگەر بڵێین لەئاسمانەوە بوو، دەڵێت باشە بۆ باوەڕتان پێنەکرد؟ [6]ئەگەر بڵێین لەخەڵکەوە بوو، ئەوسا خەڵکەکە دەکەونە بەردبارانمان، چونکە یەحیا بەپێغەمبەر دادەنێن.) [7]وەڵامیاندایەوە: (نازانین لەکوێوەیە.) [8]عیساش پێی ووتن: (کەواتە منیش پێتان ناڵێم بەچ دەسەڵاتێك ئەمانە دەکەم.)

## نموونەی ڕەزەوانەکان

[9]دیسان کەوتەوە قسەکردن بۆ خەڵکەکەو ئەم نموونەیەی بۆ گێڕانەوە، ووتی: (کابرایەك ڕەزێکی ترێی چاندو دایە دەست چەند ڕەزەوانێك، بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ ئەوێی بەجێ هێشت. [10]لەوەرزی بەرووبووم کۆکردنەوەدا، ئیشکەرێکی خۆی نارد بۆ لای ڕەزەوانەکان، تاکو بەرووبوومی ڕەزەکەی بۆ بهێنێ. بەلام ڕەزەوانەکان لێیانداو بەدەستی بەتاڵ ناردیانەوە. [11]کابرا ئیشکەرێکی کەی نارد. بەلام لەویشیانداو بەدەستی بەتاڵ ناردیانەوە. [12]دیسان کابرا ئیشکەرێکی تری نارد، کەچی ئەمیشیان برینداریان کردو فڕێیاندایە دەرەوەی ڕەزەکە.

[13](کابرای خاوەن ڕەز ووتی: باشە من چی بکەم؟ لەدوایدا ووتی: کوڕەکەم دەنێرم، لەوانەیە سڵی لێبکەنەوەو لێی بترسن. [14]هەرکە ڕەزەوانەکان کوڕەکەیان بینی، خێرا لەنێوان خۆیان کەوتنە ڕاوێژکردنو ووتیان: ئەوەتا ئەوەی ڕەزەکەی بۆ

دەمێنێتەوە بەمیرات، باهەستین بیکوژین، تاکو بکەوێتە دەستی خۆمان. [15]ئینجا هەستانو کوڕەیان بردە دەرەوەی ڕەزەکەو کوشتیان. ئایا کابرای خاوەن ڕەز دەبێ چیان لێبکات؟ [16]دێتو هەموویان دەکوژێتو ڕەزەکە دەدا بەڕەزەوانانی تر.)

کاتێ گوێیان لەمەبوو هەندێکیان وتیان: (خودا نەکات!)

[17]ئەویش سەیری کردنو ووتی: (کەواتە ئەوەی لەکتێبی پیرۆزدا نووسراون مانای چییە؟ {ئەو بەردەی وەستاکان ڕەتیانکردەوە، بوو بەبەردی بناغە.} [18]ئەوەی بکەوێتە سەر ئەو بەردە شکست دەبێت، ئەوەش کەبەردەکەی بەسەردا دەکەوێت بەتەواوی پانی دەکاتەوە.)

[19]سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت، دەیانویست لەوکاتەدا عیسا بگرن، چونکە زانییان مەبەستی ئەوانە لەو نموونەیە، بەلاّم لە گەل دەترسان.

**سەرانەدان بەقەیسەر**

[20]ئینجا عیسایان خستە ژێر چاودێرییەوە، سیخوڕیان بەلاّ وکردەوە لەدەورووبەری، خۆیان بە پیاوچاك دەردەخست، تا بەووشەیەك بیگرنو بیدەنە دەستی فەرمانڕەوایانەوە. [21]دەستیانکرد بەپرسیارکردن لێی بەم شێوەیە: (مامۆستا ئێمە دەزانین تۆ لەسەر ڕاستی دەڕۆیتو ڕاستیش فێری خەلّکی دەکەیت، گوێ نادەیتە هیچ کەسێ، هەولّدانت تەنها بۆ فێرکردنی ڕاستی ڕێگای خودایە. [22]جا لێت دەپرسین، ئایا دروستە ئێمە سەرانە بەقەیسەر بدەین یان نا؟) [23]عیسا بەفێلّەکەیانی زانیو ووتی: [24](دینارێکم بدەنێ، ئا ئەم نووسینەو ئەم وێنەیەی لەسەریکراوە، هی کێیە؟) ووتیان: (وێنەی قەیسەر.) [25]ئەویش پێی ووتن: (دەکەواتە ئەوەی هی قەیسەرە بیدەن بەقەیسەر، ئەوەش هی خودایە بیدەن بەخودا.) [26]لێرەدا نەیانتوانی بەهیچ شێوەیەك، تاوانباری کەن لەبەردەم گەل، ئیتر سەرسام بوون لەوەلاّمدانەوەکەیو بێدەنگ بوون.

**زیندووبوونەوە**

[27]هەندێ لەسەدوقیەکان، ئەوانەی باوەڕ بەزیندووبوونەوە

ناکەن، لەعیسا هاتنە پێشەوەو پرسییان: [28](ئەی مامۆستا، موسا بۆی نووسیوین، ئەگەر یەکێ برایەکی خێزانداری مردو مندالّی نەبوو، لەسەری پێویستە براژنەکەی بهێنێت‌و بەناوی براکەیەوە وەچە بخاتەوە. [29] جا حەوت برا هەبوون، یەکەمیان ژنی هێناو مرد بێئەوەی منداڵ بەجێبهێڵێت. [30]دوایی برای دووەم ژنەکەی هێناو ئەویش مرد. [31] ئینجا برای سێهەم هەتا گەیشت بەبرای حەوتەم ئیتر هەموو مردن بێئەوەی نەوە بخەنەوە. [32]لەدوایدا ژنەکەش مرد. [33]ئایا لەڕۆژی زیندووبوونەوەدا، ئافرەتەکە دەبێ بەژنی کامیان؟ چونکە ژنی هەر حەوتیان بووە.) [34]عیسا وەڵامی دانەوەو ووتی: (مرۆڤی ئەم سەردەمەی ئێستا، ژن دەهێنن‌و شوودەکەن. [35]بەڵام ئەوانەی لەڕیزی بەشدارانی سەردەمی داهاتوودان دوای زیندووبوونەوە، ژن ناهێنن‌و شووناکەن. [36]ئیتر ئەوان نامرن، چونکە وەك فریشتەن، ئەوان ڕۆڵەی خودان، ڕۆڵەی زیندووبوونەوەن. [37] بەڵام دەربارەی زیندووبوونەوەی مردووان، تەنانەت موساش پێشانی داوە لەدەوەنەکە، کاتێ خوداوەندی بانگ‌کرد بە {خودای ئیبراهیم‌و خودای ئیسحاق‌و خودای یاقوب.} [38]ئەو خودای مردووان نییە، بەڵکو خودای زیندووانە، لای ئەو هەموو زیندوودەبنەوە.) [39]هەندێ لەمامۆستایانی شەریعەت ووتیان: (مامۆستا، بەڕاستی باشت ووت.) [40]ئیتر دوای ئەمە کەسیان نەیانوێرا هیچی تری لێبپرسن.

**عیساو داود**

[41]ئینجا عیسا پرسی‌و ووتی: (باشە چۆن ئێوە دەڵێن: مەسیح ڕۆڵەی داودە، [42]کاتێ داود خۆی لەزەبوورا دەڵێ: {خوداوەند بەخوداوەندمی فەرموو: لەلای دەستی ڕاستمەوە دانیشە [43]تا دوژمنانت بخەمە ژێر پێتەوە.} [44] ئەوەتا داود بەخوداوەندی خۆی دایدەنێت، ئیتر چۆن دەبێتە کوڕی؟)

**ئاگاداركردنەوە**

[45]لەوکاتەدا کە خەڵکەکە هەموو گوێیان گرتبوو، بەقوتابیەکانی ووت:

[46](ئاگاداری مامۆستایانی شەریعەت بن، ئەوانەی بەجلی جوانی بریسکەدارەوە دەگەڕێنو حەزدەکەن لەگۆڕەپانەکانی شار سلاویان لێبکرێتو لەکەنیشتەکاندا ڕیزی پێشەوە دەگرن، هەروەها ڕیزی یەکەمیش لەکاتی بانگکردن بۆ نانخواردن. [47]ماڵی بێوەژن دەخۆنو بۆ خۆدەرخستن درێژە بەنوێژەکانیان دەدەن. جا ئەوانە توندترین سزا دەدرێن.)

## بەخشین لە پێویستی خۆت

# 21

لەکاتێکدا عیسا دەیڕوانیە ئەو پارەدارانەی پارەیان دەبەخشی بۆ سەندوقی پەرستگا. [2]بێوەژنێکی هەژاری بینی دوو پوول دادەنێت. [3]ئینجا ووتی: (ڕاستیتان پێ دەڵێم، ئەم بێوەژنە، لەهەموو ئەوانەی تر زیاتر پارەی دانا. [4]چونکە ئەوانەی تر لەوەی لەخۆیان زیادە بەخشیان، بەڵام ئەم بێوەژنە، ئەو پارەیەی بەخشی کە پێویستی پێیەتی بۆ ژیانی خۆی.)

## باسی وێرانبوونی پەرستگا

[5]عیسا دوای ئەمە گوێی لەهەندێکیان بوو باسی پەرستگاکەیان دەکرد کە چۆن بەبەردی جوانو ئەو دیاریانەی پێشکەشی کراون ڕازێندراوەتەوە، ووتی: [6](ئەمەی ئێستا دەیبینن، ڕۆژێ دێت بەردی بەسەر بەردیەوە نامێنێتو دەڕوخێت.)

## نیشانەکانی کۆتایی زەمانە

[7]ئینجا لێیان پرسی: (مامۆستا کەی ئەمە دەبێت؟ ئەو نیشانانە چییە کە دەردەکەوێت، کاتێ ئەم ڕووداوە نزیک دەبێتەوە؟) [8]عیسا ووتی: (ئاگاداربن هەڵنەخەڵەتێن زۆر هەن بەناوی منەوە دێنو دەڵێن: (من ئەوم)و (کاتەکە نزیک بووەتەوە)، نەکەن دوایان بکەون. [9]کاتێ باسی شەڕو شۆڕو تێکچوون دەبیستن، مەترسن، چونکە ئەو شتانە پێویستە یەکەمجار ڕووبدات، بەڵام کۆتایی ڕاستەوخۆ دوای ئەمە نایەت.) [10]هەروەها پێیووتن: (ووڵات بەسەر ووڵات ڕاست دەبێتەوە، پادشاهێتی بەسەر پادشاهێتیدا ڕاست دەبێتەوە. [11]لەزۆر شوێن بوومەلەرزە دەبێت،

برسێتیو نەخۆشی بڵاودەبنەوە، لەئاسمانەوە نیشانەی ترسناکو مەزن ڕوودەدات. [12]بەڵام پێش ئەمانە هەموو خەڵکی دەستتان بۆ درێژدەکەنو دەتانچەوسێننەوە، دەتانبەن بۆ کەنیشتەکانو بۆ بەندیخانە، دەتانبەنە بەردەم پادشایانو فەرمانڕەوایان، لەپێناوی ناوی من. [13]بەڵام ئەمە هەلێك دەبێت بۆتان بۆ شایەتیدان. [14]پێویست ناکات پێش ئەوە خۆتان ئامادەکەن بۆ شێوەی بەرگری لەخۆتان، [15]چونکە من ووتەو داناییەکتان دەدەمێ کە هەموو ئەوانەی بەربەرەکانیتان دەکەن، نەتوانن وەڵامتانبدەنەوەو بەرهەڵستیتان بکەن. [16]تەنانەت باوكو دایکیشتان یان براو خزمو هاوڕێتان، دەتاندەن بەدەستەوە، هەندێکیشتان لێدەکوژن. [17]لەپێناوی ناوی من خەڵکی ڕقتان لێهەڵدەگرن، [18]بەڵام موویەك لەسەرتان نافەوتێ. [19]بەدان بەخۆداگرتن خۆتان دەبەنەوە.

### هاتنەوەی عیسای مەسیح

[20]کاتێ دەبینن سوپا دەوری قودسی داوە، بزانن کە ڕووخاندنی نزیك بووەتەوە. [21]ئەوسا ڕاکەن ئەوانەی لەناوچەی یەهودیادان بەرەو چیاکان، ناو شار بەجێبهێڵن، ئەوانەی لەلادێکانیشەوە ڕادەکەن نەچنە ناو شار، [22]چونکە ئەو ڕۆژانە ڕۆژی تۆڵەسەندنەوەیە، ئەوەی لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە دەبێت هەمووی بێتەدی، [23]قوڕ بەسەر سك پڕانو شیردەران لەوڕۆژەدا، چونکە ناخۆشیەکی گەورە بەسەر زەویدا دێو توڕەبوونێکی بەهێز دادەبەزێ بەسەر خەڵکیدا. [24]بەزەبری شمشێر دەست بەسەر دەکرێنو بەدیلی دەبرێن بۆ هەموو میللەتان، بێگانەکان قودس پێشێل دەکەن، تا سەردەمیان تەواو دەبێ.

[25]لەم کاتەدا لەخۆرو مانگو ئەستێرەکان نیشانە دەردەکەون. گەلە سەرلێشێواوەکان دەکەونە تەنگانەیەکی زۆرەوە، چونکە شەپۆلو کەفو کوڵی دەریاکان جۆش دەخۆنو هەڵدەستن. [26]خەڵکی لەترسان بێهۆش دەبن لەبەرئەوەی نازانن چی بەسەر جیهان دێت. چونکە [27]هێزەکانی ئاسمان دەکەونە جووڵە. لەوکاتەدا دەبینرێ چۆن ڕۆڵەی مرۆڤ، بەشکۆو هێزەوە لەناو هەوردا

دەردەکەوێتو دێت. [28]کاتێ ڕوودانی ئەم شتانە دەستی پێکرد، هەستنو سەربەرزبکەنەوە، چونکە ڕزگاریتان نزیك دەبێتەوە.) [29]ئینجا نموونەیەکی بۆ هێنانەوە، ووتی: (سەیری دار هەنجیرو دارەکانی تر بکەن، [30]کاتێ دەبینن ئەوا گەڵا دەکات، دەزانن هاوین نزیك بووەتەوە. [31]ئێوەش هەر بەم شێوەیە، کە بینیتان ئەم شتانە ڕوودەدات بزانن پادشاهێتی خودا نزیك بووەتەوە. [32]ڕاستیتان پێ دەڵێم، ئەم نەوەیە لەناوناچێ، هەتا ئەمانە هەمووی ڕوونەدات. [33]ئاسمانو زەوی لەناودەچن، بەڵام ووشەکانم لەناوناچن.)

### بەخەبەربن و ووریابن

[34](ئاگاداری خۆتان بن، دڵتانو مێشکتان خەریك مەکەن بەڕابواردنو سەرخۆشیو خەمو خەفەتی ژیانەوە، ئەو ڕۆژە لەناکاو وەك تەڵە خۆی دەدا بەسەرتان. [35]چونکە هەموو دانیشتوانی سەر زەوی دەگرێتەوە. [36]ئێشكبگرنو نوێژبکەن لەهەموو کاتێکدا، تا بتوانن ڕزگارتان بێت لەهەموو ئەو شتانەی ڕوودەداتو لەبەردەم ڕۆڵەی مرۆڤ ڕاوەستن.)

[37]عیسا بەڕۆژ لەپەرستگا خەریکی فێرکردن بوو، بەشەویش دەڕۆیشتە دەرەوە بۆ چیای زەیتونو لەوێ دەمایەوە. [38]خەڵکی بەیانی زوو دەهاتن بۆ پەرستگا، بۆ ئەوەی گوێی بۆ ڕاگرن.

### ناپاکی یەهوزا

## 22

جەژنی فەتیرە کە پێی دەوترا جەژنی تێپەڕبوون* نزیكبووەوە. [2]سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت بەدوای ڕێگەیەکدا دەگەڕان بۆ کوشتنی عیسا، چونکە لە ﴿ئاژاوەی﴾ گەل دەترسان.

[3]شەیتان چووە یەهوزاوە، کە بە ئەسخەریوتی بەناوبانگ بوو، یەکێك بوو لەدوانزە قوتابیەکە. [4]ڕۆیشتو قسەی لەگەڵ سەرۆك کاهینەکانو پاسەوانانی پەرستگا کرد، چۆن عیسا بدا بەدەستیانەوە. [5]ئەوانیش ئەمەیان زۆر بەدڵ بوو، بڕیاریشیاندا هەندێ پارەی بدەنێ. [6]ئەویش بەمە ڕازی بوو، چاوەڕێی هەلێکی دەکرد تا عیسا بداتە دەستیان، بێ ئەوەی

خەڵك پێی بزانن.

## جەژنی تێپەڕبوون

[7]ڕۆژی فەتیرە هات ئەوەی پێویستە قوربانی تێدا سەرببڕێ بۆ نانی ئێوارەی جەژنی تێپەڕبوون. [8] عیسا پەترۆسو یۆحەنای ناردو پێی ووتن: (بڕۆن نانی جەژنی تێپەڕبوونمان بۆ ئامادەکەن، تا بەیەکەوە بیخۆین.) [9]لێیان پرسی: [10] (دەتەوێ لەکوێ ئامادەی کەین؟) پێی ووتن: (کاتێ چوونە ناو شار، یەکێك دەبینن بەگۆزەیەك ئاوەوە، دوای کەون بۆ ئەو ماڵەی بۆی دەڕوات. [11]ئینجا بەخاوەن ماڵەکە بڵێن: مامۆستامان پێت دەڵێت: کوا ئەو ژوورەی لەگەڵ قوتابیەکانم نانی جەژنی تێپەڕبوونی تێدا دەخۆم؟ [12] ئەوسا ئەویش ژوورێکتان لەنهۆمی دووەمی خانووەکە پیشان دەدات، گەورەو ڕاخراو، ئا لەوێدا ئامادەی کەن.) [13]ئەوانیش ڕۆیشتنو شوێنەکەیان دۆزیەوە، هەروەك عیسا پێی ووتبوون، ئیتر هەر لەوێ نانی جەژنی تێپەڕبوونیان ئامادەکرد.

## نانخواردنی خوداوەند

[14]کەکاتی نانخواردن هات، عیسا لەسەر خوان لەگەڵ نێرراوان دانیشت. [15]ئینجا عیسا پێی ووتن: (زۆر ئارەزووی ئەوەم دەکرد نانی جەژنتان لەگەڵ بخۆم، پێش ئەوەی بکەومە ئازارەوە. [16]پێتان دەڵێم: ئیتر نانی جەژن ناخۆم تاکو لەپادشاهێتی خودا بەتەواویی دێتەدی.) [17]جامێ شەرابی هەڵگرت، سوپاسی خودای کردو ووتی: (بگرن، بەشی کەن لەنێوانتان. [18]پێتان دەڵێم: ئیتر لەبەری ترێ ناخۆمەوە تا پادشاهێتی خودا دێت.) [19]دوای ئەمە نانێکی هەڵگرتو سوپاسی خودای کرد، نانەکەی لەتکردو دای پێیانو ووتی: (ئەمە لەشمە، ئەوەی لەپێناوتان بەخت دەکرێ، ئەمە بکەن بۆ یادکردنەوەم.) [20]ئینجا دوای نانخواردنەکە، جامی هەڵبڕیو ووتی: (ئەم جامە بریتییە لەپەیمانی نوێ کە بەخوێنی من دروست دەبێت، ئەو خوێنەی لەپێناوتان دەڕژێ. [21]بەڵام ئەوەی دەمدات بەدەستەوە ئێستا لەسەر ئەم خوانە لەگەڵمدایە. [22]ڕۆڵەی مرۆڤ پێویستە بەو شێوەیە بڕوات کە بۆی دانراوە، بەڵام قوڕ بەسەر ئەو کەسەی دەیدا

بەدەستەوە.) [23]قوتابیەکانی لەناوخۆیان کەوتنە پرسیارکردن، کێ بێ ئەمە بکات.

## گەڕان بەدوای پایەو پلە

[24]ئینجا دوای ئەمە بوو بەشەڕە قسەیان لەسەرئەوەی کامیان مەزنترە لەناویان. [25]عیسا پێی ووتن: (پادشاکان فەرمانڕەوایی میللەتان دەکەن، دەسەڵاتدارەکانیشی دەیانەوێ خەڵکی بەباشی ناویانببەن. [26]بەڵام ئێوە ئاوا مەبن، باگەورەتان وەك بچووك بێت، پێشڕەوتان وەك خزمەتکارتان بێت. [27]کێ گەورەیە، ئەوەی لەسەر خوان دانیشتووە یان ئەوەی خزمەت دەکات؟ ئایا ئەوە نییە کە لەسەر خوان دانیشتووە؟ بەڵام من لەنێوانتان وەك خزمەتکارێکم.

[28]ئێوە لەڕۆژانی تاقیکردنەوەو ناخۆشیمدا، دانتان بەخۆتانگرت لەگەڵم. [29]منیش پادشایەتیتان دەدەمێ، هەروەك باوکم داویەتیپێم. [30]تاکو لەپادشایەتیەکەم، لەسەر خوانم بخۆنو بخۆنەوەو لەسەر کورسی حوکمڕانی دانیشنو حوکم بدەن بەسەر هەر دوانزە هۆزەکەی ئیسرائیل.

## لاوازی باوەڕی پەترۆس

([31]شەمعون، شەمعون، ئەوەتا شەیتان دەیەوێ ڕاتانکێشێ بۆ لای خۆی، تاکو لەبێژنگتان بدات وەك گەنم. [32]بەڵام من نوێژم بۆ کردیت، هەتا باوەڕت بەبا نەڕوات، کاتێ دەگەڕێیتەوە، باوەڕی برایانت بەهێزکە.) [33]پەترۆس ووتی: (گەورەم من ئامادەم بۆ بەندیخانەو بۆ مردنیش لەگەڵت بێم.) [34]عیسا ووتی: (پەترۆس من پێت دەڵێم، پێش ئەوەی کەڵەشێری بەیانی بخوێنێ، تۆ سێجار نکۆڵی دەکەیت کە من دەناسی.)

[35]ئینجا پێی ووتن: (کاتێ من ئێوەم نارد بەبێ توورەکەی پارە، بەبێ توێشوو، بەبێ پێڵاو، ئایا پێویستتان بەهیچ بوو؟) ئەوانیش پێیان ووت: (نەخێر.) [36]پێی ووتن: (بەڵام ئێستا، ئەوەی جزدانی پارەی هەیە، با بیبات لەگەڵ خۆی، هەروەها ئەوەی توورەکەی هەیە، با بیبات لەگەڵ خۆی. ئەوەش شمشێری نییە، با جلەکانی بفرۆشێتو بەپارەکەی شمشێرێکی پێبکڕێ. [37]من پێتان

دەڵـێم: ئـەوەی لـەبارەی مـنەوە نووسـراوە کـە دەڵـێ: {لەڕیـزی تاوانباران دایان نا} پێویستە بێتەدی، چـونکە ئـەوەی لـەبارەی مـنەوە لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە دێتەدی. [38]ئەوسا پێیان ووت: (گەورەم ئەوەتا دوو شمشـێر لـێرە هەیە.) ئەویش پێی ووتن (ئەمە بەسە.)

**نوێژی عیسا لەکێوی زەیتون**

[39]عیسـا هەروەك جاران ڕۆیشت بـۆ کـێوی زەیـتون، قوتابیەکانـیش دوای کـەوتن. [40]کـاتێ گەیشـتە ئەو شـوێنە، بـەقوتابـیەکانی ووت: (نوێژ بکـەن بـۆ ئـەوەی نەکەونـە تاقی کـردنەوە.) [41]ئێـنجا چـەند هـەنگاوێك لـێـیان دوورکەوتـەوە مـاوەی بـەرد هاوێشـتنێك، چـۆکی داداو دەسـتی کـرد بەنوێژکردن. [42]ووتـی: (ئەی باوك، گەر دەبێت ئەم جامـەم لـێ‌دووربخـەوە، بـەڵام بـا بەخواستی خۆت بێت نەك بەخواستی مـن.) [43]لـەم کاتـەدا، فریشتەیەك لە ئاسمانـەوە دەرکـەوت تـا بەهـێزی بکات. [44]کاتێ عیسا لەملمـلانێیەکی ڕۆحـی تونـد بـوو، بەگـەرمی دەستی‌کرد بەنوێژکـردنو ئارەقە لە لەشـی وەك دلۆپـەی خوێـن دەڕژایە سـەر زەوی. [45]دوای ئەمـە هەسـتاو گەڕایـەوە بـۆ لای قوتابـیەکانی، سـەیری‌کرد هـەموو خـەویان لـێ‌کـەوتووە لەخەفـەتا. [46]ئینجا پێی ووتن: (ئەوە چییە هەستن نوێژ بکەن، تا نەکەونە تاقی‌کردنەوە.)

**گرتنی عیسا**

[47]لەوکاتـەدا کـە عیسـا دەدوا، چـەند پـیاوێك بـەرەو ڕووی هـاتن، یەهوزا کە یەکێك بوو لەقوتابییەکانی، پێشـیان کەوتـبوو، لـەعیسـا هاتـە پێشـەوە تـاکو ماچـی‌بکات. [48]عیسا پـێی‌ووت: (ئـەی یـەهوزا، بـەماچ ڕۆڵەی مرۆڤ دەدەیت بەدەستەوە؟) [49]کـاتێ ئەوانـەی دەورووپشـتی عیسـا، زانـیان بەوەی خەریکە شتێك ڕوودەدات، ووتـیان: (گـەورەم دەسـت بکەینە شمشێر وەشاندن؟) [50]هـەر لـەوێدا یەکێکـیان شمشـێری وەشـاندو گوێـی ڕاسـتی ئیشـکەری سەرۆك کاهینی بڕی.
[51]عیسـا فـەرمانی‌داو ووتـی: (دەسـت هەڵگـرن، ڕاوەسـتن) ئینجا دەسـتی هێـنا بـەگوێی کابـراداو چـاکی‌کـردەوە. [52]ئـەو کۆمەڵـەی

هاتبوونە سەر عیسا، بریتی بوون لەسەرۆك كاهینەكانو پاسەوانانی پەرستگاو پیران، عیسا پێی ووتن: (خۆ من یاخیبوو نیم، ئاوها بە شمشێرو دارەوە هاتوونەتە سەرم؟ [53] هەموو ڕۆژێك لەگەڵتان بووم لەپەرستگادا كەچی كەستان دەستتان بۆ نەبردم. بەڵام ئەمە ڕۆژی ئێوەیە، كاتێ تاریكی دەسەڵاتی هەیە.)

**نكۆڵی پەترۆس لەعیسا**

[54] ئینجا سەربازە پاسەوانەكان، عیسایان گرتو بردیان بۆ كۆشكی سەرۆك كاهین. پەترۆسیش دوور بەدوور دوایان كەوت. [55] كاتێ لەگۆڕەپانی كۆشكەكەدا، ئاگریان كردەوەو لەدەوروپشتی ئاگرەكە دانیشتن، پەترۆسیش چوو لەگەڵیان دانیشت. [56] یەكێك لەژنە ئیشكەرەكانی ئەوێ كە لەڕووناكیەكەدا دانیشتبوو پەترۆسی بینی، جوان تێیڕوانیو ووتی: (ئەمەش لەگەڵی بوو.) [57] بەڵام پەترۆس نكۆڵی لێكردو ووتی: (خوشكە، من ئەو كابرایە ناناسم.) [58] دوای ماوەیەكی كەم، یەكێكی تریش بینی، ووتی: (تۆش لەوانیت.) بەڵام پەترۆس ووتی: (نەخێر كاكە، لەوان نیم.) [59] ئینجا نزیكەی یەك كاژێری تر، یەكێكی كە ووتی (بەڕاستی ئەمیش لەگەڵی بوو، چونكە ئەمیش خەڵكی شاری جەلیلە.) [60] پەترۆس ووتی: (كاكە، من نازانم تۆ چیدەڵێیت.) هێشتا قسەكەی تەواونەكردبوو، كەڵەشێری بەیانی خوێندی. [61] خوداوەند ئاوڕیدایەوەو سەیرێكی پەترۆسی كرد، ئینجا پەترۆس بیری كەوتەوە كاتێ عیسا پێی ووت: ( پێش ئەوەی كەڵەشێری بەیانی بخوێنێ تۆ سێجار نكۆڵیم لێدەكەیت.) [62] ئەوسا پەترۆس چووە دەرەوەو گریانێكی بەكوڵ گریا.

**عیسا لەبەردەم ئەنجوومەنی باڵادا**

[63] ئەوانەی پاسەوانی عیسایان دەكرد، دەستیانكرد بەلێدانیو گاڵتە پێكردنی. [64] چاویان دەگرتو لێیان دەپرسی: (پێمان بڵێ، كێبوو ئەوەی ئێستا لێیدایت؟) [65] سەرەڕای ئەمەش قسەی خراپی زۆریان پێ ووت. [66] كاتێ ڕۆژ بووەوە، ئەنجوومەنی پیرانی گەل، ئەوەی لەسەرۆك كاهینەكانو مامۆستایانی

شەریعەت پێك هاتبوو، کۆبوونەوەو عیسایان بانگ کردە بەردەمیان، پێیان ووت: [67](ئەگەر تۆ مەسیحی پێمان بڵێ.) ئەویش پێی ووتن: (گەر ئەمەتان پێ بڵێم، باوەڕ ناکەن، [68] گەر لێشتان بپرسم وەڵام نادەنەوە. [69]پاش ماوەیەکی کەم، ڕۆڵەی مرۆڤ لەلای ڕاستی خودای بەتواناوە دادەنیشێ.) [70]هەموو ووتیان: (دەتەوێ بڵێیت کە تۆ ڕۆڵەی خودای؟)

عیسا پێی ووتن: (ئێوە دەڵێن، من ئەوم.) [71]ئینجا ووتیان: (ئیتر پێویستی چیمان بەشایەت هەیە؟ ئەوەتا لەدەمی خۆیەوە گوێمان لێبوو.)

## عیسا دەبەنە لای پیلاتۆس

## 23

دوای ئەمە هەموو هەستانو عیسایان بردە لای پیلاتۆس، [2]دەستیان کرد بە تاوانبارکردنیو ووتیان: (بۆ مان دەرکەوتووە ئەم پیاوە ڕێ تێكدەدات لەگەلەکەمان، هەروەها هانی خەڵکی دەدات سەرانە نەدەن بەقەیسەرو خۆشی بەمەسیحی پادشا دادەنێ.) [3]پیلاتۆس لێی‌پرسی: (تۆ پادشای جوولەکەی؟) [4]عیسا وەڵامی دایەوە: (تۆ ووتت.)

ئینجا پیلاتۆس بەسەرۆك کاهینەکانو خەڵکەکەی ووت: (من هیچ گوناهێك لەم پیاوەدا نابینم.) [5]بەڵام ئەوان پێیان داگرتو ووتیان: (ئەم کابرایە گەل دەوروژێنێ لەهەموو ناوچەی یەهودیادا، هەر لەجەلیلەوە تا ئێرە خەریکی فێرکردنو هاندانی خەڵکە.)

[6]کاتێ پیلاتۆس ئەمەی بیست، ووتی: (ئایا ئەم کابرایە خەڵکی جەلیلە؟) [7]کە زانی ئەو سەر بەو ناوچەیە کە هیرۆدس حوکمڕانی تیادەکات، عیسای نارد بۆ لای هیرۆدس، کە لەوکاتەدا لەقودس بوو. [8]کاتێ هیرۆدس عیسای بینی، زۆری پێ خۆش بوو، چونکە دەمێك بوو باسی عیسای بیستبوو، دەیویست خۆیو کارێك لەکارە سەرسووڕهێنەرەکانی ببینێت. [9]جۆرەها پرسیاری لێکرد، بەڵام ئەو هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. [10]سەرۆك کاهینەکانو مامۆستایانی شەریعەت، بەگەرمی تاوانباریان دەکرد. [11]هەروەها هیرۆدسو سەربازەکانیش بەرقەوە سەیریانکردو تێر گاڵتەیان پێکرد، ئینجا پاڵتۆیەکی

بریسکەداری پادشاهانەیان لەبەرکردو ناردیانەوە بۆ لای پیلاتۆس. [12]هەرچەندە هیرۆدس‌و پیلاتۆس دوژمنایەتی کۆنیان لەنێوان بوو، بەڵام لەو ڕۆژەدا بوو بوون بەهاوڕێی یەکتری.

**بڕیاری لەخاچدانی عیسا**

[13]پیلاتۆس سەرۆك کاهینەکان‌و پێشەوایان‌و گەلی بانگ‌کرد، [14]پێی ووتن: (ئێوە ئەم کابرایەتان وەك ڕێ لەگەڵ تێکدەر هێنا بۆ لام، ئەوەتا منیش دوای ئەوەی لە باسەکەم کۆڵییەوە، هیچ گوناهێك نابینم لەم کابرایەدا، بەوەی ئێوە تاوانباری دەکەن. [15]دیارە هیرۆدسیش هیچ هەڵەیەکی تیا شك نەبردووە، بۆیە ناردویەتیەوە بۆمان. ئەم کابرایە شتێکی وای نەکردووە شایانی مردن بێت. [16]فەرمانی لەقامچی‌دانی دەدەم‌و ئازادی دەکەم.) ﴾[17]پیلاتۆس دەبووایە هەموو ساڵێك لەجەژندا لەسەر داواکردنی خەڵکەکە یەکێك لەبەندکراوانی ئازادبکردایە.﴿

[18]بەڵام خەڵکەکە هاواریان‌کرد، ئەمە بکوژەو باراباسمان بۆ ئازادبکە. [19]ئەم کابرایەش بەندکرابوو بەهۆی ئاژاوەنانەوەو کوشتنەوە. [20]پیلاتۆس دیسان بۆ دووەم جار، ئارەزووی خۆی دەربڕی، بۆ ئازادکردنی عیسا. [21]هەموو هاواریان کرد: (لەخاچی‌بدە، لەخاچی‌بدە.) [22]ئینجا بۆ جاری سێهەم، لێی‌پرسین: (چ خراپەیەکی کردووە، من هیچ گوناهێکی تیادا نابینم کە شایانی مردن بێت، ئێستا فەرمانی لەقامچی‌دانی بۆ دەردەکەم‌و ئازادی دەکەم.) [23]ئەوانیش پێیان داگرت، بەدەنگی بەرز هاواریان‌کردو داوای لەخاچدانیان کرد، بەمە قسەیان سەرکەوت. [24]ئینجا پیلاتۆس فەرمانی‌دا داواکاریەکەیان جێ‌بەجێ بکرێ. [25]ئەوەی لەبەر ئاژاوەو کوشتن زیندان کرابوو، لەسەر داواکاری ئەوان ئازادی‌کرد. عیساشی خستە ژێر بڕیاری ئەوانەوە.

**لەڕێگا بۆ لەخاچدان**

[26]لەوکاتەی عیسایان دەبرد بۆ لەخاچدان، کابرایەکیان گرت لەشاری قەیرەوانەوە هاتبوو، بەناوی شەمعون تازە لەکێڵگەکەی گەڕابووەوە، خاچەکەیان دابەسەر شانی تاکو دوابەدوای عیسا

هەڵـیگرێ. [27]خەڵکـێکی زۆر دوای کەوتـبوون، هـەروەها چـەند ژنـێك دەگـریانو لـەخۆیان دەدا. [28]عیسـا ئاوڕی لێدانەوەو ووتی: (ئەی کچانی قودس بۆ من مەگرین، بۆ خۆتانو بۆ منداڵەکانـتان بگـرین. [29]ڕۆژانـێك دێـت، تـیایدا دەڵێن، خۆزگەمان بەو ژنانـەی نـەزۆك بـوون، بەو سکانەی منداڵـیان نـەبووە، بـەو مەمکانـەی شـیریان نەداوە. [30] ئینجا بەشاخەکان دەڵـێن، بـڕوخێ بەسـەرمان، بـەگردەکانـیش دەڵێن دامانپۆشە. [31] گـەر ئـاوا بکـەن بەلقی سەوز، ئاخۆ دەبێ حاڵی لقی ووشك چۆن بێ؟)

**لەخاچدان**

[32]هـەر لەوکاتـەدا لـەگەڵ عیسا، دوو تاوانـباریش دەبـران بـۆ لەخاچـدان. [33]کـاتێ گەیشـتنە ئـەو شـوێنەی بـەکاسـەی سـەر ناودەبرا، لەگـەڵ دوو تاوانبارەکە لـەخاچیاندا، یەکـێك لـەلای ڕاستیەوە ئـەوی تر لەلای چەپیەوە. [34]عیسا ووتی: (ئەی بـاوك، لێـیان خۆشبە، چونکە نازانن چـی دەکـەن.) ئیـنجا جلـەکانی عیسـایان دانـاو شـێروخەتیان لەسـەرکرد. [35]خەڵکەکـە ڕاوەسـتا بـوون سـەیریان دەکـرد، سەرۆکەکانیش، گاڵتەیان پێدەکردو دەیـانووت: (خـەڵکی تـری ڕزگـارکـرد، گـەر ئەمـە مەسـیحی هەڵـبژێرراوی خودایـە، بـاخۆی ڕزگارکـات.) [36]هـەروەها سـەربازەکانیش، گاڵتەیان پێدەکرد، لـێی نـزیك دەبوونـەوەو سـرکەیان پـێدەدا، [37]دەیـانووت: (گـەر تـۆ پادشـای جوولەکـەی، خـۆت ڕزگارکـە.) [38]تەختەیەکـیان بەسـەر سـەری هەڵواسـیبوو، لەسـەری نووسـرابـوو، ئەمـەتا پادشـای جوولەکە.

[39]یەکـێك لەتاوانـبارەکان، دەستیکرد بەقسە پێ ووتنیو ووتی: (تـۆ مەسـیحی؟ دەباشـە خـۆت ڕزگارکـەو ئیـنجا ئـێمەش.) [40]بەڵام ئـەوەیتریان، چوو بەگژیداو ووتی: (لـەخـودا ناترسی، هەرچەندە هەمان سـزات بەسـەر دراوە؟ [41]سزای ئێمە دادپەروەرانەیـە، لەجـیاتی کـردارەکانمان وەرمـانگرتووە، بەڵام ئـەو هیچ خراپەیەکی نەکردووە.) [42] ئینجا ووتـی: (عیسـا لـەیادم مەکـە کاتێ دەچیتە ناو پادشایەتیەکەت.) [43] عیسا پێی ووت: (ڕاستیت پێ دەڵێم:

هەر ئەمڕۆ لەگەڵم دەبیت لەبەهەشت.)

**مردنی عیسا**

[44]نزیکی کاتژمێری دوانزەی نیوەڕۆ، تاریکی باڵی کێشا بەسەر هەموو زەویدا، هەتا کاتژمێری سێی نیوەڕۆ. [45]ڕۆژ تاریك بوو، پەردەی پەرستگا لەناوەڕاستەوە دڕا. [46]عیسا بەدەنگی بەرز هاواری کردو ووتی: (ئەی باوك، ڕۆحی خۆم بە دەستی تۆ دەسپێرم.) ئەمەی ووتو ڕۆحی سپارد. [47]کاتێ ئەو سەرپەلەی لەوێدا بوو، ئەمەی بینی، ستایشی خودای کردو ووتی: (بەڕاستی ئەو کابرایە بێتاوانبوو.) [48]ئەو خەڵکەی لەوێدا کۆبووبوونەوە، بۆ سەیرکردنی لەخاچدانەکە، کاتێ ئەمەیان بینی بەسنگ کوتان گەڕانەوە. [49]بەلاّم هەموو ناسیاوەکانی عیسا، لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی لەجەلیلەوە لەگەڵی هاتبوون، لەدوورەوە ڕاوەستابوونو دەیانڕوانییە ئەم ڕووداوانە.

**ناشتنی عیسا**

[50]لەناو ئەندامانی ئەنجومەنی باڵا، کابرایەك هەبوو ناوی یوسف بوو، کابرایەکی چاكو سەرڕاستبوو، [51]ڕازی نەبوو بەبڕیارو هەڵسوکەوتی ئەندامانی ئەنجومەنو کرداریان. خەڵکی شاری ڕامەی ناوچەی یەهودیا بوو، لەوانەبوو کە چاوەڕوانی پادشاهێتی خودای دەکرد. [52]هاتە لای پیلاتۆسو داوای تەرمەکەی عیسای لێکرد. [53]ئینجا لەسەر خاچەکە هێنایەخوارەوەو لەقوماشێکی کەتانی پێچا. بردیو خستیە گۆڕێکی لەبەرد هەڵکەنراو هێشتا کەسی تیادا نەنێژرابوو. [54]ئەو ڕۆژەش کاتی خۆئامادەکردن بوو بۆ شەممە، چونکە ئەوەندەی نەمابوو بۆ شەممە. [55]ئەو ئافرەتانەی لەجەلیلەوە بەدوای عیساوە بوون، دوای یوسف کەوتن، گۆڕەکەیان بینیو بینیان چۆن تەرمەکەی تیادا دانرا. [56]ئینجا گەڕانەوەو بابەتی مانەوەو بۆنو ئەو شتانەیان ئامادەکرد بۆ چەورکردنی تەرمەکە، ڕۆژی شەممەش بەپێی ڕاسپاردە، پشوویاندا.

**زیندووبوونەوەی عیسای مەسیح**

# 24

ئافـرەتەكان، ڕۆژی یەك شەممە بەیانی زوو، بـەخۆیانو ئـەو بـۆنو بابـەتی مانـەوەی ئامادەیـان كـردبـوو، هاتنە سەر گۆڕەكە. [2]سەیریان كرد بەردی سـەر گۆڕەكـە لاچـووە، [3]بـەڵام كە چـــوونەژوورەوە، ســـەیریان كـــرد تەرمەكەی عیسای خوداوەند نەماوە. [4]كاتیٚ لـەم كارە سەریان سوورمابوو، لەپـــڕ دوو پـــیاویان بـــەجـــلی بریسـكەدارەوە بەتەنیشـتی خۆیانەوە بـینی. [5]تـرس دایگرتنو سەریان شۆڕ كـــردە ســـەر زەوی، دوو كابـــراكە وتـیان: (بۆچـی دەگـەڕێن بـەدوای یەكـێكی زیندوو لەناو مردوواندا؟ [6]ئـەو لـێرە نیـیە، زیـندووبووەتەوە، بیركەنـەوە لـەوەی لـەجەلـیل پـێی وتـن، [7]كـاتیٚ وتی: ڕۆڵەی مرۆڤ، پێویســـــتە بـــــدریٚ بەدەســـــت گوناهـبارانەوە، ئیـنجا لەخاچبدریٚو لـەڕۆژی سـێهەم هەستێتەوە.) [8]ئینجا [9]قســەكانی عیســایان هاتــەوە یــاد. گۆڕەكـەیان بەجیٚهێشتو گەڕانەوە، هـەواڵی هـەموو ئەم شتانەیان بەیانزە قوتابـیەكەو ئـەوانی‌تـر دا. [10]ئــەو ژنانـەش كـە هـەواڵی ئـەم شـتانەیان بەنـێرراوان ڕاگـەیاند، بریـتی بـوون لەمـریەمی مەجدەلـیو یۆناو مریەمی دایكـی یاقوبو هەندیٚ ئافرەتی‌تر كە لـەگەڵـیان هاتـبوون. [11]گـێڕانەوەی قسـەكانیان هـەر لـەوڕێنەی دەكرد، بۆیـە باوەڕیـان پیٚنەكـردن. [12]ئیـنجا پەتـرۆس هەسـتاو ڕایكـرد بـۆ سەر گۆڕەكـە، كـاتیٚ دانەویەوە تەنها ئەو كفـنەی بیـنی كـە تێـیەوە پێچرابوو، ئیـنجا زۆر بەسەرسـوڕمانەوە لەوەی كە ڕوویدا بوو، ئەوێی بەجیٚهێشت.

**دووان لەقوتابیەکان عیسا دەبینن**

[13]دووان لـەقوتابـــیەكانی، لـــەو ڕۆژەدا چـوون بۆ دییٚ عیمواس، كە تـەنها حەوت میل لـە قودسەوە دوور بـوو. [14]لــەڕیٚ باسـی ئـەو هــەموو شـتانەیان دەكرد كە ڕوویدابوو. [15]لەوكاتـەدا قسـەیان دەكـرد، عیسـا خۆی نزیك بووەوە لێیانو لـەگەڵیان ڕۆیـی بەرێدا. [16]بەڵام چاویان بەسترا لەناسـینی. [17]عیسا لێیپرسین: (ئەوە باسـی چی دەكەن بەرێوە؟) ئەوانیش بەدڵتەنگـیەوە ڕاوەستان، [18]یەكێكیان كە ناوی كلیۆپاس بوو وتی: (چیە، دەڵـێی تـۆ نامۆیـت لـەقودس لات داوە، ئاگـات لـەوەنیـیە كـە لـەم ڕۆژانـەدا ڕوویداوە؟) [19]ئەویش پێی وتـن: (چـی ڕووی داوە؟) ئەوانیش

ووتیان: (ئەوەی سەبارەت بەعیسای ناسیری ڕوویداوە، پێغەمبەرێکی تواناداربوو لەقسەو کرداری لەلای خوداو هەموو گەل. [20]بەڵام سەرۆك کاهینەکانمان و فەرمانڕەواکان دایانبەدەستەوە بۆ لەخاچدانو مردن. [21]ئێمە هیوامان بەو هەبوو، کە بە خوێنی خۆی ئیسرائیل دەکڕێتەوە، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەمڕۆ سێهەم ڕۆژە ئەمە ڕوویداوە. [22]هەندێ لەو ئافرەتانەی لەگەڵمانن بەهەواڵێك زۆر سەرسامیان کردین، چونکە بەیانی زوو چووبوونە سەر گۆڕەکە، [23]تەرمەکەیان نەبینی بوو، ئینجا گەڕانەوەو ئەمەیان باسکردو ووتیان: ئێمە دوو فریشتەمان بینی دەیان ووت: ئەو زیندووە. [24]هەندێ لەئێمە چوونە سەر گۆڕەکەو سەیریان کرد ئەوەی ئافرەتەکان گێڕایانەوە ڕاستەو لەگۆڕەکەدا کەسیان نەبینی.) [25]ئینجا عیسا پێی ووتن: (ئەی تێنەگەیشتووان، ئەی کەم باوەڕان بە هەموو ئەوانەی کە پێغەمبەران باسیان کردووە، [26]ئەی باشە نەدەبووایە مەسیح ئەم ئازارانە بچێژێو ئینجا بچێتە شوێنی شکۆمەندی خۆی.) [27]ئەوسا دەستی کرد بەڕوونکردنەوەی ئەو شتانەی لەسەری نووسراوە، هەر لەتەوراتی موساوە تا گشت پەرتووکەکانی پێغەمبەران.

[28]وورده وورده نزیك دەبوونەوە لەو دێیەی قوتابیەکان بۆی هاتبوون. عیسا وا خۆی نیشاندا ئەو دەڕوات بۆ شوێنێکی دوورتر. [29]قوتابیەکان زۆریان لێکردو ووتیان: (ئەوا ڕۆژئاوا دەبێتو تاریك دادێت، بمێنەوە لامان.) ئەویش بەمە ڕازی بوو، لەگەڵیان هاتە ماڵەوە. [30]کاتێ لەسەر خوان دانیشتن، دەستی برد نانێکی هەڵگرت، پیرۆزی کردو لەتی کرد، ئینجا دای پێیان. [31]دەستبەجێ چاویان کرایەوەو ناسیانەوە، ئیتر لەبەرچاویان نەما. [32]بەیەکتریان ووت: (ئەمە بۆیە کاتێ قسەی بۆ دەکردین، دڵمان لەناو سنگماندا وەك ئاگر گڕی گرتبوو.)

[33]دوای ئەمە یەکسەر هەستانو گەڕانەوە بۆ قودس، سەیریان کرد یانزە قوتابیەکەو ئەوانەی لەگەڵیانن، هەموو کۆبوونەتەوە، [34]دەیان ووت: (ڕاستە! گەورەمان هەستاوەتەوە، دەریش کەوتووە بۆ شەمعون.) [35]ئینجا هەر دووکیان دەستیان کرد

بەگێڕانەوەی ئەوەی لەڕێگا ڕوویدابوو، هەروەها چۆن لەکاتی نان لەتکردنەکەدا ناسییانەوە.

**عیسا بۆ نێرراوان دەردەکەوێ**

[36]کاتێ باسی ئەمەیان دەکرد، عیسا خۆی هاتە ناوەڕاستیانو لەنێوانیان ڕاوەستا، پێی ووتن: (سڵاوتان لێبێت.) [37]بەڵام لەبەر ترسو لەرزی خۆیان وایانزانی ئەمە ڕۆحە. [38]عیسا پێی ووتن: (ئەوە بۆچی واسەرتان لێشێواوە؟ بۆچی بیری وادێ بەدڵتان؟ [39]سەیری دەستو قاچم بکەن، دەستم لێدەنو دڵنیابن کە من ئەوم، چونکە ڕۆح گۆشتو ئێسقانی نییە وەك من ئێستا هەمە.) [40]کاتێ ئەمەی ووت دەستو قاچی نیشاندان. [41]لەخۆشیو سەرسوڕماندا بەتەواوی باوەڕیان نەدەکرد، ئینجا پێی ووتن: (هیچتان لێرە هەیە بخورێت؟) [42]ئیتر ئەوانیش پارچەیەك ماسی برژاویان دایە، [43]ئەویش لێیوەرگرتنو لەبەرچاویان خواردی.

[44]ئەوسا پێی ووتن: (ئا ئەمەیە ئەو قسانەی بۆم دەکردن، کاتێ لەگەڵتان بووم: پێویستە هەموو ئەوانەی لەتەوراتی موساو پەرتووکی پێغەمبەرانو زەبوور دەربارەی من نووسراون بێتەدی.) [45]ئینجا بیرو هۆشی کردنەوە، تا کتێبی پیرۆز تێبگەن. [46]پێی ووتن: (ئاوها نووسراوە، پێویست بوو مەسیح ئازاربکێشێو بمرێو دوایی لەڕۆژی سێهەم زیندووبێتەوە. [47]هەروەها بەناوی ئەوەوە تۆبەکردنو لێخۆشبوونی گوناە ڕابگەیندرێ بۆ هەموو گەلان، بەدەست پێکردن لەقودسەوە. [48]ئێوە شایەتی ئەم شتانەن. [49]ئەوەی باوکم بەڵێنی پێدابوو من خۆم بۆتانی دەنێرم، بەڵام جارێ لەناو شار بمێننەوە، تا ئەوکاتەی لەئاسمانەوە جلی بەهێزیتان لەبەردەکرێت.)

**گەڕانەوەی عیسا بۆ ئاسمان**

[50]دوای ئەمە پێشیان کەوتو بردنی بۆ دێی بەیتعەنیا، دەستی بەرزکردەوەو پیرۆزیکردن. [51]لەوکاتەدا کە پیرۆزی دەکردن، لێیان جیابووەوەو بەرزبووەوە بۆ ئاسمان. [52]چۆکیان بۆ داداو ئیتر زۆر بەشادیەوە گەڕانەوە بۆ قودس. [53]بەبەردەوامیش دەڕۆیشتن بۆ پەرستگاو

**مزگێنی بەپێی نووسینی یۆحەننا**

*یۆحەننا یەکێك بوو لەقوتابیەکانی عیسا، پەیوەندییەکی تایبەتی بەهێزی لەگەڵ هەبوو، باسی خۆی دەکات کە خۆشەویستی عیسا بووە، یۆحەننا لەم پەرتووکەدا حەوت نیشانەی سەرسوورهێنەری هەڵبژارد کەهەمووی دەریدەخات عیسا مەسیحەو چ شێوەیەکی ژیانمان پێدەبەخشێ.*

*مەبەستی یۆحەننا لەم پەرتووکەدا ئەوەیە:* (تا باوەڕ بکەن کە عیسا مەسیحە، چونکە ئەوەی باوەڕی پێبهێنێ (هەتا ئێوە بەهۆی باوەڕەوە ژیان بەدەست بهێنن بەناوی ئەوەوە.) *(20:31).*

*هەروەها باسی دەکات چۆن هەندێ کەس باوەڕیان هێناو بوون بەقوتابی ئەو، بەلام هەندێکیان ڕەتیان کردەوەو بەربەرەکانیان کرد. ئینجا هەندێ بەشی کەی ئەم پەرتووکە باسی ئەو پەیوەندییە بەهێزە دەکات کە لەنێوان عیساو قوتابیەکانی هەبووە.*

*ئەوەی شایانی باسە لەنیوەی پەرتووکەوە تاکۆتایی باسی دوا هەفتەی ژیانی عیسا دەکات، تیایدا باسی ووتەکانی عیسا دەکات لەئامادەکردنی قوتابیەکانیو هاندانیان پێش لەخاچدانی. هەروەها باسی مەسیح دەکات وەك پادشایەك، بەلام حوکمڕانیەکەی لەم جیهانە نییەو ئەمەش تامردنی لەسەر خاچ دەرنەکەوت ( 1:17)، هەروەها باسی گرتنی عیساو دادگاییکردنیو لەخاچدانیو هەستانەوەی دەکات، ئینجا دەرکەوتنی بۆ قوتابیەکانی دوای هەستانەوەی.*

**ووشەی خودا**

# 1

لەسەرەتاوە ووشەکە* بوو، ووشەکە لای خودا بوو، ووشەکەش خۆی خودا بوو. [2]ئەو هەر لەسەرەتاوە لای خودا بوو. [3]بەو هەموو شتێ دروستبووە، بێئەو هیچ شتێك دروست نەبووە لەمانەی کە دروست بوون. [4]ژیان لەئەوا بوو، ئەو ژیانەش ڕووناکی مرۆڤ بوو، [5]ڕووناکیش تاریکی ڕووناك دەکاتەوەو تاریکی ناتوانێ ڕووناکی ببەزێنێ.

[6]مرۆڤێك هات کە خودا ناردبووی، ناوی یەحیا بوو، [7]ئەو هات شایەتی بۆ ڕووناکی بدات، تاوەکو هەمووان بەهۆی ئەوەوە باوەڕبهێنن. [8]یەحیا خۆی ڕووناکیەکە نەبوو، بەڵکو شایەتی ڕووناکیەکە بوو. [9]ئەو ڕووناکیە ڕاستەی هەموو خەڵکی ڕووناك دەکاتەوە هاتە جیهان، [10]ئەو لەجیهاندا بوو، بەویش جیهان دروست بوو، کەچی

جیهان نەیناسی. [11]ئەو بۆ لای گەلەکەی هات، کەچی ئەوان پێشوازیان لێنەکرد. [12]بەڵام هەموو ئەوانەی پێشوازیان لێکرد، ئەوانەی باوەڕیان بەناوی هێنا، دەسەڵاتی پێدان ببن بەرۆڵەی خودا*، [13] ئەوانەی نەبەخوێن، نەبەویستی لەش، نەبەویستی پیاو، بەڵکو لەخوداوە بوون.

[14]ئینجا ووشەکە بوو بەلەشو لەناوماندا نیشتەجێبوو، ئێمە شکۆی ئەومان بینی، شکۆی تاقانەی باوك، ئەوەی پڕبوو لەبەرەکەتو ڕاستی. [15] یەحیا شایەتی بۆدەداو هاواری دەکرد: (ئەمە ئەوەیە کە باسم کردو ووتم: ئەوەی لەدوای من دێت لەپێش من بوونی هەیە، چونکە ئەو بووە پێش ئەوەی من ببم.) [16]هەموومان لەپڕی ئەو بەرەکەت* لەدوای بەرەکەتمان وەرگرت، [17]چونکە شەریعەت بەهۆی موساوە درا، بەڵام بەرەکەتو ڕاستی بەهۆی عیسای مەسیحەوە هاتن. [18]هەرگیز کەس خودای نەبینیوە، بەڵام تاقانەی خودا، ئەوەی لەباوەشی باوکدایە، ئەو خودای بۆ ئێمە دەرخست.

### شایەتیدانی حەزرەتی یەحیا

[19]ئەمەش شایەتییەکەی یەحیایە، کاتێ جوولەکەکانی قودس هەندێ کاهینو لاوییان نارد پرسیاری لێبکەن: (تۆ کێیت؟) [20]ئەو بە بێ دوودڵی دانی پیاناو ووتی: (من مەسیح نیم.) [21]ئینجا لێیان پرسی: (ئەی تۆ کێیت؟ ئەلیاسی؟) ووتی: (نەخێر! ئەو نیم.) ووتیان: (ئایا پێغەمبەرەکەی❖؟) ووتی: (نەخێر.) [22]لەکۆتاییدا ووتیان: (باشە تۆ کێیت، تا وەڵامەکە بدەینەوە بەو کەسانەی ئێمەیان ناردووە؟ چی دەڵێیت دەربارەی خۆت؟) [23]ئەویش ووتی: (من {دەنگێکم لەدەشتودەر هاوار دەکەم: ڕێگای خوداوەند ڕێكو ئامادەکەن}، هەروەك چۆن ئەشعیای پێغەمبەر ووتویەتی.) [24]ئەوانەی لەلایەن فەریسییەکانەوە نێرابوون، [25]دیسان پرسییان: (باشە گەر تۆ مەسیح نیتو ئەلیاس نیتو پێغەمبەرەکە نیت، ئیتر بۆچی خەڵکی لەئاوهەڵدەکێشیت؟) [26] وەڵامی دایەوە: (من خەڵکی لەئاوهەڵدەکێشم، بەڵام لەنێوانتاندا یەکێك هەیە کە نایناسن، [27]ئەو دوای من دێت، من شایانی ئەوە نیم قەیتانی پێڵاوەکانی بۆ بکەمەوە.)

[28]ئەمەش لەدێی بەیتعەنیا ڕوویدا، لەوبەری ڕووباری ئوردونەوە، لەو شوێنەی یەحیا خەڵکی لەئاو هەڵدەکێشا.

### بەرخی قوربانی خودا

[29]ڕۆژێ دوای ئەوە یەحیا عیسای بینی وا بەرەو ڕووی دێت، ووتی: (ئا ئەوەتا بەرخی خودا❖، ئەو قوربانییەی گوناهی جیهان هەڵدەگرێت. [30]ئەمە ئەو کەسەیە کە دەربارەی ووتم، ئەوەی لەدوای من

---

❖**پێغەمبەرەکەی:** مەبەستی لەو پێغەمبەرەیە کە موسا باسی دەکات. بڕوانە یۆحەننا 1:45

دێت لـەپـێش مـن بوونی هەیە، چونکە ئەو هەبووە پـێش بوونـی من. [31]منیش نەمدەناسی، بەڵام هاتووم بۆ لـەئاوهەڵکێشان تا ئەو بۆ ئیسرائیل دەرکەوێ.) [32]ئینجا یەحیا شـایەتیداو ووتـی: (ڕۆحـی پـیرۆزم* لەشـێوەی کۆتـرێك بیـنی لـەئاسمانەوە هاتەخوارەوەو لەسەر عیسا نیشتەوە. [33]من نەمدەناسی، بەڵام ئەوەی مـنی نـاردووە خـەڵك لـەئاوهەڵکێشم، ئەو پێیووتم: ئـەوەی دەیبینیـت ڕۆح دێـتەخوارەوەو لـەسـەری جـێگیر دەبـێ، ئـەو خـەڵکی بـەڕۆحی پـیرۆز هەڵدەکێشـێ. [34]لـەبەرئـەوەی ئەمـەم دیووە، شایەتی دەدەم ئەو ڕۆڵەی خودایە.)

## قوتابییە یەکەمینەکان

[35]بـۆ بـەیانی یەحـیا لـەگـەڵ دوو قوتابی خۆی دیسـان هـەر لـەوێ ڕاوەستا بوو، [36]کە عیسا بەوێدا ڕۆیشـت سـەیریکردو ووتـی: (ئـا ئـەوەتا بـەرخی خـودا.) [37]کـاتێ دوو قوتابـیەکە گوێیان لـەمە بوو، دوای عیسـا کـەوتن. [38]عیسـا ئاوڕیدایـەوەو سـەیریکرد ئـەوان بـەدوایەوەن، لێیپرسین: (چیتان دەوێـت؟) ووتـیان: (ڕابـی، (واتـە مامۆستا) لـەکوێ دەژیـت؟) [39]وەڵامـی دانەوەو ووتی: (وەرن، ببینن.) ئیـنجا لـەگەڵی ڕۆیشتنو ئەو شوێنەیان بینی کە تیایدا دەژیـا، کـات نزیکەی چواری پاش نیوەڕۆ بوو، ئەو ڕۆژە لـەگـەڵی مانـەوە. [40]ئـەندەراوس کـە بـرای شەمعون پەترۆس بوو، یەکێ بوو لـەو دووانەی دوای عیسـا کـەوتن، دوای ئەوەی گوێیان لـەقسەی یەحیا بوو. [41]هەر کە ئەندەراوس شەمعونی برای دۆزییەوە، پـێی ووت: (مەسـیحمان دۆزیـەوە) واتـە دەستنیشانکراو. [42]ئینجا بردی بۆ لای عیسا، عیسا بـەووردی تـێیڕوانی و ووتـی: (تۆ شەمعونی کوڕی یۆنـای، بـەڵام مـن بانگـت دەکـەم کـێفا❖، واتـە پەترۆس.)

[43]بـۆ بـەیانی عیسا بڕیاریدا بڕوات بۆ ناوچەی جەلـیل، کاتێ فیلیپۆسی دۆزیەوە، پێی ووت: (دوام کـەوە!) [44]فیلیـپۆس وەك ئـەندەراوسو پەتـرۆس خـەڵکی شـاری بەیت سەیدا بوو. [45]ئینجا فیلیپۆس نەسـەنائیلی دۆزیـەوە پـێی ووت: (ئـەوەی موسـا لـەتـەوراتدا لەسـەری نووسـیوەو پێغەمبەرانـیش لەپەرتووکەکانـیان، دۆزیمانـەوە. ئـەو کەسە عیسای کوڕی یوسفی خەڵکی ناسیرەیە.) [46]نەسەنائیل ووتی: (ئایـا لـەشـاری ناسـیرە شـتی چـاك هەڵدەکەوێ؟) فیلیپۆس پێی ووت: (وەرە سەیرکە!)

[47]کـە عیسـا نەسـەنائیلی بینی وا بەرەو ڕووی دێـت، ووتـی: (بێگومـان ئەمـە ئیسـرائیلییەکی بێغەلوغەشـە!) [48]نەسـەنائیل لەعیسـای پرسـی: (لـەکوێ دەمناسیت؟) عیسا لـەوەڵامدا ووتی: (کاتێ لەژێـر دارهەنجیرەکـە بوویـت تۆم بینی، پێش ئەوەی فیلیـپۆس بانگـتبکات.) [49]ئینجا نەسەنائیل هاواری

❖ [illegible] پەترۆس.

کردو ووتی: (ئەی مامۆستا، تۆ ڕۆڵەی خودایت! تۆ پادشـای ئیسـرائیلیت!) [50]عیسـا پـێی ووت: (ئایـا بـاوەڕت هێـنا چـونکە پـێم ووتیـت تـۆم لەژێـر دارهەنجیرەکـە بینـی؟ بـزانە کـاری لەمـەش مـەزنتر دەبینیـت!) [51]دیسـان ووتـی: (ڕاسـتی ڕاسـتیتان پێدەڵـێم، ئـێوە ئاسمان بەکراوەیی دەبینن‌و فریشتەی خودا دەبینن لەبەرزبوونەوەو هاتنەخوارەوەیان لەسەر ڕۆڵەی مرۆڤ.)

## شایی لەقانا
## 2

لـەڕۆژی سـێهەمدا لـەدێـی قانـا لـەناوچەی جەلیل شـاییەك هـەبوو، دایکـی عیساش ئامادەی ئەو شاییە بـوو، [2]هەروەها عیساو قوتابیەکانیشی بانگ‌کرابوون بۆ ئەم شاییە. [3]کاتێ شەراب تەواو بوو، دایکی چووە لای عیسـاو پـێی ووت: (هـیچ شەرابیان نەماوە!) [4] ئـەویش پـێی ووت: (ئەمە پەیوەندی بەمنەوە هەیە یان بـەتۆ؟ هێشـتا کـاتی مـن نـەهاتووە!) [5]دوایی دایکی عیسـا بـەئیشکەرەکانی ووت: (ئەوەی ئەو فەرمانتان پـێدەدات بیکەن.) [6]لـەوێدا شـەش کوپەی بەردین هـەبوو، جوولەکـەکان ئاوەکـەیان بەکاردەهێـنا بـۆ پـاك‌کـردنەوە بەپـێی خووڕەوشتی خۆیان، کوپەکان هەریەکەی هەشتا تا سەدو بیست لیتریان دەگرت. [7] جـا عیسـا بەئیشکەرەکانی ووت: (کوپەکان پڕکەن لـەئاو.) ئەوانیش کوپەکانیان تا سەر پڕکرد. [8]ئەوسا پـێی ووتـن: (ئێسـتا لـێی‌دەرکەن‌و بیـبەن بـۆ سەرپەرشـتیکەری شـاییەکە!) ئەوانیش وایان کرد. [9] کـاتێ سەرپەرشتیکەر تـامی ئـەو ئـاوەی کـرد کـە گۆڕابـوو بۆ شەراب، بەڵام سەرچاوەکەی نەدەزانی، ئـەوەی ئیشـکەرەکان دەیانـزانی چۆنە و چیە، ئەوسا زاوای بـانگ‌کردو [10]پێی ووت: (خەڵکی لەپێشەوە شەرابە چاکەکە دادەنێن‌و دوای کەمێك خواردنەوە، شـەرابی تـر دەهێـنن کـە ئـەوەندە بـاش نەبێ وەکو ئـەوەی یەکەم. بەڵام تۆ شەرابە باشەکەت هێشتۆتەوە بۆ ئێستا!)

[11]ئەمە یەکەمین نیشانەی سەرسوڕهێنەر بوو کە عیسـا لـەدێـی قانای ناوچەی جەلیل کردی، ئەوەی تـیایدا شـکۆمەندی خـۆی دەرخسـت‌و قوتابیەکانی باوەڕیـان پێهێـنا. [12]دوای ئەمـە عیسـاو دایکـی‌و بـراکانی‌و قوتابیەکانی چوون بۆ شاری کەفەرناحوم، چەند ڕۆژێك لـەوێ مانەوە.

## پاکسازی پەرستگا

[13]کـاتێ جـەژنی تێـپەڕبوونی جوولەکـە نزیك بـووەوە، عیسـا چـوو بـۆ قـودس، [14]لەپەرستگادا* ئەوانـەی بیـنی کە مانگاو مەڕو کۆتریان دەفرۆشت، هـەروەها پارەگۆڕەوەکـان لەبـەردەم مێزەکانـیان دانیشـتبوون، [15]عیسـا لـەگوریس قامچـیەکی دروست‌کردو ئەوانەی لەپەرستگادا بوون بەخۆیان‌و مـەڕو مانگـاوە هـەموویانی دەرکـرد. پـارەی پارەگۆڕەوەکـانی پەرشـوبڵاوکردەوەو مێزەکانـیانی سـەرەوژێر کرد، [16]ئینجا بەکۆتر فرۆشەکانی ووت: (ئـەم شـتانە لـێرە بـبەنە دەرەوە! چۆن دەوێرن ماڵی باوکم بکەنە بازاڕ؟) [17]لێرەدا قوتابیەکان ئەو ئایەتەیان

بیرکەوتەوە کە لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە: {دڵگەرمی بۆ ماڵەکەت دەمسووتێنێ}.

[18]دەسەڵاتدارانی جوولەکە بەرهەڵستی عیسایان کردو ووتیان: (نیشانەیەکمان بۆ بهێنەوە دەستنیشانی دەسەڵاتت بکات بۆ ئەو کارەی کردت!) [19]جا عیسا لەوەڵامدا ووتی: (ئەم پەرستگایە بڕوخێنن، لەسێ ڕۆژدا دروستی دەکەمەوە.) [20]ئەوسا جوولەکەکان پێیان ووت: (ئەم پەرستگایە بەچل و شەش ساڵ دروستکراوە، تۆ بەسێ ڕۆژ دروستی‌دەکەیتەوە؟) [21]بەڵام ئەو پەرستگایەی ئەو دەربارەی قسەی دەکرد، لەشی خۆی بوو. [22]کاتێ عیسا لەناو مردووان هەستایەوە، ئەوسا قوتابیەکانی ئەم قسەیەی عیسایان بیرکەوتەوە، ئینجا باوەڕیان هێنا بەکتێب*و بەو ووتانەی عیسا ووتبووی.

[23]کاتێ عیسا لەجەژنی تێپەڕبووندا لەقودس بوو، خەڵکێکی زۆر ئەو نیشانە سەرسوڕهێنەرانەیان بینی کە کردی‌و باوەڕیان بەناوی ئەو هێنا. [24]بەڵام عیسا متمانەی پێ نەکردن، چونکە هەموو خەڵکی دەناسی. [25]ئەو پێویستی بەکەس نەبوو شایەتی بۆ بدا دەربارەی مرۆڤ، چونکە ناوەڕۆکی مرۆڤی دەناسی.

## لەدایك بوون لەرۆح
## 3

پیاوێك هەبوو لەفەریسیەکان ناوی نیقۆدیمۆس بوو، ئەندام بوو لەئەنجوومەنی جوولەکەکان. [2]بەشەو بۆ لای عیسا هات‌و پێی ووت: (مامۆستا، ئێمە دەزانین تۆ مامۆستایەکی لەلای خوداوە هاتوویت، چونکە ئەو نیشانە سەرسوڕهێنەرانەی تۆ دەی‌کەیت، کەس ناتوانێ بیکات گەر خودای لەگەڵدا نەبێت.) [3]ئینجا عیسا پێی ووت: (ڕاستی ڕاستیت پێ دەڵێم، کەس ناتوانێت پادشاهێتی خودا ببینێت گەر لەئاسمانەوە لەدایك نەبێت.) [4]نیقۆدیمۆس لێی‌پرسی: (مرۆڤ چۆن دەتوانێت بەپیری لەدایك ببێتەوە؟ خۆ جارێکی‌کە ناچێتەوە سکی دایکی‌و سەرلەنوێ لەدایك بێتەوە!)

[5]عیسا وەڵامی دایەوەو ووتی: (ڕاستی ڕاستیت پێ دەڵێم، کەس ناتوانێ بچێتە ناو پادشاهێتی خودا گەر لەئاو و لەرۆح لەدایك‌نەبێتەوە. [6]چونکە ئەوەی لە لەشەوە لەدایك دەبێ لەشە، ئەوەش کە لە ڕۆحەوە لەدایك دەبێت ڕۆحە، [7]کەواتە سەرت سوڕنەمێنێ کە دەڵێم: پێویستە لەئاسمانەوە لەدایك ببنەوە. [8]شنەبا بۆ هەر شوێنێ کە ئارەزووی لێ‌بێت هەڵدەکات‌و گوێمان لە دەنگەکەی دەبێت، بەڵام نازانرێ لەکوێوە دێت‌و بۆکوێ دەڕوات. هەر بەم شێوەیەشە هەموو ئەوانەی لە ڕۆحەوە لەدایك دەبن.)

[9]دیسان نیقۆدیمۆس پرسیاری‌کردەوە: (چۆن ئەمە ڕوودەدات؟) [10]عیسا وەڵامی دایەوە: (تۆ مامۆستایەکی ئیسرائیلی‌و ئەمە نازانی! [11]ڕاستی ڕاستیت پێ‌دەڵێم: ئێمە ئەوە دەڵێین کە دەی‌زانین‌و شایەتی بۆ ئەوە دەدەین کە دەی‌بینین، لەگەڵ ئەوەشدا ئێوە شایەتیەکەمان قبوڵ ناکەن. [12]باسی شتە زەمینیەکانتان بۆ دەکەم، باوەڕناکەن، ئیتر چۆن باوەڕ دەکەن ئەگەر باسی شتی ئاسمانیتان بۆ بکەم؟ [13]هیچ کەسێ نەچۆتە ئاسمان جگە لەوەی لەئاسمان هاتۆتە

خوارەوە، ئەویش ڕۆڵەی مرۆڤە. [14]جا چۆن موسا مارەکەی لەبیاباندا* بەدارەوە هەڵواسی، بەهەمان شێوە ڕۆڵەی مرۆڤیش دەبێ هەڵواسرێ، [15]تاوەکو هەرکەسێك باوەڕی پێبێنێ ژیانی هەتاهەتایی دەسکەوێ.)

**خۆشەویستی خودا بۆ جیهان**

[16](چونکە خودا بەم جۆرە جیهانی خۆشەویست تەنانەت تاقە ڕۆڵەی خۆی پێشکەش کرد، هەتا هەموو ئەوانەی باوەڕی پێدەکەن لەناو نەچن، بەڵکو ژیانی هەتاهەتایی بەدەست بهێنن. [17] چونکە خودا ڕۆڵەی نەنارد بۆ تاوانبارکردنی جیهان، بەڵکو ناردی تا جیهان ڕزگار بێت بەهۆی ئەوەوە. [18]ئەوەی باوەڕی پێدەهێنێ تاوانبار ناکرێ، بەڵام ئەوەی باوەڕی پێناهێنێ تاوانبارکراوە، چونکە باوەڕی بەناوی تاقە ڕۆڵەی خودا نەهێناوە. [19]ئەمەش حوکمەکەیە: ڕووناکی هات بۆ جیهان، بەڵام خەڵکەکە حەزیان لەتاریکی کرد لەجیاتی ڕووناکی، چونکە کردەوەیان خراپ بوو. [20]هەر کەسێك خراپە بکات ڕقی لەڕووناکیە، نایەتە لای ڕووناکی نەوەك کردەوەکانی ئاشکرا ببێ. [21]بەڵام ئەوەی بەڕێگای ڕاستیدا دەڕوات، بۆ لای ڕووناکی دێت تاکو کردەوەکانی دەرکەوێت کە بەهۆی خوداوە کراوە.)

**عیساو شایەتی یەحیا**

[22]دوای ئەوە عیساو قوتابیەکانی ڕۆیشتن بۆ شارەکانی یەهودیە، لەوێ لەگەڵیان مایەوە، دەستی کرد بەخەڵك لە ئاوهەڵکێشان. [23]هەروەها یەحیا لەکانی نون لەنزیك شاری سالیم خەڵکی لە ئاوهەڵدەکێشا، چونکە ئاوی ئەوێ زۆر بوو خەڵکەکە دەهاتن و لەوێ لەئاوهەڵدەکێشران. [24] هێشتا یەحیا نەخرابووە بەندیخانەوە. [25]لەوێدا گفتوگۆیەکی گەرم کەوتە نێوان قوتابیەکانی یەحیا لەگەڵ جولەکەیەك دەربارەی پاككردنەوە. [26] جا چوون بۆ لای یەحیاو پێیان ووت: (مامۆستا، ئەو پیاوەی بینیمان لەگەڵت لەپشتی ڕووباری ئوردونەوە، ئەوەی شایەتیت بۆدا، ئێستا ئەویش خەڵك لەئاوهەڵدەکێشێ و هەموو خەڵکەکە دەڕۆن بۆ لای ئەو!)

[27]یەحیاش وەڵامی دایەوە: (پیاو دەتوانێ تەنها ئەوە وەرگرێ کە لەئاسمانەوە پێی دراوە! [28]ئێوە خۆتان شایەتن کاتێ ووتم: من مەسیح نیم، من پێش ئەو نێرراوم. [29]بووك بۆ زاوایە! بەڵام هاوڕێی زاوا ئەوەی لەچاوەڕوانیدایە کاتێ گوێی لەدەنگی زاوا دەبێ، دڵشاد دەبێ. جا ئەوەتا ئەم خۆشیەم هاتەدی. [30]دەبێت ئەو زیادبکات و منیش کەم.)

[31]ئەوەی لەسەرەوە هاتووە لەسەرووی هەموانە. بەڵام ئەوەی لە زەویە ئەو زەمینیەو هەر لەبارەی کاروباری زەمینی دەدوێ. جا ئەوەی لەئاسمانەوە هاتووە لەسەرووی هەموانە، [32]ئەو شایەتی ئەوە دەدات کە بینیویەتی و بیستوویەتی، بەڵام کەس شایەتیەکەی وەرناگرێ! [33]ئەوەی شایەتیەکەی وەردەگرێ، دەیسەلمێنێ کەوا خودا ڕاستە، [34]چونکە

ئەوەی خودا ناردوویەتی بەووشەی خودا دەدوێ، لەبەرئەوەی خودا بەپێوانە ڕۆح نادات. [35]باوك ڕۆڵەی خۆی خۆشدەوێ، هەموو شتێکی خستوتە ژێر دەستی. [36]ئەوەی باوەڕ بەڕۆڵەکە بهێنێ، ژیانی هەتاهەتایی هەیە. ئەوەش کە گوێڕایەڵی ڕۆڵەکە نابێ ژیان نابینێت، بەڵکو تووڕەیی خودای بەسەردا دەچەسپێ.

## ژنێکی سامری

## 4

فەریسیەکان بیستیان کە عیسا قوتابی زۆری هەیەو لەیەحیا زیاتر خەڵکی لەئاوهەڵدەکێشێ، [2]هەرچەندە خۆی خەڵکی لەئاوهەڵنەدەکێشا بەڵکو قوتابیەکانی. [3]کاتێ عیسا بەمەی زانی ناوچەی یەهودیەی بەجێهێشتو گەڕایەوە بۆ ناوچەی جەلیل. [4]دەبوایە بەناوچەی سامیرەدا* بڕۆشتایە، [5]لەوێ گەیشتە شارێکی سامری پێیدەوترا سوخار، نزیك بوو لەو پارچە زەوییەی یاقوب بەیوسفی کوڕی دابوو، [6]بیری یاقوبیش لەوێبوو. جا چونکە عیسا ماندووی گەشتەکە بوو، کاتیش نزیکەی دوانزەی نیوەڕۆ بوو، لەسەر قەراغی بیرەکە دانیشت. [7]ژنێکی سامری هاتە سەر بیرەکە بۆ ئەوەی ئاو بەرێ، عیسا پێی ووت: (هەندێ ئاوم بدەرێ!) [8]قوتابیەکانی چوو بوونە ناو شار تا خواردن بکڕن. [9]ئینجا ژنە سامرییەکە پێی ووت: (تۆ جوولەکەیتو منیش سامری، چۆن داوای ئاوم لێدەکەیت؟) چونکە جوولەکەکان تێکەڵی سامرییەکان نەدەبوون. [10]عیساش بەژنەکەی ووت: (ئەگەر تۆ بەخشینی خودا بزانیتو ئەوەی پێت دەڵێ ئاوم بدەرێ بزانی کێیە، ئەوسا تۆ داوات لێدەکردو ئەویش ئاوی ژیانی پێتدەدا!) [11]ژنەکە پێی ووت: (بەڵام گەورەم، تۆ هیچت پێ نییە بۆ دەرهێنانی ئاو و بیرەکەش قووڵە. ئیتر ئاوی ژیانت لەکوێ بوو؟ [12]ئایا تۆ لەیاقوبی باوکمان گەورەتری کە ئەم بیرەی بۆ بەجێهێشتووین، ئەوەی خۆیو منداڵو ئاژەڵی لێیان خواردۆتەوە؟) [13]عیساش پێی ووت: (هەر کەسێ لەم ئاوە بخواتەوە دیسان تینووی دەبێتەوە. [14]بەڵام ئەوەی لەو ئاوە بخواتەوە کە من دەیدەمێ، هەرگیز تینووی نابێ، بەڵکو ئەو ئاوەی من دەیدەمێ دەبێ بەکانیەك، لەناخیدا هەڵدەقوڵێو ژیانی هەتاهەتایی پێدەبەخشێ.)

[15]ئەوسا ژنەکە پێی ووت: (گەورەم، ئەو ئاوەم بدەرێ تاتینووم نەبێو جارێکی کە نەگەڕێمەوە بۆ ئێرە ئاو بەرم!) [16]عیساش پێی ووت: (بڕۆ، مێردەکەت بانگبکەو بگەڕێوە بۆ ئێرە.) [17]ئەویش وەڵامی دایەوە: (مێردم نییە!) عیساش ووتی: (ڕاست دەکەی کە دەڵێیت مێردم نییە. [18]لەڕاستیدا تۆ پێنج مێردت هەبوو، ئەوەی ئێستاش لەگەڵی دەژی مێردت نییە. ئەمەشت بەڕاستی ووت!) [19]ئینجا ژنەکە پێی ووت: (گەورەم، من وای دەبینم تۆ پێغەمبەری. [20]باوباپیرانمان خودایان لەم شاخەدا پەرستووە، بەڵام ئێوەی جوولەکە دەڵێن دەبێ تەنها قودس مەڵبەندی خوداپەرستی بێ.) [21]عیسا وەڵامی دایەوە: (باوەڕم پێبکە ئەی ئافرەت، کاتێ دێ کەوا ئێوە باوك

نەلەسەر ئەم شاخەو نەلەقودس دەپەرستن. [22]ئێوەی سامری نازانن کێ دەپەرستن، بەڵام ئێمە دەزانین کێ دەپەرستین چونکە ڕزگاری لە جوولەکەوەیە. [23]جا ئەو کاتە دێت کەوا ئێستایە، کاتێ خواپەرستە ڕاستەکان باوك بەرۆحو بەڕاستی دەپەرستن، چونکە خودا ئەو جۆرە خواپەرستانەی دەوێ. [24]خودا رۆحە، ئیتر لەبەرئەوە دەبێ ئەوانەی دەیپەرستن بەرۆحو بەڕاستی بیپەرستن.) [25]ژنەکە پێی ووت: (من دەزانم مەسیح (واتە دەستنیشانکراو) دێت، هەر کاتێ ئەو هات هەموو شتێکمان بۆ ڕووندەکاتەوە.) [26]عیسا وەڵامی دایەوە: (من ئەوم، ئەوەی قسەت لەگەڵ دەکات!).

[27]لەوکاتەدا قوتابیەکان گەیشتن، سەریانسوڕما کاتێ بینییان قسە لەگەڵ ئەو ژنە دەکات. لەگەڵ ئەوەش کەسیان پێیان نەووت: (چیت لێی دەوێ؟ یاخود بۆچی گفتوگۆی لەگەڵ دەکەیت؟) [28]ئینجا ژنەکە گۆزەکەی بەجێهێشتو گەڕایەوە ناو شار، بەخەڵکەکەی ووت: [29](وەرن، ئەو پیاوە ببینن هەر چیەکم کردووە پێیووتم! ڕەنگە ئەو مەسیح بێ؟) [30]ئیتر دانیشتوانی سوخار هاتنەدەرەوەو بەرەو لای چوون.

[31]لەوکاتەدا قوتابیەکانی زۆریان لێدەکردو پێیان دەووت: (مامۆستا، شتێ بخۆ.) [32]بەڵام ئەو وەڵامی دانەوە: (من خواردنێکم هەیە دەیخۆم کە ئێوە نایزانن.) [33]قوتابیەکانی لەنێوان خۆیاندا دەستیانکرد بەپرسیارکردن: (ئایا کەس خواردنی بۆ هێناوە؟) [34]عیساش پێی ووتن: (خواردنی من ئەوەیە خواستی ئەوە بەئەنجام بگەیێنم کە ناردوومیو کاروبارەکانی جێ بەجێ بکەم. [35]ئەی خۆتان نالێن: (پاش چوار مانگ کاتی دروێنە دێ!) بەڵام من پێتان دەڵێم: چاوتان بکەنەوەو سەیری کێڵگەکان بکەن، ئەوەتا پێگەیشتوونو کاتی دروێنەیان هاتووە. [36]دروێنەکەریش کرێی خۆی وەردەگرێ، بەرووبووم کۆدەکاتەوە بۆ ژیانی هەتاهەتایی، ئەوسا چێنەرو دروێنەکەر بەیەکەوە دڵشاد دەبن، [37]ئینجا ئەو ووتەیە ڕاستە کە دەڵێ: (یەکێ دەچێنێو ئەویکەش دروێنە دەکات.) [38]من ئێوەم ناردووە بۆ دروێنەیەك کە پێوەی ماندوو نەبوون، کەسانیتر پێوەی ماندووبوونو ئێوە بەری ماندووبوونەکەیان دەخۆن.)

[39]ژمارەیەکی زۆر لە سامریەکانی دانیشتووی ئەو شارە باوەڕیان بەعیسا هێنا بەهۆی قسەی ئەو ژنەوە کە ووتی: (هەرچیەکم کردبوو هەمووی پێیووتم.) [40]کاتێ سامریەکان هاتن بۆ لای، داوایان لێکرد لایان بمێنێتەوە، ئەویش لەوێ دوو ڕۆژ مایەوە، [41]بەهۆی ووشەکانیەوە ژمارەی ئەوانەی باوەڕیان پێهێنا زۆر زیادی کرد، [42]ئەوسا خەڵکەکە بەژنەکەیان ووت: (لەئێستا بەدواوە ئیتر ئێمە بەهۆی قسەی تۆوە باوەڕ ناکەین، بەڵکو باوەڕ دەکەین چونکە خۆمان گوێمان لێیبوو، زانیمانو بۆمان دەرکەوت، ئەو پیاوە بەڕاستی ڕزگارکەری جیهانە!)

## چاکردنەوە بەووشە

[43]پاش دوو ڕۆژ ئەوێی بەجێهێشتو ڕۆیشتە جەلیل، [44]چونکە عیسا خۆی ووتبوی: (پێغەمبەر

لەووڵاتی خۆیدا ڕێزی لێناگیرێ!) [45]کاتێ عیسا گەیشتە ناوچەی جەلیل دانیشتوانی پێشوازیان لێکرد، هەرچییەکی کردبوو لەقودس لەجەژنی تێپەڕبوون بینیبوویان، چونکە ئەوانیش لەوێ بوون.

[46]جارێکی کە سەردانی شاری قانای ناوچەی جەلیلی کرد، ئەو شوێنەی تیایدا ئاوی کرد بەشەراب، لەشاری کەفەرناحوم پیاوێك لەدەستوپێوەندی پادشا، کوڕێکی نەخۆشی هەبوو. [47]کاتێ پیاوەکە بیستی عیسا ناوچەی یەهودیەی بەجێهێشتووەو هاتووە بۆ ناوچەی جەلیل، هاتە لایو لێی پاڕایەوە لەگەڵی بچێت بۆ ئەوەی کوڕەکەی کە لەسەرەمەرگدا بوو چاك بکاتەوە. [48]ئینجا عیسا ووتی: (باوەڕ ناکەن هەتا ئایەتو نیشانەی سەرسوڕهێنەر نەبینن!) [49]لێرەدا پیاوەکە ووتی: (گەورەم، وەرە لەگەڵم پێش ئەوەی کوڕەکەم بمرێ!) [50]عیسا لەوەڵامدا ووتی: (بڕۆ! کوڕەکەت زیندووە!) پیاوەکە باوەڕی بەووشەکانی کردو ئەوێی بەجێهێشت. [51]کاتێ پیاوەکە بەڕێگاوە بوو هەندێ لەکۆیلەکانی تووش بوو، مژدەیان دایە کە کوڕەکەی زیندووە، [52]ئەویش لێیپرسین لەچ کاتێکدا چاك بووەوە، لەوەڵامدا ووتیان: (دوێنێ لە کاژێری یەکی دوای نیوەڕۆ تایەکە بەریدا.) [53]بەمە باوکەکە زانی ئەو کاژێرە ئەوکاتە بوو کە عیسا پێی ووت کوڕەکەت زیندووە. ئەوسا خۆیو خاوخێزانی هەموو باوەڕیان هێنا. [54]ئەم نیشانە سەرسوڕهێنەرە نیشانەی دووەم بوو عیسا کردی دوای ئەوەی ناوچەی یەهودیەی بەجێهێشتو بەرەو ناوچەی جەلیل ڕۆیشت.

## چاکردنەوە لەڕۆژی شەممە

# 5

دوای ئەوە لەکاتی جەژنێکی جوولەکە عیسا چوو بۆ قودس، [2]لەنزیك دەروازەی مەڕ حەوزێك هەبوو بەعیبری پێیان دەووت بەیتی حەسدا، لەدەوروپشتی پێنج هۆڵی لێبوو. [3]لەوێدا ژمارەیەکی زۆر نەخۆش کەوتبوون لەکوێرو شەلو گۆج، ﴿چاوەڕێیان دەکرد ئاوی حەوزەکە بشڵەقێ، [4]چونکە فریشتەیەك جار جارە دەهات بۆ حەوزەکەو ئاوەکەی دەشڵەقاند، جا ئەوەی یەکەم کەس بچووبایە ناو حەوزەکە، چاك دەبووەوە جۆری نەخۆشیەکەی هەرچییەك بووایە.﴾ [5]کابرایەك لەوێ بوو ماوەی سیوهەشت ساڵ بوو نەخۆش بوو. [6]کاتێ عیسا کابرای بینی لەوێدا پاڵکەوتووە، زانی ماوەیەکی دوورو درێژی بەم جۆرە بەسەربردووە، لێیپرسی: (دەتەوێ چاكببیتەوە؟) [7]کابرای نەخۆش وەڵامی دایەوە: (گەورەم، کەسم نییە یارمەتیمبداتو بمخاتە ناو حەوزەکە کاتێ ئاوەکە دەشڵەقێ. کاتێ هەوڵدەدەم بچمە ناویەوە یەکێکیتر پێشم دەکەوێو دەچێتە ناو ئاوەکە.) [8]ئەوسا عیسا پێی ووت: (هەستە! نوینەکەت هەڵگرەو بڕۆ!) [9]دەستبەجێ کابرا چاك بووەوەو نوینەکەی هەڵگرتو ڕۆیشت. ئەو ڕۆژەش شەممەبوو.

[10]بۆیە دەسەڵاتدارانی جوولەکە بەکابرای چاكبوویان ووت: (ئەمڕۆ شەممەیە. ناشێ نوینەکەت

هەڵگری!) [11] کابراش وەڵامی دانەوە: (ئەوەی چاکی کردمەوە پێی ووتم: (نوێنەکەت هەڵگرەو برۆ!)) [12] ئەوانیش لێیان پرسی: (کێ پێی ووتی: نوینەکەت هەڵگرەو برۆ؟) [13] بەڵام کابرای کە چاکبووەوە نەیدەزانی ئەو کێیە، چونکە عیسا بێ‌ئەوەی هەستی پێبکرێ خۆی کێشایەوە لەو شوێنەی خەڵکەکەی لێبوو. [14] دوای‌ئەوە عیسا کابرای لەپەرستگادا بینی پێی ووت: (ئا ئەوەتا چاکبوویتەوە. جارێکی‌کە مەگەڕێرەوە بۆ گوناه تاوەکو شتی خراپتر بەسەر نەیەت!) [15] ئینجا کابرا ڕۆیشتو بەجوولەکەکانی ووت کە عیسا چاکی کردۆتەوە. [16] ئیتر جوولەکەکان دەستیان‌کرد بەچەوساندنەوەی عیسا، چونکە ئەو کارانەی لەڕۆژی شەممەدا دەکرد.

### باوکو ڕۆڵە

[17] بەڵام عیسا پێی ووتن: (تاوەکو ئێستاش باوکم هەر کاردەکات، منیش هەروەها کاردەکەم!) [18] جا لەبەرئەوە هەوڵدانی جوولەکەکان پەرەی‌سەند بۆ کوشتنی، تەنها لەبەرئەوە نا کە بەرپێچی ڕۆژی شەممەی کرد بوو، بەڵکو لەبەرئەوەی ووتی خودا باوکیەتی، بەمەش خۆی یەکسان دەکرد لەگەڵ خودا. [19] عیسا پێی ووتن: (ڕاستی ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: ڕۆڵە ناتوانێ بەتەنها لەخۆیەوە هیچ بکات، بەڵکو دەبینێ باوکی چی دەکات ئەویش ئەوە دەکات. هەموو شتێ کە باوك دەیکات، ڕۆڵەش هەمان شت دەکات. [20] چونکە باوك ڕۆڵەی خۆی خۆش‌دەوێ، هەرچیەك دەکات نیشانی‌دەدات، هەروەها لەم کارەش گەورەتری نیشان‌دەدات، ئەوسا سەرسام دەبن. [21] هەروەك چۆن باوك مردووان هەڵدەستێنێتەوەو زیندوویان دەکاتەوە، هەروەها ڕۆڵەش هەرکەسێکی بوێ زیندووی دەکاتەوە. [22] باوك حوکم بەسەر کەس نادات، بەڵکو هەموو دەسەڵاتی حوکمدانی داوە بە ڕۆڵە، [23] جا با هەموو ڕێزی ڕۆڵە بگرن هەروەك چۆن ڕێزی باوك دەگرن. هەر کەسێکیش ڕێزی ڕۆڵە نەگرێ ڕێزی ئەو باوکە ناگرێ کە ناردوویەتی.

### لەمردنەوە بەرەو ژیان

[24] ڕاستی ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: ئەوەی گوێ لەووشەکەم بگرێو باوەڕبهێنێ بەوەی ناردوومی ژیانی هەتاهەتایی دەبێ، لەڕۆژی دوایدا حوکم نادرێ بەسەری، چونکە ئەو لە مردنەوە پەڕیوەتەوە بۆ ژیان. [25] ڕاستی ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: ئەو کاتە دێو ئەوەتا ئێستا هاتووە، کەوا مردووان گوێیان لە دەنگی ڕۆڵەی خودا دەبێ، ئینجا ئەوانەی گوێیان لێ‌دەبێ زیندوودەبنەوە. [26] چونکە هەروەك باوك سەرچاوەی ژیانە، بەم جۆرەش بەڕۆڵەی داوە سەرچاوەی ژیان بێ، [27] دەسەڵاتی حوکم بەسەردانی داوەتێ چونکە ئەو ڕۆڵەی مرۆڤە. [28] سەرتان لەمە سوڕنەمێنێ: کاتێك دێ هەموو ئەوانەی لەناو گۆڕدان گوێیان لەدەنگی دەبێو [29] دێنە دەرەوە، جا ئەوانەی کرداری چاکیان کردووە بەرەو هەستانەوەی ژیان دەڕۆن، بەڵام ئەوانەی کرداری خراپیان کردووە بەرەو هەستانەوەی حوکم

بەسەردان.

[30]مـن نـاتوانم لـةخؤمـةوة هيض بكـةم، بـةلكو حوكـمدةدةم بةثـيَى ئـةوةى طويَـم لـىَدةبىَ، حوكـم بةسـةردانةكةشـم دادثةروةرانةية، لةبةر ئـةوةى هـةولَ نـادةم خواسـتى خـؤم بهيَنمةدى، بـةلكو خواسـتى ئةوةى كة ناردوومي.

### شایەتی باوك بۆ ڕۆڵەی خۆی

[31]ئەگـەر خـۆم شایەتی بۆخۆم بدەم شایەتیەکەم ڕاسـت نـیـە، [32]بەڵام یەکێکی کە شایەتیم بۆ دەدات، منیش دەزانم ئەو شایەتیەی بۆ منی دەدات ڕاستە. [33] ئـێوە نـێرراوتان نـاردە لای یەحـیا ئەویش شایەتی بۆ ڕاستیدا. [34]مـن ئەمە دەڵێم لەبەرئەوە نییە من پشت بەشـایەتی مـرۆڤ دەبەسـتم، بـەڵکو لـەپێـناو ڕزگـاربوونتانە. [35]یەحیا چرایەکی ڕووناکی هەڵکراو بـوو، حەزتان دەکرد ماوەیەك چێژ لەڕووناکیەکەی وەرگرن. [36]بەڵام من شایەتیەکی مەزنترم هەیە لەوەی یەحـیا، ئەویش شایەتی ئەو کارانەیە کە باوکم داوای لـێکـردووم تـەواوی بکـەم. جـا ئـەوەی دەیکـەم بەئاشکرا شایەتی بۆ من دەدا کە باوك منی ناردووە، [37]ئـەو باوکـەی مـنی ناردووە خۆشی شایەتی بۆ من دەدا.

ئـەوەی ئـێوە هەرگـیز دەنگیـتان نەبیسـتووە، هـەروەها ڕواڵەتیـتان نەبینیوە. [38]ئەوەی ووشەکەی لـەدڵـتاندا نیشـتەجێ نـەبوو، چـونکە ئـەوەتا ئـێوە باوەڕناکـەن بـەوەی ناردوویـەتی. [39]ئـێوە کتێـب دەپشـکنن چـونکە لـەو بـاوەڕەدان بـەرەو ژیـانی هەتاهەتاییـتان دەبـات. ئـەو پەرتووکانەش شایەتیم بۆ دەدەن. [40]بـەڵام ئـێوە ناتانـەوێ بێن بۆ لای من تاکو ژیانتان هەبێ. [41]من شکۆمەندی لەخەڵك وەرناگرم. [42]بەڵام من دەتانناسم، هەروەها دەزانم خۆشەویستی خـودا لـە ناوەڕۆکتاندا نییە. [43]جا ئەوەتا من بەناوی باوکمەوە هاتووم پێم ڕازی نین، بەڵام پێشوازی لەوە دەکـەن کـە بـەناوی خۆیـەوە دێت. [44]ئەگـەر ئێوە شـکۆمەندی لەیەکتری وەربگرن‌و ئەو شکۆمەندیەی لەتاکـە خوداویـە داوانەکـەن، ئـیتر چـۆن دەتوانن باوەڕبهێـنن؟ [45]لـەو بـاوەڕەدا مـەبن مـن شـکاتتان لـێبکەم لای باوك، لەوێ یەکێکی کە هەیە شکاتتان لـێبکـات، ئـەویش موسـایە کـە هیواتان پێیەتی. [46] ئەگـەر باوەڕتـان بـەموسـا بکـردایە، ئەوسا باوەڕتان بـەمنـیش دەکـرد، چـونکە ئـەو لـەبارەی مـنەوە نووسـیویەتی. [47]کەواتە گەر ئێوە باوەڕنەکەن بەوەی موسـا نووسـیویەتی، ئیتر چۆن باوەڕ بە قسەکانی من دەکەن؟)

### تێرکردنی پێنج هەزارکەس

## 6

دوای ئەمە عیسا پەڕییەوە ئەوبەری دەریاچەی جەلیل کـە دەریاچـەی تەبەریـیە، [2]ئیـنجا ژمارەیـەکی زۆر خـەڵکی دوای کـەوتن، چـونکە نیشـانەی سەرسـوڕهێنەری چاکبوونەوەی نەخۆشیان لـێبینی. [3]عیسـاو قوتابیەکانیشی چوونە سەر شاخێك‌و لەوێ دانیشـتن. [4]هـەروەها جـەژنی تێـپەڕبوونی

جوولەکەکانیش نزیك بوو. [5]کاتیّ عیسا سەیری کردو بینی ژمارەیەکی زۆر بەرەو ڕووی دێن، بە فیلیپۆسی ووت: (لەکویّ نان بکڕین تا نانی ئەم هەمووە بدەین؟) [6]ئەمەی ووت بۆئەوەی تاقی کاتەوە، چونکە عیسا خۆی دەیزانی چی دەکات. [7]فیلیپۆس وەڵامی دایەوە: (گەر تەنانەت بایی دووسەد دیناریش* نان بکڕین، بەشی ئەوە ناکات هەریەکەیان پارچەیەکی بچووکی بەرکەویّ!) [8]ئینجا ئەندەراوس، برای شەمعون پەترۆس، کە یەکێك بوو لە قوتابیەکانی پێی ووت: [9](لێرە کوڕێك هەیە پێنج نانی جۆو دوو ماسی پێیە. بەڵام ئەمە چیە بۆ ئەم کۆمەڵە گەورەیە؟) [10]عیسا ووتی: (دایانبنیشێنن!) پیاوەکان کە ژمارەیان پێنج هەزار کەسێك دەبوو لەوێدا سەوزە گیایەکی زۆری لیّبوو لەسەری دانیشتن. [11]عیسا نانەکانی هەڵگرتو سوپاسی خودای کرد، ئینجا ئەوەندەی پێویستیان پیّبوو دابەشیکرد بەسەر دانیشتوان، هەمان شتیشی لە دوو ماسیەکە کرد. [12]کاتیّ تیّربوون، بە قوتابیەکانی ووت: (ئەو لەتە نانانەی ماوەتەوە کۆیکەنەوە تاکو هیچ شتێك بەفیڕۆ نەڕوات!) [13]ئەوانیش کۆیانکردەوە، ئینجا لەپێنج نانە جۆیەکە دوانزە سەبەتە لەتە نانی پاشماوەیان کۆکردەوە لە نانخۆران. [14]کاتیّ خەڵکەکە ئەو نیشانە سەرسوڕهێنەرەیان بینی کە عیسا کردی ووتیان: (بەڕاستی، ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە بۆ جیهان هاتووە.) [15]عیسا کە زانی ئەوان خەریکن بیرفێنن‌و بیکەن بە پادشا، بەتەنها گەڕایەوە بۆسەر شاخ.

## عیسا بەسەر ئاودا دەڕوات

[16]کاتیّ ئێوارە داهات قوتابیەکانی هاتنەخوارەوە بۆ دەریاچەکە، [17]سواری بەلەمێك بوون‌و بەرەو شاری کەفەرناحوم کە کەوتبووە بەری ئەوبەری دەریاچەکەوە کەوتنە ڕیّ. تاریکی داهات بەڵام عیسا هێشتا نەگەیشتبووە لایان. [18]ئینجا ڕەشەبایەکی بەهێز هەڵیکرد، ئاوی دەریاچەکەی شڵەقاند. [19]دوای ئەوەی قوتابیەکان نزیکەی پێنج تا شەش کیلۆمەتر سەوڵیان لیّدا، عیسایان بینی نزیك دەبێتەوە لەبەلەمەکەیان‌و بەسەر ئاوی دەریاچەکەدا دەڕوا. ترسیان لیّنیشت. [20]پێی ووتن: (منم، مەترسن!) [21]هەر ئەوەندەی داوایان لیّکرد سواری بەلەمەکەبیّ، یەکسەر بەلەمەکە گەیشتە شوێنی مەبەست.

[22]بۆ بەیانی، ئەو خەڵکەی لەسەر کەناری ئەوبەری دەریاچەکە مابوونەوە تەنها یەك بەلەمیان بینی، بەبیریشیان هاتەوە عیسا لەگەڵ قوتابیەکانی سواری بەلەمەکە نەببوو، بەڵکو قوتابیەکانی بەتەنها سواربببوون. [23]ئیتر چەند بەلەمێکی کە لەشاری تەبەریەوە هاتن، لەنزیك ئەو شوێنە لەنگەریان گرت کە ئەو نانەیان تیادا خواردبوو پاش ئەوەی خوداوەند سوپاسی خودای لەسەرکردبوو. [24]کاتیّ خەڵکەکە عیساو قوتابیەکانیان لەویّ نەبینی، سواری ئەو بەلەمانە بوون‌و چوون بۆ کەفەرناحوم تا بەشوێن عیسا بگەڕێن.

## من نانی ژیانم

[25]جا کاتیّ لەبەری ئەوبەری دەریاچەکەوە

دۆزییانەوە، پێیان ووت: (مامۆستا، کەی گەیشتیتە ئێرە؟) 26عیساش لەوەڵامدا ووتی: (ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم: ئێوە بەدوامدا دەگەرێن لەبەرئەوەنا کە نیشانەی سەرسوڕهێنەرتان بینی، بەڵکو لەبەرئەوەی لەنانەکەتان خواردو تێربوون. 27لەپێناوی خۆراکی لەناوچوو ئیش مەکەن، بەڵکو لەپێناو ئەو خۆراکەی دەمێنێتەوە بۆ ژیانی هەتاهەتایی، ئەوەی ڕۆڵەی مرۆڤ دەتانداتێ، چونکە ڕۆڵە مۆری خودای باوکی پێوەیە.) 28لێرە پێیان ووت: (دەبێ ئێمە چی بکەین، تاکو کارەکانی خودا بکەین؟) 29ئەویش وەڵامی دانەوە: (ئەمەیە کاری خودا: باوەڕبهێنن بەوەی ناردوویەتی.) 30ئەوسا پێیان ووت: (چ نیشانەیەکی سەرسوڕهێنەر دەکەیت تا ببینین‌و باوەڕت پێبکەین؟ دەتوانی چی‌بکەیت؟ 31باوباپیرانمان مەنیان* خواردووە لەبیاباندا هەروەك نووسراوە: {ئەو لە ئاسمانەوە نانی دانێ تا بیخۆن!})

32عیسا پێی‌ووتن: (ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم: موسا نەبوو لەئاسمانەوە نانی دانێ، بەڵکو باوکمە نانی ڕاستیتان دەداتێ لەئاسمانەوە. 33چونکە نانی خودا ئەوەیە کە لەئاسمانەوە دابەزیوەو ژیان بەجیهان دەبەخشێ.) 34پێیان ووت: (گەورە، هەموو کاتێ ئەو نانەمان بدەرێ.) 35عیسا وەڵامی دانەوە: (من نانی ژیانم، ئەوەی بێتە لام برسی نابێت، ئەوەش باوەڕم پێبهێنێ هەرگیز تینووی نابێ. 36بەڵام هەروەکو پێم‌ووتن ئێوە منتان بینی کەچی باوەڕناکەن، 37جا هەرکەسێك باوکم پێمدەبەخشێ بۆ لای من دێت، هەرکەسێکیش بێتە لای من، هەرگیز دەری ناکەمە دەرەوە. 38چونکە من لەئاسمانەوە دابەزیوم، بۆ ئەوە نا خواستی خۆم بهێنمەدی، بەڵکو بۆئەوەی خواستی ئەوە بهێنمەدی کە ناردوومی. 39ئەمەش خواستی ئەوەیە کە منی ناردووە: کەس نییە لەوانەی داویەتیە من لەناوبچێ، بەڵکو لەڕۆژی دوایدا زیندووی دەکەمەوە. 40چونکە خواستی باوکم ئەمەیە: هەر کەسێ ڕۆڵە ببینێ‌و باوەڕی پێبهێنێ، ژیانی هەتاهەتایی دەبێ، لەڕۆژی دواییشدا زیندووی دەکەمەوە.)

41جوولەکەکان دەستیانکرد بە نارەزایی دەربڕین بەرامبەر بەعیسا چونکە دەی‌ووت: (من ئەو نانەم لەئاسمانەوە هاتۆتە خوارەوە.) 42ووتیان: (ئەمە عیسای کوڕی یوسف نییە کە ئێمە دایك‌و باوکی دەناسین؟ ئێستا چۆن دەڵێ من لە ئاسمانەوە هاتوومەتە خوارەوە؟)

43عیساش وەڵامی دانەوە: (لەناو خۆتاندا بۆڵەبۆڵ مەکەن! 44هیچ کەسێ ناتوانێ بێتە لای من گەر باوك ئەوەی منی ناردووە ڕاینەکێشێ، منیش لەڕۆژی دواییدا زیندووی دەکەمەوە. 45لەپەرتووکی پێغەمبەراندا نووسراوە: {هەموو لەخوداوە فێردەبن} ، ئیتر هەرکەسێ گوێ لەباوك بگرێ‌و لێوەی فێربێ بۆ لای من دێت. 46ئەمەش مانای ئەوە نییە یەکێك هەبێ باوکی بینیبێ تەنها ئەوەی کە لەخوداوەیە ئەو باوکی بینیوە.

47(ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم: ئەوەی باوەڕ بهێنێ ژیانی هەتاهەتایی هەیە. 48من نانی ژیانم. 49باوباپیرانتان لەبیاباندا مەنیان خوارد لەگەڵ ئەوەش

مـردن، [50]بـەڵام ئـەوەتا ئـەو نانـەی لەئاسمان هاتۆتە خـوارەوە، ئەوەی هەر مرۆڤێ لێی بخوات نامرێ. [51] مـن ئـەو نانـە زیندووەم لەئاسمانەوە هاتۆتە خوارەوە. ئەوەی لەم نانە بخوا تاهەتایە دەژی. ئەو نانەش کە من دەیدەم ئـەوە لەشمـە، دەیبەخشـم لەپێـناوی ژیانی جیهاندا.)

[52]ئـەم قسـانە بووە هۆی دەمەقاڵەیەکی توندو رەق لەنـێوان جوولەکەکاندا، ئینجا پرسیاریانکرد: (چـۆن ئەمـە دەتوانـێ لەشـی خۆیمـان بداتـێ تـا بـیخۆین؟) [53]عیسا وەڵامی دانەوە: (ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵـێم: ئەگـەر لـە لەشـی ڕۆڵەی مرۆڤ نەخۆنو لـەخوێـنی نەخۆنـەوە، ژیـان لە ئێوەدا نییە. [54]بەڵام ئـەوەی لەشـم بخـواتو خوێـنم بخواتـەوە، ژیـانی هەتاهـەتایی دەبـێ، هـەروەها لـە ڕۆژی دوایـیدا زیـندووی دەکەمـەوە، [55]چـونکە لەشـم خۆراکـی ڕاستەقینەیەو خوێنیشم خواردنەوەی ڕاستەقینەیە. [56] دیسـان هـەر کەسـێ لـە لەشـم بخوات و لەخوێنم بخواتـەوە لـە مـندا جێگیردەبێو منیش لەئەودا. [57] چـۆن بـاوکی زیـندووم منی ناردووەو من زیندووم بـەو باوکـە، هـەمانشـت بـەهۆی منەوە ئەوەی لە لەشـم دەخـوات زیندوودەبێ. [58]جا ئەمە ئەو نانەیە لـەئاسمان هاتـەخوارەوە، ئەمەش وەکو ئەو مەنە نییە کـە باوباپیرانـتان خواردیانو مردن. ئەوەی لەم نانە بخوات تاهەتایە دەژی.)

[59]عیسـا ئەمانـەی هـەموو لەکەنیشـتدا ووت، کاتێ لەشاری کەفەرناحوم خەڵکەکەی فێردەکرد.

## قوتابییەکان گومان دەکەن

[60]زۆر لـەقوتابـیەکانی کـە گوێـیان لەمـە بوو ووتـیان: (ئەم قسانە چەند گرانە! کێ دەتوانێ گوێی لـێبگـرێ؟) [61]عیسا هەستیکرد قوتابییەکانی بەهۆی ئەمـەوە بۆڵـەبۆڵ دەکەن، ئەوسا لێیپرسین: (ئایا ئەمە دەتـانخاتـە گومانـەوە؟ [62]ئـەی ئەگەر ببینن ڕۆڵەی مـرۆڤ بەرزبکرێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لەپێشا لێیبوو؟ [63]ڕۆح ژیـان دەدات، بـەڵام لـەش بەکـەڵکی هـیچ نایـەت. ئـەو ووشـانەی کـە پـێموتن ئەوانە ڕۆحو ژیـانن. [64]بـەڵام هەندێکـتان باوەڕناکـەن!) عیسـا لەسـەرەتاوە دەیـزانیکێن ئەوانەی باوەڕی پێناکەن، هـەروەها کێـیە ئـەوەی دەیـدا بەدەسـتەوە. [65]ئینجا ووتی: (لەبەرئەوە پێم ووتن کەس ناتوانێ بێ بۆ لای من، گەر باوك ئەمەی پێنەبەخشێ.)

[66]لەوکاتـەدا زۆر لـە قوتابـیەکانی بەجێـیان هێشتو ئیتر دوای نەکەوتن. [67]ئەوسا عیسا بەدوانزە قوتابیەکەی ووت: (ئـێوەش دەتانـەوێ وەك ئـەوان بـڕۆن؟) [68]شـەمعون پەتـرۆس وەڵامـی دایـەوە: (گـەورەم، بـۆ لای کـێ بـڕۆین؟ ووشـەکانی ژیانی هەتاهـەتایی لای تۆیـە. [69]ئـێمە باوەڕمـان هێـناوەو زانـیومانە تـۆ پـاكوپـیرۆزی خودای!) [70]ئینجا عیسا ووتـی: (ئایـا مـن ئـێوەی دوانـزەم هەڵـنەبژاردووە؟ لەگـەڵ ئەوەشـدا یەکێ لەناوتاندا شەیتانە!) [71]لێرەدا مەبەستی لەیـەهوزای کوڕی شەمعونی ئەسخەریوتی بـوو، ئـەوەی لـەدوایـیدا ناپـاکـی لەگـەڵ کـرد، هەرچەندە یەکێ بوو لەدوانزە قوتابییەکەی.

## ڕقی جیهان بۆ عیسا

# 7

دوای ئەوەی عیسا دەستی‌کرد بەگەڕان بەناوچەی جەلیلدا، نەیویست بەناوچەی یەهودیەدا بگەڕێ، چونکە دەسەلاتدارانی جوولەکە هەوڵی کوشتنیان دەدا. [2]کاتێ جەژنی کەپرەشینەی* جوولەکەکان نزیك بووەوە، [3]براکانی پێیان‌ووت: (ئەم ناوچەیە بەجێبهێڵەو بڕۆ بۆ ناوچەی یەهودیە تاکو قوتابیەکانت کردارەکانت ببینن، [4]هیچ کەسێ بەنهێنی ئیش ناکات گەر بیەوێ ناوبانگ دەرکات. تۆ کە ئەم شتانە دەکەیت خۆت دەرخە بۆ خەڵکی.) [5]هەرچەندە براکانیشی خۆیان باوەڕیان پێ‌نەدەکرد. [6]عیسا لەوەلامدا ووتی: (جارێ کاتم نەهاتووە، بەلام کاتی ئێوە هەردەم گونجاوە. [7]جیهان ناتوانێ ڕقی لێتان بێت، بەلام ڕقی لەمن دەبێتەوە، چونکە من شایەتم بەسەریەوە کە کردەوەکانی خراپە. [8]ئێوە خۆتان بۆ جەژن بڕۆن بۆ ئەوێ، من نایەم بۆ ئەم جەژنە. چونکە هێشتا کاتی من نەهاتووە.) [9]عیسا ئەمەی پێ‌ووتن‌و لە ناوچەی جەلیل مایەوە.

[10]دوای ئەوەی براکانی ڕۆیشتن بۆ جەژنەکە، ئەویش ڕۆیشت بۆ ئەوێ، بەلام بەنهێنی نەك بەئاشکرا. [11]دەسەلاتدارانی جوولەکە لەجەژنەکەدا بەدوایدا دەگەڕان‌و دەیانپرسی: (ئەو لەکوێیە؟) [12]دەربارەی ئەو لە نێوان خەڵکەکەدا چرپەچرپێکی زۆر هەبوو، هەندێکیان دەیانووت: (پیاوێکی چاکە.) بەلام هەندێکی کەیان دەیانووت: (نەخێر بەلکو گەل گومڕا دەکات.) [13]جا لەترسی دەسەلاتدارانی جوولەکە کەس بەئاشکرا باسی نەدەکرد.

## بیروڕای جیاواز دەربارەی عیسا

[14]کاتێ نیوەی جەژن تێپەڕی، عیسا چوو بۆ پەرستگاو دەستی‌کرد بە فێرکردنی خەڵکەکە. [15]جوولەکەکان سەرسام بوون‌و پرسییان: (چۆن لەکتێب دەزانێت بەبێ ئەوەی خوێندبێتی؟) [16]عیسا لەوەلامدا ووتی: (فێرکردنەکانم هی خۆم نییە، بەلکو هی ئەوەیە کە ناردوومی. [17]جا هەر کەسێ بیەوێ بەخواستی خودا کار بکات دەزانێ ئاخۆ فێرکردنەکانم لەلایەن خوداوەیە یاخود لەخۆمەوە قسە دەکەم. [18]ئەوەی لەخۆیەوە قسە بکات، داوای شکۆمەندی بۆ خۆی دەکات، بەلام ئەوەی داوای شکۆمەندی بۆ ئەوە بکات کە ناردوویەتی، ئەوکەسە ڕاستەو درۆی تیادانییە. [19]ئایا موسا شەریعەتی نەداونەتی؟ بەلام کەستان لەسەری نارۆن! بۆچی هەوڵی کوشتنم دەدەن؟) [20]خەڵکەکە وەلامیان دایەوە: (ڕۆحی پیست تیادایە! کێ دەیەوێ بتکوژێ؟) [21]عیسا پێی ووتن: (تەنها کارێکم کرد هەمووتان سەرتان‌سوڕما. [22]جا چونکە موسا ڕای‌سپاردوون خەتەنە بکەن، هەرچەندە ئەمەش ناگەڕێتەوە بۆ موسا بەلکو بۆ باووباپیران، تەنانەت لەڕۆژی شەممەشدا بێت مرۆڤ خەتەنە دەکەن. [23]گەر هاتوو ئێوە مرۆڤێکتان خەتەنەکرد لەڕۆژی شەممەدا هەتا بەرپێچی شەریعەتی موسا نەکەن، ئایا دەبێ لەمن تووڕەبن چونکە مرۆڤێکم بە تەواوی لەڕۆژی

شـەممەدا چـاك كـردۆتەوە؟ [24]بەسـەرزاری حوكـم مـەدەن، بـەڵكو حوكمـێكی دادپەروەرانە بدەن.) [25]لەو كاتـەدا هـەندێ لـەدانیشـتوانی شـاری قـودس وەتیان: (ئایا ئەمە ئەوە نییە كە دەیانەوێ بیكوژن؟ [26]ئـا ئـەوەتا بـەئاشـكرا قسە دەكات‌و كەسیش هیچی پێ‌نـاڵێ. ئایـا سـەرۆكەكانمان دڵنـیا بوونـە كـە ئەو بەڕاسـتی مەسـیحە؟ [27]كاتێ مەسیح دێ كەس نازانێ لـەكوێوە هـاتووە، بـەلاّم ئێمە ڕەگەزو بنەچەی ئەمە دەناسین!)

[28]بۆیـە كـاتێ عیسـا لـەپەرسـتگادا خـەڵكی فـێردەكرد، دەنگـی بەرزكـردەوەو ووتـی: (ئایـا بەڕاستی ئێوە من دەناسن‌و دەزانن لەكوێوە هاتووم؟ من لەخۆمەوە نەهاتووم، جا ئەوەی منی ناردووە ئەو ڕاستەو ئێوە نایناسن. [29]بەلاّم من ئەو دەناسم چونكە مـن لـەوەم‌و ئـەویش مـنی نـاردووە.) [30]ئەوسـا جوولەكەكان هەوڵی گرتنیاندا، بەلاّم كەس دەستی بـۆ درێـژ نەكـرد، چونكە هێشتا كاتی نەهاتبوو. [31]لـێرە ژمارەیـەكی زۆر لـەخەڵكی باوەڕیان پێ‌هێناو ووتـیان: (كـاتێ مەسـیح بێـت، ئایـا نیشـانەی سەرسـوڕهێنەری زیاتـر دەكـات لـەوەی ئـەم پیاوە كردوویەتی؟)

[32]فەریسـیەكان گوێـیان لـێ‌بوو خەڵكەكـە دەربـارەی عیسا چرپەچرپ دەكەن لەگەڵ یەكتری، ئەوسا ئەوان‌و سەرۆك كاهینەكان چەند پاسەوانێكیان نارد تابیگرن. [33]عیسا ووتی: (من تەنها بۆ ماوەیەكی كـەم لەگەڵـتاندام، ئینجا دەگەڕێمەوە بۆ لای ئەوەی نـاردوومی. [34]ئەوكاتـە بـەدوامدا دەگـەڕێن‌و نامدۆزنەوە، هەروەها ناتوانن بێن بۆ ئەو شوێنەی منی لـێدەبم.) [35]ئـیتر جوولەكـەكان لەنـێوان خۆیـاندا پرسـیاریان كـرد: (نـیازی كوێی هەیە بۆی بڕوات‌و ئێمە نای‌دۆزینەوە؟ ئایا بۆ ئەو شارە یۆنانیانە دەڕوات كە جوولەكەكان تیایدا پەرشوبلاّو بوونەتەوە، تاوەكو یۆنانیەكان فـێربكات؟ [36]مەبەسـتی چـیە لـەوەی كە دەڵـێ: (دەگەڕێن بەدوام بەلاّم نامدۆزنەوە، هەروەها ناتوانن بێن بۆ ئەو شوێنەی منی لێدەبم؟))

**ڕووبـاری زیندوو**

[37]لـەدوا ڕۆژی جـەژندا، كە گرنگترین ڕۆژی بـوو، عیسـا ڕاوەسـتاو بـەدەنگـی بەرز ووتی: (گەر یەكێ تینووی بوو بابێتە لای من‌و بخواتەوە. [38]ئەوەی بـاوەڕم پێ‌بهێـنێ، لەناوەڕۆكیدا ڕووباری ئاوی ژیان هـەڵدەقوڵێ.) [39]لـێرە عیسـا مەبەسـتی لـەرۆحی پیرۆزبوو، كە دەدرێ بەوانەی باوەڕی پێ‌دەهێنن، جا ئـەو ڕۆحـە جـارێ نـەدرابوو چـونكە هێشـتا عیسا شكۆدار نەببوو.

[40]كـاتێ ئامـادەبووان گوێیان لەم ووشانە بوو، هەندێكیان ووتیان: (ئەمە بەڕاستی پێغەمبەرەكەیە!) [41]هـەروەها هەندێكی كـەیان ووتـیان: (ئەمە مەسیحە.) بـەلاّم چـەند كەسـێكی كە ووتـیان: (ئایـا مەسـیح لەناوچـەی جەلـیلەوە دەردەكەوێ؟ [42]ئایا لـەكتێبدا بـاس نەكـراوە مەسـیح لـەنـەوەی داود پەیدا دەبێ، لـەدێی بەیـت‌لـەحم كـە داودی لـێ‌بووە؟) [43]جا بـەهۆی ئـەوەوە دووبـەرەكی لـەبیرورا لەنـێوان خەڵكەكـەدا دروسـت بـوو. [44]هەندێكـیان ویستیان

بیگرن، بەڵام کەسیان دەستیان بۆ نەبرد.

45ئەوسا پاسەوانەکان گەڕانەوە لای فەریسیەکانو سەرۆك کاهینەکان، ئەوانیش لێیان پرسین: (بۆچی نەتان هێنا؟) 46لەوەڵامدا ووتیان: (هەرگیز کەس وەك ئەو قسەی نەکردووە!) 47ئەوانیش پێیان ووتن: (ئایا ئێوەش گومڕا بوون؟ 48ئایا بینیوتانە یەکێ لەسەرۆکەکان یاخود فەریسیەکان باوەڕی پێبهێنن؟ 49نەخێر! تەنها ئەو خەڵکە نەفرەت لێکراوەی لەشەریعەت نازانن.) 50بەڵام یەکێ لەوان کە ناوی نیقۆدیمۆس بوو، ئەوەی بەشەو بۆ لای عیسا هاتبوو، پێی ووتن: 51(ئایا شەریعەتی ئێمە ڕێگا دەدات حوکم بدرێ بەسەر یەکێکدا بێئەوەی یەکەمجار گوێ لەو کەسە بگیرێ تا بزانرێ چی کردووە؟) 52ئەوانیش وەڵامیان دایەوە: (ئایا تۆش لەدانیشتوانی جەلیلی؟ کتێب بخوێنەوە ئەوسا دەزانی هەرگیز لەجەلیل پێغەمبەر دەرناکەوێ!) ﴿53ئیتر هەر یەکە ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆی.

## ئافرەتێکی داوێن پیس

# 8

بەڵام عیسا بۆ شاخی زەیتون ڕۆیشت. 2لەبەرەبەیان گەڕایەوە بۆ پەرستگا، خەڵکێکی زۆر لێی کۆبوونەوە، ئەویش دانیشتو دەستی کرد بەفێرکردنیان. 3مامۆستایانی شەریعەتو فەریسیەکان ژنێکی داوێن پیسیان هێنایە لایو لەناوەڕاست ڕایانگرت، 4پێیان ووت: (مامۆستا ئەم ژنە لەکاتی داوێنپیسیدا گیراوە. 5موسا لەشەریعەتدا ڕایسپاردووین ئەوانەی وەك ئەم ژنە وان دەبێ بەردباران بکرێن، تۆ چی دەڵێی؟) 6ئەمەیان لێپرسی تا تاقی بکەنەوەو هۆیەك بدۆزنەوە بۆ تاوانبارکردنو دادگایی کردنی. بەڵام عیسا سەری داگرتو بەپەنجە دەستی کرد بەنووسین لەسەر زەوی. 7کاتێ ئەوان هەر سوور بوون لەسەر پرسیارەکەیان، عیسا سەری هەڵبڕیو پێی ووتن: (کامتان بێگوناهە با یەکەم بەردی لێبدات!) 8دیسان سەری داگرتەوەو دەستی کرد بەنووسین لەسەر زەوی. 9کە گوێیان لەم قسەیە بوو، لە پیرەکانیانەوە هەموو یەك لەدوای یەك خۆیان کێشایەوە. ئەوسا عیسا بەتەنها مایەوە، ژنەکەش لەشوێنی خۆی وەستابوو. 10ئینجا عیسا سەری بەرزکردەوە، لەژنەکە زیاتر کەسی تری نەبینی، پێی ووت: (ئەی ئافرەت ئەوان لە کوێن؟ کەسیان تاوانباری نەکردی؟) 11ئەویش وەڵامی دایەوە: (نەخێر گەورەم.) عیساش پێی ووت: (منیش تاوانبارت ناکەم، بڕۆ جارێکی کە گوناە مەکە!)﴾

## من ڕووناکی جیهانم

12جارێکی کە عیسا گفتوگۆی لەگەڵدا کردنو ووتی: (من ڕووناکی جیهانم. ئەوەی دوامبکەوێ بەتاریکیدا ناڕوات، بەڵکو ڕووناکی ژیانی دەبێ.) 13فەریسیەکان بەربەرەکانیان کردو ووتیان: (تۆ ئێستا شایەتی بۆ خۆت دەدەیت، بەڵام شایەتیەکەت ڕاست نییە.) 14ئەویش وەڵامیدایەوە: (لەگەڵ ئەوەی من شایەتی بۆ خۆم دەدەم، شایەتیەکەم ڕاستە، چونکە

دەزانم لەکوێوە هاتووم و بۆ کوێ دەڕۆم، بەڵام ئێوە نازانن لەکوێوە هاتووم و بۆ کوێ دەڕۆم. [15]جا ئێوە بەپێی لەش حوکمدەدەن بەسەرم، بەڵام من حوکم بەسەر کەس نادەم، [16]لەگەڵ ئەوەشدا گەر حوکم بدەم حوکمەکانم دادپەروەرانەیە، چونکە من بەتەنها حوکم نادەم، بەڵکو من و ئەو باوکەی ناردوومی. [17]لەشەریعەتەکەتان نووسراوە شایەتی دوو پیاو ڕاستە. [18]من ئەوەم شایەتی بۆخۆم دەدەم، هەروەها ئەو باوکەی ناردوومی شایەتیم بۆ دەدات.) [19]ئەوسا لێیانپرسی: (باوکت لەکوێیە؟) لەوەڵامدا ووتی: (ئێوە من ناناسن، باوکیشم ناناسن. گەر منتان بناسیبایە باوکمیشتان دەناسی.) [20]عیسا ئەم قسانەی لەلای سندوقی بەخشینی پەرستگادا کرد کاتێ خەڵکی فێر دەکرد، بەڵام هیچ کەسێ نەیگرت، چونکە هێشتا کاتی نەهاتبوو.

[21]ئینجا عیسا پێی ووتن: (من دەڕۆم و ئێوە بەدوامدا دەگەڕێن، بەڵام ناتوانن بێن بۆ ئەو شوێنەی منی لێدەبم، بەڵکو بەگوناهەکانتانەوە دەمرن.) [22]دەسەڵاتدارانی جوولەکە دەستیان کرد بەپرسیارکردن: (ئایا مەبەستی لەم قسەیە چیە ناتوانن بێن بۆ ئەو شوێنەی منی لێدەبم؟ ئایا خۆی دەکوژێ؟) [23]وەڵامی عیسا ئەوەبوو: (ئێوە لەخوارەوەن، بەڵام من لەسەرەوەم، ئێوە سەر بەم جیهانەن، بەڵام من سەر بەم جیهانە نیم. [24]جا لەبەرئەوە بوو پێمووتن: بەگوناهەکانتانەوە دەمرن، چونکە ئەگەر باوەڕ نەهێنن من ئەوم، بەگوناهەکانتانەوە دەمرن.) [25]لێیانپرسی: (تۆ کێیت؟) عیسا لەوەڵامدا ووتی: (من هەر ئەو کەسەم لەسەرەتاوە پێمووتون! [26]زۆر شتم هەیە بیڵێم و حوکمی پێبدەم بەسەرتان. بەڵام ئەوەی منی ناردووە، ئەو خۆی ڕاستییە، ئەوەی بەجیهانیشی دەڵێم ئەوەیە کە لەوم بیستووە.) [27]جا ئەوان تێنەگەیشتن عیسا لەم قسەیە مەبەستی لەباوکی بوو. [28]لەبەرئەوە عیسا پێی ووتن: (کاتێ ڕۆڵەی مرۆڤ هەڵدەواسن دەزانن من ئەوم، هەروەها من لەخۆمەوە هیچ ناکەم، بەڵکو ئەو قسانە دەڵێم کە باوکم فێری کردووم. [29]ئەوەی ناردوومی لەگەڵمدایە، بەتەنها بەجێی نەهێشتووم، چونکە هەمیشە بەپێی ڕەزامەندی ئەو کاردەکەم.)

## ڕاستی ئازادتان دەکات

[30]کاتێ عیسا ئەم قسانەی دەکرد، ژمارەیەکی زۆر خەڵك باوەڕیان پێهێنا. [31]ئەوسا عیسا بەو جوولەکانەی باوەڕیان پێیهێنابوو ووتی: (گەر لەسەر ووشەکانم جێگیربن، بەڕاستی دەبنە قوتابی من و [32]ڕاستی دەناسن و ڕاستیش ئازادتان دەکات.) [33]جوولەکەکان لەوەڵامدا ووتیان: (ئێمە نەوەی ئیبراهیمین، هەرگیز کۆیلەی کەس نەبووین! ئیتر چۆن پێمان دەڵێی: ئێوە ئازاد دەبن؟) [34]عیساش وەڵامی دانەوە: (ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم: هەرکەسێ گوناه بکات دەبێت بەکۆیلەی گوناه. [35]کۆیلە لەماڵی گەورەکەیدا تاسەر نامێنێتەوە، بەڵام ڕۆڵە تاسەر تیایدا دەژی. [36]جا گەر ڕۆڵە ئازادیکردن، ئەوا بەڕاستی ئازاد دەبن. [37]من دەزانم ئێوە لەنەوەی ئیبراهیمین. بەڵام ئێوە هەوڵی کوشتنم

دەدەن، چونکە ووتەکانم لەدڵتان جێگەی نابێتەوە. [38]من چیم لەلای باوك بینیوە دەیلێم، بەڵام ئێوە چیتان لەباوکتانەوە بیستووە کاری پێدەکەن.)

[39]ئەوان بەربەرەکانیان کردو ووتیان: (ئیبراهیم باوکمانە!) عیساش ووتی: (گەر رۆڵەی ئیبراهیم بوونایە، کردارەکانی ئیبراهیمتان دەکرد. [40]بەڵام چونکە من ئەو کەسەم ئەو راستییەی لەخوداوە بیستبووم پێم ووتن، ئێوە هەوڵی کوشتنم دەدەن، ئەمەش ئیبراهیم نەیکردووە. [41]ئێوە کرداری باوکتان دەکەن!) ئەوانیش پێیان ووت: (ئێمە بەزۆڵی لەدایك نەبووین! یەك باوکمان هەیە ئەویش خودایە.) [42]عیساش ووتی: (گەر خودا باوکتان بووایە، منتان خۆش دەویست، چونکە من لە خوداوە دەرچووم‌و هاتووم. لە خۆمەوە نەهاتووم، بەڵکو ئەو ناردوومی. [43]بۆچی لەووتەکانم تێناگەن؟ چونکە توانای گوێگرتنی ووشەکانی منتان نییە! [44]ئێوە رۆڵەی شەیتانی باوکتانن، دەتانەوێ ئارەزووەکانی باوکتان جێبەجێ بکەن. ئەو هەر لەسەرەتاوە خەڵك کوژ بووە، نەیتوانی لەناو راستیدا بچەسپێ، چونکە راستی لەودا نییە! کاتێکیش درۆ دەکات، ئەوە دەردەخات کەتیایەتی، چونکە خۆی درۆزنەو باوکی درۆیە! [45]بەڵام چونکە من راستیتان پێدەڵێم باوەڕم پێناکەن. [46]کامتان دەتوانن گوناهێکم لێبدۆزنەوە؟ جا مادام راستی دەڵێم، بۆچی باوەڕم پێناکەن؟ [47]ئەوەی لەخوداوە بێت، گوێ لەووشەی خودا دەگرێ. بەڵام ئێوە ووشەی خوداتان ناوێ چونکە لەخودا نین!)

[48]ئەوسا جوولەکەکان ووتیان: (ئایا ئێمە قسەکانمان راست نییە کە دەڵێین تۆ سامری، هەروەها رۆحی پیست تیایە؟)

[49]ئەویش وەڵامی دانەوە: (رۆحی پیسم تیادانییە، بەڵام رێزی باوکم دەگرم‌و ئێوەش بەسووکی سەیرم دەکەن. [50]من داوای شکۆمەندی بۆ خۆم ناکەم، بەڵام یەکێ هەیە بۆم داوا دەکات‌و حوکم دەدا. [51]راستی راستیتان پێدەڵێم: ئەوەی گوێڕایەڵی ووتەکانم بێ هەرگیز مردن نابینێ.)

[52]ئەوسا جوولەکەکان ووتیان: (ئێستا بۆمان دەرکەوت کە رۆحی پیست تیایە. ئیبراهیم‌و پێغەمبەران مردن، کەچی تۆ دەڵێیت ئەوەی گوێڕایەڵی ووتەکانم بێت هەرگیز تامی مردن ناکات. [53]ئایا تۆ گەورەتری لەئیبراهیمی باوکمان کە مرد؟ تەنانەت پێغەمبەرانی خوداش مردن، کەواتە خۆت بەچی دادەنێی؟)

[54]عیساش لەوەڵامدا ووتی: (گەر من خۆم شکۆدار بکەم، ئەوا شکۆمەندیەکەم هیچ نییە. بەڵام باوکمە کەوا شکۆدارم دەکات ئەوەی ئێوە دەڵێن خودامانە، [55]لەگەڵ ئەوەشدا نایناسن. بەڵام من دەیناسم. جا گەر پێتان بڵێم من ئەو ناناسم، منیش ئەوکاتە وەك ئێوە درۆزنم. بەڵام من ئەو دەناسم‌و بەووتەکانی رەفتار دەکەم. [56]ئیبراهیمی باوکتان دڵشادبوو بەوەی رۆژی من ببینێ، جا ئەو رۆژەی بینی‌و پێی دڵخۆش بوو.) [57]جوولەکەکان پێیان ووت: (تۆ جارێ تەمەنت هێشتا نەبووە بەپەنجا ساڵ ئیتر چۆن ئیبراهیمت بینیوە؟) [58]عیساش لەوەڵامدا

ووتی: (ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم، پێش ئەوەی ئیبراهیم لەدایك بێ من هەم.) [59]ئەوسا بەردیان هەڵگرت تابەردبارانی بکەن، بەڵام عیسا خۆی شاردەوەو لەپەرستگاکە چووە دەرەوە.

## چاکردنەوەی کوێرێکی زگماك
## 9

کاتێ عیسا بەرێگادا دەڕۆیشت، پیاوێکی بەزگماك کوێری بینی، [2]قوتابیەکانی لێیانپرسی: (مامۆستا، کێ گوناهی کردووە؟ ئەم پیاوە، یاخود دایكو باوکی، تا بەکوێری لەدایك ببێ؟) [3]عیسا لەوەڵامدا ووتی: (نەگوناهی ئەم پیاوەیەو نەدایكو باوکی، بەڵام بۆیە وای لێهاتووە تا بەهۆی ئەوەوە کارەکانی خودا دەرکەوێ. [4]هەتا کاتەکە ڕۆژە لەسەرمە کاری ئەو بکەم کە ناردوومی. دوایی شەو دێتو کەس ناتوانێ کاری تیا بکات. [5]جا ئەوەندەی لەجیهاندام، من ڕووناکی جیهانم.)

[6]ئەمەی ووتو تفی کردە سەر زەوی، بەتفەکە قوڕی دروستکرد، ئینجا خستیە سەر هەردوو چاوی کوێرەکە، [7]پێی ووت: (بڕۆ خۆت بشۆ لەگۆمی سیلوام (واتای نێرراوە).) ئەویش ڕۆیشتو خۆی شوشتو بەچاوکراوەیی هاتەوە.

[8]ئینجا دراوسێکانیو ئەوانەی لەپێشا بینیبوویان سواڵ دەکات پرسییان: (ئەمە ئەوە نییە دادەنیشت سواڵی دەکرد؟) [9]هەندێکیان ووتیان: (خۆیەتی.) هەندێکی کەیان: (نەخێر، بەڵام لەو دەکات.) ئەوسا خۆی وەڵامی دایەوەو ووتی: (بەڵێ من ئەوم.) [10]ئینجا پێیانووت: (ئەی چۆن چاوت چاك بووەوە؟) [11]لەوەڵامدا ووتی: (ئەو پیاوەی ناوی عیسایە قوڕی دروستکردو چاومی پێسواخدا، پێیووتم: بڕۆ بۆ گۆمی سیلوام خۆتی تیادا بشۆ. منیش ڕۆیشتمو خۆم تیا شوشتو چاوم چاكبووەوە!) [12]هەروەها لێیان پرسی: (ئێستا ئەو لەکوێیە؟) ئەویش ووتی: (نازانم.)

[13]پیاوە کوێرەکەیان بردە لای فەریسیەکان. [14]ئەو ڕۆژەش کە عیسا قوڕەکەی دروستکردو چاوی کوێرەکەی تیا چاككردەوە ڕۆژی شەممە بوو. [15]دیسان فەریسیەکانیش لێیان پرسی چۆن چاوی چاكبووەوە. ئەویش لەوەڵامدا ووتی: (قوڕی خستە سەر چاوم، خۆم شوشتو ئەوەتا ئێستا دەبینم!) [16]بەڵام هەندێ لەفەریسیەکان ووتیان: (ناشێ ئەم پیاوە لەخوداوە بێت، چونکە بەرپێچی یاسای شەممە دەکات.) بەڵام هەندێکیان پرسییان: (چۆن پیاوێکی گوناهبار دەتوانێ نیشانەی سەرسوڕهێنەر بنوێنێ؟) ئیتر دووبەرەکی کەوتە نێوانیانەوە. [17]دیسان لەکوێرەکەیان پرسی: (تۆ ڕات چییە بەرامبەر ئەو چونکە چاوی تۆی چاككردەوە؟) ئەویش وەڵامی دانەوە: (ئەو پێغەمبەرە!) [18]دەسەڵاتدارانی جولەکە باوەڕیان نەکرد کە ئەو پیاوە کوێر بووەو ئێستا دەبینێ، ئیتر دایكو باوکیان بانگکرد. [19]لێیان پرسین: (ئایا ئەم کوڕەتان بەکوێری لەدایك بووە وەك دەڵێن؟ جا چۆن ئێستا دەبینێ؟) [20]دایكو باوکەکە وەڵامیان دایەوە: (ئێمە دەزانین ئەمە کوڕمانە و بەکوێری لەدایك بووە. [21]بەڵام نازانین ئێستا چۆن دەبینێ، هەروەها کێ چاوی چاككردۆتەوە؟ ئەو

خۆی گەورەیەو دەتوانێ وەڵامتان بداتەوە لێی‌بپرسن!) 22دایك‌و باوكی كوڕە لەترسی دەسەڵاتدارانی جوولەكە ئەمەیان ووت، چونكە بڕیاری ئەوەیان دابوو هەركەسێ دانبنێ بەوەی عیسا مەسیحە لەكەنیشت دەری‌بكەن. 23ئیتر لەبەرئەوە بوو ووتیان: (ئەو گەورەیە پرسیار لەخۆی بكەن.)

24دیسان فەریسیەكان ئەو پیاوەی كوێر بوو بانگیان كردو پێیان‌ووت: (ستایشی خودا بكە! ئێمە دەزانین ئەو پیاوە گوناهبارە.) 25كابراش وەڵامی دانەوە: (گەر ئەو گوناهبارە، نازانم! بەڵام یەك شت دەزانم: من كوێر بووم و ئێستا دەبینم!) 26دیسان لێیان پرسیەوە: (چی لێ‌كردیت؟ چۆن چاوی چاك‌كردیتەوە؟) 27ئەویش وەڵامی دانەوە: (من پێم ووتن ئێوە گوێتان لێ‌نەگرتم، ئیتر بۆچی جارێكی‌كە دەتانەوێ بی‌بیستن؟ ئایا ئێوەش دەتانەوێ ببن بەقوتابی ئەو؟) 28ئەوسا فەریسیەكان جنێویان بەكابرا داو پێیان ووت: (تۆ قوتابی ئەویت! بەڵام ئێمە قوتابی موساین. 29ئێمە دەزانین خودا قسەی لەگەڵ موسا كردووە، بەڵام ئەمە نازانین لە كوێوە هاتووە!) 30كابراش وەڵامی دانەوە: (ئەمە شتێكی سەیرە! ئەو چاوی چاك‌كردومەتەوە، كەچی ئێوە دەڵێن ئێمە نازانین ئەو وەچەو بنەچەی كێیە! 31ئێمە دەزانین خودا وەڵامی گوناهباران ناداتەوە، بەڵام گوێ لەوانە دەگرێ كە لێی‌دەترسن‌و بەخواستی ئەو دەكەن. 32تا ئێستا پشتاوپشت نەبیستراوە یەكێك چاوی مرۆڤێكی بەزگماك كوێری چاك‌كردبێتەوە! 33گەر ئەو لەخودا نەبووایە، نەی‌دەتوانی هیچ بكات.) 34ئەوسا هاواریان كرد بەسەری: (تۆ خۆت هەموو گیانت بەگوناه لەدایك بووەو ئێمە فێردەكەیت؟) ئینجا دەریان‌كردە دەرەوەی كەنیشتەكە.

35كاتێ عیسا زانی كابرا دەركراوەتە دەرەوە، چوو بۆ لای و لێی‌پرسی: (ئایا باوەڕ بەڕۆڵەی مرۆڤ دەكەیت؟) 36كابرا لەوەڵامدا ووتی: (گەورەم، ئەو كێیە تا باوەڕی پێ‌بهێنم؟) 37لێرە عیسا پێی ووت: (ئەوەی كە بینیت، هەروەها ئەوەی لەگەڵت دەدوێ، ئەوە خۆیەتی!) 38كابرا ووتی: (گەورەم من باوەڕ دەكەم!) ئەوسا كڕنووشی بۆ برد.

39عیسا ووتی: (هاتووم بۆ ئەم جیهانە بۆ حوكمدان، تا كوێر ببینێ‌و چاوساغ كوێربێ!) 40هەندێ لەفەریسیەكان كە لەگەڵیدا بوون گوێیان لەمەبوو لێیان‌پرسی: (ئایا ئێمەش كوێرین؟) 41عیساش وەڵامی دانەوە: (گەر ئێوە بەڕاستی كوێر بوونایە، گوناهتان لەسەر نەدەبوو. بەڵام ئێوە ئێستا دەڵێن: دەبینین، جا لەبەرئەوە گوناهەكەتان دەمێنێتەوە .

## من شوانێكی دڵسۆزم

# 10

(ڕاستی ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: ئەوەی لەدەرگای پشتیری مێگەلێكەوە ناچێتە ژوورەوە، بەڵكو بەرێگایەكی‌كەدا بۆی سەربكەوێ، ئەوە دزو جەردەیە. 2بەڵام ئەوەی لەدەرگاوە بچێتە ژوورەوە، ئەوە شوانی مێگەلەكەیە، 3دەرگاوانیش دەرگاكەی بۆ دەكاتەوە، مێگەلەكەش گوێ لەدەنگی دەگرن، بانگی مێگەلە

تایبەتیەکەی خۆی دەکات هەر یەکە بەناوی خۆیەوە، ئەوسا دەیانباتە دەرەوە. [4]کاتێ هەموویانی هێنایە دەرەوە، لەپێشیانەوە دەڕواتو ئەوانیش دوای دەکەون، چونکە دەنگی دەناسن. [5]ئەوان شوێنی یەکێکی نامۆ ناکەون، بەڵکو لێی ڕادەکەن، چونکە دەنگی نامۆ ناناسن. [6]عیسا ئەم نموونەیەی بۆ هێنانەوە، بەڵام ئەوان لەمەبەستی قسەکەی تێنەگەیشتن.

[7]جا لەبەرئەوە دیسان ووتی: (ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم: من دەرگای مێگەلەکەم. [8]هەموو ئەوانەی پێش من هاتوون دزو جەردە بوون، بەڵام مێگەلەکە گوێیان لێنەگرتن. [9]من ئەو دەرگایەم، ئەوەی لێم بێتە ژوورەوە ڕزگاری دەبێت، ئەوسا دێتەژوورەوەو دەچێتەدەرەوەو لەوەڕگا دەدۆزێتەوە. [10]دز نایەت، تەنها بۆ دزینو سەربڕینو لەناوبردن نەبێت. بەڵام من هاتووم هەتا ئەوان ژیانیان هەبێ، ژیانێکی تێروتەسەل. [11]من شوانێکی دڵسۆزم، شوانی دڵسۆزیش ژیانی خۆی دەکاتە قوربانی لەپێناوی مێگەلەکەی. [12]بەکرێگیراو وەك شوان نییە، چونکە مێگەلەکە هی خۆی نییە. کاتێ دەبینێ گورگ دێ، مێگەلەکە بەجێدەهێڵێ هەتا خۆی ڕزگارکات، ئەوسا گورگەکە مێگەلەکە دەڕفێنێو پەرشو بڵاویان دەکاتەوە. [13]کابرا هەڵدێ، چونکە بەکرێ گیراوە گوێنادات بەمێگەلەکە! [14]بەڵام من شوانێکی دڵسۆزم، مێگەلەکەم دەناسم، ئەوانیش من دەناسن، [15]هەروەك چۆن باوك من دەناسێ، منیش ئەو دەناسم. جا من ژیانم دەکەم بەقوربانی لەپێناوی مێگەلەکەمدا. [16]هەروەها مەڕیترم هەیە سەر بەم پشتیرە نین، دەبێ ئەوانیش کۆبکەمەوە لای خۆم، ئەوانیش گوێ لەدەنگم دەگرن، ئەوسا یەك مێگەڵو یەك شوان دەبێ.

[17]باوك منی خۆشدەوێ، چونکە ژیانم دەکەم بەقوربانی تا جارێکی کە وەری گرمەوە. [18]کەس لەمنی ناسێنێ، بەڵکو من بەئارەزووی خۆم پێشکەشی دەکەم. من دەسەڵاتی پێشکەشکردنو دەسەڵاتی بردنەوەیم هەیە. ئەمە ڕاسپاردەیەکە لەباوکمەوە وەرمگرتووە.) [19]بەهۆی ئەم قسانە دووبەرەکی لەنێو جوولەکەکان پەیدابوو. [20]زۆربەیان ووتیان: (ڕۆحی پیسی تیادایەو وڕێنە دەکات. ئیتر بۆچی گوێی لێبگرین؟) [21]هەندێکی کەیان ووتیان: (ئەمە قسەی یەکێك نییە کە ڕۆحی پیسی تیادابێ. ئایا ڕۆحی پیس دەتوانێ چاوی کوێران چاكبکاتەوە؟)

## منو باوك یەکین

[22]لەکاتی ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی تازەکردنەوەی پەرستگا لەزستاندا، [23]عیسا لەپەرستگا بەناو هۆڵی سلێماندا دەڕۆیشت. [24]جوولەکەکان لێی کۆبوونەوەو پێیان ووت: (تا کەی بەسەرسوڕماوی دەمانهێڵیتەوە دەربارەی خۆت؟ گەر تۆ بەڕاستی مەسیحیت، بەئاشکرا پێمانبڵێ.) [25]عیسا وەڵامی دانەوە: (من پێمووتن، بەڵام ئێوە باوەڕم پێناکەن. جا هەموو ئەو کارانەی بەناوی باوکمەوە دەیکەم، شایەتی بۆمن دەدەن. [26]بەڵام ئێوە

باوەڕناکەن چونکە مەڕی من نین. 27مەڕەکانم گوێ لەدەنگم دەگرن، منیش دەیانناسمو ئەوانیش دوام دەکەون، 28ژیانی هەتاهەتاییان دەدەمێو هەرگیز لەناوناچن، هیچ کەسیش لەدەستم نایانڕفێنێ. 29ئەو باوکەی بەمنی داوە لەهەموو کەس گەورەترە، کەس ناتوانێ هیچ شتێ لەدەستی باوك بسەنێ. 30منو باوك یەکین!)

31جارێکی کە جوولەکەکان بەردیان هەڵگرت، تا بەردبارانی بکەن. 32عیسا پێی ووتن: (زۆر کاری چاکم لەلایەن باوکمەوە نیشانداون، ئیتر بەهۆی کامیانەوە بەردبارانم دەکەن؟) 33ئەوانیش وەڵامیان دایەوە: (بەردبارانت ناکەین بەهۆی کرداری چاك، بەڵکو بەهۆی کفرەکانتەوە: چونکە خۆت دەکەیت بە خودا، هەرچەندە تۆ مرۆڤی!) 34عیسا پێی ووتن: (ئایا لەشەریعەتەکەتان نەنووسراوە: {من پێم ووتون ئێوە خوداوەندەکانن؟} 35ئەگەر شەریعەتی موسا ئەوانەی ووشەی خودایان بۆ هاتۆتەخوارەوە، ناویان بنێت خوداوەندان (هەرچەندە ناتوانرێ کتێبیش بەدرۆ بخرێتەوە) 36ئیتر چۆن دەڵێن بەوەی کە باوك پیرۆزی کردووەو ناردوویەتی بۆ هەموو جیهان: تۆ کفر دەکەیت، چونکە ووتومە: من ڕۆڵەی خودام؟ 37گەر بێتو من کردارەکانی باوکم نەکەم، باوەڕم پێمەکەن. 38بەڵام گەر ئەوەم کرد، ئەگەرچی باوەڕیش بەمن ناکەن، باوەڕ بەو کردارانە بکەن، تابزانن‌و تێبگەن باوك لەمندایەو منیش لەئەودام.)

39جارێکی کە ویستیان بیگرن، بەڵام خۆی دەربازکرد لەدەستیان، 40ئینجا عیسا چووەوە ئەوبەری ڕووباری ئوردون و لەوێ مایەوە، ئەو شوێنەی کە یەحیا جاران خەڵکی تیایدا لەئاوهەڵدەکێشا. 41ژمارەیەکی زۆر خەڵك هاتنە لایو ووتیان: (یەحیا نیشانەی سەرسوڕهێنەری نەکرد، بەڵام هەموو ئەوەی دەربارەی ئەم پیاوە ووتبووی ڕاستبوو!) 42هەر لەوێ ژمارەیەکی زۆر باوەڕیان پێهێنا.

## مردنی لەعازر

# 11

مرۆڤێك ناوی لەعازر بوو نەخۆش بوو، خەڵکی بەیتعەنیا بوو، ئەو لادێیەی لەگەڵ مریەمو مەرسای خوشکی تیایدا دەژیان. 2ئەم مریەمە ئەوە بوو کە خوداوەندی بەبۆن چەورکردو بەقژی پێیەکانی سڕیەوە، لەعازری نەخۆشیش برای ئەم بوو. 3 هەردوو خوشکەکە ناردیان بەدوای عیسادا تا پێی بڵێن: (گەورەم، ئەوەی خۆشتدەوێ نەخۆشە.) 4 کاتێ عیسا ئەمەی بیست ووتی: (ئەم نەخۆشیە بەمردن کۆتایی نایەت، بەڵکو دەبێتە هۆی شکۆداری خودا، ئەوسا بەهۆی ئەمەوە ڕۆڵەی خودا شکۆدار دەبێ.)

5لەگەڵ ئەوەی عیسا مەرساو خوشکەکەی و لەعازری خۆش دەویست، 6لەو شوێنەی کەلێی بوو دوو ڕۆژ مایەوە هەرچەندە بەنەخۆشیەکەی لەعازریشی زانیبوو. 7دوای ئەوە عیسا بە قوتابیەکانی ووت: (با بگەڕێینەوە بۆ ناوچەی یەهودیە!) 8قوتابیەکان پێیانووت: (مامۆستا، ئایا

دەگەڕێیتەوە بۆ ناوچەی یەهودیە، باشە ماوەیەك لەمەوبەر جوولەکەکان نەیانویست بەردبارانت بکەن؟ [9]عیسا لە وەڵامدا ووتی: (ئایا ڕۆژ دوانزە سەعات نییە؟ ئەوەی بەڕۆژ بڕوات ساتمە ناکات، چونکە ڕووناکی ئەم جیهانە دەبینێ. [10]بەڵام ئەوەی بەشەو بڕوات ساتمە دەکات، چونکە ڕووناکی تیادانییە.) [11]ئینجا عیسا ووتی: (لەعازری خۆشەویستمان خەوتووە، بەڵام من دەڕۆم خەبەری دەکەمەوە.) [12]قوتابیەکان ووتیان: (گەورەم، گەر ئەو نووستوە، ئەوسا بەساغی خەبەری دەبێتەوە.) [13] قوتابیەکانی وایانزانی مەبەستی لەنووستنی ئاساییە، بەڵام عیسا مەبەستی لەمردنی لەعازر بوو . [14]ئەو کاتە عیسا بەئاشکرا پێ‌ووتن: (لەعازر مردووە. [15] بەڵام لەبەر ئێوە من دڵشادم کە لەوێ نەبووم، تا باوەڕ بهێنن. بابرۆین بۆ لای!) [16]ئینجا تۆما کە بە دووانە ناسرابوو لای قوتابیەکانی کە ووتی: (با ئێمەش بڕۆین لەگەڵی تا لەگەڵ ئەودا بمرین!)

## من زیندووبوونەوەو ژیانم

[17]کاتێ عیسا گەیشت، لەعازر چوار ڕۆژ بوو نێژرابوو. [18]بەیتعەنیاش تەنها نزیکەی دوو میل لە قودسەوە دووربوو. [19]ژمارەیەکی زۆر لەجوولەکە هاتبوونە لای مەرساو مریەم تا سەرەخۆشی براکەیان لێبکەن. [20]کاتێ مەرسا زانی عیسا هاتووە، هاتەدەرەوە بۆ چاوپێکەوتنی، مریەمیش لەماڵەوە دانیشتبوو. [21]ئینجا مەرسا بەعیسای ووت: (گەورەم، گەر لێرە بوویتایە، براکەم نەدەمرد. [22] بەڵام دەزانم تەنانەت ئێستاش هەرچی لەخودا داوا بکەیت دەتداتێ.) [23]عیسا لەوەڵامدا ووتی: (براکەت زیندوودەبێتەوە.) [24]مەرسا ووتی: (دەزانم هەڵدەستێتەوە لەهەستانەوەی مردووان لەڕۆژی دوایدا!) [25]عیسا لەوەڵامدا ووتی: (من زیندووبوونەوەو ژیانم. هەر کەسێ باوەڕم پێبهێنێ، ئەگەر مردیش زیندوودەبێتەوە. [26]هەروەها هەر کەسێ زیندوو بێ و باوەڕم پێبهێنێ هەرگیز نامرێ. ئایا باوەڕ بەمە دەکەیت؟) [27]ئەویش وەڵامی دایەوە: (بەڵێ گەورەم. من باوەڕ دەکەم تۆ مەسیحی ڕۆڵەی خودای هاتووی بۆ جیهان!)

## گریانی عیسا

[28]دوای ئەوەی ئەمەی ووت، چوو مریەمی خوشکی بانگبکات، بەدزیەوە پێی ووت: (مامۆستا لێرەیە، بانگتدەکا!) [29]مریەم کە ئەمەی بیست خێرا هەستاو هاتە لای. [30]عیسا جارێ نەگەیشتبووە دێیەکە، بەڵکو هێشتا لەوشوێنە بوو کە تیایا چاوی بەمەرسا کەوتبوو. [31]جوولەکەکانیش، ئەوانەی لەماڵەوە لەگەڵیدا بوونو بۆ دڵنەوایی هاتبوون، کە بینییان ئاوا هەستایە سەرپێو خێرا چووە دەرەوە، شوێنی کەوتن، چونکە وایانزانی دەڕوات تا لەسەر گۆڕەکە بگری. [32] کاتێ مریەم عیسای بینیو گەیشتە ئەو شوێنەی ئەوی لێبوو، کەوت بەسەر پێیداو ووتی: (گەورەم، گەر لێرە بوویتایە، براکەم نەدەمرد!) [33]عیسا کە مریەمو ئەو جوولەکانەی بینی لەگەڵی هاتبوون دەگرین، دڵی پڕ بوو لەپەژارەیەکی زۆر، [34]ئینجا پرسی: (لەکوێ

ناشـتوتانە؟) ئەوانـیش وەڵامیان دایەوە: (گەورەم، وەرە سـەیرکە!) [35]عیسـا گریا. [36]لـەمکاتەدا جوولـەکەکان بـەیەکتریان ووت: (سەیرکە چەندی خۆش دەویست!) [37]هــەندێکیان پرسـیاریان کرد: (ئایا نەیدەتوانی ئەمەی کـە چاوی کوێرانی چاك کردەوە، نەیهێشتایە لەعازر بمرێ؟)

## زیندووبوونەوەی لەعازر

[38]جارێکی‌کە عیسا دڵی پڕبوو لە پەژارە. ئینجا لەگۆڕەکـە نـزیك کەوتـەوە کـە ئەشـکەوتێك بـوو دەرگاکـەی بـەردێکی گەورەی لەسەر بوو. [39]عیسا ووتی: (بەردەکە لابەن!) مەرسا ووتی: (گەورەم ئەمە ڕۆژی چـوارەمینێتی، بۆنی کردووە.) [40]جا عیسا پێی ووت: (پـێم نـەووتی گەر باوەڕت هەبێ شکۆمەندی خـودا دەبـینی؟) [41]ئەوسـا بەردەکـەیان لابردو عیسا سـەیری ئاسمـانی کردو ووتی: (ئەی باوك، سوپاست دەکـەم چـونکە گوێت لێ‌گرتم، [42]من زانیومە کە تۆ هەمیشە گوێم لێ‌دەگری. بەڵام من ئەمەم ووت لەبەر ئـەو خەڵکـەی لــە دەورووپشـتم ڕاوەستاون تا باوەڕ بهێنن تـۆ منـت نـاردووە.) [43]کـاتێ ئەمـەی ووت بەدەنگێکی بەرز بانگی کرد: (لـەعازر وەرە دەرەوە!) [44]ئەوسـا مـردووەکە هاتـەدەرەوە، بـەکفن دەستو قاچـی بەسـترابوو، سەریشـی بەقوماشێك پێچرابوو. لـێرە عیسا بەوانەی دەورووپشتی ووت: (بیکەنەوە با بڕوات.)

## پلانێك بۆ کوشتنی عیسا

[45]ژمارەیەکی زۆر لەجوولـەکەکان لـەوانەی کە هاتـبوون بـۆ دڵـنەوایی مـریەم، کـاتێ ئەمـەیان بینی باوەڕیـان هێـنا بەعیسا. [46]بەڵام هەندێ لـەوان چوونە لای فەریسـیەکان تـا هـەواڵی ئـەوە بـدەن کە عیسا کــردوویەتی. [47]ئیــنجا ســەرۆك کاهیــنەکانو فەریسـیەکان ئەنجومـەنی باڵایان کۆکردەوەو ووتیان: (چـی بکـەین؟ ئەم کابرایە نیشانەی سەرسوڕهێنەری زۆر دەکـات. [48]گـەر بـەم شـێوەیە وازی لـێ‌بهێنین هەموو خەڵکەکە باوەڕی پێ‌دەهێنن، ئیتر ڕۆمانیەکان دێـنو پەرسـتگاکەمان لـەناو دەبـەنو میللـەتەکەمان ڕاپێچ دەکەن!) [49]یەکێ لـەوان کەناوی قەیافا بوو ئەو ساڵە سەرۆك کاهین بوو ووتی: (ئێوە هیچ نازانن! [50]ئێوە تێ‌ناگەن باشتروایە پیاوێك بمرێ و ببێ بەقوربانی گــەل لـەجـیاتی ئــەوەی مــیللـەتەکە هــەمووی لەناوبچـێ.) [51]قـەیافا لەخۆیەوە ئەم قسەیەی نەکرد، بـەڵام چـونکە لــەو سـاڵەدا کاهیـنی بـەرز بـوو، پێشـبینی‌کردبوو* کە عیسا لەپێناوی گەلدا دەمرێ، [52]ئەمـەش تـەنها لەپێـناوی گـەل نا، بەڵکو هەروەها لەپێـناوی کۆکـردنەوەی ڕۆڵــەکانی خـودا کــە پەرشوبڵاوبوونەتەوە تا بیانکات بەیەك. [53]لـەو ڕۆژەوە ئـیتر جوولـەکـەکان بـڕیاریاندا عیسا بکوژن. [54]ئیتر ئەویش بەئاشکرا بەناویاندا نەدەڕۆیشت، بەڵکو چوو بـۆ شـارێك نـاوی ئەفـرایم بـوو، کەوتۆتە شوێنێکی نزیك بیابان، لەوێ لەگەڵ قوتابیەکانی مایەوە. [55]لەو کاتەدا جەژنی تێپەڕبوونی جوولەکە نزیك بووبوەوە، خەڵکێکی زۆر لەلادێکانەوە هاتبوون بۆ قودس تاکو

هەستن بەمەراسیمی خۆپاككردنەوەی پێش جەژن. [56] ئەوان بەدوای عیسادا دەگەڕان، كاتێ لەپەرستگادا كۆبوونەوە پرسییان: (ڕاتان چیە؟ ئایا نایەت بۆ جەژن؟) [57] سەرۆك كاهینەكانو فەریسیەكان فەرمانیان دەركردبوو كەوا هەركەسێك عیسا ببینێ دەبێ خەبەری لێبدات تا بیگرن.

## چەوركردنی عیسا بۆ مردن

# 12

شەش ڕۆژ پێش جەژنی تێپەڕبوون عیسا هات بۆ دێی بەیتعەنیا، ئەوەی عیسا لەعازری تیا زیندووكردەوە لەنێو مردوواندا. [2] لەعازر داوەتی نانخواردنی ئێوارەی سازكرد بۆ عیسا، مەرسای خوشكی دەستیكرد بەخزمەتكردن، لەعازر خۆی یەكێ بوو لەوانەی لەسەر خوان لەگەڵ عیسادا دانیشتبوو. [3] مریەمیش سێیەكی لیترێك بۆنی ناردینی گرانبەهای بێغەشی هێناو هەردوو قاچی عیسای پێ چەوركرد، ئینجا بەقژی هەردوو قاچی سڕیەوە، ئیترماڵەكە هەمووی پڕبوو لەبۆنی خۆش. [4] یەكێ لەقوتابیەكانی كە یەهوزای ئەسخەریوتی بوو، ئەوەی لەدواییدا ناپاكی لەگەڵدا دەكات ووتی: ([5] بۆچی ئەم بۆنە بەسێ سەد دینار* نەفرۆشراو دابەشنەكرا بەسەر هەژاراندا؟) [6] ئەویش ئەمەی نەووت چونكە بەزەیی بەهەژاراندا دەهاتەوە، بەڵكو لەبەرئەوەی دز بوو، ئەو دانرا بوو بەسەر پارەی سندوق بەڵام هەرچیەكی تیا دابنرایە دەیدزی. [7] عیساش وەڵامی دایەوە: (وازی لێبهێنە! ئەو ئەم بۆنەی هەڵگرتبوو بۆ ڕۆژی ناشتنم، [8] چونكە هەژاران هەموو كاتێ لاتانن، بەڵام من هەموو كاتێ لاتان نیم.) [9] كاتێ ژمارەیەكی زۆر لەجوولەكەكان زانییان عیسا لەوێیە، هاتن تەنها بۆ ئەوەنا كە عیسا ببینن، بەڵكو بۆ ئەوەش لەعازر ببینن كە لەنێو مردوواندا زیندووی كردبووەوە. [10] ئەوسا سەرۆك كاهینەكان بڕیاریاندا لەعازریش بكوژن، [11] چونكە ژمارەیەكی زۆر لە جوولەكەكان بەهۆی ئەوەوە دەهاتنو باوەڕیان بەعیسا دەهێنا.

## چوونە ناو قودس وەك پادشا

[12] ڕۆژێ دوایی، ژمارەیەكی زۆر لە خەڵكی كە هاتبوون بۆ جەژن، بیستیان عیسا هاتووە بۆ قودس. [13] لقە دار خورمایان برد لەگەڵ خۆیانو هاتنەدەرەوە بۆ پێشوازیكردنیو هاواریانكرد: (هۆسانا! پیرۆزە ئەوەی بەناوی خوداوەندەوە دێت! ئەو پادشای ئیسرائیلە!) [14] عیسا جاشكێكی بینی، سواری بوو، وەك لەكتێبی پیرۆزدا نووسراوە: [15] {مەترسە ئەی كچی شاری داود، پادشاكەت دێتە لات بە سواری جاش ماكەرێك.} [16] قوتابیەكانی عیسا یەكەمجار ئەمانە تێنەگەیشتن. بەڵام پاش ئەوەی عیسا شكۆداركرا، بیریان كەوتەوە كە لەكتێبی پیرۆزدا ئەمە دەربارەی نووسراوە، ئەوانیش ئەمەیانكرد بوو بۆ ئەو.

[17] ئەو خەڵكەی كە لەگەڵیدا بوون كاتێ لەعازری بانگكرد لەگۆڕداو زیندووی كردەوە لەنێو مردووان، شایەتی ئەمەیان بۆ دەدا. [18] جا لەبەرئەوە خەڵكەكە هاتنەدەرەوە بۆ پێشوازی،

چونکە بیستبوویان کە ئەو نیشانە سەرسوڕهێنەرەی کردووە. [19]فەریسییەکان بەیەکتریان ووت: (دەبینن بێسوودە؟ ئا ئەوەتا هەموو جیهان شوێنی کەوتووە!)

### مردن دەرگایە بۆ ژیان

[20]هەندێ یۆنانی لەگەڵ ئەو خەڵکەبوون کە لەجەژندا هاتبوون بۆ خوداپەرستی، [21]ئەوسا چوونە لای فیلیپۆس کە خەڵکی شاری سەیدای ناوچەی جەلیل بوو، پێیان ووت: (گەورەم، دەمانەوێ عیسا ببینین.) [22]فیلیپۆس ڕۆیشتو ئەمەی بە ئەندەراوس ووت، ئینجا بەیەکەوە ڕۆیشتن هەواڵیاندا بە عیسا.

[23]جا عیسا پێی ووتن: (ئەوەتا کاتی شکۆدارکردنی ڕۆڵەی مرۆڤ نزیك بووەتەوە. [24]ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم: دەنکە گەنم هەروەك خۆی دەمێنێتەوە، گەر نەکەوێتە ناو زەویو نەمرێ، بەڵام کە مرد ئەوکاتە دەنکی زۆری لێبەبەردێ. [25]ئەوەی ژیانی خۆی خۆش بوێ، دەیدۆڕێنێ. ئەوەش کە ڕقی لەژیانی خۆی دەبێتەوە لەم جیهانەدا، دەیهێڵێتەوە بۆ ژیانی هەتاهەتایی. [26]ئەوەی دەیەوێ خزمەتم بکات با شوێنم بکەوێ. جا من لەهەر شوێنێکدابم، خزمەتکاریشم لەوێیە. هەروەها هەرکەسێ خزمەتم بکات باوکم ڕێزی لێدەگرێ.

### عیسا باسی مردنی خۆی دەکات

[27](ئێستا دڵم تەنگە، چی بڵێم؟ ئەی باوك، ڕزگارم بکە لەوکاتە سەختەی چاوەڕێم دەکات؟ نەخێر! لەپێناوی ڕوودانی ئەم کاتە هاتووم. [28]جا ئەی باوك، ناوی خۆت شکۆدارکە!) لەوکاتەدا دەنگێ لەئاسمانەوە وەڵامی دایەوە: (شکۆدارم کردووەو شکۆداریشی دەکەمەوە.) [29]هەندێ لەوانەی لەوێ ئامادەبوون کاتێ گوێیان لەدەنگەکە بوو ووتیان: (ئەمە دەنگی هەورە!) بەڵام هەندێکی کەیان ووتیان: (فریشتە بوو قسەی لەگەڵ کرد.) [30]عیسا لەوەڵامدا ووتی: (ئەم دەنگە لەپێناوی من نەبوو، بەڵکو لەپێناوی ئێوە بوو. [31]ئێستا کاتی حوکمدانە بەسەر ئەم جیهانە! ئێستا سەرۆکی ئەم جیهانە دەکرێتە دەرەوە! [32]کاتێ من لەسەر زەوی بەرزدەکرێمەوە، هەمووان بانگدەکەم بۆ لای خۆم.) [33]عیسا ئەمەی ووت تا دەستنیشانیکات بەچ شێوەیەك دەمرێ. [34]خەڵکەکە پێیانووت: (ئێمە لەشەریعەتدا بیستوومانە مەسیح تاهەتایە بەزیندوویەتی دەمێنێتەوە، ئیتر چۆن تۆ دەڵێی ڕۆڵەی مرۆڤ دەبێ بەرزبکرێتەوە؟ ئەم ڕۆڵەی مرۆڤە کێیە؟) [35]عیسا پێی ووتن: (ڕووناکی کاتێکی کورت لەگەڵتان دەمێنێتەوە. جا بەردەوامبن لەڕۆیشتن تا دونیا ڕووناکەو تاریکیتان بەسەردا نەهاتووە، چونکە ئەوەی بەتاریکیدا دەڕوات نازانێ بۆ کوێ دەڕوات. [36]باوەڕبهێنن بەڕووناکی هەتا ڕووناکیتان لەگەڵدایە، ئەوکاتە دەبنە ڕۆڵەی ڕووناکی.) دوای ئەوەی عیسا ئەمەی ووت، ڕۆیشتو خۆی لێیان شاردەوە. [37]لەگەڵ ئەوەی کە زۆر نیشانەی سەرسوڕهێنەری لەبەردەمیان کرد، باوەڕیان پێنەهێنا، [38]تا ووتەی ئەشعیای پێغەمبەر بێتەدی: { ئەی خوداوەند کێ باوەڕی هێنا بە ووتەکانمان؟

دەستی خوداوەند بۆ کێ دەرکەوت؟} [39]ئەوان نەیانتوانی باوەڕبهێنن، چونکە ئەشعیا دیسان ووتبووی: [40]{چاویانی کوێرو دڵیانی ڕەق‌کردووە، تاکو بەچاویان نەبینن‌و بەدڵیان هەست نەکەن، ئەوسا بگەڕێنەوەو چاکیان بکەمەوە.} [41]ئەشعیا ئەمەی ووت بوو، چونکە شکۆی ئەوی بینی بوو و باسی‌کرد بوو. [42]لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر لەسەرۆکەکان باوەڕیان بە عیسا کرد، بێ‌ئەوەی باوەڕەکەیان دەربخەن، لەترسی ئەوەی فەرمانی دەرکردنیان لەکەنیشتدا بەسەر بدرێ، [43]چونکە ئەوان زیاتر حەزیان لەشکۆی خەڵکی بوو نەك شکۆی خودا.

## ڕووناکی باوەڕ

[44]ئینجا عیسا بەدەنگێکی بەرز ووتی: (ئەوەی باوەڕم پێبهێنێ، باوەڕ بەمن ناهێنێ بەڵکو بەوەی کە ناردوومی، [45]ئەوەش منی بینیوە، ئەوەی بینیوە کە ناردوومی. [46]من وەك ڕووناکی هاتومەتە جیهان، تائەوەی باوەڕم پێبهێنێ لە تاریکیدا نەمێنێتەوە. [47]گەر یەکێ گوێی لەووتەکانم بوو و کاری پێ‌نەکرد، من حوکم نادەم بەسەری، چونکە من نەهاتووم تا حوکم بەسەر جیهاندا بدەم، بەڵکو هاتووم بۆ ڕزگاری جیهان. [48]ئەوەی دانم‌پیانەنی‌و بەووتەکانم ڕازی نەبێ، هەیە کەوا حوکم‌بدا بەسەری، ئەو ووشەیەی کە ووتم ئەو حوکم دەدات بەسەری لەڕۆژی دواییدا، [49]چونکە من هیچ شتێکم لەخۆمەوە نەوتووە، بەڵکو ئەو باوکەی ناردوومی چی ڕاسپاردووم ئەوە دەڵێم. [50]هەروەها من دەزانم ڕاسپاردەی ئەو ژیانی هەتاهەتاییە، جا هەر ووتەیەك من دەیڵێم، بەو شێوەیە دەیڵێم کە باوکم پێی ووتووم.)

## عیسا قاچی قوتابیەکانی دەشوات

# 13

پێش جەژنی تێپەڕبوون، عیسا دەیزانی کاتی هاتووە ئەم جیهانە بەجێبهێڵێ‌و بڕواتە لای باوك، ئەو چۆن ئەوانەی سەر بەئەو بوون لە جیهاندا خۆشی‌دەویستن، ئێستاش بەوپەڕی خۆشەویستییەوە خۆشی‌دەوێن. [2]کاتی نانخواردنی ئێوارە، شەیتان خستیە دڵی یەهوزای کوڕی شەمعونی ئەسخەریوتی کەوا ناپاکی لەگەڵ عیسادا بکات، [3]بەڵام عیسا دەیزانی باوك هەموو شتێکی خستۆتە ژێردەستی، هەروەها ئەو لەخوداوە هاتووەو بۆ خوداش دەگەڕێتەوە، [4]بۆیە لەسەر خوان هەستا، کەواکەی داکەندو خاولییەکی هەڵگرت‌و بەستی بەناو قەدیەوە، [5]ئینجا ئاوی کردە لەگەنێکەوە بۆ شوشتن، دەستی‌کرد بەشوشتنی قاچی قوتابیەکانی‌و بەو خاولییەی بەناو قەدیەوە بەستبووی بۆی سڕینەوە. [6]کاتێ گەیشتە سەر شەمعون پەترۆس، شەمعون پێی ووت: (گەورەم، تۆ قاچی من دەشۆیت؟) [7]عیسا لەوەڵامدا ووتی: (تۆ ئێستا ئەمەی دەی‌کەم تێی‌ناگەی، بەڵام دوایی تێی‌دەگەیت.) [8]پەترۆس پێی ووت: (نەخێر، هەرگیز قاچم ناشۆیت!) عیساش وەڵامی دایەوە: (ئەگەر نەت‌شۆم، لەگەڵ من بەشت

نابێ!) [9]جا شەمعون پەترۆس پێی ووت: (گەورەم، تەنها قاچم نا، بەڵکو دەستو سەریشم!) [10]عیسا ووتی: (ئەوەی خۆی شوشتبێ، بەتەواوی بێگەردە هیچیتری پێویست نییە، تەنها قاچی بشۆرێ، ئێوە بێگەردن، بەڵام هەمووتان نا.) [11]چونکە عیسا دەیزانی کێ لەدواییدا ناپاکی لەگەڵدا دەکات، بۆیە ووتی: (هەمووتان بێگەرد نین.)

[12]دوای ئەوەی عیسا تەواو بوو لەشوشتنی قاچیان، کەواکەی هەڵگرت، سەرلەنوێ لەسەر خوان دانیشتو لێیپرسین: (ئایا تێگەیشتن لەوەی بۆم کردن؟ [13]ئێوە پێمدەڵێن مامۆستاو گەورە، جا ڕاستدەکەن من وام. [14]گەر من گەورەو مامۆستاتان بم، قاچم شوشتن، ئیتر ئێوەش لەسەرتانە قاچی یەکتری بشۆن. [15]من نموونەیەکم پێدان هەتا ئەوەی من بۆتانم کرد ئێوەش بیکەن. [16]ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم: کۆیلە گەورەتر نییە لە گەورەکەی، نێرراو گەورەتر نییە لەوەی ناردوویەتی. [17]گەر هاتوو ئێوە ئەمەتان زانی، خۆزگەتان پێدەخوازری گەر کارتان پێکرد. [18]ئەمە بەهەمووتان ناڵێم، چونکە ئەوانەی هەڵمبژاردون دەیانناسم، بەڵام ئەوەی لەکتێبدایە دەبێ بێتەدی کە دەڵێ: {ئەوەی نانم لەگەڵ دەخوات، ناپاکیم لەگەڵ دەکات!} [19]ئەوەی ڕوودەدات من پێش ڕوودانی پێتان دەڵێم، تاکو کاتێ ڕوویدا باوەڕبهێنن من ئەوم. [20]ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم: هەر کەسێ ئەو کەسەی بوێت کە من بۆی دەنێرم، ئەوە منی دەوێت، ئەوەش منی بوێت، ئەوەی دەوێت کە ناردوومی.)

## ناپاکی یەهوزا

[21]کاتێ عیسا ئەمانەی ووت، لەڕۆحدا دڵتەنگ بوو و بەئاشکرا ووتی: (ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم: یەکێ لەئێوە دەمدات بەدەستەوە!) [22]قوتابیەکانی بەسەرسامیەوە سەیری یەکتریان کردو نەیاندەزانی مەبەستی لەکێیە. [23]یەکێ لەقوتابیەکان کە عیسا خۆشیدەویست لەتەنیشتی پاڵی دابووەوە، [24]شەمعون پەترۆس ئیشارەتی بۆی کرد تا پرسیار لەعیسا بکات مەبەستی لەکێیە. [25]ئەویش شانیدایە سەر سینگی عیساو لێیپرسی: (گەورەم ئەو کەسە کێیە؟) [26]عیسا لەوەڵامدا ووتی: (ئەو کەسەیە پارووە نانەکە دەخەمە ناو قاپەکەو دەیدەمێ.) ئینجا پارووەکەی کردە ناو قاپەکەو دای بە یەهوزای کوڕی شەمعونی ئەسخەریوتی. [27]پاش پارووەکە، شەیتان چووە ناویەوە. ئینجا عیسا پێی ووت: (خێرا بیکە ئەوەی دەتەوێ بیکەیت!) [28]هیچ کەسێ لەوانەی لەسەر خوانەکە لەگەڵیدا بوون، تێنەگەیشتن بۆچی ئەمەی پێووت، [29]بەڵکو هەندێکیان لەو باوەڕەدا بوون کەوا فەرمانی پێدەدا چییان پێویستە لەجەژنا بۆیان بکڕێ، یاخود هەندێ پارە بدات بەهەژاران، چونکە سەرپەرشتیاری سندوق بوو. [30]دوای ئەوەی یەهوزا پارووەکەی خوارد، چووە دەرەوە، کات شەوبوو.

## ڕاسپاردەی تازە

[31]کاتێ یەهوزا چووە دەرەوە، عیسا ووتی: (ئێستا ڕۆڵەی مرۆڤ شکۆدارەو خودا تیایدا

شكۆداركرا. [32]جا ئەگەر خودا لەودا شكۆدارە، بەهەمان شێوە خودا دەیەوێ ئەویش شكۆدار بكات لەخۆیداو هەر ئێستا شكۆداری دەكات. [33] منداڵەكانم، ماوەیەكی كورت لەگەڵتان دەمێنمەوە، ئەوسا داوام دەكەن، بەڵام ئەوەی پێشتر بەجوولەكەكانم ووت ئێستا بە ئێوەشی دەڵێم: ئێوە ناتوانن بێن بۆ ئەو شوێنەی من بۆی دەڕۆم. [34]من ڕاسپاردەیەكی تازەتان پێ‌دەسپێرم: یەكتریتان خۆش بوێ. هەروەك چۆن من خۆشم‌ویستن، ئاوا یەكتریتان خۆش‌بوێ. [35]بەمە هەموو خەڵكی دەزانن كە قوتابی منن، گەر ئێوە یەكتریتان خۆش‌ویست.)

## پێشبینیكردنی لاوازی پەترۆس

[36]ئینجا شەمعون پەترۆس لێی‌پرسی: (گەورەم، بۆ كوێ دەڕۆیت؟) عیساش وەڵامی دایەوە: (ئەو جێیەی بۆی دەڕۆم، ئێستا ناتوانی دوام بكەوی، بەڵام دوایی دوام دەكەوی.) [37]دیسان پەترۆس پرسیاری لێ‌كردەوە: (گەورەم، بۆچی ئێستا ناتوانم دوات‌كەوم؟ من ژیانم لەپێناوی تۆ دادەنێم!) [38]عیسا وەڵامی دایەوە: (ئایا ژیانت لەپێناوی من بەخت دەكەیت؟ ڕاستی ڕاستیت پێ‌دەڵێم: پێش ئەوەی كەڵەشێر بخوێنێ، تۆ سێ‌جار نكۆڵیم لێ‌دەكەی!)

## دڵتەنگ مەبن

# 14

(دڵتەنگ مەبن. ئێوە باوەڕتان بەخودا هەیە، كەواتە باوەڕیش بەمن بكەن. [2]ماڵی باوكم ژووری زۆری لێیە، گەر وانەبووایە ئەوسا پێم دەووتن، من دەڕۆم بۆ ئەوێ تا شوێنتان بۆ ئامادەبكەم. [3]دوای ئەوەی ڕۆیشتم‌و شوێنم بۆ ئامادەكردن، دەگەڕێمەوە لاتان‌و لەگەڵ خۆم دەتانبەم، تاكو ئێوەش لەو شوێنە بن كە منی لێدەبم. [4]ئێوە ڕێگای ئەو شوێنە پێ‌دەزانن كە من بۆی دەچم.)

## من ڕێگاو ڕاستی‌و ژیانم

[5]ئینجا تۆما ووتی: (گەورەم، نازانین تۆ بۆكوێ دەڕۆی، ئیتر چۆن ڕێگەكە بزانین؟) [6]عیسا وەڵامی دایەوە: (من ڕێگاو ڕاستی‌و ژیانم. كەس نایەت بۆ لای باوك بەهۆی منەوە نەبێ. [7] گەر ئێوە من بناسن، ئەوا باوكیشم دەناسن، لەئێستا بەدواوە دەیناسن‌و بینیوتانە.) [8]لێرە فیلیپۆس پێی ووت: (گەورەم، باوكمان نیشان بدە ئیتر بەسمانە!)

[9]عیسا وەڵامی دایەوە: (ماوەیەكی دوورو درێژە من لەگەڵتانم هێشتا هەر نەتناسیوم ئەی فیلیپۆس؟ ئەوەی منی بینیوە باوكی بینیوە، ئیتر چۆن دەڵێی باوكمان نیشانبدە؟ [10]ئایا باوەڕ ناهێنی من لەباوكدام، باوكیش لەمندایە؟ ئەو قسانەی كە دەیڵێم لەخۆمەوە نایلێم، بەڵكو ئەو باوكەی لەمندا نیشتەجێ بووە، ئەو كارەكانی خۆی دەكات. [11] باوەڕم پێ‌بكەن من لەباوكدام‌و باوكیش لەمندایە، ئەگەر نا باوەڕم پێ‌بكەن بەهۆی كارەكان خۆیانەوە.

[12]ڕاستی ڕاستیتان پێ‌دەڵێم: ئەوەی باوەڕ بەمن بكات ئەو كارانە دەكات كە من دەیكەم، بەڵكو لەوانەش

مەزنتر دەکات، چونکە من بۆ لای باوك دەڕۆم. [13]هەرچیەك بەناوی منەوە داوابکەن بۆتانی دەکەم، هەتا باوك لەڕۆڵەدا شکۆداربێ. [14]گەر شتێکتان بەناوی من داواکرد، من بۆتانی دەکەم.)

## بەڵێنی هاتنی ڕۆحی پیرۆز

[15](گەر ئێوە منتان خۆش بوێ بەڕاسپاردەکانم کاردەکەن. [16]ئەوسا لەباوکم داوادەکەم یارمەتیدەرێکی* دیکەتان بداتێو تاهەتایە لەگەڵتان بمێنێتەوە، [17]ئەوەش ڕۆحی ڕاستییە، کەوا جیهان ناتوانێ وەری گرێ چونکە نای‌بینێت‌و نایناسێت، بەلام ئێوە دەیناسن چونکە لەگەڵتان دەمێنێتەوەو لەناوتان دەبێت. [18]بەهەتیوی بەجێتان ناهێڵیم، بەڵکو دەگەڕێمەوە لاتان. [19]پاش ماوەیەکی کەم جیهان نامبینێت، بەلام ئێوە دەمبینن. جاچونکە من زیندووم، ئێوەش هەروەها زیندوودەبنەوە. [20]لەو ڕۆژەدا دەزانن باوك لەمندایە، ئێوەش لەمندان، منیش لە ئێوەدام. [21]ئەوەی ڕاسپاردەکانی منی لایەو کاری‌پێ دەکات، ئەوە منی خۆش‌دەوێت. ئەوەی منی خۆش‌بوێ، باوکم خۆشیدەوێ، منیش خۆشم‌دەوێ‌و خۆمی پێ‌نیشان دەدەم.)

[22]ئینجا یەهوزایەکی‌تر کە یەهوزای ئەسخەریوتی نەبوو، پرسیاری لێ‌کرد: (گەورەم، بۆچی دەتەوێ خۆت بۆ ئێمە دەرخەیت بەلام بۆ جیهان نا؟) [23]عیسا وەلامی دایەوە: (ئەوەی منی خۆش بوێت کار بەووتەکانم دەکات، باوکیشم خۆشی دەوێت، ئێمە بۆ لای ئەو دێین‌و لای ئەو نیشتەجێ دەبین. [24]ئەوەش منی خۆش ناوێ کارناکات بە ووتەکانم. ئەم ووشانەی گوێتان لێ‌دەبێ هی من نییە، بەڵکو هی ئەو باوکەیە کە ناردوومی. [25]من ئەم شتانەم پێ‌ووتن لەکاتێکدا هێشتا لاتانم. [26]بەلام ڕۆحی پیرۆز، ئەو یارمەتیدەرەی باوك بەناوی من دەینێرێ، هەموو شتێکتان فێر دەکات، هەروەها هەموو ئەو شتانەی پێم ووتوون بیرتان دەخاتەوە.

## ئاشتی عیسا

[27](ئاشتیتان بۆ بەجێ‌دەهێڵم. ئاشتی خۆمتان دەدەمێ. بەلام بەو شێوەیە نا کە جیهان دەتان‌داتێ. دڵتەنگ مەبن، هەروەها مەترسن. [28]گوێتان لێ‌بوو من پێم‌ووتن: من لاتان دەڕۆم‌و دواتر دەگەڕێمەوە لاتان. گەر ئێوە منتان خۆش بوێ، دڵشاد دەبن چونکە من دەڕۆم بۆلای باوك، لەبەرئەوەی باوك لەمن مەزنترە. [29]ئەوەتا ئێستا هەواڵی ئەوەم پێ‌دان پێش ڕوودانی، بۆ ئەوەی هەرکاتێ ڕوویدا باوەڕبهێنن. [30]ئیتر لەمەولا زۆر قسەتان لەگەڵ ناکەم، چونکە گەورەی ئەم جیهانە وا دێت‌و هیچ دەسەلاتێکی بەسەر من نییە. [31]بەلام دەبێ جیهان بزانێ من باوکم خۆش دەوێ، هەروەها باوك چۆن ڕای‌سپاردم وا ڕەفتار دەکەم. هەستن! با لێرە بڕۆین!)

## من مێوی ڕاستەقینەم

# 15

(مـن مـێوی ڕاسـتەقینەم، باوکیشـم ڕەزەوانە. [2]هەر لقێ لە مندا بەرنەگرێ ئەو دەیبڕێتەوە. هەر لقێ کە بـەردەدات ئـەو پاکیدەکاتـەوە تـا بەرهـەمی زیاتر بـدات. [3]ئـێوە ئێسـتا بێگەردن بەهۆی ئەو ووتانەی لەگەڵـتان پـێیدوام. [4]جـا لـەمندا بچەسپێنو منیش لـەئێوەدا. چۆن لق لەخۆیەوە ناتوانێ بەرهەم بێنێ، گـەر بـەمـێوەکەوە نەچەسـپێ، ئـێوەش ناتوانن گەر لەمـندا نەچەسپێن. [5]من مێومو ئێوەش لقەکان. کێ لـەمـندا بچەسـپێتو منیش لـەو، ئەو بەرهەمی زۆر دەهێنێـت. چـونکە بـێ مـن ئـێوە ناتوانن هیچ شتێ بکـەن. [6]هـەر کەسێ لەمندا نەچەسپێ فڕێ دەدرێتە دەرەوە وەك لقـێكو ووشـك دەبـێ، ئیـنجا لقـە ووشـکەکان کۆدەکرێنەوەو فڕێ دەدرێنە ناو ئاگرو دەسـووتێن. [7]بەڵام، گەر لەمندا بچەسپێن، هەروەها ووتـەکانم لـەناوتاندا چەسـپا، ئـەوەی دەتانـەوێ داوایبکەن بۆتان دەبێ. [8]بەمە باوکم شکۆدار دەبێ گـەر بـەرهـەمی زۆر بهێنن، بەم شێوەیە ئێوە قوتابی مـنن. [9]هەروەك چۆن باوك منی خۆشویست، منیش ئێوەم خۆشویست، کەواتە لەناو خوشەویستیەکەمدا بچەسـپێن! [10]گـەر بـە ڕاسـپاردەکانی منـتانکـرد، لـەخۆشەویسـتیمدا دەچەسـپێن، هەروەك چۆن من بـــەراســـپاردەکانی بـــاوکم کـــردو لـــەناو خۆشەویسـتیەکەیدا چەسپاوم! [11]ئەم شتانەم پێووتن تـا خۆشـی من تیاتان بچەسپێو خۆشیتان بە تەواوی بێـت. [12]ڕاسـپاردەی من بۆ ئێوە ئەمەیە: یەکتریتان خـۆش بـوێ هـەروەك چـۆن من خۆشمویستن. [13]کـەس خۆشەویسـتی لەمـە مەزنتری نییە: کە ژیانی خۆی بکات بەقوربانی لەجیاتی دۆستەکانی. [14]ئێوە دۆستی منن گەر ڕەفتار بکەن بەوەی ڕامسپاردوون. [15]ئـیتر بەکۆیلـە ناوتان نابەم، چونکە کۆیلە نازانێ گەورەکـەی چـی دەکـات. بـەڵام مـن نـاوی خۆشەویستم لـێنان چـونکە هـەرچیەکم لـە بـاوکم بیسـتبوو پـێم ڕاگـەیاندن. [16]ئـێوە منـتان هەڵـنەبژاردووە، بـەڵکو مـن ئـێوەم هەڵـبژاردووە، دیـاریمکردون تا بڕۆن بەرهەم بهێننو بەرهەمەکەتان بەردەوام بێت، ئەوسا هەرچیەك بەناوی من لەباوك داوابکـەن دەتـانداتێ. [17]کەواتـە ئەم ڕاسپاردەیەتان پێدەدەم: یەکتریتان خۆشبوێ.

## ڕقبوونەوە لەعیساو قوتابیەکانی

[18](گـەر جـیهان ڕقی لێتان بووەوە، ئەوە بزانن پـێش ئێوە ڕقی لەمن بووە. [19]گەر ئێوە سەر بەجیهان بـن، جـیهان ئەوانـەی سـەربەخۆیەتی خۆشیدەوێن، بـەڵام چـونکە ئـێوە سـەر بـەجـیهان نین، بەڵکو من لەناوەڕاسـتی جـیهان هـەڵمبـژاردوون، لەبەرئـەوە جـیهان ڕقـی لێـتانە. [20]ئـەو قسـەیەتان بیربێتەوە کە پـێمووتـن: کۆیلـە مـەزنتر نییە لە گەورەکەی. گەر ئەوانـەی سـەر بە جیهانن منیان چەوساندبێتەوە، ئەوا ئێوەش دەچەوسێننەوە، گەرهاتوو کاریان بەووشەکانم کـرد، ئەوا کار بەووشەکانی ئێوەش دەکەن. [21]بەڵام ئەمـەتان هەموو پێدەکەن لەپێناوی ناوی من، چونکە ئـەوەی مـنی نـاردووە ئـەوان نایناسـن. [22]مـن گەر نەهاتـبوومایەو قسـەم لەگـەڵ نەکـردبوونایە، ئـەوا گوناهـیان نە دەبوو، بەڵام ئێستا هیچ بیانویەکیان نییە

بۆ گوناهەکانیان. [23]ئەوەی ڕقی لەمن بێت، ڕقی لەباوکیشمە. [24]گەر لەنێوانیان ئەو کارانەم نەکردایە کە کەسیتر نەیکردووە، ئەوسا گوناهیان نە دەبوو. بەڵام ئەوان ڕقیان لەمن‌و لە باوکم بووەوە، هەرچەندە ئەو کارانەیان بینی. [25]ئەمەش ڕوویدا تا ئەو وتەیە بێتەدی کە لە شەریعەتەکەیاندا نووسراوە: { بەبێ هۆ ڕقیان لێم بووەوە! } [26]جا کاتێ یارمەتیدەر دێ، ئەوەی من لەلایەن باوکەوە بۆتانی دەنێرم، ئەو ڕۆحە ڕاستییەی کە لەباوکەوە هەڵدەقوڵێ، ئەو شایەتیم بۆ دەدات. [27]ئێوەش هەروەها شایەتیم بۆ دەدەن، چونکە لە سەرەتاوە ئێوە لەگەڵ من بوون.

## کاری ڕۆحی پیرۆز
# 16

(من ئەمەم پێی ووتن، تا نەکەونە هەڵەوە. [2] لەکەنیشتەکان دەردەکرێن، بەڵکو کاتێ دێت ئەوەی دەتانکوژێ وابیردەکاتەوە خزمەتی خودای کردووە. [3]ئەوان ئەمەتان پێدەکەن چونکە نەباوك دەناسن نەمن. [4]جا ئەمەم پێووتن تا کاتی ڕوودانی هات، بیرتان بکەوێتەوە کە ئەمەم لەپێشا پێ ووتوون. لەسەرەتادا ئەمەم پێ نەووتن، چونکە لەگەڵتان بووم.

[5](ئێستا من دەگەڕێمەوە بۆ لای ئەوەی ناردوومی، لەگەڵ ئەوەشدا کەستان نەی پرسی: بۆ کوێ دەچی؟ [6]چونکە ئەمەم پێووتن، دڵگرانی دایگرتن. [7]بەڵام من ڕاستیتان پێدەڵێم: باشتر وایە بۆتان کە بڕۆم، چونکە ئەگەر من نەڕۆم، یارمەتیدەرتان بۆ نایەت. بەڵام گەر بڕۆم بۆتانی دەنێرم. [8]کاتێ ئەو دێ، جیهان سەرزەنشت دەکات لەسەر گوناەو ڕاست‌ودروستی‌و حوکمدان، [9]لەسەر گوناە لەبەرئەوەی باوەڕم پێناهێنن. [10]لەسەر ڕاست‌ودروستی لەبەرئەوەی من دەچمە لای باوك‌و ئیتر نامبینن. [11]لەسەر حوکمدانیش لەبەرئەوەی سەرۆکی ئەم جیهانە حوکمی بەسەر دراوە.

[12](هێشتا شتی زۆرم هەیە پێتانی بڵێم، ئێستا ناتوانن بەرگەی بگرن. [13]بەڵام کاتێ ڕۆحی ڕاستی بۆ لاتان دێ، بەرەو هەموو ڕاستیەکتان دەبات، چونکە لەخۆیەوە هیچ نالێ، بەڵکو ئەوەی گوێی لێدەبێ پێتانی ڕادەگەیێنێ، ئەوەی لە دوایدا ڕوودەدات پێتانی دەڵێ. [14]ئەو شکۆدارم دەکات چونکە هەموو ئەوەی بۆتانی باسدەکات لەمنەوە دەرچووە. [15]هەموو ئەوەی کە هی باوکە، هەروەها هی منە. لەبەرئەوە بوو پێمووتن ئەوەی بۆتانی باس دەکات لەمنەوە دەرچووە. [16]پاش ماوەیەکی کەم نامبینن، بەڵام دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم دەمبینن، چونکە دەگەڕێمەوە لای باوك.)

### خۆشی دوای ناخۆشی

[17]هەندێ لەقوتابیەکان پرسیاریان کرد: (مەبەستی چییە لەم قسەیە: پاش ماوەیەکی کەم نامبینن، دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم دەمبینن، هەروەها: چونکە دەگەڕێمەوە لای باوك؟) [18]دیسان ووتیان: (ئەم کەمە چییە باسی دەکات؟ تێناگەین لەوەی دەیڵێ!) [19]عیسا زانی کەوا حەزدەکەن

پرسیاری لێبکەن، ئینجا پێی ووتن: (پرسیار لە واتای قسەکەم دەکەن: پاش ماوەیەکی کەم نامبینن، دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم دەمبینن.

[20](ڕاستی ڕاستیتان پێدەڵێم: ئێوە دەگرینو شیوەن دەکەن، بەڵام جیهان دڵشاد دەبێ، ئێوە دڵتەنگ دەبن، بەڵام دڵتەنگیەکەتان دەبێ بە خۆشی. [21]ژن دڵتەنگ دەبێ کاتێ کە منداڵبوونی نزیك بووەوە. بەڵام کاتێ منداڵەکەی بوو، ئیتر بیر لەماندووبوونی ناکاتەوە، لەخۆشی ئەوەی مرۆڤێك لەدایكبوو بۆ ئەم جیهانە. [22]ئێوەش ئاوها، ئێستا دڵتەنگ دەبن، بەڵام کاتێ دێمەوە بۆلاتان، دڵتان خۆش دەبێ، ئیتر کەس ئەو خۆشیەتان لێناسێنێتەوە. [23]لەو ڕۆژەدا پرسیاری هیچم لێناکەن. ڕاستی ڕاستیتان پێ دەڵێم: هەر شتێك بەناوی منەوە لەباوك داوا بکەن دەتانداتێ. [24]هەتا ئێستا بەناوی منەوە هیچتان داوا نەکردووە. داوابکەن وەریدەگرن، تا خۆشیەکەتان بە تەواوی بێت.

## من بەسەر جیهاندا زاڵبووم

[25](دەربارەی ئەم شتانە لەقسەکانمدا نموونەم بۆ هێنانەوە، بەڵام کاتێ دێ، باسی باوکتان بۆ بکەم بەئاشکرا و بێ نموونە. [26]لەو ڕۆژەدا بەناوی منەوە داوا لەباوك دەکەن. ئیتر پێتان ناڵێم من داواتان بۆ دەکەم لای باوك. [27]چونکە باوك خۆی خۆشی دەوێن، لەبەرئەوەی ئێوە منتان خۆشویست، هەروەها باوەڕتان بەوە هێنا کە من لە خوداوە دەرچووم. [28] لەباوکەوە دەرچوومو هاتووم بۆ جیهان، ئێستا جیهان بەجێدەهێڵمو دەگەڕێمەوە لای باوك.)

[29]لێرە قوتابیەکانی پێیانووت: (ئێستا بەئاشکرا گفتوگۆمان لەگەڵ دەکەیت بێ نموونە. [30]ئێستا دەزانین تۆ هەموو شتێك دەزانی، پێویست بەوە ناکات کەس پرسیارت لێبکات. لەبەرئەوە باوەڕدەهێنین تۆ لە خوداوە دەرچووی.) [31]عیسا لەوەڵامدا ووتی: (ئایا ئێستا باوەڕدەهێنن؟ [32]کاتێ دێ، ئەوەتا هاتووە، تیایدا لەیەکتری جیادەبنەوە هەر یەکە بۆ ماڵی خۆی، ئینجا بەتەنها بەجێمدەهێڵن. بەڵام من بەتەنها نیم، چونکە باوك لەگەڵمدایە. [33] ئەمانەم هەموو پێووتن تاکو لەمندا ئاشتیتان هەبێ. ئێوە لەجیهاندا تەنگانە دەچێژن. بەڵام وورەتان بەرزبێ، من بەسەر جیهاندا زاڵبووم!)

## نوێژی عیسا بۆ باوەڕداران

# 17

کاتێ ئەم قسانەیکرد، ڕوانیە ئاسمانو ووتی: (ئەی باوك، کاتی ئەوە هاتووە! ڕۆڵەکەت شکۆدار بکەی، تاکو ڕۆڵەکەشت تۆ شکۆدار بکات، [2]ئەوەی تۆ دەسەڵاتت داوەتێ بەسەر هەموو مرۆڤدا، هەتا ئەو ژیانی هەتاهەتایی بدات بە هەموو ئەوانەی تۆ بەوت داوە. [3]ژیانی هەتاهەتایش ئەوەیە کە تۆ بناسن، تەنها خودای ڕاستەقینە، هەروەها عیسای مەسیح کە ناردووتە. [4]من لەسەر زەوی شکۆدارم کردی بەتەواوکردنی ئەو کارەی دابووت پێم. [5]ئەی باوك ئێستا شکۆدارمکە لەلای خۆت، بەو شکۆمەندییەی لای تۆ هەمبوو پێش دروستکردنی جیهان.

[6](ناوی تۆم دەرخست بۆ ئەوانەی لەجیهاندا بەمنتدان، ئەوانە هی تۆ بوون، تۆ بەمنتدان. ئەوانیش گوێڕایەڵی ووتەکانت بوون، [7]ئێستا دەزانن هەرچیەکت بەمن داوە لەتۆوەیە، [8]چونکە من ئەو ووشانەم دانیٚ کە تۆ پێت دابووم، ئەوانیش وەریانگرت، هەروەها بەڕاستی زانییان من لەتۆوە هاتوومو باوەڕیان هێنا کە تۆ منت ناردووە. [9] لەپێناوی ئەوانەدا نوێژت بۆ دەکەم. ئێستا لەپێناوی جیهاندا نوێژ ناکەم، بەڵکو لە پێناوی ئەوانەی بەمنتداون، چونکە ئەوانە هی تۆن. [10]هەرچیەك هی منە، هی تۆیە، هەرچیەکیش هی تۆیە، هی منە، من لەئەواندا شکۆدار بووم. [11]ئەمان لەجیهان دەمێننەوە، بەلاّم من تیایدا نامێنمەوە، چونکە من دەگەڕێمەوە لای تۆ. ئەی باوکی پاکوپیرۆز ئەوانەی داوتە بەمن بەهێزی ناوی خۆت بیانپارێزە، هەتا ببن بە یەك وەك ئێمە یەکین. [12]کاتیٚ لەگەڵیاندا بووم دەمپاراستن بەناوی تۆوە. ئەوانەی بەمنتدابوون ئاگاداریم کردن، کەسیان لەناونەچوون جگە لە ڕۆڵەی لەناوچوو نەبیٚ، تاکو ئەوەی لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە بێتەدی. [13]بەلاّم ئێستا من دەگەڕێمەوە لای تۆ، من باسی ئەمە دەکەم، جاریٚ هێشتا لە جیهاندام، تا دڵشادی من تیایاندا بەتەواوی بێت. [14] من ووشەی تۆم بەواندا، بەلاّم جیهان ڕقی لێیان بووەوە، چونکە ئەوان سەر بە جیهان نەبوون، هەروەك چۆن من سەر بە جیهان نیم. [15]من داوای ئەوە ناکەم تۆ ئەوان لەجیهان بسێنیتەوە، بەڵکو لەشەیتان بیانپارێزە. [16]ئەوان سەر بە جیهان نین هەروەك چۆن من سەر بە جیهان نیم. [17]لەڕاستیدا پیرۆزیانبکە، چونکە ووشەی تۆ ڕاستییە. [18]هەروەك چۆن منت نارد بۆ جیهان، منیش دەیاننێرم بۆ جیهان. [19]جا لەپێناوی ئەواندا من خۆم پیرۆز دەکەم، هەتا ئەوانیش لەڕاستی پیرۆزبن.

[20]تەنها لەپێناوی ئەمان نوێژ ناکەم، بەڵکو لەپێناوی ئەوانەش کە باوەڕم پیٚدەکەن بەهۆی قسەی ئەمانەوە، [21]تا هەموو یەك بن، هەروەك تۆ چۆن لەمندای ئەی باوك منیش لەتۆدام، تا ئەوانیش لەئێمەدا بن، تاکو جیهان باوەڕبهێنیٚ کە تۆ منت ناردووە. [22]من ئەو شکۆمەندیەم داونەتیٚ تۆ داوتە بەمن، تا ببن بەیەك هەروەك چۆن ئێمە یەکین. [23]من لەئەواندامو تۆ لەمندای، تا تەواوبنو ببن بە یەك، هەتا جیهان بزانیٚ تۆ منت ناردووە، هەروەها ئەوانت خۆشویستووە وەك چۆن منت خۆشویست.

[24](ئەی باوك، دەمەویٚ ئەوانەی کە داوتە بە من لەهەر شوێنێکدابم لەگەڵمبن، تا ئەو شکۆمەندیەم ببینن کە داوتە بەمن، چونکە تۆ منت خۆشویستووە پێش دروستبوونی جیهان. [25]ئەی باوکی ڕاستودروست، جیهان ناتناسیٚ، بەلاّم من تۆ دەناسم، ئەوانیش دەزانن کە تۆ منت ناردووە، [26]من ناوی تۆم بەوان ناساند، هەروەها پێیان دەناسێنم، تاکو ئەو خۆشەویستیەیان تیادابیٚ کە تۆ منت پیٚ خۆشویست، هەتا من خۆم لەواندا بم.)

## گرتنی عیسا
# 18

دوای ئەوەی عیسا لەم ووتانەی بووەوە، لەگەڵ قوتابیەکانی کەوتنە ڕێو دۆڵی قەدرونیان بڕی. لەوێدا باخچەیەك هەبوو خۆیو قوتابیەکانی چوون بۆ ئەوێ. [2] بەڵام ئەو یەهوزایەی ناپاکی لەگەڵ کرد، ئەو شوێنەی دەزانی، چونکە عیسا زۆر جار لەگەڵ قوتابیەکانی تیادا کۆدەبووەوە. [3] ئینجا یەهوزا بەرەو ئەوێ چوو، تیپێك سەربازو پاسەوانانی پەرستگای لەگەڵ خۆی برد، ئەوانەی سەرۆك کاهینەکانو فەریسیەکان ناردبوویانن، چراو مەشخەڵو چەکیان هەڵگرتبوو. [4] عیسا دەیزانی چی بەسەر دێ، بەرەو ڕوویان چوو، ووتی: (کێتان دەوێ؟) [5] وەڵامیان دایەوە: (عیسای ناسری). ئەویش پێی ووتن: (من ئەوم). ئەو یەهوزایەی کە ناپاکی لەگەڵ کرد لەگەڵیان وەستا بوو. [6] کاتێ پێی ووتن: (من ئەوم) گەڕانەوە دواوەو کەوتن بە زەویدا! [7] عیسا جارێکی کە لێیپرسینەوە: (کێتان دەوێ؟) ئەوانیش لەوەڵامدا ووتیان: (عیسای ناسری.) [8] ئەویش ووتی: (پێم ووتن: من ئەوم، گەر ئێوە بەدوای مندا دەگەڕێن، با ئەوانەیکە بڕۆن.) [9] ئەمەش بۆ هاتنەدی ئەو قسەیە بوو کە ووتی: (ئەوانەی بەمنتدابوون کەسیان لەناونەچوو!) [10] شەمعون پەترۆس شمشێرێکی پێبوو دەری هێناو لەکۆیلەی سەرۆك کاهینەکانیداو گوێچکەی ڕاستی پێبڕی. ئەو کۆیلەیەش ناوی مەلخس بوو. [11] عیسا بە پەترۆسی ووت: (شمشێرەکەت بگەڕێنەوە کێلانەکەی! ئایا ئەو جامەی باوکم داویەتی پێم نەیخۆمەوە؟)

**لەبەردەم سەرۆکی کاهینەکان**

[12] ئیتر تیپە سەربازەکەو سەرتیپەکەیانو پاسەوانەکانی جولەکە عیسایان گرتو بەستیانەوە. [13] یەکەمجار بردیان بۆ لای حەنانی خەزوری قەیافا کە سەرۆك کاهین بوو لەو ساڵەدا. [14] قەیافاش ئەو پیاوە بوو کە ڕاوێژی بۆ جولەکەکان کردبوو، باشتر وایە پیاوێك بمرێ لەجیاتی هەموو گەل.

**پەترۆس نکۆڵی لەعیسا دەکات**

[15] شەمعون پەترۆس لەگەڵ قوتابیەکەی تر کە سەرۆکی کاهینەکان دەیناسی شوێنی عیسا کەوت. ئەو قوتابیە لەگەڵ عیسا چووە کۆشکی سەرۆك کاهین. [16] بەڵام پەترۆس لەدەرەوە لەلای دەرگاکە ڕاوەستا. ئینجا قوتابیەکەی تر کە سەرۆك کاهینەکان دەیناسی هاتەدەرەوەو قسەی لەگەڵ کچە دەرگاوانەکەدا کردو پەترۆسی هێنایە ژوورەوە. [17] کچە دەرگاوانەکە لە پەترۆسی پرسی: (ئایا تۆ یەکێك لەقوتابیەکانی ئەم کابرایە نیت؟) ئەویش وەڵامی دایەوە: (نەخێر، لەوان نیم.) [18] ئاووهەوا سارد بوو، خزمەتکارانو پاسەوانان ئاگریان کردبووەوەو لەدەوری وەستابوون خۆیان گەرم دەکردەوە، پەترۆسیش لەگەڵیان وەستابوو خۆی گەرم دەکردەوە.

[19] سەرۆکی کاهینەکان پرسیاری لەعیسا کرد دەربارەی قوتابیەکانیو فێرکردنەکەی. [20] عیساش وەڵامی دایەوە: (بە ئاشکرا قسەم بۆ جیهان کرد، لەکەنیشتو پەرستگادا لەو شوێنەی هەموو جولەکەکان لێیکۆدەبونەوە، هەموو کاتێ خەڵکم

فێردەکرد، هیچ شتێکم بەنهێنی نەوتووە. [21] بۆچی پرسیار لە من دەکەیت؟ پرسیار لەوانە بکە کە گوێیان لەقسەکانم بووە، ئەوان دەزانن چیم ووتوە!) [22] کاتێ عیسا ئەمەی ووت یەکێك لەخزمەتکارەکان زللەیەکی لێداو پێیووت: (ئاوها وەڵامی سەرۆکی کاهینان دەدەیتەوە؟) [23] عیسا وەڵامی دایەوە: (گەر قسەی خراپم کردووە بڵێ چیم ووتووە، گەر ڕاستیشم ووتووە، ئیتر بۆچی لێم دەدەیت؟) [24] ئەوسا حەنان بەدەستی بەستراوەوە ناردی بۆ لای قەیافای سەرۆك کاهین. [25] هێشتا شەمعون پەترۆس لەوێ ڕاوەستابوو خۆی گەرم دەکردەوە، لێیان پرسی: (ئایا تۆش لە قوتابیەکانی ئەو نیت؟) ئەویش نکۆڵی لێکردو ووتی: (نەخێر، لەوان نیم.) [26] یەکێك لەخزمەتکارانی سەرۆکی کاهینان زاوای ئەو خزمەتکارە بوو کە پەترۆس گوێی لێکردەوە، ووتی: (ئەی لەباغچەکەدا تۆم لەگەڵ ئەو نەبینی؟) [27] دیسان پەترۆس نکۆڵی لێکرد، ئینجا یەکسەر کەڵەشێر خوێندی!

### عیسا دەدرێتە دەست پیلاتۆس

[28] ئیتر بەیانی زوو عیسایان لەماڵی قەیافاوە برد بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی ڕۆمەکانو ئەوان نەچوونە ئەو کوشکە نەوەك پیس بنو بەهۆی ئەوەوە نەتوانن بەشداری بکەن لەخواردنی جەژنی تێپەڕبوون. [29] ئەوسا پیلاتۆس هاتە دەرەوە بۆ لایانو لێیپرسین: (بەچی ئەم پیاوە تاوانبار دەکەن؟) [30] وەڵامیان دایەوە: (گەر تاوانبار نەبووایە، نەماندەدا بەدەستەوە.) [31] پیلاتۆس ووتی: (ئێوە بیبەن، بەپێی شەریعەتی خۆتان حوکمی بەسەردا بدەن.) ئەوانیش وەڵامیان دایەوە: (مافی ئەوەمان نییە کەس بکوژین.) [32] ئەمەش ڕوویدا تاکو ئەوەی عیسا ووتبووی لەبارەی شێوەی مردنەکەی بێتەدی. [33] ئینجا پیلاتۆس چووە ناو کۆشکەکەیو بانگی عیسای کردو لێیپرسی: (تۆ پادشای جوولەکەی؟) [34] عیسا لە وەڵامدا ووتی: (ئایا تۆ لەخۆتەوە ئەمەم پێدەڵێی، یاخود خەڵکی کە دەربارەی من ئەمەیان پێ ووتوی؟) [35] ئەوسا پیلاتۆس لێیپرسی: (ئایا من جوولەکەم؟ گەلەکەتو سەرۆك کاهینەکان تۆیان داوەتە دەستی من. چیت کردووە؟) [36] عیساش لەوەڵامدا ووتی: (پادشاهێتی من سەر بەم جیهانە نییە. گەر پادشاهێتی من سەر بەم جیهانە بووایە، ئەوسا خزمەتکارەکانم دەجەنگان تا نەدرێمە دەست دەسەڵاتدارانی جوولەکە. بەڵام پادشاهێتی من هی ئێرە نییە.) [37] جا پیلاتۆس لێیپرسی: (کەواتە تۆ پادشای؟) ئەویش وەڵامی دایەوە: (خۆت ووت من پادشام. لەبەر ئەمەش لەدایك بوومو هاتووم بۆ جیهان، تاشایەتی بۆ ڕاستی بدەم، هەر کەسێ لەڕاستی بێ گوێ لە دەنگم دەگرێ.) [38] پیلاتۆس پێی ووت: (ڕاستی چییە؟) دوای ئەوەی ئەمەی ووت دیسان چووە دەرەوە بۆ لای جوولەکەکانو ووتی: (من هیچ خراپەیەکی تیادا نادۆزمەوە! [39] ئێوە لەسەر ئەوە ڕاهاتوون لەجەژنی تێپەڕبووندا گیراوێکتان بۆ ئازاد بکەم. ئایا دەتانەوێ پادشای جوولەکەتان بۆ ئازاد بکەم؟) [40] هەموو هاواریان کردو ووتیان: (ئەمە ئازاد مەکە! بەڵکو باراباس!) هەرچەندە باراباس

دزیش بوو.

## فەرمانی کوشتنی عیسا

## 19

ئیتر پیلاتۆس فەرمانیدا عیسا ببرێت و بەقامچی لێیبدرێت. [2]سەربازەکان تاجێکیان لەدڕك چنیو خستیانە سەر سەری، جلێکی ئەرخەوانییان لەبەرکرد. [3]لێی دەچوونە پێشەوەو پێیان دەووت: (سڵاو! ئەی پادشای جوولەکە!)، زللەیان لێدەدا. [4]جارێکیکە پیلاتۆس هاتەدەرەوە بۆ لای خەڵکەکەو پێی ووتن: (من دەی هێنمە دەرەوە بۆلاتان تا بزانن من هیچ گوناهێکی تیادا نابینم!) [5]عیسا بەتاجی دڕکاویو جلی ئەرخەوانییەوە هاتەدەرەوە، ئینجا پیلاتۆس بەوانی ووت: (ئەوەتا پیاوەکە!) [6]کاتێ سەرۆك کاهینەکانو پاسەوانەکان بینیان، هاواریان کرد: (لەخاچی بدە! لەخاچی بدە!) ئەوسا پیلاتۆس پێیووتن: (ئێوە بیبەنو لەخاچی بدەن، من هیچ گوناهێکی تیادا نابینم!) [7]جوولەکەکان وەڵامیاندایەوە: (شەریعەتمان هەیە. بەپێی شەریعەتی ئێمە دەبێ بمرێ، چونکە خۆی کردووە بە ڕۆڵەی خودا.)

[8]کاتێ پیلاتۆس گوێی لەم قسەیە بوو زیاتر ترسا، [9]چووە ناو کۆشکەکەیو لەعیسای پرسی: (تۆ خەڵکی کوێی؟) بەڵام عیسا هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. [10]پیلاتۆس پێیووت: (بۆ قسەم لەگەڵ ناکەیت؟ ئایا نازانی من دەسەڵاتی ئەوەم هەیە ئازادت بکەم یان لەخاچت بدەم؟) [11]عیسا وەڵامیدایەوە: (تۆ هیچ دەسەڵاتێکت بەسەر منەوە نییە، گەر لە سەرەوە بەتۆیان نەدابێ. جا لەبەرئەوە، ئەوەی منی داوەتە دەست تۆ گوناهێکی گەورەتری هەیە.)

[12]ئیتر لەبەرئەمە پیلاتۆس هەوڵی ئازادکردنی عیسایدا، بەڵام جوولەکەکان هاواریانکرد: (گەر ئەمەت ئازادکرد، ئیتر هاوڕێی قەیسەر نیت. هەر کەسێك خۆی بکات بەپادشا، دوژمنایەتی لەگەڵ قەیسەر دەکات.) [13]کاتێ پیلاتۆس گوێی لەم قسانە بوو، عیسای بردە دەرەوە، ئەوسا لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی دانیشت، لەشوێنێك پێیدەووترێ بەردڕێژکراو بەزمانی عیبریش گەباسا. [14]کاتەکەش نزیکەی دوانزەی نیوەڕۆ بوو، لەو ڕۆژەدا [ڕۆژی هەینی] خۆ ئامادەدەکرا بۆ جەژنی تێپەڕبوون. ئینجا پیلاتۆس بەجوولەکەکانی ووت: (ئا ئەوەتا پادشاکەتان!) [15]ئەوانیش هاواریانکرد: (بیبە! بیبە! لەخاچی بدە!) پیلاتۆس لێیپرسین: (ئایا پادشاکەتان لەخاچ بدەم؟) ئەوسا سەرۆك کاهینەکان وەڵامیان دایەوە: (هیچ پادشایەکمان نییە جگە لە قەیسەر.) [16]ئیتر پیلاتۆس دایە دەستیان تا لەخاچ بدرێ.

### لە خاچدان

ئەوانیش عیسایان بردو ڕۆیشتن. [17]عیساش هاتەدەرەوەو خاچەکەی هەڵگرت بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشت کە ناسرابوو بەشوێنی کاسەی سەر بەزمانی عیبری پێیدەوترێ (گولگۆسە)، [18]لەوێ لەگەڵ

دوو پیاو لەخاچیاندا، هەر یەکە لە لایەکییەوە، عیساش لە ناوەڕاست.

[19]پیلاتۆس لەسەر خاچەکە دروشمێکی هەڵواسی بوو لەسەری نووسرا بوو: (عیسای ناسیری پادشای جولەکە.) [20]جوولەکەیەکی زۆر دروشمەکەیان خوێندەوە، چونکە ئەو شوێنەی عیسای تیادا لەخاچدرابوو لەشار نزیك بوو. دروشمەکەش بەزمانی عیبریو لاتینیو یۆنانی نووسرا بوو. [21]سەرۆك کاهینەکانی جوولەکە بەپیلاتۆسیان ووت: (مەنووسە: (پادشای جوولەکە)، بەڵکو بنووسە: (ئەم پیاوە خۆی دەیووت: من پادشای جوولەکەم.))

[22]پیلاتۆس وەڵامیدایەوە: (ئەوەی نووسیومە، نووسیومە!)

[23]کاتێ سەربازەکان عیسایان لەخاچدا، جلەکانیان بردو کردیان بەچوار بەشەوە، هەر سەربازو بەشێکی برد. هەروەها کراسەکەشیان برد، کە سەرتاپا بەبێ دروون لەیەك پارچە چنرابوو. [24]ئینجا سەربازەکان بەیەکتریان ووت: (پێویست ناکات بیدڕێنین، بەڵکو شێروخەتی لەسەر دەکەین بزانین بەرکێ دەکەوێ.)

ئەمەش ڕوویدا تا ئەوەی لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە بێتەدی: {جلەکانمیان لەنێوان خۆیان بەش کردو شێروخەتیان لەسەر کراسەکەم کرد.} ئەمەش ئەوە بوو کە سەربازەکان کردیان.

[25]لەوێ لەلای خاچەکەی عیسا، دایکی لەگەڵ مریەمی ژنی کلۆپا کە پووری بوو، هەروەها مریەمی مەجدەلی وەستابوون. [26]کاتێ عیسا دایکی بینی، بە تەنیشت ئەو قوتابییەوە وەستاوە کە خۆشیدەویست، بەدایکیووت: (ئەی ئافرەت، ئەمە کوڕتە!) [27]ئینجا بەقوتابییەکەی ووت: (ئەمە دایکتە.) لەوکاتەوە قوتابییەکە بردیە ماڵی خۆی.

## مردنی عیسا

[28]دوای ئەوەی عیسا بینی هەموو شتێ تەواو بوو، ووتی: (تینوومە.) تا ئەوەی لەکتێبی پیرۆز باس کراوە بێتەدی. [29]لەوێ قاپێکی پڕ لەسرکە هەبوو، ئیسفەنجێکیان کرد بەسرکەکەو بەقامیشێك بەرزیانکردەوە بۆ دەمی. [30]کاتێ عیسا دەمی لەسرکەکەدا، ووتی: (تەواوبوو!) ئینجا سەری دانەواندو گیانی سپارد.

[31]جا چونکە ئەو ڕۆژە ڕۆژی خۆئامادەکردن بوو بۆ جەژنی تێپەڕبوون، ڕۆژی پاشتریش شەممەیەکی مەزن بوو، هەروەها تا لاشەکان بە هەڵواسراوەیی لەسەر خاچەکان نەمێننەوە، جوولەکەکان داوایان لەپیلاتۆس کرد قاچی لەخاچدراوەکان بشکێنرێو لاشەکانیان هەڵگیرێ. [32]ئینجا سەربازەکان هاتنو هەردوو قاچی ئەو دوو پیاوەیان شکاند کە لەگەڵ عیسا لەخاچدرابوون. [33]بەڵام کاتێ گەیشتنە سەر عیسا، سەیریانکرد مردووە، ئیتر قاچیان نەشکاند. [34]ئینجا یەکێك لەسەربازەکان ڕمێکی کرد بەلاتەنیشتی، یەکسەر خوێنو ئاوی لێ هاتەدەرەوە. [35]جا ئەوەی ئەمەی بینی خۆی شایەتی دەدا، شایەتیەکەشی ڕاستە، خۆی بەتەواوی دەزانێ کە

ڕاستی دەڵێ، هەتا ئێوەش باوەڕبهێنن. [36]ئەمەش ڕوویدا تا ئەوەی لەکتێب باسکراوە بێتەدی: { ئێسقانێکی لێناشکێ! } [37]هەروەها لەشوێنێکیتر لەکتێب باسکراوە: {سەیری ئەوە دەکەن کە ڕمیان لێداوە. }

## ناشتنی عیسا

[38]پاش ئەوە یوسف ناوێك کە خەڵکی ڕامە بوو داوای لەپیلاتۆس کرد تا ڕێیبدات لاشەکەی عیسا بەرێ، ئەم یوسفەش قوتابی عیسا بوو، بەڵام بە نهێنی چونکە لە دەسەڵاتدارانی جولەکە دەترسا، ئیتر پیلاتۆس ڕێیدا. ئینجا یوسف هاتو لاشەکەی عیسای هەڵگرت. [39]هەروەها نیقۆدیمۆسیش هات ئەوەی کە لە پێشا بەشەو هاتبوو بۆ لای عیسا. لەگەڵ خۆی نزیکەی سی لیتر بۆنی مۆڕی تێکەڵاو بە عودی هێنا. [40]لاشەکەی عیسایان هێناو لەگەڵ بۆن بەکفن پێچایانەوە، بەو شێوەیەی نەریتی جولەکە بوو لە ناشتن. [41]لەو شوێنەی عیسای تیادا لە خاچدرا باخچەیەکی لێبوو، لە باخچەکەشدا گۆڕێکی تازەی لێبوو، لەوەو پێش کەسی تیادا نەنێژرا بوو. [42]هەردووکیان عیسایان لەو گۆڕەدا ناشت چونکە نزیك بوو، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆژە ڕۆژی خۆئامادەکردن بوو لەلای جولەکەکان.

## زیندووبوونەوە

# 20

بەرەبەیانی ڕۆژی یەکشەممە، مریەمی مەجدەلی چووە سەر گۆڕەکەی عیسا، هێشتا تاریك بوو، سەیری کرد بەردەکە لەسەر دەرگای گۆڕەکە لابراوە. [2] ئەویش بەڕاکردن هات بۆ لای شەمعون پەترۆسو قوتابیەکەی تر کە عیسا خۆشیدەویست پێیووتن: (گەورەیان لەگۆڕەکە بردووە، نازانین لەکوێ دایان ناوە!) [3]ئینجا پەترۆسو قوتابیەکەیکە ڕۆیشتن بەرەو گۆڕەکە. [4]هەردووکیان بەیەکەوە ڕایاندەکرد، بەڵام قوتابیەکەیتر پێش پەترۆس کەوتو پێش ئەو گەیشتە سەر گۆڕەکە، [5]دانەویەوە سەیریکرد کفنەکە لەوێ کەوتووە، بەڵام نەچووە ژوورەوە. [6] ئینجا دوای ئەو شەمعون پەترۆس گەیشتە سەر گۆڕەکەو چووە ژوورەوە، ئەویش بینی کفنەکە لەوێ کەوتووە. [7]ئەو دەستەسڕەی بەسەری عیساوە بوو بینی بەتەنها پێچراوەتەوە بەجیا لەشوێنی کفنەکە. [8]لەوکاتەدا قوتابیەکەیکەش هاتە ژوورەوە، ئەوەی یەکەمجار گەیشتە سەر گۆڕەکە، ئەمەی بینیو باوەڕی هێنا. [9]چونکە قوتابیەکان تا ئەوکاتەش تێنەگەیشتبوون ئەوەی کتێبی پیرۆز باسی دەکات، ئەو دەبێ لەنێوان مردوواندا هەستێتەوە. [10]ئیتر دوو قوتابیەکە گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان.

## عیسا بۆ مریەم دەردەکەوێ

[11]بەڵام مریەم هەر لە دەرەوە وەستاو لەسەرگۆڕەکە دەگریا. کاتێ کە دەگریا دانەویەوە بۆ گۆڕەکە، [12]سەیری کرد دوو فریشتە بەجلی سپیەوە، دانیشتوون لەو شوێنەی تەرمەکەی عیسای

لـێدانرابوو، یەکێك لەلای سەریەوە ئەوی‌کە لەلای قاچیەوە. [13]لێیانپرسی: (خوشکە، بۆ دەگری؟) لەوەڵامدا ووتی: (گەورەمیان بردووە، نازانم لەکوێ دایاننـاوە.) [14]ئەمـەی ووتو ئاوڕی‌دایـەوەو سـەیری‌کرد عیسـا وەستاوە، بەڵام مریەم نەیزانی ئەو عیسـایە. [15]عیسـا لێیپرسی: (خوشکە، بۆچی دەگری؟ بەدوای کێدا دەگەڕێی؟) مریەمیش وایزانی باخەوانەکەیە، پێیووت: (گەورەم گەر تۆ بردووتە پێم بڵێ لەکوێ داتناوە تا بیبەمەوە.)

[16]ئینجا عیسا بانگی‌کرد: (مریەم!) ئـەویش ئاوڕی‌دایـەوەو بـە زوبـانی عیـبری هـاواری کـرد: (ڕەبونـی)، بـەواتای مامۆستا. [17]عیساش پێی‌ووت: (مەمگرە! هێشتا نەڕۆیشتووم بۆ لای باوك، بەڵام برۆ بـۆ لای بـراکانمو پێیان بڵـێ: مـن دەچـم بـۆ لای باوکمو باوکتان، خودامو خوداتان!) [18]ئینجا مریەمی مـەجدەلی گەڕایـەوەو هـەواڵی‌دا بـەقوتابیـەکانو پێیووتن: (مـن گـەورەم بـینی!) هەروەها ئەوەی پێ ووتن کە پێی ووتبوو.

## دەرکەوتنی مەسیح بۆ قوتابیەکان

[19]لەئێوارەی ئـەو یەکشەممەیە، کاتێ قوتابیەکان لـەترسی دەسەڵاتدارانی جوولەکە بەیەکەوە بوونو دەرگاکانیان لەسـەر خۆیان داخستبوو، عیسا هات لەناوەڕاستیان وەستاو ووتی: (ئاشتی بۆ ئێوە!) [20]کـاتێ ئەمـەی ووت، دەستیو لاتەنیشتی نیشاندان، قوتابیەکان کاتێ خوداوەندیان بینی دڵشاد بوون. [21]ئینجا عیسا پێیووتن: (ئاشتی بۆ ئێوە! چۆن باوك منی نـاردووە، منیش ئاوا ئێوە دەنێرم.) [22]ئەمەی ووتو فـووی لـێ‌کـردنو پـێی ووتـن: (ڕۆحـی پـیرۆز وەرگـرن. [23]ئـەوەی گونـاهی ببەخشن، بەخشراوە، ئەوەی گوناهی نەبەخشن، ئەوا نەبەخشراوە!)

## دەرکەوتنی مەسیح بۆ تۆما

[24]بەڵام تۆما، یەکێك لەدوانزەکە، کە ناسرابوو بـەدووانـە، لەگـەڵ قوتابیـەکان نەبوو کاتێ عیسا بۆ لایـان هـات. [25]قوتابیـەکانی‌تر پێیان ووت: (ئێمە گـەورەمان بـینی!) ئـەویش لـەوەڵامـدا ووتی: (گەر نیشـانەی بزمارەکان بەدەستیەوە نەبینم، پەنجە نەخەمە شـوێنی بـزمارەکانەوە، دەسـت نـەدەم لەلاتەنیشتی باوەڕناکەم!)

[26]دوای هەشـت ڕۆژ، کـاتێ قوتابیـەکانی دووبـارە لەماڵەوە بوون تۆماشیان لەگەڵ بوو، عیسا هـات بـۆ لایـانو دەرگاکانـیش داخـرابوون، لـە ناوەڕاسـتیان وەستاو ووتی: (ئاشتی بۆ ئێوە!) [27]ئینجا بـە تۆمـای ووت: (پەنجـەت بێـنە بـۆ ئـێرە، سەیری دەسـتمبکە، دەستت بێنەو بیدە لەلاتەنیشتم. بێباوەڕ مەبە بەڵکو باوەڕداربە!) [28]ئەوسا تۆما هاواری کرد: (ئـەی خوداوەنـدو خـودام!) [29]عیسا پێی‌ووت: (ئایا لەبەرئـەوەی منـت بیـنی بـاوەڕت کـرد؟ خۆزگـەدەخوازرێ بەوانـەی باوەڕدەکـەن بێ‌ئەوەی ببینن!)

[30]عیسـا لەبـەردەم قوتابیـەکانی زۆر نیشـانەی سەرسـوڕهێنەری تری‌کـرد کـە لـەم پەرتووکـەدا نەنووسـراوە. [31]بـەڵام ئـەم نیشـانانە نووسـراون تـا

باوەڕبکەن کە عیسا مەسیحە، ڕۆڵەی خودایە، هەتا ئێوە بەهۆی باوەڕهێنانەوە ژیان بەدەستبهێنن بەناوی ئەوەوە.

## دەرکەوتنی عیسا لەسەر دەریاچە

# 21

دوای ئەمە عیسا جارێکی کە بەم شێوەیە خۆی دەرخست بۆ قوتابیەکان لەسەر کەناری دەریاچەی تەبەریە: [2]شەمعون پەترۆس‌و تۆما کە بە دووانە ناسراوە، لەگەڵ نەسانائیل کە خەڵکی قانای ناوچەی جەلیل بوو، هەروەها دوو کوڕەکەی زەبدی‌و دوو قوتابی کە کۆببوونەوە. [3]شەمعون پەترۆس پێی‌ووتن: (من دەڕۆم بۆ ڕاو!) ئەوانیش ووتیان: (ئێمەش لەگەڵت دێین.) ئینجا ڕۆیشتن‌و سواری بەلەم بوون، بەلاَم لەو شەوەدا هیچیان نەگرت.

[4]کاتی بەرەبەیان، عیسا لەسەر دەریاچەکە وەستا، بەلاَم قوتابیەکان نەیانزانی ئەو عیسایە. [5]عیسا لێی‌پرسین: (ها کوڕینە ماسیتان پی‌نییە؟) ئەوانیش وەلاَمیان دایەوە: (نەخێر!) [6]ئەویش پێی‌ووتن: (تۆڕەکانتان هەڵدەن بۆ لای ڕاستی بەلەمەکە، ئەوسا ماسی دەگرن!) ئەوانیش هەڵیاندا ئیتر نەیانتوانی ڕای‌کێشن لەبەر زۆری ئەو ماسییانەی تیایدا بوو!

[7]ئەو قوتابیەی عیسا خۆشی‌دەویست بە پەترۆسی ووت: (ئەوە خوداوەندە!) کاتێ پەترۆس ئەمەی بیست، خۆی داپۆشی بە جلەکانی چونکە ڕووت بوو و خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە. [8]قوتابیەکانی‌تر بەبەلەمەکە هاتن‌و تۆڕە پڕ لەماسیەکەیان ڕادەکێشا، چونکە ئەوەندە دوور نەبوون لەکەناری دەریاچەکە تەنها دووسەد باڵ نەبێ. [9]کاتێ قوتابیەکان گەیشتنە کەناری دەریاچەکە، بینییان وا نان دانراوە، خەڵوز ئامادەکراوەو ماسی خراوەتە سەر. [10]عیسا پێی‌ووتن: (هەندێ لەو ماسییانە بهێنن کە ئێستا ڕاوتان‌کردا!) [11]جا شەمعون پەترۆس چووە ناو بەلەمەکەو تۆڕەکەی ڕاکێشایە سەر ووشکانی، سەدو پەنجاو سێ ماسی گەورەی تیادا بوو، لەگەڵ ئەم ژمارە زۆرەشدا تۆڕەکە نەدڕا بوو. [12]عیسا بە قوتابیەکانی ووت: (وەرن بخۆن.) ئیتر کەس لە قوتابیەکان نەی‌وێرا پرسیاری لێبکات: (تۆ کێیت؟) چونکە دەیانزانی ئەو خوداوەندە. [13]عیسا هاتە پێشەوە نانەکەی هەڵگرت‌و دای‌پێیان، ماسیەکەش بەهەمان شێوە. [14]ئەمە جاری سێهەم بوو عیسا خۆی دەرخات بۆ قوتابیەکانی پاش ئەوەی لەنێو مردووواندا هەستایەوە.

## عیسا لەگەڵ پەترۆس دەدوێ

[15]دوای ئەوەی نانیان خوارد عیسا پرسیاری لەشەمعون پەترۆس‌کردو ووتی: (شەمعونی کوڕی یۆنا، ئایا تۆ منت زیاتر خۆش دەوێ یان ئەوانی‌کە منیان زیاتر خۆش دەوێ؟) ئەویش وەلاَمی‌دایەوە: (بەلێ خوداوەند، تۆ دەزانی من خۆشم دەوێیت!) [16]جا عیسا پێی‌ووت: (بەرخەکانم بلەوەڕێنە.) جارێکی کە لێی‌پرسییەوە: (شەمعونی کوڕی یۆنا، منت خۆش دەوێ؟) وەلاَمی‌دایەوە: (بەلێ خوداوەند، تۆ دەزانی من خۆشم دەوێیت!) ئەویش

پێیووت: (شوانی مەڕەکانم بکە.) [17]بۆ جاری سێهەم لێیپرسیەوە: (ئەی شەمعونی کوڕی یۆنا، ئایا منت خۆشدەوێ؟) ئیتر پەترۆس دڵگران بوو چونکە عیسا بۆ جاری سێهەم لێیپرسی: (ئایا منت خۆش دەوێ) پەترۆس پێیووت: (ئەی خوداوەند، تۆ هەموو شتێ دەزانی. تۆ دەزانی من خۆشمدەوێیت!) دیسان عیسا پێیووت: (مەڕەکانم بلەوەڕێنە. [18]ڕاستی ڕاستیت پێدەڵێم کاتێ کە گەنج بووی پشتوێنەکەت بەناو قەدتەوە دەبەستو بۆ هەرشوێنێك دەتویست دەڕۆیشتی. بەڵام کاتێ پیر دەبیت دەستت درێژدەکەیت، یەکێکی کە پشتوێنەکەت بۆ دەبەستێتو دەتبات بۆ شوێنێك کە ناتەوێ!) [19]عیسا ئەمەی ووت وەك ئاماژەکردنێك بۆ ئەو مردنەی پەترۆس کە خودا شکۆدار دەکات. دوای ئەمە، پێیووت: (دوامکەوە.)

[20] پەترۆس ئاوڕیدایەوە بۆ دواوە، ئەو قوتابیەی بینی کە عیسا خۆشیدەویست شوێنیان کەوتووە، ئەویش ئەو قوتابیە بوو کە شانی بەسینگی عیسا دابوو لەکاتی نانخواردنەکەو پێیووت: (گەورەم، کێیە ئەوەی ناپاکیت لەگەڵ دەکات؟) [21] کاتێ پەترۆس قوتابیەکەی بینی لەعیسای پرسی: (ئەی خوداوەند ئەی ئەمە چی لێدێ؟)

[22]عیسا لە وەڵامدا ووتی: (گەر بمەوێ دەمێنێتەوە هەتا دەگەڕێمەوە، بە تۆ چی؟ تۆ دوامکەوە!) [23]ئیتر هەواڵ لەنێوان برا باوەڕدارەکان بڵاوبووەوە کە ئەو قوتابیە نامرێ. بەڵام عیسا ئەمەی بە پەترۆس نەووت: (کە ئەو نامرێ!) بەڵکو ووتی: (گەر بمەوێ دەمێنێتەوە هەتا دەگەڕێمەوە، بە تۆ چی؟)

[24]ئەو قوتابیە ئەمەیە کە ئەم شتانەی لێرەدا نووسیوە، خۆیشی شایەتی بۆ ئەم شتانە دەدات. ئێمەش دەزانین شایەتیەکەی ڕاستە. [25]زۆر شتی تر هەیە عیسا کردوویەتی، لەو باوەڕەدام گەر یەك لەدوای یەك بنووسرایە، هەموو جیهان جێگای ئەو پەرتووکانەی تیانەدەبووەوە!

# کرداری نێرراوان

*پەرتووکی کرداری نێرراوان تەواوکەری مزگێنییە بەپێی نووسینی لۆقا، باسی قوتابیەکان دەکات چۆن بە رۆحی پیرۆز مزگێنی عیسای مەسیحیان لەقودس و هەموو یەهودیەو سامیرەو تا ئەوپەڕی زەوی بڵاوکردەوە (1: 8). لەم کتێبەدا نووسەر دووپاتی دەکاتەوە کە باوەڕ بە مەسیح هیچ مەترسییەکی سیاسی نییە بۆ ئیمپراتۆریەتی رۆمانی.*

*دەتوانرێ ئەم کتێبە بکرێ بە سێ بەش:*

*1- سەرەتای دەستپێ کردنی باوەڕداران لەقودس دوای بەرزبوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان.*

*2- بڵاوبونەوەی باوەڕ بە مەسیح لەهەموو فەلەستین.*

*3- پەرەسەندنی ئەم باوەڕە لەناوچەکانی دەوروبەری دەریای سپی ناوەڕاست تاشاری رۆما.*

*کتێبی کرداری نێرراوان باسی چەند رووداوێکی گرنگ دەکات لەوانە: چۆنیەتی کارکردنی رۆحی پیرۆز لەناو باوەڕداران، دوای ئەوەی لەرۆژی پەنجاهەمین هاتە ناویان، دواتریش مایەوە بۆ ئەوەی رێنماییان بکات و رابەرەکانی بە هێز بکات. هەروەها چۆنیەتی باوەڕهێنانی پۆڵس و گەشتەکانی بۆ بڵاوکردنەوەی مزگێنی عیسای مەسیح. بەکورتیش ئەم نووسراوە فێرکردن و دەنگوباسی باوەڕدارانە لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی باوەڕ دوای بەرزبوونەوەی عیسا.*

پێشەکی

## 1

بەڕێز ساوفیلۆس، لەپەرتووکی یەکەمدا هەموو کردارەکان و فێرکردنەکانی عیسام بۆت گێڕایەوە، لەسەرەتای پەیامەکەیەوە [2] تا ئەو رۆژەی بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان، دوای ئەوەی راسپاردەکانی پێشکەش کرد بەهۆی رۆحی پیرۆزەوە بەو نێرراوانەی هەڵبژاردن. [3] هەروەها دوای ئازارکێشانی، لەماوەی چل رۆژ خۆی بۆ دەرخستن بەزیندوویی بەچەندەها بەڵگەی چەسپاو و سەبارەت بە پاشایەتی خودا بۆیان دوا. [4] کاتێ لەگەڵیان کۆبووەوە، ووتی: (قودس بەجێمەهێڵن، بەڵکو تیایدا چاوەڕێی بەڵێنی باوکم بکەن،

وەك لــەپێشــا لــەمنــتان گــوێ لێبــوو. [5]یەحیا خــەڵکی لــەئاو هەڵدەکێشــا، بەڵام ئێوە پاش چـــەند ڕۆژێکـــی کـــەم لـــەڕۆحی پـــیرۆز هەڵدەکێشرێن.)

بەرزبوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان

[6]ئەوانــەی لـــەوێدا کۆبـــبوونەوە لێـــیان پرســی: (ئــەی خوداوەنــد، ئایــا لــەم کاتــەدا پاشــایەتی بــۆ ئیســرائیل دادەمەزرێنیــیەوە؟) [7]ئەویش وەڵامیدانەوە: (ئێوە مافی ئەوەتان نییە ئــەو کــاتوساتانە بزانن کە خودا بەدەسەڵاتی خــۆی دەســتنیشــانی کردووە. [8]بەڵام کاتێ ڕۆحـــی پیرۆزتـــان بەســـەردا دەڕژێ هـــێز بەدەســتدەهێــنن، دەبــن بەشــایەت بــۆ مــن لــەقودسو هەموو ناوچەی یەهودیەو سامیرەو تا ئەوپەڕی جیهان.)

[9]ئەمــەی ووتو لــەبەرچاویان بەرزبووەوە بــۆ ئاسمـــان، ئیـــنجا هـــەورێك شـــاردیەوە لەبەرچـاویان. [10]جارێ ئەوان بە سەرسامیەوە ســەیری ئاسمانــیان دەکــرد، دوو پــیاو خۆیان نیشــاندان بەجــلی سپییەوە، [11]پێــیان ووتن: (ئــەی جەلیلــیەکان، بۆچی وەستاون سەیری ئاسمــان دەکــەن؟ ئــەو عیســایەی لــەنێوانــتان بەرزکــرایەوە بــۆ ئاسمــان، بــە هــەمان شــێوە دەگەڕێــتەوە وەك بینیــتان بەرزکــرایەوە بــۆ ئاسمان.)

هەڵبژاردنی یەکێك لەجێی یەهوزا

[12]ئیــنجا نــێرراوان گەڕانــەوە قودس لــەو شــاخەی پــێی دەووتــرێ شــاخی زەیتونو لــە قودسەوە نزیکە بەقەد پێوانەی ڕۆژی شەممە*. [13]کــاتێ گەیشــتن چــوونە ژوورێك لــە نهۆمی ســەرەوەو مانــەوە، ئەوانــیش ئەمانــە بــوون: پەتــرۆسو یۆحەنــناو یــاقوب، ئــەندەراوسو فیلیــپۆسو تۆمــا، بــەرتۆلماوسو مەتتاو یاقوبی کوڕی حەلفی، شەمعونی بەجەرگو یەهوزای بــرای یاقوب. [14]هەموویان بەیەك دڵ بەردەوام بــوون لەســەر نوێژکــردن، هــەندێ ژنیشــیان لەگــەڵ بــوو، هەروەها مریەمی دایکی عیساو براکانیشی.

[15]ڕۆژێکـــیان نـــزیکەی سەدوبیســـت لەبــرایانی بــاوەڕدار کۆبــبوونەوە، پەتــرۆس لــەنێوانیان وەستا، بۆیان دواو ووتی: [16](ئەی بــرایان، دەبووایــە نووســراوی کتێــب ئەوەی ڕۆحــی پــیرۆز بــە زمــانی داود پێغەمــبەرەوە ووتویــەتی دەربــارەی یــەهوزا بێتەدی، ئەوەی بــوو بــە ڕێنیشــاندەر بــۆ ئەوانــەی عیســایان گــرت. [17]ئــەو لــەگــەڵ ئــێمە ژمێردراو بەشی

---

*پێوانەی ڕۆژی شــەممە: ئــەو مەســافەیە کە یەکێکی جوولەکە بۆی هەیە بیبڕێ لەڕۆژی شەممەدا. ئەویش تەنها (1100مەترە). چونکە ڕۆژی شەممە ڕۆژی پشوودانە، ئەمەش تەنها نەریتێکی ئایینیبوو.

هەبوو لەم خزمەتە. [18]ئەو کێڵگەیەکی کڕی بە پارەیەك کە نرخی ناپاکی بوو، بەڵام تیایدا کەوت بەدەمدا، لەناوەڕاستدا شەقبوو هەموو ڕیخۆڵەکانی هاتەدەرەوە. [19]هەموو دانیشتووانی قودس بەمەیان زانی، بۆیە کێڵگەکەیان ناونا حەقل دەمەخ، بەزمانی خۆیان بەواتای کێڵگەی خوێن. [20]چونکە لە پەرتووکی زەبووردا نووسراوە:

{ماڵەکەی دەبێ بە وێرانەو

هیچ کەس تیایدا ناژی.}

هەروەها:

{با یەکێکی تر جێی بگرێتەوە لە ڕابەرایەتی.}

[21]کەواتە لەسەرمانە یەکێ لەو پیاوانە هەڵبژێرین کە کۆدەبوونەوە لەگەڵمان بەدرێژایی ئەو کاتەی خوداوەند عیسا هاتوچۆی لەگەڵمان دەکرد، [22]لەو کاتەی یەحیا لە ئاوی هەڵکێشا تا ئەو ڕۆژەی لێمان بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان، لەگەڵمان شایەتی هەستانەوەی عیسا بووە.)

[23]ئامادەبووان دوو پیاویان هەڵبژارد یەکێکیان یوسف بوو کە ناودەبرا بە بارساباو نازناوی یوستوس بوو، ئەوی‌کەشیان مەتیاس بوو. [24]ئینجا نوێژیان کردو ووتیان: (ئەی ئەو خوداوەندەی بەدڵی هەمووان دەزانی، بۆمان دەرخە لەم دوو پیاوە کامیان هەڵبژێرین، [25]تا بەشداریمان بکات لە خزمەتو نێرراویەتی لەجیاتی یەهوزا، ئەوەی هەڵگەڕاوەو بۆ شوێنی خۆی ڕۆیشت.) [26]ئینجا شێروخەتیان بۆ کرد، مەتیاس شێروخەتی بردەوە، ئەوسا خستیانە سەر یانزە نێرراوەکە.

## 2
### هاتنی رۆحی پیرۆز

کە ڕۆژی پەنجاهەمین* هات، هەموو باوەڕداران لە یەك شوێن کۆبوونەوە، [2]لەپڕێکدا دەنگێك لە ئاسمانەوە پەیدا بوو وەك بایەکی بەهێز، ئەو ماڵەی پڕکرد کە تیایدا دانیشتبوون. [3]ئینجا چەند زمانێك وەك لە ئاگر بێت دەرکەوت بۆیان، دابەش بوو بەسەریانو هەر یەکە زمانێکی لەسەر نیشتەوە. [4]ئەوسا هەموویان پڕبوون لە ڕۆحی پیرۆز، دەستیان‌کرد بە قسەکردن بە زمانی جۆراوجۆر، بەو شێوەیەی ڕۆح پێی بەخشی‌بوون.

[5]لەو کاتەدا ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکە لەخودا ترسەکانی هەموو نەتەوەکانی جیهان لە قودس بوون. [6]کاتێ گوێیان لە دەنگەکە بوو، خەڵکەکە کۆبوونەوە، هەموو سەریان‌سوڕما لەبەرئەوەی هەر یەکەیان گوێیان لێ‌بوو بە زمانی خۆیان دەدوێن. [7]ئینجا حەپەسانو سەرسام بوونو ووتیان: (ئایا هەموو ئەوانەی قسە دەکەن

دانیشتووانی جەلیل نین؟ [8]ئیتر چۆن هەر یەك لەئێمە گوێی لەزمانی ئەو وولاتە دەبێ کە تیایدا لەدایك بووە؟ [9]ئێمە خەڵكی پەرتیاو میدیاو عیلامین، هەندێکیشمان لەدانیشتووانی نێوان دجلەو فوراتین، هەروەها لەناوچەی یەهودیەو کەپدوکیەو پونتسو ئاسیا، [10]یان لەفریجیەو پەمفیلیەو میسرو ناوچەی لیبیای دراوسێی قەیرەوان، هەروەها لەگەڵمان خەڵکی ڕۆماش هەیە بەسەردان هاتوون، لەگەڵ جوولەکەو ئەوانەی بوو بوون بەجوولەکە، [11]هەروەها هەندێ لەکریتیەکانو عەرەب. جا ئەوەتا گوێمان لێیانە بەزمانی خۆمان قسە دەکەن دەربارەی کردارە مەزنەکانی خودا.) [12]خەڵکەکە بەسەرسامیەوە دەستیانکرد بە پرسیارکردن لەیەکتری: (ئەمانە هەمووی چی دەگەیێنی؟) [13]بەلام هەندێکیان بەگاڵتە پێکردنەوە دەیانووت: (ئەوانە سەرخۆشن.)

**یەکەم ووتاری پەترۆس**

[14]جا پەترۆس لەگەڵ یانزە نێرراوەکە ڕاوەستا، بەدەنگێکی بەرز قسەی بۆ ئامادەبووان کردو ووتی:

(ئەی پیاوانی جوولەکەو هەموو دانیشتووانی قودس، گوێبگرن بۆ قسەکانم تا ئەوەی پێتان دەڵێم زانراوبێ لاتان، [15]چونکە ئەوانە سەرخۆش نین وەك بیردەکەنەوە، هێشتا کاژێر نۆی بەیانییە. [16]بەلام ئەمە ئەوەیە کە بەزمانی پێغەمبەر یۆئیلەوە ووتراوە:

[17]{خودا دەفەرمووێ:
لەڕۆژانی کۆتاییدا ڕۆحم دەڕێژم بەسەر هەموو مرۆڤداو
کوڕانو کچانتان بەووشەی خودا دەدوێن،
هەروەها گەنجەکانتان بینین دەبینن‌و
پیرەکانتان خەون دەبینن.
[18]لەو ڕۆژانەدا ڕۆحی خۆم دەڕێژم
بەسەر هەموو دەستو پێوەندەکانم، لەژنو لەپیاو،
جا هەموویان بەووشەی خودا دەدوێن.
[19]لە ئاسمان لە سەروە کاری سەرسوڕهێنەرو
لە زەویش لە خوارەوە نیشانەی سەیر دەکەم:
خوێنو ئاگرو چڕە دووکەڵ
[20]ڕۆژ تاریك دەبێ،
مانگیش وەك خوێنی لیدێت،
پێش ئەوەی ڕۆژی خوداوەند بێ، ئەو ڕۆژە مەزنە بەناوبانگە.
[21]هەر کەسێکیش بەناوی خوداوەند بانگبکات ڕزگاری دەبێ.}

[22]ئەی ڕۆڵەکانی ئیسرائیل، گوێ لەم

قسانە بگرن: عیسای ناسیری پیاوێکە خودا لایەنگیری کردووە بەو نیشانەو کارە سەیرو سەرسوڕهێنەرانەی کە خودا لەسەر دەستی لەنێوانتان کردوویەتی، خۆشتان دەزانن. [23]لەگەڵ ئەوەشدا خودا ڕێگەی‌دا، بەپێی خواستو ڕەزامەندی بڕیار لەسەردراوی خۆی کە لەپێشا دەیزانی، کەوا ئێوە بیگرنو لەخاچی‌بدەنو بیکوژن بەدەستی گوناهباران. [24]بەڵام خودا زیندووی کردەوە لەنێوان مردوانداو لە ئازاری مردن ئازادی‌کرد، لەبەرئەوەی مردن نەیتوانی لەداوی خۆی بیهێڵێتەوە. [25]چونکە داود دەربارەی ئەو دەڵێ:

{هەمیشە خوداوەندم لەبەرچاوە،
ئەو لەلای دەستە ڕاستمەوەیە
نەوەك باوەڕم لاواز بێ.
[26]بۆیە دڵشادمو زارم هاواری خۆشی دەکات،
تەنانەت لەشیشم لەهیوادا نیشتەجێیە،
[27]چونکە تۆ گیانم لەدونیای مردووان بەجێ‌ناهێڵی،
هەروەها ناهێڵی تاقە پیرۆزی خۆت گەندەڵی ببینێت.
[28]ڕێگای ژیانت پێ‌ناساندم،
دڵت پڕکردووم لەشادی بە بینینی ڕوخسارت.}

[29]ئەی برایان، ڕێگام بدەن بەئاشکرا پێتان بڵێم داودی باوکمان مردو نێژرا، هێشتا گۆڕەکەی تا ئەمڕۆ لامانە. [30]بەڵام ئەو پێغەمبەر بوو، دەیزانی خودا سوێندی بۆ خواردووە کە لە بەری پشتی ئەو یەکێك ئەو پەیدا دەبێو لەسەر تەختی ئەو دادەنیشێ، [31]ئەو پێشتر بینیو دەربارەی هەستانەوەی مەسیح ووتی کە گیانی لەناو دونیای مردووان بەجێ نەهێڵرا، هەروەها لەشی گەندەڵی نەبینی. [32]ئەو عیسایەی خودا لەنێو مردووان زیندووی‌کردەوە، ئێمە هەموو بۆ ئەوە شایەتین. [33]ئەو بەرزکرایەوە بۆ لای دەستە ڕاستی خودا، ئەو ڕۆحە پیرۆزەی بەڵێنی پێ‌درا بوو لەباوکەوە وەرگیراو ڕژا بەسەرمان، ئەوەی ئێستا دەی‌بینینو گوێتان لێی‌دەبێت ئەنجامی ئەوەیە. [34]داود بەرزنەکرایەوە بۆ ئاسمان، بەڵام ئەو خۆی دەڵێ:

{خودا بە خوداوەندمی ووت:
لەلای دەستە ڕاستم دانیشە،
[35]هەتا دوژمنەکانت بخەمە ژێر پێتەوە.}

[36]کەواتە باهەموو ڕۆڵەکانی ئیسرائیل بەتەواوی بزانن، ئەو عیسایەی ئێوە لەخاچتان دا، خودا کردی بەمەسیحو بەخوداوەند.)

باوەڕهێنانی سێ هەزار

[37]کـاتێ ئامـادەبووان گوێـیان لـەم قسانە بـوو، کـاری کـردە سـەر دڵـیان، پرسیاریان لەپەترۆس‌و نێرراوەکانی تر کرد: (ئەی برایان ئێســتا ئــێمە چــیبکــەین؟) [38]پەتــرۆس وەڵامیدانـەوە: (تۆبـەبکـەن، بـا هەر یەکەتان بـەناوی عیسای مەسیحەوە لەئاوهەڵبکێشرێ بـۆ لـێخۆشبوونـی گونـاەو بەخشینی ڕۆحی پیرۆزتـان دەسـکەوێ، [39]چونکە ئەم بەڵێنە بۆ خۆتـان‌و منداڵەکانـتانە، هـەروەها بـۆ هەموو ئەوانـەی دوورن، هـەموو ئەوانەی خوداوەند خودامـان بانگیان دەکات.) [40]پەترۆس بەزۆر ووشـــەیتـــر شـــایەتی بـــۆ دان‌و وورەی بەرزکردنەوە، دەیووت: (خۆتان ڕزگار بکەن لـەم نەوە لارو چەوتە.) [41]ئەوانەی قسەکەیان قـبوڵکـرد لەئاوهەڵکێشـران، لـەو ڕۆژەدا نزیکەی سێ هەزار کەس هاتنە پاڵیان.

[42]ئیـت ئەوانـە بـەردەوامبـوون لەسـەر وەرگرتـنی فـێرکردنی نـێرراوان‌و ژیـانی خوشـك‌و بـرایەتی‌و لـەتکـردنی نـان‌و نوێژکـردن. [43]هـەروەها کاتێ کارو نیشانەی سەرسـوڕهێنەری زۆر لەسەر دەستی نێرراوان کــرا، هـــەموو ترســـیان لـێنیشـــت. [44]باوەڕدارەکان هەموو بەیەکەوە یەکیان‌گرتبوو، لـەهـەموو شـتێك کـە هـەیانبـوو بەشداری یەکتریان دەکرد، [45]هەروەها ئەوەی هەیانبوو دەیـانفرۆشـت‌و نـرخەکەیان دابـەش دەکرد بەسـەر ئەوانـەی پێویستیان پێبوو، [46]هەموو ڕۆژێـك بەیەك دڵ بەردەوام لەپەرستگا ئامادە دەبـوون، لـە مـاڵان نانـیان لـەت دەکـرد، هـەروەها بەیەکـەوە نانـیان بـە دڵخۆشـی‌و دڵپاکیـیەوە دەخـوارد، [47]ستایشـی خودایـان دەکـرد، خەڵکەکـە هـەموو بەچاوی ڕێزەوە سـەیریان دەکـردن. هـەموو ڕۆژێکـیش خوداوەنـد ئەوانـەی دەهێـنایە پـاڵ کۆمەڵەی باوەڕداران کە ڕزگاریان دەبوو.

چاکبوونەوەی ئیفلیجێك

3

ڕۆژێکیان کاژێری سێی پاش نیوەڕۆ پەترۆس‌و یۆحەننا لەکاتی نوێژکردن چوونە پەرستگا. [2]لەبـەردەم دەرگـای پەرسـتگادا کە پێیدەوترا دەرگـای جـوان، پـیاوێکی بـەزگماك ئیفلیج دانیشـتبوو، هـەموو ڕۆژێـك هەڵیاندەگرت‌و لـەوێ دایاندەنـا تـا سـواڵ بکـات لەوانـەی دەهاتـنە پەرستگاکەوە. [3]کاتێ کابرا پەترۆس‌و یۆحەنـنای بینی خەریکن بچنە ناو پەرستگا، داوای خێری لـێکردن، [4]ئەوانیش بە ووردی تێـیانڕوانـی، ئیـنجا پەتـرۆس پـێیووت: (سـەیرمان بکـە!) [5]ئـەویش چـاوی تێبڕین‌و چـاوەڕێی دەکـرد شـتێکی بدەنـێ. [6]پەترۆس ووتـی: (نـە زێـڕم پێـیەو نە زیو، بەڵام ئەوەی

هەمە دەتدەمێ، بەناوی عیسای مەسیحی ناسیری هەستەو بڕۆ!) [7]پەترۆس دەستی ڕاستی گرتو هەڵیساند، یەکسەر هێز کەوتە قاچوقولی. [8]ئیتر کابرا هەڵبەزیەوەو دەستی کرد بە ڕۆیشتن، لەگەڵ پەترۆسو یۆحەننا چووە پەرستگا، لەخۆشیان بە ڕۆیشتنەوە هەڵدەبەزیەوەو ستایشی خودای دەکرد. [9]هەموو ئەوانەی لەوێبوون بینییان کابرا بەپێی خۆی دەڕواو ستایشی خودا دەکات. [10]ئیتر خەڵکەکە زانییان کابرا ئەو سواڵکەرە ئیفلیجەیە کەوا کردبووی بە خوو لەبەردەم دەرگای جوانی پەرستگا دادەنیشت، جا هەموو سەریان سوڕما لەوەی بەسەر کابرا هاتووە.

### ووتاری پەترۆس لەپەرستگا

[11]کاتێ کابرای ئیفلیج دەستی گرتبوو بە پەترۆسو یۆحەنناوە، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکەکە بەسەرسامیەوە لێیان کۆبوونەوە لەو شوێنەی کە بە هەیوانی سلێمان ناسراوە. [12]کاتێ پەترۆس ئەمەی بینی پێیووتن: (ئەی پیاوانی ئیسرائیل، بۆچی سەرتان سوڕماوە لەوەی ڕوویداوە؟ بۆچی چاوتان تێبڕیوین، وادەزانن ئێمە بەتوانای خۆمان یاخود بەلەخواترسیمان وامان لەو پیاوە کردووە بڕوا؟ [13]خودای ئیبراهیمو ئیسحاقو یاقوب، خودای باوباپیرانمان، عیسای ڕۆڵەی خۆی شکۆدارکرد، ئەوەی ئێوە داتان بەدەستەوە بۆ مردنو ڕەتتانکردەوە لەبەردەم پیلاتۆس، لەکاتێکدا بڕیاری دابوو ئازادی بکات. [14] ئێوە ئەو پاکوپیرۆزە بێتاوانەتان ڕەتکردەوەو داوای لێبووردنتان بۆ بکوژێك کرد. [15]جا ئێوە سەرۆکی ژیانتان کوشت، بەڵام خودا لەنێو مردووان زیندووی‌کردەوە، ئێمەش شایەتین بۆ ئەمە. [16]هەروەها باوەڕ بە ناوی ئەو، ناوی ئەو هێزو توانای گەڕاندەوە بۆ ئەم کابرایەی ئێوە دەیبینن‌و دەیناسن، ئەو باوەڕەی بەهۆیەوە دێت ئەم تەندروستییەی پێ بەخشی لەبەردەم هەمووتان.

[17](ئەی برایان من دەزانم ئێوەو سەرۆکەکانتان بە نەزانی هەڵسوکەوتتان کرد، [18]بەڵام خودا بەمە ئەوەی هێنایەدی کە لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران ووتبووی، کەوا مەسیحەکەی دەبێ ئازار بچێژێ. [19] کەواتە تۆبە بکەنو بگەڕێنەوە تا گوناهەکانتان بسڕێنەوە، [20]ئینجا خوداوەند دەرگای خۆشیتان لێبکاتەوەو عیسای مەسیحتان بۆ بنێرێتەوە، ئەوەی لەپێشا بۆی دیاری‌کردوون. [21]جا دەبێ مەسیح لەئاسمان بمێنێتەوە تا ئەو کاتەی هەموو شتێك چاك دەبێتەوە، هەروەك چۆن خودا لەکۆنەوە لەسەر زاری پێغەمبەرە پیرۆزەکانی دواوە. [22]

موسـا بەباپیرانی ووت: {خوداوەند خوداتان لــەنــێو براکانــتان پێغەمبەرێکــتان بــۆ هەڵدەسـتێنێ وەك من، هەرچیەکتان پێدەڵێ گوێیلــێبگــرن. [23] بــەڵام ئــەوەی گوێــی لــێناگرێ لەناو گەل ڕیشەکێش دەکرێ.} [24] ئـەو کـاتو سـەردەمە هـەموو پێغەمبەران باسـیان کـردووە، لەسـامۆئیلەوە تا ئەوانەی دوای ئــەو هــاتوون. [25] ئــێوە ڕۆڵــەی پێغەمـبەرانو ئـەو پەیمانـەن کـە خودا لـەگەڵ باوباپیرانتان بەستی، کاتێ بە ئیبراهیمی ووت: {بـە نـەوەی تـۆ هـەموو گەلانی سەر زەوی پـیرۆز دەبن.} [26] لەپێناوی ئێوە خودا ڕۆڵەی خـۆی هەسـتاندو یەکەمجار بۆ ئێوەی نارد، تا پیرۆزتـان بکات بەگەڕانەوەی هەر یەکێکتان لەخراپە.)

## پەترۆسو یۆحەننا لـەئەنجوومەن

## 4

کـاتێ پەتـرۆسو یۆحەنـنا قسـەیان لـەگـەڵ خەڵکەکـە دەکـرد، کاهیـنەکانو سـەرۆکی پاسـەوانی پەرسـتگا هـاتن بـۆ لایـان لـەگـەڵ سـەدوقیەکانو [2] زۆر بـێزار بـبوون، چـونکە بـەهۆی پەیامی عیسا خەڵکەکەیان فێردەکردو هەسـتانەوەی مردووانـیان ڕادەگـەیاند. [3] جـا ئـەوان یۆحەنـناو پەترۆسـیان گـرتو لــە بەندیخانـەیان کـردن تـا بـەیانی چونکە کاتەکە دەمەوئێوارە بوو. [4] بەڵام زۆر لـەوانەی گوێیان لـەقسـەکان بـوو باوەڕیـان هێنا، ژمارەی ئەو پیاوانەش گەیشتە پێنج هەزار کەس.

[5] بۆ بەیانی پێشەوایانو پیرانو مامۆستایانی شـەریعەت لــەقودس کۆبوونــەوە. [6] حـەنانی سەرۆك کاهینو قەیافاو یۆحەنناو ئەسکەندەرو هـەموو ئەوانـەی سەر بەتیرەی سەرۆك کاهین بـوون لـەگەڵـیان بـوون. [7] ئیـنجا پەتـرۆسو یۆحەنـنایان لەناوەڕاسـتیان ڕاگـرتو لێـیان پرسـین: (خەڵکانـێکی وەك ئـێوە بەچ هێزێك یان بەناوی کێ ئەمانە دەکەن؟)

[8] پەتـرۆس پـڕبوو لــەڕۆحـی پـیرۆزو وەڵامیدانەوە: (ئەی پێشەوایانو پیرانی گەل، [9] گـەر ئـێوە ئەمـڕۆ پرسـیارمان لـێدەکـەن دەربـارەی ئـەو چـاکەیەی لـەگـەڵ نەخۆشێك کـردوومانە، بـە چ هۆیەك چاکبووەتەوە، [10] باهـەمووتانو هـەموو گەلـی ئیسرائیل بزانێ، ئـەو بەناوی عیسای مەسیحی ناسیری، ئەوەی ئـێوە لەخاچـتانداو خـوداش لــەناو مردووان زیـندووی کــردەوە، ئــەم ئیفلــیجە بــە تەندروســتیەکی تــەواوەوە وا لـەبەردەمــتان ڕاوەستاوە. [11] ئەم عیسایە

{ئــەو بەردەیــە ئــەی وەســتاکان کــە ڕەتتان کردەوە،

بەڵام هەر ئەم بوو بە بەردی بناغە.}

[12] بــێجگە لەعیســا بــە کەســی کە

ڕزگـاربوون نیـیە، چـونکە جگـە لـەو لەژێر ئـاسمـــان ناوێکـــی کـــە نییە خودا پێشکەشی کردبێ بە مرۆڤ کە بەهۆیەوە ڕزگارمان ببێ.)

[13]ئـەوان سـەریانسـوڕما لەچاونەترسـی پەتـرۆسو یۆحەنـنا، کاتێ زانییان بێزانیاریو شـارەزا نـەبوون، بۆیـە زانیـیان ئـەوان پێشتر لەگـەڵ عیسـا بـوون. [14]هـەروەها کـاتێ ئەو ئیفلـیجەیان بیـنی چـاكبووەتـەوەو بەپـێوە لەگەڵـیان وەسـتاوە، ئیتر هیچیان نەدۆزییەوە بەربەرەکانی پێ بکەن. [15]لێرە فەرمانیان پێدان لـە کۆڕەکـە بچـنە دەرەوە، تـا لەناو خۆیان تەگبیرێك بکەن. [16]جا ووتیان: (چی لەم دوو پـیاوە بکـەین؟ شـتێکی ئاشـکرایە لەبـەردەم دانیشـتووانی هـەموو قـودس ئـەو کـارە سەرسوڕهێنەرەی لەسەر دەستی ئەم دوو پیاوە کـراوەو نـاتوانین نکۆڵی لێبکەین، [17]بەڵام تا ئـەم کـارە زیاتـر لـەناو گـەل بڵاونەبێـتەوە، هەڕەشـەیان لـێدەکـەین هەتا لەمەودوا باسی ئەم ناوە نەکەن لای کەس.)

[18]ئیـنجا ئەوانـیان هێـناو فەرمانیان پێدان ئـیتر بـەناوی عیسا دەم نەکەنەوەو کەس فێر نەکـەن. [19]پەترۆسو یۆحەنناش ووتیان: (ئێوە حوکـمبـدەن، ئەگـەر ڕاسـتە لەبەردەم خودا ملکەچی فەرمانەکانتان بین یان فەرمانی خودا. [20]چـونکە ناتوانین ئەوەی بینیومانەو بیستومانە باسی نەکەین.)

[21]جارێکی کـە ئەنجوومەنەکـە هەڕەشەیان لـێکـردنەوە، بەڵام نەیاندەزانی بەچ ڕێگایەك سـزایان بـدەن، ئـیتر ئازادیانکردن، چونکە هـەموو ستایشی خودایان دەکرد لەبەر ئەوەی ڕوویـدا بـوو، [22]چـونکە ئـەو پـیاوەی بـەم نیشـانەیە چاككرایەوە تەمەنی لەچل ساڵ زیاتر بوو.

نوێژی باوەڕداران

[23]کـاتێ پەتـرۆسو یۆحەنـنا ئازادکـران گەڕانـــەوە بـــۆ لای هاوڕێکانـــیان، ســـەرۆك کاهیـنەکانو پـیران چـیان پێووتـبوون بۆیان گـێڕانەوە، [24]ئەوانـیش کـاتێ گوێـیان لەوان بوو، هەموو بەیەك دڵ دەنگیان بەرزکردەوە بۆ خوداو ووتیان: (خوداوەندی باڵادەست، ئەی دروسـتکەری ئاسمـانو زەویو دەریاو هەموو ئـەو شـتانەی تیایاندایە، [25]ئەی ئەوەی بەهۆی ڕۆحـی پیرۆز لەسەر زمانی داودی باوکمانو خزمەتکاری خۆت ووتت:

{بۆچی میللـەتان وروژاونو

گەلان بیر لـەشتی پووچ دەکەنەوە؟

[26]پادشایانی سەر زەوی خۆیان ڕێکخستووە،

سەرۆکەکانیان کۆبوونەوەو

یەکیانگرت تا بەرهەڵستی خوداوەندو

مەسیحەکەی بکەن.}

[27] چـونکە بەراستی هێرۆدسو پیلاتۆسی

پونتیو ناجوولەکەکانو گەلی ئیسرائیل لەم شارە یەکیانگرت تا بەربەرەکانی عیسای ڕۆڵەی پیرۆزت بکەن، ئەوەی کردت بەمەسیح، [28]هەتا هەموو ئەوەی لەپێشا دەستتو خواستت نەخشەی بۆ کێشابوو ڕوویدات. [29]ئەی خوداوەند، ئێستاش سەیری ئەو هەڕەشانە بکە کە دەیکەن، چاونەترسی ببەخشە بەخزمەتکارەکانت تا بەووشەکانت بدوێن، [30]کاتێ دەستی خۆت درێژدەکەیت بۆ چاکبوونەوەی نەخۆش، تا نیشانەو کاری سەرسوڕهێنەر بەناوی عیسای ڕۆڵەی پیرۆزتەوە بکرێ.)

[31]کاتێ نوێژیان دەکرد ئەو شوێنەی تیایدا کۆبووبوونەوە لەرزیو هەموو پڕ بوون لەڕۆحی پیرۆز، ئینجا بێترس بەووشەی خودا دوان.

ژیانی هاوبەش

[32]کۆمەڵی باوەڕداران یەك دڵو یەك گیان بوون، هیچ کەسێ نەیدەووت ئەو شتەی هەیەتی هی خۆیەتی بەتەنها، بەڵکو لەهەموو شتێك هاوبەشبوون. [33]بەهێزێکی مەزنەوە نێرراوان شایەتی زیندووبوونەوەی عیسای خوداوەندیان دەدا، بەرەکەتێکی گەورە بەسەر هەموویانەوە بوو. [34]کەسی نەبوونیان تیا نەبوو چونکە هەموو ئەوانەی خاوەن کێڵگەو ماڵ بوون دەیانفرۆشتو پارەکەیان [35]دەخستە بەردەم نێرراوانەوە، ئەوانیش دابەشیان دەکرد بەسەر هەر یەکێك بەپێی پێویستی خۆی. [36]یەکێك لەوانە یوسف ناوێك بوو کە نێرراوان بە بەرنابا ناویان دەبرد بەواتای ڕۆڵەی هاندەر، کە لە تیرەی لاوی*و خەڵکی قوبروس بوو. [37]ئەم کابرایە کێڵگەیەکی هەبوو، فرۆشتیو نرخەکەی خستە بەردەم نێرراوان.

حەنانیاو سەفیرە

# 5

بەڵام پیاوێك ناوی حەنانیا بوو، لەگەڵ سەفیرەی ژنی کێڵگەیەکی فرۆشت. [2]هەروەها لەگەڵ ژنەکەی ڕێککەوتو بەشێك لە نرخەکەی شاردەوە، ئەوەی مایەوە هێنایو خستیە بەردەم نێرراوان. [3]بەڵام پەترۆس پێیووت: (ئەی حەنانیا، چۆن شەیتان دڵی پڕ کردیت تا درۆ لەگەڵ ڕۆحی پیرۆز بکەیتو بەشێك لە نرخی کێڵگەکەت بشاریتەوە؟ [4]ئایا نەتدەتوانی کێڵگەکە بۆ خۆت دانێیو نەیفرۆشی کاتێ کە هی خۆت بوو؟ پاش فرۆشتنی ئایا مافی ئەوەت نەبوو نرخەکەی هەڵگریت؟ ئیتر بۆچی لەدڵی خۆتدا ویستت ناپاکی بکەیت؟ تۆ درۆت لەگەڵ خەڵك نەکرد، بەڵکو لەگەڵ خودا.) [5]

کـاتێ حەنانـیا گوێی لەم قسەیە بوو کەوتو مـرد. هـەموو ئەوانـەی بەمەیان زانی ترسێکی زۆریـان لـێنیشـت. [6]ئەوسـا هـەندێ گەنج هەسـتان حەنانـیەیان کفن کرد، هەڵیان گرتو ناشتیان.

[7]پاشـان نـزیکەی دوای سـێ کاژێـر ژنەکـەی حەنانیا هـاتو بەوەی نەدەزانی کە ڕووی دابـوو، [8]پەترۆس لێی پرسی: (پێم بڵێ، ئایا بـەم نرخە کێڵگەکەتان فرۆشت؟) ژنەش لـە وەڵامـدا ووتـی: (بەڵێ، بەو نرخە.) [9]جا پەتـرۆس پێی ووت: (بۆچی لەگەڵ مێردەکەت ڕێککـەوتی تا ڕۆحی خوداوەند تاقی بکەنەوە؟ ئـا ئـەوەتا ئـەو گەنجانـەی مێردەکەیان ناشتی گەیشـتنە بەردەرگا، تۆش هەڵدەگرن.) [10]ژنە دەسـتبەجێ لەبەرپێی پەترۆس کەوتو مرد. کـاتێ گەنجـەکان هاتـنەژوورەوەو بینیـیان مـردووە، تەرمەکـەیان هەڵگرتو لەتەنیشت مـێردەکەی ناشـتیان. [11]ئـیتر ترسـێکی زۆر گـەورە باڵی کێشـا بەسـەر هـەموو کۆمـەڵی بـاوەڕداران، هـەروەها هـەر کەسـێ ئـەو هەواڵەی دەبیست.

### زۆربوونی باوەڕداران

[12]لەسـەر دەسـتی نێرراوان زۆر نیشانەو کـاری سەرسـوڕهێنەر لەنـێو گـەل ئەنجامدرا. هـەموویان بەیـەك دڵ لـە هـەیوانی سـلێمان لەپەرسـتگا کۆدەبوونـەوە. [13]خـەڵکی تـر نەیاندەوێـرا تـێکەڵاویان بن، بەڵام زۆر ڕێزیان دەگـرتن و [14]باوەڕدارانـیش زیاتـردەبوونو دەهاتـنە پـاڵ خوداوەنـد، بـە کۆمەڵ لەپیاو و لـەژن، [15]تـا وای لـێهات نەخۆشـەکانیان هەڵدەگـرتە دەرەوە بـۆ سـەر شـەقامەکانو لەسـەر جـێگاو چوارپایە دایاندەنان، تا ئەگەر پەتـرۆس هات، تەنانەت سێبەرەکەشی بکەوێتە سـەر یەکێکـیان. [16]خەڵکـێکی زۆر لـەشارو دەوروپشتی قودسەوە دەهاتن، نەخۆشەکانیانو ئەوانـەیان هەڵگرتـبوو کـە بەدەسـت ڕۆحـی پیسـەکان دەیـانناڵاند، ئیتر هەموویان چاك دەبوونەوە.

[17]بـەڵام سەرۆك کاهینو هەموو ئەوانەی لەگـەڵی بوون کە سەربە ڕێبازی سەدوقیەکان بـوون، حەسـوودییان پـێ بـردن. [18] نێرراوەکانـیان گـرتو خسـتیاننە بەندیخانەی گشـتی. [19]بـەڵام فریشـتەیەکی خوداوەنـد لەشـەودا دەرگـای بەندیخانەکـەی کـردەوەو ئـازادی کردنو پێی ووتن: [20](بڕۆن لەپەرستگا ڕاوەسـتن، تـەواوی پـەیامی ئـەم ژیانـە نوێـیە بەخـەڵکی بڵـێن.) [21]ئەوانیش کە گوێیان لەم قسـانەبوو، بـەیانی زوو چـوون بـۆ پەرستگاو دەسـتیان کـرد بە فێرکردن. ئینجا ئەنجوومەنی بـاڵا کۆبـووەوە، بـە ئامـادەبوونی سـەرۆك کـاهینو هـەموو ئەوانـەی لەگـەڵی بـوون،

هەروەها پیرانی ئیسرائیل بەشوێن نێرراوانیان نارد لەبەندیخانە تا بیانهێنن، [22]بەلاَم یاریدەدەرەکان چوونە بەندیخانەو نەیان دۆزینەوە، ئیتر ئەوانیش گەرانەوەو هەواڵیان دانیو [23]ووتیان: (دەرگای بەندیخانەکەمان بینی بە باشی داخرابوو، پاسەوانەکان لەبەردەمی وەستابوون، بەلاَم کاتێ کردمانەوە کەسمان تیادا نەدی.)

[24]کاتێ سەرۆکی پاسەوانی پەرستگاو سەرۆك کاهینەکان ئەمەیان بیست سەریان سوڕما لەوەی کۆتایی ئەمە چۆن دەبێ. [25] ئینجا پیاوێك هاتە ناو کۆڕەکەو ووتی: (ئەو پیاوانەی خستبووتانە ناو بەندیخانە، ئێستا لەپەرستگا وەستاونو خەڵکی فێر دەکەن.)
[26]ئەوسا سەرۆك پاسەوانەکانو یاریدەدەرەکان ڕۆیشتن نێرراوانیان بێتوندوتیژی هێنا، چونکە لەگەل دەترسان بەردبارانیان بکەن. [27]کاتێ ڕایانگرتن لەبەردەم ئەنجوومەنەکەدا، سەرۆك کاهین لێیانی پرسیو [28]ووتی: (ئایا بە توندی فەرمانمان پێ نەدان بەم ناوە خەڵکی فێر نەکەن، بەلاَم ئێوە هەموو قودستان پڕکرد لە فێرکردنەکانتان، دەتانەوێ خوێنی ئەم پیاوە بخەنە ئەستۆمان.)

[29]پەترۆسو نێرراوان وەلاَمیاندایەوە: (ئێمە پێویستە زیاتر ملکەچی خودا بین نەك خەڵك! [30] خودای باوباپیرانمان عیسای هەستاندەوە، ئەوەی ئێوە کوشتتان بە لەسەر دار هەڵواسینی. [31]خودا ئەمی بەرزیکردەوە بۆلای دەستە ڕاستی خۆی، کردی بە سەرۆكو ڕزگارکەر هەتا تۆبەکردنو لێخۆش بوونی گوناە بە ئیسرائیل ببەخشێ.
[32]جا ئێمە شایەتی ئەمانەین، هەروەها ڕۆحی پیرۆزیش ئەوەی خودا بەخشیویەتی بەوانەی ملکەچن بۆی.)

[33]کاتێ گوێیان لەم قسانە بوو زۆر تووڕەبوون، تەگبیریان کرد بیانکوژن. [34] بەلاَم یەکێ لەئەندامانی ئەنجوومەنەکە ناوی گەمالائیل بوو، مامۆستای شەریعەتو فەریسیبوو، هەموو گەل ڕێزی لێدەگرت، هەستاو فەرمانیدا نێرراوان بۆ ماوەیەك ببرێنەدەرەوە. [35]ئینجا بەئەنجوومەنەکەی ووت: (ئەی پیاوانی ئیسرائیل ئاگاداربن لەوەی دەتانەوی بیکەن بەم پیاوانە. [36] ماوەیەکی کورت لەمەوبەر سوداس ناوێك هەستاو خۆی بەشتێك دادەنا، نزیکەی چوارسەد پیاو دوایکەوتن، بەلاَم کوژراو ئەوانەی دوای کەوتبوون بلاَوبوونەوە، ئیتر ناوی نەما. [37]ئینجا لەکاتی ناونووسینەکەدا یەهوزای جەلیلی هەستاو ژمارەیەکی زۆر لەخەڵك ڕوویان تێکردو شوێنی کەوتن، بەلاَم ئەویش لەناوچوو هەروەها ئەوانەی

شـوێنی کەوتـبوون بڵاوبوونـەوە. [38]جا ئێستا مـن ئامۆژگاریـتان دەکەم، دووربکەونەوە لەم پیاوانەو وازیان لـێبهێنن، گەر ئەم بیروباوەڕو کـارە لـەلای خەڵکـەوە بێـت، مسـۆگەر لەناودەچـێ، [39]ئەگـەر لـەلای خوداوەش بێ نـاتوانن لـەناوی ببەن، ئەگینا خۆتان دەبیننەوە دژی خودا دەجەنگن.)

[40]ئـیتر بەقسـەیان کـرد، نێرراوانـیان بـانگ‌کردو قامچیان لـێدانو فەرمانیان پێدان لەمـەولا باسـی نـاوی عیسـا نەکـەن، دوایی ئازادیان‌کردن.

[41]بـەڵام نێرراوان بەدڵشادیەوە لە بەردەم ئەنجوومەنەکـە هاتنەدەرەوە، چونکە وا دانران شـایانی ئـەوە بـن لەپێـناوی نـاوی ئـەو سـووکایەتییان پێبکـرێ. [42]جـا ئەوانـیش بێووچـان هـەموو ڕۆژێـك لـەپەرسـتگاو لە مـاڵان، خەڵکـیان فێردەکردو مزگێنیان دەدا کە عیسا مەسیحە.

## هەڵبژاردنی حەوت خزمەتکار
# 6

کاتێ لەو ڕۆژانەدا ژمارەی قوتابیەکان زیادی دەکرد، جوولەکە یۆنانیەکان گلەییان هەبوو لـە عیـبرانیەکان، کە بێوەژنەکانیان پشتگوێ دەخـران لـە خـزمەتی ڕۆژانـە. [2]بۆیە دوانزە نێرراوەکە هەموو قوتابیانیان بانگ‌کردو پێیان ووتن: (نابێ ئێمە واز لەووشەی خودا بهێنین و بەئازووقـە دابەشـکردن خەریك بین. [3]ئەی برایان لەنێو خۆتان حەوت پیاو هەڵبژێرن کە ناوبانگـیان بـاش بێتو پڕبن لەڕۆحی پیرۆزو لـەدانایی، هەتا هەستن بەجێبەجێ‌کردنی ئەم ئەرکـە. [4]بەڵام ئێمە خۆمان تەرخاندەکەین بۆ نوێژکردنو خزمەت‌کردنی ووشەی خودا.)

[5]خەڵکەکە هەموو ئەم پێشنیارەیان بەدڵ بوو، یەکـەمجار ئیستفانۆسـیان هەڵـبژارد، ئـەویش پیاوێکی پڕ لەباوەڕو ڕۆحی پیرۆز بوو، ئینجا فیلـیپۆسو پـروخۆرسو نـیکانۆرو تـیمۆنو پەرمیـــناسو نیقولاوســـی ئەنـــتاکی کـــە ناجوولەکـەبوو بـبوو بەجوولەکـە. [6]ئەوانـە هێـنرانە پـێش نـێرراوانو ئەوانـیش دەستیان خستە سەر سەریانو نوێژیان بۆ کردن. [7]ئیتر ووشـەی خـودا زیاتـر بڵاوبووەوە، هەروەها ژمـارەی قوتابـیان لـە قـودس زۆر زیاد بوو، کۆمەڵـێکی گـەورەش لـە کاهیـنەکان گوێڕایەڵی باوەڕ بوون.

## گرتنی ئیستفانۆس

[8]ئیستفانۆسـیش پـڕ لە بەرەکەتو هێزی خـودا، کـاری سەرسـوڕهێنەرو نیشـانەی گـەورەی لەنـێو گـەل دەکـرد. [9]جا هەندێك لەوانـەی لـەو کەنیشـتەن کـە پێی دەووترێ کەنیشـتی ئازادکـراوەکان، قەیرەوانیـیەکانو

ئەسکەندەریەکانو ئەوانەی لە کلیکیاو ئاسیان، هەستانو شەڕە قسەیان لەگەڵ ئیستفانۆس کرد. [10] بەڵام نەیانتوانی بەربەرەکانی ئەو داناییەو ئەو ڕۆحە بکەن کە تیایدا دەدوا. [11] بۆیە بەدزییەوە چەند کەسێکیان هاندا تا بڵێن: (گوێمان لەئیستفانۆس بوو کفری سەبارەت بە موساو خودا دەکرد.) [12] ئینجا گەلو پیرانو مامۆستایانی شەریعەتیان جۆشدا، ئەوسا کەوتنەسەریو گرتیانو هێنایانە لای ئەنجوومەنی باڵای جولەکە، [13] شایەتی درۆیان بەسەرەوە دروستکردو دەیان ووت: (ئەم کابرایە دژی ئەم شوێنە پیرۆزەو شەریعەت هەمیشە قسە دەکاتو وازناهێنێ. [14] چونکە گوێمان لێبوو دەیووت عیسای ناسیری ئەم پەرستگایە دەروخێنێو ئەو خووڕەوشتانەی لەموسا وەرمانگرتووە دەیگۆڕێ.) [15] جا هەموو ئەوانەی لە ئەنجوومەنەکە دانیشتبوون سەرنجیاندایێ، بنیان دەموچاوی وەك دەموچاوی فریشتە وایە.

## ووتاری ئیستفانۆس

## 7

جا سەرۆك کاهین لەئیستفانۆسی پرسی: (ئایا ئەم تاوانانە ڕاستە؟) [2] ئەویش لەوەڵامدا ووتی: (ئەی برایانو باوکان گوێ بگرن، خودای شکۆدار بۆ ئیبراهیمی باوکمان دەرکەوت کاتێ لەخاکی نێوان دجلەو فورات بوو، پێش ئەوەی بڕوا لەحاران نیشتەجێ بێ، [3] {پێیووت: خاكو کەسوکارت بەجێبهێڵەو بڕۆ بۆ ئەو خاکەی پێشانت دەدەم.} [4] ئەوسا ئەویش خاکی کلدانیەکانی بەجێهێشتو لەحاران نیشتەجێ بوو. کاتێ باوکی مرد، خودا هێنای بۆ ئەم خاکەی ئێوە ئێستا تیایدا نشتەجێن. [5] لەگەڵ ئەوەش خودا هیچ میراتێکی نەدایە، تەنانەت شوێن پێیەك زەویشی نەدایە. هەرچەندە ئەو کاتە بێ منداڵ بوو، بەڵام خودا بەڵێنی پێدا {ئەم خاکە بدا بەخۆیو بە نەوەکانی دوای خۆی. } [6] جا خودا بەم شێوەیە قسەی کرد:{نەوەکانی تۆ بۆ ماوەی چوارسەد ساڵ نامۆ دەبن لەخاکێکی بێگانە، لەو ماوەیەدا دەبن بە کۆیلەو هەڵسوکەوتی خراپیان لەگەڵ دەکرێ، [7] بەڵام ئەو گەلە تاوانبار دەکەم کە دەیانکەن بە کۆیلە.} هەروەها خودا دەڵێ: {دوای ئەمە دێنەدەرەوەو لەم شوێنە دەمپەرستن.} [8] ئینجا خودا پەیمانی خەتەنەکردنی* لەگەڵ ئیبراهیم بەست. ئەوەبوو ئیبراهیم ئیسحاقی کوڕی خەتەنەکرد کە تەمەنی بوو بە هەشت ڕۆژ، ئیسحاقیش یاقوبی کوڕی، یاقوبیش هەردوانزە باوکانی یەکەمان. [9] باوکانیش لەبەرئەوەی چاویان بەیوسف هەڵ

نەدەهات، فرۆشتیان بە میسر. بەلاٚم خودا هەر لەگەڵیٚبوو، [10]ڕزگاری‌کرد لە هەموو ئەو ناخۆشییانەی بەسەری هات، هەروەها داناییو بەرەکەتی خۆی پێدا لەبەردەم فیرعەونی پادشای میسر. ئەویش کردی بە لێپرسراوی میسرو سەرپەرشتی‌کەری هەموو کاروباری ماڵی خۆی.

[11]دوای ئەمە برسێتیو تەنگانەیەکی گەورە لەمیسرو کەنعان ڕوویدا، باوکانمان هیچ خواردنیان نەبوو. [12]بەلاٚم کاتیٚ یاقوب بیستی لەمیسر گەنم هەیە باوکانمانی یەکەمجار بۆ ئەویٚ نارد. [13]کە بۆ جاری دووەم ڕۆیشتنەوە یوسف خۆی پیٚناساندن، ئەوسا بنەماڵەی یوسف بۆ فیرعەون دەرکەوت. [14]ئیتر یوسف ناردیو یاقوبی باوکی لەگەڵ هەموو کەس‌وکارەکەی بۆ میسر بانگ‌کرد کە حەفتاو پێنج کەس بوون. [15]بەو شێوەیە یاقوبو باوکانمان دابەزین بۆ میسر، لەویٚ مانەوە تا مردن. [16]پاشان بردیانن بۆ ناوچەی شەکیم، لەویٚ لەو گۆڕستانە نێژران ئەوەی ئیبراهیم بە هەندیٚ زیو لە شەکیم لە کوڕەکانی حەموری کڕی.

[17]بەلاٚم کە کاتی هاتنەدی ئەو بەڵێنەی خودا بەئیبراهیمی دابوو نزیك بووەوە، گەل لە میسر پەرەیان‌دەسەندو ژمارەیان زیادی دەکرد. [18]ئینجا {پادشایەکی تازە بۆ میسر دانرا یوسفی نەدەناسی.} [19]بەفرِوفێڵ دەجولاٚیەوە لەگەڵ ڕەگەزەکەمان، لەگەڵ باوکانمان بەخراپە هەڵسوکەوتی دەکرد، بەزۆر وای لێکردن واز لە منداڵە ساواکانیان بهێنن هەتا بمرن.

[20]لەو کاتەدا موسا لەدایك‌بوو. لەبەرچاوی خودا پەسەند بوو، سیٚ مانگ لەماڵی باوکی بەخێوکرا، [21]بەلاٚم کاتیٚ وازیان لیٚی هیٚنا، ئەوەبوو کچەکەی فیرعەون هەڵی‌گرتەوەو کردی بەکوڕی خۆیو بەخێوی‌کرد. [22]ئینجا موسا هەموو زانیاریەکانی میسری خوێند، تا بەتوانا بوو لە قسەو لەکردار.

[23]کاتیٚ تەمەنی بوو بە چل ساڵ، بەخەیاڵیدا هات سەردانی برا ئیسرائیلیەکانی بکات، [24]یەکێکیانی بینی لەلایەن میسرییەکەوە دەست درێژی لیٚدەکریٚ، ئەوسا ئەویش بەرگری لەزۆرلێکراو کردو کابرای میسری کوشت. [25]بەهیوای ئەوەی براکانی هەست بکەن کەوا خودا لەسەر دەستی ئەو ڕزگاریان دەکات. بەلاٚم ئەوان هەستیان پیٚنەکرد. [26]بۆ بەیانی دووان لە وانی بینی شەڕ دەکەن، ئەویش هەوڵیدا ئاشتیان بکاتەوەو ووتی: ئێوە بران، بۆچی دەست بۆ یەکتری درێژ دەکەن؟ [27]بەلاٚم ئەوەی کە زۆری لەوی تر دەکرد، پاڵێکی پێوەناو

ووتی: {کێ تۆی کردووە بەگەورەو دادوەر بەسەرمان؟ [28]ئایا دەتەوێ بمکوژی وەك چۆن دوێنێ کابرای میسریت کوشت؟} [29]ئەوسا موسا لەمیسرەوە ڕایکرد بۆ وولاتی مەدیان، بە نامۆیی تیایدا ژیاو هەر لەوێ دوو کوڕی بوو.

[30]پاش چل ساڵ لەبیابانی شاخی سینا* فریشتەیەك دەرکەوت بۆ موسا لەنێو دەوەنێکی داگیرساو. [31]ئەم دیمەنە بووە هۆی سەرسامی موسا، کاتێ لێی‌نزیك بووەوە بۆ سەیرکردنی، گوێی لەدەنگی خوداوەند بوو بانگی‌کرد: {[32]من خودای باوباپیرانتم، خودای ئیبراهیم‌و ئیسحاق‌و یاقوب!} موسا کەوتە ترس‌ولەرزو ئیتر نەیوێرا جارێکی دیکە سەیری بکاتەوە. {[33]جا خوداوەند پێی‌ووت: پێلاوەکانت داکەنە، چونکە ئەو شوێنەی لەسەری وەستاوی زەویەکی پیرۆزە. [34] بەڕاستی ئەو زۆرداریەی لەمیسر بەگەلەکەم دەکرا بینیم، هەروەها گوێم لەناڵەیان بوو، هاتمەخوارەوە تا بیانهێنمە دەرەوە. ئێستا وەرە دەتنێرم بۆ میسر.}

[35]ئەو موسایەی کەوا گەلەکەی ڕەتیانکردەوەو پێیان ووت: {کێ تۆی کردووە بەگەورەو دادوەر بەسەرمان؟} هەر ئەو بوو خودا ناردی وەك سەرۆكو ڕزگارکەر بەهۆی ئەو فریشتەیەی لەدەوەنەکەدا بۆی دەرکەوت. [36]ئەم بوو لە میسر دەری‌هێنان، پاش ئەوەی نیشانەوکاری سەرسوڕهێنەری ئەنجامدا لە خاکی میسرو لە دەریای سوورو لە بیابان بۆ ماوەی چل ساڵ.

[37]ئەمە ئەو موسایەیە کە بە نەوەی ئیسرائیلی ووت: {خودا لەنێو برایانتان پێغەمبەرێکی وەکو منتان بۆ هەڵدەستێنی.} [38] هەر ئەویش لەناو کۆمەڵەکە لە بیابان بوو لەگەڵ ئەو فریشتەیەی گفتوگۆی لەگەڵی دەکرد لەسەر چیای سینا، هەروەها لەگەڵ باوکانمان، هەر ئەویش بوو ووشەی زیندووی وەرگرت تا بیدا بە ئێمە. [39]بەڵام باوکانمان نەیانویست ملکەچی موسابن‌و ئەویان بەلاوەنا، دڵیان هەر بۆ میسر دەگەڕایەوە، [40] بە هارونیان ووت: {چەند خودایێکمان بۆ دروستبکە تا لە پێشمانەوە بڕۆن، چونکە ئەو موسایەی ئێمەی لە وولاتی میسر هێنایەدەرەوە نازانین چی بەسەرهاتووە.} [41]جا لەو ڕۆژانەدا بتێکیان لە شێوەی گۆلك دروستکردو قوربانیان پێشکەش‌کرد، دڵشاد بوون بەدەستکردی دەستیان. [42]بەڵام خودا ڕووی لێ‌وەرگێڕان‌و وازی لێ‌هێنان ئەستێرەکانی ئاسمان بپەرستن، هەروەك لە پەرتووکی پێغەمبەران باسکراوە:

{ئەی نەوەی ئیسرائیل، ئایا لە بیابان بەدرێژایی چل ساڵ

هیچ قوربانیەکتان بۆ کردم؟
[43]نەخێر، بەڵکو چادری بتی ملوکتان هەڵگرت
لەگەڵ ئەستێرەی خودای خۆتان، ڕێفان،
ئەو دوو پەیکەرەی دروستتانکرد تا کڕنوشی بۆ بەرن.
جا لەبەرئەوە بۆ دوورتریش لە بابل دەتانێرم.
}
[44](باوکانمان لەبیابان چادری شایەتییان پێبوو، ئەوەی موسا دروستی کردبوو، جا خودا موسای ڕاسپارد چادرەکە هەڵبدات بەو شێوەیەی نیشانی دابوو. [45]ئەوسا بردیانە ئەو وولاتەی دەستیان بەسەریدا گرت بەسەرکردایەتی یەشوع*، کاتێ خودا ئەو گەلەی تیایدا دانیشتبوو لەبەردەم باپیرانمان دەریکردن. ئیتر بەو شێوەیە مایەوە تا ڕۆژانی داود، [46]ئەوەی مایەی ڕەزامەندی خودا بوو، هەوڵیدا ماڵێك بدۆزێتەوە بۆ خودای یاقوب. [47]هەرچەندە سلێمان بوو خانوویەکی بۆ دروستکرد.
[48]بەلام خودای هەرەبەرز لەو کۆشکانەی کە دەستی مرۆڤ دروستیکردووە نیشتەجێ نابێ، وەك پێغەمبەر ووتویەتی:
[49]{ئاسمان تەختی منە،
زەویش شوێنی پێمە.
چ ماڵێکم بۆ دروست دەکەن؟ خوداوەند دەڵێ.
چ شوێنێکم بۆ حەوانەوە بۆ ئامادە دەکەن؟
[50]ئایا دەستی خۆم هەموو ئەم شتانەی دروست نەکردووە؟}
[51]ئەی مل ڕەقەکان، ئەی ئەوانەی دڵۆ گوێتان خەتەنە نەکراوە! ئێوە هەمیشە بەربەرەکانی ڕۆحی پیرۆز دەکەن وەك باوباپیرانتان! [52]چ پێغەمبەرێك نەچەوسێندراوەتەوە لە لایەن باوباپیرانتان؟ هەروەها ئەوانەیان کوشت کە باسی هاتنی ئەو ڕاستودروستەیان دەکرد کە ئێوە ئێستا داتانبەدەستەوەو کوشتتان، [53]ئێوە شەریعەتتان لەدەستی فریشتەکان وەرگرت، بەلام کارتان پێنەکرد.)

کوشتنی ئیستفانۆس
[54]کاتێ ئەوانەی کۆبوونەوە گوێیان لەقسەکانی ئیستفانۆس بوو، دڵیان پڕبوو لەکینە لێیو ددانیان لێجیڕدەکردەوە. [55]بەلام ئیستفانۆس گیانی پڕبوو لەڕۆحی پیرۆز، سەیری ئاسمانی کرد، ئەوسا شکۆی خودای بینیو عیساش لەلای دەستە ڕاستی خوداوە وەستابوو، [56]ووتی: (دەبینم ئاسمان کراوەتەوەو ڕۆلەی مرۆڤیش لەلای دەستە ڕاستی خوداوە ڕاوەستاوە.)
[57]بەلام ئەوان بەدەنگێکی بەرز هاواریان

کـردو گوێـیان ئاخـنیو هـەموو بـە یەکجار پـەلاماریاندا، [58]بەپاڵ ئیستفانۆسیان دەرکردە دەرەوەی شـارو دەسـتیان کـرد بە بەردباران کـردنی. شـایەتەکان جلەکانـیان داکـەند لەبەرپـێی گەنجێك دایانا ناوی شاول بوو. [59] لەکاتێکدا بەردبارانـیان دەکـرد، ئیستفانۆس بانگیکـرد: (ئـەی عیسای خوداوەند، ڕۆحم وەرگـرە!) [60]ئـیتر چـۆکی داداو بەدەنگێکی بـەرز هاواریکـرد: (ئـەی خوداوەنـد، ئـەم گوناهـەیان لەسـەر مەنووسـە.) ئـیتر ئەمـەی ووتو نوست.

## چەوسانەوەی باوەڕداران
# 8

شاولیش ڕازی بوو بە کوشتنی ئیستفانۆس.

هـەر لـەو ڕۆژەدا کۆمـەڵی بـاوەڕداران تووشـی چەوسانەوەیەکی زۆر هات لەقودس. هـەموو بـاوەڕداران لـەناوچـەکانی یەهودیەو سـامیرە بڵاوبوونـەوە، بـەڵام نـێرراوان هـەر لـەقودس مانەوە. [2]ئیتر هەندێ پیاوی لەخودا تـرس ئیستفانۆسـیان ناشـتو زۆر لەسـەری گـریان. [3]بـەڵام شـاول هـەوڵی لەناوبـردنی کۆمەڵـەی بـاوەڕدارانی دەدا، لـەم ماڵـەوە دەچـوو بـۆ ئـەو ماڵ، ژنو پیاوی ڕادەکێشاو دەیخستنە بەندیخانە.

## مزگێنیدان لەسامیرە

[4]ئـەو باوەڕدارانـەی بڵاوبـبوونەوە لـەشـوێنێکەوە دەچـوون بـۆ شـوێنێکی‌کەو مزگێـنی ووشـەی خودایان بەخەڵکی دەدا. [5] جـا فیلـیپۆس بـۆ شارێك ڕۆیشت لەناوچەی سـامیرەو مەسـیح ڕادەگـەیاند بـۆ دانیشـتووانەکەی. [6]کاتێ خەڵکەکە بەیەك دڵ گوێیان لێی گرتو نیشانەی سەرسوڕهێنەریان لـێی بینـی، زۆر بایەخـیان دا بەوەی ووتی، [7] چـونکە ڕۆحـی پـیس لـەزۆر کەس کەتیایان نیشتەجێبوون، دەهاتە دەرەوەو بەدەنگی بەرز هاواریـان دەکـرد، هـەروەها شـەلو گۆجـی زۆری چاككردەوە، [8]ئەوسا خۆشی‌یەکی زۆر ئەو شارەی گرتەوە.

[9]پـێش ئەمـە لـەو شـارەدا پیاوێکی‌جادوگـەرێك هـەبوو ناوی شەمعون بـوو، جـادوی دەکـردو دانیشـتووی سامیرە سـەریان سوڕمابوو لێی، دەیووت من پیاوێکی مـەزنم. [10]گـەورەو بچـووك گوێـیان لـێدەگـرتو دەیانووت: (ئەم پیاوە توانای خودای‌یـە کـە ناسراوە وەك هێزێکی مەزن.) [11]ئـەوان گوێـیان بـۆ دەگـرت، چـونکە ماوەیـەکی درێـژ بـوو سەرسـامی کـردبوون بەجادوگەرێتـیەکەی. [12]بـەڵام کاتێ باوەڕیان هێـنا بەووشـەکانی فیلـیپۆس ئـەوەی مزگێنی پاشـایەتی ئاسمـانو نـاوی عیسـای مەسـیحی

پێیدان، ئیتر ژنو پیاو لەئاوهەڵکێشران. [13] ئەوسا شەمعونیش باوەڕی هێناو لەئاوهەڵکێشرا، خوی بە فیلیپۆس گرتبوو، سەری‌سوڕما بوو کاتێ نیشانەو کاری سەرسوڕهێنەری دەبینی لەسەردەستی دەکرا.

[14]کاتێ نێرراوان لەقودس بیستیان کەوا دانیشتووانی سامیرە ووشەی خودایان وەرگرتووە، ئەوسا پەترۆس‌و یۆحەننایان بۆ لایان نارد. [15]کاتێ گەیشتنە لایان نوێژیان بۆ کردن تاکو ڕۆحی پیرۆز وەرگرن، [16]چونکە هێشتا ڕۆحی پیرۆز نەڕژابوو بەسەر کەسیان، بەڵکو تەنها بەناوی عیسای خوداوەند لەئاو هەڵکێشرابوون. [17]جا پەترۆس‌و یۆحەننا دەستیان خستە سەر سەریان، ئەوسا ڕۆحی پیرۆزیان وەرگرت. [18] کاتێ شەمعون بینی ڕۆحی پیرۆز درا بەو باوەڕدارانەی کە دوو نێرراوەکە دەستیان خستە سەر سەریان، هەندێ پارەی خستە بەردەم پەترۆس‌و یۆحەنناو پێی‌ووتن: [19](ئەو توانایە بەمنیش بدەن، هەتا دەست بخەمە سەر هەر کەسێك ڕۆحی پیرۆز وەرگرێ.) [20] پەترۆس پێی‌ووت: (با زیوەکەت لەگەڵ خۆت لەناوبچێت! چونکە لەو باوەڕەدا بووی تۆ دەتوانی بەهرەی خودا بە پارە بکڕی! [21]تۆ لەم شتەدا بەش‌و میراتت نییە، چونکە دڵت ڕاست نییە بەرامبەر خودا. [22]تۆبە بکە لەبەر ئەم خراپەیە، نوێژ بکە بۆ خوداوەند تا لەمەبەستی دڵت خۆش بێت، [23]چونکە دەتبینم پڕ تاڵاویت‌و بەندی گوناهیت.) [24] ئینجا شەمعون ووتی: (هەر دووکتان لەپێناوی من نوێژ بکەن بۆ خوداوەند، هەتا هیچ شتێك لەوەی باسی دەکەن بەسەرمدا نەیەت.) [25]دوای ئەوەی پەترۆس‌و یۆحەننا شایەتیانداو بە ووشەی خوداوەند قسەیان کرد، گەڕانەوە بۆ قودس‌و مزگێنیاندا بە زۆر دێی سامیریەکان.

فیلیپۆس‌و وەزیری حەبەشە

[26]فریشتەیەکی خوداوەند لەگەڵ فیلیپۆس دواو پێی‌ووت: (هەستە بڕۆ بەرەو خواروو، لەسەر ئەو ڕێگایەی شۆڕدەبێتەوە لە قودسەوە بۆ غەززە، کە بیابانە. [27]ئەویش هەستاو ڕۆیشت، لەوکاتەدا تووشی پیاوێکی گرنگی خەساوی حەبەشی‌بوو کە وەزیری کاروباری دارایی بوو لای کەنداکەی شاژنی حەبەشە، هاتبووە قودس بۆ پەرستن، [28]کاتێ بەسواری گالیسکەکەی دەگەڕایەوە بۆ حەبەشە، خەریکی خوێندنەوە بوو لەپەرتووکی ئەشعیای پێغەمبەر، [29]ڕۆحی پیرۆز بە فیلیپۆسی ووت: (بڕۆ دوای ئەو گالیسکەیە کەوە.) [30]ئیتر فیلیپۆس بە پەلە دوای‌کەوت، گوێی لەکابرا بوو پەرتووکی ئەشعیای دەخوێندەوەو

لێی‌پرسی: (ئایا ئەوەی دەی‌خوێنیتەوە تێی‌دەگەی؟) [31] ئەویش لەوەڵامدا ووتی: (چۆن ئەمە بتوانم گەر یەکێك بۆمی ڕوون نەکاتەوە؟) ئینجا فیلیپۆسی بانگ‌کرد بچێتە سەر گالیسکەکەی‌و لەگەڵی دابنیشێ. [32] کابرا لەو پەرتووکەی دەیخوێندەوە گەیشتبووە ئەو بەشەی کە دەڵێ:

{وەك مەڕ کە دەبرێ بۆ سەربڕین،
هەروەها وەك بەرخ بێ‌دەنگ لەبەردەست
ئەوەی خوری لێ‌دەبڕیتەوە،
بەم شێوەیە دەمی نەکردەوە.
[33] لەکاتێکدا نەرمونیان بوو بەناڕەوایی
هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کرد.
ئیتر کێ باسی نەوەکانی دەکات،
کاتێ ژیانی لەسەر زەوی هەڵگیرا؟}

[34] لێرە کابرا بە فیلیپۆسی ووت: (تکایە پێم‌بڵێ: ئەشعیای پێغەمبەر مەبەستی لە کێیە لەم ووتەیەدا؟ لەخۆی یاخود لە یەکێکی‌کە؟) [35] ئیتر فیلیپۆس کەوتە قسەکردن‌و دەستی‌کرد بە مزگێنی‌دانی عیسا بە دەست پێ‌کردن لەم بەشەی‌و پەرتووکەوە. [36] کاتێ بەڕێگاوە بوون، گەیشتنە شوێنێك ئاوی لێ‌بوو، کابرا ووتی: (ئەوە ئاوە، چی ڕێم لێ‌دەگرێ لەئاوهەڵبکێشرێم؟) [[37] فیلیپۆس ووتی: (ئەمە دەبێ گەر بە هەموو دڵتەوە باوەڕ بهێنی.) جا کابرا ووتی: (باوەڕ دەکەم عیسای مەسیح ڕۆڵەی خودایە.) ] [38] فەرمانی‌دا گالیسکەکە ڕاوەستێ، ئەوسا هەردووکیان بەیەکەوە چوونە سەر ئاوەکەو فیلیپۆس کابرای خەساوی لەئاوهەڵکێشا. [39] کاتێ لە ئاوەکە هاتنەدەرەوە ڕۆحی خوداوەند فیلیپۆسی ڕفاند، ئیتر کابرا فیلیپۆسی نەبینییەوە. بەڵام بەخۆشیەوە بەڕێگای خۆی ڕۆیشت. [40] دوای ئەوە فیلیپۆس لە ئەشدود خۆی بینییەوە، ئینجا ڕۆیشت بۆ مزگێنی‌دان لە هەموو ئەو شارانەی ئەوێ تا گەیشتە شاری قەیسەریە.

## خوداوەند شاول دەگۆڕێت
# 9

هێشتا شاول دڵی پڕبوو لە هەڕەشەو کوشتن بەرامبەر قوتابیەکانی خوداوەند. لەبەرئەوە چووە لای سەرۆك کاهین، [2] داوای نامەی لێ‌کرد بۆ کەنیشتەکان لە دیمەشق تا ئەوانەی شوێنی ئەم ڕێگایە کەوتوون لەژن‌و لەپیاو لە هەر شوێنێ بیانبینێ بەبەندکراوی بیانبات بۆ قودس. [3] کاتێ بەرەو دیمەشق دەڕۆیشت‌و لێی‌نزیك‌بووەوە، لەپڕ لە دەوروپشتی ڕووناکیەك لەئاسمان بریسکەی دایەوە، [4] ئیتر کەوت بە زەویداو گوێی لەدەنگێك بوو پێی‌ووت: (شاول! شاول! بۆچی دەم‌چەوسێنیتەوە؟) [5] ئەویش پرسیاری‌کرد: (تۆ کێیت ئەی گەورە؟)

دەنگەکە وەڵامی دایەوە: (من عیسام ئەوەی تۆ دەیچەوسێنیتەوە؟ [6]بەڵام هەستە، برۆ ناو شار لەوێ پێتدەوترێ چی دەبێ بکەیت.) [7]ئەوانەی لەگەڵ شاول بوون بەبێدەنگی وەستان، ئەوان دەنگەکەیان بیست بەڵام کەسیان نەبینی. [8]کاتێ شاول هەستایەوە، چاوی کردەوەو سەیری کرد هیچ نابینێ، ئەوانی تر دەستیان گرت و بردیان بۆ دیمەشق، [9]لەوێ سێ ڕۆژ مایەوە هیچی نەبینی، هەروەها هیچی نەخواردو هیچی نەخواردەوە.

[10]لەدیمەشق قوتابیەکی خوداوەند هەبوو ناوی حەنانیا بوو، لەخەودا خوداوەند بانگی کرد: (حەنانیا!) ئەویش ووتی: (ئەوەتام ئەی خوداوەند!) [11]خوداوەند پێیووت: (برۆ بۆ ئەو شەقامەی بە ڕاست ناسراوە لەماڵی یەهوزا پرسیار لەپیاوێکی تەرتوسی بکە ناوی شاولە وا لەوێ نوێژ دەکات. [12]لەخەودا بینیویەتی پیاوێك ناوی حەنانیایە دەچێتە لایو دەستی دەخاتە سەر بۆ ئەوەی ببینێ.)

[13]حەنانیا بە خوداوەندی ووت: ( ئەی خوداوەند، لەزۆر کەس ئەو خراپانەم بیستۆتەوە کە ئەم پیاوە لەقودس کردوویەتی بەرامبەر بەخوشكو برا پیرۆزەکانت، [14]ئەوەتا لێرە دەسەڵاتی هەیە لەلایەن سەرۆك کاهینەکانەوە، هەر کەسێك ناوت بهێنێ بیگرێ.) [15]خوداوەند فەرمانی پێدا: (برۆ! من ئەم پیاوەم هەڵبژاردووە وەك ئامێرێك بۆ هەڵگرتنی ناوی من بۆ میللەتانو بۆ پادشایانو بۆ نەوەی ئیسرائیلیش. [16]نیشانی دەدەم چەند دەبێ ئازاربکێشێ لەپێناوی ناوی من.) [17]ئیتر حەنانیا ڕۆیشتو چووە ماڵی یەهوزا، دەستیخستە سەر سەری شاولو ووتی: (ئەی شاولی برا، عیسای خوداوەند ئەوەی لەو ڕێگایەی پیایدا هاتی خۆی نیشان دایت، منی ناردووە بۆ لات تا بەچاوت ببینیتو گیانت پڕبێت لەڕۆحی پیرۆز.) [18]دەستبەجێ لەهەردوو چاوی شاول شتێك کەوتە خوارەوە وەك توێکڵ وابوو، ئەوسا چاوی چاكبووەوەو بینی، ئیتر هەستاو لەئاوهەڵکێشرا. [19]دەستیکرد بەنان خواردنو هێز هاتەوە گیانیو چەند ڕۆژێك لەگەڵ قوتابیەکان لەدیمەشق مایەوە.

مزگێنیدانی شاول لەدیمەشق

[20]یەکسەر شاول لەکەنیشتدا دەستیکرد بەراگەیاندنی ئەوەی کە عیسا ڕۆڵەی خودایە. [21]گوێگرەکان لەووتەکانی سەرسام بوونو پرسییان: (ئایا ئەمە ئەوە نییە، هەموو ئەوانەی لەناودەبرد کە باسی ئەو ناوەیان دەکرد لەقودس؟ ئەی نەهاتبوو بۆ ئێرە تا بەندکراوی بیانبات بۆ سەرۆك کاهینەکان؟) [22]بەڵام شاول زیاتر بەتوانا دەبوو

لــەووتارەکــەیدا، هــەروەها ئەو جوولــەکانەی دانیشــتووی دیمەشق بوون دەمکوتی‌کردن بەو بەڵگانەی دەریدەخات‌کە عیسا مەسیحە.

[23]لــەپاش ماوەیــەکی زۆر جوولــەکەکان پلانێکــیان دانا بۆ کوشتنی شاول، [24]بەڵام ئەو بە پلانەکەیانی زانی. ئیتر جوولــەکەکان شەو و ڕۆژ ئاگــاداری دەروازەی شــار بــوون تــا بــیکوژن. [25]لەبەرئــەوە هەندێ لەقوتابیەکانی بەشــەو بــردیانو خســتیانە نــاو سەبەتەیەك، بە گوریــس لـــەشــوورەی شــارەکە شــۆڕیان کردەوە.

### شاول لەقودس

[26]کــاتێ شــاول گەیشتە قودس، هەوڵی‌دا پەیوەندی بە قوتابیەکانەوە بکات لەوێ، بەڵام ئــەوان لێی‌ترسان، چونکە باوەڕیان نەدەکرد کــە ئــەو بــووە بە قوتابی خوداوەند. [27] بەڵام بــەرنابا کارەکــەی گــرتە ئەستۆ و هێنایە لای نــێرراوان، بــۆی گــێڕانەوە چــۆن خوداوەنــد لــەڕێگا خــۆی نیشان‌داوەو گفتوگۆی لەگەڵ کــردووە، هــەروەها چۆن بەچاونەترسی ناوی عیسای ڕاگەیاندووە لەدیمەشق.

[28]ئــیتر شـــاول لەگەڵــیان دەســـتی‌کرد بەهاتووچــۆ لــەقودس، بەچاونەترسیەوە ناوی خوداوەنـــدی ڕادەگـــەیاند. [29]هـــەروەها گفــتوگۆی لەگەڵ ئەو جوولــەکانە دەکرد کە بــەیۆنــانی دەدوان، جــا ئەوانــیش هەوڵــیان‌دا بــیکوژن. [30]کــاتێ برایان بەمەیان زانی بردیانە قەیسەریە لەوێشەوە ناردیانە شاری تەرتوس.

[31]لـــەو کاتــەدا کۆمــەڵی بــاوەڕدارانی ناوچــەی یەهودیــەو جەلــیلو ســامیرە ئاشتیان هــەبوو. هــەروەها گەشــەیان دەکــردو لەسەر ڕێگــای خوداوەنــد پەرســتی دەڕۆیشــت، بەپشتیوانی ڕۆحی پیرۆزیش لەپەرەسەندن‌بوو.

### پەترۆس لەشاری لودەو یافا

[32]کاتێ پەترۆس لەهەموو لایەك بەڕێگاوە بــوو، چــوو بــۆ دیدەنــی ئــەو خوشــكو بــرا پیرۆزانــەی شاری لودە، [33]لەوێ ئیفلیجێکی بینی ناوی ئینیاس بوو، هەشت ساڵ بوو لەناو جــێگا کەوتــبوو. [34]پەتــرۆس پێی‌ووت: (ئەی ئینــیاس، عیســای مەســیح چــاکت‌دەکاتەوە. هەســتە خــۆت جــێگاکەت چاك‌بکە!) ئەویش یەکســەر هەســتا. [35]کــاتێ هەموو دانیشتوانی لــودەو شــارون کابرایان بینی، ئیتر هەموویان بۆ خوداوەند گەڕانەوە.

[36]لــەشــاری یافــا قوتابــیەکی کچ هەبوو نــاوی تابیســا بــوو ناوەکــەی بەواتای ئاسك، هەمیشە بە کاری چاکەو یارمەتی‌دانی هەژاران خــەریك بــوو. [37]لەوکاتــەدا وا ڕێکــەوت نــەخۆش‌کــەوتو مــرد، شوشــتیانو خستیانە ژوورێکەوە لە نهۆمی سەرەوە.

[38]کاتێ قوتابیەکان لەیافا بیستیان پەترۆس لەشاری لودەیە، جا یافا نزیك بوو لەشاری لودەوە، دوو پیاویان ناردە لای، داوایان لێکردو ووتیان: (تکایە وەرە بۆ لامان خۆت دوامەخە!) [39]ئەویش هەستاو ڕۆیشت، کاتێ گەیشت بردیانە نهۆمی سەرەوە، هەموو بێوەژنەکان بەگریانەوە هاتنە لای، هەندێ کراس‌و جلیان بۆ هێنا لەوانەی ئاسکە دروبووی کاتێ بە زیندوویی لەگەڵیان بوو.

[40]پەترۆس داوای لە هەموو ئەوانەکرد کە لەوێدا بوون لە ژوورەکە بچنە دەرەوە، چووە سەر چۆك‌و نوێژی‌کرد، ئینجا ڕووی کردە لاشەکەو ووتی: (تابیسا، هەستە!) ئەوسا کچە چاوی کردەوەو کاتێ پەترۆسی بینی دانیشت. [41]یەکسەر پەترۆس دەستی بۆ ڕاکێشاو یارمەتی‌دا تا هەستێ، ئیتر خوشك‌و برا پیرۆزەکان‌و بێوەژنەکانی بانگ‌کردو کچەکەی بەزیندوویەتی دایەوە دەستیان. [42]هەواڵی ئەمە لەهەموو یافادا بڵاوبووەوە، ئەوسا ژمارەیەکی زۆر باوەڕیان بە خوداوەند کرد. [43]پەترۆس لە یافا بۆ ڕۆژانێکی زۆر لای کابرایەکی پێستە خۆشکەر مایەوە ناوی شەمعون بوو.

## پەترۆس‌و کرنیلیوس
## 10

لە شاری قەیسەریە سەرپەلێك هەبوو ناوی کرنیلیوس بوو، لەلیوای ئیتالی‌بوو. [2]ئەم پیاوە خۆی‌و ماڵو منداڵی خواپەرست بوون‌و ترسی خودایان لەدڵ بوو، زۆر چاکەی لەگەڵ خەڵکی دەکرد، هەموو کاتێك نوێژی بۆ خودا دەکرد. [3]ڕۆژێکیان نزیکەی سەعات سێی دوای نیوەڕۆ، کرنیلیوس لە خەودا بە ڕوونی بینی لەلایەن خوداوە فریشتەیەك بۆ لای هات‌و ووتی: (کرنیلیوس!) [4]ئەویش بەترسەوە سەیری فریشتەکەی کردو پرسی: (چی گەورەم؟) فریشتەکە لەوەڵامدا ووتی: (نوێژەکانت‌و چاکەکانت گەیشتنە بارەگای خوداو لای لێ‌کردیتەوە. [5]ئێستا چەند پیاوێك بنێرە بۆ یافا بەدوای شەمعون ناوێك نازناوی پەترۆسە. [6]لەماڵی شەمعونی پێستەخوشکەرە، ماڵەکەی لەسەر قەراغی دەریایە.) [7]کاتێ ئەو فریشتەیەی قسەی لەگەڵ کرنیلیوس کرد ڕۆیشت، دووان لەخزمەتکارەکانی بانگ‌کرد لەگەڵ سەربازێکی خوداپەرست کە یەکێك بوو لەوانەی هەمیشە لەگەڵی بوو، [8]هەموو مەسەلەکەی بۆ گێڕانەوەو ناردنی بۆ شاری یافا.

[9]بۆ بەیانی، کاتێ سێ پیاوەکە لە شاری یافا نزیك بوونەوە، پەترۆس دەمەو نیوەڕۆ چووە سەربان تا نوێژبکات. [10]زۆر برسی

بوو، ئارەزووی نانخواردنی دەکرد. جا کاتێ کە خواردنیان بۆ ئامادە دەکرد، لە هۆشی خۆی چوو، [11] ئاسمانی بەکراوەیی بینی، شتێکی بۆ هاتەخوارەوە لەشێوەی پارچە قوماشێکی گەورە، لە هەر چوار لاوە شۆڕکرایەوە سەر زەوی. [12] هەموو جۆرە ئاژەڵی چوار پێو خشۆکی سەرزەویو باڵندەی ئاسمانی تێدا بوو. [13] ئینجا دەنگێ بانگی کرد: (پەترۆس هەستە، سەربڕەو بخۆ!) [14] بەڵام پەترۆس وەڵامی‌دایەوە: (نەخێر ئەی خوداوەند، لەژیانم هەرگیز شتی گڵاو یاخود حەرامم نەخواردووە.) [15] دووبارە دەنگەکە پێی‌ووت: (ئەوەی خودا پاکی کردۆتەوە تۆ بە گڵاو دایمەنێ.) [16] ئەمەش سێ جار دووبارە بووەوە، ئینجا پارچە قوماشەکە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان.

[17] لەو کاتەی پەترۆس سەری سوڕمابوو، پرسیاری لەخۆی دەکرد لەبارەی ئەو شتەی بینیبووی، ئەو پیاوانەی کرنیلیوس ناردبوونی پرسیاری ماڵی شەمعونیان دەکردو لەبەردەگا وەستان. [18] پرسییان ئایا ئەو شەمعونەی نازناوی پەترۆسە لێرەیە. [19] لەو کاتەی پەترۆس جارێ هەر بیری لەواتای بینینەکەی دەکردەوە، ڕۆحی پیرۆز پێی‌ووت: (لەبەر دەرگا سێ پیاو پرسیارت دەکەن. [20] هەستە بڕۆ خوارەوەو لەگەڵیان بڕۆ بێ دوودڵی، چونکە من ئەوانم ناردووە.) [21] ئەویش ڕۆیشت بۆ لایانو ووتی: (منم ئەوەی دەتانەوێ. بۆچی هاتوون؟) [22] ئەوانیش ووتیان: (کرنیلیوسی سەرپەل پیاوێکی چاکی لەخواترسە، هەموو جوولەکەش شایەتی ئەمەن، خودا پێی‌ڕاگەیاندووە بەهۆی فریشتەیەکی پیرۆزەوە کەوا بانگت‌بکات بۆ ماڵی خۆی تا گوێ لە قسەکانت بگرێ.) [23] جا پەترۆس داوای لێ‌کردن شەو بە میوانی لەوێ بمێننەوە.

بۆ بەیانی هەستا لەگەڵیان ڕۆیشت، هەروەها هەندێ برایانی باوەڕداریش لەیافاوە لەگەڵیان ڕۆیشتن. [24] بۆ ڕۆژی دووەم گەیشتنە شاری قەیسەریە. کرنیلیوس چاوەڕێی هاتنی دەکردن، خزمو کەسوکارو هاوڕێیانی نزیکی بانگ کردبوو. [25] کاتێ پەترۆس هاتە ژوورەوە، کرنیلیوس پێشوازی لێکردو لەبەرپێی کەوتو کڕنووشی بۆ برد، [26] پەترۆس هەڵیساندو پێی‌ووت: (هەستە! منیش وەك تۆ مرۆڤم!) [27] کاتێ پەترۆس لەگەڵی دواو چووە ژوورەوە، خەڵکێکی زۆری بینی، [28] پێی‌ووتن: (ئێوە دەزانن حەرامە بۆ جوولەکە تێکەڵاوی بێگانە بێت یاخود سەردانی‌بکات لەماڵ، بەڵام خودا نیشانی دام بەکەس نەڵێم گڵاو یاخود حەرام. [29] جا من بێ هێنانەوە نارەزایی هاتم،

لەسەر بانگکردنەکەی خۆتان. هۆی بانگکردنەکەتان چییە؟) [30]کرنیلیوس لەوەڵامدا ووتی: (چوار ڕۆژ لەمەوبەر، لەوکاتەی لەماڵی خۆم کاژێری سێی پاش نیوەڕۆ نوێژم دەکرد، لەپڕ پیاوێك پەیدا بوو جلی بریسکەداری لەبەر بوو، [31]پێی ووتم: کرنیلیوس نوێژەکانتبیستراو کردەوە چاکەکانتە لایان لێکرایەوە لەبەردەم خودا. [32]بۆیە ئێستا بنێرە بۆ یافا بەشوێن شەمعون ناوێك کە نازناوی پەترۆسە. لەماڵی شەمعونی پێستەخۆشکەرە، ماڵەکەیان لەسەر قەراغی دەریایە. [33]من یەکسەر ناردم بەشوێنت، تۆش شتێکی چاکتکرد کە هاتی. ئێستا ئێمە هەموو ئامادەین لەبەردەم خودا، تا گوێ بگرین لەهەموو ئەوەی خوداوەند فرمانی پێداوی.)

ووتاری پەترۆس

[34]پەترۆس دەستیکرد بە قسەکردنو ووتی: (بە تەواوی بۆم دەرکەوتووە خودا لایەنگیری خۆیبۆ کەس دەرناخات، [35]لەهەر نەتەوەیەك کێ ترسی خودای لەدڵدا بێتو چاکە بکات پەسەندە لای ئەو. [36]ئەو ووشەیەیە خودا ناردی بۆ نەوەی ئیسرائیل، مزگێنی ئاشتی دانێ بەهۆی عیسای مەسیح، ئەوەی خوداوەندی هەمووانەوە. [37]ئێوە دەزانن چی لەووڵاتی یەهودیەدا ڕوویدا، بەدەست پێکردن لەجەلیلەوە دوای ئەوەی یەحیا لەئاوهەڵکێشانەکەی ڕاگەیاند. [38]چۆن خودا عیسای ناسیری بە ڕۆحی پیرۆزو بە هێز دەستنیشانکرد، دەگەڕاو کاری چاکەی دەکرد، هەموو ئەوانەی شەیتان دەستیگرتبوو بە سەریان چاکی کردنەوە، چونکە خودای لەگەڵ بوو. [39]ئێمە شایەتی هەموو ئەو شتانەین کە لەناوچەی یەهودیەو قودسدا کردی، ئەوەی ئەوان کوشتیان بە هەڵواسینی بەدارەوە. [40]بەلام خودا لەنێو مردووواندا لە ڕۆژی سێیەم زیندووی کردەوە، وای لێکرد دەرکەوێ، [41]نەك بۆ هەموو گەل بەڵکو بۆ ئێمە کە لەپێشا هەڵبژاردووین وەك شایەت، ئێمە کە لەگەڵی خواردمانو خواردمانەوە پاش زیندووبوونەوەی لەنێو مردوواندا. [42]ئینجا فەرمانی پێدایـن ئەوە بە گەل ڕابگەیێنین، هەروەها شایەتی ئەوە بدەین کە خودا ئەوی داناوە بەدادوەر بەسەر زیندووانو مردوواندا. [43]هەموو پێغەمبەران شایەتی بۆ دەدەن، هەر کەسێك باوەڕی پێ بهێنێ، بەناوی ئەو گوناهەکانی دەبەخشرێ.)

وەرگرتنی ڕۆحی پیرۆز

[44]کاتێ پەترۆس لەم قسانەدا بوو، ڕۆحی پیرۆز ڕژا بەسەر هەموو ئەوانەی گوێیان گرتبوو. [45]ئەو جوولەکە باوەڕدارانەی لەگەڵ پەترۆس هاتبوون سەریان سوڕما، چونکە بەهرەی ڕۆحی پیرۆز بەسەر ناجوولەکەکانیش ڕژاو [46]گوێیان لێبوو بەزمانە ڕۆحیەکان دەدوانو ستایشی خودایان دەکرد. پاشان پەترۆس ووتی: [47](ئەو خەڵکەش وەك ئێمە ڕۆحی پیرۆزیان وەرگرتووە، جا کێ دەتوانی ڕێگایان لێبگرێ تا لە ئاو هەڵنەکێشرێن؟) [48]فەرمانیدا هەموو ئەوانە بەناوی عیسای مەسیح لەئاوهەڵکێشرێن. ئەوسا ئەوان داوایان لەپەترۆس کرد چەند ڕۆژێك لایان بمێنێتەوە.

# 11

نێرراوانو برایانی باوەڕدار لە ناوچەی یەهودیە بیستیان کە ناجوولەکەش باوەڕیان بە ووشەی خودا هێناوە، [2]کاتێ پەترۆس گەڕایەوە بۆ قودس ئەوانەی سەر بەڕێبازی خەتەنکردن* بوون بەربەرەکانیان کردو پێیان ووت: [3](چۆن چوویتە لای ئەوانەی خەتەنە نەکراونو نانت لەگەڵ خواردن؟) [4]جا پەترۆس ئەوەی ڕوویدابوو یەك لە دوای یەك بۆی گێڕانەوەو ووتی: [5](لە شاری یافا نوێژم دەکردو لەهۆشی خۆم چووم، لە بینینێکدا شتێکم لەئاسمانەوە بۆ هاتە خوارەوە، لەشێوەی پارچە قوماشێکی گەورە لەهەر چوار لایەوە بۆم شۆڕکرایەوە. [6]کاتێ بەووردی سەیرم کرد جۆرەها ئاژەڵی سەر زەویم تیادا بینی لە ئاژەڵی کێویو لە خشۆكو هەموو باڵندەی ئاسمان، [7]ئینجا گوێم لەدەنگێك بوو پێیووتم: پەترۆس، هەستە سەربڕەو بخۆ! [8]منیش لەوەڵامدا ووتم: نەخێر ئەی خوداوەند، هەرگیز شتی گڵاو یاخود حەرام نەچۆتە دەمم. [9]بەڵام دەنگەکە دووبارە لەئاسمانەوە پێیووتم: ئەوەی خودا پاکی کردۆتەوە تۆ بە پیسی دامەنێ. [10]ئەمە سێجار دووبارە بووەوە، جا شتەکان بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان. [11]ئیتر ئەو سێ پیاوەی لەقەیسەریەوە بۆ لای منیان ناردبوون گەیشتنە ئەو ماڵەی تیایدا بووم، [12]ڕۆحی پیرۆز فەرمانی پێدام بێ دوو دڵی لەگەڵیان بڕۆم، ئەوسا منو ئەو شەش برایەی لەگەڵم هاتبوون، لەگەڵیان ڕۆیشتین، کاتێ چووینە ماڵی پیاوەکە، [13]پێیووتین چۆن فریشتەی دیوە هاتۆتە ماڵەکەیو پێیووتوە: پیاو بنێرە بۆ یافا، بەدوای شەمعون کە نازناوی پەترۆسە، [14]ئەو پەیامێکت دەداتێ بەهۆیەوە خۆتو هەموو خاوخێزانت ڕزگارتان دەبێ. [15]کاتێ دەستم

کـرد بـە قسەکردن، ڕۆحی پیرۆزیان بەسەردا ڕژا، چۆن لـەسەرەتا بەسەر ئێمەدا ڕژا. [16]لێرە ئـەوەم بیرکەوتـەوە کـە خوداوەند پێیووتین: یەحـیا خـەڵکی لەئاوهەڵکێشـا، بـەڵام ئـێوە لـەرۆحی پیرۆز هەڵدەکێشرێن. [17]گەر خودا هـەمان بەهرەی بەوان دابێ کە داوێتی بە ئێمە کـاتێ باوەڕمـان بە خوداوەند عیسای مەسیح هێـنا، جا من چیم هەتا ڕێگا لەخودا بگرم؟) [18]کـاتێ گوێـیان لەمەبوو، ئیتر بەربەرەکانییان نەکـردو ستایشـی خودایـان کـردو ووتـیان: (کەواتـە خـودا بەهـەمان شـێوە، تۆبەکـردنی ژیانی بەخشیوە بەوانەی جوولـەکە نین.)

کۆمەڵی باوەڕدارانی ئەنتاکیا

[19]ئـیتر ئـەو باوەڕدارانـەی بڵاوبوونـەوە بـەهۆی ئـەو چەوسـانەوەی بەسـەریان هـات لەبـەر ئیسـتفانوس، کـاتێ بە فنیقیەو قوبرسو شـاری ئەنتاکـیادا تێپەڕین، ووشەی خودایان تەنها بەجوولـەکەکان دەدا. [20]بەڵام هەندێکیان لـەبنەچـەدا خەڵکی قوبرسو قەیرەوان بوون، کاتێ گەیشتنە شاری ئەنتاکیا، دەستیانکرد بە ڕاگـەیاندنی مزگێـنی عیسـای خوداوەنـد بـۆ یۆنانیەکانـیش. [21]ئـەوان دەستی خوداوەندیان لەگـەڵ بـوو، ژمارەیـەکی زۆر باوەڕیان هێناو بۆ خوداوەند گەڕانەوە.

[22]ئـەم هەواڵـە گەیشـت بـە کۆمـەڵی بـاوەڕدارانی قودس، ئیتر ئەوان بەرنابایان نارد بۆ ئەنتاکیا. [23]کاتێ گەیشتە ئەوێو بەرەکەتی خـودای بیـنی، زۆر دڵشـاد بـوو، هەمووانی هـاندا بـەدڵ لەگـەڵ خوداوەنـد بمێنـنەوە بەخواسـتێکی چەسـپاو. [24]لەبەرئەوەی بەرنابا کابـرایەکی چـاك بوو، گیانی پڕبوو لە ڕۆحی پـیرۆزو بـاوەڕ، خەڵکـێکی زۆر باوەڕیـان بە خوداوەند هێنا.

[25]ئەوسا بەرنابا چوو بۆ شاری تەرسوسو گـەڕا بـەدوای شاول. [26]کاتێ دۆزیەوە هێنای بۆ ئەنتاکیا، لەوێ هەردووکیانساڵێکی تەواو لەگـەڵ کۆمـەڵی بـاوەڕداراندا کۆبوونـەوەو خەڵکـێکی زۆریـان فـێرکرد. جـا لە ئەنتاکیا قوتابـیەکانی خوداوەنـد بـۆ یەکـەم جار ناوی مەسـیحیيان* لـێنرا. [27]لەو ڕۆژانەدا هەندێ لــە پەیامبەرانی خـودا لەقودسـەوە هـاتن بۆ ئەنتاکـیا، [28]لەنێوانـیاندا یەکـێك هەبوو ناوی ئاگـابوس بـوو، بـەهۆی ڕۆحـی خـوداوە پێشـبینییکرد برسـێتییەکی گـەورە لـەهەموو جـیهان ڕوودەدات. جـا ئەم برسێتیە بەڕاستی ڕوویـدا لەسـەردەمی کلۆدیۆسی قەیسەر. [29]ئـیتر قوتابـیەکان بـڕیاریاندا هـەر یەکە بەپێی توانـای خـۆی یارمـەتی بنێرێـت بـۆ ئەو برا باوەڕدارانەی لەناوچەی یەهودیەدا دەژین. [30]جـا بەمـە هەسـتانو یارمەتییەکەیان بە دەستی بـەرناباو شاول بۆ پیرانی کۆمەڵی باوەڕدارانی

ئەویٚ نارد.

## کوشتنی یاقوب

## 12

لەوکاتەدا هێرۆدسی پاشا دەستی‌کرد بە چەوساندنەوەی چەند کەسیٚ لە کۆمەڵی باوەڕداران، [2]یاقوبی برای یۆحەننای بەشمشێر کوشت. [3]هەرکە بینی ئەمە جێگەی ڕەزامەندی جوولەکەکانە، ئەوسا بڕیاریدا پەترۆسیش بگریٚ، ئەمەش لە ڕۆژانی جەژنی فەتیرەدا بوو. [4]کاتیٚ هێرۆدس ئەوی گرت، خستیە بەندیخانەوە لەژێر چاودێری چوار کۆمەڵ پاسەوان داینا، هەر کۆمەڵەش لەچوار سەرباز پێکهاتبوو، چونکە دەیویست بیداتە دەستی جوولەکەکان دوای جەژنی تێپەڕبوون، [5]لەبەرئەوە لەبەندیخانەدا هێشتیەوە، بەلاٚم ئەندامانی کۆمەڵی باوەڕداران بە بەردەوامی بۆ ئەو لەخودا دەپاڕانەوەو نوێژیان بۆ دەکرد.

## ڕزگاربوونی پەترۆس

[6]ئینجا کە هێرۆدس بەتەمابوو بیدات بەدەستەوە، لەو شەوەدا پەترۆس لەنێوان دوو سەربازدا نووستبوو، بە دوو زنجیر بەسترابووەوە، هەروەها سەربازیش پاسەوانی دەرگای بەندیخانەکەیان دەکرد. [7]لەپڕ فریشتەیەکی خوداوەند پەیدابوو، ژووری بەندیخانەکە بەتەواوی ڕووناك بووەوە، فریشتەکە لەلاوە لە پەترۆسی داو خەبەری کردەوەو پێیووت: (خێرا هەستە!) ئیتر هەردوو زنجیرەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە. [8]فریشتەکە پێیووت: (پشتێنەکەت ببەستە، پێلاٚوەکانت لەپیٚ بکە!) ئەویش کردی. ئینجا فریشتەکە پێیووت: (سەرکراسەکەت لەبەرکەو دوامکەوە.) [9]پەترۆس چووە دەرەوەو شوێنی فریشتەکە کەوت وایدەزانی خەو دەبینیٚ، چونکە نەیدەزانی ئەوەی لەسەر دەستی فریشتەکە ڕوودەدا شتێکی ڕاستیە. [10]یەکەم بنکەی پاسەوانیان بڕیو ئینجا دووەم. کاتیٚ گەیشتنە دەروازەی ئاسنینی بەندیخانەکە کە ڕووەو شار بوو لەخۆیەوە بۆیان‌کرایەوە، هەردووکیان چوونەدەرەوە. دوای ئەوە شەقامێکیان بڕی، ئیتر یەکسەر فریشتەکە بەجێیهێشت. [11]جا ئەوکاتە پەترۆس هۆشی بەخۆی هاتەوەو ووتی: (بەڕاستی ئێستا بۆم دەرکەوت کەوا خوداوەند فریشتەکەی ناردو ڕزگاری کردم لەدەستی هێرۆدس‌و هەموو ئەوەی جوولەکەکان چاوەڕێیان دەکرد.)

[12]تۆزیٚ بیری‌کردەوە، ئیتر ڕۆیشت بەرەو ماڵی مریەمی دایکی یۆحەننا کە نازناوی مەرقۆس بوو، لەویٚ ژمارەیەکی زۆر کۆبووبوونەوە نوێژیان دەکرد. [13]کاتیٚ

گەیشــت لــەدەرگای دەرەوەی ماڵەکــەیدا، کچە کارەکەرێك کە ناوی ڕودا بوو هاتەلای دەرگاکـە تـا بـزانێ کێـیە. [14]هەر کە دەنگی پەترۆسـی ناسـیەوە لــە خۆشـیا دەرگاکــەی نەکــردەوە، بــەڵکو خــێرا چــووە ژوورەوەو مزگێنیدا بەوانەی لەوێ بوون کەوا پەترۆس لەبـەر دەرگایـە. [15]ئەوانـیش پێیانووت: (تۆ وڕێـنە دەکەیـت.) بەڵام کە سووربوو لەسەر قســـەکەی، ئەوســـا پێـــیانووت: (ئـــەوە فریشتەکەیەتی!) [16]بەڵام پەترۆس بەردەوام بوو لە دەرگا لــێدانەکە هەتا لێیان کردەوە. کاتێ بینییان زۆر سەرسامبوون. [17]بەدەست نیشانی دان تا بێدەنگ بن، ئینجا بۆی گێڕانەوە چۆن خوداوەنـد لــەبەندیخانـە دەریهێنا، پێیووتن: (ئـەم هەواڵــە بـەیاقوبو برایانی دیکە بدەن.) ئـیتر لێـیان جیابووەوەو ڕۆیشت بۆ شوێنێکی دیکە.

[18]کــــاتێ ڕۆژبـــووەوە ئاژاوەیـــەکی گـــەورە دروســـت بـوو لەنێـو سەربازەکان، دەسـتیانکـــرد بە پرسیارکردن، پەترۆس چی بەســەرهاتووە. [19]کاتێ هێرۆدس داوایکردو نەیدۆزیەوە، دەستیکرد بەلـێکۆڵینەوە لەگەڵ سەربازەکانو فەرمانیدا لـــەسێدارە بدرێن.

### مردنی هێرۆدس

ئیـنجا هـێرۆدس لەناوچـــەی یەهـودیەوە بـۆ ناوچـەی قەیسـەریە ڕۆیشـتو لــەوێ مایــەوە. [20]هــێرۆدس زۆر تــۆڕە بــوو لـــە دانیشـتوانی سورو سەیدا، لەبەرئەوە ئەوانیش لەنـێو خۆیـان ڕێکـەوتنو چەند نوێنەرێکیان نـاردە لای بلاستوسـی سەرپەرشـتیاری ماڵی پاشـا. تا ڕازی بکەن داوای ئاشتبوونەوەیان بۆ بکات، چونکە پشتیان بەناوچەی هێرۆدس دەبەسـت بـۆ ئازووقـە. [21]هێرۆدس لەڕۆژی دیاریکـراودا، جـلی پاشـایەتی لەبەرکـرد، لەســەر تەخـتی شـاهانە دانیشـتو ووتـاری بۆیـاندا. [22]جا خەڵکەکە هاواریانکرد: (ئەمە دەنگی خودایە نەك دەنگی مرۆڤ!) [23]یەکسەر فریشتەیەکی خوداوەند لە پادشای دا، چونکە شـکۆ و مەزنی نەدا بە خودا، ئیتر کرم لێیداو مـرد. [24]بەڵام ووشەی خودا گەشەی دەکردو زیاتر بڵاودەبووەوە.

[25]دوای ئـــەوەی بـــەرناباو شـــاول ئـــەو خـزمەتەی پێـیان درابـوو جێبەجێیانکـرد، لەقودسەوە گەڕانەوە [بۆ ئەنتاکیا]، یۆحەنناش کە نازناوی مەرقۆس بوو لەگەڵیان بوو.

### هەڵبژاردنی بەرناباو شاول

## 13

لەکۆمـەڵی باوەڕدارانی ئەنتاکیا هەندێ کەس پەیامـــبەری خـــودا بـــوونو هەندێکـــیش فێرکەربوون، لەوانە: بەرنابا، شەمعونی ناسراو

بـه ڕەش، لوکیوسی قەیرەوانی، مەناین کە لـە منداڵـیەوە لـەگـەڵ هێرۆدسـی فەرمانـڕەوای چـواریەکی ناوچـەکە بـوو بەخـێوکرابوو، هـەروەها شـاولیش. [2]کاتێ بە ڕۆژوو بوونو خوداوەندیـان دەپەرسـت، ڕۆحـی پـیرۆز پـێیووتن: (بەرناباو شاولـم بۆ تەرخان بکەن بۆ ئـەو کـارەی کە بانگم کردوون بۆی.) [3] ئیـنجا بەرۆژووبـوونو نوێژیانکردو دەستیان خستە سەریانو ڕەوانەیان کردن.

شاولو بەرنابا لەقوبرس

[4]کـاتێ ڕۆحـی پـیرۆز بـەرناباو شاولـی نـارد، بـەرەو بـەندەری سـولوکیە ڕۆیشـتن، لەوێشـەوە بـەرێگای دەریـا بـەرەو قوبـرس کەوتنەڕێ. [5]کاتێ گەیشتنە شاری سەلامیس، دەسـتیانکـرد بەبڵاوکـــردنەوەی ووشـەی خودا لـەکەنیشتی جوولـەکەکان، یۆحەنناشیان لـەگـەڵ بـوو بۆ یارمەتی. [6]بەهەموو دوورگەکە گـەڕان هـەتا گەیشـتنە شـاری پافۆس. لەوێ تووشـی جادوگـەرێکی جوولـەکـە بـوون کە پێغەمبەرێکی بەدرۆ بوو، ناوی باریشوع بوو، [7]لـەگـەڵ سـەرجیۆس پۆڵسـی فەرمانـڕەوای قوبـرس بـوو. فەرمانـڕەوایەکی زیـرەك بـوو، بـەرناباو شاولی بانگ کرد، داوای لـێکردن باسـی ووشـەی خـودای بـۆ بکـەن. [8]بـەڵام عەلـیمی جادوگەر، ئەمە وەرگێرانی ناوەکەی بـوو، بەربـەرەکانی کـردنو هـەوڵیدا بەهەر شـێوەیەك بـێ ڕێگـای بـاوەڕ لــە فەرمانـڕەوا بگرێ.

[9]ئیـنجا شـاول کـە ناوی پۆڵسیش بوو، پـــڕبوو لـــە ڕۆحـــی پـــیرۆز، ســـەیری جادوگەرەکـەی کردو [10]ووتی: (ئەی ڕۆڵەی شـەیتان، ئـەی ئـەوەی پـڕی لـەچـەوتـیو خـــراپە، ئـــەی دوژمـــــنی هـــــەموو ڕاستودروسـتیەك! بـۆ وازناهێـنی لەچەوت کـردنی ڕێگـای ڕاسـتەقینەی خوداوەنـد؟ [11] ئێسـتا دەسـتی خوداوەنـدت دێتە سەر، کوێر دەبیـتو بۆ ماوەیەك خۆر نابینی.) دەستبەجێ تەمـێکی تاریك کەوتە سەرچاوی، دەستیکرد بەگـەڕان بەدوای یەکێك تا دەستیبگرێ. [12] کـاتێ فەرمانـڕەوا ئەوەی بینی ڕوویدا باوەڕی هێـنا، چـونکە سەرسـام بـوو لـەفـێرکردنی خوداوەند.

لەئەنتاکیای بیسیدیە

[13]پۆڵـسو هاوڕێکـانی بـەناو دەریادا لـە پافوسەوە چوون بۆ پەرگە لـە پەمفیلیە. لەوێ یۆحەنـــنا لـــەپۆڵسو بـــەرنابا جـــیابووەوەو گەڕایـەوە بـۆ قـودس. [14]بـەڵام ئـەوان لـە پەرگەوە بۆ ئەنتاکیای سەر بە ناوچەی پیسیدیە ڕۆیشـتنو ڕۆژی شـەممە چـوونە کەنیشـتو دانیشـتن. [15]پـاش خوێـندنەوە لـەشەریعەتو

پەرتووکی پێغەمبەران، پێشەوایانی کەنیشتەکە بەشوێنیان ناردنو پێیان ووتن: (ئەی برایان، گەر شتێکتان هەیە دانیشتووانی پێهانبدەن بیلێن.) [16]پۆلس هەستاو بەدەست نیشانیداو ووتی:

(ئەی پیاوانی ئیسرائیل، ئێوەش ئەی ئەوانەی لەخودا دەترسن، گوێ بگرن: [17]خودای ئەم گەلە، گەلی ئیسرائیل، باوباپیرانمانی هەڵبژارد، کردنی بەگەلێکی مەزن لەمیسر، ئینجا بە بازوویەکی بەرزەوە لەوێ دەریهێنان. [18]هەروەها نزیکەی چل ساڵ لەبیابان بەخێوی کردن، [19]ئەوسا حەوت گەلی لەووڵاتی کەنعان لەناوبرد، ئەوانی کرد بە میراتگری زەویەکەیان. [20]ئەمە هەمووی نزیکەی چوارسەدو پەنجا ساڵی خایاند، پاش ئەمە خودا دادوەری بۆ دانان هەتا سەردەمی سامۆئیل پێغەمبەر. [21]ئینجا داوای پاشایان کرد، خوداش بۆ ماوەی چل ساڵ شاولی بۆ دانان، کە کوڕی قەیس بوو لە تیرەی بنیامین. [22]ئینجا خودا لایبرد، داودی بۆیان دانا وەك پادشا، ئەوەی شایەتی بۆ دەداو دەڵێ: {من داودی کوڕی یەسام دۆزیەوە، ئەو پیاوەی بەدڵی منە، بەخواستی من دەکات.} [23]خودا بۆ نەوەی ئیسرائیل لە تۆی داود ڕزگارکەرێکی نارد کە عیسایە بەپێی بەڵێنەکەی. [24]پێش هاتنی عیسا، یەحیا لەئاوهەڵکێشانی تۆبەی بۆ هەموو گەلی ئیسرائیل ڕاگەیاند. [25]یەحیا نزیك بوو لە کۆتایی خزمەتەکەی، کاتێ ووتی: بیردەکەنەوە ئاخۆ من کێم؟ من ئەو نیم، بەڵکو ئەوەی دوای من دێت، من شایانی ئەوەنیم قەیتانی پێڵاوەکانی بکەمەوە.

[26](ئەی برایان، ئەی نەوەی ئیبراهیم، هەروەها ئێوەش ئەی لەخواترسەکان، بۆ ئێمە پەیامی ئەم ڕزگاریە نێرراوە. [27]چونکە دانیشتووانی قودسو سەرۆکەکانیان مەسیحیان نەناسی، هەروەها ووتەکانی پێغەمبەرانیش ئەوەی هەموو ڕۆژێکی شەممە بۆیان دەخوێنرایەوە، هێنایانەدی کاتێ تاوانباریان کرد. [28]هەرچەندە ئەوان هیچ تاوانێکیان بەسەری نەگرت تاشایانی مردن بێ، لەگەڵ ئەوەشدا داوایان لەپیلاتۆس کرد بیکوژێ. [29]دوای ئەوەی هەموو ئەوەی لەسەری نووسرا بوو هێنایانەدی، لە دار هێنایانە خوارەوەو لەگۆڕ ناشتیان. [30]بەڵام خودا لەنێو مردووان هەڵیساندەوە، [31]ئینجا بۆ ڕۆژانێکی زۆر خۆی نیشانی ئەوانەدا کە لەناوچەی جەلیلەوە تا قودس لەگەڵی بوون. ئێستا ئەوان شایەتی ئەمە دەدەن لەبەردەم گەل.

[32](ئەوەتا ئێمەش وا مزگێنیتان دەدەینێ بەوەی خودا بەڵێنی دابوو بە باوباپیرانمان، [33]

ئێستا بۆ ئێمەی ڕۆڵەی ئەوان هێنایەدی، بەهەستانەوەی عیسا لەنێو مردووان هەروەك لەزەبووری دووەم نووسراوە:

{تۆ ڕۆڵەی منی،

من ئەمڕۆ بوومە باوکت.}

[34]ئەوەش کە خودا عیسای لەنێو مردووان هەستاندەوەو هەرگیز گەندەڵی نابینیٚ، لەم ووشانەی خودادایە:

{ئەو بەڵێنە پیرۆزو بیٚگومانەتان دەدەمیٚ کە بە داودم دابوو.}

[35]هەروەها لە شوێنێکی تر دەڵیٚ:

{تۆ نایەڵی تاقە پیرۆزەکەت گەندەڵی ببینێت.

}

[36]چونکە داود دوای ئەوەی خزمەتی نەوەکەی خۆی کرد بە خواستی خودا نووست، لەگەڵ باوباپیرانی نێژراو گەندەڵیشی بینی. [37]بەلاٚم ئەوەی خودا هەڵیساندەوە گەندەڵی نەبینی. [38]بۆیە ئەی برایان با زانراوبیٚ لاتان، بەهۆی عیساوەیە گوناە بەخشینتان پیٚڕاگەیێندرا، [39]هەر کەسێك باوەڕی پیٚبهێنی بیٚتاوان دەبیٚ لەوەی شەریعەتی موسا نەیتوانیٚ بیٚتاوانی بکات. [40]جا ئاگاتان لەخۆتان بیٚ با ئەوەی لەسەر زمانی پێغەمبەران ووتراوە بەسەرتان نەیەت:

[41]{سەیر بکەن ئەی گاڵتەجارەکان،

سەرسام بن‌و بمرن،

چونکە من لەڕۆژانی ئێوەدا کارێك دەکەم

گەر یەکێك بۆتانی بگێڕایەوە بڕواتان پێی نەدەکرد.})

[42]کاتیٚ پۆڵس‌و بەرنابا لەکەنیشت دەردەچوون، خەڵکەکە داوایان لیٚ کردن شەممەی داهاتووش بێنەوەو زیاتر قسەیان بۆ بکەن. [43]دوای کۆبوونەوەکە، زۆر لەجوولەکەکان‌و ئەوانەی ببوون بەجوولەکەو ترسی خودایان لەدڵ بوو دوایانکەوتن، ئەوانیش قسەیان لەگەڵ کردن‌و هانیاندان تا لەبەرەکەتی خودا بەردەوام بن.

[44]لە شەممەی داهاتوو نزیکەی هەموو دانیشتوانی شارەکە کۆبوونەوە تا گوێیان لەووشەی خودا بیٚ. [45]کاتیٚ جوولەکەکان خەڵکەکەیان بینی حەسوودی دایگرتن، دەستیانکرد بە جنێودان‌و کفرکردن‌و بەربەرەکانی قسەکانی پۆڵسیان کرد. [46]پۆڵس‌و بەرنابا بەچاونەترسیەوە قسەیان لەگەڵ کردن‌و ووتیان: (پێویست بوو لەپێشا بۆ ئێوە باسی ووشەی خودا بکرایە، بەلاٚم چونکە ئێوە ڕەتتانکردەوەو بڕیارتاندا ئێوە شایانی ژیانی هەتاهەتایی نین، ئەوەتا ئێمە بەرەو لای ناجوولەکەکان لادەدەین! [47]چونکە خوداوەند بەم شێوەیە ڕایسپاردین:

{من تۆم کردۆتە ڕووناکی میللەتان،

هەتا ڕزگاری بگەیەنی بەوپەڕی زەوی.})

48 کاتێ ناجوولەکەکان گوێیان لەمەبوو، زۆر دڵشادبوون، ستایشی ووشەی خوداوەندیانکرد. هەروەها هەموو ئەوانەی دەست نیشانکرابوون بۆ ژیانی هەتاهەتایی باوەڕیان هێنا.

49 جا بەم شێوەیە ووشەی خوداوەند لەهەموو ناوچەکەدا بڵاوبووەوە. 50 بەڵام جوولەکەکان ژنە بەڕێزە لەخواترسەکانو گەورە پیاوانی شاریان هاندا، بۆ چەوساندنەوەی پۆڵسو بەرنابا، تاکو دەریان کردن لەشارەکەیان. 51 جا ئەوانیش تۆزی پێیان تەکاندو بەرەو شاری ئیقۆنیە ڕۆیشتن. 52 بەڵام قوتابیەکان پڕبوون لەخۆشیو لەڕۆحی پیرۆز.

## گەشتێك بۆ ئیقۆنیە

## 14

لە ئیقۆنیە پۆڵسو بەرنابا وەك باوبوو چوونە کەنیشتی جوولەکەکان. بە شێوەیەك دەستیان کرد بە قسەکردن بۆ خەڵکەکە تا وای لێهات ژمارەیەکی زۆر لەجوولەکەو یۆنانی باوەڕیان هێنا. 2 بەڵام ئەو جوولەکانەی ڕازی نەبوون باوەڕ بهێنن، ناجوولەکەکانیان هانداو مێشکیان پڕکردن دژی برایان. 3 لەگەڵ ئەوەش پۆڵسو بەرنابا ماوەیەکی دوورو درێژ لەوێ مانەوە، بەهەموو چاونەترسیەك سەبارەت بەخوداوەند دەدوان، خوداوەندیش شایەتی بۆ ووشە بەرەکەتدارەکەی دەداو لایەنگیری دەکردن بەهۆی ئەو نیشانەو کارە سەرسوڕهێنەرانەی لەسەر دەستیان ڕوویدا. 4 ئیتر دانیشتووانی ئیقۆنیە بوون بە دوو بەشەوە، هەندێکیان لەگەڵ جوولەکەکان بوون، ئەوانی تریشیان لەگەڵ نێراوان. 5 کاتێ خەریكبوو جوولەکەکانو ناجوولەکەکان لەگەڵ سەرۆکەکانیان بەخراپە لەگەڵ نێراوان بجوڵێنەوەو بەردبارانیان بکەن، 6 ئیتر ئەوانیش بەوەیان زانیو هەردووکیان هەڵاتن بۆ شارەکانی لیسترەو دەربە لە لیکاونیە، هەروەها بۆ ناوچەکانی دەوروپشت، 7 لەوێش دەستیانکرد بەڕاگەیاندنی مزگێنی.

### چاکبوونەوەی ئیفلیجێك

8 لەشاری لیسترە کابرایەك بەزگماك ئیفلیج، کە هەرگیز بەپێی خۆی نەڕۆیشتبوو، دانیشتبوو. 9 کاتێ کابرا گوێی لەقسەکانی پۆڵس دەگرت، پۆڵس چاوی تێبڕیو سەیریکرد ئەو جۆرە باوەڕێکی تیایە دەبێتە هۆی چاکبوونەوە. 10 ئینجا بەدەنگێکی بەرز پێیووت: (هەستە بەپێوە ڕاوەستە!) ئیتر کابرا یەکسەر هەستایە سەرپێو دەستیکرد بە ڕۆیشتن. 11 کاتێ ئەوانەی لەوێبوون ئەوەی

پۆڵس کردی بینییان، بەزمانی لیکاونیە هاواریان‌کرد: (خودایەکان* شێوەی مرۆڤیان وەرگرتووەو هاتونەتە خوارەوە بۆ ناومان!) 12 جا بەرنابایان ناونا زیبۆس، پۆڵسیش هرمس، چونکە ووتاری دەدا.

13 لەدەروازەی شارەکەدا پەرستگای بتی زیبۆسی لێبوو، کاهینی پەرستگاکە لەگەڵ کۆمەڵێ لەدانیشتوانی شارەکە هات‌و گایان لەگەڵ خۆیان هێنابوو تا بیکەن بەقوربانی بۆیان.

14 بەڵام کاتێ دوو نێرراوەکە پۆڵس‌و بەرنابا ئەمەیان بیست جلەکانیان دڕی، خێرا چوونە لای خەڵکەکە، هاواریان کردو 15 ووتیان: (خەڵکینە بۆچی ئەمە دەکەن؟ ئێمەش مرۆڤین، لەبارەی سروشتیەوە وەکو ئێوەین، مزگێنیتان دەدەینێ واز لەم شتە هیچ‌و پووچانە بهێنن، بگەڕێنەوە بۆ لای خودای زیندوو، دروستکەری ئاسمان‌و زەوی‌و دەریاو هەموو ئەو شتانەی تیایەتی. 16 خودا لەنەوەکانی ڕابووردوودا وازی لەهەموو میللەتان هێنا بە ڕێگای خۆیان بڕۆن، 17 بەڵام خودا بێ شایەت وازی لەخۆی نەهێنا، لەڕێگای کردارە چاکەکانیەوە کە دەیکات کاتێ لەئاسمانەوە باران‌و وەرزی پڕ بەروبوومان دەداتێ‌و دڵمان لەخواردن‌و لەخۆشی تێردەکات.) 18 دوای هەوڵدانێکی زۆر بەم قسانە توانییان خەڵکەکە ڕازی بکەن کەوا قوربانیان پێشکەش نەکەن.

19 بەڵام هەندێ جوولەکە لەئەنتاکیاو ئیقونیەوە هاتن، خەڵکەکەیان هاندا، ئەوانیش پۆڵسیان بەردباران‌کرد تەنانەت وایانزانی مردووە، ئەوسا ڕایانکێشایە دەرەوەی شار. 20 جا کاتێ قوتابیەکان دەورەیاندا، هەستاو گەڕایەوە ناو شار. بۆ ڕۆژی دواتر لەگەڵ بەرنابا ڕۆیشت بۆ دەربە، 21 مزگێنیاندا بە دانیشتووانەکەی، ژمارەیەکی زۆریان بوون بە قوتابی. ئینجا گەڕانەوە بۆ لیسترەو ئیقۆنیەو ئەنتاکیە. 22 وورەی قوتابیەکانیان بەرزدەکردەوە، هانیاندەدان لەباوەڕ بچەسپێن، پێیان ڕاگەیاندن کە پێویستە بۆ چوونە ناو پاشایەتی ئاسمان بە تەنگانەی زۆردا بچن. 23 لە هەموو کۆمەڵە باوەڕدارەکانیش پیرانیان هەڵبژاردو دایاننان، ئینجا بەزمانی بەڕۆژووەوە نوێژیان کردو خەڵکەکەیان دایەدەست خوداوەند ئەوەی کە باوەڕیان پێ‌هێناوە.

### لەسوریا بۆ ئەنتاکیا گەڕانەوە

24 ئینجا بەناوچەی پیسیدیە ڕۆیشتن‌و

---

*خودایەکان: یۆنانیە کۆنەکان بت‌پەرست بوون‌و بڕوایان وابوو چەند خودایێك هەیە.

گەیشتنە ناوچەی پەمفیلیە. [25] سەبارەت بەووشەی خودا قسەیان‌کرد لە پەرگە، دواتر ڕۆیشتن بۆ ئەتالیە. [26] جا لەوێوە بەرێگای دەریا گەڕانەوە بۆ شاری ئەنتاکیا، لەوێ درانە دەست بەرەکەتی خودا بۆ ئەو کارەی تەواویان کردووە. [27] کاتێ گەیشتن، باوەڕدارەکانیان بانگ‌کرد بۆ کۆبوونەوە، هەواڵی ئەو شتانەیان هەموو پێڕاگەیاندن کە خودا بەهۆیئەوانەوە کردوویەتی، هەروەها چۆن دەرگای باوەڕ کراوەتەوە بۆ ناجوولەکەکان. [28] جا لەوێ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ قوتابییەکان مانەوە.

## 15

### کۆبوونەوەی نێرراوان لەقودس

هەندێ کەس لەناوچەی یەهودیەوە هاتن بۆ ئەنتاکیا، دەستیان‌کرد بە فێرکردنی برایانو ووتیان: (ڕزگارتان نابێ گەر بەپێی شەریعەتی موسا خۆتان خەتەنە نەکەن.) [2] ئەوسا پۆڵسو بەرنابا لەم بارەیەوە بێنەوبردەو دەمەقاڵێیەکی توندیان لەگەڵ کردن. ئینجا باوەڕدارانی ئەنتاکیا بڕیاریاندا پۆڵسو بەرنابا لەگەڵ هەندێ لەباوەڕداران بچنە لای نێرراوانو پیران لە قودس، تا لەو بابەتە بکۆڵنەوە. [3] پاش ئەوەی کۆمەڵی باوەڕداران ماڵئاوایییان لێ‌کردن، ڕۆیشتن بۆ قودس بەناو فنیقیەو سامیرە، لەوێ هەواڵیاندا بە برایان کەوا ناجوولەکەکانیش بە لای عیسا لایانداوە، بەمە خۆشییەکی زۆر لەنێو هەموو برایان بڵاوبووەوە. [4] کاتێ گەیشتنە قودس، کۆمەڵی باوەڕدارانو نێرراوانو پیران پێشوازیان لێ‌کردن، هەواڵی هەموو ئەو شتانەیان دانێ کە خودا بەهۆی ئەوانەوە کردبووی. [5] بەلاَم هەندێ لەوانەی سەر بەڕێبازی فەریسیەکانو باوەڕیان هێنابوو، هەستانو ووتیان: (پێویستە ئەو باوەڕدارانە خەتەنە بکرێنو بە شەریعەتی موسا هەڵسوکەوت بکەن.)

### پەترۆسو پیرانی قودس

[6] جا نێرراوانو پیران کۆبوونەوەیەکیان کرد بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە. [7] پاش بێنەوبردەیەکی زۆر، پەترۆس هەستاو ووتی: (ئەی برایان، ئێوە دەزانن پێش ماوەیەك، خودا لەناوماندا هەڵیبژارد کە لە دەمی منەوە ناجوولەکەکان ووشەی مزگێنی ببیستنو باوەڕبهێنن. [8] خوداش کە دەزانێ چی لەدڵدایە، شایەتییان بۆ دەداو ڕۆحی پیرۆزی پێبەخشیون وەك بە ئێمەی بەخشیوە. [9] ئەو بە هیچ شتێك جیاوازی لەنێوان ئێمەو ئەوان نەکردووە، بەباوەڕ دڵی پاك کردونەتەوە. [10] ئیتر بۆچی ئێوە خودا تاقیدەکەنەوەو نیرێك دەخەنە سەر شانی قوتابیان ئەوەی خۆمانو

باوباپیرانمـان نـەمانتوانی هەڵی‌گرین؟ [11]بەڵام لـەو بـاوەڕەداین ئـێمەو ئەوانـیش بـەهۆی بەرەکەتی عیسای خوداوەند ڕزگار دەبین.)

[12]ئـیتر ئامـادەبووان بێدەنـگ بـوون، دەستیان‌کرد بە گوێ‌گرتن لە بەرناباو پۆڵس، کـە هـەواڵی ئـەو نیشـانەو کـارە سەرسـوڕهێنەرانەیان ڕادەگـەیاند خودا لـەسەر دەسـتی ئەوان کردی لـەنێو ناجوولـەکەکان. [13]کـاتێ لەقسە بوونەوە، یاقوب ووتی: (ئەی بـرایان گوێـم لـێبگـرن: [14]شـەمعون پـێی ڕاگەیاندن چۆن خودا لـەسەرەتاوە بایەخی‌داوە بەوانەی جوولـەکە نین تا لـە نێوانیان میلـلـەتێك هەڵـبژێرێ نـاوی ئـەو هەڵـگـرێ، [15]ئەمـەش لەگـەڵ ووتـەی پێغەمـبەران ڕێـك‌دەکـەوێ، هەروەك لـەکتێبی پیرۆز نووسراوە:

{[16]دوای ئەمە دەگەڕێمەوە

چـادرە ڕووخاوەکـەی داود بنـیاد دەنێمەوە،

ئینجا ڕووخاوییەکانی بنیاد دەنێمەوەو

سەر لـەنوێ ڕاستی دەکەمەوە،

[17]تا گەلانی تر داوای خوداوەند بکەن،

هـەروەها هـەموو ئـەو میلـلـەتانەی ناوی منیان هەڵگرتووە،

ئەمـە ئەوەیـە کە خوداوەند دەیلێ ئەوەی ئەم شتانەی کردووەو

[18]هەر لـە سەرەتاوەش زانراون.}

[19]لـەبەرئەوە وای بە باش دەزانم قورسایی نەخەیـنە سـەر شـانی ئەوانەی جوولـەکە نین‌و ڕێگای خودایان گرتووە، [20]بەڵکو نامەیەکیان بـۆ بنووسـین، خۆیان دووربخەنەوە لـە گڵاوی بتەکان‌و لـە داوێن‌پیسی‌و لـە خواردنی گۆشتی ئـاژەڵی خنکێـنراو و خوێـن. [21]چـونکە هەر لـەکۆنـەوە موسـا لـەهـەموو شـارێك پـیاوی هـەبووە فـێرکردنەکانی ئەو ڕابگەێنن، هەموو ڕۆژێکـی شـەممەش لـە کەنیشـتەکان بیخوێننەوە.)

بڕیاری کۆبوونەوەی کۆمەڵەی باوەڕداران

[22]ئینجا نێرراوان‌و پیران‌و هەموو کۆمەڵی بـاوەڕداران بەباشیان زانی دوو پیاو هەڵبژێرن لـەناو بـرایان‌و بیانـنێرن بـۆ ئەنتاکـیا لـەگـەڵ پۆڵس‌و بەرنابا. ئیتر سیلاو یەهوزا کە نازناوی بەرسـابا بـوو هەڵـیان‌بـژاردن، ئەم دووانـەش ڕابـەر بـوون لـەنـێو بـرایان. [23]ئـەم نامەیەیان دایەدەستیان:

(لـە نـێرراوان‌و پیرانی‌و برایانەوە، بۆ ئەو بـرا باوەڕدارانـەی ناجـوولـەکـەن لـەناوچەکانی ئەنتاکیاو سوریاو کیلیکیە:

سـڵاوتان لـێبێ. [24]بیسـتمان هـەندێ کـەس هـاتوون بـۆ لاتـان لـەلایـەن ئـێمەوە بێ‌ئـەوەی ئـێمە ڕایـان‌سپێرین، بەهۆی قسەی ئەوانـەوە ناخۆشـی کەوتە ناوتانەوە، مێشکتان

ناڕەحەتبوو. [25]بۆیە بەباشمان زانی بەیەك بیروڕاوە پیاوانی هەڵبژێردراوتات بۆتان بنێرین لەگەڵ برایانی خۆشەویستمان بەرناباو پۆڵس، [26]ئەم پیاوانە گیان لەسەر دەستن لە پێناوی ناوی عیسای مەسیحی خوداوەندمان. [27]جا ئێمە یەهوزاو سیلامان بۆ ناردن تا هەمان شتتان بەدەم پێ ڕاگەیێنن. [28]چونکە ڕۆحی پیرۆزو ئێمە وامان بەباش زانی قورسایی نەخەینە سەر شانتان جگە لەوەی پێویستە، کە ئەمانەن: [29]خۆتان دووربخەنەوە لەو قوربانیانەی بۆ بت پێشکەش کراون، هەروەها لە خواردنی ئاژەڵی خنکێنراو خوێنو لەداوێن پیسی. گەر خۆتان پاراست لەمانە، شتی چاك دەکەن. خوداتان لەگەڵ.)

[30]ئینجا کە بەرێکران هاتن بۆ ئەنتاکیا، هەموو باوەڕدارانیان بانگ کرد بۆ کۆبوونەوەو نامەکەیان پێشکەش کردن. [31] کاتێ خوێندیانەوە زۆر دڵشاد بوون بەو هاندانەی تیایدا بوو. [32]هەروەها یەهوزاو سیلا کە پەیامبەری خودا بوون، زۆر قسەیان بۆ برایان کردو ورەیان بەرزکردنەوەو هانیاندان. [33]پاش ماوەیەك برایان بە ئاشتی ڕەوانەیان کردنەوە بۆ لای ئەوانەی ناردوبوویانن. [[34]بەلاّم سیلا بەلایەوە باشتر بوو لەوێ بمێنێتەوە.] [35]پۆڵسو بەرناباش هەر لەئەنتاکیا مانەوەو لەگەڵ خەڵکێکی زۆر خەریکی فێرکردنو ڕاگەیاندنی ووشەی خوداوەند بوون.

### لێكجیابونەوەی پۆڵسو بەرنابا

[36]پاش چەند ڕۆژێك پۆڵس بە بەرنابای ووت: (وەرە بابگەڕینەوە سەرێك لەبرایان بدەینو هەواڵیان بزانین لەهەموو شارێك کەوا ووشەی خوداوەندمان تیایدا ڕاگەیاندووە.) [37] ئینجا بەرنابا پێشنیاری کرد کەوا یۆحەننا کە نازناوی مەرقۆسە لەگەڵ خۆیان ببەن، [38]بەلاّم پۆڵس نەیویست لەگەڵ خۆیان بیبات، چونکە لەپەمفیلیە بەجێی هیشتبوونو لەگەڵیان نەڕۆیشت بوو بۆ کارکردن. [39]لەبەر ئەوە دەمەقاڵەیەکی توند کەوتە نێوانیان، تا وای لێهات لەیەکتری جیابوونەوە. ئەوسا بەرنابا مەرقۆسی لەگەڵ خۆی بردو بەرێگای دەریا بۆ قوبرس ڕۆیشتن، [40]بەلاّم پۆڵس سیلای هەڵبژارد لەگەڵی بڕوات، ئیتر ئەوێیان بەجێهێشتو برایان ئەوانیان بە بەرەکەتی خوداوەند سپارد. [41]ئینجا ڕۆیشتن بۆ ناوچەکانی سوریاو کیلیکیە تا کۆمەڵەکانی باوەڕداران بەهێز بکەن.

### تیمۆساوس لەگەڵ پۆڵسو سیلا

## 16

ئینجا پۆڵس گەیشتە شاری دەربە، پاشان

ڕۆیشت بۆ شاری لیسترە، لەوێ قوتابیەك هەبوو ناوی تیمۆساوس بوو، دایکی جوولەکە بوو باوەڕی بە مەسیح هێنابوو، باوکیشی یۆنانی بوو. [2]تیمۆساوس لە لیسترەو ئیقۆنیە ناوبانگی بەچاکە دەرکردبوو لەنێو برایان. [3]پۆڵس حەزی دەکرد تیمۆساوس لەگەڵی بێت، بەلاّم جوولەکەکانی ئەو ناوچەیە دەیانزانی باوکی یۆنانیە، لەبەر ئەوە پۆڵس بردیەو خەتەنەی کرد. [4]پۆڵسو هاوڕێکانی لەشارێکەوە دەچوون بۆ شارێکی ترو بڕیارەکانی نێرراوانو پیرانی قودسیان بەباوەڕداران ڕادەگەیاند تا گوێڕایەڵی بن. [5] جا کۆمەڵەکانی باوەڕداران لەباوەڕدا بەهێز دەبوون، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەیان زیادی دەکرد.

بینینی پۆڵس لە تروادا

[6]لەبەرئەوەی ڕۆحی پیرۆز ڕێی لێگرتن ووشەی خودا لەناوچەی ئاسیا بلاّوبکەنەوە، ئەوسا ڕۆیشتن بۆ ناوچەی فریجیەو غەلاّتیە. [7] بەلاّم کاتێ گەیشتنە نزیك ناوچەی میسیا بەرەو ناوچەی بیسینیە ڕۆیشتن، لێرە ڕۆحی عیسا ڕێگای نەدان، [8]ئەوسا بە میسیادا تێپەڕینو بەرەو شاری ترۆادا ڕۆیشتن. [9]پۆڵس شەو لەخەودا پیاوێکی بینی لەدانیشتووانی مەکدۆنیا لێی دەپاڕایەوەو دەیووت: (وەرە بۆ مەکدۆنیاو یارمەتیمانبدە.)

پۆڵسو سیلا لەفیلیپی

[10]ئەو کاتەی خەوەکەی بینی، دڵنیابووین کەوا خودا بانگی کردووین بۆ مزگێنیدان لەمەکدۆنیا، ئەوسا یەکسەر ڕۆیشتین بۆی. [11] جا بەڕێگای ئاو لە بەندەری تروادا بۆ دورگەی ساموسراکی ڕۆیشتین. بۆ ڕۆژی داهاتوو بەردەوام بووین لەگەشتەکەمان بەرەو بەندەری نیاپۆلیس، [12]لەوێشەوە بۆ شاری فیلیپی کە یەکەم شاری ناوچەی مەکدۆنیا بوو و جێنشینی ڕۆمانیەکان بوو، لەوێ چەند ڕۆژێك ماینەوە. [13]لەڕۆژی شەممەدا چووینە دەرەوەی شار بۆ سەر ڕووبارێك، لەوێ شوێنێك هەبوو نوێژی لێدەکرا. دانیشتین قسەمان لەگەڵ ئەو ژنانە کرد کە لەوێ کۆبووبوونەوە، [14]لەنێویان ژنێکی هەبوو گوێی دەگرت ناوی لیدیا بوو بازرگانی قوماشی گرانبەها بوو لەشاری سیاتیرا لەخواترس بوو، خوداوەند دڵی کردەوە تاگوێ لە قسەکانی پۆڵس بگرێ. [15]کاتێ خۆیو ئەندامانی خێزانەکەی لەئاوهەڵکێشران، بەگەرمی داوای لێکردین بە میوانی بچنە لای و پێیووتین: (گەر ئێوە بڕیارتان داوە من باوەڕدارم بەخوداوەند،

وەرنە ماڵەکەمو لەوێ بمێننەوە.) ئیتر ناچاری کردین.

### دەرکردنی ڕۆحی جادوگەرێتی

[16]ڕۆژێکیان کاتێ دەڕۆیشتین بۆ نوێژکردن، کچەکارەکەرێکمان تووش هات ڕۆحی جادوگەرێتی تیادابوو، بەهۆی جادوگەرێتییەوە پارەیەکی زۆری بەدەست دەهێنا بۆ خاوەنەکانی، [17]بەدوای پۆڵسو ئێمە کەوتو هاواری دەکرد: (ئەم مرۆڤانە خزمەتکاری خودای هەرەبەرزن، ڕێگای ڕزگاریتان بۆ ئاشکرا دەکەن.) [18]چەند ڕۆژێك ئەمەی کرد، تاکو پۆڵس زۆر بێزار بوو، لێرە ئاوڕی دایەوەو بەڕۆحە پیسەکەی ووت کە تیایدا بوو: (بەناوی عیسای مەسیح فرمانت پێدەدەم لێی وەرە دەرەوە!) ئەوسا یەکسەر ڕۆحەکە لێی هاتە دەرەوە.

### پۆڵسو سیلا لەبەندیخانە

[19]کاتێ خاوەنەکانی کچەکارەکەرەکە بینییان سەرچاوەی داهاتیان بڕاوە، ئەوسا پۆڵسو سیلایان گرت، ڕایانکێشان بۆ گۆڕەپانی شارەکە بۆ بەردەم فەرمانڕەوایان، [20]دایاننەدەست فەرمانڕەوایانو ووتیان: (ئەم دوو پیاوە جوولەکەیە لە شارەکەدا ئاژاوە دەنێنەوە، [21]نەریتێ بڵاودەکەنەوە کە ئێمەی ڕۆمانی نابێ وەریگرین یا کاری پێبکەین.) [22]ئیتر خەڵکەکە زۆر لێیان پڕبوون، فەرمانڕەواکان جلەکانیان دڕاندنو فرمانیاندا دارکاریبکرێن، [23]جا زۆر دارکاریان کردنو خستیاننە بەندیخانەوە، فەرمانیاندا بەسەرپەرشتیکەری بەندیخانەکە کەوا بیان خاتە ژێر چاودێریەکی زۆرەوە. [24]ئەوسا سەرپەرشتیاری بەندیخانەکە کە ئەم فەرمانە توندەی وەرگرت، هەر دووکیانی خستە ناو قوولایی زیندان، هەردوو قاچی هەردووکیانی خستە ناو قالبی تەختە.

### باوەڕهێنانی سەرپەرشتیکەری بەندیخانە

[25]لەنیوەی شەو پۆڵسو سیلا نوێژیان دەکردو گۆرانی ڕۆحیان بۆ خودا دەووت، بەندکراوەکانیش گوێیان لێبوو. [26]لەپڕ بومەلەرزەیەکی توند ڕوویدا گۆشەکانی بەندیخانەکەی هەژاند، دەستبەجێ هەموو دەرگاکانی کرایەوە، کۆتو زنجیری هەموو بەندکراوەکانیش کرایەوە. [27]بومەلەرزەکە سەرپەرشتیارەکەی خەبەرکردەوە، کاتێ بینی دەرگاکان کراوەتەوە وایزانی بەندکراوەکان ڕایان کردووە، شمشێرەکەی هەڵکێشا تاخۆی بکوژێ. [28]بەڵام پۆڵس هاواری کرد: (هیچ لەخۆت مەکە، ئێمە هەموومان لێرەین!) [29]

ئینجا کابرا داوای ڕووناکی کردو چووە ژوورەوە لەترسا هەموو لەشی دەلەرزی، چۆکی دا لەبەردەم پۆڵسو سیلا. [30] ئەوسا بردنیە دەرەوەو لێی پرسین: (گەورەکانم، پێویستە چی بکەم تا ڕزگارم بێ؟) [31] ئەوانیش وەڵامیاندایەوە: (باوەڕبهێنە بەعیسای خوداوەند، خۆتو خێزانەکەت ڕزگارتان دەبێ.) [32] جا سەبارەت بە ووشەی خوداوەند بۆ خۆیو هەموو خێزانەکەی دوان. [33] ئیتر کابرا بەو شەوە هەردووکیانی بردو برینەکانی تیمارکردنو دەستبەجێ خۆیو هەموو خێزانەکەی لەئاوهەڵکێشران. [34] کابرا بردنیە ماڵی خۆیو خواردنی بۆ دانان، خۆیو هەموو خێزانەکەی زۆر دڵشادبوون چونکە باوەڕیان بەخودا هێنا.

[35] سەر لەبەیانی فەرمانڕەواکان چەند سەربازێکیان نارد، تاکو فەرمانی ئازادبوونی پۆڵسو سیلا بە سەرپەرشتیاری بەندیخانەکە ڕابگەیێنن. [36] سەرپەرشتیاری بەندیخانەکە ئەم هەواڵەی بەپۆڵس داو ووتی: (فەرمانڕەوایان فەرمانی ئازادبوونتانیان دەرکردووە، ئێستا وەرنە دەرەوەو بە ئاشتی بڕۆن.) [37] بەڵام پۆڵس بە نارەزاییەوە ووتی: (بەئاشکرا لەبەردەمی خەڵك دارکاریان کردین بەبێ فەرمانی دادگا، هەرچەندە ڕەگەزنامەی ڕۆمانیشمان هەیە ئێمەیان خستە بەندیخانە، ئیتر ئێستا چۆن بە نهێنی دەرمان دەهێنن؟ نەخێر! با خۆیان بێن دەرمان بهێنن.) [38] ئەفسەرەکان ئەم قسانەیان بە فەرمانڕەواکان ڕاگەیاند، ئەوانیش ترسان کاتێ زانییان ئەو دووانە ڕۆمانین، [39] بەم شێوەیە هاتنو لێیان پاڕانەوە، ئازادیانکردنو داوایان لێکردن شارەکە بەجێبهێڵن.

[40] ئەوسا پۆڵسو سیلا لەبەندیخانە هاتنە دەرەوە بەرەو ماڵی لیدیا چوون، لەوێ برایانیان بینیو ووریان بەرزکردنەوە ئینجا ڕۆیشتن.

## پۆڵسو سیلا لەتەسالۆنیکی

## 17

دوای ئەوەی بەشاری ئەمفیپولیسو ئەپولونیادا ڕۆیشتن، پۆڵسو سیلا گەیشتنە تەسالۆنیکی، لەوێ کەنیشتی جوولەکەی لێبوو. [2] پۆڵس وەك کردبووی بە پیشە ڕۆیشت بۆ ئەوێ، سێ ڕۆژی شەممە لەسەر یەك لەکتێبی پیرۆز بەڵگەی بۆ دەهێنانەوە، [3] جا بۆی ڕوونکردنەوەو دەیسەلماند کەوا مەسیح دەبێ ئازار بکێشێو لەنێو مردووواندا زیندووبێتەوە. پێیووتن: ( ئەو عیسایەی من پێتانی ڕادەگەیێنم، مەسیح.) [4] هەندێ لە ئامادەبووان باوەڕیان هێناو لایەنگیری پۆڵسو سیلایان کرد، لەوانە ژمارەیەکی زۆر

یۆنـانی لـەخواتـرسو ژمارەیـەکی زۆر ژنـی خانـەدان. [5]جـا جوولـەکەکان حەسوودیان برد، ئەوسا هەندێ کوڕی خراپی سەرجادەیان هێنا، خەڵکیان کۆکـردەوەو دەستیانکرد بە هـاندانی خـەڵکی هەتا ئاژاوە کەوتە ناو شار، ئیـنجا هێرشـیان بـردە سـەر مـاڵی یاسـونو داوایـان لـێکـرد پۆڵسو سیلا بداتە دەست خەڵکەکـە. [6]ئـیتر کـاتێ ئەوانـیان لـەوێ نەدۆزیەوە، یاسونو هەندێ برایانیان ڕاکێشاو بردیانن بۆ لای فـەرمانڕەوایانی شار، هاواریان کـرد: (ئـەم پـیاوانە جیهانیان هەڵگێڕاوەتەوە، بـۆ شـارەکەی ئـێمەش هـاتوون، [7]یاسـون مـیوانداری کـردوون. ئـەوان سەرپێچـی فەرمانـەکانی قەیسـەر دەکـەن، دەڵـێن پادشـایەکی تـر هەیـە ناوی عیسایە.) [8]جا بەم قسـانە فەرمانـڕەواکانو خەڵکەکـەیان ووروژانـد. [9]ئـیتر فەرمانـڕەواکان لە یاسونو ئەوانـەی لەگـەڵی بـوون کەفالەتـنامەیان وەرگرتو ئازادیان کردن.

لەشاری بیریە

[10]بـرایان یەکسـەر پۆڵسو سـیلایان لەشـەودا نارد بۆ شاری بیریە، ئەوانیش لەوێ بـۆ کەنیشـتی جوولـەکـەکان چوون. [11]بەڵام جوولەکـەی بیریـە مێشـك کراوەتـربوون لەجوولەکەی تەسالۆنیکی، ووشەی خودایان زۆر بەپەرۆشـەوە وەرگـرت، هـەموو ڕۆژێك دەستیان دەکرد بە لـێکۆڵینەوەی کتێبی پیرۆز تـاکو دڵنیابن لەراستی مەسەلەکان. [12]لەوانە ژمارەیەکی زۆریان باوەڕیان هێنا، هەروەها لە یۆنانیەکانـیش زۆر ژنـی خانەدانو ژمارەیەکی زۆر لەپیاوان باوەڕیان هێنا.

[13]بـەڵام کـاتێ جوولەکـەی تەسالۆنیکی زانـیان پۆڵـس لـەبیریـە ووشـەی خـودا ڕادەگەیـنێ، دوایکـەوتنو لـەوێش دەستیان کـرد بـە ووروژانـدنـی خەڵکەکە. [14]دەست بەجێ هەندێ برایان پۆڵسیان بەرەو دەریا برد تـا گەشـت بکـات، بـەڵام سیلاو تیمۆساوس لـەوێ مانەوە. [15]ئەوانەی لەگەڵ پۆڵس بوون لەگـەڵـی ڕۆیشتن تا گەیاندیانە شاری ئەسینا، ئیـنجا گەڕانەوە پاش ئەوەی پۆڵس ڕایسپاردن بـە زووتـرین کـات سیلاو تیمۆساوس بێن بۆ لای.

پۆڵس لەئەسینا

[16]کـاتێ پۆڵـس لـە ئەسـینا چـاوەڕێی دەکـردن، شـارەکەی بیـنی پڕە لە بت، بەمە زۆر دڵتـەنگو تـۆڕەبـوو. [17]لـە کەنیشـت گفـتوگۆی دەکـرد لەگـەڵ جوولەکـەکانو خەڵکـە لەخواترسـەکان، هـەروەها ئەوانـەی هـەموو ڕۆژێ لە گۆڕەپانی شارەکەدا تووشی دەهـاتن. [18]ئەوسـا دەمەقاڵـە لـەنێوان ئـەمو

هەندێ لە فەیلەسوفە ئەپیقوریەکانو ڕەواقیەکان پەیدابوو، هەندێکیان ووتیان: (ئەم چەنەبازە مەبەستی چییە لە قسەکانی؟) هەندێکیتریشیان ووتیان: (ئەمە لەوە دەکات بانگەواز بۆ خودا نامۆکان بکات)، چونکە ئەو مزگێنی عیساو زیندووبوونەوەی دەدا. [19] ئینجا بردیان بۆ گردی ئاریۆپاگۆس‌و لێیان پرسی: (ئایا بۆمان هەیە بزانین ئەم فێرکردنە تازەیەی بانگەوازی پێدەکەیت چییە؟ [20] چونکە ئێمە قسەی سەیرت لێدەبیستین دەمانەوێ واتاکەی بزانین.) [21]لەو سەردەمە دانیشتوانی ئەسیناو ئەو بێگانانەی تیایدا دانیشتبوون، کاتی بێکاریان بەهیچ شتێك بەسەر نەدەبرد جگە لەلێکۆڵینەوەی بیروڕای تازە نەبێ.

ووتارێك لە ئاریۆپاگۆس

[22]پۆڵس لە ناوەڕاستی ئاریۆپاگۆسدا وەستاو ووتی: (ئەی دانیشتووانانی ئەسینا، دەتانبینم لەهەموو لایەکەوە زۆر ئیندارن. [23]لەکاتێکدا لەناو شارەکەتان دەگەڕام سەیری پەرستراوەکانتانم دەکرد، قوربانگەیەکم بینی لەسەری نووسرا بوو: (بۆ خودای نەناسراو.) جا من ئەو خودایەتان بۆ ڕادەگەیێنم کە دەیپەرستن‌و نایناسن. [24]ئەو خودایەی دروستکەری جیهان‌و هەموو ئەو شتانەی تیایەتی، ئەو لە پەرستگایەك دانانیشێ دەستی مرۆڤ دروستی کردبێ، چونکە خوداوەندی ئاسمان‌و زەوییە، [25]پێویستی بەوە نییە بەدەستی مرۆڤ خزمەتبکرێ، وەك بڵێی پێویستی بەشتێك بێ. ئەو بەهەموو مرۆڤێ ژیان‌و هەناسەو هەموو شتێك دەبەخشێ. [26] هەموو میللەتانی لە یەکێك دروست کردووە، تا لەسەر هەموو زەوی نیشتەجێبن. پێشتر کاتی دروستبوون‌و سنووری وولاتی بۆیان دەستنیشان کردووە، [27]تا بگەڕێن بەدوای خودا بەهیوای ئەوەی بیدۆزنەوەو ڕێگای ئەو بگرنە بەر، هەرچەندە ئەو دوور نییە لە هەر یەکێکمان. [28]چونکە ئێمە لەو دەژین‌و دەجولێینەوەو هەین، وەك هەندێ لە شاعیرەکانتان دەڵێن: (ئێمەش نەوەی ئەوین.) [29]جا چونکە ئێمە نەوەی خوداین، پێویستە سەیری خودایەتی نەکەین وەك بتێك لە زێڕ یا زیو یاخود بەرد کەوا مرۆڤ بتوانێ بیتاشێ یاخود دایڕێژێ بەو شێوەیەی بیری بۆ دەڕوات. [30]بۆیە خودا چاو دەپۆشێ لەسەردەمەکانی نەزانی، بەڵام ئێستا هەموو کەسێك لەهەموو شوێنێك ڕادەسپێرێ تۆبە بکەن، [31]چونکە ڕۆژێکی دیاری کردووە تیایدا حوکمبدرێ بەسەر جیهان بە دادپەروەری لەسەر دەستی پیاوێك بۆ ئەم مەبەستەی هەڵبژاردوە. بەڵگەش بۆ

ئەمە بە هەمووان دەدات، بەوەی لەنێو مردووان زیندووی کردەوە.)

[32]کاتێ ئامادەبووان گوێیان لەزیندووبوونەوەی مردووان بوو، هەندێکیان دەستیان کرد بە گاڵتەپێکردنی، بەڵام هەندێکی کەیان بە پۆڵسیان ووت: (دەمانەوێ جارێکی کە لەم بارەیەوە قسەمان بۆ بکەیت.) [33]ئیتر پۆڵس لەناویان چووە دەرەوە. [34]بەڵام هەندێکیان لایەنگیری پۆڵسیان کردو باوەڕیان هێنا. لەوانە دیونیسیوس کە ئەندامی ئەنجوومەنی ئاریۆپاگۆس بوو، هەروەها ژنێك ناوی داماریس بوو لەگەڵ چەند کەسێکی کە.

## پۆڵس لەکۆرنسوس

## 18

دوای ئەوەی پۆڵس ئەسینای بەجێهێشت، بۆ شاری کۆرنسوس ڕۆیشت. [2]لەوێ تووشی جوولەکەیەکی خەڵکی پونتس بوو، ناوی ئەکیلا بوو، تازە لەگەڵ پریسکیلای ژنی لە ئیتالیاوە هاتبوون، چونکە کلۆدیۆس فەرمانی دەرکردنی جوولەکەی دابوو لە ڕۆما، ئیتر پۆڵس چوو بۆ لایان. [3]لەلایان مایەوەو ئیشی لەگەڵیان کرد، چونکە ئەویش چادر دروستکەر بوو.

[4]پۆڵس هەموو ڕۆژێکی شەممە قسەی لەگەڵ ئەوانەدا دەکرد کە لە کەنیشتدا ئامادە دەبوون، هەوڵی دەدا باوەڕ بهێنێ بەجوولەکەو یۆنانیەکان. [5]کاتێ سیلاو تیمۆساوس لە ناوچەی مەکدۆنیاوە گەیشتنەجێ، پۆڵس بەتەواوی خۆی تەرخان کردبوو بۆ بلاوکردنەوەی ووشەی خودا، هەتا بۆ جوولەکەکانی دەرخات‌و شایەتی بدات کە عیسا مەسیحە. [6]بەڵام کاتێ دژایەتیان کردو کفریان کرد، کراسەکەی تەکاندو پێی‌ووتن: (خوێنی خۆتان لەسەر خۆتان. من بێتاوانم! لە ئێستا بەدواوە دەڕۆم بۆ لای ناجوولەکەکان.) [7]ئیتر پۆڵس ئەو شوێنەی لێی‌بوو بەجێی‌هێشت‌و بەمیوانی چووە ماڵی پیاوێك ناوی تیتۆس بیوستس بوو، کە لەخواترس بوو، ماڵەکەی بەتەنیشت کەنیشتەوە بوو. [8]لێرە کریسپۆسی سەرۆك کەنیشت خۆی‌و خاوخێزانی باوەڕیان بەخوداوەند هێنا. هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی کۆرنسوس کە گوێیان لەپۆڵس بوو باوەڕیان هێناو لەئاوهەڵکێشران.

## قسەبکەو بێدەنگ مەبە

[9]شەوێکیان خوداوەند لەخەودا بە پۆڵسی ووت: (مەترسە، بەڵکو قسە بکەو بێدەنگ مەبە، [10]من لەگەڵتم، کەس ناتوانێ ئازارت بدات، چونکە خەڵکێکی زۆرم هەیە لەم شارە.) [11]ئیتر پۆڵس ساڵێك‌و شەش مانگ لە

کۆرنسوس مایەوە خەڵکی فێری ووشەی خودا دەکرد. [12]لەو سەردەمەی گالیۆن فەرمانڕەوای وولاتی ئەخائیەی بوو، جوولەکەکان بەیەك بیروڕا دژی پۆڵس کۆبوونەوە، بردیان بۆ دادگا، [13]شکاتیان لێکردو ووتیان: (ئەم پیاوە هەوڵدەدات خەڵکەکە ڕازی بکات خودا بە شێوەیەك بپەرستن کە لەگەڵ شەریعەتمان ناگونجێ.) [14] کاتێ پۆڵس خەریك بوو بەرگری لە خۆی بکات، گالیون بە جوولەکەکانی ووت: (ئەی جوولەکەکان، گەر مەسەلەکە سەرپێچیەك یاخود تاوانێك بووایە، ئەوکاتە هۆیەك دەبوو تا گوێ لە شکاتەکەتان بگرم. [15]بەلام گەر مەسەلەکە شەڕەقسەیە لەسەر ووشەیەك یا ناوێك یاخود شەریعەت، ئەوا پێویستە خۆتان چارەسەری بکەن، من نامەوێ لەم مەسەلانەدا حوکمبدەم.) [16]ئیتر لە دادگا دەریکردن. [17]ئەوسا خەڵکەکە سۆستانیسی سەرۆکی کەنیشتەکەیان گرتو لەبەردەمی دادگا لێیاندا، بەلام گالیون گوێی بەمە نەدا.

گەڕانەوەی پۆڵس بۆ ئەنتاکیا

[18]پۆڵس ڕۆژانێکی زۆر لە کۆرنسوس مایەوە، دوای ئەوەی بەتەواوی سەری تاشی لە شاری کەنخەریا چونکە نەزری لەسەربوو، ماڵئاوایی لەبرایان کردو لەگەڵ پریسکلاو ئەکیلا بەڕێگای دەریا بەرەو سوریا ڕۆیشت. [19]کاتێ گەیشتنە ئەفەسۆس پۆڵس لەوێ بەجێیهێشتن، چووە ناو کەنیشتی جوولەکەکانو گفتوگۆی لەگەڵ کردن. [20] ئەوانیش داوایان لێکرد ماوەیەکی زیاتر لایان بمێنێتەوە، بەلام ئەو داوای لێبووردنی لێکردن، [21]ماڵئاوایی لێکردن و ووتی: (گەر خودا حەزبکات دەگەڕێمەوە لاتان.) ئینجا بەڕێگای دەریا ئەفەسۆسی بەجێهێشت، [22]لە قەیسەریە دابەزی، لەوێوە سەرکەوتو سلاوی لەکۆمەڵەی باوەڕداران کرد، ئینجا بەرەو شاری ئەنتاکیا دابەزی. [23]لەوێ ماوەیەك مایەوە، پاشان ڕۆیشت بۆ ناوچەکانی غەلاتیەو فریجیە، لەشارێکەوە دەچوو بۆ شارێکی کە هەتا ووڕەی هەموو قوتابیەکان بەرزکاتەوە.

ئەپۆلۆس لەئەفسۆسو ئەخائیە

[24]جوولەکەیەکی خەڵکی ئەسکەندەریە ناوی ئەپۆلۆسبوو، هات بۆ شاری ئەفەسۆس، [25] زمان پاراو و شارەزابوو لەکتێبی پیرۆز، بەباشی سەبارەت بە ڕێگای خوداوەند فێرکرابوو، هەروەها لەڕۆح چالاكبوو، زۆر بەووردی سەبارەت بەخوداوەند خەڵکی فێردەکردو دەدوا، هەرچەندە تەنها بە

لەئاوهەڵکێشانی یەحیای دەزانی. [26]کاتێ بەچاونەترسی لەناو کەنیشتدا دەستی‌کرد بە قسەکردن، پریسکیلاو ئەکیلا گوێیان لێ‌گرت، دوایی بردیانە لای خۆیانو بەووردتر ڕێگای خودایان بۆ ڕوون‌کردەوە. [27]جا ئەپۆلۆس بڕیاریدا بچێ بۆ ناوچەی ئەخائیە، برایان هانیانداو بۆ قوتابیەکانی ئەوێیان نووسی کەوا پێشوازی لێ‌بکەن. کاتێ گەیشتە ئەوێ یارمەتیەکی زۆری ئەوانەیدا کەبەهۆی بەرەکەتی خوداوە باوەڕیان هێنا بوو. [28]چونکە بە هێزی قسەکانی بەئاشکرا جوولەکەکانی بێ‌دەنگ دەکرد، بەکتێبی پیرۆز بۆی دەردەخستن کە عیسا مەسیحە.

## پۆڵس لەئەفەسۆس

## 19

کە ئەپۆلۆس لەکۆرنسوس بوو، پۆڵس پاش تێپەڕبوونی بە ناوچە بەرزەکان گەیشتە ئەفەسۆس. لەوێ هەندێ قوتابی بینی، [2] لێی‌پرسین: (ڕۆحی پیرۆزتان وەرگرت کاتێ باوەڕتان هێنا؟) وەڵامیاندایەوە: (نەخێر! تەنانەت ئێمە بوونی ڕۆحی پیرۆزمان نەبیستووە!) [3]جا لێی پرسین: (کەواتە لەسەر چ بناغەیەك لەئاوهەڵکێشران؟) ئەوانیش وەڵامیاندایەوە: (لەسەر بناغەی لەئاوهەڵکێشانی یەحیا.) [4]ئینجا پۆڵس ووتی: (لەئاوهەڵکێشانی یەحیا بۆ تۆبەکردن بوو، خەڵکی بانگ دەکرد تاکو باوەڕبهێنن بەوەی لەدوای دێت، واتە عیسا.) [5]کاتێ ئەمەیان بیست بەناوی عیسای خوداوەندەوە لەئاوهەڵکێشران. [6]هەروەها کاتێ پۆڵس دەستی خستە سەریان، ڕۆحی پیرۆز دابەزییە سەریانو بەزمانی ڕۆحی قسەیان‌کردو بەووشەی خودا دوان، [7]ژمارەیان نزیکەی دوانزە پیاو دەبوو.

[8]ماوەی سێ مانگ پۆڵس بەردەوام بۆ کەنیشت دەچوو، بەچاونەترسی قسەی دەکرد، لەگەڵ ئامادەبووان دەدواو هەوڵی‌دەدا ڕازیان بکات بەو ڕاستیانەی تایبەتە بە پاشایەتی خودا. [9]بەڵام هەندێکیان کەللەڕەقیان کردو نەیانویست باوەڕبهێنن، دەستیان‌کرد بەجنێودان بەم ڕێگایە لەبەردەم ئەوانەی کۆبووبوونەوە. جا پۆڵس لێیان جیابووەوەو بەتەنها قوتابییەکانی لەگەڵ خۆی برد، هەموو ڕۆژێك گفتوگۆی دەکرد لەقوتابخانەی پیاوێك ناوی تیرانۆس بوو، [10] دوو ساڵ لەسەر ئەمە بەردەوام بوو. بەم شێوەیە ووشەی خوداوەند بەهەموو دانیشتووانی ئاسیا گەیشت لەجوولەکەو یۆنانی.

[11]خوداش کاری سەرسوڕهێنەری مەزنی

لەسەر دەستی پۆڵس دەکرد، [12]تا وای لێهات خەڵکی دەستەسڕەکەی یاخود پارچەیەك لەجلەکانی کەلەبەری کردبێ دەیانبردو دەیانخستە سەر نەخۆشەکانیان، بەمە نەخۆشیەکانیان نەدەماو ڕوحە پیسەکانیان لێ‌دەهاتە دەرەوە.

## کوڕەکانی سکاوا

[13]هەندێ لەو جوولەکە گەڕۆکانەی ئیشیان دەرکردنی ڕۆحی پیس بوو هەوڵیاندا ناوی عیسای خوداوەند بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکار بهێنن‌و دەیانووت: (دەرتدەکەم بەناوی عیسا، ئەوەی پۆڵس ڕایدەگەێنێ.) [14]لەناو ئەوانە حەوت کوڕی سکاوا، جوولەکەیەکی سەرۆك کاهین بوو، ئەمەیان دەکرد. [15]جارێکیان ڕۆحە پیسەکە وەڵامی‌دانەوە: (من عیسا دەناسم‌و پۆڵسیش دەناسم، بەڵام ئێوە کێن؟) [16]ئینجا ئەو پیاوەی ڕۆحە پیسەکەی تێدابوو پەلاماری دان‌و زاڵبوو بەسەریان، بەشێوەیەك لەو ماڵەی تیایدا بوون بەڕووتی‌و برینداری ڕایان کرد.

[17]ئیتر ئەم هەواڵە بڵاوبووەوە لەناو ئەو جوولەکەو یۆنانیانەی لەئەفەسۆس دەژیان، ئەوسا هەموو ترس دایگرتن، بەمەش ناوی عیسای خوداوەند بەرزبووەوە. [18]هەروەها زۆر لەوانەی باوەڕیان هێنابوو هاتن، بەئاشکرا دانیانناو بەکردەوە خراپەکانیان. [19]زۆر لەوانەی خەریکی جادوگەرێتی بوون دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی پەرتووکەکانیان‌و لەبەردەم هەمووان سووتاندیانن، سەرجەمی نرخەکانیان پەنجا هەزار پارچە زیو بوو. [20]بەم شێوەیە ووشەی خوداوەند گەشەی دەکردو بەهێز دەبوو.

## شڵەژانێکی ترسناك لەئەفەسۆس

[21]دوای ئەوەی ئەم شتانە ڕوویدا، پۆڵس بڕیاریدا بچێ بۆ ناوچەی مەکدۆنیاو ئەخائیە، کاتێ بەڕێگاوە بوو بۆ قودس، ووتی: (پاش ئەوەی لەوێ مامەوە پێویستە بچم سەرێك لە ڕۆماش بدەم.) [22]جا پۆڵس دووان لە یاریدەدەرەکانی نارد بۆ مەکدۆنیا کە تیمۆساوس‌و ئەراستۆس بوون، خۆشی ماوەیەك لەناوچەی ئاسیا مایەوە.

[23]لەو کاتەدا شڵەژانێکی ترسناك لەئەفەسۆس پەیدا بوو بەهۆی ئەم ڕێگایە. [24]لەوێ زێڕنگەرێك هەبوو ناوی دیمتریوس بوو، پەرستگای بچووکی زیوی دروست دەکرد بۆ بتی ئەرتامیس، بەهۆی ئەمەوە خۆی‌و کرێکارەکانی پارەیەکی چاکیان دەستدەکەوت. [25]کابرا، کرێکارەکانی‌و زێڕینگەرەکانی تری بانگ کردو پێی ووتن:

(دەزانن داهاتمان بەستراوە بەم پیشەیەمانەوە، [26]ئێوە دیوتانەو بیستوتانە ئەم پۆڵسە ڕێگای لەخەڵکێکی زۆر تێك داوە، تەنها لەئەفەسۆس نا بەڵکو نزیکەی لەهەموو ناوچەی ئاسیا، ڕازی کردوون کە ئەوانەی بە دەست دروست دەکرێن خودانین. [27]ئەمەش تەنها زیانی بۆ ئیشەکەمان نییە، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی پەرستگای ئەرتامیسی خواژنی گەورەمان گەورەیەتی نەمێنێ. جا دەترسین نرخو مەزنی نەمێنێ، ئەوەی هەموو دانیشتووانی ئاسیاو هەموو جیهان دەیپەرستێ.)

[28]کاتێ گوێیان لەم قسانە بوو تووڕە بوونو دەستیانکرد بەهاوار کردن: (مەزنە ئەرتامیسی ئەفەسۆسیەکان!) [29]ئەم شڵەژانە هەموو شارەکەی گرتەوە خەڵکێکی زۆر پەلاماری گایوسو ئەرستارخۆسی مەکدۆنییاندا کە هەردووکیان هاوڕێی پۆڵس بوون لەگەشتدا، ڕایانکێشان بۆ ناو گۆڕەپانی شانۆی شارەکە.

[30]پۆڵس ویستی خۆی قسە لەگەڵ خەڵکەکە بکات، بەڵام قوتابیەکان ڕێگای ئەمەیان لێگرت، [31]هەروەها هەندێ لەگەورە پیاوانی ئاسیا کە دۆستی بوون ناردیانە لای تا داوای لێبکەن خۆی نزیك نەکاتەوە لەشانۆکە. [32]ئیتر شتەکە لە خەڵکەکە تێکچوو بوو، هەندێکیان هاواری شتێکیان دەکرد، هەندێکی کەشیان هاواری شتێکی تر، تەنانەت زۆربەیان هۆی کۆبوونەوەکەیان نەدەزانی. [33]لەناو خەڵکەکەدا جوولەکەیەك هەبوو ناوی ئەسکەندەر بوو، جوولەکەکان پاڵیان پێوەنا بۆ پێشەوە، هەندێکیان بانگیان کرد بۆ قسەکردن. بەدەست ئیشارەتی بۆ کردن کە دەیەوێ قسە بۆ خەڵکەکە بکات. [34]بەڵام کە زانییان ئەو جوولەکەیە، بۆ ماوەی دوو کاژێر هەموویان بەیەکەوە هاواریان دەکردو دەیانووتەوە : (مەزنە ئەرتامیسی ئەفەسۆسیەکان!)

[35]لە دوایدا نووسەری کاروباری شارەکە توانی خەڵکەکە هێمن بکاتەوە، ووتی: (ئەی دانیشتووانی ئەفەسۆس، کێ هەیە دان نەنێ بەوەی ئەفەسۆس شاری پاسەوانی پەرستگای ئەرتامیسی خواژنی گەورە نییە لەگەڵ ئەو پەیکەرەی لە ئاسمان هاتۆتە خوارەوە؟ [36]لەبەرئەوەی بیروڕای جیاواز نییە لەم شتەدا، پێویستە هێمن بنەوەو بەخێرایی هیچ شتێك نەکەن. [37]ئێوەش ئەم دوو پیاوەتان هێناوە لەگەڵ ئەوەی پەرستگایان ڕووتنەکردۆتەوەو کفریان سەبارەت بە خواژنەکەمان نەکردووە. [38]بەڵام ئەگەر دیمتریوسو هاوڕێیانی نارەزاییەکیان هەیە، ئەوا دادگاو دادپرسمان هەیە با نارەزایینامە

پێشکەش بەدادپرس بکەن. [39]گەر هاتوو نارەزاییەکی کەتان هەبوو، لە کۆبوونەوەیەکی یاساییدا سەیر دەکرێ. [40]چونکە هەموومان لەمەترسی داین، لەسەر دروستکردنی ئەم شڵەژانەو ئەوەی ئەمڕۆ ڕوویدا، ئێمە هیچ بەهانەیەکمان نییە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم کۆبوونەوەیە.) [41]ئیتر بەم قسانە کۆمەڵەکەی ڕەوانەکرد.

# 20

## پۆڵس لەمەکدۆنیاو یۆنان

دوای ئەوەی ئەو شڵەژانە لەئەفەسۆس تەواوبوو، پۆڵس قوتابیەکانی بانگ کرد، وورەی بەرزکردنەوەو ماڵئاوایی لێکردن، ئەوسا بەرەو ناوچەی مەکدۆنیا ڕۆیشت. [2] کاتێ بەو ناوچانەدا تێدەپەڕی، لە هەموو لایەك وورەیانی بەرز دەکردەوە. پاشان گەیشتە یۆنان، [3]لەوێ سێ مانگی بەسەربرد، بەڵام کاتێ خۆی ئامادەکرد بەرێگای دەریا بچێ بۆ سوریا، زانی جوولەکەکان پلانێکیان داناوە بۆ کوشتنی ئەوسا بڕیاریدا بەرێگای مەکدۆنیا بگەڕێتەوە. [4]لەگەشتەکە ئەمانەی لەگەڵ بوو: سوپاترۆسی کوڕی پیرۆ خەڵکی بیریە، ئەرستارخۆس‌و سەکوندۆسی تەسالۆنیکی، گایۆسی دەربەو تیمۆساوس، تیخیکۆس‌و ترۆفیمۆسی ناوچەی ئاسیا. [5] ئەمانە پێشمان کەوتن‌و چاوەڕێیان کردین لەترواوادا. [6]بەڵام ئێمە دوای جەژنی فەتیرە، بەرێگای دەریا چووین بۆ فیلیپی، پاش پێنج ڕۆژ گەیشتینە ترواستروادا، چووینە لایان‌و حەوت ڕۆژ لەوێ ماینەوە.

## پۆڵس لەتراوس

[7]ڕۆژی یەکشەممە کۆبووینەوە بۆ نان لەتکردن، پۆڵس قسەی بۆ ئامادەبووان کرد، تا نیوەی شەو درێژەی بە ووتارەکەیدا، چونکە بەیانی دەیویست بڕوات. [8]کۆبوونەوەکەمان لەژوورێك بوو لەنهۆمی سەرەوە، چرای زۆری لێ داگیرسابوو. [9]لەوێدا گەنجێك هەبوو ناوی یوتیخۆس بوو لەناو پەنجەرەکەدا دانیشتبوو، خەوێکی قورس دایگرتبوو، پۆڵسیش بەردەوام بوو لەسەر ووتارە درێژەکەی، جا کوڕە لەنهۆمی سێهەم کەوتەخوارەوەو بە مردوویەتی هەڵیان گرتەوە. [10]لێرە پۆڵس هاتەخوارەوە خۆیدا بەسەری، گرتیە باوەشی‌و ووتی: (مەپەشۆکێن، هێشتا ژیانی تیاداماوە!) [11]دوایی پۆڵس چووە سەرەوەو نانی لەتکردو خواردی، ئیتر هەتا بەرەبەیان بەردەوام بوو لەووتارەکەی، پاشان لەوێ ڕۆیشت. [12]ئەوسا کوڕەکەیان بەزیندوویەتی هێنا، ئەمەش دڵنەواییەکی گەورەبوو بۆیان.

لە ترواداوە بۆ میلیتوس

[13]بەڵام ئێمە بەکەشتی بەرەو شاری ئەسۆس ڕۆیشتینو پێش پۆڵس کەوتین، لەوێ چاوەڕێی گەیشتنمان کرد بەپێی ئەو پلانەی بۆی دانابووین بە پێ بەدوامان بێت. [14]کاتێ پێمان گەیشت، لەگەڵ خۆمان بردمان، بەناو ئاو بەرەو بەندەری میتیلینی ڕۆیشتین. [15]لەوێش ڕۆیشتین، بۆ بەیانی گەیشتینە بەرامبەر خیۆس، بۆ ڕۆژی دووەمیش گەیشتینە سامۆس [دوای لەترۆگیلیۆن مایەنەوە]. هەروەها لەڕۆژی سێهەم گەیشتینە میلیتۆس. [16]جا پۆڵس بڕیاری دابوو بەئەفەسۆسدا تێنەپەڕێت، نەوەك دوای لێبکەن ماوەیەك لەهەرێمی ئاسیا بمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی پەلەی بوو بەڵكو بتوانێ لەڕۆژی پەنجاهەمین بگاتە قودس.

ووتەی پۆڵس بۆ پیرانی ئەفەسۆس

[17]لەمیلیتوسەوە پۆڵس ناردی بە شوێن پیرانی كۆمەڵی باوەڕدارانی ئەفەسۆس. [18]كاتێ گەیشتنە لای پێیووتن: (دەزانن هەڵسوكەوتم چۆن بوو لەگەڵتان بەدرێژایی ئەو كاتەی لەگەڵتان بەسەرمبرد، لەیەكەم ڕۆژەوە كە هاتمە ناوچەی ئاسیا، [19]خزمەتی خوداوەندم دەكرد بەفرمێسكی زۆرو بەملكەچییەوە، هەروەها دەزانن چەند ناخۆشیم تووش هات بەهۆی پیلانی جوولەكەكانەوە. [20]لەهەر شتێك سوودی هەبێ كەموكوڕیم نەكردووە لەگەڵتان، بەڵكو ماڵ بەماڵو بەئاشكرا بۆم باسكردوونو فێرمكردوون. [21]هەروەها شایەتیم بۆ جوولەكەو یۆنانیەكان داوە تا تۆبە لەلای خودا بكەنو باوەڕبهێنن بەعیسای خوداوەندمان. [22]جا ئەمڕۆ بەڕۆحی پیرۆزەوە بەستراومو دەچم بۆ قودس، لەوێ نازانم چی دێتە ڕێم. [23]ڕۆحی پیرۆز لەهەموو شارێك بۆی ڕۆیشتووم ئاگاداری كردووم لەو گرتنو ناخۆشیانەی چاوەڕێم دەكات. [24]بەڵام نرخم بۆ ژیانی خۆم دانەناوە، خۆشم بەگرانبەها دانانێم، تا بەخۆشییەوە ئەم پێشبڕكێیەو ئەو خزمەتەی لەعیسای خوداوەند وەرمگرتووە تەواوی بكەم، هەتا شایەتی بۆ مزگێنی بەرەكەتی خودا بدەم. [25]ئێستا من دەزانم لەئەمڕۆ بەدواوە دەموچاوم نابینن، ئێوە ئەوانەن كە بەناو هەمووتان دەگەڕامو پاشایەتی خودام ڕادەگەیاند. [26]لەبەرئەوە ئەمڕۆ شایەتی بۆ هەمووتان دەدەم، من لەخوێنی هەمووتان بێتاوانم، [27]چونكە دوانەكەوتم لەڕاگەیاندنی هەموو مەبەستەكانی خودا بۆتان.

[28](كەواتە ئاگاتان لەخۆتانو لەمێگەل بێ ئەوەی ڕۆحی پیرۆز ئێوەی وەك چاودێر بۆ داناوە، تا شوانی كۆمەڵی باوەڕدارانی خودا

بکەن ئەوەی بەخوێنی ڕۆڵەکەی بەدەستی هێناوە. [29]من دەزانم پاش ڕۆیشتنم گورگی ڕفێنەر دێنە ناوتان، بەزەییان بە مێگەلەکە نایەتەوە. [30]هەروەها لەناوتان چەند کەسێك پەیدا دەبن ڕێگای خوارووچەوت فێر دەکەن، تا قوتابیەکان بۆلای خۆیان ڕاکێشن. [31] لەبەرئەوە ئێشك بگرنو بیربکەنەوە، من بۆ ماوەی سێ ساڵ شەو و ڕۆژ بە فرمێسکەکانی چاوم ئامۆژگاری یەکە یەکەتانم دەکرد. [32]جا ئێستا دەتاندەمە دەست خوداو ووشەی بەرەکەتی، ئەو توانای ئەوەی هەیە بنیادتان بکاتو لەگەڵ ئەوانەی پیرۆزکراون میراتتان پێبەخشێ.

[33](ڕۆژێ من حەزم لەزیو یا زێڕ یا جلی کەس نەکرد. [34]ئێوە دەزانن من بەم دوو دەستە ئیشم کردووە تا پێویستی خۆمو هاوڕێکانم بەدەست بهێنم. [35]من بەڕوونی بۆم دەرخستن چۆن پێویستە ڕەنج بدەن، تا یارمەتی نەداران بدەنو ووشەکانی عیسای خوداوەندتان بیربکەوێتەوە کە دەڵێ: (بەخشین پیرۆزترە لەوەرگرتن.) [36]دوای ئەم قسانە پۆڵس لەگەڵ هەموویان چۆکیدادا و نوێژی کرد. [37]ئەوسا هەموویان زۆر گریان، باوەشیان کرد بەپۆڵسداو بەگەرمی ماچیانکرد. [38]ئیتر زۆر دڵتەنگ بوون، بەتایبەتی چونکە پێیووتن جارێکی کە دەموچاوی نابیننەوە، ئینجا تا لای کەشتیەکە لەگەڵی ڕۆیشتن.

## پێشبینیەکان دەربارەی ئازاری پۆڵس

# 21

کاتێ کە لەیەکتری جیابووینەوە، بەڕێکی بەڕێگای دەریادا بەرەو کوس ڕۆیشتین. بۆ ڕۆژی داهاتوو گەیشتینە دورگەی ڕودس لەوێشەوە بەرەو دورگەی پاترا ڕۆیشتین، [2] لەوێ کەشتیەکمان بینی بۆ فینیقیە دەچوو، سواری بووینو ڕۆیشتین. [3]کاتێ دورگەی قوبروسمان بینی بە دەستە چەپ بەجێمان هێشت، جا بەردەوام بووین لەگەشتەکەمان بەرەو سوریا، ئەوسا گەیشتینە بەندەری سورو لێی دابەزین، چونکە کەشتیەکە لەوێ بارەکەی بەتاڵ دەکرد. [4]کاتێ لەوێ قوتابیەکانمان دۆزیەوە، حەوت ڕۆژ لایان ماینەوە، ئەوانیش بەهۆی ڕۆحی پیرۆزەوە ئامۆژگاری پۆڵسیانکرد نەڕوات بۆ قودس. [5]کاتێ ماوەی مانەوەمان لایان تەواو بوو ڕۆیشتین تا گەشتەکەمان تەواو بکەین، تادەرەوەی شار خۆیانو ژنو منداڵیان لەگەڵمان هاتن. لەسەر قەراغی دەریا چۆکماندادا و نوێژمان کرد، [6]جا یەکترمان بەخودا سپارد، سواری کەشتیەکە بووین، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان.

[7]جا کە بەردەوام بووین لە گەشتەکەمان، لەشاری سورەوە ڕۆیشتین بۆ شاری پتولمایس، لــەوێ ســلاوّمان لەبــرایان ئ‌کردنو ڕۆژێك لــەلایان مایــنەوە. [8]بۆ ڕۆژی داهاتوو چووین بـۆ شاری قەیسەریە بەمیوانی لەماڵی فیلپۆسی مزگێنــیدەر مایــنەوە، کــە یەکــێك بــوو لــەو حــەوت خــزمەتکارەکە، [9]ئەویش چوار کچی هــەبوو بەووشــەی خــودا دەدوان. [10]پــاش ئەوەی ئێمە چەند ڕۆژێك لەوێ بووین، ئینجا لەناوچــەی یەهودیــەوە یەکــێك هــات نــاوی ئاگــابۆس بــوو پەیامــبەری خــودا بــوو. [11] پشتێنەکەی پۆڵسی هەڵگرت، دەستو قاچی خۆی پێ‌بەستەوەو ووتی: (ڕۆحی پیرۆز دەڵێ خــاوەنی ئەم پشتێنە، جوولــەکەکان بەم شێوەیە لــەقودس دەیبەســتنەوە، دەیدەنــە دەســتی بــێگانەکان.) [12]کــاتێ ئەمــەمان بیست، ئێمەو ئەوانــەی دانیشــتووی ئــەوێ بــوون، داوامان لــەپۆڵــس کــرد نەچێ بۆ قودس، [13]بەلاّم ئەو پــێیووتین: (ئــەوە چــیتانە دەگــرینو دڵــم دەشــکێنن؟ من ئامادەم نەك تەنها بەند بکرێم، بــەڵکو لــەبــەر نــاوی عیســای خوداوەند لە قــودس بشــمرم.) [14]ئــیتر نەمانــتوانی ڕازی بکــەین، بێ‌دەنــگ بوویــنو ووتمــان: (بــا بــەخواســتی خوداوەند بێ.) [15]دوای ماوەیەك خۆمان ئامادەکردو بەرەو قودس ڕۆیشتین، [16] لەگــەڵ هــەندێ لــەقوتابیانی شاری قەیسەریە، ئــێمەیان بــردە مــاڵی مەناســونی قوبروسی کە قوتابیەکی کۆن بوو، تا لەوێ بمێنینەوە.

لەقودس

[17]کــاتێ گەیشــتینە قــودس، بــرایان بــە خۆشــیەوە پێشــوازیان لێ‌کــردین. [18]ڕۆژێ دوای گەیشــتنمان پۆڵــس لەگەڵمان هات بۆ لای یــاقوب هــەموو پیرانیش لەوێ بوون. [19] پۆڵــس ســلاّوی لێ‌کردن، ئەوسا یەك لەدوای یــەك هــەواڵی هــەموو ئــەو شــتانەی دانێ کە خــودا کردوویەتی لەنێوان ئەوانەی جوولەکە نــین بــەهۆی خــزمەتی ئــەو. [20]کــاتێ ئــەم هەواڵانــەیان بیســت، ستایشی خودایان کردو پێــیانووت: (ئــەی بــرا دەبینی چۆن هەزاران جوولەکــە باوەڕیان هێنا، هەموویان دڵگەرمن بـۆ شــەریعەتی موسا. [21]وایان بیستووە کە تۆ ئــەو جوولــەکانــەی لەنــێوان بــێگانەدا دەژیــن بانگــیان دەکەیــت بــۆ هەڵگەڕانــەوە لــە شــەریعەتی موســا، هــەروەها ڕایــاندەســپێری مــنداڵەکانــیان خەتەنــە نەکــەنو پەیــڕەوی خووڕەوشــتی باوباپیریــان نەکــەن. [22]کەواتــە دەبــێ چــی بکرێ، چونکە بێ‌گومان هەواڵی هاتنــت دەبیســتن؟ [23]جــا ئــەوە بکــە کە پێت دەڵــێین: چوار پیاومان لایە نەزریان لەسەرە، [24]بیانــبە بــۆ پەرســتگاو خــۆت پــاك بکــەوە لەگەڵــیان، نــرخی سەرتاشــینەکەیان بــۆ بدە،

ئەوسا هەموو دەزانن ئەوەی دەربارەی تۆ بیستوویانە ڕاست نییە، تۆش وەك ئەوان لەسەر شەریعەت دەڕۆیت. [25]بەڵام بۆ ئەو باوەڕدارانەی ناجوولەکەن، نامەیەکمان ناردووە تیایدا ڕامانسپاردون ئەو قوربانیانەی بۆ بتەکان دەکرێ نەیخۆن، هەروەها خوێنو گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی خنکێنراونو داوێن پیسیش نەکەن.)

[26]ڕۆژێ دوای ئەوە پۆڵس چوار پیاوەکەی برد، پاش ئەوەی خۆی پاککردەوە لەگەڵیان، چوو بۆ پەرستگا هەتا ئەو بەروارە تۆمار بکات کە هەفتەی پاکبوونەوە کۆتایی پێ دێت، هەروەها لەجیاتی هەر یەکێکیان ئەو قوربانیەی پێویستە پێشکەشی بکات.

## گرتنی پۆڵس

[27]کاتێ خەریك بوو حەوت ڕۆژی پاکبوونەوە تەواوبێ، هەندێ جوولەکەی ناوچەی ئاسیا پۆڵسیان بینی لەپەرستگا، خەڵکەکەیان هانداو گرتیان، [28]ئینجا هاواریانکرد: (فریاکەون ئەی پیاوانی ئیسرائیل! ئەمە ئەو پیاوەیە لەهەموو لایەکەوە خەڵك فێری شتێك دەکات دژی گەلو شەریعەتەکەمانو ئەم شوێنەش، تەنانەت یۆنانی هێناوە بۆ پەرستگاو ئەم شوێنە پیرۆزەی گڵاو کردووە!) [29]ئەمەیان ووت چونکە ترۆفیمۆسی خەڵکی شاری ئەفەسۆسیان لەگەڵ پۆڵس بینی بوو، جا وایانزانی لەگەڵ خۆی بردوویەتی بۆ پەرستگا.

[30]ئەوسا هەموو خەڵکی شار وورووژان، خەڵکەکە پەلاماری پۆڵسیانداو ڕایانکێشایە دەرەوەی پەرستگا، یەکسەر دەرگاکەیان داخست، [31]کاتێ ئەوان هەوڵی کوشتنیان دەدا، فەرماندەی ڕۆمانی بیستی کەوا قودس هەمووی وورووژاوە. [32]دەستبەجێ کۆمەڵێ سەربازو سەرپەلێکی بردو خێرا بۆ لایان ڕۆیشت. کاتێ جوولەکەکان فەرماندەو سەربازەکانیان بینی وازیان هێنا لەلێدانی پۆڵس. [33]ئیتر فەرماندەکە لێی نزیکبووەوەو گرتی، فەرمانیدا بە سەربازەکانی بە دوو زنجیر بیبەستنەوە، دەیویست بزانێ ئەمە کێیەو چی کردووە، [34]بەڵام هەندێکیان شتێکیان دەووتو هەندێکی کەیان شتێکی کە. جا کە نەیتوانی ڕاستی شتەکە دەربخات بەهۆی وورووژانی خەڵکەکەوە، فەرمانیدا پۆڵس ببرێ بۆ سەربازگە. [35]کاتێ سەربازەکان گەیاندیانە سەر پێپلیکانەکان ناچاربوون هەڵیگرن تا ڕزگاری بکەن لەدەستی خەڵکەکە، [36]چونکە ئەو خەڵکەی کۆببونەوە دوایکەوتنو هاواریان دەکرد: (با لەناوبچێ!)

[37]پێش ئەوەی پۆڵس بچێتە سەربازگەکە، بە فەرماندەکەی ووت: (ئایا دەتوانم شتێکت

پێ بڵێم؟) فەرماندەکە لێی پرسی: (چۆن! یۆنانی دەزانی؟) [38]کەواتە تۆ ئەو پیاوە میسریە نیت ماوەیەك لەمەوبەر ئاژاوەی نایەوە، بەچوار هەزار پیاوکوژەوە چوو بۆ بیابان! [39] ئەوسا پۆڵس ووتی: (نەخێر، من جوولەکەی تەرسوسم کە شارێکی بەناوبانگە لە ناوچەی کیلیکیە. داوات لێدەکەم ڕێگام بدەی قسە لەگەڵ خەڵکەکە بکەم.) [40]ئیتر فەرماندەکە ڕێگایدا، پۆڵس لەسەر پێپلیکانەکان ڕاوەستا، بەدەست نیشانەی دا بە خەڵکەکە، کاتێ بێدەنگی باڵی کێشا بەو ناوە، دەستیکرد بەقسەکردن بۆیان بەزمانی عیبریو ووتی:

## بەرگری پۆڵس
## 22

(ئەی برایانو باوکان، ئێستا گوێ بگرن لەو بەرگرییەی لەخۆمی دەکەم.) [2]کاتێ گوێیان لێبوو بەزمانی عیبری قسەیان لەگەڵ دەکات زیاتر بێدەنگ بوون، ئەویش ووتی: [3](من پیاوێکی جوولەکەم، لەشاری تەرسوسی کلیکیە لەدایکبووم، لەم شارە گەورە بوومو لەژێردەستی گەمالائیل فێرکراوم بە شێوەیەك بەتەواوی دەگونجێ لەگەڵ شەریعەتی باوباپیرانمان. زۆر بەپەرۆش بووم بۆ کاروباری خودایی، وەك هەر یەکێك لە ئێوە ئەمڕۆ. [4] ئەم ڕێگایەم چەوساندەوە تا ڕادەی مردن، ئەوانەی ئەم ڕێگایەیان گرتبوو لە ژنو لەپیاو دەمگرتنو دەمخستنە بەندیخانەوە. [5]سەرۆك کاهینو ئەنجوومەنی پیران شایەتی ڕاستی ئەم قسەیەن. نامەم لەوان وەرگرت بۆ برایان لەدیمەشق، تا [باوەڕداران بە عیسا] بهێنم بۆ قودسو سزای خۆیان وەرگرن.

[6]کاتێ گەیشتمە نزیك دیمەشق، نیوەڕۆ بوو، لەپڕ ڕووناکیەکی گەورە لە ئاسمانەوە لەدەوروبەرم پرشنگی دایەوە، [7]کەوتم بەسەر زەوی، گوێم لەدەنگێك بوو پێیووتم: (شاول، شاول، بۆ دەمچەوسێنیەوە؟) [8]منیش لێم پرسی: (تۆ کێی گەورەم؟) لەوەڵامدا ووتی: (من عیسای ناسیریم ئەوەی تۆ دەیچەوسێنیەوە). [9]ئەوانەی لەگەڵم بوون ڕووناکیەکەیان بینی، بەڵام گوێیان لەوە نەبوو کە قسەی لەگەڵ دەکردم. [10]ئینجا لێم پرسی: (ئەی خوداوەند چی بکەم؟) ئەوسا خوداوەند وەڵامیدامەوە: (هەستە بڕۆ بۆ دیمەشق، لەوێ پێت دەوترێ چی پێویستە لەسەرت بیکەی.) [11]ئیتر ئەوانەی لەگەڵم بوون دەستیان گرتم تا منیان گەیاندە دیمەشق، چونکە نەمدەبینی لەبەر تیشکی ڕووناکیەکە.

[12]لە دیمەشق پیاوێك هەبوو ناوی حەنانیا بوو، خواناس بوو بەو شێوەیەی شەریعەت دەیەوێ، هەموو جوولەکەی

دیمەشق شـایەتییەکی باشیان لەسەر دەدا. [13] هـــات بـۆ لام، وەسـتاو ووتی: (شاولی برام ببیـــنە.) دەســـتبەجیٚ چـــاوم ڕوونـــاکی تیٚکـــەوتو ئـەوم بیـنی، [14] ئیـنجا پیٚیووتم: (خـــودای باوباپیرانمان پیٚشتر هەڵیبژاردووی هـــەتا مەبەســتی بـزانی، هــەروەها ئــەو ڕاستودروسـتە ببیـنیو گـــوێـت لەووشەی دەمـی ئـەو بیٚ. [15] چـــونکــە تـۆ بۆی دەبی بەشـایەت لەبـەردەم هـەموو خەڵك، بەوەی بینیــتو بیســتت. [16] ئیٚســتا بـــۆ خـــۆت دوادەخەیـت هەسـتە بـا لەئاوهەڵبکیٚشریٚتو گوناهەکانـت بشـۆرێنەوە بـە بـانگ کـردنی ناوی خوداوەند.)

[17] دواتــر گەڕامــەوە بـۆ قـودس. کـاتیٚ لەپەرستگا نوێژم دەکرد لەهۆشی خۆم چووم، [18] خـــوداوەندم بیـــنی پـێیووتم: (قــودس بەخێرایی بەجیٚبهـێڵە، چـونکە دانیشـتووانی هیچ شایەتییەك سەبارەت بەمن وەرناگرن.)

[19] ئەوسـا پـیٚم ووت: (ئـەی خوداوەند، ئـەوان دەزانــن مــن لەهــەموو کەنیشــتەکان بـەدوای ئەوانـە دەگـەڕام کـە باوەڕیان پیٚت هـەبوو، تـا بـەندیان بکـەمو بەقامچـی لیٚیان بــدەم. [20] مـــن لـــەویٚ ئامـــادەبووم کـــاتیٚ ئیستفانۆسی شایەتی تۆ کوژرا، ڕازی بووم بە کوشـتنیو پارێزگاری جلوبەرگی بکوژەکانم کـرد.) [21] بـــەلاّم پـیٚی ووتم: (هەسـتە بـڕۆ دەتنـــێرم بـــۆ شـــوێنیٚکی دوور، بـــۆ لای ناجوولـەکەکان.)

[22] ئەوانـەی لـەوێدا بـوون تـا ئـەم خاڵە گوێیان گرت، ئینجا هاواریانکرد: (ئەم پیاوە لەسـەر ڕووی زەوی مەهـێڵە! شـایانی ژیان نیـیە!) [23] ئیـنجا خەڵکەکـە دەسـتیان کـرد بەهاوارکـردنو جلەکانـیان دڕانـدو خۆڵیان هــەڵدا بەهــەوادا. [24] ئەوســا فەرماندەکـــە فـەرمانیدا بەسـەربازەکانی تـا پۆڵس ببەن بۆ سـەربازگەو لەژێـر قامچـی لیٚی بکۆڵنەوە، هـەتا هـۆی ئەو هەموو هاوارکردنە بزانیٚ کە دژی دەکریٚ.

پۆڵس هاولاّتیەکی ڕۆمانییە

[25] کــاتیٚ ســەربازەکان بەسـتیانەوە تــا بەقامچـی لیٚیبدەن، بەسەرپەلەکەی ووت کە لەتەنیشتیەوە وەستا بوو: (ئایا یاسایە بەقامچی لـــە هاولاّتـــیەکی ڕۆمـــانی بـــدەن پـــێش دادگایی کـردنی؟) [26] کـاتیٚ سەرپەلەکە گوێی لەمـەبوو ڕۆیشت بۆ لای فەرماندەکەو ئەمەی پیٚ ڕاگەیاندو ووتی: (تۆ دەتەویٚ چی بکەیت؟ ئەم پیاوە ڕۆمانیە!) [27] ئەوسا فەرماندەکە خۆی چـوو بـۆ لای پۆڵـسو لیٚی پرسی: (بەڕاستی تـۆ ڕۆمـانی؟) وەلاّمیدایــەوە: (بـەڵیٚ.) [28] فەرماندەکە ووتی: (من پارەیەکیٚ زۆرمدا هەتا ڕەگەزنامــەی ڕۆمانــیم وەرگــرت.) پۆڵــس

ووتی: (بەڵام من بەرۆمانی لەدایك بووم.) [29]
ئەو سەربازانەی پێیان ڕاگەیێنرا بوو بەزەبری قامچی پرسیاری لێبکەن دەستبەجێ لێی دوورکەوتنەوە، فەرماندەکەش ترسا کە بەکۆتو زنجیر بەستبوویەوە، دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت ڕۆمانییە.

[30] بەڵام بۆ بەیانی فەرماندەکە ویستی سەیری ڕاستی ئەو تاوانە بکات کە جوولەکەکان خستویانەتە پاڵ پۆڵسەوە، ئیتر کۆتو زنجیرەکەی کردەوە، فەرمانیدا سەرۆك کاهینەکانو هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی جوولەکە بهێنن ئەوسا پۆڵسی بانگکردو لەناوەڕاستیان ڕایگرت.

## 23
### پۆڵس لەئەنجوومەنی جوولەکە

پۆڵس ڕوانیە ئەنجوومەنەکەو ووتی: (ئەی برایان، من بەویژدانێکی پڕ لەڕەزامەندییەوە تاکو ئەمڕۆ لەگەڵ خودا ژیاوم) [2] لێرەدا حەنانیای سەرۆك کاهین فەرمانیدا بەوانەی لەنزیکی وەستابوون تابکێشن بەدەمی پۆڵسدا، [3] پۆڵس پێیووت: (خودا لێتدەدا، ئەی دیواری گۆڕستانی سواخدراو بەگەچ! چۆن دانیشتووی حوکم دەدەی بەسەرم بەپێی شەریعەت، کەچی خۆشت بەرپێچی شەریعەت دەکەیتو فەرمانی لێدانم دەردەکەیت؟) [4] ئەوانەی لەوێدا وەستابوون پێیان ووت: (ئایا جنێو بەسەرۆك کاهینی خودا دەدەی؟) [5] پۆڵس لەوەلامدا ووتی: (ئەی برایان نەمزانیوە سەرۆك کاهینە، چونکە لەکتێب باسکراوە { نەفرەت لەسەرۆکی گەلەکەت مەکە}.)

[6] پۆڵس دەیزانی هەندێ لەئەندامانی ئەنجومەنەکە سەدوقینو هەندێکی کەیان فەریسین، لەکۆڕەکە هاواریکرد: (ئەی برایان، من فەریسی کوڕی فەریسیم، ئێستا حوکم بەسەرم دەدرێ، چونکە هیوام هەستانەوەی مردووانە.) [7] ئیتر ناکۆکی کەوتە نێوان فەریسیو سەدوقیەکانی ئەندامانی ئەنجومەنەکەو بوون بەدوو بەش. [8] چونکە سەدوقیەکان دانیان بە هەستانەوەو فریشتەو ڕۆح نەدەنا، بەڵام فەریسیەکان باوەڕیان بەمانە هەمووی هەبوو. [9] دوایی دەنگ بەرزبووەوە، هەندێ لەمامۆستایانی شەریعەتی فەریسیستان، بەتوندی نارەزاییان دەربڕیو ووتیان: (تاوان لەم پیاوەدا نابینین، لەوانەیە ڕۆح یاخود فریشتە لەگەڵی دوابێ!)

[10] ناکۆکییەکە پەرەیسەند تەنانەت فەرماندەکە ترسا کەوا پۆڵس بکەن بە دووکەرتەوە، فەرمانیدا بەسەربازەکان بڕۆن لە نێوانیان بیرفێننو بیگەڕێننەوە بۆ سەربازگە. [11] جا شەوێك دوای ئەوە خوداوەند دەرکەوت بۆ پۆڵسو

پـــێی ۆووت: (وورەت بـــەرزبێ، چـــۆن لـــەقودس شایەت بووی بۆم، لەرۆماش دەبێ شایەتیم بۆ بدەی.)

پیلانی جوولەکە بۆ کوشتنی پۆڵس

[12]کـاتێ ڕۆژهـەڵات هـەندێ جوولەکە پیلانــیان ڕێکخســت، ســوێندیان خــوارد، نەخۆنو نەخۆنەوە هەتا دەیکوژن. [13]ئەوانەی لەم پیلانەدا بوون زیاتر لە چل پیاو بوون. [14] ئینجا چوونە لای سەرۆك کاهینەکانو پیران، پێیان ووتن: (سوێندمان خواردووە نەخۆینو نەخۆیـنەوە هەتا پۆڵس دەکوژین.) [15]چونکە ئـــێوە ئـــەندامی ئەنجوومـــەنن داوابکـــەن لەفەرماندەکـە، پۆڵس بهێنێ بۆ ئێرە بەبیانوی ســـەیرکردنەوەی مـەســـەلەکە بەووردتـــر، ئەوســـا ئـێمـــە ئـــامـادە دەبـین بۆ کوشتنی پـێش ئـەوەی بگـات.) [16]بـەڵام هەواڵی ئەم پـیلانە گەیشـتە لای خوشـکەزای پۆڵـس، ئـەویش چـوو بـۆ سەربازگەو هەواڵی ئەمەی دایـە. [17]جـا پۆڵـس یەکێك لەسەرپەلـەکانی بـانگ کـردو داوای لـێکرد خوشـکەزاکەی بـباتە لای فەرماندەکە تاکو هەواڵێکی بداتێ. [18]ئـەویش بـردیە لایو فەرماندەکـەو ووتی: (پۆڵـــی بەندکـــراو بانگی کـــردمو داوای لێکـردم ئـــەم کـــوڕە بهێـنمە لات، چـونکە شـــتێکی هەیـــە دەیـــەوێ پێـت بڵـــێ.) [19] فەرماندەکە دەستی کوڕەکەی گرتو بەتەنها بـردیە ئـەولاوە، لـێی پرسـی: (ئەو شتە چیە دەتـەوێ پـێمی بڵـێی؟) [20]ئـەویش ووتـی: (جوولـەکـەکان پیلانێکـیان داناوە بۆ پۆڵس، داوات لێ ۆدەکـــــەن بیهێـــــنی بـــــۆ ئەنجوومەنەکـەیان، بەبـیانوی سەیرکردنەوەی مەســـەلەکەی، [21]بـەڵام تـۆ ڕازی مەبـە بـە داواکاریەکـەیان، چـونکە لـەناو ئەوان زیاتر لەچـل پـیاو بەڵێنـیان داوە هـیچ نـەخۆنو نەخۆنـەوەو خۆیان لەبۆسە ناوە بۆ کوشتنی، ئێســتا ئـەوان ئامـادەنو چـاوەڕێی بـڕیارن لەتۆوە.)

[22]فەرماندەکـە بە گەنجەکەی ووت: (ئەم هەواڵەی بە منت گەیاندووە بەکەسی مەڵێ.)

ناردنی پۆڵس بۆ لای فیلیکس

[23]ئیـــنجا فەرماندەکـــە دووان لـــەو ســـەرپەلانەی لای بوون بانگیکردنو ووتی: (دووســـەد ســـەرباز لەگـــەڵ حەفـتا ســوارو دووســـەد شمشـێر هەڵگـــر ئامادەکـــەن، تـــا ئەمـــشـــەو لـــەکاژێـری نـۆی ئێوارە بڕۆن بۆ شـاری قەیســـەریە. [24]لەگـــەڵ هەندێ ئەسپ تـا پۆڵـس هەڵگـریو بەساغی بیگەێنێتە لای فیلیکســی فەرمانڕەوا.) [25]نامەیەکی لەگەڵی نـــاردو ئەمـــەی تـــیادا نووســـی بـــوو: [26] لەکـــلودیۆس لیسیاسەوە:

سڵاو، بۆ بەڕێز فیلیکسی فەرمانڕەوا: [27] ئەم پیاوە جوولەکەکان گرتبوویان، هەوڵی کوشتنی دەدەن. کاتێ زانیم ڕۆمانییە خێرا لەگەڵ هەندێ سەرباز چووم بۆ لایو ڕزگارم کرد. [28] ویستم ئەو تاوانە بزانم کە پێیان تاوانبارکردووە، جا بردمە لای ئەنجوومەنەکەیان، [29] ئەوسا بۆم دەرکەوت تاوانەکەی تایبەتە بەکاروباری شەریعەت. هەروەها تاوانێکی وای نەکردووە شایانی مردن یاخود بەندیخانە بێت. [30] دیسان بۆم دەرکەوت کۆمەڵێ لەجوولەکە پیلانیان داناوە بۆ کوشتنی، جا بەخێرایی ناردمە لای تۆ، فەرمانم دا بەوانەی شکاتیان هەیە لەسەری شکاتەکەیان بهێننە لای تۆ.)

[31] بەم شێوەیە سەربازەکان بەشەو پۆڵسیان برد بۆ ئەنتیپاتریس، بەپێی ئەو ڕێنماییەی پێیان درابوو. [32] ئیتر بۆ بەیانی گەڕانەوە بۆ سەربازگە، سوارەکانیان بەجێهێشت تا لەگەڵ پۆڵس بڕۆن بۆ قەیسەریە. [33] ئەوانیش لەوێ لەگەڵ نامەکە دایانەدەست دادوەر. [34] کاتێ نامەکەی دەخوێندەوە، پرسی خەڵکی چ ناوچەیەکە. کە زانی خەڵکی کیلیکیەیە، [35] پێیووت: (گوێت لێ دەگرم کاتێ ئەوانەی شکاتیان لێکردووی هاتن بۆ ئێرە.) فەرمانیدا پۆڵس بخەنە کۆشکی هێرۆدس لەژێر چاودێری.

## شکاتی جوولەکەکان دژی پۆڵس
# 24

پاش پێنج ڕۆژ حەنانیای سەرۆك کاهینو هەندێ پیرانو پارێزەرێك ناوی تەرتولس بوو، چوونە لای فەرمانڕەوا تا شکات لەپۆڵس بکەن. [2] کاتێ پۆڵس بانگکرا، ئیتر تەرتولس دەستیکرد بەتاوان خستنە پاڵیو ووتی: (ئەی فیلیکسی پایەبەرز، لە ئاشتییەکی زۆر داین بەهۆی تۆوە، گەلەکەشمان گوزەرانێکی باشی هەیە لەسایەی داناییەکەت، [3] بە سوپاسێکی زۆرەوە لەهەموو کاتو شوێنێك پێشوازی لەمە دەکەین. [4] بەڵام تا زیاتر ماندووت نەکەم، داواکارم بەنیانی خۆت گوێ لەپوختەی قسەکانم بگریت. [5] بینیمان ئەم پیاوە گێرەشێوێنیو ئاژاوە دەنێتەوە لەناو جوولەکەکان لەهەموو جیهاندا، هەروەها پێشەوایەتی ڕێبازی ناسری دەکات. [6] جا کاتێ هەوڵیدا پەرستگا گڵاو بکات، گرتمان. [ئیتر ویستمان بەپێی شەریعەتی خۆمان حوکم بەسەری بدەین. [7] بەڵام لیسیاسی سەرۆکفەرماندە هاتو بەزەبری هێز لەدەستی سەندین، [8] بۆ لای تۆی ناردو فەرمانیدا بەناحەزەکانی تا شکاتی خۆیان بهێننە لای تۆ.] جا ئێستا دەتوانی دڵنیابی لەڕاستی شکاتەکەمان، گەر بێتو هەستی بە لێکۆڵینەوەی ئەم مەسەلەیە لەگەڵ ئەو.) [9]

جوولەکەکانیش لایەنگیریان کردو ووتیان، ئەمانە هەمووی ڕاستە.

پۆڵس بەرگری لەخۆی دەکات

[10]فەرمانڕەوا دەستی بۆ پۆڵس ڕاکێشا تا بەرگری لەخۆی بکات، ئەویش ووتی: (من دەزانم تۆ چەند ساڵێکە دادوەری لەکاروباری گەلە، لەبەرئەوە بەهەموو ئاسوودەییەك بەرگری لەخۆم دەکەم. [11]دەتوانی دڵنیابی، دوانزە ڕۆژ تێپەڕی نەکردووە بەسەر هاتنم بۆ قودس بۆ خودا پەرستن. [12]نەیان بینیوم لەپەرستگا بێنەوبردە لەگەڵ یەکێك بکەم، یاخود گەل هانبدەم بۆ ئاژاوەنانەوە لەکەنیشتەکان یا لەهەر شوێنێکی شار. [13] ئەوان ئێستا ناتوانن لەبەردەمی تۆ ڕاستی ئەو تاوانانە بسەلمێنن. [14]بەڵام من لەبەردەمت دانی پیادەنێم کەوا خودای باوباپیران دەپەرستم، بەپێی ئەو ڕێگایەی ناوی دەبەن بە ڕێبازی گومڕا، هەروەها باوەڕم هەیە بە هەموو ئەوەی لەشەریعەت‌و پەرتووکی پێغەمبەران نووسراوە، [15]منیش هەمان هیوام بەخودا هەیە کە ئەم پیاوانەش هەیانە، ئەوەش هەستانەوەی مردووانە بە ڕاست‌ودروستان‌و خراپەکارانیشەوە. [16]جا لەبەرئەوە منیش خۆم ڕادەهێنم هەتا هەمیشە بە ویژدانێکی پاك بەرامبەر بە خوداو خەڵك بژیم.

[17]دوای ئەوەی چەند ساڵێك لەقودس دوور بووم، بۆی گەڕامەوەو هەندێ پیتاکم بۆ گەلەکەم هێنا، قوربانیشم پێشکەش ý کرد. [18]کاتێ هەستام بەخۆ پاککردنەوە، هەندێ جوولەکەی ناوچەی ئاسیا بینیمیان لەپەرستگا، بەڵام لەناو هیچ کۆڕێك‌و لەهیچ ئاژاوەیەك نەبووم. [19]دەبوایە بهاتنایە لات‌و شکاتم لێ بکەن، گەر شتێکیان هەبووایە دژی من. [20]یان با ئەمان بڵێن چ تاوانێکیان لەمندا دۆزیەوە، کاتێ لەبەردەم ئەنجوومەنەکەیان وەستابووم، [21]جگە لەوەی لەبەردەمیان ڕوونم کردەوە کاتێ هاوارم کرد: ئێوە ئەمڕۆ حوکم بەسەرم دەدەن، چونکە باوەڕم بە هەستانەوەی مردووان هەیە!)

پۆڵس لەبەندیخانەی قەیسەریە

[22] چونکە فیلیکس شارەزاییەکی زۆری هەبوو دەربارەی ئەم ڕێگایە، کاتێ گوێی لەبەرگری پۆڵس بوو فەرمانی حوکمدانی ڕاگرت‌و ووتی: (کاتێ لیسیاسی فەرماندە بێت بۆ ئێرە سەیری شکاتەکەتان دەکەم.) [23]ئینجا فەرمانی بەسەرپەلەکەدا پۆڵس بخاتە ژێر چاودێری، بەڵام بە شێوەیەك هەندێ سەربەستی هەبێ، هەروەها ڕێگای هاوڕێیەکانی بدەن دیدەنی‌و خزمەتی بکەن.

[24] پاش چەند ڕۆژێك فیلیکس هات‌و

دروسیلای ژنی لەگەڵ بوو، کە جوولەکە بوو، پۆڵسی بانگ‌کردو گوێی لەقسەکانی گرت لەبارەی باوەڕ بە عیسای مەسیح. [25] کاتێ پۆڵس لەبارەی ڕاست‌ودروستی‌و خۆڕاگرتن‌و سزای دوارۆژ دەدوا، فیلیکس ترسا، بەپۆڵسی ووت: (ئێستا بڕۆ، کەی کاتم هەبوو جارێکی دیکە بانگت دەکەمەوە.) [26]فیلیکس هیوای ئەوە بوو پۆڵس هەندێ پارەی بداتێ، جا لەبەرئەوە زۆر بانگی دەکردو قسەی لەگەڵ دەکرد. [27] دوو ساڵ تێپەری کرد. لەدواییدا پورکیوس فستوس دانرا بە فەرمانڕەوا لەجێی فیلیکس. بەلاّم فلیکس دەیویست ڕەزامەندی جوولەکەکان بەدەست بهێنێ، بۆیە پۆڵسی لەبەندیخانە هێشتەوە.

## مەسەلەی پۆڵس لەلای قەیسەر 25

کاتێ فستوس هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی، دوای سێ ڕۆژ لە شاری قەیسەریەوە سەرکەوت بۆ قودس، [2]سەرۆك کاهینەکانو گەورە پیاوانی جوولەکە هاتنە لایو دژ بە پۆڵس شکاتیان پێشکەش کردو لێی پاڕانەوە، [3]چاکەیەکیان لەگەڵ بکات بەوەی پۆڵسیان بۆ بنێرێ بۆ قودس. چونکە لەسەر ڕێگا بۆسەیان بۆ نابۆوە تا بیکوژن. [4]فستوس وەلاّمی‌دانەوە پۆڵس بە بەندکراوی لەشاری قەیسەریە دەمێنێتەوە، بەلاّم خۆی پاش ماوەیەکی کورت دەگەڕێتەوە بۆ ئەوێ. [5] ئینجا ووتی: (باگەورەکانتان بێن لەگەڵم، گەر بێتو ئەم پیاوە تاوانێکی لەسەر بێت، با لەبەردەمم تاوانباری بکەن.)

[6]دوای ئەوەی فستوس لە قودس چەند ڕۆژێکی بەسەربرد کە هەشت تا دە ڕۆژ زیاتر نەبوو، ئەوسا گەڕایەوە بۆ شاری قەیسەریە. ڕۆژێ دوای گەیشتنی لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی دانیشت، فەرمانیýدا پۆڵس بهێنن. [7]کاتێ هات ئەو جوولەکانەی لەقودس هاتبوون لەدەوری کۆبوونەوە، تاوانی زۆرو ترسناکیان خستە پاڵی، بەلاّم نەیانتوانی ڕاستی تاوانەکان بسەلمێنن. [8]ئەوسا پۆڵس بەرگری لەخۆی کردو ووتی: (هیچ شتێکم نەکردووە دژی شەریعەتی جوولەکە یا پەرستگا یا قەیسەر.) [9]لەبەر ئەوەی فستوس دەیویست ڕەزامەندی جوولەکەکان بەدەست بهێنێ، لەپۆڵسی پرسی: (ئایا دەتەوێ بچی بۆ قودس لەوێ لەسەر ئەو تاوانانەی خراوەتە پاڵت لەبەردەم من حوکمت بەسەر بدرێ؟)

[10]پۆڵس لەوەلاّمدا ووتی: (من ئێستا لەدادگای قەیسەر وەستاوم، لێرەش دەبێ حوکم بەسەرم بدرێ. تۆ خۆت باش دەزانی من هیچ خراپەیەکم نەکردووە بەرامبەر بە

جوولەکە. [11]گەر تاوانێکم کردبێ شایانی سزای مردن بێ، ئەوسا لەمردن ڕامدەکرد. بەڵام چونکە ئەو تاوانەی ئەوان خستویانەتە پاڵی من بێبناغەیە، کەس مافی ئەوەی نییە بم داتە دەستی ئەوان. جا من مەسەلەکەم دەبەمە لای قەیسەر!) [12] فستوس لەگەڵ تەگبیرکەرانی ڕاوێژی کردو ووتی: (تۆ مەسەلەکەت بەرزکردەوە بۆ قەیسەر، ئیتر بۆ لای قەیسەر دەچیت!)

ڕاوێژی فستوس بە ئەغریباسئەگریپاس

[13]دوای چەند ڕۆژێک ئەغریباسئەگریپاسی پادشاو خوشکەکەی کە ناوی بەرنیکی بوو هاتن بۆ شاری قەیسەریە تا بەخێرهاتنی فستوس بکەن. [14]لەوێ چەند ڕۆژێکیان بەسەربرد. ئەوسا فستوس مەسەلەکەی پۆڵسی هێنایە بەردەم پادشاو ووتی: (پیاوێك لێرەیە فیلیکس خستویەتیە بەندیخانەوە. [15]کاتێ ڕۆیشتم بۆ قودس، سەرۆك کاهینەکانýو پیرانی جوولەکە شکاتیان لێýکرد، داوایانکرد حوکم بدرێ. [16]منیش پێمýووتن پیشەی ڕۆمانی نییە حوکم بەسەر یەکێك بدا پێش ئەوەی ڕووبەڕووی ئەوانەی بکەنەوە کە تاوانەکەیان خستۆتە پاڵی، هەتا دەرفەتی هەبێ بۆ بەرگریکردن لەخۆی. [17]کە هاتن بۆ ئێرە خێرا بۆ ڕۆژی داهاتوو لەسەر کورسی فەرمانڕەوایەتی دانیشتم، فەرمانی هێنانی تاوانبارەکەم دا.تاوانبارەکەمý دا. [18]کاتێ ئەوانەی تاوانباریان ýکردبوو بەرامبەری وەستان، باسی تاوانێکیان نەکرد لەوەی من چاوەڕێم ýدەکرد پێی تاوانبار بکەن، [19]بەڵکو دەمەقاڵێیان لەگەڵ کرد دەربارەی بابەتێك تایبەتە بە ئاینیانýو بە پیاوێك ناوی عیسایە، کە مردووە، بەڵام پۆڵس دەڵێ زیندووە. [20] کاتێ بە گومان بووم لە کێشەکە، سەبارەت بەم ووتم، ڕەنگە بخوازێت بۆ قودس بچێتو لەوێ سەبارەت بەم شتانە دادگایی بکرێت. [21]بەڵام ئەو داواکاریەکەی بەرزکردەوە بۆ قەیسەری خاوەنýشکۆ تا لەبەردەمی حوکمی بەسەر ýبدرێ، ئەوسا فەرمانی ئێشكýگرتنیمýدا تاکو دەینێرمە لای قەیسەر.) [22]ئینجا ئەغریباسئەگریپاس بە فستوسی ووت: (حەز دەکەم گوێم لەم پیاوە بێ.) ئەویش لەوەڵامدا ووتی: (بەیانی گوێت لێیý دەبێ.)

[23]بۆ بەیانی ئەگریپاسو بەرنیکی خوشکی هاتن بۆ ئەوێ بە ئاهەنگێکی گەورە پێشوازی کران، کاتێ هاتنە هۆڵی گوێگرتن لەگەڵ فەرماندە سەربازەکانو گەورە پیاوانی شار، فەستوس فەرمانیدا پۆڵس بهێنن. [24]کە هێنایان فەستوس ووتی: (ئەی ئەغریباسئەگریپاسی

پاشاو هەموو ئامادەبووانی بەڕێزی ئێرە: ئەم پیاوەی لەبەردەمتانە ئەوەیە کە هەموو گەلی جوولەکە لەقودس‌و لێرە شکاتی لێýدەکەن لام، ئەوان هاوار دەکەن، ئەوە نابێ بە زیندوویی بمێنێتەوە، [25]وا من بۆم دەرکەوتووە هیچی نەکردووە شایانی مردن بێ. بەلاّم ئەو داواکاریەکەی بەرزکردۆتەوە بۆ قەیسەری خاوەنýشکۆ، جا منیش بڕیارمدا بۆی بنێرم. [26]بەلاّم دەربارەی ئەو شتێکم نییە بینووسم بۆ گەورەمان، لەبەرئەوە هێناومە بۆ بەردەمی هەمووتان، بەتایبەتی بۆ بەردەمی تۆ ئەی ئەگریپاسی پادشا، تا گەر سەیرکردنی مەسەلەکەی تەواو بوو، شتێك بدۆزمەوە بینووسم. [27]چونکە گێلایەتییە بەندکراوێك بنێرمە لای قەیسەر، بێ ئەوەی ئەو تاوانەی خراوەتە پالّی دیاری‌کراو بێ.)

## بەرگری پۆلّس لەلای ئەغریپاسئەگریپاس

## 26

ئەگریپاس بە پۆلّسی ووت: (ئێمە ڕێگات دەدەین بەرگری لەخۆت بکەی.) پۆلّس بەدەستی نیشانی داو دەستی‌کرد بە بەرگری‌و ووتی:

[2](ئەی ئەگریپاسی پادشا، پێخۆشحالّم لەبەردەمت بەرگری لەخۆم دەکەم، دژی هەموو ئەوانەی جوولەکەکان پێیان تاوانبارکردووم، [3]بەتایبەتی چونکە تۆ بە تەواوی خووڕەوشت‌و دەمەقالێی نێوان جوولەکەنان دەزانی، بۆیە داوات لێ‌دەکەم بەسنگ‌فراوانیەوە گوێم لێ‌بگری. [4]هەموو جوولەکەکان لەسەرەتاوە پەروەردەکردن‌و گەورەبوونم دەزانن. هەروەها دەزانن لەمندالّیەوە چۆن لەناو گەلەکەم لەقودس ژیاوم. [5]جا چونکە لەسەرەتاوە دەمناسن، گەر بیانویستایە شایەتیان‌دەدا کەوا من وەك فەریسی ژیاوم کە توندترین ڕێبازی ئاینەکەمانە. [6]ئێستاش وا حوکم دەدرێ بەسەرم لەسەر ئەو هیوایەی هەمە بەو بەلّێنانەی خودا بەباوباپیرانی داوە، [7] ئەوەی هێشتا دوانزە هۆزەکەیهۆزýزەکەی ئیسرائیل‌هیوایان پێیەتی‌و شەو و ڕۆژ خودای بۆ دەپەرستن، لەبەر ئەم هیوایە جوولەکەکان تاوانبارم دەکەن ئەی پادشا. [8]بۆچی باوەڕ ناکەن خودا مردووان هەلّدەستێنێتەوە؟ [9]ئەو کاتە منیش لەو باوەڕەدا بووم دەبێ ئەوپەڕی کۆشش بکەم بۆ بەربەرەکانی ناوی عیسای ناسیری. [10]هەروەها لەقودسیش ئەوەم کردو دەسەلاّتم لەسەرۆك کاهینەکان وەرگرتبوو و ژمارەیەکی زۆرم لەخوشك‌و برا پیرۆزەکان خستە بەندیخانەو هەموو کاتێکیش دەنگم دەدا بۆ کوشتنیان. [11]لەهەموو کەنیشتەکان زۆر ئازارمداون تا ناچاری

کفرکردنیان بکەم. کینەم گەیشتە پلەیەك بەرامبەریان تا وایýلێکردم دەرەوەیلەدوایان بچمە شارەکانی دەرەوە ناوچەکە بۆ چەوساندنەوەیان. [12] بەدەسەڵاتو مۆڵەتی سەرۆك کاهینەکان بەرەو شاری دیمەشق ڕۆیشتم، [13] ئەوسا ئەی پاشا، نیوەڕۆ بەرێگاوە ڕووناکییەکم لە ئاسمانەوە بینی، تیشکی زیاتر بوو لەڕووناکی ڕۆژ، لە دەوروبەری خۆمو ئەوانەی لەگەڵمدا بوون پرشنگی دایەوە، [14] ئیتر هەمووومان بەسەر زەویدا کەوتین. دەنگێکم بیست بەزمانی عیبری بانگیکردمو ووتی: شاول، شاول، بۆچی دەمچەوسێنیتەوە؟ ئازاری خۆت دەدەی کاتێ جووتە دژی نەقیزە لێدانم باوێی*. [15] ئینجا کرد:پرسیارمýکرد: تۆ کێیت گەورەم؟ خوداوەند ووتی: من ئەو عیسایەم کە تۆ دەیچەوسێنیتەوە. [16] هەستە بەپێوە ڕاوەستە، من بۆت دەرکەوتم تا بتکەم بەخزمەتکاری خۆمو شایەتی بۆ ئەو شتانە بدەی کەبینیت، هەروەها شایەتی بۆ ئەو شتانەش بدەی کە لەداهاتوودا بۆت دەردەکەوێ. [17] جا ڕزگارت دەکەم لە گەلەکەتو لەو میللەتانەی ئێستا تۆیان بۆ دەنێرم، [18] تا چاویان بکەیتەوە بۆ ئەوەی لە تاریکی بگەڕێنەوە بۆ ڕووناکی، لەژێر دەستی شەیتانەوە بۆ لای خودا، ئەوسا لێخۆشبوونی گوناە بەدەستدەهێنن، هەروەها بەشیان دەبێت لەگەڵ ئەوانەی پیرۆزکراون بەباوەڕیان بەمن.

[19] (ئەی ئەغریباسئەگریپاسی پادشا، لەوکاتەوە بەرپێچی بینینی ئاسمانی ناکردەم. [20] ئەو مەسەلەشم یەکەم جار بەدانیشتووانی دیمەشق ڕاگەیاند، ئینجا دانیشتووانی قودسو هەموو ناوچەی یەهودیە، پاشان میللەتانیش. تا تۆبە بکەنو بۆ لای خودا بگەڕێنەوە، هەروەها کرداری باش بکەن شایانی تۆبەکردنەکەیان بێ. [21] لەبەر ئەم هۆیە جوولەکەکان لە پەرستگادا گرتمیان وگرتمیانýویانن هەوڵی کوشتنیاندام، [22] بەلاَم خودا تا ئەمڕۆ یارمەتی داومو وا لێرە وەستاوم شایەتی بۆ ئەو دەدەم بۆ گەورەو بچووك، هیچیýکە نالێم جگە لەوەی موساو پێغەمبەران ووتویانە سەبارەت بەوەی ڕوودەدا، [23] مەسیح دەبووایە ئازاری بکێشایەýو یەکەم کەس بێ لەنێو مردووواندا زیندووبێتەوەو ڕووناکی ئاشکرا بکات بۆ جوولەکەو میللەتانیش.) [24] کاتێ پۆڵس بەم قسانە بەرگری لە خۆی دەکرد، فستوس قسەکەی پیýبریýو بەدەنگێکی بەرز ووتی:

---

* پەندێکی یۆنانیە بۆ بەرهەڵستیکردنی بێ سوود بەکاردێت.

(پۆڵس دەڵێی شێت بووی! زۆری زانایيت شێتی كردويت.) [25]پۆڵس ووتی: (ئەی فستۆسی خاوەنýشكۆ من شێت نیم، من قسەی ڕاستýودروست ýدەكەم. [26] چونكە ئەم پادشایەی ئێستا قسەی لەگەڵ دەكەم، هەموو ئەو شتانەی باسی ýدەكەم دەیزانێ، من دڵنیام لەمانە هیچ شتێكی لاشاراوە نییە، چونكە لەسووچێكی تاریك ڕوویýنەداوە. [27]ئەی ئەغریباسئەگریپاسی پادشا، باوەڕت بەپێغەمبەرەكان هەیە؟ من دەزانم تۆ باوەڕت پێیان هەیە).

[28]ئەغریباسئەگریپاس لەوەلاّمدا ووتی: (لەو باوەڕەدای لەم ماوە كەمەدا دەتوانی بمكەی بە مەسیحی؟) [29]ئەوسا پۆڵس ووتی: (گەر كەم بێ یا زۆر، لەپێناوی تۆ و هەموو ئەوانەی لێرە ئامادەن بۆ خودا نوێژ دەكەم تا وەك منتان لێ ýبێت، بەلاّم بەبێ ئەم كۆتýو زنجیرە.)

[30]دوای ئەمە پادشاو فەرمانڕەواو بەرنیكیو ئامادەبووان هەستان، [31]هۆڵەكەیان بەجێýهێشت، بەیەكتریان دەووت: (ئەم پیاوە شتێكی وای نەكردووە شایانی مردن یاخود بەندیخانە بێ.) [32]ئینجا ئەغریباسئەگریپاس بە فستوسی ووت: (گەر بێتو ئەم پیاوە داواكاریەكەی بۆ قەیسەر بەرز نەكردایەوە لەوانەبوو ئازاد بكرایە.)

## گەشتی پۆڵس بەرەو ڕۆما

## 27

لەكۆتاییدا بڕیاردرا بەڕێگای دýەریا بڕۆین بۆ ئیتالیا، سەرپەلێك ناوی یولیۆس بوو پۆڵسýو هەندێ لەبەندكراوەكانیýكەی درایە دەست، ئەمیش سەر بەلەشكری ئیمپراتۆریئۆغوستوس بوو. [2]ئینجا سواری كەشتیەك بووین لەشاری ئەدرامیتەوە هاتبوو، بەرەو بەندەری ناوچەی ئاسیا دەڕۆیشت. لەگەشتەكە ئەریستەرخۆسمان لەگەڵýبوو خەڵكی شاری تەسالۆنیكی ناوچەی مەكدۆنیا بوو. [3]بۆ بەیانی گەیشتینە شاری سەیدا. یولیۆسی سەرپەل لەگەڵ پۆڵسدا باش هەڵسوكەوتی دەكرد، هەروەها ڕێگایدا سەردانی هاوڕێیەýكانی بكات تا ئەوەی پێویستی پێیەتی لێیان ýوەربگرێ. [4] لەبەندەری سەیدا سواربووین، بە قەراغی قوبرسدا ڕۆیشتین، چونكە ڕەشەýبا بەرەو ڕوومان بوودەهات. [5]دوای ýئەوەی دەریای تەنیشت ناوچەی كیلیكیەو پەمفیلیەمان بڕی، گەیشتینە بەندەری میرا لەناوچەی لیكیە. [6]لەوێ سەرپەلەكە كەشتییەكی بینی لەئەسكەندەریەوە دەهات بەرەو ئیتالیا دەڕۆیشت، ئێمەش سواریبووین، [7] كەشتییەكە بەهێواشی بەچەند ڕۆژێك بردینی، دوای هەوڵدان نزیك قەراغی شاری

کەندیدوس بووینەوە، بەڵام ڕەشەباکە نەیهێشت بچینە بەندەرەکە ئیتر نەمانتوانی لەوێ دابەزین، ئینجا بەردەوام ڕۆیشتین بە نزیك قەراغی دورگەی کریت، بەرامبەرلەلای کەنداوی سەلمونیە. [8]پاش هەوڵدانێکی زۆر گەیشتینە شوێنێك پێیýدەووترێ بەندەری جوانە کەوتۆتە نزیك شاری لەسائیە.

[9]جا چونکە لەوێ ماوەیەکی زۆر ماینەوە تا کاتی ڕۆژووگرتن بەسەرچوو، گەشتýکردن بەناو دەریا ترسناك بوو، لەبەرئەوە پۆڵس ئاگاداریئامۆژگاری کردنەوەو [10]ووتی: (ئەی پیاوان، ئێستا لەگەشتەکەمان ترسýو زیانێکی گەورە دەبینم، تەنها بۆ سەر کەشتیýو بارەکەی نا، بەڵکو لەسەر ژیانیشمان.) [11]بەڵام سەرپەلەکە باوەڕی بە کەشتیوانýو خاوەن کەشتییەکە زیاتر دەکرد، وەك لەقسەکانی پۆڵس. [12]جا چونکە بەندەرەکە باش نەبوو بۆ بەسەربردنی وەرزی زستان، زۆربەی کەشتیوانەکان بڕیاریانýدا بەجێیý بهێڵن، بە هیوای ýئەوەی بگەنە بەندەری فینکس هەتا وەرزی زستانی تیادا بەسەرببەن، ئەم بەندەرەش لەدورگەی کریت بوو ڕەشەبای باشووری ڕۆژئاواو باکووری ڕۆژئاوا دەیگرتەوە.

**گەشتێکی ترسناك**

[13]ئینجا لەباشورەوە شنە بایەك هەڵیکرد، کەشتیوانەýکان وایانزانی ئەم شنەبایە بەخواستی خۆیان دەگەیێنێ، لەنگەرەکەیان بەرزکردەوە، ئەوسا بەنزیك قەراغی دورگەی کریتýدا ڕۆیشتن.

[14]بەڵام دوای ماوەیەکی کەم گەردەلوولێك ناسراوە بەرەشەبای باکووری ڕۆژهەڵات لەلای دوورگەکەوە هەڵیýکردو [15]لەکەشتییەکەیدا ئیتر کەشتییەکە نەیتوانی بەرەنگاری بکات، خۆمانýدا بەدەستەوەو ڕەشەباکە هەڵیگرتین، [16]بۆ شوێنێکی نزیك لەدورگەیەکی بچووك ناوی کودا بوو. پاش هەوڵدان توانیمان بەلەمە ڕزگارکەرەکە بەرزکەینەوە بۆ ناو کەشتیەکە. [17]ئینجا کەشتیوانەکان خێرا ئەوەی پێویست بوو هەستان بەکردنی، ناوەڕاستی کەشتییەکەیان بەگوریس بەست. لەترسی ئەوەی نەوەکو ڕەشەباکە پاڵ بە کەشتیەکەوە بنێ بۆ ناو لمە جولاوەکانی قەراغی دەریا،ر چادرو گوریسی کەشتیەکەیان هێنایە خوارەوە، ئیتر ڕەشەباکە کەشتیەکەی دەهێناو دەبرد. [18]بۆ بەیانی ڕەشەباکە بەهێز بوو، دەستیانýکرد بە سووكýکردنی بارەکە. [19]لەڕۆژی سێهەم بەدەستی خۆیان کەلوپەلی کەشتیەکەیان فڕێدا. [20]بەڵام ڕەشەباکە ڕۆژ بەرۆژ بەهێزتر دەبوو،

تا وای ýلێهات چەند ڕۆژێك ئێمە ڕۆژو ئەستێرەمان نەبینی، ئیتر هەموو هیوای ڕزگاریمان بڕا.

[21]کاتێ خەڵکەکە ماوەیەکی درێژ بوو نانیان نەخواردبوو، پۆڵس هاتە لایانýو ووتی: (پیاوەکان، دەبووایە گوێتان لەقسەکانی من بگرتایەو دورگەی کریتتان بەجیýنەهێشتایە، ئەوسا دووردەبوون لەم ئازارو زیانە. [22]لێرە ئاگادارتان دەکەمەوە تا وورە بەرنەدەن، کەستان ژیانی تیادا ناچێ، تەنها کەشتیەکە نەبێ. [23]چونکە ئەمشەو فریشتەی خودا هاتە لام، ئەو خودایەی سەربە ئەوم‌و دەیپەرستم، [24]پێیýووتم: ئەی پۆڵس مەترسە! تۆ دەبێ ئامادýەبی لەبەردەم قەیسەر. خودا ژیانی هەموو ئەوانەی پێت ýبەخشی کە لەگەڵت لەکەشتیەکەدان. [25]کەواتە ئەی برادەران وورەتان ýبەرزبێ چونکە من باوەڕ بەخوداý دەکەم، ئەوەی پێیýووتوم جیýبەجێ دەبیý، [26]بەلام دەبێ خێرا بگەینە دوورگەیەك.

[27]دوای ئەوەی چواردە شەو ڕەشەبا لەدەریای ئەدریا پاڵی پێوە دەناین، لەنیوە شەو کەشتیەوانەکان وایانزانی لەووشکانی نزیك دەبنەوە. [28]ئینجا قولایی ئاوەکەیان پێوا سەیریان کرد سەدوبیست پێیە. پاش ماوەیەکی کەم قولاییەکەیان پێوا بینیان پانزەنەوەت پێیە. [29]ئەوسا ترسان کەشتیەکە خۆیýبدا لە بەرد، لەبەرئەوە لەکۆتایی کەشتیەکەوە چوار لەنگەریان خستە ئاوەکەوە تا کەشتیەکە ڕابگرێ، ئیتر دەپاڕانەوە تا ڕۆژیان لێهەڵبێ. [30]کەشتیوانەکان هەوڵیانýدا لە کەشتیەکە هەڵبێن، بەلەمێکیان شۆڕکردە خوارەوە بۆ ناو دەریاکە بە بیانوی ئەوەی دەیانەوێ چەند لەنگەرێك لەپێشەوەی کەشتیەکە شۆڕکەنەوە. [31]لەویدا پۆڵس بە سەرپەلýو سەربازýەکانی ووت: (گەر بێتو ئەم کەشتیوانانە لەکەشتیەکەدا نەمێننەوە، ڕزگارتان نابێ.) [32]ئەوسا سەربازýەکان پەتی بەلەمەکەیان بڕیýو فڕێیانýدایە ناو ئاوەکە.

[33]کاتێ خەریكýبوو ڕۆژهەڵدەهات، پۆڵس داوای لەهەمووان ýکرد نان بخۆنý، ئینجا پێیýووتن: (ئەوە چواردە ڕۆژە ئێوە چاوەڕێ دەکەن‌و هیچتان نەخواردووە، [34]بۆیە داواتان لێýدەکەم نانýبخۆن، تاهێزتان بێتەبەرو کەستان تاڵێ لەقژی سەری نافەوتێ.) [35] ئەوسا نانێکی هەڵگرت، سوپاسی خودایýکرد لەبەردەم هەمووان، لەتی‌کردو دەستیýکرد بەخواردن، [36]بەمە ئەوان هەموو وورەیان بەرزبووەوەو نانەکەیان خوارد. [37]ژمارەمان لەکەشتییەکە دووسەدو حەفتاو شەش کەس بوو.

[38]دوای ئەوەی تێربوون، ئەو دانەوێڵەی

پێیانýبوو فڕێیانýدایە ناو دەریا، تا باری کەشتیەکە سووکýبێ.

### تێکشکانی کەشتییەکە

[39] کاتێ ڕۆژبووەوە، کەشتیوانەکان نەیانزانی لەچ شوێنێکدان، بەلاّم کەنداوێکیان بینی بەندەری هەبوو، ئەوسا بڕیاریانýدا گەر بتوانن پاڵبنێن بە کەشتیەکە بۆ ئەوێ، [40] لەو کاتەدا لەنگەرەکانیان فڕێدایە ئاوەکەو گوریسەکانیان بڕینوازیان، لەهەمان کات گوریسی ئەو تەختەیان شلýکرد کە بەکۆتایی کەشتیەکە بەسترابوو یارمەتی ڕێك ڕۆیشتنی کەشتیەکەی دەدا، ئینجا چادری بچووکی کەشتیەکەیان ڕووەو ڕەشەباکردو بەرەو قەراغی دەریا ڕۆیشتن. [41] بەلاّم کەشتیەکە گەیشتە شوێنێکی لماوی کەم ئاو، پێشەکەی گیربوو ئیتر نەجولاّ، لەهەمان کات توندی شەپۆل پشتەکەی پارچە پارچەکرد. [42] سەربازەکان پلانیان دانا بەندکراوەکان بکوژن هەتا کەسیان بە مەلە نەڕوا بۆ قەراغی دەریاو لەوێ ڕابکا، [43] بەلاّم چونکە سەرپەلەکە دەیویست پۆڵس بمێنێ، لەبەرئەوە ڕێی لەسەربازýەکان گرت ئەمە بکەن، فەرمانیýدا بە مەلەوانەکان پێش ئەوانیýکە بە مەلە بگەنە ووشکانی، [44] ئینجا ئەوانیýکە بەتەختە یاخود بەپارچەکانی کەشتیەکە. ئیتر بەم شێوەیە هەموو بە ساغی گەیشتنە ووشکانی.

### لە دورگەی ماڵتا

## 28

دوای ئەوەی ڕزگارمان بوو زانیمان ئەو شوێنەی گەیشتوینەتێ دورگەی ماڵتایە. [2] دانیشتووانی دورگەکە بەڕووخۆشییەکی گەورەی بێýهاوتا پێشوازیان لێکردینەنامۆکان کرد.، بەخێرهاتنیان کردین، ئاگریان بۆ کردینەوە، چونکە باران دەباریýو ئاوهەوا ساردبوو.

[3] ئینجا پۆڵس هەندێ تەختەی کۆکردەوە، کاتێ خستیە ئاگرەکە مارێك بەهۆی گەرمی ئاگرەکەوە پاڵنرابوو هاتەدەرەوە، خۆی لەدەستی ئالاّند. [4] خەڵکی ماڵتا مارەکەیان بینی خۆی هەڵواسی بوو بە دەستیەوە، بەیەکتریان ووت: (بێگومان ئەم کابرایە پیاوکوژە، بەلاّم دادپەروەری ناهێڵێ بژی دوای ئەوەی لەدەریا ڕزگاری بوو.) [5] پۆڵس مارەکەی ڕاوەشاندە ناو ئاگرەکە بێýئەوەی تووشی ئازار بێ. [6] ئەوانیش چاوەڕێیانýکرد لەشی بئاوسێ یا لەپڕ بە مردوویی بکەوێ. بەلاّم چاوەڕێ کردنەکەیان درێژەی خایاند بێýئەوەی هیچ زیانێکی پێ بگات، ئەوسا بیروڕایان گۆڕی بەرامبەریýو

ووتیان: (ئەمە خودایەکە!)

[7]لە نزیك ئەو شوێنە کێڵگەیەکی لیýبوو هی پۆبلیوسپوپلیوسی گەورەی دورگەکە بوو، ئەو بانگی‌کردینýو سیێ ڕۆژ میوانداری کردین. [8]وا ڕێکەوت باوکی پۆبلیوسپوپلیوس نەخۆش بوو لە جێگەدا کەوتبوو زۆر سکی دەچوو تای لیýهاتبوو. پۆڵس دیدەنی کردو نوێژی کرد، دەستی خستە سەر سەریýو چاکیý کردەوە. [9] کاتێ ئەمە ڕوویدا، نەخۆشەکانی‌تری دورگەکە هاتنە لایýو چاكبوونەوە، [10] پیێداینبەزۆر شێوە ڕێزیان گرتین، هەروەها لەکاتی ڕۆیشتنمان ئەوەی بۆ گەشتەکەمان پێویستمان پێیýبوو پێمانیاندا.

لەماڵتاوە بۆ ڕۆما

[11]دوای سێ مانگ سواری کەشتییەك بووین، کە ئەسکەندەری بوو وەرزی زستانی لە ماڵتا بەسەربرد بوو، وێنەی دووانەی لەسەربوو. [12]کاتێ گەیشتینە شاری سیراکوسا سێ ڕۆژمان تیادا بەسەربرد، [13] ئینجا بە دەریادا ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە شاری ڕیغیونریگیۆن. بۆ بەیانی بای خوارووو هەڵیکرد، بۆ ڕۆژی دووەم گەیشتینە شاری پوتیولی. [14]لەوێ هەندێ لەبرایانمان بینی، داوایان لیýکردین حەوت ڕۆژ لایان بمێنینەوە، جا بەم شێوەیە گەیشتینە ڕۆما. [15] کاتێ لەوێ برایان بیستیان گەیشتوین، هاتنەدەرەوە بۆ پێشوازیمان لەگۆڕەپانی ئەپیوسýو لە سێ خانەکان. کە پۆڵس ئەوانی بینی سوپاسی خودای کردو وورەی بەرزبووەوە.

پۆڵس لەرۆما

[16]کاتێ گەیشتینە ڕۆما، ڕێگا بە پۆڵس درا لەماڵێکی تایبەت بمێنێتەوە لەگەڵ ئەو سەربازەی پاسەوانی دەکات. [17]دوای سێ ڕۆژ پۆڵس پێشەوایانی جوولەکەی بانگýکرد، پێیýووتن: (ئەی برایان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی خراپ ýبێ دژی گەلýو خووڕەوشتی باوباپیران نەمýکردووە، کەچی بەندکراوم لەقودسýو دراومەتە دەستی ڕۆمانیەکان، [18]ئەوانیش سەیری مەسەلەکەیان کردمýو ویستیان ئازادم بکەن، چونکە هیچ تاوانێکم لەسەر نییە شایانی لەسێدارەدانم بێ. [19]بەلام جوولەکەکان نارازی بوون، ئەوسا ناچار بووم داواکاریەکەم ببەمە لای قەیسەر. ئەمەش ئەوە ناگەێنێ شکات لەنەتەوەی خۆم بکەم بەشتێك. [20]جا لەبەرئەوە داوامýکرد بتانبینمýو قسەتان لەگەڵ بکەم، چونکە من لەپێناوی هیوای ئیسرائیل ئاوا بەندکراوم.)

[21]ئەوانیش ووتیان: (دەربارەی تۆ هیچ

نامەیەکمان لەولاتی یەهودیە وەرنەگرتووە، هەروەها نێرراو لەلایەن براکانمانەوە نەهاتووە بەشتێك دەربارەی تۆ هەواڵمان بداتێ، یاخود شکاتت لێبکات. [22] بەلام پێمان خۆشە گوێ لەڕات بگرین،چونکەبگرین، چونکە دەزانین خەڵك لەهەموو شوێنێك بەربەرەکانی ئەم بیروڕایە دەکەن.)

[23] کاتێ ئەوان ڕۆژێکیان بۆ دیاریکرد، لەو ڕۆژەدا خەڵکێکی زۆر بۆ لای پۆڵس هاتن. ئەویش لەبەیانییەوە تا ئێوارە قسەی بۆ دەکردنو سەبارەت بەپاشایەتی خودا شایەتی دەداو هەوڵی ڕازیکردنیدان بەو کاروبارانەی تایبەتە بەعیسا بەهۆی تەوراتی موساو پەرتووکی پێغەمبەران. [24] جا هەندێ لەوانە باوەڕیان بە قسەکانی کردهێنا، هەندێکیشیان باوەڕیان نەکردهێنا. [25] ئەوسا دووبەرەکی کەوتە ناویانەوە، ئینجا ڕۆیشتن دوای ئەوەی پۆڵس پێیووتن: (ڕۆحی پیرۆز ڕاستی کردووە، بەزمانی ئەشعیای پێغەمبەر بەباوباپیرانتانی ووتوە: {[26] بڕۆ لای ئەم گەلەو پێی بلێ: گوێگرتن گوێ دەگرن، بەلام تێناگەن: سەیرکردن سەیر دەکەن، بەلام نابینن! [27] چونکە دڵی ئەم گەلە ڕەق بووەو گوێیان قورس بووە، چاویان نوقاندووە هەتا بەچاویان نەبینن، بەگوێیان نەبیستن بەدڵیان تێنەگەنو بۆ لام بگەڕێنەوە، ئەوسا منیش چاکیان بکەمەوە.}

[28] با زانراو بێت لاتان، خودا ڕزگاری خۆی نارد بۆ ئەوانەی جوولەکە نین، ئەوانیش گوێی بۆ دەگرن.)

﴿[29] کاتێ پۆڵس ئەمەی ووت، جوولەکەکان ئەوێیان بەجێهێشتو بووە دەمەقالێ لەنێوانیان.﴾

[30] پۆڵس دوو ساڵی تەواو لەو ماڵەی بەکرێی گرتبوو مایەوە، پێشوازی لەهەموو ئەوانە دەکرد کە دەهاتن بۆ دیدەنی، [31] هەروەها پاشایەتی خودای ڕادەگەیاند، بەچاونەترسیو سەربەستییەوە سەبارەت بە خوداوەند عیسای مەسیح فێری دەکردن.

# نامەی پۆڵس بۆ باوەڕدارانی ڕۆما

*کاتێ پۆڵس بەرەو ڕۆما دەچوو، بۆ ئەوەی لەوێەوە بۆ ئیسپانیا بڕوات. ئەم نامەیەی نووسی‌و هیوای وابوو یارمەتی بدرێ لەلایەن کۆمەڵەی باوەڕدارانی ڕۆما تا بتوانی بەردەوام بێ لەگەشتەکەی بۆ ئیسپانیا. مەبەستی بوو لەڕۆما دەست‌بکات بەفێرکردنی باوەڕداران‌و هانیان بدات‌و بەشداریان بکات لەباوەڕەکەیان. بۆیە ئەم نامە درێژەی بۆ نووسین، تا ئینجیلیان بداتێ، ئەوەی مزگێنی پێ‌دەدات.*

*ئەم نامەیە ناوەڕۆکی ئینجیل شی‌دەکاتەوە، واتە ئەو مزگێنییەی تایبەتە بەو ڕێگایەی خودا دایناوە بۆ بێ‌تاوانکردنی مرۆڤ. ئەم بێ‌تاوانکردنەش تەنها بەباوەڕ بەقوربانیەکەی عیسای مەسیح، ئەمەش بۆ هەمووانە بەبێ جیاوازی، لەبەر ئەوەی هەموو مرۆڤێك لەژێر دەسەڵاتی گوناهەو شایانی مردنە، لەبەر ئەمە پێویستە ئەم ئینجیلە بەهەموو کەسێك ڕابگەیێنرێ.*

*ئینجیل بەپێی ئەم نامەیە بەرەکەتی خودا ڕادەگەیێنێ کە گوناهبار بێ‌تاوان دەکات لەسەر ئەو باوەڕەی هەیەتی‌و سزای مردنی لەسەر هەڵدەگرێ‌و لەگوناهەکانی خۆش‌دەبێ هەروەها یارمەتی دەدات زاڵبێ بەسەر گوناهدا. پاشان ئەم نامەیە دەریدەخات کە بێ‌تاوانکردن چەند ئەنجامی پیرۆزی هەیە وەکو: ئاشتبوونەوە لەگەڵ خوداو هیوا بەشکۆمەندی خودا. کۆتایی نامەکەش ئامۆژگاری هەڵسوکەوت کردنە بەهێزی ئینجیلی شکۆدار، کە ڕاست‌ودروستی خودا بەکردەوە بۆ ئەوانی دیکە دەردەخات.*

**مزگێنی خودا**

# 1

[1] لەپۆڵس بەندەی عیسای مەسیح، نێرراوی بانگکراو و تەرخان‌کراو بۆ ئاشکراکردنی مزگێنی خودا، [2] ئەو مزگێنییەی دەمێکە خودا بەڵێنی داوە بەهۆی پێغەمبەرەکانی لەکتێبی پیرۆز، [3] ئەمەش تایبەتە بەڕۆڵەکەی کە لەبارەی مرۆڤایەتیەوە لەنەوەی داود پەیدابوو، [4] هەروەها لەبارەی ڕۆحی پیرۆزەوە دەست‌نیشان‌کراوە کە ئەو ڕۆڵەی خودایە بەهۆی هێزو توانای هەستانەوەی لەنێو مردووان، عیسای مەسیحی خوداوەندمان، [5] ئەوەی

بەهۆیەوە بەرەکەتمان وەرگرت تاکو
بین بەنێرراو لەپێناوی ناوی، تاهەموو
گەلان بانگ بکەین بۆ گوێڕایەڵی
باوەڕ، [6]لەناو ئەوان ئێوەش لەلایەن
عیسای مەسیحەوە بانگکراون.
[7]بۆ هەموو ئەوانەی لە ڕۆمان،
خۆشەویستانی خوداو بانگکراو تا
پاکوپیرۆز بن. با بەرەکەتو ئاشتی
خودای باوکو عیسای مەسیحی
خوداوەندتان لەگەڵ بێت.

### ئارەزووی دیدەنی ڕۆما

[8] لەپێش هەموو شتێك لەپێناوی
هەمووتان سوپاسی خودام دەکەم
بەهۆی عیسای مەسیح، چونکە
باوەڕتان لەهەموو جیهان
بڵاوبووەتەوە. [9]ئەو خودایەی بەڕۆحم
خزمەتی دەکەم لەمزگێنی ڕۆڵەکەی،
ئەو شایەتی منە چۆن من هەموو کاتێ
لەنوێژ باستان دەکەم. [10]لەخودا
دەپاڕێمەوە، ئێستا بەخواستی خۆی
ڕێکی بخا، بێم بۆ لاتان. [11]من
تامەزرۆی بینینتانم تا بەرەکەتی
ڕۆحیتان پێ ببەخشم بۆ
جێگیربوونتان، [12]تا یەکتری
هانبدەینو دڵنەوایی یەکتر بکەین
بەو باوەڕەی هەمانە.

[13]ئینجا ئەی برایان، نامەوێ
لێتان شاراوە بێ، زۆر جار هەوڵم
داوە بێم بۆ لاتان تا لەنێوان ئێوەشدا
بەرووبوومم هەبێ وەك چۆن لەنێوان
میللەتانی دیکەدا هەمە، بەڵام تا
ئێستا ڕێك نەکەوتووە. [14]من
قەرزاری ئەوانەم کە یۆنانیو بەربەرن،
داناو گێلن. [15]جا لەبەرئەوە بە
هەموو توانایەکمو بەو پەڕی
ئارەزووەوە دەمەوێ مزگێنی بەئێوەش
بدەم، ئێوەی دانیشتووی شاری ڕۆما.

### مزگێنی توانای خودایە

[16]من شەرمم بەمزگێنی نییە،
چونکە ئەو مزگێنییە توانای خودایە
بۆ ڕزگاربوونی هەموو ئەوانەی
باوەڕیان هەیە، یەکەمجار بۆ جوولەکە
ئینجا بۆ یۆنانی هاتووە. [17]چونکە
تیایدا دادپەروەری خودا
دەرکەوتووە، ئەمەش لەباوەڕەوە
هەڵدەقوڵێو بەرەو باوەڕ دەچێ،
هەروەك چۆن لەکتێبی پیرۆزدا
نووسراوە: {ئەوەی بەباوەڕ بێتاوان
دەبێ، دەژی.}

### تووڕەیی خودا بۆ هەمووانە

[18]چونکە تووڕەیی خودای

لەئاسمانەوە دەرخست بەرامبەر هەموو ئـــەوەی خـــەڵك دەیكـــات لـەخودانەناسـیو گونـاه، ئـیتر بەمـە ڕووی ڕاسـتی بـەگوناه دەگـرن، [19] چـونكە زانیـنی خـودا تیایاندا دیارە، لەبەرئەوەی خودا بۆی دەرخستوون. [20] بەڵام ئەوەی لەكاروباری خودابیدا نابیـــنرێ، توانـــای هەمیشـــەییو خودایـەتی، ئەمـەش لەدروستكردنی جـیهانەوە بـەڕوونی بیـنراوە، مێشك تێـیدەگات بـەهۆی ئـەو شـتانەی دروسـتبوون، تاوای لێهات خەڵك بێبیانو مانەوە.

[21] لەگـەڵ ئـەوەی خودایان ناسی بـوو، ستایشیان نەدەكرد وەك خودا، هـەروەها سوپاسیان نەدەكرد، بەڵكو بێمێشكانە بیریان دەكردەوە، ئەمەش دڵـــە پووچـــەكانیانی پڕكـــردبوو لـــەتاریكی. [22] خۆیـــان بـــەدانا دەردەخســت، بـوون بـەگێل، [23] شكۆمەندی خودای نەمریان گۆڕیەوە بـە پەیكەری وێنەی مرۆڤی لەناوچوو و بەباڵندەو چوارپێو خشۆك.

[24] ئـیتر لەبەرئـەوە خـودا بەهۆی هەوەسـی دڵـیان ئـەوانی دایەدەست گلاوییـەوە، تـا سـووكایەتی بەلەشی خۆیـان بكـەن لەنـێوان خۆیـان. [25] بـەوەی ڕاسـتی خودایـان بـەدرۆ گۆڕیـەوەو دروسـتكراویان پەرستو خزمەتیـانكـرد لەجیاتی دروستكەر، ئەوەی تاهەتایە پیرۆزە. ئامین.

[26] لەبەرئـــەوە خـــودا ئـــەوانی دایەدەسـت هەوەسـێكی سـووك. تا ژنەكانـیان وایـان لێهات بەكارهێنانی لەشـیان لـەشێوەی سروشـتی بـۆ شـێوەی ناسروشـتی گـۆڕی، [27] هـەروەها پیاوەكان جووتبوونیان بە شێوەی سروشـتی لەگـەڵ ژنەكانیان پشتگوێخسـت، بەمـە لـەزەتو ئـارەزووی یـەكتریان خۆش دەكرد. پـیاو لـەگەڵ پیاو بەدڕەوشتی دەكرد، ئەوسـا ئـەوان شـایانی ئـەوە بـوون سـزایەكی دادپەروەرانـە وەرگـرن بەرامبەر بەگوناهیان.

[28] لەبـەر ئەوەی ئەوان بۆ ناسینی خـودا هـیچ بایەخێكـیان نـەدا، ئـیتر خـودا ئەوانی دایە دەست مێشكێكی گـەندەڵ تـاكو خراپەكاری بكەن. [29] پـڕبوون لـەهـەموو گوناهو خراپەیەك لـەداوێـنپیسیو چاوچنۆكی، دڵیان چاوپیسـیو كوشـتنو دوژمـنایەتیو فێڵبازیو خراپەی لێدەڕژا. [30] ئەوانە چـەنەبازو قسـەگێڕەوەن، ڕقـیان لـــەخودا بـــوو، جنـــێوفرۆشو

لـووتبـەرز، شـانازیکەرو داهێنەری خـراپەو گوێـڕایەڵ نـەبوونی دایـكو بـاوك بـوون، [31] بێمێشـکن، بێمـتمانەن، بێهەسـتو سـۆزو بێبـەزەیی. [32] لەگـەڵ ئـەوەش کـە دەزانن حوکمی دادپەروەرانەی خودا مـردنە بەسـەر ئەوانـەی ئـەم جـۆرە کارانـە دەکـەن، هێشـتا خۆیـان لەکـردنی ئەو کارانە دوورناخەنەوە، بەڵکو ڕازین بەوانەی دەیکەن.

## حوکمی داد پەروەرانەی خودا

## 2

کەواتـە هیچ بیانویەکت نییە ئەی ئەو مـرۆڤەی حوکـم بەسـەر خـەڵکی دەدەیت، چونکە کاتێ حوکم بەسەر خـەڵکی دەدەیـت، خـۆت تاوانـبار دەکەیـت، لەبەرئـەوەی تـۆ حوکـم بەسـەر خـەڵکی دەدەیـت، خۆشـت هـەمان شـت دەکەیـت. [2] بەڵام ئێمە دەزانـین حوکمی خودا ڕاستە بەسەر ئـەو کەسـانەی ئـەم جـۆرە شـتانە دەکـەن. [3] ئـەی ئـەو مرۆڤەی حوکم بەسـەر ئەوانـە دەدەیت کە ئەم جۆرە شـتانە دەکـەنو خۆشت هەمان شت دەکەیـت، ئایا وا دەزانی تۆ ڕزگارت دەبـێ لـەحوکمـی خـودا؟ [4] یـاخود بەچـاوی سووك سەیری دەوڵەمەندی نـەرمونـیانیو دانـبەخۆگرتنو ئارامی خـودا دەکەیـت؟ ئایـا تـۆ نـازانی نـەرمونـیانی خـودا هانـت دەدا بـۆ تۆبەکردن؟

[5] بـەڵام تـۆ لەبـەر دڵڕەقیو تۆبە نەکردنـت، تووڕەیـی بـۆ خـۆت کۆدەکەیتەوە بۆ ڕۆژی تووڕەبوون، ئـەو ڕۆژەی سـزای دادپەروەرانـەی خودای تیا دەردەکەوێ. [6] ئەوسا هەر مرۆڤـێك پاداشـتی خۆی وەردەگرێ بەپـێی کـرداری. [7] ژیانی هەتاهەتایش بـۆ ئەو کەسانە دەبێ کە هەوڵدەدەن بۆ شکۆمەندیو ڕێزگرتنو نەمری بە بـەردەوامبوونـیان لەسـەر کـرداری چـاك، [8] بـەڵام تووڕەیـیو ڕق بـۆ ئەوانـەی هـەوڵی خۆویستی دەدەنو ملکەچـی ڕاستی نابن بەڵام بۆ گوناه مل شۆڕ دەکەن. [9] هەروەها ناخۆشیو تەنگانـە بـۆ هـەموو مرۆڤـێکە کـە ڕەفتاری خراپ دەکات، یەکەمجار بۆ جوولەکـە ئیـنجا بـۆ یۆنـانی. [10] شـکۆمەندیو ڕێـزو ئاشتی بۆ هەموو ئەوانـەی چـاکە دەکـەن یەکەمجار بۆ جوولەکـە ئیـنجا یۆنـانی، [11] چونکە خودا لایەنگیری کەس ناکات.

[12] هـەموو ئەوانـەی شـەریعەتیان

نییەو هەڵە دەکەن، بەبێ شەریعەت لەناودەچن. ئەوانەش کە شەریعەتیان هەیەو هەڵە دەکەن، هەر بەو شەریعەتە تاوانبار دەکرێن. [13]ئەوانەی شەریعەتیان بیستووە بێ‌تاوان نین لەبەرامبەر خودا، تەنها ئەوانە نەبێت کە کاری پێ‌دەکەن، ئەوانە بێ‌تاوان دەبن. [14]جا کاتێ ئەوانەی جوولەکە نین، واتە ئەوانەی شەریعەتیان نییە، ئەوەی کە شەریعەت داوای دەکات، هەروەك شتێکی سروشتی لەسەری دەڕۆن، ئەوانە شەریعەتن بۆ خۆیان، هەرچەندە ئەوان ئەو شەریعەتەیان نییە. [15]دەری‌دەخەن ناوەڕۆکی شەریعەت لەدڵیان نووسراوە، ویژدانو بیریشیان لەناوەوە شایەتی بۆ ئەمە دەدات، ئەمەش جارێك تاوانباریان دەکات، جارێکی دیکە بەرگرییان لێ‌دەکات. [16]هەموو ئەم شتانەش لەو ڕۆژەدا دەبێ، کاتێ خودا حوکم بەسەر نهێنی خەڵکی دەدات بەهۆی عیسای مەسیح، بەپێی مزگێنیم.

### جوولەکەو شەریعەت

[17]بەڵام ئەی ئەوەی ناوی خۆت بەجوولەکە دەبەیت، پشت بەشەریعەت دەبەستی، شانازی بەخودا دەکەیت، [18]خواستی ئەو دەزانیتو چی باشە جیای دەکەیتەوە بەهۆی ئەوەی لەشەریعەت فێری بووی، [19]ئەگەر باوەڕت بەخۆت هەیە تۆ ڕێنیشاندەری کوێرانیو ڕووناکی بۆ ئەوانەی لە تاریکیدان، [20]هەروەها فێرکەری نەزانەکانو مامۆستای منداڵانی، چونکە تۆ شێوەی زانیاریو ڕاستیت هەیە لەشەریعەت، [21]کەواتە تۆ، ئەی ئەو کەسەی خەڵکی فێر دەکەیت، بۆچی خۆت فێرناکەی؟ لەکاتێکدا ئامۆژگاری دەکەیت :دزی مەکەن، کەچی خۆت دزی دەکەیت؟ [22]ئەی ئەوەی دەڵێیت داوێن‌پیسی مەکەن، کەچی خۆت داوێن‌پیسی دەکەی؟ ئەی ئەوەی ڕقت لەبت دەبێتەوە، کەچی پەرستگاکان تاڵان دەکەی؟ [23]ئەی ئەو کەسەی شانازی بەشەریعەت دەکەیت، کەچی دەتەوێ سووکایەتی بەخودا بکەیت بەوەی سەرپێچی شەریعەت دەکەیت؟ [24]لەبەر ئەمە لەکتێبدا نووسراوە: {بەهۆی ئێوەوە لەناو ئەوانەی جوولەکە نین کفر بەناوی خودا دەکرێ.}

[25]جا خەتەنەکردن کاتێ سوودی هەیە بەپێی شەریعەت هەڵسوکەوت بکەیت، بەڵام گەر تۆ بەپێچەوانەی شەریعەت ڕەفتار بکەیت، ئەو کاتە خەتەنەکردنەکەت وەك بێ خەتەنەی لێدێت. [26]جا گەر هاتوو خەتەنە نەکراوان بەپێی شەریعەت ڕەفتاریان کرد، ئایا وەك خەتەنەکراوان دایان نانێن؟ [27]ئیتر ئەوەی لەبنەڕەت خەتەنەنەکراوە، بەڵام لەسەر شەریعەت دەڕوا، ئایا حوکم نادا بەسەر تۆی جوولەکە ئەی ئەوەی سەرپێچی شەریعەت دەکەیت هەرچەندە خاوەنی کتێبیت‌و خەتەنەکراوی؟

[28]جوولەکە ئەوە نییە بەڕواڵەت جوولەکەیە، خەتەنەکراویش ئەوە نییە لەشی خەتەنەکراوە، [29]بەڵام جوولەکەی ڕاستەقینە ئەوەیە لەدڵ جوولەکەیە، خەتەنەکردنیش خەتەنەکردنی دڵە کە بەڕۆح دەبێ نەك بەنووسراوی شەریعەت. جا ئەمە ئەو مرۆڤەیە کە ستایشی خودا بەدەست دەهێنێ نەك هی ئادەمیزاد.

### سەرڕاستی خودا

## 3

کەواتە، چاکەی جوولەکەکان چییە؟ هەروەها سوودی خەتەنەکردن چییە؟ [2]زۆرە لەهەموو لایەکەوە. یەکەمیان ئەوەبوو خودا متمانەی بەجوولەکە هەبوو ووشەکانی خۆی خستە بەردەستیان. [3]چی ڕوودەدا گەر هاتوو هەندێکیان بێباوەڕ بوون؟ ئایا بێباوەڕییان ڕێگا لەسەرڕاستی خودا دەگری؟ [4]نەخێر! خودا هەمیشە ڕاستگۆیەو مرۆڤ هەمووی درۆزنە. هەروەك چۆن لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە: {ئەی خودا، ڕاستی ووشەکانت دیارە کاتێ دەدوێی، هەروەها سەرکەوتووی کاتێ حوکمدەدەی.}

[5]بەڵام گەر هاتوو خراپەکانمان ڕاست‌ودروستی خودای دەرخست، ئەوسا چی دەڵێین؟ ئایا خودا زۆردارە گەر تووڕەیی خۆی بەسەرماندا بهێنێ؟ (لێرە وەك مرۆڤێك قسە دەکەم.) [6]نەخێر! ئەگینا چۆن خودا جیهان حوکم دەدات؟ [7]لەوانەیە یەکێك بیەوێ بڵێ: (گەر بێتو بەهۆی درۆی منەوە، ڕاستی خودا زیاتر دەرکەوێ، بۆ شکۆمەندی ئەو، ئیتر بۆچی خودا تاوانبارم بکات وەك گوناهبارێك؟) [8]

یـان یەکـێکی دیکـە دەڵـێ: (بۆچی خـراپە نەکەین تاکو چاکەی لەدواوە بـێ؟) هـەروەك هـەندێ کـەس ئەم بوخـتانەمان بەدەمـەوە هەڵدەبەستن‌و دەڵـێن ئـێمە وامان ووتوە. جا سزای ئەوانە دادپەروەرانەیە.

**هیچ مرۆڤێك بێ‌گوناه نییە**

[9]کەواتـە، ئـیتر چـی؟ ئایا ئێمەی جوولـەکـە باشـترین؟ نەخێر، چونکە جوولـەکـەو یۆنـانی، وەك لەپێشـا باسـکراوە، هـەموویان ملکەچـی دەسـەڵاتی گونـاهن، [10]وەك لـەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە:

{هـیچ مرۆڤێك ڕاست‌ودروست نییە،
تەنانەت یەکێکیش!
[11]هەروەها یەکێك نییە تێبگات‌و یەکـێك نیـیە بـەدوای خـودا بگەڕێ.
[12]هـەموو خۆیـان لـەخودا دوورخستەوە،
جـا لـەبەرئـەوە هـەموو بێ‌سوود بوون،
کەس کاری چاك ناکات،
نەخێر تەنانەت یەکێکیش نا.}
[13]{قوڕگیان گۆڕێکی کراوەیە،
لـەزمانـیان فـێڵ‌و تەڵەکـەبازی دەڕژێ}،
{لـێویان پـڕە لـەژەهـری مـاری کوشندە}،
[14]{دەمیان پڕە لەنەفرەت‌و تاڵاو}
،
[15]{قاچـیان خـێرایە بـۆ خوێـن ڕشتن،
[16]ڕێـبازیان هـەموو خـراپەو وێران‌کردنە،
[17]هەروەها ڕێگەی ئاشتی نازانن}
،
[18]{ترسـی خـودایـان لـەبەر چاو نییە.}

[19]ئێسـتا دەزانـین هەرچـی شـەریعەت دەیلـێ بەوانەی دەڵێ کە لەژێـر سایەی شەریعەتدان، تا هەموو دەمـێك دابخـرێ‌و هـەموو جـیهان بکەوێـتە ژێر لێپرسینەوەی خودا. [20]بۆیـە کارکـردن بەشـەریعەت هـیچ کەسێك لای خودا بێ‌تاوان ناکات، بـەڵکو بـەهۆی شـەریعەت گونـاه دەناسرێ.

**بێ‌تاوانبوون بەباوەڕ**

[21]بـەڵام ئێستا دادپەروەری خودا بەجـیا لەشـەریعەت دەرکـەوت،

شەریعەتو پێغەمبەرانیش شایەتی بۆ دەدەن. 22 ئەو هەموو کەسێك بێتاوان دەکات لەسەر بناغەی باوەڕهێنان بەعیسای مەسیح بەبێجیاوازی، 23 چونکە هەموویان گوناهیان کردو لەشکۆمەندی خودا کەوتن. 24 بەلاّم خودا بەخۆڕایی بێتاوانی کردن* بە بەرەکەتی خۆی بەهۆی کڕینەوەیان بەخوێنی عیسای مەسیح، 25 ئەوەی خودا کردی بەکەفارەت* لەجیاتی گوناهەکانیان بە باوەڕهێنان بەخوێنی ئەو. ئەمەی کرد تا دادپەروەری خۆی دەربخات، چونکە خودا دانیگرت بەخۆیو چاوی پۆشی لەگوناهەکانی ڕابوردوویان، 26 بۆ دەرخستنی دادپەروەریەکەی لەکاتی ئێستا، تا ڕاستودروست بێو ئەوانە بێتاوان بکات کە باوەڕیان بەعیسا هەیە.

27 کەواتە کوانێ شانازی؟ نەماوە. بەچ شەریعەتێك؟ ئایا بەشەریعەتی کردار؟ نەخێر، بەڵکو بەشەریعەتی باوەڕ. 28 چونکە ئێمە بۆمان دەرکەوت مرۆڤ بە باوەڕ بێتاوان دەبێ، نەك کارکردن بەشەریعەت. 29 ئایا خودا تەنها خودای جوولەکەیە؟ ئایا خودای هەموو میللەتان نییە؟ بەڵێ، خودای هەموو میللەتانە. 30 جا چونکە خودا یەکە، ئەوەی خەتەنەکراوان لەسەر بنچینەی باوەڕ بێتاوان دەکات، خەتەنەنەکراوانیش بەهەمان باوەڕ بێتاوان دەکات. 31 جا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ئێمە بەهۆی باوەڕەوە شەریعەت پووچەڵ دەکەینەوە؟ نەخێر، بەڵکو ئێمە بەباوەڕ شەریعەت جێگیر دەکەین.

### نموونەی ئیبراهیم

## 4

بۆیە چی بڵێین لەبارەی ئیبراهیم کە بەپێی گۆشتو خوێن باوکمانە، چی دۆزییەوە؟ 2 ئەگەر ئیبراهیم بەپێی کردار بێتاوان بووە مافی ئەوەی هەبوو شانازی بکات، بەلاّم نەك بەرامبەر خودا. 3 کتێبی پیرۆز چی دەڵێ؟ :{ئیبراهیم باوەڕی بە خودا هێنا، ئەمەش بە ڕاستودروستی بۆی دانرا.}

4 ئەوەی کار دەکات، کرێیەکەی بە بەرەکەت بۆ دانانرێ، بەڵکو مافی خۆیەتی. 5 ئەوەش کار ناکات، بەلاّم باوەڕی بەوە هەیە خودا خوانەناس بێتاوان دەکات، ئەوا بەهۆی باوەڕ بەڕاستودروست دادەنرێ. 6

هەروەك چۆن داود باس لەپیرۆزی ئەو مرۆڤە دەكات، كە خودا بەڕاستودروست دایدەنێت بێ هیچ كردارێك، كاتێ دەڵێ: [7] {خۆزگەدەخوازرێ بەوانەی گوناهەكانیان بەخشراوەو هەڵەكانیان داپۆشراوە! [8] خۆزگەدەخوازرێ بەو كەسەی خوداوەند گوناهی لەسەر ناژمێرێ!}

[9] جا ئایا ئەم خۆزگەیە تەنها بۆ خەتەنەكراوانە یاخود بۆ ئەوانەشە كە خەتەنەنەكراون؟ چونكە باسمان كرد بەهۆی باوەڕەوە ئیبراهیم بە ڕاستودروست دانرا. [10] بەلام چۆن ئەمەی بۆ دانرا؟ دوای خەتەنەكردن یا پێش خەتەنەكردن؟ بێگومان ئەمە دوای خەتەنەكردن نەبوو، بەڵكو پێشی بوو. [11] ئیتر ئیبراهیم نیشانەی خەتەنەكردنی وەرگرت وەك مۆری ڕاستودروستی بەهۆی باوەڕ، كاتێ هێشتا خەتەنە نەكرابوو، تا ئیبراهیم بوو بەباوكی هەموو ئەوانەی باوەڕیان هەیەو خەتەنە نەكراون، بە ڕاستودروستی بۆیان دابنرێ، [12] هەروەها بوو بەباوك بۆ ئەو خەتەنەكراوانەی نەك تەنها خەتەنەكراون، بەڵكو لەبەرئەوەی بەڕێگای ئەو باوەڕەدا دەڕۆن كە هی ئیبراهیمی باوكمانە، پێش ئەوەی خەتەنە بكرێ.

[13] لەسەر بناغەی شەریعەت نەبوو ئەو بەڵێنەی بەئیبراهیمو نەوەكانی درا، تاكو ببێ بەمیراتگری جیهان، بەڵكو لەسەر بناغەی ئەو ڕاستودروستیە بوو كە بەهۆی باوەڕەوەیە. [14] گەر خاوەن شەریعەتەكان تەنها میراتگر بوونایە، ئەو كاتە باوەڕ بێ سوود دەبوو، بەڵێنی خوداش دەشكێنرا، [15] چونكە شەریعەت دەبێتە هۆی تووڕەیی خودا، گەر شەریعەت نەبووایە سەرپێچی دەرنەدەكەوت.

[16] بۆیە بەڵێن بە باوەڕەوەیەو بەپێی بەرەكەتە، تاكو مسۆگەر بێ بۆ هەموو نەوەی ئیبراهیم، نەك تەنها بۆ خاوەن شەریعەتەكان، بەڵكو بۆ ئەو باوەڕدارانەش كە باوەڕی ئیبراهیمیان هەیە، ئەو باوكی هەمووانە. [17] هەروەك لەكتێبی پیرۆزدا نووسراوە: {من تۆم كرد بەباوكی زۆر لەمیللەتان.} ئەو باوكی ئێمەیە لەبەرچاوی ئەو خودایەی ئیبراهیم باوەڕی پێهێنا، ئەو خودایەی مردووان زیندوودەكاتەوە، ئەو شتانە

بانگ دەکات کە بوونیان نییە وەك ئەوەی بوونیان هەبێ.
[18]هەرچەندە هیواش بڕابوو، ئیبراهیم بە ئومێدەوە باوەڕی هێنا کەوا دەبێ بە باوکی زۆر لەمیللەتان، بەپێی ئەوەی پێی ووترا بوو: {نەوەکەت بەم شێوەیە دەبێ.} [19]لەگەڵ ئەوەی لەشی وەك مردوو بوو، چونکە تەمەنی نزیکەی سەد ساڵ بوو، هەروەها سارای ژنی منداڵدانی مردبوو، هێشتا هەر باوەڕی لاواز نەببوو، [20]گومانی نەبوو لەبەڵێنی خودا، بەڵکو باوەڕی بەهێزی کردبوو، بەمەش شکۆمەندی بۆ خودا دانا، [21]بەتەواوی باوەڕی بەوە هەبوو ئەوەی خودا بەڵێنی پێداوە دەتوانێ بیکات، [22]لەبەر ئەمە بوو {بەڕاستودروستی بۆی دانرا.} [23]ئەوەی نووسراوە: {بۆی دانرا} تەنها لەپێناوی ئەو نەبوو، [24]بەڵکو لەپێناوی ئێمەش بوو، جا ئێمەش بۆمان دانرا بەهۆی باوەڕمان بەخودا ئەوەی عیسای مەسیحی لەنێو مردووان زیندووکردەوە، [25]خودا ئەوی دایەدەست مردن لەپێناوی گوناهەکانمان، ئینجا هەڵیساندەوە لەپێناوی بێتاوانکردنمان.

## رزگاربوون لەتووڕەیی خودا

## 5

کەواتە خودا لەسەر بناغەی باوەڕ بێتاوانی کردین، بەهۆی عیسای مەسیحی خوداوەند لەگەڵ خودا ئاشتبووینەوە. [2]جا بەهۆی عیساوە بوو دەرگای باوەڕمان بۆ کرایەوەو بەر ئەو بەرەکەتە کەوتین کە ئێستا تیایداین، ئێمە شانازی دەکەین بەو هیوایەی هەمانە لەشکۆمەندی خودا. [3]بەتەنها ئەمە نا، بەڵکو لەکاتی تەنگانەشدا شانازی دەکەین، چونکە ئێمە دەزانین تەنگانە دان بەخۆگرتنمان تیا دروست دەکات، [4]دان بەخۆگرتنیش ئەزمون، ئەزمونیش هیوامان تیا دروست دەکات، [5]هیواش نابێتە هۆی شەرمەزاری، چونکە خودا دڵمانی پڕکردووە لەخۆشەویستی خۆی بەو ڕۆحە پیرۆزەی بەئێمەی بەخشیوە.
[6]کاتێ هێشتا لاواز بووین، لەکاتی پێویست، مەسیح لەپێناوی خوانەناسان مرد. [7]بەدەگمەن یەکێك لەپێناوی مرۆڤێکی ڕاستودروست دەمرێ، لەوانەیە لەپێناوی مرۆڤێکی باش یەکێك بوێرێ بمرێ. [8]بەڵام خودا خۆشەویستی خۆی بۆ

دەرخستین، بەوەی مەسیح لەپێناوی ئێمەدا مرد، کاتێ هێشتا گوناهبار بووین.
[9]جا لەبەرئەوەی ئێستا بەخوێنی ئەو بێتاوان بووین، لەوەش زیاتر بەهۆی ئەو ڕزگار دەبین لەتووڕەیی خودا! [10]ئەگەر خودا ئاشتی کردینەوە لەگەڵ خۆی بەمردنی ڕۆڵەکەی کاتێ ئێمە دوژمنی بووین، چەند زیاتر ئێمە کە ئاشتبووینەوە ڕزگارمان دەبێ بەژیانی ئەو! [11]نەك تەنها بەم شێوەیە بەڵکو شادومانین بەخودا، چونکە ئێستا بەهۆی خوداوەندمان عیسای مەسیح لەگەڵ خودا ئاشتبووینەوە.

### ئادەمو مەسیح

[12]لەبەرئەمە، چۆن بەهۆی یەکێك گوناە هاتە جیهان، بەهۆی گوناهیش مردن، بەهەمان شێوەیە مردنیش بۆ هەموو مرۆڤێك هات، چونکە هەموویان گوناهیان کرد. [13]چونکە گوناە لەجیهان بڵاوبۆوە پێش هاتنی شەریعەت، بەڵام حساب بۆ گوناە نەدەکرا، چونکە شەریعەت نەبوو. [14]بەڵام مردن لەئادەمەوە تا موسا حوکمڕانی دەکرد، تەنانەت بەسەر ئەوانەش کە بەشێوەی ئادەم گوناهیان نەکردبوو، ئەو ئادەمەی نموونەی ئەو کەسە بوو کە دوای دێت. [15]بەڵام دیاری خودا وەك گوناهی ئادەم نییە، چونکە مردن زۆر مرۆڤی گرتەوە بەهۆی گوناهی یەکێك، جا چەند زیاتر بەهۆی مرۆڤێك کە عیسای مەسیحە زۆر لەخەڵکی بەرەکەتی خوداو دیاری بەرەکەت بەدەستدەهێنن. [16]لێرە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەنجامی دیاری خوداو گوناهی مرۆڤێك! چونکە گوناهی یەکێك مرۆڤی بەرەو لەناوبردن برد، بەڵام دیاری خودا پاش چەندەها گوناە مرۆڤی بەرەو بێتاوانی برد. [17]گەر مردن بەهۆی گوناهی یەکێك حوکمڕانی دەکرد، ئیتر چەند زیاتر ئەوانەی پڕی بەرەکەتو دیاری ڕاستودروستیان وەرگرتووەو حوکمڕانی دەکەن لەم ژیانە بەهۆی یەکێك کە عیسای مەسیحە.
[18]کەواتە، چۆن یەك گوناە هەموو مرۆڤێکی تاوانبارکرد، بەهەمان شێوە یەك کاری ڕاستودروست هەموو کەسێکی بێتاوانکرد بۆ ژیان. [19]چونکە چۆن

بە یاخیبوونی یەکێك زۆر کەس گوناهبار بوو، بەهەمان شێوە بەگوێڕایەڵی یەکێك زۆر کەس بێتاوان دەبێ.

[20] ئیتر شەریعەت هاتەکایەوە تا زۆری گوناە دەربخات، بەڵام لەگەڵ زۆربوونی گوناە بەرەکەت زۆر زیاتربوو. [21] جا چۆن گوناە بەهۆی مردن حوکمڕانی کرد، بەهەمان شێوە بەهۆی بێتاوانبوون بەرەکەت حوکمڕانی دەکات بۆ ژیانی هەتاهەتایی بەهۆی عیسای مەسیحی خوداوەندمان.

## ئازادبوون لەگوناە

# 6

باشە چی بڵێین؟ بەردەوام بین لەسەر گوناە کردن بۆ ئەوەی بەرەکەتی خودا زیاد بێت؟ [2] نەخێر! ئێمە کە گوناە تیاماندا مردووە، ئیتر چۆن تیایدا دەژین؟ [3] ئایا نازانن کاتێ ئێمە هەموومان لەئاوهەڵکێشراین لەعیسای مەسیح، ئەو لەئاوهەڵکێشانە لەمردنی ئەودا بوو؟ [4] جا لەبەرئەمە بە لەئاوهەڵکێشانمان لەگەڵ ئەو لەمردن نێژراین، تا چۆن باوك بەشکۆمەندیەوە مەسیحی لەنێو مردووان زیندووکردەوە، ئاوا ئێمەش لەسەر ژیانێکی تازە دەڕۆین.

[5] گەر ئێمە لەگەڵ ئەو لەمردنی یەکمان گرتبێ، ئەوا بێگومان لەزیندووبوونەوەشی دەبێ لەگەڵی یەك بگرین. [6] ئەمە دەزانین: مرۆڤە کۆنەکە تیاماندا لەخاچدرا لەگەڵ مەسیح، تا لەشی گوناهبارمان نەمێنێو ئیتر بەکۆیلەیی گوناە نەمێنینەوە. [7] چونکە ئەوەی مرد لەگوناە ئازادبوو.

[8] جا لەبەرئەوەی لەگەڵ مەسیح مردووین، ئێمە باوەڕمان هەیە لەگەڵ ئەویش دەژین. [9] چونکە ئێمە دڵنیاین مەسیح لەناو مردووان هەستاوەتەوە، جارێکی دیکە نامرێتەوە. ئیتر مردن دەسەڵاتی بەسەریدا نییە. [10] چونکە ئەو مردنەی مرد، بۆ گوناە مرد یەکجار، بەڵام ئەو ژیانەی دەژی بۆ خودا دەژی.

[11] ئیتر ئێوەش، خۆتان بەمردوو دابنێن سەبارەت بەگوناە، هەروەها بەزیندوو بۆ خودا لەعیسای مەسیحدا. [12] کەواتە مەهێڵن گوناە حوکمڕانی لەشی لەناوچووتان بکات، تا ملکەچی ئارەزووەکانی بن. [13] ئەندامانی لەشتان پێشکەش

مەکـەن بۆ گوناه، تا ببێت بەئامێرێك بـۆ خـراپەکاری، بـەڵکو خۆتـان پێشکەشـی خـودا بکـەن، چـونکە ئـێوەی لەمـردنەوە بـۆ ژیـان هێناوە، ئەندامانی لەشتان بۆ خودا دانێن وەك ئامـێرێك بـۆ ڕاسـتودروسـتی. [14] لەمـەولا گونـاه هـیچ دەسـەڵاتی بەسـەرتان نەماوە، چونکە ئێوە لەژێر سـایەی شـەریعەت نین، بەڵکو لەژێر سایەی بەرەکەتن.

### کۆیلەکانی چاکە

[15]کەواتـە چـی؟ ئایا هەڵە بکەین چـونکە ئێمە لەژێر سایەی شەریعەت نـین بـەڵکو لەژێر سایەی بەرەکەتین؟ نەخێر! [16]ئایا نازانن ئێوە کاتێ خۆتان پێشـکەش دەکـەن وەك کۆیلـەی ملکـەچ، دەبـن بـەکۆیلـەی ئەوەی ملکەچـن بۆی، جا یان بۆ گوناه کە بـەرەو مردنـتان دەبـات، یـاخود بـۆ گوێـڕایەڵی کـە بـەرەو ڕاسـتودروسـتیتان دەبات؟ [17]بەڵام سـوپاس بـۆ خـودا، لەگـەڵ ئـەوەی کۆیلـەی گوناه بوون، بەهەموو دڵتان ملکەچـی ئەو شێوە فێرکردنە بوون کـە وەرتـانگرتـبوو. [18]ئـێوە سەربەسـتبـوون لـەگوناه، بـوون بەکۆیلەی ڕاستودروستی.

[19]لێرە وەك مرۆڤێك قسە دەکەم بـەهۆی لاوازی لـەشـتان. ئـیتر چۆن لـەپێشـا لـەشـتان پێشکەش کرد وەك کۆیلـەی گـڵاوی‌و خـراپەکاری، بەهەمان شێوە ئێستا لـەشتان پێشکەش بکـەن وەك خـزمەتکاری ڕاستودروستی بۆ پاكو پیرۆزی. [20] کـاتێ ئـێوە کۆیلـەی گونـاه بوون، سەربەسـت بـوون سـەبارەت بەڕاسـتودروسـتی. [21] ئـەو کاتـە چـیتان دەسکەوت لـەو شتانەی ئێستا شـەرمی لێدەکـەن، کـە کۆتاییەکەی مـردنە؟ [22]بـەڵام ئێسـتا ئـازاد بـوون سـەبارەت بەگوناه، بوون بەکۆیلەی خـودا، جـا ئـێوە لـەبەرهـەمی پاكو پـیرۆزی دەچـننەوە، کـە ئەنجامەکەی ژیـانی هەتاهەتایـیە. [23]چـونکە کرێی گونـاه مـردنە، بـەڵام دیـاری خـودا ژیـانی هەتاهەتاییە لەعیسای مەسیحی خوداوەندمان.

### ئازادبوون لەشەریعەت

# 7

ئەی برایان، ئایا ئێوە نازانن – چونکە مـن بـۆ ئەوانەی لەشەریعەت دەزانن دەدوێـم –شـەریعەت تـەنها ئەوەندە

دەسەڵاتی بەسەر مرۆڤ هەیە تا زیندووە؟ [2]ژنێك کە شووی کردبێ بەهۆی شەریعەت بەمێردەکەیەوە دەبەسترێتەوە هەتا مێردەکەی زیندووە، بەڵام کاتێ مرد، ئەوسا ئازاد دەبێ لەشەریعەتی شووکردن. [3] جا لەبەرئەمە تا مێرد زیندووە گەر ژن پیاوێکی دیکەی هەبێ، بەداوێنپیس ناودەبرێ، بەڵام گەر مێرد بمرێ، ئەوسا ژن سەربەست دەبێ لەشەریعەتی ژنو مێردایەتی، تەنانەت گەر ببێ بەهی پیاوێکی کەش بەداوێنپیس دانانرێ.

[4]ئەی برایان، ئاوا ئێوەش بەهۆی لەشی مەسیح بوون بەمردوو لەلایەن شەریعەتەوە، تا ببن بەهی یەکێکی کە، بەهی مەسیح خۆی، ئەوەی لەناو مردووان هەستایەوە، تا بەروبوومتان هەبێ بۆ خودا. [5]کاتێ بەپێی لەش دەژیاین، ئەوسا ئارەزووە خراپەکانمان کە شەریعەت دەریخستووە کاری لەئەندامەکانی لەشمان دەکرد، تا بۆ مردن بەرووبووم بدەین. [6]بەڵام ئێستا ئازاد بووین لەشەریعەت، بەمردن سەبارەت بەوەی ئێمەی بەستبووەوە، بۆ ئەوەی بەرێگای نوێی ڕۆح خزمەت بکەین، نەك بەرێگای کۆنی شەریعەتی نووسراو.

**شەریعەت پیرۆزە**

[7]کەواتە چی بڵێین؟ ئایا شەریعەت گوناهە؟ نەخێر! من گوناهم نەدەزانی بەهۆی شەریعەتەوە نەبێ. هەروەها من ئارەزووی «خراپ»م نەدەزانی گەر شەریعەت نەیووتایە: {ئارەزوو مەکە!} [8]بەڵام گوناه ئەم ڕاسپاردەیەی وەك هەل بەکارهێنا ئیتر هەموو ئارەزوویەکی لەمندا وورووژاند، چونکە گوناه بەبێ شەریعەت مردووە. [9]من لەپێشا بەبێ شەریعەت دەژیام، بەڵام کاتێ ڕاسپاردە هات، گوناه ژیاو منیش مردم. [10]ئەو ڕاسپاردەیەی مەبەست بوو لێی ژیان بهێنێ، هەرخۆی مردنی هێنا، [11]چونکە گوناه ڕاسپاردەکەی وەك هەلێك بەکارهێناو منی پێخەڵەتاندو کوشتمی. [12]کەواتە شەریعەت پیرۆزە*، هەروەها ڕاسپاردەش پیرۆزو دادپەروەرو باشە. [13]ئایا ئەوەی باشە، بۆتە هۆی مردنم؟ نەخێر! بەڵام گوناه، تا دەرکەوێ گوناهە، لەشتی باش مردنی بۆ

هێنام، تا بەهۆی ڕاسپاردەوە گوناه بێ بەهەڵەیەکی گەورە.

**ئەی منی مرۆڤی بەدبەخت!**

[14]ئێمە دەزانین شەریعەت شتێکی ڕۆحییە، بەڵام من دونیاییمو وەك کۆیلە فرۆشراوم بە گوناه. [15]ئەوەی دەیکەم تێی ناگەم، چونکە ئەوەی دەمەوێ نایکەم، بەڵکو ئەوەی ڕقم لێیەتی ئەوە دەکەم. [16]جا ئەگەر ئەوە بکەم کە نامەوێ، ئەوسا داندەنێم بەباشی شەریعەت. [17]کەواتە ئێستا، ئیتر ئەوە من نیم وادەکەم، بەڵکو ئەو گوناهەی لەمن نیشتەجێیە. [18]چونکە دەزانم لەمندا، واتە لەلەشم چاکە ناژی. من دەمەوێ ئەو چاکەیە بکەم، بەڵام ناتوانم بیکەم. [19]من ئەو چاکەی دەمەوێ نایکەم، بەڵام ئەو خراپەی نامەوێ ئەوەیە دەیکەم. [20]گەر هاتوو شتێکم کرد کە نامەوێ، ئیتر ئەوە من نیم ئەو شتە دەکات، بەڵکو ئەو گوناهەیە کە لەمن نیشتەجێیە.

[21]من وای دەبینم وەك یاسای لێهاتووە، ئەویش ئەوەیە من دەمەوێ کاری چاکە بکەم بەڵام خراپە لەتوانامدایە. [22]چونکە من بەقووڵایی ناوەڕۆکم دڵشادم بەشەریعەتی خودا، [23]بەڵام من هەست بەیاسایەکی تر دەکەم لەئەندامانی لەشم دایە بەربەرەکانی ئەو یاسایە دەکا کە لەمێشك دایە، وام لێدەکات ببم بەدیلی ئەو یاسایەی گوناه کە لە ئەندامانی لەشم نیشتەجێیە. [24]ئەی منی مرۆڤی بەدبەخت! کێ لەم لەشەی مردن ڕزگارم دەکات؟ [25]سوپاس بۆ خودا بەهۆی عیسای مەسیحی خوداوەندمان!

بۆیە ئیتر من بەخۆم بەمێشك خزمەتی شەریعەتی خودا دەکەم، بەڵام بەلەش یاسای گوناه.

**ئازادبوون لەمردن**

# 8

بۆیە لەمەولا ئەوانەی لەعیسای مەسیحن تاوانبار ناکرین، [2]چونکە بەهۆی عیسای مەسیح یاسای ڕۆحی ژیان، ئازادم دەکات لەیاسای گوناهو مردن. [3]چونکە ئەوەی لەتوانای شەریعەت نەبوو، لەش لاوازی کردبوو، خودا هێنایەدی کاتێ ڕۆڵەکەی نارد لەشێوەی لەشێك لە لەشی گوناهباری ئێمە دەکات، ئەوسا ئەو لەبەر گوناه، حوکمیدا

بەسەر ئەو گوناهەی لە لەشدایە، [4]تا ڕاستودروستی شەریعەت لەئێمەدا بێتەدی، کە بەپێی ڕۆح ڕەفتار دەکەین نەك بەپێی لەش.

[5]جا ئەوانەی بەپێی لەش دەژین کاروباری لەش مێشکی پڕکردوون، هەروەها ئەوانەی بەپێی ڕۆح دەژین کاروباری ڕۆح مێشکی پڕکردوون. [6]چونکە بایەخدان بەلەش مردنە، بەڵام بایەخدان بەڕۆح ژیانو ئاشتییە، [7]بۆیە بایەخدان بەلەش دوژمنایەتییە لەگەڵ خودا، چونکە ملکەچ ناکات بۆ شەریعەتی خودا، لەبەرئەوەی ناتوانێ. [8]جا ئەوانەی لەژێر دەسەڵاتی لەشدان ناتوانن خودا ڕازی بکەن.

[9]گەر ڕۆحی خودا لەناوەڕۆکتان بێ، ئەوا ئێوە لەژێر دەسەڵاتی لەش نین، بەڵکو لەژێر دەسەڵاتی ڕۆحدان. ئیتر هەر یەکێك ڕۆحی مەسیحی نەبێ، ئەوا سەر بەمەسیح نییە. [10]گەر مەسیح لەئێوەدا بێ، هەرچەندە لەش بەهۆی گوناه مردووە، بەڵام ڕۆحتان زیندووە بەهۆی ڕاستودروستی. [11]گەر ئەو ڕۆحەتان تێدا بژی کە عیسای لەنێو مردووان زیندووکردەوە، ئاواش ئەوەی مەسیحی لەنێو مردووان زیندووکردەوە لەشی لەناوچووتان زیندوو دەکاتەوە بەهۆی ڕۆحیەوە کە تیاتان نیشتەجێیە.

[12]کەواتە ئەی برایان ئێمە قەرزارین، بەڵام قەرزاری لەش نین، تا بەپێی لەش بژین. [13]گەر ئێوە بەپێی لەش بژین دەمرن، بەڵام گەر بەڕۆح کردارەکانی لەشتان مراند ئەوسا دەژین. [14]چونکە هەموو ئەوانەی ڕۆحی خودا ڕابەرایەتیان دەکات، ڕۆڵەی خودان. [15]ئێوە ڕۆحی کۆیلەییتان وەرنەگرتووە، تاوەکو بترسن، بەڵکو ڕۆحی ڕۆڵەییتان وەرگرتووە، کە بەهۆیەوە هاوار دەکەین: (بابە! باوکە!) [16]ئەو ڕۆحە خۆی شایەتی دەدا لەگەڵ ڕۆحمان ئێمە ڕۆڵەی خوداین. [17]جا گەر ڕۆڵە بین، میراتگریشین، بەواتای میراتگری خوداو بەشداری میراتی مەسیح، گەر ئێستا بەشداری ئەو بکەین لەئازارکێشان، بۆ ئەوەیە بەشداری لەشکۆمەندیەکەشی بکەین.

### شکۆو مەزنی داهاتوو

[18]من دڵنیام ئازاری ئێستا هیچ

نیـیە گـەر بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو شـکۆمەندیەی لـەداهـاتوو پـێمان ڕادەگەیـــــنرێ. [19]لەبەرئـــــەوە دروسـتکراو بەپەرۆشـەوە چـاوەڕێی ئەو ڕۆژە دەکات کە خودا ڕۆڵەکانی دەستنیشـــان بکـــات. [20]ملکەچـــی دروسـتکراو بـۆ شـتی هـیچوپـووچ بـەئـارەزووی خـۆی نـەبوو، بـەڵکو بەخواسـتی ئەوە بوو کە ملی پێکەچ کـرد، بەهیوای ئەوەی [21]دروستکراو لەکۆیلەیەتی گەندەڵی ئازاد بێ بەرەو ئــەو سەربەسـتییە شـکۆدارەی بـۆ ڕۆڵەکانی خودایە.

[22]ئـــێمە دەزانـــین هـــەموو دروسـتکراو تـاوەکو ئێستا دەناڵێنێ وەك ئـەوەی ژانـیان گرتـبێ. [23]تەنها ئەمە نا، بەڵکو ئێمەش کە پێشەبەرەی ڕۆحـی پیرۆزمـان هەیە، بە پەرۆشەوە چـاوەڕێی ئـەوە دەکـەین خـودا ئێمە بـەمـندالّی خـۆی دابـنێ، لـەشمـان بـەخوێن بکڕێتەوە. [24]ئێمە بەئاواتەوە ڕزگارمـان بـوو. بـەڵام ئاواتی بینراو ئـاوات نییە، جا چۆن ئاوات بەشتێك دەخـوازرێ لـــەبەردەسـتدایـە؟ [25]بـەڵام گـــەر ئـێمە ئـاواتی شـتێك بخـــوازین کـــە لەبەردەستمان نییە، ئەوسـا بـەدان بەخۆگرتنەوە چاوەڕێی دەکەین.

[26]هـــەروەها ڕۆحـــی پیرۆزیـــش یارمـەتی بـێ هێزیمان دەدات. چونکە ئـێمـە نـازانین بەچ شێوەیەك پێویستە نوێژ بکەین، بەڵام ڕۆحی پیرۆز خۆی بۆمـــان دەپاڕێـــتەوە لای خـــودا بەشـێوەیەك بەدەم باس ناکرێ. [27]جا خـودا ئەوەی دڵ دەپشـکنێ، دەزانێ بیرکـردنەوەی ڕۆحـی پـیرۆز چـییە، ئـەو خـــۆی دەپاڕێـتەوە بـۆ بـرا پیرۆزەکـان، بەپێی خواستی خودا.

[28]ئێمە دەزانین لـە هەموو شتێکدا خـودا لـەپێناوی خێرو چاکەی ئەوانە کاردەکـات کـە خۆشـیان دەوێ، ئەوانـەی بەپێی مەبەستی خۆی بانگی کردوون. [29]ئەوانەی لـەپێشا ناسیانی، لـەپێشـا دیاریکـردن، تا وەك وێنەی ڕۆڵەکەی ئەویان لێبێت، تا عیسا ببێ بـە نۆبـەرە لـەنـێو خوشـكو بـرایانی زۆر. [30]ئەوانەی لـەپێشا دیاریکردن، بانگیکـردن، ئەوانـەی بـانگیکردن بـێتاوانیکـردن، ئەوانـەی بێتاوانی کردن، شکۆداری کردن.

[31]دوای ئەمـە، ئـیتر چـی بڵێین؟ گـەر خودا لـەگەڵمان بێت، ئیتر کێ دژمانە؟ [32]ئەوەی دەستی بەڕۆڵەکەی خـۆی نەگـرت، بـەڵکو لەپێـناوی

هەمووان پێشکەشی کرد، ئیتر چۆن لەگەڵ ئەو هەموو شتێکمان ناداتێ؟ [33]جا کێ دەتوانێ تاوان بخاتە پاڵ هەڵبژێرراوانی خودا؟ ئەوەی بێتاوان دەکات خودایە. [34]هەروەها کێ دەتوانێ تاوانباریان بکات؟ عیسای مەسیح نییە ئەوەی لەپێناوی ئەواندا مرد، بەڵکو لەمەش زیاتر ئەو بوو لەناو مردووان هەستایەوەو لەلای دەستە ڕاستی خودا دانیشت، هەر ئەویش نییە نوێنەری ئێمەیەو بۆمان دەپاڕێتەوە؟ [35]ئیتر کێ دەتوانێ لەخۆشەویستی مەسیح جیامان بکاتەوە؟ ناخۆشیو تەنگانە یاخود چەوسانەوەو برسێتیو ڕووتیو ترسو شمشێر؟ [36]هەروەك لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە: {وەك مەڕێك بیانەوێ سەری ببڕن، بەهۆی تۆوە هەموو ڕۆژێك ڕووبەڕووی کوشتن دەبینەوە!} [37]بەلام ئێمە لەهەموو ئەم شتانە لەسەرکەوتووان مەزنترین بەهۆی ئەوەی ئێمەی خۆش دەوێ. [38]من دڵنیام نەمردنو نەژیان، نەفریشتەکانو نەسەرۆکەکانی ڕۆحە بەدکارەکان، نەشتەکانی ئێستاو نەشتەکانی داهاتوو، نەهێزەکان، [39]نەبەرزیو نزمی، نەهیچ شتێك لەهەموو دروستکراوان، ناتوانێ جیامان بکاتەوە لەخۆشەویستی خودا، ئەوەی لەعیسای مەسیحی خوداوەندمانە.

### ئایا ووشەی خودا نایەتەدی؟

## 9

من لەمەسیح ڕاستی دەڵێمو درۆ ناکەم، ڕۆحی پیرۆزیش شایەتی ویژدانمە، [2]کە زۆر دڵتەنگمو لەدڵم ئازارێکی بێبڕانەوە هەیە، [3]چونکە هیوام دەخواست خۆم نەفرەتم لێ بکرایەو لەمەسیح بێبەش بوومایە لەپێناوی خوشكو برایانم، ئەوانەی لەڕەگەزی منن بەپێی لەش. [4]ئەوانە ئیسرائیلیەکانن، ڕۆڵەیەتیو شکۆمەندیو پەیمانەکانو وەرگرتنی شەریعەتو خواپەرستیو بەڵێنەکان بۆ ئەوانە، [5]هەروەها باوباپیران دەگەڕێنەوە بۆ ئەوان، مەسیحیش بەپێی لەش لەوان پەیدا بووە، خودایە بەسەر هەموو شتێك، پیرۆزە تاهەتایە! ئامین.

[6]مەبەست ئەوە نییە ووشەی خودا نایەتەدی. چونکە هەموو ئەوانەی نەوەی ئیسرائیلن،

ئیسرائیلی نین، [7]هەروەها هەموو ئەوانەی نەوەی ئیبراهیمن ڕۆڵەی نین، بەڵکو هەروەك لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە: {بەهۆی ئیسحاق نەوەکەت ناودەبرێ.} [8]مەبەست لەمەش ئەوەیە: ئەوانەی ڕۆڵەی لەشن ڕۆڵەی خودا نین، بەڵکو تەنها ڕۆڵەکانی بەڵێن بەنەوەی ئیبراهیم دادەنرێن. [9]دەقی بەڵێنەکەش ئەمەیە: {لەکاتی دیاریکراو دەگەڕێمەوە، ساراش کوڕێکی دەبێ.} [10]بەلام بەتەنها ئەمە نا، بەڵکو ڕفقەش لەیەکێك سکی بوو کە ئیسحاقی باوکمانە، [11]هێشتا دوو کوڕەکە لەدایك نەبوو بوونو چاکەو خراپەیان نەکردبوو، ئەمەش تا مەبەستی خودا لەهەڵبژاردن بمێنێتەوە، نەك لەسەر بناغەی کردار، بەڵکو لەسەر بناغەی بانگکردن، [12]لەلایەن خوداوە پێی ووترا: {کوڕی گەورە خزمەتی کوڕی بچووك دەکات}، [13]هەروەك نووسراوە: {یاقوبم خۆشویست، بەلام ڕقم لەعیسو بوو. }

**بەزەیی خودا**

[14]کەواتە، چی بلێین؟ ئایا خودا زۆردارە؟ نەخێر! [15]چونکە خودا بەموسای ووت: {بەزەیییم دێتەوە بەوەی دەمەوێ بەزەییم پێی‌بێتەوە، دڵنەوایی ئەوە دەکەم کە دەمەوێ دڵنەوایی بکەم.} [16]کەواتە، شتەکە پشت بەئارەزوو و هەوڵدانی مرۆڤ نابەستێ، بەڵکو تەنها پشت بە بەزەیی خودا دەبەستێ. [17]جا کتێبی پیرۆز بە فیرعەون دەڵێ: {تۆم بەرزکردەوە تاوەکو توانای خۆم لەتۆدا دەرخەمو ناوم لەهەموو زەوی بلاوبێتەوە.} [18]کەواتە خودا بەزەیی بەو کەسە دێتەوە کە خۆی دەیەوێ، دلی ئەو کەسە ڕەق دەکات کە خۆی دەیەوێ.

[19]یەکێکتان پێم دەڵێ: (ئیتر بۆچی خودا سەرزەنشتمان دەکات؟ چونکە کێ دەتوانێ دژی خواستی ڕاوەستێ؟) [20]تۆ کێیت ئەی مرۆڤ هەتا وەلامی خودا بدەیتەوە؟ ئایا شتێکی دروستکراو بەدروستکەرەکەی دەلێ: بۆچی وا دروستت کردووم؟ [21]ئایا گۆزەدروستکەر دەسەلاتی بەسەر قوڕ نییە تا لەهەمان قوڕ گۆزەیەك بۆ مەبەستی ڕێزو گۆزەیەك بۆ مەبەستی سووك دروست بکات؟

[22]کەواتە چییە ئەگەر خودا بیەوێ تووڕەیی دەربخاو توانای خۆی ئاشکرا بکا، بەهەموو دان بەخۆداگرتنێکەوە بەرگەی جامی تووڕەی خۆی کە ئامادەیە بۆ لەناوبردن بگری؟ [23]ئەگەر ئەمەی کرد تا دەوڵەمەندی شکۆی خۆی ئاشکرا بکات لە جامی بەزەیی خۆیدا کە لەپێشەوە ئامادەی کرد بوو بۆ شکۆمەندی، [24]ئەوەی ئێمەش بانگکراوین بۆی، نەك تەنها لەجوولەکەکان بەڵکو لەمیللەتانیش؟ [25]هەروەك چۆن خودا بەهۆی هۆشەعی پێغەمبەری خۆی دەڵێ: {دەمەوێ ئەو گەلە بانگ بکەم وەك گەلی خۆم کە گەلی من نین، هەروەها ئەوە بکەم بە خۆشەویستی خۆم کە خۆشەویست نییە.} [26]جا لەکوێ بەوان ووترا: { ئێوە گەلی من نین، ئەوسا ئەوان لەوێ بەرۆڵەی خودای زیندوو ناودەبرێن.} [27]بەلاّم ئەشعیا هاوار دەکاتو دەربارەی ئیسرائیل دەڵێ: {گەر ژمارەی رۆڵەکانی ئیسرائیل بەقەدەر لمی دەریا بێ، تەنها ژمارەیەکی کەم رزگاریان دەبێ، [28]چونکە خوداوەند حوکمی خۆی بەدادپەروەریو بەخێرایی بەسەر زەویدا دەهێنێ.} [29]ئیتر چۆن ئەشعیا لەپێشا ووتویەتی: {گەر خوداوەندی دەسەلاّتدار نەوەی بۆ نەهێشتباینەوە، وەك سەدومو عەمورەمان لێدەهات. }

[30]کەواتە کورتەی ئەم قسانە چییە؟ ئەو میللەتانەی بەدوای راستودروستی نەگەڕان، راستودروستیان بەدەستهێنا بەهۆی باوەڕ. [31]کەچی ئیسرائیلیەکان، هەرچەندە دوای ئەو راستودروستییە کەوتبوون ئەوەی لەشەریعەتەوە بوو، بەلاّم نەیانتوانی بەدەستیبهێنن. [32]بۆچی؟ چونکە هەوڵدانەکەیان لەسەر بناغەی باوەڕ نەبوو، بەڵکو لەسەر بناغەی کردار بوو. ئەوسا بەبەردی کۆسپ پێیان هەڵکەوت، [33]هەروەك چۆن کتێبی پیرۆز دەڵێ: {ئەوەتا من لەشاری داود* بەردی کۆسپو بەردی کەوتن دادەنێم، بەلاّم ئەوەی باوەڕی پێدەهێنێ شەرمەزار نابێ.}

# 10

ئەی برایان، ئاواتی دڵمو نوێژەکانم بۆ خودا لەپێناوی رزگاربوونی

ئەوانە. [2]شایەتیان بۆ دەدەم ئەوان دڵگەرمن بۆ خودا، بەڵام بەزانینەوە نا. [3]جا چونکە ڕاستودروستی خودایان نەدەزانی، ئیتر هەوڵی ڕاستودروستی خۆیاندا بەڕێگای تایبەتی خۆیان، ئەوسا ملکەچ نەبوون بۆ ڕاستودروستی خودا. [4]چونکە شەریعەت بەمەسیح تەواو بوو بۆ ڕاستودروستی هەموو ئەوانەی باوەڕی پێدەهێنن.

**ڕزگاری بۆ هەمووان**

[5]موسا دەربارەی ئەو ڕاستودروستیەی بەپێی شەریعەتە نووسیویەتی: {هەر کەسێك ئەمانە بکات، پێی دەژی.} [6]بەڵام ئەو ڕاستودروستیەی لەباوەڕەوەیە دەڵێ، لەدڵتدا مەڵێ: {کێ سەردەکەوێ بۆ ئاسمان؟} تا مەسیح بهێنێتە خوارەوە، [7]یاخود: {کێ دادەبەزێ بۆ ناو بیری بێبن؟} هەتا مەسیح لەناو مردووان بهێنێتە دەرەوە. [8]بەڵام چی دەڵێ؟ {ووشەی خودات لێتزیکە، لەسەر لێوانتەو لەدڵتدایە}، ئەم ووشەیەش ئەو ووشەی باوەڕەیە کە بڵاوی دەکەینەوە. [9]چونکە گەر بەدەم دانت پیانا عیسا خوداوەندە، هەروەها لەدڵەوە باوەڕت هێنا خودا لەناو مردووان زیندووی کردووەتەوە، ئەوسا ڕزگارت دەبێ. [10]چونکە بەدڵ باوەڕهێنان بەرەو ڕاستودروستیت دەبات، دانپیانان بەدەم بەرەو ڕزگاربوونت دەبات. [11]چونکە کتێبی پیرۆز دەڵێ: {هەر کەسێك باوەڕی پێ بهێنێ، شەرمەزار نابێ.} [12]چونکە جیاوازی نییە لەنێوان جوولەکەو یۆنانی، لەبەرئەوەی هەمان خوداوەند بۆ هەمووانە، ئەویش لەدەوڵەمەندی خۆی دەڕژێنێ بەسەر ئەوانەی هاواری بۆ دەبەن. [13]چونکە {هەر کەسێك بەناوی خوداوەندەوە بانگ بکات ڕزگاری دەبێت.}

[14]بەڵام چۆن هاواری بۆ دەبەن گەر باوەڕی پێنەکەن؟ هەروەها چۆن باوەڕ دەکەن بەیەکێك گەر ناویان نەبیستبێ، کەواتە چۆن ناوی ئەو دەبیستن بێ مزگێنیدەر؟ [15]هەروەها چۆن مزگێنی دەدەن گەر نەنێرابن؟ هەروەك لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە: {چەند جوانە پێیەکانی ئەوانەی مزگێنیدەدەن!}

[16]بەڵام هەموویان گوێڕایەڵی

مزگێنی نەبوون. چونکە ئەشعیا دەڵێ: {خوداوەند، کێ باوەڕ دەکات بەو هەواڵەی لەئێمە بیستیان؟} [17]کەواتە باوەڕ بەهۆی بیستن پەیدا دەبێ، بیستنیش لەڕاگەیاندنی ووشەکانی مەسیح دێت. [18]من پرسیار دەکەم: ئایا ئەوان گوێیان لێنەبوو؟ بێگومان گوێیان لێبوو، {دەنگیان بەهەموو زەوی گەیشتو ووشەکانیان بەوپەڕی جیهان.} [19]دیسان دەپرسم: ئایا ئەوەی ئیسرائیل تێنەگەیشتن؟ کە یەکەم جار موسا ووتی: {من واتان لێ دەکەم حەسوودی ببەن بەوانەی گەل نین، بە گەلێکی نەزان توڕەتان دەکەم.} [20]هەروەها ئەشعیا بەچاونەترسیەوە دەڵێ: {دۆزرامەوە لەلایەن ئەوانەی بەدوامدا نەدەگەڕان، هەروەها بۆ ئەوانەی لەمنیان نەدەپرسیەوە دەرکەوتم.} [21] بەڵام دەربارەی ئیسرائیل دەڵێ: { بەدرێژایی ڕۆژ دەستم بۆ گەلێکی یاخیبووی بەربەرەکانیکەر ڕاکێشا.
}

**ئایا خودا گەلەکەی ڕەتکردەوە؟**

# 11

ئینجا پرسیار دەکەم: ئایا خودا گەلەکەی خۆی ڕەتکردەوە؟ نەخێر شتیوا نییە! منیش ئیسرائیلیم، لەنەوەی ئیبراهیم لەتیرەی بنیامینم. [2]خودا گەلەکەی ڕەتناکاتەوە کە لەپێشا ناسیویەتی. ئایا نازانن کتێبی پیرۆز دەربارەی ئەلیاس پێغەمبەر دەڵێ چی؟ کاتێ شکاتی لەجوولەکەکان کرد لەلای خوداو ووتی: [3]{ئەی خوداوەند، جوولەکەکان پێغەمبەرەکانی تۆیان کوشت، هەروەها قوربانگاکانی تۆیان ڕووخاند، من بەتەنها ماومەتەوە، دەیانەوێ بمکوژن.} [4] بەڵام دەنگی خودا چۆن وەڵامی دایەوە؟ {حەوت هەزار پیاوم بۆ خۆم هێشتۆتەوە ئەوانەی چۆکیان نەداوە بۆ بتی بەعل.} [5]ئێستاش هەروایە بەهۆی بەرەکەتەوە بەشێك هەڵبژێرراون تا بمێننەوە. [6]بەڵام گەر ئەمە بەبەرەکەت بووبێ، ئیتر بەکرداری خۆمان نییە، ئەگینا بەرەکەت، بەرەکەت نییە. [7]کەواتە دوای ئەمە چی؟ ئەوەی ئیسرائیل هەوڵی بۆ دەدا دەستی نەکەوت، بەڵکو هەڵبژێرراوان دەستیانکەوت، بەڵام ئەوانی دیکە دڵیان ڕەق ببوو، [8]

هەروەك لەکتێبی پیرۆز نووسراوە: { خـودا هـەتا ئەمـڕۆ ڕۆحـی سسـتی داونـەتێ، چاوی داونەتێ پێی نەبینن‌و گوێـی داونـەتێ پـێی نەبیسـتن، هەتا ئەمڕۆش.} [9]هەروەها داود دەڵێ: {با خوانەکـەیان تەڵـەو داو بێـت بۆیان، ببێـت بـەکۆسـپ‌و سـزا بۆیان. [10]با بەرچـاویان تـاریك بـێ تـا نەبیـنن، هەمیشە پشتیان چەماوە بێت تاهەتایە. }

**ڕزگاربوونی ناجوولەکەکان**

[11]بۆیـــە دەپرســـم: ئایـــا جوولـەکـەکان قاچـیان هەڵخلیسکا بـۆ ئـەوەی بکـەون؟ نەخـێر بـەهیچ جـۆرێ! بـەڵکو بـەیاخی‌بوونـیان ڕزگـاری هاتەکایـەوە بـۆ مـیللەتان ﴿ناجوولەکەکان﴾، تاکو حەسوودی ئیسـرائیل دابگـرێ. [12]جـا گـەر یاخی‌بوونـیان دەوڵەمـەندی بـێ بـۆ جـیهان، کەوتنـیان دەوڵەمـەندی بـۆ مـیللەتان، ئـەی ژمـارەی تـەواویان چـەند دەوڵەمەندی زیاتر دەهێنێ؟ [13]ئێسـتا مـن بـەمـیللـەتـان دەڵـێم: چـونکە مـن بـۆ میللەتان نێرراوم ، شـانازی بـەخـزمەتەکەم دەکەم، [14]تا ڕۆڵـەکانی نەتەوەکـەم حەسـوودی بـیانگرێ‌و هەندێکـیان ڕزگار بکەم. [15]چـونکە گەر هاتوو ڕەتکردنەوەیان هەلـێك بێ بۆ ئاشتبوونەوەی جیهان، ئایـا قـەبوڵکردنـیان لـەلایەن خوداوە وەك زیندووبوونەوە نییە لەمردن؟ [16]گـەر بەشی یەکەمی هەویر پیرۆز بێ، ئەوسـا هەموو هەویرەکە پیرۆز دەبێ. هـەروەها گـەر ڕەگی درەخت پیرۆز بێ، ئەوسا لقەکانیش پیرۆزن. [17]گەر هـاتوو هـەندێ لقـی دار زەیتونـێك بـڕایەوە، تۆش وەك زەیتونێکی کێوی تـیایدا موتوربـە کـرای، ئەوسـا بەمە بەشـداری دەکـەی لـەڕەگ‌و پیت‌و بەرەکـەتی، [18]شـانازی مەکـە بەسەر لقـە بـڕاوەکان. گەر هاتوو شانازیت کرد بەخۆتەوە، ئەوسا دەبێ بزانی کە تـۆ ڕەگـی درەخـتەکەت هـەڵ نەگـرتووە، بـەڵکو ئـەوە تـۆی هەڵگرتووە. [19]گەر بڵێی: (ئەو لقانە بـڕاونەتەوە تاکو من موتوربە بکرێم.) [20]ئەمـە ڕاستە. ئەوان بڕانەوە بەهۆی بـێباوەڕیـیان، بەڵام تۆ بەهۆی باوەڕ جێگیر بووی. لەخۆبایی مەبە، بەڵکو بترسـە. [21]گـەر خـودا لقـی بنەڕەتی درەخـتەکە نەهێلێـتەوە ئەوسـا تۆش ناهێلێـتەوە. [22]بۆیە دلنەرمی‌و توندی خـودا لـەبەرچـاو بگرە: توندییەکەی

بۆ ئەو کەسانەیە کە کەوتن، بەڵام دڵنەرمییەکەی بۆ تۆیە، ئەگەر لەدڵنەرمی جێگیر بیت، ئەگینا تۆش وەك ئەو لقانە دەبڕێیتەوە. [23]دیسان جولەکەکانیش، گەر بەردەوام نەبن لەسەر بێباوەڕییان، موتوربە دەکرێن، چونکە خودا توانای ئەوەی هەیە جارێکی کە موتوربەیان بکات. [24]چونکە گەر تۆ لەدار زەیتونێکی کێوی بڕابیتەوە، بەپێچەوانەی سروشتەوە لەدار زەیتونێکی چاك موتوربە کرای، ئاخۆ دەبێ چەند ئاسانتر بێ بۆ ئەوانەی خۆیان سەر بەدار زەیتونە چاکەکەن هەتا تیایدا موتوربە بکرێن.

**بەزەیی خودا بۆ هەمووانە**

[25]ئەی برایان، من نامەوێ ئێوە ئەو نهێنییە نەزانن، هەتا خۆتان بەدانا نەزانن لەبۆچوونتان، ئەویش ئەوەیە کە بەشێك لەئیسرائیل دڵیان ڕەق بوو، تا تەواوی ژمارەی میللەتان دێن، [26]ئیتر بەم شێوەیە هەموو ئیسرائیل ڕزگاری دەبێ، بەپێی ئەوەی لە کتێبی پیرۆزدا نووسراوە: {لەشاری داودەوە ڕزگارکەر دێت، خوانەناسی ناهێڵێ لە ناو یاقوب. [27]ئەمەش پەیمانمە لەگەڵیان، کاتێ گوناهەکانیان دەسڕمەوە.} [28]جولەکەکان بەگوێرەی مزگێنی دوژمنن لەپێناوی ئێوەدا، بەڵام بەگوێرەی هەڵبژاردن خۆشەویستن لەپێناوی باوباپیران، [29]چونکە خودا هەرگیز لەبەخشینو بانگ کردنی خۆی پاشگەز نابێتەوە. [30]جا چۆن ئێوە لەپێشا لەخودا یاخیبوونو ئێستا خودا بەزەیی پێتانهاتەوە بەهۆی یاخیبوونی ئەوان، [31]بەهەمان شێوە ئەوانیش ئێستا لەخودا یاخیبوون، تا بەزەیی پێیان بێتەوە وەك بەزەیی بەئێوە هاتەوە. [32]چونکە خودا هەموو مرۆڤی لە یاخیبووندا بەندکرد هەتا بەزەیی بە هەموویان بێتەوە.

[33]ئای چەند قووڵە دەوڵەمەندیو دانایيو زانیاری خودا! هەروەها چەند دوورە پشکنینی حوکمەکانیو تێگەیشتنی ڕێگاکانی!

[34]{چونکە کێ لەبیروڕای خوداوەندی زانی؟ یاخود کێ تەگبیرکەری بوو؟}

[35]{یاخود کێ شتێکی پێبەخشیوە هەتا بیداتەوە؟}

[36]چونکە هەموو شتێك لەئەوەو

بەهۆی ئەوەو بۆ ئەو دەبێ. بۆ ئەوە شکۆمەندی تاهەتایە. ئامین.

## قوربانیەکی زیندوو

# 12

بۆیە ئەی برایان، لەبەر بەزەیی خودا، داواتان لێدەکەم لەشتان پێشکەش بکەن وەك قوربانیەکی زیندوو، پاكوپیرۆز، پەسەندکراو لەلایەن خوداوە، ئەمەش پەرستنی ڕاستو ڕۆحی ئێوەیە. [2]خۆتان لەگەڵ جیهان ڕامەهێنن، بەڵکو بگۆڕێن بەتازەکردنەوەی بیرتان، تا بتوانن خواستی خودا تێبگەن، کە باشو پەسەندکراو و تەواوە.

[3]بەو بەرەکەتەی خودا داویەتی بەمن بەهەر یەکێکتان دەڵێم: کەستان زیاتر نرخ بۆ خۆی دانەنێ لەوەی بۆی دانراوە، بەڵکو وریا بن، بەگوێرەی ئەو بەشە باوەڕەی خودا بۆ هەر یەکێکتانی داناوە نرخ بۆ خۆتان دابنێن. [4]هەروەك لە لەشمان چەند ئەندامێك هەیە، بەڵام هەموو ئەم ئەندامانە یەك کاریان نییە، [5]بەهەمان شێوە ئێمە هەموومان یەك لەشین لەمەسیح، ئیتر هەموومان ئەندامی یەکترین. [6]بەڵام بەهەرەی جیاوازمان هەیە بەپێی ئەو بەرەکەتەی پێمان دراوە، ئەگەر قسەکردنە بەووشەی خودا، با بەگوێرەی ڕێژەی باوەڕ بێ، [7]هەروەها کێ خزمەتکردنی هەیە با خزمەت بکات، یا کێ فێرکردنی هەیە، با فێر بکات، [8]یان کێ هاندانی هەیە، با هانبدات، یان بەخشینی هەیە، با بەدڵفراوانی ببەخشێ، یان ڕابەرایەتی‌کردنی هەیە با بەدڵگەرمی بێ، یا بەزەیی هەیە بابەدڵخۆشی بیکات. [9]با خۆشەویستیتان بە دووڕوویی نەبێ. ڕقتان لەخراپە بێو لایەنی چاکە بگرن. [10]یەکتریتان خۆشبوێ بەخۆشەویستیەکی خوشكو برایانە، بەپەرۆش‌بن بۆ ڕێزگرتن لەیەکتری. [11]سست مەبن لەچالاکی، دڵگەرم بن لەرۆح، خزمەتی خوداوەند بکەن. [12]دڵشادبن لەهیوا، دانبگرن بەخۆتان لەتەنگانە، بەردەوام بن لەنوێژکردن، [13]بەشداری بکەن لەپێویستی برا پیرۆزەکان، میوانداری خوشكو برا نامۆکان بکەن.

[14]داوای پیرۆزی بکەن بۆ ئەوانەی دەتانچەوسێننەوە. داوای پیرۆزی بکەنو نەفرەت مەکەن. [15]دڵشادبن لەگەڵ ئەوانەی دڵیان

خۆشە، بگرین لەگەڵ ئەوانەی دەگرین. [16]لەگەڵ یەکتری ڕێك بکەون، شانازی مەکەن، بەڵکو تێکەڵاوی پایەنزمەکان بن. لووتبەرز مەبن. [17]پاداشتی خراپەی یەکێك مەدەنەوە بەخراپە، هەوڵبدەن چی چاکە ئەوە بکەن لەبەردەمی هەموو خەڵك. [18]گەر ببێ بەپێی تواناتان لەگەڵ هەموو خەڵك بە ئاشتی بژین. [19]خۆتان تۆڵەمەستێنن ئەی خۆشەویستان، بەڵکو ڕێبدەن بەتووڕەیی خودا، چونکە نووسراوە: {خوداوەند دەڵێ، تۆڵەسەندن هی منە، منم پاداشت دەدەمەوە.} [20]بەڵام: {گەر دوژمنەکەت برسیبوو نانی بدەرێ، گەر تینووی بوو ئاوی بدەرێ. جا تۆ بەم کارە پشکۆی داگیرساو لەسەری کۆدەکەیتەوە.} [21]ئیتر مەهێڵە خراپە بەسەرتدا زاڵبێت، بەڵکو بەچاکە سەرکەوە بەسەر خراپە.

## ملکەچی بۆ دەسەڵاتداران

## 13

پێویستە لەسەر هەموو کەسێك ملکەچی دەسەڵاتداران بێ. چونکە هیچ دەسەڵاتێك نییە لەلایەن خوداوە نەبێ، جا ئەو دەسەڵاتانەی هەیە لەلایەن خوداوە دانراوە. [2]ئیتر ئەوەی بەربەرەکانی دەسەڵات دەکات، بەربەرەکانی دانراوی خودا دەکات، ئەوانەی بەربەرەکانی دەکەن حوکمدان بەسەر خۆیان دەهێنن. [3]ئەوەی چاکە دەکات، ناترسێ لە لێپرسراوان، بەڵکو ئەوەی خراپە دەکات. کەواتە گەر حەز دەکەی لەدەسەڵاتدار نەترسی؟ ئەوەی چاکە بیکە، ئەوسا ستایشی ئەو بەدەست دەهێنی، [4]چونکە دەسەڵاتدار خزمەتکاری خودایە تا چاکەت لەگەڵ بکات. بەڵام بترسە گەر خراپەت کرد، چونکە دەسەڵاتدار شمشێر بەخۆڕایی هەڵناگرێ، ئەو خزمەتکاری خودایە تا تووڕەیی ئەو بەسەر خراپەکاران بهێنێتە خوارەوە. [5]بۆیە پێویستە ملکەچی دەسەڵات بن، نەك لەبەر تووڕەیی، بەڵکو لەپێناوی ویژدانیش. [6]هەر لەبەر ئەمەشە باج دەدەن، چونکە لێپرسراوان خزمەتکاری خودان کە بەردەوامن لەسەر ئەم کارە. [7]هەر کەسێك مافی خۆی بدەرێ: باج بەخاوەن باج، سەرانە بەخاوەن سەرانە، ڕێز بەخاوەن ڕێز، ئابڕوو

بەخاوەن ئابڕوو.

### خۆشەویستی برایانە

[8]با هیچ قەرزێکتان بەسەروە نەبێ جگە لەوەی یەکتریتان خۆش بوێ، ئەوەی نزیکەکەی خۆش بوێ ئەوا شەریعەتی تەواو کردووە، [9]چونکە ئەو ڕاسپاردانەی دەڵێ: {داوێن پیسی مەکە، مەکوژە، مەدزە، شایەتی درۆ مەدە، ئارەزووی خراپ مەکە.} هەروەها ڕاسپاردەکانی دیکە، لەم ڕاسپاردەیەدا کۆدەبنەوە: {ئەوەی لێت نزیکە وەك خۆت خۆشت بوێ.} [10]ئەوەی نزیکەکەی خۆش بوێ خراپە بەرامبەری ناکات، ئیتر بەم شێوەیە خۆشەویستی دەبێتە تەواوکەری هەموو شەریعەت. [11]جگە لەوەش ئێوە دەزانن ئێمە لەچ کاتێك داین، کاتی ئەوەتان هاتووە لەخەو هەستن، ئێستا ڕزگاری لێمان نزیکترە لەو ڕۆژەی باوەڕمان هێنا. [12]خەریکە وا شەو تەواو دەبێو ڕۆژ هەڵدێت. با واز لەکرداری تاریکی بهێنینو چەکی ڕووناکی هەڵگرین. [13]با بەشێوەیەك ڕەفتار بکەین بگونجێ لەگەڵ ڕۆژ، نەك بە وورگ پڕکردنو سەرخۆشی، بەڕەڵڵاییو خراپەکاری، دوژمنایەتیو چاوپیسی. [14]بەڵکو عیسای مەسیحی خوداوەند لەبەر بکەن، خۆتان خەریك مەکەن بەتێرکردنی ئارەزووەکانی لەش.

### پێشوازی لەیەکتری بکەن

## 14

ئەوەی لەناوتان باوەڕی لاوازبوو، پێشوازی لێبکەن بێئەوەی لەسەر بیروڕا حوکمی بەسەر بدەن. [2]هەندێ کەس هەن لەو باوەڕەدان مافی ئەوەیان هەیە هەموو شتێك بخۆن، بەڵام ئەوەی باوەڕی لاوازە تەنها سەوزەوات دەخوات. [3]ئەوەی دەتوانێ هەموو شتێك بخوات، لەسەریەتی بەچاوی سووکەوە سەیری ئەوە نەکات کە ناخوات، هەروەها ئەوەی لەهەموو شتێك ناخوات ئەو کەسە تاوانبار نەکات کە لەهەموو شتێك دەخوات، چونکە خودا پەسەندی کردووە. [4]تۆ کێی تا حوکم بدەی بەسەر خزمەتکاری یەکێکی دیکە؟ لەبەر چاوی گەورەکەی خۆی بکەوێ یاخود بمێنێتەوە، بەڵام دەمێنێتەوە، چونکە خوداوەند توانای مانەوەی ئەوی

هەیە. [5]یەكێك هەیە ڕۆژێكی لەڕۆژێكی تر بە پیرۆزتر دادەنێ، یەكێكی تریش هەموو ڕۆژەكان بەیەك چاو سەیر دەكات، كەواتە با هەر یەكە لەبیروڕای خۆی دڵنیابێت. [6]چونكە ئەوەی ڕۆژێك بەتایبەت دابنێ، بەتایبەتی دادەنێت وەك ڕێزێك بۆ خوداوەند. هەروەها ئەوەی هەموو شتێك دەخوات، ئەوەش وەك ڕێزە بۆ خوداوەند، چونكە سوپاسی خوداش دەكات، ئەوەش هەموو شتێك ناخوات، ناخوات وەك ڕێزێك بۆ خوداوەندو سوپاس كردنی خودا. [7]كەسمان لەپێناوی خۆمان ناژین، كەسیشمان بۆ خۆی نامرێ. [8]گەر بژین لەپێناوی خوداوەند دەژین، گەر بشمرین لەپێناوی خوداوەند دەمرین. كەواتە بژین یاخود بمرین، ئێمە هەر هی خوداوەندین. [9]چونكە بۆ ئەمە مەسیح مردو زیندووبووەوە تابێ بەخوداوەندی زیندووانو مردووان. [10]ئیتر چۆن براكەت تاوانبار دەكەیت؟ ئیتر چۆن ڕقت لەبراكەت دەبێتەوە؟ چونكە ئێمە هەموو بەیەكەوە دەبێ لەبەردەم دادگای خودا ڕاوەستین بۆ لێپرسینەوە، [11]هەروەك لەكتێبی پیرۆزدا نووسراوە:

{خوداوەند دەڵێ: سوێندبێ بەژیانم، دەبێ هەموو ئەژنۆیەك بۆ من چۆك بدات، دەبێ هەموو زمانێك دان بەخودا بنێت.} [12]كەواتە، هەریەك لەئێمە لەبارەی خۆیەوە لێپرسینەوەی هەیە لەبەردەم خودا.

## لێپرسراوین بەرامبەر بەیەكتری

[13]با واز لەحوكمدانی یەكتری بهێنین، بەڵكو باشترە بڕیارێك بدەین كەس نەبێتە كۆسپو تەگەرە لەبەردەم براكەی. [14]من دەزانم، هەروەها دڵنیام لەعیسای خوداوەند، هیچ شتێك لەخۆیدا گڵاو نییە، بەڵكو گەر یەكێك شتێك بەگڵاو بزانێ، ئەوە لەبەر چاوی خۆی گڵاوە. [15]گەر هاتوو بەهۆی خۆراكتەوە بوویتە هۆی دڵتەنگی براكەت، ئیتر تۆ بەگوێرەی خۆشەویستی ناڕۆیت. جا ئەوەی مەسیح لەپێناوی مردووە بەخۆراكت لەناوی مەبە. [16]مەهێڵە شتە باشەكانت خەڵكی بە خراپە باسی بكات، [17]چونكە پادشاهێتی خودا بەخواردنو خواردنەوە نییە، بەڵكو ڕاستودروستیو ئاشتیو خۆشیە لەڕۆحی پیرۆز. [18]جا ئەوەی بەم

شێوەیە خزمەتی مەسیح بکات، لەلایەن خودا پەسەندکراوە، جێی ڕەزامەندی خەڵکیش دەبێت. [19] کەواتە با تێکۆشین بەدوای ئەوەی بەرەو ئاشتیو بنیادنانی یەکترمان دەبات. [20] کاری خودا وێران مەکە بەهۆی خۆراك. ڕاستە هەموو خۆراکێك پاکە، بەڵام شتێك خراپە بیخۆی گەر ببێتە کۆسپ لەڕێگای براکەت. [21] ئیتر باشترە گۆشت نەخۆیتو شەراب نەخۆیتەوە، هەروەها کارێك نەکەیت ببێتە کۆسپ لەڕێگای براکەت. [22] ئەو باوەڕەی هەتە، با لەنێوان خۆتو خودا بێ. خۆزگەدەخوازرێ بەوەی خۆی تاوانبار ناکات کاتێ شتێك دەکات بەچاکی دەزانێ. [23] بەڵام گەر یەکێك گومانی هەبێ لەوەی دەیخوات، حوکمی بەسەر دەدرێ، چونکە ئەوە ناکات بەباوەڕەوە، بۆیە هەر شتێك بەباوەڕ نەبێ گوناهە.

### مەسیح نموونەیە بۆ ئێمە

## 15

بەڵام ئێمە کە بەهێزین لەباوەڕ لەسەرمانە دانبگرین بەخۆماندا بەرامبەر بە بێهێزی باوەڕی لاوازان، هەروەها خەریکی ڕازیکردنی خۆمان نەبین. [2] جا هەریەك لەئێمە پێویستە نزیکەکەی ڕازی بکات بۆ چاکەی ئەو، لەپێناوی بنیادنانی. [3] تەنانەت مەسیحیش هەوڵی ڕازیکردنی خۆی نەداوە، بەڵکو بەپێی ئەوەی لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە: {جنێوی ئەوانەی جنێوت پێدەدەن منیشی گرتەوە.} [4] جا ئەوەی لەپێشا نووسراوە، بۆ فێرکردنی ئێمە نووسراوە، تا ئێمە بەهۆی دانبەخۆگرتنو هاندانی کتێبی پیرۆز هیوامان هەبێ. [5] داواکارم خودای دانبەخۆگرو هاندەر ڕێککەوتنی بیروڕاتان پێببەخشێ لەنێو خۆتان بەگوێرەی عیسای مەسیح، [6] تا بەیەك دڵو بەیەك دەنگ ستایشی خودا بکەین، باوکی عیسای مەسیحی خوداوەندمان. [7] لەبەر ئەمە پێشوازی لەیەکتری بکەن، هەروەك چۆن مەسیح پێشوازی لێکردین، لەپێناوی شکۆمەندی خودا. [8] من پێتان دەڵێم، مەسیح بوو بەخزمەتکاری خەتەنەکراوەکان، تا ڕاستی خودا دەربخاتو ئەو بەڵێنەی داویەتی بە باپیران بیباتەسەر. [9] هەروەها تا میللەتان ستایشی خودا

بکەن بەهۆی ئەو بەزەییەی هەیەتی، هەروەك لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە: {بۆیە سوپاست دەکەم لەنێو میللەتانداو گۆرانی بۆ ناوت دەڵێم}، [10]دیسان باسکراوە: {دڵشادبن ئەی میللەتان لەگەڵ گەلی خودا}، [11]هەروەها ووتراوە: {ستایشی خوداوەند بکەن ئەی هەموو میللەتان، باهەموو گەلان ستایشی بکەن}، [12]ئەشعیاش دەڵێ: {یەکێك لەپشتی یەسا دەردەکەوێ، فەرمانڕەوایی میللەتان دەکات، ئەوەی میللەتان ئومێدیان پێیەتی.} [13]با خودای هیوا پڕتان بکات لەهەموو خۆشیو ئاشتییەك لەباوەڕدا، تاکو هیواتان زۆربێ بەهۆی توانای ڕۆحی پیرۆزەوە.

**خزمەتکردنی پۆڵس**

[14]ئەی برایان من لەو باوەڕەدام ئێوە پڕن لەچاکە، تەواون لەزانیاریو توانای ئامۆژگاری یەکتڕتان هەیە. [15]بەڵام زۆر بەچاونەترسیەوە بەهۆی ئەو بەرەکەتەی خودا پێی بەخشیوم، هەندێ شتم بۆ نووسیون تا بەبیرتان بهێنمەوە، [16]هەتا ببم بەخزمەتکاری عیسای مەسیح، دەبێ وەك کاهینێك بەمیللەتان مزگێنی خودا بدەم، هەتا قوربانی میللەتان پەسەند کراو و پیرۆزکراو بێ بەڕۆحی پیرۆز بۆ خودا.

[17]کەواتە شانازی بەعیسای مەسیح دەکەم لەخزمەتم بۆ خودا. [18]من بەخۆم ڕانابینم باسی شتێك بکەم، گەر مەسیح بەهۆی منەوە نەیکردبێ، هەتا ملکەچی میللەتان بۆ خودا بەووتەو کردار بەدەست بهێنم، [19]بەتوانای نیشانەو کاری سەرسوڕهێنەر، بەتوانای ڕۆحی پیرۆز، ئاوا توانیم لەقودس‌و دەورووپشتی هەتا ناوچەی ئیلریکوم، مزگێنیدانی مەسیح تەواو بکەم. [20]من پێم داگرت لەسەر ئەوەی مزگێنی ووشەی خودا بدەم، لەو شوێنەی ناوی مەسیحی تێدا نەبیسترا بوو، بۆ ئەوەی لەسەر بناغەیەك کە یەکێکیتر دایناوە دروستی نەکەم، [21]وەك لەکتێبی پیرۆز نووسراوە: {ئەوانەی کەس هەواڵی ئەوی پێ نەداون لەمەولا دەبینن، ئەوانەی دەربارەی ئەو هیچیان نەبیستووە لەمەولا تێدەگەن.}

**ئارەزووی دیدەنی ڕۆما**

22لەبەرهەمان شتیش بوو چەند جار نەم دەتوانی بێم بۆ لاتان. 23 بەڵام ئێستا، لەم ناوچانە شوێن نەماوە ئیشی لێبکەم، هەروەها ساڵانێکی زۆرە ئارەزووی ئەوە دەکەم بێم بۆ لاتان، 24کاتێ دەچم بۆ ئیسپانیا هیوادارم بەلاتان تێپەڕمو بتانبینم، دوای ئەوەی چێژم لەبینینتان وەرگرت گەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ، ئومێدەوارم کاروباری چوونی ئەوێم بۆ ئاسان بکەن. 25بەڵام ئێستا دەچم بۆ قودس تاخزمەتی برا پیرۆزەکانم بکەم. 26چونکە باوەڕدارانی مەکدۆنیەو ئەخائیە وایان بەباش زانی هەندێ یارمەتی کۆبکەنەوە بۆ ئەو برا پیرۆزانەی هەژارو دەستکورتن لەقودس. 27 ئەوان ئەمەیان بە باش زانیو قەرزاری ئەوان بوون، چونکە جوولەکەکان لەشتە ڕۆحییەکان بەشداری میللەتانیان کرد، جا پێویست بوو لەسەر ئەوان خزمەتی جوولەکەکان بکەن لەبارەی شتە مادییەکانەوە. 28 دوای ئەوەی بەم کارە هەڵدەستمو ئەو یارمەتییەیان پێشکەش دەکەم، سەرتان لێدەدەم کاتێ بەرەو ئیسپانیا دەڕۆم. 29من دەزانم گەر بێم بۆ لاتان، بەتەواوی پیرۆزی مەسیح بۆ لاتان دێم. 30ئەی برایان داواتان لێدەکەم، بەناوی عیسای مەسیحی خوداوەندو بەخۆشەویستی ڕۆحی پیرۆز، هەمووتان بەیەکەوە لەگەڵم تێبکۆشنو کۆشش بکەن لەنوێژدا لەپێناوی من بۆ خودا، 31تا ڕزگاربم لەدەست بێباوەڕانی ناوچەی یەهودیە، هەروەها تاکو خزمەتەکەم لەقودس پەسەند کراو بێ لای برا پیرۆزەکان، 32گەر خودا خواستی لەسەر بێ بەدڵشادیەوە دێم بۆ لاتان، بەمە لەگەڵتان پشوو دەدەم. 33ئیتر با خودای ئاشتی لەگەڵ هەمووتان بێ. ئامین.

## سڵاوی تایبەتی
# 16

ڕاتان دەسپێرم سەبارەت بە فیبی خوشکمان، کەوا خزمەتکارە لەکۆمەڵەی باوەڕدارانی کەنخەریا، 2 بەناوی خوداوەندەوە پێشوازی لێبکەن، پێشوازییەك کەشایانی خوشكو برای پیرۆز بێ، هەر شتێکی پێویست بوو لەئێوە بیدەنێ، چونکە ئەو یارمەتیدەری زۆر کەس بووە، هەروەها هی منیش.

[3]سـلاو لـەپریسـکلاو ئەکـیلا بکـەن، کـە بەیەکـەوە کـار دەکەین لـەعیسـای مەسـیح، [4]ئەوانـەی ملی خۆیـان بـۆ سـەربڕین دانـا لەپێناوی ژیانم، جا من بەتەنها سوپاسیان ناکەم، بەڵکو هەموو کۆمەڵە باوەڕدارەکانی میللەتانـیش. [5]هەروەها سلاو لەوانە بکـەن کـەسـەر بـەو کۆمەڵـەنو لـەماڵەکـەیان کۆدەبـنەوە. سـلاو لەئیپینتوسی خۆشەویستم بکەن ئەوەی نۆبـەرەی بـاوەڕ بـوو بـەمەسـیح لـەناوچـەی ئاسـیا. [6]سـلاو لەمریەم بکـەن، زۆر خـۆی ماندووکـرد لـەخـزمەت کـردنمان لەبـەر ئێوە. [7] سـلاو لـەئەندرونـیکوس‌و یونـیاس بکـەن، ئەو دوو خزمانەم کە لەگەڵم بەندکرابوون، ئەوان بەناوبانگ بوون لـەناو نێرراوان، پێش من لەمەسیحدا بوون. [8]هەروەها سلاو لەئەمپلیاتۆس بکـەن، خۆشەویستم لەخوداوەند. [9] سلاو لەئوربانوس بکەن پێکەوە کار دەکـەین لـەمەسـیح، هـەروەها ئیستاخیسـی خۆشەویسـتم. [10]سلاو لـەئەپیلەس بکەن، ئەوەی سەلمێنەری ڕاسـتی خۆیـەتی لـەمەسـیح. سـلاو لـەخـێزانی ئەرستوبولـوس بکەن. [11] سـلاو لـەهیرودیونـی خـزمم بکەن. هـەروەها لەوانـەی لـەخوداوەندن لـەخـێزانی نەرکیسـوس. [12]سـلاو لەخوشـکان تەریفیناو تەریفۆسا بکەن ئەوانـەی زۆر مـاندوو دەبـن لـەخوداوەنـد. سـلاو لـەخوشـکە پەرسیسـی خۆشەویسـت بکـەن، ئـەوەی خـۆی زۆر ماندووکـرد لـەخزمەتکـردنی خوداوەند. [13]سلاو لـەروفسـی بکـەن هەڵـبژێرراوە لەخوداوەند، هەروەها لەدایکی وەك دایکمـە. [14]سـلاو لـەئەسینکریتس‌و فەلـیگۆن‌و هـەرمس‌و پەتـروباس‌و هـەرماس‌و ئـەو بـرایانەی لەگەڵـیان بـوون بکـەن. [15]سـلاو بکـەن لـەفـیلولوگۆس‌و خوشـکە جولـیاو نیریـوس‌و خوشکەکەی‌و ئولومپاس‌و هـەموو ئـەو خوشك‌و برا پیرۆزانەی لەگەڵـیان بـوون. [16]سلاو لەیەکتری بکـەن بەماچی پیرۆز. هەموو کۆمەڵە باوەڕدارەکـانی مەسـیح سـلاوتان لێ دەکەن.

[17]بـەلام ئـەی برایان، ئاگادارتان دەکەمـەوە، ئاگاتـان لەدروستکەری نـاکۆکی‌و کۆسـپ بـێ، لێـیان دوورکەونـەوە، چـونکە ئـەوان دەرچـوون لەڕێگای ئەو فێرکردنەی فـێری بـوون. [18]جـا ئەوانـەی بـەم

شێوەیەن، خزمەتی مەسیحی خوداوەندمان ناکەن، بەڵکو خزمەتی سکیان دەکەن، بەقسەی خۆشو زمان لووسی ساکارەکان دەخەڵەتێنن. [19] هەواڵی گوێڕایەڵیتان بۆ خودا بەهەمووان گەیشتووە، لەبەر ئەوە پێتان دڵخۆشم، بەڵام دەمەوێ لەچاکە داناو لەخراپە بێبەری بن. [20] ئەوسا خێرا خودای ئاشتی شەیتان لەژێر پێتان دەپلیشێنێتەوە. بابەرەکەتی* عیسای مەسیحی خوداوەندمان لەگەڵتان بێ. [21] تیمۆساوس ئەوەی لەگەڵم کار دەکات سڵاوتان لێ دەکات، هەروەها لوکیوسو یاسونو سوسیپاتەری خزمانم.

[22] منیش کەناوم تەرتیوسەو نووسەری ئەم نامەیەم، سڵاوتان لێ دەکەم بەناوی خوداوەندەوە.

[23] غایۆس کەمیوانداری منو هەموو کۆمەڵی باوەڕداران دەکات سڵاوتان لێ دەکات. هەروەها ئاراستسی خەزنەداری شار سڵاوتان لێ دەکات لەگەڵ کوارتسی برامان.

﴿[24] با بەرەکەتی عیسای مەسیحی خوداوەندمان لەگەڵتان بێ. ئامین.﴾

**ستایشی خودا**

[25] بۆ ئەو خودایەی دەتوانێ بەهێزتان بکات بەگوێرەی مزگێنییەکەمو ڕاگەیاندنی عیسای مەسیح، بەگوێرەی ئاشکراکردنی ئەو نهێنییەی ماوەیەکی زۆر بوو بەشاراوەیی مابووەوە، [26] بەڵام ئێستا ئاشکرا بووە بەهۆی نووسراوی پێغەمبەران، بەگوێرەی ڕاسپاردەی خودای هەمیشەیی تا هەموو نەتەوەکان باوەڕی پێبهێننو گوێڕایەڵی بن، [27] شکۆمەندی تاهەتایە بۆ تاقە خودای دانا، بەناوی عیسای مەسیح! ئامین.

*پۆڵس ئەم نامەیەی نووسی بەهۆی ئەو گیروگرفتانەی لەناو کۆمەڵەی باوەڕدارانی کورنسۆس هەبوو، دەربارەی ژیان بەپێی باوەڕ بەمەسیح .*

*لەو سەردەمەدا کۆرنسۆس شارێکی یۆنانی گەورە بوو. پایتەختی ولایەتی ئەخائییەی ڕۆمانی بوو. ناوبانگی دەرکرد بوو بە بازرگانیو ڕۆشنبیری بەرزو بەدرەوشتیو جۆراوجۆری ئاینەکانی.*

*لەم نامەیەدا لەهەموو شتێك زیاتر، پۆڵس گرنگی داوە بەو مەسەلانەی کە پەیوەندییان هەیە بە:*

*دووبەرەکی لەناو کومەڵەی باوەڕدارانی کۆرنسۆسو مەسەلەی داوێن پیسیو ژنهێنانو شووکردنو ئەو شتانەی پەیوەندییان هەیە بەویژدانو ڕێکخستن لەناو کۆمەڵەی باوەڕدارانو ئەو بەهرانەی ڕوحی پیرۆز دەیبەخشێ بەباوەڕدارانو چۆنیەتی بەکارهێنانی، هەروەها هەڵسانەوە دوای مردن. دەریشی خستووە چۆن مزگێنی عیسای مەسیح وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە.*

# 1

لە پۆڵس، بانگ کراو لەسەر خواستی خودا، تاببێ بەنێرراوی عیسای مەسیح، هەروەها لە سۆستانیسی برامانەوە،

[2]بۆ کۆمەڵەی باوەڕدارانی خودا لە شاری کۆرنسۆس، بۆ ئەوانەی لەعیسای مەسیحدا پیرۆزکراون، هەروەها بانگ کراون تا پاكوپیرۆزبن لەگەڵ هەموو ئەوانەی لەهەموو شوێنێك بەناوی خوداوەند عیسای مەسیح بانگ دەکەن، خوداوەندی ئێمەو ئەوانە. [3]با ئاشتیو بەرەکەتی خودای باوکمانو عیسای مەسیحی خوداوەندتان لەگەڵ بێ. [4]هەمیشە سوپاسی خودا دەکەم لەپێناوتان بۆ ئەو بەرەکەتەی پێیبەخشیون لەعیسای مەسیحدا، [5]بەهۆی ئەوەوە لەهەموو شتێك دەوڵەمەندبوون، لەهەموو شێوەیەکی قسەکردنو

زانـــياريدا، [6]بەگوێــرەی چەســـپانی شــايەتی عيســای مەسيح لەئێوەدا. [7]تەنانـــەت ئـــێوە ئيتر پێويستيتان بەهيچ بەهـــرەيەكی ڕۆحـــی نـــابێ، كـــاتێ بـــە پەرۆشـــەوە چـــاوەڕوانی دەركەوتـــنی عيســـای مەســـيحی خوداوەنـــدن. [8]ئـــەوەی تاكۆتـــايی دەتانچەسـپێنێ، تـــا بێكـــەموكـــوڕی بن لـەڕۆژی عيسای مەسـيحی خوداوەنـد. [9]خـــودا پشتی پێدەبەســـــترێ، ئـــــەو خودايـــــەی بانگی كـــردن بـــۆ بەشـــداری كـــردن لەگـــەڵ ڕۆڵەكـــەی كـــە عيســـــای مەسيحی خوداوەندمانە.

**ناكۆكی نێوان باوەڕداران**

[10]ئـــەی برايان، بەناوی خوداوەند عيســـای مەســـيح داواتان لـــێدەكەم، هـــەمووتان يـــەك دەنگـــتان هـــەبێ، دووبـــەرەكی لەنێوانـــتان نەبێ، بەڵكو هـــەمووتان يەك بيرو يەك ڕاتان هەبێ. [11]ئـــەی برايان، خێزانی ماڵی خلۆيی هەوالـــيان دامـــێ كـــەوا لەنێوانـــتان نـــاكۆكیو ئـــاژاوە هەيـــە، [12]مەبەستم ئەوەيـــە يەكێكـــتان دەڵێ: (من لەگەڵ پۆڵـــسم) ئـــەوی ديكەتان دەڵێ: (من لەگەڵ ئەپۆلـۆسم)، هەروەها يەكێكی ديكـــەتان دەڵـــێ: (مـــن لەگـــەڵ پەترۆســـم)، ئـــەوی ديكە دەڵێ: (من لەگـــەڵ مەســـيحم.) [13]ئايـــا مەســـيح بەشـــكراوە؟ يـــاخود پۆڵـــس لەپێناوی ئـــێوەدا لـــەخاچـــدراوە، يـــان بـــەناوی پۆڵـــســـــەوە لەئاوهەڵكێشـــــران؟ [14]ســـوپاس بـــۆ خـــودا مـــن كەســـتانم لەئاوهەڵنەكێشـــا جگە لەكريسپۆسو غـــايۆس نـــەبێ، [15]هەتا كەستان نەڵێن بـــەناوی مـــن لەئاوهەڵكێشـــران، [16]هـــــەروەها خـــــێزانی ئيستفانۆســــم لەئاوهەڵكێشـــاوە، جگـــە لەمانە بيرم نايە كەسی ديكەم لەئاوهەڵكێشا بێ. [17]چـــونكە مەســـيح منی نەناردووە بۆ لەئاوهەڵكێشـــــان، بـــــەڵكو بـــــۆ مزگـــێنیدان، ئەمـــەش بەقسەی دانايی مرۆڤانە نا، ئەگينا لـەخاچدانی مەسيح بێسوودە.

مەسيح داناییو تواناى خودايە

[18]چـــونكە ووشەی خاچ لەلايەن ئەوانـــەی لەناودەچـــن نەزانييە، بەڵام لای ئـــێمە كـــە ڕزگارمان بووە هێزی خودايـــە. [19]جا لـەو بارەيەوە لـەكتێبی پـــيرۆز نووســـراوە: {دانـــايی داناكـــان دەســـڕمەوە، هـــەروەها تێگەيشـــتنی تێگەيشتوان.}

[20]كەواتـــە داناكـــان لـــەكوێن؟ هـــەروەها فـــێربووانـــی شـــەريعەتو

زاناکـانی ئـەم جـیهانە لـەکوێن؟ ئایا خـودا دانایی ئەم جیهانەی نەکردووە بـە نـەزانی؟ [21]بۆیە لەدانایی خودادا، خـەڵکی خودایـان بـەدانایی نەناسی، ئـەوە بـوو خـودا بەباشـی بیـنی، بـاوەڕداران ڕزگار بکات بەگێلایەتی ڕاگـەیاندنی مزگێـنی. [22]چـونکە جوولەکەکان داوای نیشانە دەکەنو یۆنانیەکان بەدوای دانایی‌دا دەگەڕێن، [23]بـەڵام ئـێمە، مەسیحی لەخاچدراو ڕادەگەیـنین، ئەمـەش کۆسـپە بـۆ جوولەکەو نەزانیە بۆ یۆنانی، [24]بەڵام لـەلای ئەوانـەی کـە خـودا بـانگی کـردوون لـەجوولەکـەو لـەیۆنانی، مەسـیح توانـاو دانـایی خودایـە. [25] نـەزانی خـودا، داناتـرە لـەدانایی خـەڵکی، هـەروەها لاوازی خـودا، بەهێزترە لەهێزی خەڵکی.

[26]بیرکەنـەوە ئـەی بـرایان چـۆن بـوون کاتیٚ خودا بانگی‌کردن، چەند داناتـان تـیادابوو بەگوێـرەی جیهان، هـەروەها چەند توانادارو لەبنەماڵەی ناودارتـان تـیادابـوو. [27]بـەڵام خودا ئـەوەی نـەزان بـوو لـەجـیهان هەڵبـژارد، تـاکو داناکـان شـەرمەزاربن، لاوازەکـانی هەڵبژارد تـاکو بەهـێزەکان شـەرمەزاربن. [28]

هـەروەها خودا ئەوانەی هەڵبژارد کە نـزمو بـیٚ‌ترخن لـەجیهان، بوونیشیان نیـیە، تاکـو ئەوانەی بوونیان هـەیە نەمێـنن، [29]ئەمـەش بۆ ئەوەیە تا هیچ مرۆڤـێك لەبـەردەم خـودا شـانازی نـەکات. [30]بـەڵام ئـێوە بەهۆی خودا لەعیسـای مەسـیحدان، ئـەوەی لـەخوداوە بۆمـان بـوو بە دانایی‌و ڕاسـتودروسـتی، پاكوپیرۆزی‌و قـوربـانی، [31]تا ئەوەی لەکتێبی پیرۆز نووسـراوە بێـتەدی: {ئـەوەی بیەویٚ شـانازی بکـات، بـا شـانازی بـە خوداوەند بکات.}

## مزگێنی مەسیحی لەخاچدراو

## 2

منیش ئەی برایان، کاتیٚ هاتم بۆ لاتان بـۆ ڕاگـەیاندنی شـایەتی خـودا، ئەمـەش بـەووشەی دانایی‌و پاراو و پـڕ لـەواتاوە نا، [2]چونکە من بڕیاری ئـەوەم داوە باسـی هیچـتان بۆ نەکەم جگـە لەعیسـای مـەسـیحو لـەخاچـدانی. [3]کـاتیٚ هـاتم بۆ لاتان هەسـتم بە لاوازی‌و سامو هەیبەتو تـرس دەکـرد، [4]ووتـەکانمو ڕاگەیاندنەکانم لەڕازی‌کردنی خەڵك پشـتیان بـە دانـایی مرۆڤ نەدەبەست،

بـەڵکو بـە بەڵگـەی هـێزی ڕۆحـی پـیرۆز، [5]تـا بـناغەی باوەڕتان لـەسەر هـێزی خـودا دابمـەزری، نەك لـەسەر دانایی مرۆڤ.

**دانایی خودا**

[6]ئـێمە لەنـێوان پێگەیشـتوان بـەدانایی دەدوێین، بەڵام بەدانایی ئەم سـەردەمەو دەسـەڵاتدارانی ئـەم سـەردەمە نا کە لەناودەچن، [7]بەڵکو باسـی دانـایی خودا دەکەین، ئەوەی بەنهێـنی پێچـراوەتەوە، ئـەوەی خودا لـەپێش زەمانەوە ئامادەی کردووە بۆ شـکۆو بـەرزی ئـێمە. [8]ئەمـەش دانایـیەکە هـیچ لـەدەسەڵاتدارانی ئەم سـەردەمە نایـزانن، چـونکە گـەر بیانزانـیایە، خوداوەنـدی شکۆداریان لـەخاچ نـەدەدا. [9]هەروەك لـە کتێبی پـیرۆزدا نووسـراوە: {ئـەوەی چـاو نەیبینیوە، هەروەها گوێ نەیبیستووەو بەمێشـکی هـیچ مرۆڤێکدا نەهاتووە، خـودا ئامـادەیکـردووە بۆ ئەوانەی خۆشیان دەوێ.} [10]ئیتر خودا ئەمەی بـەهۆی ڕۆحـی خۆی بۆ دەرخستین، چـــونکە ڕۆح هـــەموو شـــتێك دەپشـكنێ، تەنانەت ناخو ناوەڕۆکی خـوداش. [11]جـا هیچ کەسێك نازانێ چـی لـەناوەرۆکی مـرۆڤ هەیـە ئـەو ڕۆحـە نـەبێ کـە لـەو مـرۆڤە دایە؟ هـــەروەها کـــەس نـــازانێ چـــی لـــەناوەڕۆکی خـــودا هەیـــە جگـــە لەڕۆحی خودا. [12]کەواتە ئێمە ڕۆحی ئـەم جـیهانەمان وەرنەگرتووە، بەڵکو ئـەو ڕۆحـەی خـودا داویەتی پێمان، تـاکو ئـەو دیاریـە بـزانین کـە خودا پێیبەخشـیوین. [13]ئـەوەی باسـی دەکـەین لـەزیـرەکیو دانـایی مـرۆڤ نـەهاتووە، بەڵکو لەوەی ڕۆح فێری کـردین. بـۆ ئەمـەش شتە ڕۆحیەکان بەشـتی ڕۆحیتر بەراورد دەکەین. [14]مـرۆڤ بـەو هەسـتە سروشـتیەی کـە هەیـەتی ناتوانێ ئەوەی کە هی ڕۆحی خودایـە وەریگـرێ، چـونکە بـۆ ئەو ئەمانـە هـەمووی گێلایەتیـیەو ناتوانێ تێبـگات، چـونکە جـیاکردنەوەی پێویسـتی بـە هەستی ڕۆحی هەیە. [15]بـەڵام مـرۆڤی ڕۆحانی حوکم بەسەر هـەموو شـتێك دەدا، کەچـی خـۆی کەس حوکمی بەسەر نادات. [16]{کێ دەتوانـێ بـیری خوداوەنـد بـزانێ، یاخود کێ دەتوانێ ببێتە ڕێنیشاندەری خـودا؟} بەڵام ئێمە، بیری مەسیحمان هەیە.

## دووبەرەکی لەکۆمەڵەی باوەرداران

# 3

ئەی برایان، من نەمتوانی وەك مرۆڤی ڕۆحانی لەگەڵتان بدوێم، بەڵکو وەك مرۆڤێك بەپێی لەش بژیو هێشتا هەر منداڵی ساوا بێ لە مەسیح. [2] لەجیاتی خواردن شیرم داونەتێ نەك خواردنی تەواو، چونکە ئێوە بەرگەی ئەو خواردنەتان نەدەگرت، ئێستاش بەرگەی ناگرن. [3] جا ئێوە هێشتا هەر بەپێی لەش دەژین. ئایا ئەو چاوپیسیو دووبەرەکایەتیەی لەنێوانتان هەیە دەرناخات ئێوە وەك خەڵك هێشتا بەپێی لەش بیردەکەنەوەو دەژین؟ [4] کاتێ یەکێکتان دەڵێ: (من لەگەڵ پۆڵسم)، ئەوی دیکە دەڵێ: (من لەگەڵ ئەپۆلۆسم)، ئایا لێرەدا ئێوە بەپێی لەش ناژین؟

[5] پۆڵس یاخود ئەپۆلۆس کێیە؟ ئەوان تەنها خزمەتکاری خودان، ئێوە بەهۆی ئەوانەوە باوەڕتان هێناوە. جا هەریەکو بەپێی ئەوەی خوداوەند پێیبەخشیوە. [6] من چاندمو ئەپۆلۆس ئاوی‌دا، بەڵام خودا بوو پێی‌گەیاند. [7] کاری چێنەرو ئاودەر ئەوەندە گرنگ نییە، بەڵکو گرنگی بۆ خودایە کە پێی‌دەگەینێ. [8] جیاوازی لەنێوان چێنەرو ئاودەر نییە، هەریەکە کرێی خۆی وەردەگرێ بەپێی کارو ماندووبوونی خۆی. [9] کەواتە ئێمە لەگەڵ خودا کار دەکەین، ئێوەش کێڵگەی خوداو خانووی خودان. [10] ئیتر بەپێی ئەو بەرەکەتەی خودا پێی بەخشیوم، بناغەم دانا وەك وەستایەکی لێهاتوو، ئەوسا خەڵکی تر لەسەری دروست دەکات. جا با هەر یەکە ئاگاداربێ چۆن لەسەر ئەو بناغەیە دروست دەکات، [11] ئەو بناغەی لای ئێوە دانراوە، عیسای مەسیحە، کەس ناتوانێ بناغەیەکی‌تر دابنێ. [12] بەڵام گەر یەکێك لەسەر ئەو بناغەیە بەزێڕ یا بەزیوو یا بە بەردی گرانبەها، یاخود بەدارو پووش‌وکا دروست بکات. [13] ئەو کاتە کاری هەر یەکێك دەردەکەوێ، چونکە ڕۆژی لێپرسینەوە ئاشکرای دەکات، لەبەر ئەوەی کرداری هەر یەکێك بەئاگر ڕادەگەیێنرێو بە ئاگر تاقی دەکرێتەوە. [14] ئیتر هەر یەکێك کرداری لەسەر ئەو بناغەیە بمێنێتەوە ئەوا پاداشت وەردەگرێ. [15] گەر کرداری یەکێك سووتا، ئەوا زیانی پێ‌دەگات، خۆی ڕزگار دەبێ، بەڵام

وەك یەكێك بەناو ئاگردا چوو بێ.

[16]ئایا نازانن ئێوە پەرستگای خوداو ڕۆحی خوداتان تیادا نیشتەجێیە؟ [17]ئەوەی پەرستگای خودا بڕوخێنێ، خوداش ئەو تێك دەدات. چونكە پەرستگای خودا پیرۆزە، ئێوەش خۆتان ئەو پەرستگایەن. [18]ئاگاداربن كەستان خۆی هەڵنەخەڵەتێنێ. گەر یەكێك لەنێوانتان خۆی بەدانا زانی لەم سەردەمەدا، دەبێ ببێ بەنەزان هەتا بەڕاستی ببێ بەدانا. [19]چونكە هەموو دانایی ئەم جیهانە لەبەرچاوی خودا گێلایەتییە، لەو بارەیەوە كتێبی پیرۆز دەڵێ: {خودا داناكان بەزیرەكیو فێڵبازی خۆیانەوە دەگرێ.} [20]هەروەها دەڵێ: {خوداوەند دەزانێ بیركردنەوەی داناكان پڕو پووچە.} [21]كەواتە، كەس شانازی بە مرۆڤ نەكات، چونكە هەموو شتێك بۆ ئێوەیە، [22]گەر پۆڵس بێ یاخود ئەپۆلۆس یان پەترۆس، هەروەها جیهان یاخود ژیان یان مردن لەگەڵ ئێستاو داهاتوودا، ئەمانە هەمووی بۆ ئێوەیە. [23]بەڵام ئێوە خۆتان هی مەسیحن، مەسیحیش هی خودایە.

## نێرراوانی مەسیح

# 4

بەم شێوەیە باخەڵكی بەخزمەتكاری مەسیحو هەڵگری نهێنییەكانی خودامان دابنێ. [2]لەمەش زیاتر ئەوەی داوا دەكرێ لەوانەی هەڵگری نهێنین دڵسۆزییە. [3]من بەلامەوە گرنگ نییە گەر ئێوە حوكمم بەسەر بدەن یاخود هەر دادگایەكی مرۆڤانە، تەنانەت خۆشم حوكم بەسەرخۆم نادەم. [4]جا كە ویژدانم بەشتێك ئازاری نەدام، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ بێتاوانم، چونكە خوداوەندە ئەوەی حوكمم بەسەر دەدا. [5]كەواتە پێش كاتەكە حوكم مەدە بەسەر كەس، هەتا خوداوەند دەگەڕێتەوە، ئەوەی ڕووناكی دەخاتە سەر ئەو شتانەی ئێستا لەتاریكی شاراوەیەو نیازی دڵ دەردەخات، ئەو كاتە هەر كەسەو بەپێی كرداری خۆی لەلایەن خوداوە ستایش دەكرێ.

[6]ئەی برایان، من خۆمو ئەپۆلۆسم بۆ كردن بەنموونە تا بۆتان ڕوونبێتەوەو لەئێمەوە فێربن مەبەست چییە لەوەی، كەس لەسەرووی ئەوەی لەكتێبی پیرۆزدا نووسراوە نەڕوات، جا لەبەرئەوە با

كەس لەناوتان لووتبەرز نەبێ بەسەر ئەوی دیكە. [7]كێ تۆی بەزیاتر داناوە لەخەڵكیتر؟ ئایا تۆ چیت هەیە وەرتنەگرتبێ؟ كەواتە، گەر وەرتگرتبێ، بۆ شانازی دەكەیت وەك ئەوەی وەرتنەگرتبێ؟ [8]ئێستا ئێوە تێربوونو دەوڵەمەند بوون! بوون بە پادشا بەبێ ئێمە. خۆزگە ئێوە بەڕاستی پادشا بوونایە ئەوسا لەگەڵتان بەشداری حوكمڕانیمان دەكرد! [9]من لەو باوەڕەدام خودا بەئێمەی نێرراو، لەناو خەڵك نزمترین شوێنی پێداوین، وەك یەكێك لەبەر چاوی فریشتەو مرۆڤو جیهان، بەئاشكرا حوكمی مردنی بەسەر درابێ. [10]ئێمە لەپێناوی عیسا خەڵك بە نەزان سەیرمان دەكات، بەڵام ئێوە بەهۆی عیساوە خەڵكی بەدانا سەیرتان دەكات. ئێمە لاواز بووین بەڵام ئێوە بەهێزبوون، ئێوە ڕێزتان لێدەگیرێ بەڵام ئێمە بەچاوی سووكەوە سەیر دەكرێین. [11]تا ئێستا ئێمە ئازاری برسێتیو تینوێتیو ڕووتیو لێدانو بێلانەیی دەچێژین. [12]بەئارەقی ناوچەوان نان پەیدا دەكەین. ئەوەی جنێومان پێدەدات داوای پیرۆزی بۆ دەكەین، هەروەها كاتێ دەمانچەوسێننەوە دانبەخۆمان دەگرین. [13]هەستمان بریندار دەكەن، بەڵام ئێمە بە نەرمو نیانی وەڵامیان دەدەینەوە. وەك زبڵی جیهانو پاشماوەی هەموو خەڵكمان لێهاتووە.

[14]من ئەمە نانووسم تا شەرمەزارتان بكەم، بەڵكو ئامۆژگاریتان دەكەم وەك منداڵی خۆشەویستی خۆم. [15]گەر هاتوو ئێوە هەزاران مامۆستاتان لەمەسیح هەبێ، ئەمە ئەوە ناگەینێ باوكی زۆرتان هەیە. چونكە من بووم بەباوكی ئێوە لەعیسای مەسیحدا بەهۆی مزگێنییەوە. [16]لەبەرئەوە داواتان لێدەكەم لاسایی من بكەنەوە. [17]لەبەر هەمان شت تیمۆساوسم بۆ ناردن، كوڕی خۆشەویستو دڵسۆزم لەخوداوەند، ئەو ڕێبازی منتان بیردەخاتەوە لەمەسیحدا، كە من لەهەموو شوێنێك لەكۆمەڵەی باوەڕداران فێری خەڵكی دەكەم. [18]هەندێ كەس لەنێوانتان بە لووتبەرزیەوە لەو باوەڕەدا بوون من نایەم بۆ لاتان. [19]بەڵام گەر خوداوەند خواستی لەسەربێ بەخێرایی دێم بۆ لاتان، ئەوسا

بايــەخ نـــادەم بـــە قســـەی ئـــەو لووتبەرزانە، بەڵكو دەمەوێ توانای ئـەوان بـزانم. [20]چـونكە پادشـاهێتی خـودا لەسـەر قسـە ڕانەوەسـتاوە، بـەڵكو لەسـەر هێزو توانا. [21]كەواتە كامـەتان دەوێ؟ بـەدارو قامچـی بۆ لاتـان بـێم يـاخود بـەخۆشەويستیو ڕۆحی ميهرەبانی؟

## حوكمدان بەسەر داوێن پيس

# 5

لەڕاســـتيدا بلاوبووەتـــەوە كـــە لەنێوانـتان داوێـنپيسی هەيە. جۆرە داوێـــنپيســـيەك تەنانـــەت لـــەلای بـتپەرسـتانيش نـيـە، پـياو لـەگـەڵ بـــاوەژنی خـــۆی دەســـت تـــێكەڵ دەكـــات. [2]لـەگـــەڵ ئـــەوەش بـەلووتبەرزيـەوە شـانازی بەخۆتان دەكـەن! ئايا لـەجياتی ئەمە باشتر نييە ماتـەمداربـن هەتا ئەوەی ئەم كارەی كـردووە لەنێوانـتان نەمێـنی؟ [3]مـن بـەلـەش لێـتان دوورم، بەلام بەڕۆح لەگەڵـتانم، حوكمم داوە بەسەر ئەو كەسـەی ئـەو كـارەی كـردووە هـەروەك لـەوێ بـووبم. [4]بـەناوی خوداوەندمان عيسا كۆببنەوە لەسەر ئـەو كەسـەی ئـەم شتانەی كردووە، ئەوسـا منيش بەڕۆح لـەگەڵتان دەبم. بـەهۆی هـێزو توانـای خوداوەندمان عيسـا، [5]ئـەو پـياوە بدەنـە دەسـتی شـەيتان تـا لـەشی بفەوتێ، بۆ ئەوەی ڕۆحـــی ڕزگـــاری بـــێ لـــەڕۆژی لـێپرسـينەوەی خوداوەنـد عيسـا. [6]بـاش نـيـە ئـێوە شانازی بەخۆتانەوە بكـەن. ئايـا نـازانن هەويرترشـێكی بچووك هەموو هەويرەكە هەڵدێنێ؟ [7]جـا خۆتـــان پـــاكبكەنـــەوە لـــە هەويرترشـــی كـــۆن هـــەتا بـــبن بـــە هەويـرێكی تازە، چونكە ئێوە نانێكن هەويرترشـی تـيا نـيـە. لـەبەر ئەوەی مەسـيح بـەرخی جـەژنی تێپەڕبوونی ئـێمەيەو كـرا بـە قوربـانی. [8]كەواتە ئێمە باجەژن بكەين، بەلام نەك بەنانی هەويرترشـــی كـــۆن، هەويرترشـــی چاوپيسـیو خـراپە، بـەڵكو بـەنـانی فەتيرەی پاكیو ڕاستی.

[9]مـن پێشـتر بۆم نووسيون تێكەڵ بـەداوێـنپيسان مەبن، [10]مەبەستم لە داوێـــنپـــيسو چاوچـــنۆكو دزو بتپەرسـتانی ئـەم جيهانە نييە، ئەگينا ئـێوە ناچار دەبوون لـەم جيهانە بچنە دەرەوە. [11]بـــەڵكو بـــۆ ئـــەوە بـــۆم نووسـيون تـێكەڵ بـەيەكـێك مـەبن، خـۆی ناونـاوە بـرا لـەبـاوەڕ، بەلام

لەهەمان کات گوناهبارە بە داوێنپیسی یان چاوچنۆکی یاخود بتپەرستیو جنێوفرۆشی یان سەرخۆشیو دزی. ئەم جۆرە کەسانە تەنانەت بۆ نان خواردنیش لەگەڵیان دامەنیشن. [12]ئایا کاری منە حوکم بەسەر ئەوانە بدەم کە لەدەرەوەی کۆمەڵەی باوەڕدارانن؟ ئایا ئێوە نین حوکم دەدەن بەسەر ئەوانەی لەناو کۆمەڵەن؟ [13]چونکە ئەوانەی لەدەرەوەی کۆمەڵەن، خودا حوکمیان بەسەر دەدات. {لەناو خۆتان خراپەکار دەربکەن.}

**شکاتی نێوان باوەڕداران**

# 6

گەر هاتوو لەنێوانتان یەکێك شکاتێکی هەبوو دژی ئەویتر، ئایا دەوێرێ شکاتەکەی بباتە لای زۆرداران لەجیاتی ئەوەی بیباتە لای برایانی پیرۆز؟ [2]ئایا نازانن برایانی پیرۆزن حوکم بەسەر جیهان دەدەن؟ گەر هاتوو ئێوە بتوانن حوکم بەسەر جیهان بدەن، ئایا توانای ئەوەتان نییە بەسەر کاروباری ساکارو ئاسان حوکم بدەن؟ [3]ئایا نازانن ئێمە تەنانەت حوکم بەسەر فریشتەکانیش دەدەین؟ ئیتر چۆن توانامان نییە بەسەر گیروگرفتی ڕۆژانەمان زاڵبینو حوکم بەسەر کاروباری ئەم ژیانەدا بدەین؟ [4]گەر ئێوە لەم بارەیەوە ناکۆکی کەوتە نێوانتان، ئایا دەیبەنە لای ئەوانەی بێ‌ترخن لەلای کۆمەڵەی باوەڕداران؟ [5]من ئەمە دەڵێم تاکو شەرم بکەن. ئایا لەناوتان یەکێکی دانای تیادا نییە بتوانێ بڕیار سەبارەت بەم کاروبارانە بدات؟ [6]برا برای خۆی ڕادەکێشێ بۆ دادگا، ئەمەش بۆ لای بێباوەڕان!

[7]لەڕاستیدا شورەییە بۆ ئێوە لەنێوانتان شکاتو شکاتکاریو ئاژاوە هەبێ. باشتر نەبوو بۆتان زۆرلێکراوبن؟ باشتر نەبوو بۆتان ڕووتێنراوبن؟ [8]بەڵام ئێوە خۆتان خراپەو تاڵان بەرامبەر براکانیشتان دەکەن. [9]ئایا نازانن زۆردار نایێتە میراتگری پادشاهێتی خودا؟ هەڵمەخەڵەتێن، نە داوێنپیسو نە بتپەرستو نە مێبازو نە هەتیوباز، [10]نە دزو نە چڵێسو نە سەرخۆشو نە جنێوفرۆشو نە تاڵانکەر نابنە میراتگری پادشاهێتی خودا. [11]جا هەندێکتان بەم شێوەیە بوون، بەڵام ئێستا شۆراونەوە، بەڵکو

پیرۆزکراون‌و بێ‌تاوان بوون بەناوی خوداوەند عیسای مەسیح‌و ڕۆحی خودامان.

**بەلەش ستایشی خودا بکەن**

[12]لەوانەیە یەکێك بڵێ: (هەموو شتێك دروستە بۆ من.) بەڵام هەموو شتێك سوودی نییە. (هەموو شتێك دروستە بۆ من.) بەڵام نابم بەکۆیلەی هیچ شتێك. [13]لەوانەیە یەکێکی تر بڵێ: (خواردن بۆ وورگەو وورگیش بۆ خواردن)، ئەمە ڕاستە، بەڵام دڵنیابن خودا هەردووکیان لەناودەبات. ئەمەش مانای ئەوە نییە لەش بۆ داوێن‌پیسییە، بەڵکو بۆ خوداوەندە، هەروەها خوداوەندیش بۆ لەشە. [14]ئیتر چۆن خودا بەهۆی توانای خۆیەوە خوداوەندی لەناو مردووان هەستاندەوە، هەروەها ئێمەش لەنێو مردووان هەڵدەستێنێتەوە. [15]ئایا دەزانن لەشتان ئەندامی لەشی مەسیحە؟ ئایا دەبێ ئەندامی لەشی مەسیح بهێنم‌و بیکەم بەئەندامی لەشی داوێن‌پیسێك؟ نەخێر، هەرگیز ئەمە نابێ! [16]ئایا نازانن ئەوەی لەگەڵ داوێن‌پیسێك تێکەڵ بێت لەگەڵی دەبێ بەیەك لەش؟ چونکە لەکتێبی پیرۆز نووسراوە: {هەردووکیان دەبن بە یەك لەش.} [17]بەڵام ئەوەی لەگەڵ خوداوەند بوو بەیەك، لەگەڵی دەبێ بەیەك ڕۆح.

[18]لە داوێن‌پیسی دووربکەونەوە، چونکە هەر گوناهێك مرۆڤ بیکات کار ناکاتە سەر لەشی، چونکە لەدەرەوەی لەشە، بەڵام داوێن‌پیس هەڵە دژی لەشی خۆی دەکات.

[19]ئایا نازانن لەشتان پەرستگای ڕۆحی پیرۆزە ئەوەی تیاتاندایەو جێگیربووە لەلایەن خوداوە؟ ئیتر ئێوە هی خۆتان نین، بەڵکو هی خودان. [20]چونکە ئێوە بە نرخێکی گران کڕراون. کەواتە بەلەشتان ستایشی خودا بکەن.

**ژن‌هێنان‌و شووکردن**

# 7

سەبارەت بەوەی بۆ منتان نووسیوە، باشترە بۆ پیاو ژن نەهێنێ. [2]بەڵام، تا دوورکەونەوە لەتاقی‌کردنەوەی داوێن‌پیسی، با هەر پیاوێك ژنی خۆی هەبێ، هەروەها هەر ژنێکیش مێردی خۆی هەبێ. [3]با مێرد چ مافێکی ژن‌و مێردایەتی بەسەرەوەیە

سەبارەت بەژنەکەی بیداتێ، هەروەها ژنیش هی مێردەکەی. [4] چونکە ژن دەسەڵاتی بەسەر لەشی خۆی نییە، بەڵکو هی مێردەکەیەتی. هەروەها مێردیش دەسەڵاتی بەسەر لەشی خۆی نییە، بەڵکو هی ژنەکەیەتی. [5] کەستان خۆی بێبەش نەکات لەوەی دیکە، تەنها کاتێك نەبێ کە هەردووکتان لەسەر ئەوە رێككەوتبن، بەمەبەستی کات تەرخانکردن بۆ نوێژ، ئینجا بگەرێنەوە بۆ ژیانی ژنو مێردایەتی جاران، تاکو بەهۆی خۆڕانەگرتنتانەوە نەکەونە تاقیکردنەوەی شەیتان. [6] ئێستا ئەوەی من لێرە پێتان دەڵێم، وەك رێگادانە نەك فەرمان پێکردن. [7] من ئاواتەخواز بووم، هەر یەك لەئێوە وەك من بووایە، بەلام هەریەکەو بەهرەی تایبەتی خۆی هەیە لەلایەن خوداوە هی یەکێکیان بەجۆرێکەو ئەوەی تریش بەجۆرێکیتر.

[8] من بەوانە دەڵێم کە ژنیان نەهێناوەو شوویان نەکردووە، هەروەها ئەوانەی ژنو مێردیان مردووە باشترە بۆیان وەك من بمێننەوە. [9] بەلام گەر هاتوو نەیانتوانی خۆیان راگرن، با ژنبهێننو شووبکەن، چونکە ژنهێنانو شووکردن باشترە لەسووتان بەهەوەسەکانی لەش.

[10] بۆ ئەوانەی ژنیان هێناوەو شوویان کردووە، ئامۆژگاری تایبەتی خۆم نییە، بەڵکو راسپاردەی خوداوەندە کە دەڵێ: با ژن مێردەکەی بەجێنەهێڵێ، [11] ( بەلام گەر هاتوو لێیجیابووەوە، با بێ مێرد بمێنێتەوە یاخود مێردەکەی ئاشتبکاتەوە)، هەروەها مێردیش لەسەریەتی ژنەکەی تەلاق نەدات.

[12] بەلام ئەوانیتر من پێتان دەڵێم نەك خوداوەند: گەر هاتوو برایەکی باوەڕدار ژنێکی بێباوەڕی هەبوو ژنەکەش رازیبوو لەگەڵی بژی، با پیاوەکە بەجێی نەهێڵێو تەلاقینەدا. [13] هەروەها گەر هاتوو ژنێکی باوەڕدار مێردێکی بێباوەڕی هەبوو مێردەکەشی رازی بوو لەگەڵی بژی، با ژنەکە وازی لێنەهێنێ. [14] چونکە مێردە بێباوەڕەکە پاكو پیرۆز دەبێ بەهۆی ژنە باوەڕدارەکەی، هەروەها ژنە بێباوەڕەکە پاكو پیرۆز دەبێ بەهۆی مێردە باوەڕدارەکەی، ئەگینا منداڵی ئەم جۆرە ژنو

مێردایەتیە گلاون، هەرچەندە ئەوان پیرۆزبن. [15]بەلام گەر مێردە یاخود ژنە بێباوەڕەکە ویستی وازبهێنێ، باوازبهێنێ، لەم حاڵەتە پیاوەکە یا ژنە باوەڕدارەکە پەیوەست نییە بەپەیوەندی ژن‌و مێردایەتی، چونکە خودا بانگی کردووین بەئاشتی بژین. [16]چونکە چۆن دەزانی ئەی ژنی باوەڕدار دەتوانی مێردەکەت ڕزگار بکەیت؟ یان ئەی پیاوی باوەڕدار چۆن دەزانی دەتوانی ژنەکەت ڕزگار بکەیت؟ [17]لەگەڵ ئەوەش بەپێی ئەوەی خوداوەند بۆی داناون بژین، بەو شێوەیەی خودا بانگی کردوون، ئەمە فەرمانی منە بۆ هەموو کۆمەڵە باوەڕدارەکان. [18]ئەوەی خودا بانگی کردووە بە خەتەنەکراوی، با هەوڵی شاردنەوەی خەتەنەکەی نەدا، هەروەها ئەوەش بە خەتەنە نەکراوی بانگی کردووە، باخۆی خەتەنە نەکات. [19]چونکە خەتەنەکردن هیچ نییە، هەروەها خەتەنە نەکردنیش هیچ نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کار بە ڕاسپاردەکانی خودا بکرێ. [20]با هەر یەکە بەو شێوەیە بمێنێتەوە کە تیایەتی کاتێ خودا بانگی کردووە. [21]گەر هاتوو کۆیلە بوویت کاتێ خودا بانگی کردی؟ پێویست ناکات بایەخ بەمە بدەیت، بەلام گەر توانیت سەربەستبی، باشترە ئەم هەلە بەکاربێنی، [22]چونکە ئەوەی کۆیلە بووە کاتێ خوداوەند بانگی کردووە ئەوە دەبێتە سەربەستی خوداوەند. هەروەها ئەوەی بەسەربەستی بانگ کراوە ئەوە دەبێتە کۆیلەی مەسیح. [23]خودا ئێوەی بەنرخێکی گران کڕیوە، ئیتر ئێوە مەبن بە کۆیلەی خەڵکی. [24]لەبەرئەوە ئەی برایان، پێویستە هەر یەکە بەو شێوەیە بمێنێتەوە لەگەڵ خودا کە تیایدا بووە کاتێ بانگ کراوە.

## ڕەبەن

[25]دەربارەی ئەوانەی ژنیان نەهێناوەو شوویان نەکردووە، ڕاسپاردەیەکی تایبەتیم نییە بۆیان لەلایەن خوداوەندەوە، بەلام من بیروڕای خۆم لەم بارەیەوە دەڵێم، وەك یەکێك بەهۆی بەزەیی خوداوەندەوە متمانەی بەدەست هێناوە. [26]چونکە گەر من بیربکەمەوە، چ کاتێکی ناخۆش لەبەردەممان دایە، وای بەباشتر دەزانم کە پیاو بەبێ ژن هێنان بمێنێتەوە. [27]

گــەر تــۆ ژنــت هــەبوو، داوای جـیابوونەوە مەکـە، بـەڵام گەر ژنت نـەبوو، مەگەڕێ بەدوای ژنهێنان. [28] گـەر کوڕێـك ژنـی هێـنا، هەڵـەی نەکـردووە، هـەروەها گـەر کچـێك شووی‌کرد، هەڵەی نەکردووە. بەڵام ئــەو جــۆرە کەســانە تووشـــی دەردەســەری ژیــان دەبــن، جـا مـن دەمـەوێ ئـێوە لـەوە بپارێزم. [29]ئەی بــرایان مــن پێــتان دەڵــێم: ئــەوەندە کاتمـان نــەماوە، لەبەرئــەوە ئەوانــەی ژنــیان هێـــناوە، پێویســـتە ئێســـتا بەشــێوەیەك بــن هــەروەك ژنـــیان نەهێـــنابێ. [30]هـــەروەها ئەوانـــەی دەگــرین هــەروەك بلـێی ناگـرین، ئەوانـەی دڵخۆشـن هـەروەك بلـێی دڵخـۆش نـین، ئەوانەی شت دەکرن هـەروەك بلـێی هیچـیان نـیـە. [31] ئەوانەی پەیوەندیان بەم جیهانەوە هەیە وەك بلـێی پـەیوەندیان پێـیەوە نییە، چــونکە شـێوەی ئـەم جـیهانە ڕووەو نەمانـە. [32]دەمـەوێ ئـێوە لـەسەرقاڵی سەربەسـت بـن، ئەوەی ژنی نەهێناوە ســـەرقاڵ دەبـــێ بـــە کاروبـــاری خوداوەندو چۆنیەتی ڕازی‌کردنی. [33] بەڵام ئەوەی ژنی هێناوە سەرقاڵ دەبێ بـە کاروبـاری جـیهانیو چـۆنیەتی ڕازی‌کـردنی ژنەکەی. [34]ئەو کابرایە دڵـی بـەش‌کـراوە. هەروەها کچانو ئەو ژنانەی مێردیان نییە سەرقاڵ دەبن بەکاروباری خوداوەندو چۆن پیرۆزی لــەشو ڕۆح بەدەســت بهێـنن. بەڵام ئــەوەی شـــووی‌کردووە ســـەرقاڵی کاروبـــاری جـــیهانیو چـــۆنیەتی ڕازی‌کردنی مێردەکەیەتی.

[35]مـــن ئەمـــەتان پێ‌دەڵـــێم بـــۆ بــەرژەوەندی خۆتــان. نەك بۆ ئەوەی بـتانبەستمەوە. تاکو ڕێگای ڕاستو پەســەند بگرنو بێ دوودڵی خزمەتی خوداوەنــد بکــەن. [36]گــەر هــاتوو یەکـێك لــەو بـاوەڕەدا بـوو شتێکی چــــاك ناکـــــات بەرامـــــبەر بەدەزگیرانەکـــەی گـــەر بکەوێـــتە تەمەنــەوەو نەیهێــنێ، بــەم شــێوەیە پێویست بوو بیهێنێ، با بیهێنێ چونکە بەمـە گونـاه ناکـات. [37]بەڵام ئەوەی لەدڵــەوە بـڕیاری دابێو خۆی ناچار نەکـردبێ، بـەڵکو دەسەڵاتی تەواوی بەســەر خــۆی هەبێ، دەزگیرانەکەی خـۆی بەکچـی بهێڵێـتەوە، ئەوا باش دەکــات. [38]کەواتــە، ئــەوەی ژن دەهێـنێ شـتێکی چاك دەکات، بەڵام ئـەوەی ناهێـنی ئەوا چاکتر دەکات. [39]ژن ئـــەوەندە بـــە مـــێردەوە

دەبەستریتەوە هەتا میردەکەی زیندووە. بەلام گەر میردەکەی مرد، ئەوسا ژنەکە سەربەستەو مافی ئەوەی هەیە هەر پیاویك کە بیەوێ شووی پێ بکات، بەلام پیاوەکە لەخوداوەند بێ. [40]ئەگینا بەڕای من ئەو ئافرەتە بەختەوەرترە گەر وەك خۆی بمێنێتەوەو شوونەکات. لەو باوەڕەشدام منیش ڕۆحی خودام تیادایە.

## قوربانی بتەکان
## 8

ئێمە هەموومان ئەو زانینەمان هەیە سەبارەت بەو قوربانییانەی پێشکەش بەبتەکان دەکرێت. بەلام زانین لووتبەرزت دەکات، کەچی خۆشەویستی بنیادت دەنێ، [2]گەر یەکێك لەو باوەڕەدایە شتێك دەزانێ، ئەو کەسە جارێ شتەکە بەتەواوی نازانێ وەك پێویستە بیزانێ. [3]بەلام ئەوەی خودای خۆشدەوێ، ئەوا لای ئەو ناسراوە.

[4]سەبارەت بەوەی پەیوەندی بەخواردنی قوربانیی بتەکانەوە هەیە، ئێمە دەزانین بت بوونی نییە، هەروەها جگە لەخودای تاکو تەنها هیچ خودایەکی تر نییە. [5]چونکە گەر هەندێك هەبن پێیان بگوترێ خودا لەئاسمانو لەسەر زەوی، هەروەك زۆر خوداو زۆر خوداوەندیش هەیە. [6]بەلام ئێمە تەنها یەك خودامان هەیە، ئەویش ئەو باوکەیە کە هەموو شتێك لەلایەن ئەوەو ئێمەش بۆ ئەو هەین، هەروەها یەك خوداوەندمان هەیە ئەویش عیسای مەسیحە، کە هەموو شتێك بەهۆی ئەوەو ئێمەش بەهۆی ئەو هەین.

[7]بەلام هەموو خەلك ئەم ڕاستیە نازانن، چونکە هەندێکیان تا ئەمڕۆش واڕاهاتوون کەوا بت بەڕاستی بوونی هەیە، تەنانەت لە گۆشتی قوربانیی بتیش دەخۆن، هەر وادەزانن پێشکەش بەبتەکان کراوە، ویژدانە لاوازەکەشیان گلاوبووە. [8]خواردن لە خودا نزیکمان ناکاتەوە، گەر هاتوو لەشتێکمان خوارد هیچمان دەست ناکەوێ، هەروەها گەر لێمان نەخوارد باشتر نییە. [9]بەلام ئاگاداری خۆتان بن تاکو ئەم سەربەستیەتان نەبێتە بەردی کۆسپ بۆ ئەوانەی باوەڕیان لاوازە، [10]ئەی خاوەنی زانیاری گەر هاتوو یەکێك تۆی بینی لەپەرستگای بت لەسەر خوان

دانیشـتووی، ئایـا ئـەو کەسـە گـەر ویژدانی لاواز بیّ هاننادریّ لەگۆشتی قوربـانی بـتەکان بخـوات؟ [11]جـا زانیاریەکەت بووە هۆی لەناوچوونی ئـەو بـرا بـاوەڕ لاوازەی مەسـیح لەپێناوی مرد.

[12]کەواتـە بەهـەمان شـێوە گوناه بەرامـبەر بـە مەسـیح دەکـەن، کاتیّ گونـاه بەرامبەر بە برایەکتان دەکەنو ویژدانی لاوازیان بریندار دەکەن. [13] لەبەر ئەوە، گەر هەندیّ خۆراك ببێتە کۆسـپو کەوتـنی بـراکەم، ئـیتر هەرگـیز گۆشـت نـاخۆم تـاکو نەبمە کۆسپ بۆ براکەم.

## مافی نێرراوان
## 9

ئایـا سەربەسـت نیم؟ ئایا نێرراو نیم؟ ئایـا عیسای مەسیحی خوداوەندمانم نـەدیوە؟ ئایا ئێوە بەرووبوومی کاری مـن نـین لـەخوداوەنـد؟ [2]گەر هاتوو نـێرراو نـەبم لای خەلّکی تر، بۆ ئێوە نـێرراوم، چـونکە ئـێوە مـۆری نێرراوێـتی مـنن. [3]ئەوەیـە بەرگری‌کردنی من سەبارەت بەوانەی تاقیم دەکەنەوە: [4]ئایا مافی خواردنو خواردنـەوەمان نـیـە؟ [5]ئایـا مـافی ئـەوەمان نیـیە یەکـێك لـەخوشـکان بکـەین بەهاوسەرمانو لـەگەلّ خۆمان بیهێـنین، وەکـو نـێرراوانی تـرو پەتـرۆسو بـرایان لـەخوداوەنـد؟ [6] یـاخود تـەنها مـنو بـەرنابا مـافی ئەوەمان نییەو هەر دەبیّ ئیش بکەین ﴿بـۆ پەیداکـردنی پێویسـتیەکانی ژیانمـان﴾؟ [7]چ سـەربازێك دەچیّ بۆ جـەنگ لەسـەر حسابی خۆی؟ یا چ باخەوانـێك ڕەزێـك دەچـێنیّو لەبەرەکـەی نـاخوات؟ یـاخود چ شـوانێك مـێگەلـیّ دەلـەوەڕێـنیّو لەماسـتەکەی نـاخوات؟ [8]ئایـا ئـەم قسانەم قسەی مرۆڤە؟ ئایا شەریعەتیش هەمان شت نالّیّ؟ [9]لەشەریعەتی موسا نووسـراوە: {دەمـی گـا مەبەسـتەوە لـەکاتی دەغلّ کوتانەوە.} گەر خودا بایـەخ بـە گـا بدات؟ [10]ئایا بەڕاستی ئەمـەی لەپێـناوی ئـێمەدا نـەوتووە؟ بـەلّیّ، لەپێـنـاوی ئـێمـەدا ئەمـە نووسـراوەو مانـای ئەوەیـە: هـەموو ئەوانـەی زەوی دەکـێلّن. دەیکـێلّن بەهیواوە، ئەوانەی گەنم دەکوتن ئەوە دەکـەن بەهـیوای ئـەوەی بەشداربن لەبـەرووبووم. [11]کـاتیّ ئـێمە شـتی ڕۆحیـتان تیا بچێنین ئایا گەلـێك زۆرە گـەر لەئـێوە هـەندیّ شـتی پێویستی

لـەشمان دەسـت کەوێ؟ [12]گەر بێتو کەسانی تر ئەم مافەیان بـەسـەرتـان هــەبێ، دەبــێ ئـێمە چەند لەوان لەپێشـتر بین؟ بەلاَم ئێمـە ئەم مافەمان وەرنەگـرت، بـەڵکو لەهەموو شتێك داڤمان بەخۆمان گرت تاکو کۆسپێك نەخەیـنە سـەر ڕێگـای مـزگێـنی مەسـیح.

[13]ئایا نازانن ئەوەی خزمەتی پەرستگا دەکـات بـە خـێری پەرستگا دەژی، هـەروەها ئـەوەی خـزمەتی قوربانگـا دەکـات بەشـی خۆی لەقوربانیەکان هەڵدەگرێ؟ [14]هەر ئاواش خوداوەند فــەرمانیداوە ئەوانــەی مزگێــنی خوداوەنـد دەدەن خۆیان بەهۆی ئەو مزگێنییەوە بژێنن. [15]بەلاَم من داوای هـیچ مافـێك لـەو مافانـە ناکـەم، هـەروەها ئێسـتا ئـەوە نانووسـم هەتا داوای ئـەم یارمەتیـیە بکـەم. چونکە مـردنم بـەلاوە باشترە لەوەی یەکێك ڕێـی ئـەم شـانازیەم لـێبگـرێ. [16] چـونکە گـەر مزگێـنی بـدەم نـابێ شـانازی بـەخۆم بکـەم، لەبەرئەوەی مزگێنیدان لەسەرم پێویستە. جا قور بەسـەرم گەر بێتو مزگێنیم نەدایە. [17] چـونکە گـەر بەخواسـتی خـۆم ئەوە بکــەم، ئەوا پاداشت دەکرێم، بەلاَم گـەر بەخواسـتی خـۆم نـەبێ، ئـەوا مـتمانەی لێپرسراویەتییەکم پێدراوەو جێبەجـێی دەکـەم. [18]ئـیتر پاداشـتم چـییە؟ پاداشـتی من ئەوەیە بەخۆڕایی مزگێـنی بـدەمو واز لــەمـافـی خۆم بهێـنم لەمزگێـنیدا. [19]من مرۆڤێکی ئـازادم، کۆیلـەی هـیچ کەس نیـم، بـەلاَم خـۆم کـرد بەکۆیلە بۆ هەموو خـەڵك تـا ژمارەیـەکی زۆریـان لـێ بەدەسـتبهێـنم. [20]هەتا جوولـەکە بۆ مەســیح بەدەســتبهێــنم، وەك جوولـەکەیەك دەژیم. هەروەها بۆ ئەو خەڵکانـەی لـەژێـر سایەی شەریعەت دەژیـن وەك ئـەوان لـەژێـر سـایەی شـەریعەت دەژیـم، چـونکە دەمەوێ ئـەو جـۆرە کەسـانەش بـۆ مەسـیح بەدەسـتبهێـنم، [21]بـەلاَم بـۆ ئـەو کەسـانەی بێ شەریعەتن، خۆم دەکەم بـە بێشـەریعەت هـەتا بـۆ مەسـیح بەدەسـتیانبهێـنم. ئـیتر ئەمـە ئـەوە ناگەیــەنێ مــن شــەریعەتی خــودا ڕاناگــرم، بــەڵکو لەژێـر سـایەی شـەریعەتی مەسیحم. [22]بۆ لاوازەکان خــۆم دەکــەم بــە لاواز، تــاکو بەدەسـتیانبهێـنم بـۆ مەسیح. ئیتر بۆ هـەمووان بووم بەهەموو شتێك، هەتا بەهەر شێوەیەك بێ هەندێکیان ڕزگار

بکەم. [23]ئەمانە هەمووی دەکەم لەپێناوی مزگێنیدا، تا بەشداری تیادا بکەم.

[24]ئایا نازانن هەموو ئەوانەی بەشداری ڕاکردن دەکەن لەیاری پێشبڕکێدا، تەنها یەکێکیان پاداشت وەردەگری؟ بەهەمان شێوە ئێوەش ڕابکەن تا دەیبەنەوە، [25]هەر یەکێك لەو یاریزانانە مەشقی خۆ بەهێزکردن دەکەن، تاکو تاجێکی لەناوچوو بەدەستبهێنن. بەڵام ئێمە لەپێناوی بەدەستهێنانی تاجێکی لەناونەچوو. [26]کەواتە من ڕاناکەم وەك یەکێك ئامانجی نەبێ، هەروەها بۆکسێن ناکەم وەك یەکێك لەهەوا بدا. [27]بەڵکو ڕەق دەبم لەگەڵ لەشی خۆمو دەیکەم بەکۆیلە، تاکو خۆم ڕەت نەکرێمەوە، دوای ئەوەی خۆم بەخەڵکیترم ڕاگەیاندووە.

## فێربوون لەمێژووی ئیسرائیل

# 10

برایان دەمەوێ ئێوە بزانن، باوباپیرانمان هەموویان لەژێر هەوردا بوونو هەمووشیان دەریای سووریان بڕی. [2]جا هەموو ئەوانەی لەدەریاو لەژێر هەوردا بوون وەك قوتابیانی موسا لەئاوهەڵکێشران، [3]هەمووشیان یەك جۆرە خواردنی ڕۆحیان خواردو [4]هەموویان یەك جۆرە ئاوی ڕۆحیان خواردەوە، چونکە لەو بەردە ڕۆحیەیان دەخواردەوە کە دوایان کەوتبوو، ئەو بەردەش مەسیح بوو. [5]بەڵام خودا لە زۆربەیان ڕازی نەبوو، ئیتر ئەمە بووە هۆی فڕێدانیان لەبیابان. [6]ئەم شتانە ڕوویدا تاکو ببێ بەنموونەیەك بۆمان، ئارەزووی کاری خراپ نەکەین، هەروەك ئەوان ئارەزوویانکرد، [7]نابێ ئێمە ببین بە بتپەرست وەك هەندێ لەوان، چونکە لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە: {گەل دانیشتن بۆ خواردنو خواردنەوە، ئینجا هەستانەوەو کەوتنە سەماکردن.} [8]هەروەها نابێ خۆمان بدەینە دەست داوێنپیسی وەك هەندێکیان کردیان.لێرە ئەمە بووە هۆی ئەوەی لەڕۆژێکدا بیستوسێ هەزار کەسیان لێ بمرێ. [9]هەروەها نابێ مەسیح تاقیبکەینەوە وەك هەندێکیان کردیان، ئیتر هەموویان بەمار لەناوچوون. [10]بێزاری دەرمەبڕن وەك هەندێکیان کردیان، ئەوسا ئەوەبوو فریشتەی لەناوبەر لەناوی

بـردن. [11]ئـەم شـتانە هەمووی دەبێ بەئاگاداریـەك بـۆ ئێمە، چونكە ئەمانە هـەمووی بـۆ ئامۆژگاری كـردنەوەی ئـێمە نووسـراوە، كـە كۆتایی جیهان لـێمان نزیك بووەتەوە. [12]ئیتر ئەوەی لـــەو باوەڕەدایـــە كـــەوا خـــۆی ڕاگـرتووە، بائاگـای لـەخۆی بـێ نەكـەوێ. [13]هەر تاقی كردنەوەیەكتان تووش بێ ئەوە مرۆڤانەیە، بەڵام خودا پشـتی پـێ دەبەسـترێو نایەڵێ زیاتر لەتواناى خۆتان تاقیبكرێنەوە، بەڵكو لـەكـاتی تاقی كردنەوەدا ڕێگایەكتان بـۆ دەكاتـەوە تـاكو بـتوانن بەرگـە بگـــرن. [14]لەبەرئـــەوە، ئـــەی خۆشەویســـتانم، لـــەبـــتپەرســـتی دوور كەونەوە.

[15]چـۆن لـەگـەڵ تێگەیشـتوان دەدوێـم، ئاواش لەگەڵ ئێوە دەدوێم، جا ئێوە حوكمبدەن سەبارەت بەوەی دەیڵـێم: [16]ئایـا ئـەو جامە پیرۆزەی پـیرۆزی دەكـەین بەشـداری نـیيە لەخوێـنی مەسـیح؟ یاخود ئەو نانەی لـەتی دەكـەین بەشـداری نـیيە لـە لەشـی مەسـیح؟ [17]لـەبەر ئەوەی یەك نان هەیە، ئێمە لەگەڵ ئەوەی زۆرین، یـەك لـەشـین، چـونكە هـەموومان بەشـداری لـەیـەك نـان دەكەین. [18]سـەیری ئیسـرائیل بكـەن لـەبارەی مرۆڤایەتـیەوە: ئایـا ئـەوەی قوربـانی دەخوات لەقوربانگەدا بەشدار نییە؟ [19]كەواتـە مەبەسـتم چییە؟ ئایا ئەوەی بۆ بت سەربڕاوە بەنرخە یاخود بتەكە خـۆی بەنـرخە؟ [20]نەخـێر، چـونكە ئـەوەی بـتپەرستەكان سەریدەبڕن بـۆ ڕۆحە پیسەكان سەریدەبڕن نەك بـۆ خـودا. نامـەوێ ئێوە بەشداریتان هـەبێ لەگەڵ ڕۆحە پیسەكان. [21]ئێوە نـاتوانن لەیـەك كـاتدا لـەجامی خوداوەنـدو لەجامی ڕۆحە پیسەكان بخۆنـەوە، هـەروەها نـاتوانن لەیـەك كـاتدا بەشـداری خوانی خوداوەندو خوانـی شـەیتان بكـەن، [22]یـاخود دەمانـــەوێ توڕەیی خوداوەنـــد هەستێنین؟ ئایا ئێمە لەو بەهێزترین؟

**هەموو شتێك بۆ شكۆی خودایە**

[23]ئـێوە دەڵـێن (هـەموو شـتێك دروسـتە) بـەڵام هەموو شتێك سوود بـەخش نـیيە، دەڵێن (هەموو شتێك دروسـتە) بەڵام هەموو شتێك بنیادنەر نـیيە. [24]بـا كەسـتان بـەدوای بـەرژەوەندی خـۆی نەگەڕێ، بەڵكو بـەدوای بـەرژەوەندی نـزیكەكەی بگـەڕێ. [25]ئـەو گۆشـتەی لـەبازار

دەفرۆشریٚ بیخۆن، ئەوەندە پرسیار مەکەن لەپێناوی ویژدانتان. [26]چونکە زەوی‌و هەموو ئەو شتانەی لەسەریەتی هی خوداوەندە. [27]گەر هاتوو بیٚباوەرێك داوەتی‌کردن‌و ئێوەش ڕازی‌بوون بڕۆن، ئەوسا هەرچییەکتان پێشکەش دەکات بیخۆن، بیٚ پرسیارکردن، لەبەر ویژدان. [28]بەلاّم گەر هاتوو یەکێك پێی ووتن: (ئەم خواردنە لە قوربانی پێشکەش‌کراوی بتە.) ئەوسا لێی‌مەخۆن، لەبەر ئەو کەسەو ڕازی کردنی ویژدان، [29]مەبەستم لەویژدانی ئێوە نییە، بەلکو ویژدانی ئەوی دیکە، جا بۆچی سەربەستی لەلایەن یەکێکی‌تر حوکمی بەسەر بدریٚ؟ [30]گەر خواردنێکم خواردو سوپاسی خودام لەسەری کرد، ئیتر بۆچی یەکێکی دیکە بەخراپە باسم بکات لەسەر شتێك سوپاسی خودای لەسەر دەکەم؟ [31]گەر خواردتان‌و خواردتانەوە یان هەر شتێکتان‌کرد، با هەموو شتێکتان لەپێناوی شکۆمەندی خودا بیٚ. [32]مەبن بەکۆسپ لەڕێگای جوولەکە یا یۆنانی یاخود کۆمەلّەی باوەڕدارانی خودا. [33]بەهەمان شێوە منیش هەوڵی ڕازی‌کردنی هەمووان دەدەم لەهەموو شتێك، بایەخ نادەم بە بەرژەوەندی تایبەتی خۆم، بەلکو بایەخ بە بەرژەوەندی زۆربەی خەلکی تر دەدەم، تاکو ڕزگاریان بیٚ.

## 11

بەشوێن پێی مندا برۆن وەك چۆن منیش بەشوێن پێی مەسیح دا دەڕۆم.

### نوێژکردن لەکۆبوونەوە

[2]ستایشتان دەکەم چونکە هەمیشە یادم دەکەن‌و لەسەر ئەو خووڕەوشتانە دەڕۆن بەو شێوەی پێم‌داون. [3]بەلاّم دەمەویٚ ئەوە بزانن کە مەسیح سەری هەموو پیاوێکەو پیاویش سەری ئافرەتەو خوداش سەری مەسیحە. [4]هەر پیاوێك بەسەری داپۆشراو نوێژ بکا یاخود بەووشەی خودا بدویٚ ئەوا شورەیی بەسەر خۆی دەهێنیٚ، [5]هەروەها هەر ئافرەتێك بەسەری دانەپۆشراو نوێژ بکا یاخود بەووشەی خودا بدویٚ، ئەوا شورەیی بەسەر خۆی دەهێنیٚ، ئەوەش وەك ئافرەتێك وایە کە سەری تاشرابیٚ. [6]گەر ئافرەتێك سەری

دانەپۆشـێ، باشـترە قژی ببڕێ، بەڵام گـەر هـاتوو بـۆ ئەو ئافرەتە شورەیی بـوو قـژی بـبڕێ یاخود بیتاشێ، ئەوا پێویستە سەری داپۆشێ. [7]کەواتە پیاو نـابێ سـەری داپۆشێ، چونکە وێنەو شــکۆمەندی خودایــە ، بــەڵام ژن شکۆمەندی پیاوە. [8]چونکە پیاو لەژن نـیـە، بـەڵکو ژن لــەپـیاوە. [9]پـیاو دروسـت نەکراوە بۆ ژن، بەڵکو ژن دروسـتکـراوە بـۆ پـیاو. [10]بۆیــە پێویسـتە ژن سەری داپۆشێ لەپێناوی فریشـتەکان. [11]لــە خوداوەنـد ژن سـەربەخۆ نییە سـەبارەت بەپـیاو، هـەروەها پیاویش سەبارەت بەژن. [12]چـــونکە هـــەروەك ژن لەپـــیاو دروسـتکراوە، ئـاواش پـیاو لـەژن لـەدایك دەبێت، بەڵام هەموو شتێك لەلایەن خوداوەیە.

[13]کەواتـە خۆتـان حوکـم بدەن: ئایا شتێکی جوانە بۆ ژن بێ سەرپۆش نوێـژ بکـات بـۆ خودا؟ [14]ئایا هەمان بـاری سروشــتی فـێرتان ناکــات، شــەرمەزارییە بـۆ پـیاو قـژی درێـژ بکـات، [15]بەڵام شانازییە بۆ ژن قژی درێژکاتـەوە؟ چـونکە خـودا قـژی پـیداوە بـۆ داپۆشـینی. [16]لـێرە گەر یـەکێ بـیەوێ بەربـەرەکانی ئەمــە بکات، ئیتر ئەوە لـەگەڵ خووڕەوشتی ئـێمەو کۆمەڵـە باوەڕدارەکانی خودا ڕێك ناکەوێ.

**نانخواردنی خوداوەند**

[17]ئامۆژگاریـەکانم ستایش‌کردنی ئـێوە نـیـە، چونکە کۆبوونەوەکانتان زیـانی لەسـوود زیاترە. [18]چونکە بۆ یەکــەمجار بیســـتم، کـــاتێ ئـــێوە کۆدەبنەوە وەك کۆمەڵەی باوەڕداران نـــاکۆکی لـــەنێوانـــتان هەیـــە. تاڕادەیەکـیش بـاوەڕ بەمە دەکەم. [19]چـونکە دەبـێ لـەنێوانـتان نـاکۆکی گومــڕابوون هــەبێ تــا لەنێوانــتان بـاوەڕی ڕاستەقینە دەربکـەوێ. [20]کـاتێ کۆدەبـنەوە ئـەوە بـۆ نـانی خوداوەنـد نـیـیە. [21]بـەڵکو هـەر یەکـەتان پـێش ئەوەیتـر دەکـەوێ بۆئەوەی بۆ خۆی بخوات، بەڵام هەیە لـــەناوتان بەبرســـێتی دەمێنێـــتەوە، هەندێکیشتان سەرخۆش دەبێ. [22]ئایا ماڵـتان نـیـە تـیایدا بخۆنو بخۆنەوە؟ یـاخود دەتانـەوێ بەسووکی سەیری کۆمەڵـەی باوەڕدارانی خودا بکەنو هـەژارەکان شـەرمەزار بکـەن کـە هیچـیان نییە؟ کەواتە چیتان پێبڵێم؟ ئایـا ستایشـتان بکـەم؟ نەخـێر، ئەمە

ناکـەم. [23]ئـەوەی مـن بـە ئـێوەم دا لـەخوداوەنـد وەرم‌گـرتووە، ئەویش ئـەوە بـوو عیسـای خوداوەنـد ئـەو شـەوەی تـیایدا دەدرا بەدەسـتەوە نانێکی هەڵگرت، [24]سوپاسی خودای کـرد، لەتی‌کـردو ووتـی: (وەری بگـرن بـیخۆن، ئەمـە لەشـی مـنە لەپێناوی ئێوەدا شـکاوە، جـا ئەمە بکـەن بـۆ یادکردنەوەم.) [25]بەهەمان شـێوە دوای نان خواردن، جامەکەی هەڵگـرت‌و ووتی: (ئەم جامە پەیمانی نوێیە بەخوێنی من، جا ئەمە بکەن هەر جارێك دەیخۆنەوە بۆ یادکردنەوەم.) [26]کەواتـە، هـەر کـاتێ لـەم نانـەتان خـواردو لەم جامەتان خواردەوە بەمە مـردنی خوداوەنـد ڕادەگەیـنن، هەتا دەگەڕێـتەوە. [27]جـا هەر یەکێك لەم نانـە بخـوات‌و لەم جامەی خوداوەند بخواتـەوە بـێ ئـەوەی شـایانی بـێ، تاوانـبارە بەرامـبەر بـەلـەش‌و خوێنی خوداوەند.

[28]با هەر یەکە خۆی تاقی‌بکاتەوە، پـێش ئـەوەی لـەم نانـە بخوات‌و لـەم جامـە بخواتــەوە. [29]هــەر یەکـێك بخـوات‌و بخواتـەوە بـێ ئەوەی مانای لـەش تێبگات ئـەوا حوکمـی خودا بەسـەر خۆی دەهێنێ. [30]لـەبەر ئەوەیە ژمارەیـەکی زۆر نـەخۆش‌و لاوازتـان تیادایە، هەندێکیش مردوون. [31]بەڵام گـەر ئـێمە حوکـم بەسـەر خۆمـان بدەیـن، ئـەوا تاوانبار نەدەکراین. [32]بـەڵام کـاتێ خوداوەنـد حوکـم بەسـەرمان بـدات تەمـێمان دەکات، تاکو تاوانبار نەکرێین لەگەڵ جیهان.

[33]ئـەی بـرایان، کـاتێ بەیەکەوە کۆدەبنەوە بۆ نان خواردن، چاوەڕێی یـەکتری بکـەن. [34]گـەر یەکێکـتان برسـی بـوو بـا لەماڵەوە نان بخوات، تـا کۆنەبـنەوە بـۆ تاوانـبار کردنی. سـەبارەت بەشتەکانی‌تر کاتێ هاتم بۆ لاتان ئامۆژگاریتان دەکەم.

## بەهرەکانی ڕۆحی پیرۆز
## 12

ئـەی بـرایان، سـەبارەت بـە بەهـرە ڕۆحـیەکان دەمـەوێ لاتـان شـاراوە نـەبێ. [2]ئێوە دەزانن کاتێ بت‌پەرست بـوون، ڕاتـان دەکـرد بـەدوای بـتە لاڵـەکان تـا بیانپەرسـتن. [3]بۆیـە مـن دەمـەوێ ئـێوە تێـبگەن کـە هـیچ کەسـێك نیـیە بدوێ بەڕۆحی خوداو بڵـێ (نەفـرەت لەعیسـا)، هـەروەها هـیچ کـەس ناتوانێ بێ ڕۆحی پیرۆز بڵێ (عیسا خوداوەندە.)

[4]چەندەها بەهرە هەیە، بەلاّم هەمووی لە یەك ڕۆحەوەیە، [5]هەروەها چەندین جۆر خزمەت هەیە، بەلاّم هەمووی لە یەك خوداوەندەوەیە، [6]جۆرەها كاریش هەیە، بەلاّم تەنها یەك خودایە ئەوەی هەموو شتێك دەكات لەهەموو كەسێك.

[7]جا بەیەكێك ئاشكرا بوونی ڕۆحی دەدرێ، ئەمەش سوودی بۆ هەموانە. [8]یەكێك بەهۆی ڕۆحی پیرۆزەوە قسەی دروستو دانای پێ دەبەخشرێ، بۆ یەكێكی تر قسەی زانین بەگوێرەی هەمان ڕۆح. [9]هەر هەمان ڕۆحیش بە یەكێك باوەڕ دەبەخشێ، بەوی دیكەش بەهرەی نەخۆش چاككردنەوە بەیەك ڕۆح، [10]هەروەها یەكێك توانای كردنی كاری سەرسوڕهێنەری پێ دەبەخشرێ، یەكێكی دیكەش دوان بە ووشەی خودا، یەكێكی دیكەش توانای لێك جیاكردنەوەی ڕۆحەكان، بۆ یەكێكی دیكەش زمانە ڕۆحیەكان، بۆ یەكێكی دیكەش ڕوونكردنەوەی ئەو زمانانە. [11]بەلاّم ئەمانە هەموو كاری یەك ڕۆحو هەمان ڕۆحن، بە هەر یەكێك چۆن بیەوێ دەیدا.

**یەك لەشو ئەندامی زۆر**

[12]چۆن لەش یەكەو ئەندامی زۆری هەیە، ئەو ئەندامانە چەند زۆرن، بەلاّم یەك لەش پێك دەهێنن، هەروەها مەسیح بەم شێوەیەیە. [13]چونكە ئێمە بەیەك ڕۆح لەناو هەلّكێشراین بۆ یەك لەش. گەر ئێمە جوولەكە بین یاخود یۆنانی، كۆیلە بین یاخود سەربەست، ئێمە هەموو لە یەك ڕۆحمان خواردۆتەوە. [14]كەواتە لەش یەك ئەندام نییە بەلّكو كۆمەلّە ئەندامێكە. [15]گەر بێتو قاچ بلّێ: (چونكە من دەست نیم ئیتر من سەر بە لەش نیم،) ئایا ئیتر بە ئەندامی لەش دانانرێ؟ [16]هەروەها گەر بێتو گوێ بلّێ: (چونكە من چاو نیم، ئیتر من سەر بە لەش نیم،) ئایا بە ئەندامی لەش دانانرێ؟ [17]گەر هاتوو لەش هەمووی چاو بووایە، ئیتر چۆن شتمان دەبیست؟ هەروەها هەمووی گوێ بووایە، ئیتر چۆن بۆنمان دەكرد؟ [18]لەبەرئەوە خودا هەر ئەندامێكی لەشی لەشوێنێكی تایبەت داناوە، بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێ. [19]جا كوا لەش گەر هەمووی یەك

ئـەندام بووايە؟ [20] بەڵام ئەوەتا وا نییە، بـەڵكو ئەندامـەكان زۆرن بەڵام یەك لەشن. [21] بەم شێوەیە، چاو ناتوانێ بە دەسـت بڵـێ: (پێویسـتم پێت نییە.) هـەروەها سـەر بە هەردوو قاچ بڵێ: (پێویسـتم پێـتان نـیـیە.) [22] ئـەوەی بە لاوازتـرین ئـەندام دایدەنێن لە لەش، ئـەوە ئەندامـێكی پێویسـتە. [23] ئـەو ئەندامـەی لـە لەشـدا ئەوەندە ڕێزی نییە، زیاتر ڕێزی بۆ دادەنێن، هەروەها ئـەو ئەندامـەی بـە شەرمەوە سەیری دەكەین، ڕێزی تایبەتی لێدەگیرێ. [24] بـەڵام ئـەو ئەندامانـەی بـەنـرخن پێویسـتیان بەمـە نـییە، چونكە خودا ئەندامـەكانی لەشـی بـە شـێوەیەك دروسـت كـردووە تەنانـەت بـۆ بچـووكترین ئـەندامی لەش نرخێكی تایـبەتی داناوە، [25] تاكو لـەش ناكۆكی تـیادا پـەیدا نەبێ، بەڵكو ئەندامەكان یـەك بایەخـیان هـەبـێ سـەبارەت بەیـەكتری. [26] گـەر هـاتوو ئەندامێك ئـازاری هـەبوو هـەموو ئەندامەكانی دیكـە لەگەڵی ئازار دەچێژن، ئەگەر یەكـێك لەئەندامان ڕێزی لێنرا، ئەوا هـەموو ئـەندامان لـەگـەڵی دڵخۆش دەبـن. [27] لەڕاسـتیدا ئـێوە لەشـی مەسـیحن، هـەر یەكـەتان لەئـەو ئەندامـێكە. [28] خـودا لـەكۆمەڵـەی باوەڕدارانی خۆی یەكەمجار نێرراوانی دانـا، دووەمجـار ئەوانـەی بەووشـەی خـودا دەدوێـن، سێهەمجار فێركەران. ئێـنجا بەهـرەكانی كـاری سەرسـوڕهێنەر: نەخۆش چاككردنو یارمەتـیدانو بەڕێوەبـردنو دوان بـە زمانـە ڕۆحـیەكان. [29] ئایـا ئەوانـە هـەموویان نـێرراون؟ یـاخود هـەموو بەووشـەی خودا دەدوێن؟ یان هەموو فێركەرن؟ یا هەموویان بەهرەی كاری سەرسـوڕهێنەریان دراوەتـێ؟ [30] ئایـا هـەموویان بەهـرەی چـاككردنەوەی خەڵكـیان دراوەتـێ؟ یـان هەموویان دەتوانـن بـەزمـانی ڕۆحـی بدوێـن؟ یـاخود توانـای ڕوونكردنەوەی زمانە ڕۆحییەكانـیان هەیـە؟ [31] ئـێوە هەوڵێ بەهـرەی باشـتر بـدەن، ئەوسـا مـن ڕێگایەكی باشترتان نیشاندەدەم.

## گرنگی خۆشەویستی

## 13

گەر بێتو بە هەموو زمانەكانی جیهانو فریشـتەكان بدوێـم، بـەڵام خۆشەویسـتیم نـەبێ، ئـەوا مـن وەك گرمەگـرمی دەهۆڵو زیڕەزیڕی زۆرنا وام. [2] گـەر بێـتو بەووشـەی خـودا

بدوێـمو هـەموو نهـێنیو زانیاریـیەك بـزانمو بـاوەڕێکی تـەواوی وام هەبێ بـتوانم چـیای پـێ هەڵکـەنم، بـەڵام خۆشەویسـتیم نەبێ، ئەوا هیچ نیم. [3] گـەر بێـتو هـەموو سـامانم بەسـەر هـەژاران دابـەش بکـەمو تـا سووتان ژیـانم پێشـکەش بکـەم، بـەڵام خۆشەویسـتیم نـەبێ، ئـەوا هـیچ سوودی بۆم نابێ. [4] خۆشەویستی دان بەخۆگـرتنو ڕۆح سـووکییە، خۆشەویسـتی شانازی نییە، چاوپیسی نیـیە، [5] لـووتبـەرزی نیـیە، خۆشەویسـتی توندڕەوی نییە، داوای بـەرژەوەندی تایبەتی خـۆی ناکات، زوو تـووڕە نـابێو بەهەڵـەکانی پێشـوودا ناچـێتەوە، [6] خۆشەویسـتی بەخـراپە دڵخـۆش نـابێ، بـەڵکو بۆ ڕاسـتی دڵشـاد دەبێ. [7] خۆشەویستی هـەموو کـاتێ بەرگە دەگرێ، هەموو کـاتێ بـاوەڕ دەکـات، هـەموو کاتێ هـیوای هەیـە، هـەموو کـاتێ ئـارام دەگـرێ. [8] خۆشەویسـتی هەرگـیز نافەوتێ، بەڵام دوان بە ووشەی خودا نامێـنێو دوان بەزمانـە ڕۆحیەکانیش بەسەردەچـێ، هـەروەها زانـیاریش نامێنێ. [9] چونکە زانیاریمان تەواو نییە، هەروەها دوانمان بەووشەی خوا تەواو نییە، [10] بەڵام کاتێ تەواو دێت، ئەوسا ناتـەواو نامێـنێ. [11] کـاتێ منداڵ بووم وەك منداڵـێك قسـەم دەکـرد، وەك مـنداڵ تیدەگەیشتم، وەك منداڵ بیرم دەکـردەوە. بـەڵام ئێستا بووم بەپیاو، ئـەوەی شتی منداڵیبوو وازم لێهێنا. [12] چـونکە ئێستا تەماشای ئاوێنەیەکی تـاریك دەکـەین، بـەڵام دوایـی ڕووبـەڕووە. مـن ئێسـتا بەشـێك لەزانیـنم هەیە، بەڵام دوایی بەتەواوی خوداوەنـد دەناسـم، هـەروەك ئـەو بەتـەواوی مـن دەناسێ. [13] جا ئەوەی دەمێنێـتەوە بـاوەڕو هـیواو خۆشەویسـتیە، ئەمانە سێ شتن، بەڵام خۆشەویستی لەهەموویان مەزنترە.

## دوان بەووشەی خودا

## 14

بـا خۆشەویسـتی ئامانجـتان بـێ، ئـارەزووی بەهـرە ڕۆحیەکان بکەن، بەتایـبەتی دوان بـە ووشەی خودا، [2] ئـەوەی بـەزمانـە ڕۆحـیەکان بدوێ، قسـە لـەگـەڵ خـەڵك ناکات، بەڵکو لـەگـەڵ خـودا، کـەس لێی تێناگات، چـونکە ئـەوەی ئـەو بەهۆی ڕۆحی پـیرۆز دەیڵـێ نهێنییە. [3] بەڵام ئەوەی بەووشـەی خـودا دەدوێ، ئـەوە بـۆ

بنیادنانو هاندانو دڵنەواییە. [4]ئەوەی بەزمانە ڕۆحیەکان دەدوێ، ئەوا خۆی بنیاد دەنێ، بەڵام ئەوەی بەووشەی خودا دەدوێ، ئەوا کۆمەڵەی باوەڕداران بنیاد دەنێ. [5]من حەز دەکەم هەمووتان بەزمانە ڕۆحیەکان بدوێن. بەڵام باشترە بەهرەی دوان بەووشەی خوداتان هەبێ، چونکە ئەوەی بەووشەی خودا دەدوێ مەزنترە لەوەی بەزمانە ڕۆحیەکان دەدوێ، تەنها گەر یەکێك بتوانێ ڕوونیبکاتەوە، ئەمەش ببێتە هۆی بنیادنانی کۆمەڵەی باوەڕداران. [6]ئەی برایان، ئێستا وابزانن من هاتووم بۆ لاتانو بەزمانە ڕۆحیەکان لەگەڵتان دەدوێم، لێرە چ سوود لەمن وەردەگرن، گەر بینینو زانیاریو دوان بەووشەی خوداو فێرکردنی تیادا نەبێ؟ [7]تەنانەت ئامێرێکی مۆسیقای بێڕۆح، بۆ نموونە شمشاڵو ساز، گەر دەنگی جیاوازیان نەبێ، چۆن گوێگر بزانێ کامەیان دەنگی شمشاڵەو کامەیان دەنگی سازە؟ [8]گەر بێتو کەڕەنای شەڕ دەنگەکەی ئاشکرا نەبێ، کێ خۆی ئامادە دەکات بۆ شەڕ؟ [9]ئێوەش هەروەها گەر بێتو بە زمانی ڕۆحی بدوێنو کەس لێتان تێنەگات، ئیتر چۆن خەڵکی بزانێ چی دەڵێن؟ ئایا وەك ئەوە نییە لەگەڵ هەوا بدوێن؟ [10]لەجیهان ئەوەندە زمان هەیە لەژماردن نایەن، بەڵام هیچیان بێواتا نییە. [11]گەر بێتو من لەواتای زمانێك تێنەگەم، ئەوا دەبێتە بێگانەو ئەو کەسەی بەو زمانەش دەدوێ، هەروەها منیش دەبمە بێگانە بۆ ئەو کەسە. [12]کەواتە ئێوەش، گەر بەپەرۆش بن بۆ بەهرەی ڕۆحی، زیاتر هەوڵی بۆ بدەن لەپێناوی گەشەکردنی کۆمەڵەی باوەڕدارانو پەرەسەندنی.

[13]لەبەرئەوە پێویستە لەسەر ئەوەی بەزمانە ڕۆحیەکان دەدوێ، نوێژ بکات تا خودا هێزی ڕوونکردنەوەی زمانەکانی بداتێ. [14]چونکە گەر من بەزمانە ڕۆحیەکان نوێژم کرد، تەنها ڕۆحم نوێژ دەکات، بەڵام مێشکم هیچ بەرووبوومی نابێت. [15]کەواتە چی بکەم؟ بەڕۆح نوێژ دەکەم، هەروەها بەمێشکیش نوێژ دەکەم. بەڕۆح گۆرانی دەڵێم، هەروەها بەمێشکیش گۆرانی دەڵێم. [16]ئەگینا گەر تۆ بەڕۆح ستایشی خودا بکەی، چۆن

دەبێ یەکێکی دەرەوە بەسوپاس کردنەکەت بڵێ (ئامین)؟ چونکە ئەو نازانێ تۆ دەڵێی چی. [17]لەوانەیە سوپاس کردنەکەت باش بێ، بەڵام ئەوەی تر بنیادنانرێ. [18]سوپاس بۆ خودا لەهەمووتان زیاتر دەتوانم بەزمانە ڕۆحیەکان بدوێم، [19]بەڵام لەکۆمەڵەی باوەڕداران بەلامەوە باشترە پێنج ووشە بڵێم بەمێشکمەوە کە خەڵکی لێی فێر بێ، لەوەی کە دە هەزار ووشە بڵێم بەزمانەکان کەس لێی تێ نەگات. [20]ئەی برایان، لەبیرکردنەوەدا وەك مندالْ مەبن، بەڵکو لەئاست خراپەکاریدا وەك منداڵی ساوا بن. بەڵام لەبیرکردنەوەدا وەك یەکێکی گەورەو تێگەیشتوو بن. [21] لەشەریعەت نووسراوە: {خوداوەند دەڵێ، بەزمانی بێگانەکانو بەلێوی نامۆکان قسە لەگەڵ ئەم گەلە دەکەم، لەگەڵ ئەمەش گوێم لێ ناگرن.} [22]کەواتە زمانەکان نیشانە نییە بۆ باوەڕداران بەڵکو بۆ بێباوەڕان، بەڵام دوان بەووشەی خودا بۆ باوەڕدارانە نەك بۆ بێباوەڕان. [23]گەر ئەندامانی کۆمەڵەی باوەڕداران هەموو بەیەکەوە کۆبوونەوە، لەوێ هەموویان بەزمانە ڕۆحیەکان قسەیان کرد، ئینجا یەکێکی نەزان یاخود بێباوەڕ بێتە ژوورەوە، ئایا نالێ ئێوە هەمووتان شێتن؟ [24]بەڵام بەپێچەوانەی ئەمە گەر بێتو هەموو بەووشەی خودا بدوێنو یەکێکی نەزان یاخود بێباوەڕ بێتە ناوتان، هەموو سەرزەنشتی دەکەنو هەموو حوکمی بەسەر دەدەن. [25]ئەمە وای لێدەکات نهێنی دڵی ئاشکرا بکات، ئەوسا ئەو کەسە کڕنووش دەباو خودا دەپەرستێ، دانبەوەدا دەنێ خودا بەڕاستی لەنێوانتانە.

### کۆبوونەوەی ڕێكوپێك

[26]ئەی برایان، کاتێ ئێوە کۆدەبنەوە هەریەکەتان شتێکی هەیە، یەکێك گۆرانی ڕۆحی، یاخود وانەیەکی فێرکردن، یا بینین، یان دوان بەزمانە ڕۆحیەکان، یان ڕوونکردنەوەی زمانەکان. باهەموو شتێك بۆ بنیادنان بێ. [27] با دووان یا سیان بەزمانەکان بدوێن یەك لەدوای یەك، بەڵام هەر یەکێك ڕوونیانبکاتەوە. [28]بەڵام گەر لەوێ کەس نەبوو ڕوونی بکاتەوە. ئەوسا

دەبێ لەکۆبوونەوە بێدەنگبنو لەدڵی خۆتان بۆ خۆتانو بۆ خودا بدوێن. [29] هەروەها ئەوانەی بەووشەی خودا دەدوێن، تەنها دەتوانن دووان یان سیانیان بدوێن، ئەوانی دیکە دەبێ قسەکانیان هەڵسەنگێنن. [30] گەر هاتوو یەکێك لەدانیشتوان لەلایەن خوداوە بینینێکی بۆ ڕاگەیەنرا، پێویستە لەسەر ئەوەی دەدوێ بێدەنگ بێ، [31] ئێوە هەموو دەتوانن یەك لەدوای یەك بەووشەی خودا بدوێن، هەتا هەموو فێربنو هانبدرێن. [32] ڕۆحی ئەوانەی بەووشەی خودا دەدوێن ملکەچن بۆیان، [33] چونکە خودا، خودای ئاژاوە نییە، بەڵکو خودای ئاشتییە. هەروەك لەهەموو کۆمەڵەکانی خوشكو برا پیرۆزەکان، [34] ژنان بێدەنگ دەبن لەکاتی کۆبوونەوەدا، چونکە ئەوان نابێ قسە بکەن پێویستە ملکەچ بن بەو شێوەیەی شەریعەت دەیڵێ. [35] بەڵام گەر ویستیان شتێك فێربن، با لەماڵەوە لەمێردەکانیان بپرسن. چونکە شورەییە بۆ ژن لەناو کۆبوونەوە بدوێ. [36] ئایا ووشەی خودا لەلای ئێوەوە هاتووە، یاخود تەنها بۆ لای ئێوە هاتووە؟ [37] گەر یەکێك خۆی بەهەڵگری ووشەی خودا بزانێ یاخود بەڕۆحی دانا، بابزانێ ئەوەی بۆتانی دەنووسم ڕاسپاردەی خوداوەندە. [38] گەر یەکێك ئەوە نەزانێ، با هەر نەزانێ. [39] کەواتە ئەی برایان، بەدڵگەرمییەوە هەوڵ بدەن بەووشەی خودا بدوێن، هەروەها ڕێی دوان بەزمانە ڕۆحیەکان لەکەس مەگرن. [40] بەڵام هەموو شتێك پێویستە دروستو ڕێكوپێك بێ.

**هەستانەوەی عیسا**

# 15

ئەی برایان، ئەوەتان بیردەخەمەوە کە بۆم هێنانو مزگێنیم پێدان، ئەوەی وەرتانگرتو هەتا ئێستا لەسەری چەسپاون. [2] گەر هاتوو بەبەردەوامی لەسەر ئەو ووشانە ڕۆیشتن بەو شێوەیەی مزگێنیم پێدان، ئەوسا ڕزگارتان دەبێ، ئەگینا بەخۆرایی باوەڕتان هێناوە.

[3] چونکە ئەوەم پێدان کە لەسەرەتاوە وەرمگرتبوو، ئەوەش ئەوەیە مەسیح لەپێناوی گوناهەکانمان مرد بەگوێرەی نووسراوی ﴿پێغەمبەرەکان﴾، [4] ئەو نێژراو

لەرۆژی سێهەم هەستایەوە دیسان بەگوێرەی نووسراوی «پێغەمبەرەکان»، [5]ئینجا بۆ پەترۆس و دوایی بۆ دوانزە قوتابیەکەی دەرکەوت، [6]پاشان بۆ زیاتر لە پێنجسەد لەبرایان دەرکەوت کە بەیەکەوە بوون، لەوانە هێشتا زۆربەیان دەژین، بەڵام هەندێکیان نوستوون، [7]دوایی بۆ یاقوب دەرکەوت، ئینجا بۆ هەموو نێرراوان، [8]پاش هەمووان بۆ منیش دەرکەوت، وەك منداڵێك لەکاتی خۆی لەدایك نەبووبێ. [9]چونکە من بچوکترین نێرراوم، هەروەها شایانی ئەوە نیم بە نێرراو ناوببرێم، چونکە من کۆمەڵەی باوەڕدارانی خودام لەکاتی خۆی چەوساندۆتەوە. [10] بەڵام بەهۆی بەرەکەتی خوداوە وام لێهاتووە وەك ئێستا دەمبینن، هەروەها ئەو بەرەکەتەی پێیبەخشیووم بێسوود نەبوو بەڵکو بەپێچەوانەوە، من لەهەموو نێرراوانی دیکە زیاتر ئیشم کردووە، ئەو شتانەش بەهۆی توانای خۆم نەبوو، بەڵکو بەهۆی بەرەکەتی خودا بوو کە لەگەڵمدایە. [11]ئیتر من بم یاخود نێرراوانی دیکە، ئێمە ووشەی خودامان ڕاگەیاند، ئێوەش باوەڕتان هێنا.

### هەستانەوەی مردووان

[12] گەر ئێمە هەستانەوەی مەسیح لە نێو مردووان ڕابگەیێنین، ئیتر چۆن هەندێکتان دەڵێن مردووان زیندوونابنەوە؟ [13]گەر هەستانەوەی مردووان نەبێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ مەسیح هەڵنەستاوەتەوە. [14]گەر بێتو مەسیح هەڵنەستابێتەوە، ئەوسا مزگێنیدانمان بێ سوود دەبێ، هەروەها باوەڕی ئێوەش هیچ سوودی نابێ. [15]ئێمەش دەبینە شایەتی درۆزن بۆ خودا، چونکە ئێمە شایەتیمان‌دا سەبارەت بەخودا، کە مەسیحی هەستاندووەتەوە، بەڵام هەڵینەستاندووەتەوە گەر مردووان هەڵنەستنەوە. [16]بۆیە گەر مردووان هەڵنەستنەوە، کەواتە مەسیحیش هەڵنەستاوەتەوە. [17]گەر بێتو مەسیح لەنێو مردووان هەڵنەستابێتەوە، ئەوسا باوەڕتان بەتاڵ دەبێو ئێوەش هێشتا لەگوناهەکانتان دان. [18]هەروەها ئەوانەی نووستوونو باوەڕیان بەمەسیح هەبوو هەموو لەناوچوون. [19]گەر بێتو هیوامان بەمەسیح تەنها

بۆ ئەم ژیانە بێ، ئەوا ئێمە بەدبەختترین کەس دەبین لەنێو مرۆڤ.

[20]بەلآم لەڕاستیدا مەسیح لەنێو مردووان هەستایەوەو بوو بەنۆبەرەی نووستوان. [21]جا چۆن مردن بەهۆی مرۆڤێك هاتەکایەوە، زیندووبوونەوەی مردووانیش بەهۆی مرۆڤێك بوو. [22]هەروەها چۆن هەموو بەهۆی ئادەم دەمرن، بەهەمان شێوە هەموو بەهۆی مەسیح زیندوودەبنەوە. [23]بەلآم هەر یەکەو بەنۆرەی خۆی، یەکەمجار مەسیح وەك نۆبەرەیەك هەستایەوە، ئینجا دوای گەڕانەوەی ئەوانەی سەر بە مەسیحن هەڵدەستنەوە، [24]دوای ئەمە کۆتایی دێت، کاتێ پادشاهێتی دەدات بەخودای باوك، پاش ئەوەی هەموو سەرکردایەتیو دەسەلآتو هێزێك لەناودەبات. [25] عیسا دەبێ ئەوەندە فەرمانڕەوایی بکات، هەتا هەموو دوژمنانی دەخاتە ژێر پێیەوە. [26]ئیتر دوا دوژمن کە لەناودەبرێ مردنە. [27]چونکە خودا {هەموو شتێکی ملکەچی ژێر پێی‌کردووە}. بەلآم کاتێ دەڵێ هەموو شتێك ملکەچ‌کرا، شتێکی ئاشکرایە خودا ناگرێتەوە، ئەوەی هەموو شتێکی ملکەچی مەسیح کردووە. [28]کاتێ هەموو شتێك ملکەچی ڕۆڵە بوو، ئەوسا ئەویش ملکەچی خودا دەبێ، ئەوەی هەموو شتێکی ملکەچی کردووە، تاکو خودا ببێت بەهەموو شتێك لەهەموو شتێك.

[29]گەر ڕاستبێ مردووان هەرگیز هەڵنەستنەوە، ئیتر لەئاوهەڵکێشانی ئەوانەی لەجیاتی مردووان لەئاوهەڵدەکێشرێن چ سوودێکی هەیە؟ کەواتە بۆچی لەجیاتی ئەوان خۆیان لەئاوهەڵدەکێشن؟ [30]هەروەها بۆچی ئێمە هەموو کاتێ خۆمان دەخەینە مەترسییەوە؟ [31]ئەی برایان پێتان دەڵێم، من ڕۆژانە ڕووبەڕووی مردن دەبمەوە، بەو شانازیەی لەئێوەدا هەمە بەهۆی عیسای مەسیحی خوداوەندمان. [32]گەر بێتو وەك مرۆڤێك بەرەنگاری دڕندان بوومایە لە شاری ئەفەسۆس، ئەوسا چ سوودێکم دەبوو؟ گەر بێتو مردووان هەڵنەستنەوە، ئیتر ئێمەش دەڵێین: (وەرن با بخۆینو بخۆینەوە، بەیانی مردنە.) [33]هەڵمەخەڵەتێن، چونکە پەیوەندی خراپ ڕەوشتی جوان تێك دەدات. [34]هۆش بهێننەوە بەرخۆتان،

ئـیتر هەڵە مەکەن، چونکە هەندێکتان نـەزانن سـەبارەت بە خودا. من ئەمە دەڵێم تا شەرمەزاربن.

**هەستانەوەمان چۆن دەبێ؟**

[35]لەوانەیـــە یەکـــێك بپرســـێ: (مـردووان چۆن هەڵدەستنەوە، بە چ جـۆرە لەشـێك دەگەڕێنەوە؟) [36]ئەی گێل! ئەوەی دەچێنرێ زیندوونابێتەوە هـەتا نەمرێ. [37]ئەوەی دەچێنرێ ئەو شـتە نیـیە کـەوا دێتەدەرەوە، بەڵکو تەنها دەنکە گەنمە یاخود هەر تۆوێکی دیکـە. [38]ئیـنجا خـودا ئەو شێوەیەی دەداتـێ کـە خۆی دەیەوێ، هەروەك چۆن هەموو جۆرە تۆوێك شێوەیەکی تـایـبەتی داوەتـێ. [39]بەهـەمان شـێوە هـەموو لەشـێك یـەك شـێوەی نییە، بـەڵکو مـرۆڤ لەشـێکی هەیـە، ئاژەڵ لەشێکی دیکە، ماسی لەشێکی هەیەو باڵندە لەشێکی دیکە. [40]تەنی ئاسمانی هەیـەو تـەنی زەویـش هەیـە، بـەڵام شکۆمەندی تەنە ئاسمانییەکان شتێکەو شـکۆمەندی تـەنـی زەویـش شتێکی تـرە. [41]شـکۆمەندی خـۆر شـتێکەو شـــکۆمەندی مانگـــیش شـــتێکە، هـەروەها شـکۆمەندی ئەسـتێرەش شتێکی تر، ئەستێرەش لەگەڵ ئەستێرە شکۆمەندی جیاوازی خۆیان هەیە.

[42]بـــەم جـــۆرەش هەڵســـانەوەی مـــردووان: ئـــەوەی دەچـــێنرێ لەفەوتاوی، لەهەڵسانەوە فەوتاو نییە. [43]لەســـووکایەتی دەچـــێنرێ، لەشـــکۆمەندی هەڵدەســـتێتەوە. لـــەلاوازی دەچـــێنرێ، لەهـــێز هەڵدەستێتەوە. [44]بەلەشـی سروشتی دەچـــێنرێ، بەلەشـــی ڕۆحـــی هەڵدەستێتەوە. گەر لەشی سروشتی هـەبێ لەشـی ڕۆحـیش هەیـە. [45]هەروەك لەکتێبی پیرۆز نووسراوە: { ئادەمی یەکەم لەشێکی زیندوو بوو.} بـەڵام دوا ئـادەم ڕۆحـێکە ژیانمـان پێدەبەخشێ. [46]ئەوەی یەکەم ڕۆحی نیـیە بەڵکو لەشی سروشتییەو ئەوەی دواتـر ڕۆحیـیە. [47]مـرۆڤی یەکـەم لـەزەوی بـوو لـەخۆڵ دروست کرا، [48]بەڵام مرۆڤی دووەم لەئاسمانەوەیە. کەواتـە ئەوەی لەخۆڵ دروستبووە، ئەوانـەش لەخۆڵن ئاوا دەبن. ئەوەش لـەئاسمانەوەیـە، ئاسمانیەکانـیش ئـاوا دەبـن. [49]جـا چـۆن ئـەو وێـنەیەمان وەرگـرتووە کـە لـەخـۆڵ دروسـت کـراوە، بەهەمان شێوە وێنەی ئاسمانی وەردەگـرین. [50]ئەی برایان، من پێتان دەڵـێم: گۆشتو خوێن ناتوانێ ببێتە

میراتگری پادشاهێتی خودا، هەروەك چۆن فەوتاو نابێتە میراتگری نەفەوتاو. [51]گوێ لەم نهێنیە بگرن: ئێمە هەموومان ناخەوین؟ بەڵکو هەموومان دەگۆڕێین، [52]ئەمەش یەکسەر لەچاوتروکانێك ڕوودەدات، کاتێ دوا کەڕەنا لێدەدرێو دەنگ دەداتەوە. ئەوسا مردووان بێگەندەڵیو فەوتان هەڵدەستنەوە، هەروەها ئێمەش دەگۆڕێین. [53]چونکە دەبێ ئەو سروشتە فەوتاوە نەفەوتاوی بپۆشێو سروشتی مردوو نەمری بپۆشێ. [54]کاتێ فەوتاو نەفەوتاوی دەپۆشێو مردن نەمری دەپۆشێ، ئەوسا ئەوەی لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوە دێتەدی: {سەرکەوتن مردنی قووتدا. [55]ئیتر ئەی مردن کوا سەرکەوتنت؟ ئەی گۆڕ، کوا پێوەدانت؟} [56]پێوەدانی مردن گوناهە، هێزی گوناه شەریعەتە. [57]بەڵام سوپاس بۆ خودا، ئەوەی سەرکەوتنی بە ئێمە بەخشیوە بەهۆی عیسای مەسیحی خوداوەندمان. [58]کەواتە، ئەی برایانی خۆشەویستم، جێگیرو چەسپاو بن، خۆتان بەتەواوی بۆ خوداوەند تەرخان بکەن، ئیتر بزانن ئەوەی بۆ خوداوەندی دەکەن بێسوود نییە.

### پارەکۆکردنەوە بۆ باوەڕداران

## 16

بەڵام لەبارەی کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ برا پیرۆزەکان، چۆن کۆمەڵە باوەڕدارەکانی ناوچەی غەلاتیەم ڕاسپاردووە، ئێوەش ئاوا بکەن. [2]با هەر یەکەتان لەڕۆژی یەکشەممە چەند پارەی لەتوانادایە بیخاتە لایەك، تا ئەو ڕۆژە پارە کۆنەکرێتەوە کە دەگەمە لاتان. [3]جا کاتێ گەیشتمە لاتان، کێ بەباش دەزانن لەناو خۆتان دەیانێرم بەنامەوە تا ئەو یارمەتییەی کۆتانکردۆتەوە بۆ قودس بیبەن. [4]ئەگەر پێویست بوو، خۆم لەگەڵیان دەڕۆم. [5]کاتێ دێم بۆ لاتان تێدەپەڕم بەناوچەی مەکدۆنیا، چونکە دەبێ بەمەکدۆنیادا بڕۆم. [6]لەوانەیە ماوەیەك لاتان بم، یاخود لەوانەیە هەموو زستان لاتان بمێنمەوە، ئینجا ڕێگای سەفەرم بۆ ئاسان بکەن بۆ هەر شوێنێك کە دەمەوێ. [7]چونکە ئەمجارە نامەوێ تەنها بەسەر پێی بتانبینم، بەڵکو هیوادارم گەر خوداوەند خواستی لەسەربێ ماوەیەکی زۆر لاتان بمێنمەوە. [8]بەڵام

هەتا ڕۆژی پەنجاهەمین لە ئەفەسۆس دەمێنمەوە، [9]چونکە دەرگای پانو بەرین بۆ ئیشی کاریگەر کراوەتەوە بۆم، هەرچەندە زۆر دوژمنیشم هەیە.
[10]گەر تیمۆساوس بۆ لاتان هات، با بەئاسودەیی لەناوتان بێ، چونکە ئەویش وەك من کاری خوداوەند دەکات. [11]نامەوێ کەس بەسووکی سەیری بکات، بەڵکو لەگەڕانەوەدا یارمەتیبدەنو بەئاشتی بەڕێی بکەن، چونکە منو برایان چاوەڕێی دەکەین، [12]هەروەها زۆر داوام لەئەپۆلۆسی برامان کرد هەتا لەگەڵ برایان بێو دیدەنیتان بکات، بەڵام ئەو نەیویست ئێستا بۆ لاتان بێ، ئیتر کەی بۆی ڕێکەوت ئەوسا بۆ لاتان دێت.

**کۆتایی**

[13]ئێشك‌بگرن، جێگیربن لەباوەڕ، پیاوی ئازابن، بەهێزبن. [14]هەرچییەك دەکەن لە خۆشەویستییەوە بیکەن. [15]ئێوە دەزانن ماڵی ئیستیفانۆس پێشەبەرە بوون لەئەخائیە، خۆیان تەرخان کردبوو بۆ خزمەت‌کردنی خوشك‌و برا پیرۆزەکان، [16]داواتان لێدەکەم، ئەی برایان، گوێڕایەڵی ئەوان بن، لەگەڵ هەموو ئەوانەی لەگەڵیان ئیش دەکەن. [17]دڵشاد بووم بە هاتنی ئیستیفانۆس‌و فەرتوناتوس‌و ئەخائیکۆس، چونکە شوێنی ئێوەیان گرتەوە بۆم، [18]ئەوان ڕۆحی منو ئێوەیان گەشاندەوە، ئەو جۆرە کەسانە ڕێزیان بۆ دابنێن.
[19]کۆمەڵەی باوەڕدارانی ئاسیا سڵاوتان لێدەکەن، ئەکیلاو بریسکلا لەگەڵ ئەو کۆمەڵەی لەماڵەکەیان کۆدەبنەوە بەناوی خوداوەند بەگەرمی سڵاوتان لێدەکەن. [20]هەموو برایان سڵاوتان لێدەکەن، ئێوەش بەماچی پاك‌و پیرۆز سڵاو لەیەکتری بکەن.
[21]منم پۆڵس سڵاوی منتان لێبێ کە بە دەستی خۆم بۆتان دەنووسم. [22]بەڵێ ئەو کەسەی عیسای خوداوەندی خۆش‌ناوێ با نەفرەتی لێبێ. (ماراناسا) ﴿واتای: ئەی خوداوەند وەرە﴾. [23]بەرەکەتی عیسای مەسیحی خوداوەندتان لەگەڵ بێت. [24]بەو خۆشەویستیەتان دەسپێرم کە لەعیسای مەسیحە. ئامین.

# دووەم نامەی پۆڵس بۆ باوەڕدارانی کۆرنسۆس

*هۆی نووسینی نامەی دووەم بۆ کۆمەڵەی باوەڕدارانی کۆرنسۆس، ئەو گرژیە بوو کە لەنێوان پۆڵس و کۆمەڵەکەدا هەبوو، بە هۆی هەندێ لەئەندامانی کۆمەڵەکە، کاتێ هێرشێکی توندیان کردبووە سەری. بەڵام پۆڵس لە نامەکەدا ئارەزووی خۆی دەردەبڕی بۆ ئاشتبوونەوەو دڵخۆشی خۆی دەردەخا ئەگەر ئەم ئاشتبوونەوەیە بێتەدی.*

*لە بەشی یەکەمی نامەکە، پۆڵس باسی پەیوەندی خۆی دەکات بەکۆمەڵەی باوەڕدارانی کۆرنسۆسەوە. باس دەکات بۆچی بە توندی وەڵامی ئەو سووکایەتی پێکردنەو بەرهەڵستیە دەداتەوە کە لەلایەن کۆمەڵەی باوەڕدارانی کۆرنسۆسەوە تووشی هاتبوو. پاشان دڵخۆشی خۆی دەردەبڕێ، چونکە وەڵامە توندەکەی بووە هۆی ئاشتبوونەوەو تۆبەکردن. دوایی پۆڵس تکا لەکۆمەڵی باوەڕداران دەکا بۆ ئەوەی کۆمەك بۆ باوەڕدارانی یەهودیە کۆبکەنەوە.*

*لە کۆتایی نامەکەشدا بەرگری لە نێرراوێتی خۆی دەکا لە دژی ئەو کەسانەی لە کۆرنسۆس ووتبوویان گوایا ئەوان نێرراوی ڕاستەقینەن و پۆڵس نێرراوی ڕاستەقینە نییە.*

## 1

لە پۆڵسەوە، نێرراوی عیسای مەسیح لەسەر خواستی خودا، هەروەها لە تیمۆساوسی براوە، بۆ کۆمەڵەی خودا لە کۆرنسۆس، هەروەها بۆ هەموو برا پیرۆزەکان لە گشت ناوچەی ئەخائیە. [2] با بەرەکەت و ئاشتی خودای باوکمان و عیسای مەسیحی خوداوەند بۆ ئێوە بێ.

**خودای دڵنەوایی‌کەر**

[3] پیرۆزە خودا، باوکی عیسای مەسیحی خوداوەند، باوکی پڕ لە بەزەیی و خودای هەموو دڵنەواییەك، [4] هەر ئەوە لە هەموو ناخۆشییەکدا دڵنەواییمان دەکات، تاکو بتوانین بەو دڵنەواییەی لە خوداوە وەرمانگرتووە، دڵنەوایی خەڵکی تر

بكەین لەهەموو ناخۆشیەك. [5]جا چۆن بەشداری زۆرمان كردووە لە ئازاری مەسیح، بەهەمان شێوە بەهۆی مەسیحەوە زۆر دڵنەوایی دەكرێین. [6]گەر ئێمە لەناخۆشی بین، ئەوە لەپێناوی دڵنەوایی‌و ڕزگاری ئێوەیە، گەر دڵنەوایی كرابین، ئەوەش لەپێناوی دڵنەوایی ئێوەیە، ئەوەی واتان لێ‌دەكات خۆتان ڕاگرن بەرامبەر هەمان ئازار كە ئێمەش دەیچێژین. [7]ئیتر هیوامان بەئێوە چەسپاوە، چونكە دەزانین چۆن لەئازار بەشداریمان دەكەن، لەدڵنەواییش بەشداریمان دەكەن.

[8]ئەی برایان، نامانەوێ لاتان شاراوە بێ ئەو ناخۆشیانەی بەسەرمان هات لەناوچەی ئاسیا، تەنانەت ئەوەندە قورس بوو بە شێوەیەك لەسەرووی توانامان بوو، هەتا هیوای ژیانمان بڕا، [9]بەڵكو هەستمان دەكرد حوكمی مردن بەسەرمان دراوە، تا پشت نەبەستین بە خۆمان، بەڵكو بەو خودایەی مردووان هەڵدەستێنێتەوە. [10]ئەو بوو لەو مردنە ڕزگاری كردین‌و ڕزگارمان دەكات، هیوامان لەئەودایە كە هێشتا هەر ڕزگارمان دەكات. [11]هەروەها ئێوەش پێویستە بەنوێژەكانتان یارمەتی پێشكەش بكەن، تا خەڵكێكی زۆر سوپاسی خودا بكەن لەپێناوی ئێمە لەسەر ئەو پیرۆزیەی پێمان دراوە بەهۆی نوێژی خەڵكێكی زۆر.

**پۆڵس پلانەكەی دەگۆڕێ**

[12]چونكە ئەمەیە شانازی ئێمە، ویژدانمان شایەتمانە لەهەڵسوكەوتمان لەجیهان، بەتایبەتی سەبارەت بە ئێوە بەبێ دووڕوویی‌و بەدڵسۆزی خودا، ئەمەش بەدانایی مرۆڤانە نییە بەڵكو بەبەرەكەتی خودایە. [13]ئێمە شتێكتان بۆ دەنووسین بتوانن بیخوێننەوەو لێی تێبگەن. هیوادارم بەتەواوی تێبگەن، [14]ئەوەی ئێستا هەندێكی لێ تێدەگەن. ئەوەش ئەمەیە، بزانن ئێمە هۆی شانازی ئێوەین، هەروەها ئێوەش هی ئێمە لەڕۆژی عیسای خوداوەند.

[15]لەبەر ئەوەی بێ‌گومانبووم لەم شتە، وویستم یەكەم جار بێم بۆ لای ئێوە تا دووجار سوود ببینن، [16]ئەوەش ئەوەیە كاتێ دەڕۆم بۆ مەكدۆنیا دیدەنیتان دەكەم ئینجا كە

لەوسەر گەرامەوە سەرتان لێدەدەمەوە، دوای ئەوەی ڕێگای سەفەرم بۆ ئاسان بکەن بۆ ناوچەی یەهودیە. 17ئایا من دوو دڵم کاتێ ویستم ئەوە بکەم؟ ئایا من پلانەکانم وەك مرۆڤێکی ئەم جیهانە داناوە، کە ئامادەیە لەیەك کات بڵێ نەخێرو بەڵێ؟ 18وەك چۆن خودا سەرڕاستە، ووشەکانی ئێمەش بۆ ئێوە (بەڵێ)و (نەخێر) نییە، 19هەروەها عیسای مەسیحی ڕۆڵەی خودا، ئەوەی منو سیلوانسو تیمۆساوس مزگێنی ئەومان پێتاندا، لەیەك کات (بەڵێ)و (نەخێر)ی نەوتووە. بەڵام لەئەودا بەردەوام هەر (بەڵێ) بووە، 20چونکە هەموو بەڵێنەکانی خودا لەئەودا (بەڵێی) خۆی دۆزیەوە. بۆیە ئێمە بەهۆی ئەوەوە دەڵێین (ئامین)، بۆ شکۆمەندی خودا. 21ئەوە خودایە ئێمەو ئێوەی لەمەسیحدا چەسپاندووە، هەروەها دەستنیشانی کردووین. 22هەر ئەویشە مۆری خۆی لێداوینو ڕۆحی پیرۆزی پێمان بەخشیوە وەك پێشەکی.

23خودا ئاگای لێیە بۆچی نەهاتم بۆ کۆرنسۆس، چونکە بەزەییم پێتان دەهاتەوە. 24ئێمە نامانەوێ دەست بەسەر باوەڕتان بگرین، بەڵکو ئێمە لەگەڵتان کار دەکەین بۆ خۆشیتان، چونکە ئێوە بەباوەڕ چەسپاون.

# 2

لەبەرئەوە بڕیارمدا نەیەم بۆ لاتان، تاکو سەردانەکەم بە غەمباریەوە نەبێ. 2چونکە گەر من دڵتەنگم کردن، ئیتر کێ دڵشادم دەکات جگە لەئێوە کە دڵتەنگم کردوون؟ 3بۆیە نامەی پێشوم بۆ نووسین، تا کاتێ هاتم دڵگران نەبم بەوانەی پێویستە ببنە سەرچاوەی خۆشیم. باوەڕم بە هەمووتان هەیە، کەوا خۆشی من خۆشی هەمووتانە. 4کاتێ نامەی یەکەمم بۆ ناردن زۆر غەمبارو دڵتەنگ بوومو فرمێسك بەچاومدا دەهاتەخوارەوە، مەبەستم ئەوە نەبوو دڵتەنگتان بکەم بەڵکو تا بزانن من چەند ئێوەم خۆشدەوێ.

### لێخۆشبوون لە گوناهبار

5گەر هاتوو یەکێکتان بووە هۆی دڵتەنگیتان، ئەمە تەنها من دڵتەنگ ناکات، بەڵکو تا ڕادەیەك هەمووتان، گەر زۆرم نەووتبێ. 6ئێستا ئیتر بەسە ئەو سزایەی لەلایەن زۆربەتانەوە

دراوە بەسەر ئەو کابرایە، [7]بە پێچەوانەی ئەوە باشترە بۆتان لێی‌خۆش‌بن‌و دلنەوایی بکەن، ئەگینا خەفەت گیانی تێك‌دەشکێنێ. [8]لەبەرئەوە ڕاتان‌دەسپێرم خۆشەویستی خۆتانی بۆ دەربڕن. [9]من ئەمەم بۆ نووسیون هەتا تاقیتان بکەمەوەو ببینم ئایا بۆ هەموو شتێك ملکەچن. [10]گەر هاتوو لەیەکێك خۆش بوون، ئەوسا منیش لێی‌خۆش دەبم. جا لەبەر ئێوە لەبەردەم مەسیح لەو کەسە یاخود لەو شتە خۆش دەبم. [11]تا شەیتان دەست بەسەرماندا نەگرێت، چونکە ئێمە لەمەبەستەکانی شەیتان بی‌ئاگا نین.

### سەرکەوتن بەهۆی عیسا

[12]کاتێ گەیشتمە شاری ترواس تا مزگێنی مەسیح بدەم، ئەوسا دەرگای کارکردنی خوداوەندم بۆ کرایەوە. [13]بەلام زۆر نارەحەت بووم، چونکە تیتۆسی برام نەدۆزیەوە، ئیتر مالئاوایم لەباوەڕداران کردو ڕۆیشتم بۆ ناوچەی مەکدۆنیا.

[14]بەلام سوپاس بۆ خوا، ئەوەی هەموو کاتێ بەرەو سەرکەوتنمان دەبات، هەروەها بەهۆی ئێمە لەهەموو شوێنێك زانیاری مەسیح بلاودەکاتەوە وەك بۆنێکی خۆش. [15]ئێمە لای خودا بۆنی خۆشی مەسیحین لەنێوان ئەوانەی ڕزگاریان دەبی‌و لەنێوان ئەوانەی لەناودەچن. [16]بۆ ئەوانە بۆنی مردنە بۆ مردن، بۆ ئەوانی تر بۆنی ژیانە بۆ ژیان، ئایا کێ بەتوانایە بۆ ئەم کارە؟ [17]ئێمە وەك زۆربەی خەلك بازرگانی ناکەین بە ووشەی خودا، بەلکو بە دلسۆزی لەبەردەم خوداو لەلایەن خوداوە باسی عیسای مەسیح دەکەین.

### خزمەتکاری پەیمانی نوێ

## 3

ئایا ئێمە دووبارە دەست بە ستایش‌کردنی خۆمان دەکەین؟ یان پێویستە وەك هەندێ کەس دەیکەن، ڕاسپاردە نامەتان نیشان بدەین، یان ئێوە شتێکی وا بە ئێمە بدەن؟ [2]ئێوە نامەی ئێمەن کە لەدلمان نووسراوە، لەلایەن هەموو خەلك دەتوانرێ بخوێنرێتەوەو بناسرێ. [3]بەلێ دەرکەوت ئێوە نامەی مەسیحن، ئەوەی ئێمە لەسەر داواکاری ئەو نووسیومانە، ئەمەش بە مەرەکەب

نەنووسراوە بەڵکو بە ڕۆحی زیندووی خودا، هەروەها لەسەر تەختەی بەردین نەنووسراوە، بەڵکو لەسەر تەختەی دڵی مرۆڤ.

4 ئێمە متمانەیەکی لەم جۆرەمان هەیە بەهۆی مەسیح سەبارەت بەخودا. 5 ئەوەش نەك بڵێین بەتواناین تا بڵێین ئێمە شتێکمان هەیە، توانای ئێمە لەخوداوەیە. 6 ئەوەی ئەو توانایەی‌دا بەئێمە تا ببین بەخزمەتکاری پەیمانی نوێ. پەیمانی ڕۆح نەك نووسراوی کۆن، چونکە نووسراوی کۆن دەکوژێ، بەڵام ڕۆح ژیان دەبەخشێ.

7 گەر بێتو ئەو خزمەتەی دەبێتە هۆی مردن کە لەسەر بەرد هەڵکەنرا بوو [شەریعەت] بەمەزنی هاتبێ، بە شێوەیەك نەوەی ئیسرائیل نەیانتوانی بەتەواوی سەیری ڕووی موسا بکەن، بەهۆی درەوشانەوەی دەموچاوی، کە فەوتاوە، 8 ئاخۆ دەبێ چەند بەشکۆو مەزنتر بێ خزمەتی ڕۆحی پیرۆز؟ 9 گەر بێتو ئەو خزمەتەی دەبێتە هۆی تاوانبارکردن شکۆمەندبێ، ئیتر دەبێ خزمەتی بێ‌تاوان کردن چەند شکۆدارتر بێ؟ 10 لەم حاڵەتە ئەوەی شکۆمەندی هەبوو شکۆدار نەماوە ئێستا لەبەراورد کردنی لەگەڵ شکۆمەندی ڕادەبەدەر. 11 چونکە گەر ئەوەی لەناوچوو بوو شکۆدار بوو، باشە ئەوەی نەمرە دەبێ چ شکۆمەندییەکی هەبێ!

12 چونکە ئێمە ئەم هیوایەمان هەیە، ئێمە چاونەترسین. 13 ئێمە وەك موسا نین، ئەوەی پێچەی لەسەر دەمو چاوی دانا، هەتا ئیسرائیلیەکان کۆتایی شکۆی فەوتاو نەبینن. 14 بەڵکو مێشکیان تاریك بووە، چونکە تا ئەمڕۆش، کاتی پەیمانی کۆن دەخوێننەوە، هەمان پێچە هەر ماوە، چونکە تەنها بەمەسیح لادەچێ، 15 بەڵێ، تا ئەمڕۆ هێشتا مێشکیان داخراوە، کاتێ شەریعەتی موسا دەخوێنرێتەوە بۆیان. 16 بەڵام گەر مرۆڤ ڕووبکاتە خوداوەند، ئەوسا ئەو پێچەیە لادەچێ. 17 ئێستا خوداوەند ڕۆحە، جا ڕۆحی خوداوەند لەهەرکوێ بێت، ئازادی لەوێیە. 18 ئێمە هەموومان بەڕوویەکی کراوە تەماشای شکۆمەندی خوداوەند دەکەین، هەروەك لەئاوێنەدا، دەگۆڕێین بۆ وێنەی ئەو، لەپلەیەکی شکۆمەندی بۆ پلەیەکی تر، ئەوەش لەخوداوەندەوە دێت کە ڕۆحە.

### دڵسۆزی لە خزمەتکردن

## 4

لەبەرئەوەی خودا بە بەزەیی خۆی ئەم خزمەتەی داوە بە ئێمە، ئیتر نابێ وورە بەربدەین. [2]چونکە هەموو هەڵسوکەوتێکی ناشیرینو تەڵەکەبازی ڕەت دەکەینەوە، فێڵ ناکەینو ووشەی خودا ناگۆڕین، بەڵکو بە دەرخستنی ڕاستی ڕاستگۆیی خۆمان دەسەلمێنین بۆ ویژدانی هەموو خەڵك لەبەردەم خودا. [3]بەڵام گەر مزگێنیەکەمان شاراوە بێ، تەنها لای ئەوانە شاراوەیە کە لەناودەچن، [4] خوداوەندی ئەم جیهانە ﴿شەیتان﴾ ئەو بێباوەڕانەی وا کوێر کردووە، نەتوانن ڕووناکی مزگێنی شکۆمەندی مەسیح ببینن، ئەوەی وێنەی خودایە. [5]ئێمە مزگێنی بۆ خۆمان نادەین، بەڵکو مزگێنی عیسای مەسیح دەدەین کە خوداوەندە، ئێمەش خزمەتکاری ئێوەین لەپێناوی عیسا. [6]چونکە خودا بوو ووتی: {با لەتاریکی ڕووناکی هەڵبێت}، هەر ئەو بوو دڵمانی ڕووناك کردەوە، بۆ ڕووناککردنەوەی زانیاری شکۆمەندی خودا لەڕووی مەسیح.

[7]بەڵام ئەم گەنجینەیەی ئێمە هەمانە لەناو گۆزەی گڵە، تا ئەو هێزە لە ڕادەبەدەرە دەرکەوێ، کە لەخوداوەیە نەك لەخۆمان. [8]ناخۆشی تەنگمان پێ هەڵدەچنێ لە هەموو لایەکەوە، بەڵام وورە بەرنادەین. سەرمان لێ دەشێوێ، بەڵام بێ هیوا نابین. [9]دەچەوسێینەوە، بەڵام خودا وازمان لێ ناهێنێ، بە زەویماندا دەدەن، بەڵام لەناوناچین. [10]هەموو کاتێ لە لەشماندا ئازاری مردنی عیسا هەڵدەگرین، تا ژیانیشی لە لەشمان دەرکەوێ. [11]هەرچەندە ئێمە جارێ زیندووین، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە دەدرێینە دەست مردن لەپێناوی عیسا، تا لە لەشی فەوتاومان ژیانی عیسا دەرکەوێ. [12]ئیتر بەم شێوەیە، مردن لەئێمە کار دەکات، بەڵام ژیان لەئێوەدا کار دەکات.

### چاونەترسی لە خزمەتکردن

[13]چونکە ئێمە هەمان ڕۆحی باوەڕمان هەیە، بۆیە وەکو ئەوەی نووسیویەتی: {باوەڕم کرد بۆیە قسەم کرد.} ئێمەش باوەڕمان هەیە بۆیە قسە دەکەین. [14]ئێمە دەزانین ئەوەی

عیسای خوداوەندی لەنێو مردووان هەستاندەوە، لەگەڵ عیسا ئێمەش هەڵدەستێنێتەوە، ئەوسا ئێمە لەگەڵ ئێوە بەیەکەوە بۆ بەردەمی خۆی دەبات. [15]ئەم شتانە هەمووی دەچێژین لەپێناوی ئێوەدا، تا بەرەکەتی خودا زۆر بێت بۆ خەڵکێکی زیاتر، تابێتە مایەی بەرزکردنەوەی سوپاسی زیاتر بۆ شکۆمەندی خودا.

[16]لەبەرئەوە وورە بەرنادەین، گەر بە ڕواڵەتیش لەناوبچین، ئەوا ناوەڕۆکو دەروونمان ڕۆژ بەرۆژ تازەتر دەبێتەوە. [17]ئەو ئازارە سووکو کەم خایەنەمان شکۆمەندیەکی گرانی هەتاهەتایی لی دێتەکایەوە بۆمان، [18]چونکە ئێمە تەماشای شتە بینراوەکان ناکەین، بەڵکو تەماشای شتە نەبینراوەکان دەکەین، چونکە شتە بینراوەکان کاتین، بەڵام شتە نەبینراوەکان هەمیشەیین.

## ماڵی هەتاهەتای

# 5

ئێمە ئەوە دەزانین، کەی چادری زەوییمان ڕووخا ئەوەی تیایدا دەژین، لەلایەن خوداوە ماڵی هەتاهەتایمان دەدرێتێ لەئاسمان، کە بەدەست دروست نەکراوە. [2]چەند بەتاسەوە ئارەزووی ئەوە دەکەین، ماڵی ئاسمانیمان بکرێتە بەر، [3]چونکە هەر کاتێ لەبەرمانکرد ڕووت نابین. [4]ئەوەندەی لەم چادرەداین، دەناڵێنین لەژێر بارگرانی، نامانەوێ ئەو خانووە دابکەنین، بەڵکو ئەوەی تریش لەسەری لەبەر بکەین، تاکو ژیانی تازە هەرچی فەوتاوە تیامان هەڵیلووشێ. [5]بەڵام خودا خۆیەتی ئێمەی بۆ ئەم مەبەستە ئامادە کردووە، جا بۆ ئەم شتانە هەمووی، ڕۆحی پیرۆزی وەك پێشەکی پێمان داوە. [6]ئێمە هەموو کاتێ بڕوامان هەیەو دەزانین کە ئێمە کاتێ لەلەشدا نیشتەجێین لەخوداوەند دوورین. [7]چونکە ئێمە بەباوەڕ دەڕۆین نەك بە بینراو. [8]کەواتە ئێمە دڵنیاین، بەلامانەوە باشترە واز لەم لەشە بهێنینو لای خوداوەند نیشتەجێ بین. [9]ئیتر وەك یەك وایە لای ئێمە، گەر لای خوداوەند بین یاخود لەسەر ئەم زەویە بژین، ئامانجمان ڕازیکردنیەتی. [10]چونکە دەبێ هەموومان لەبەردەم دادگای مەسیح ڕاوەستین، تاکو هەر یەك لە ئێمە

پاداشتی خۆی وەرگریٚ بەگوێرەی ئەو کارانەی کردوویەتی کاتیٚ بەلەش ژیاوە، ئیتر باش بووبیٚ یاخود خراپ.

## خزمەتی ئاشتبوونەوە

[11]چونکە ترسی خوداوەند لە دلّمانە، ئێمە هەولّ دەدەین باوەڕ بە خەلّکی بهێنین. بەلاّم خودا بەتەواوی دەمانناسیٚ، هیوادارین ئێوەش بە ویژدانتان بە تەواوی ئێمە بناسن. [12]ئێمە نامانەویٚ ستایشی خۆمان بکەین، بەلّکو دەمانەویٚ پێتان بلّێین بەچییەوە شانازیمان پیٚبکەن، ئەوسا دەتوانن وەلاّمی ئەوانە بدەنەوە کەوا شانازی بە ڕوالّەتی مرۆڤ دەکەن نەك بەوەی لە دلّیایەتی. [13]گەر مێشکمان تێکچوو بیٚ ئەوە بۆ خودایە، گەر هۆشمەندیش بین ئەوە لەبەر ئێوەیە. [14]چونکە خۆشەویستی مەسیح دەستی بەسەر ئێمە گرتووە، لەبەر ئەوەی زانیمان یەکێك لەجیاتی هەموو خەلّك مرد، ئیتر هەموو خەلّك مردن. [15]ئەو لەپێناوی هەمووان مرد هەتا زیندووان ئیتر بۆ خۆیان نەژین، بەلّکو بۆ ئەوەی لەپێناویان مردو هەستایەوە. [16]لەمەولا بەپێی ڕوالّەت تەماشای کەس ناکەین، گەر بێتو جاران بەپێی لەش تەماشای مەسیحمان کردبیٚ، ئیتر لەئێستاوە بەم شێوەیە نایناسین. [17]گەر یەکێك سەر بە مەسیح بیٚ، ئەوا دەبێتە بوونەوەرێکی تازە، شتە کۆنەکان نەمانو بەسەرچوون، ئەوەتا هەموو شت نویٚ بووەتەوە. [18]ئەمەش هەمووی لەخوداوەیە کە ئاشتی کردینەوە لەگەلّ خۆی بەهۆیٚ مەسیح، ئینجا خزمەت کردنی ئەم ئاشتبوونەوەیەی بە ئێمە سپارد. [19]واتە خودا جیهانی ئاشتکردەوە لەگەلّ خۆی لەمەسیحدا، ئیتر لەسەر گوناە لێیان ناپرسێتەوەو ووشەی ئاشتبوونەوەی بە ئێمە سپاردووە. [20]کەواتە ئێمە بالّیۆزی مەسیحین، خودا بەهۆی ئێمە ووتار دەدات، لەبەر ئەوە لەجیاتی مەسیح داواتان لیٚدەکەین لەگەلّ خودا ئاشتبنەوە. [21]لەپێناوی ئێمە ئەوی کرد بەگوناە هەرچەندە گوناهی نەدەناسی، تا لەئەودا بەشداری ڕاستودروستی خودا بکەین.

## 6

وەك ئیشکەرێك لەگەلّ خودا

داواتان لـێدەکەین، بەرەکەتی خودا بێ سوود وەرمەگرن. [2]چونکە خودا دەڵـێ: {ئەو کاتەی جێی ڕەزامەندیم بوویـت، گوێـم بـۆ گرتویـت، لـە ڕۆژی ڕزگـاری یارمەتیم دایت.} جا سـەیرکە ئـەوەتا ئێسـتایە کـاتی ڕەزامەندیو ئێستایە ڕۆژی ڕزگاری. [3]نامانـەوێ لـەهـیچ شـتێك ببین بە کۆسـپ لـەڕێگای کەس، بۆ ئەوەی ڕەخـنە لەخزمەتمان نەگیرێ، [4]بەڵکو وەك خـزمەتکاری خـودا لـەهـەموو شـتێك خۆمـان دەردەخـەین: بـە ئـارامگرتنی مەزنمان لەکاتی تەنگانەو ناخۆشـیو لـێقەومان، [5]لـێدانو گـرتنو شـڵەژان، مـاندوویيو شـەونوخونيو برسێتیدا، [6]بەپاکیو زانـیاریو دانبەخۆگـرتنو زمـان شـیرینی، هـەروەها بـەڕۆحی پیرۆزو خۆشەویستی پاك، [7]بەقسەی ڕاستو هـێزی خـوداو چـەکەکانی ڕاسـتودروستی بۆ دەستی ڕاستو چـەپ، [8]لەسـتایش کـردنمانو سـووکایەتی پـی کـردنمان، ناوبانگی بـاشو ناوبـانگی خـراپ، هەڵخەڵەتێنەر لەکاتێك ڕاستگۆین، [9]نەناسـراو لەکاتێك بـاش ناسراوین، مردوو لەکاتێك زیندووین، سزادراو لەکاتـێك نـەکوژراوین، [10]غەمـبار لەکاتـێك هـەردەم دڵشادین، هەژار لەکاتـێك زۆر کـەس دەوڵەمـەند دەکـەین. وەك یەکـێك هیچی نەبێ، هەرچـەندە هەموو شتێکمان هەیە. [11]ئـەی دانیشتوانی کۆرنسۆس، دەممان کـراوەیەو دڵمـان فـراوانە. [12]بێگومان ئێوە شوێنی خۆتان گرتووە لـەدڵمـان، هەرچـەندە ئێوە ئەوەندە شـوێنتان نیـیە بۆمان. [13]وەك منداڵی خـۆم لەگەڵـتان دەدوێـم، کەواتـە ئێوەش دڵتان بکەنەوە بۆمان.

**پەرستگای خودای زیندوو**

[14]لەگـەڵ بێبـاوەڕان تـێکەڵاو مـەبن، چـونکە ڕاسـتودروسـتیو خـراپە چ پەیوەندییەکـیان بـەیەکەوە هەیـە؟ هـەروەها ڕوونـاکی چ هاوبەشـییەکی لەگـەڵ تاریکی هەیە؟ [15]یـان چ تەبایـیەك لەنـێوان مەسیحو بەلـیعال [شەیتان] هەیە؟ یان چ شتێك هەیـە بـاوەڕدارێك بـە بێباوەڕێکەوە ببەسـتێتەوە؟ [16]هـەروەها پەرسـتگای خودا چ ڕێککەوتنێکی لەگەڵ بتەکان هەیـە؟ ئـێمە پەرسـتگای زیـندووی خودایـن، بەپـێی ئـەوەی خـودا ووتویـەتی: {لەنێوانـیان نیشـتەجێ

دەبم و لەگەڵـیان دەڕۆم، دەمەوێ ببم بە خودایانو ئەوانیش ببن بە گەلـم}، [17]{لەبەرئەوە لەناویان بڕۆنە دەرەوەو بەجێیان بهێڵن، چی گڵاوە دەستی بۆ مەبـەن، خوداوەنـد دەڵـێ، ئیـنجا بەخێرهاتنـتان دەکـەم}و [18]{دەبم بـە باوکتان، ئەوسا ئێوەش دەبن بە کوڕو کچـم، ئەمـە خوداوەنـدی توانـادار دەیڵێ.}

# 7

ئـەی خۆشەویستان، لەبەرئەوەی ئێمە ئـەم بەڵێـنەمان هەیـە، باخۆمـان پـاك بکەیـنەوە لەهەموو گڵاویەکی لەشو ڕۆح، لەترسـی خودا با پاكوپیرۆزی تەواو بەدەست بهێنین.

### تۆبەکردن بەهۆی غەمباری

[2]دڵـتان بکەنەوە بۆمان. هەڵەمان لەگـەڵ کەستان نەکردووە، ڕەوشتی کـەسمان تێك نەداوە لەئێوە، هەروەها کـەسمان لەئـێوە نەخڵەتاندووە. [3]ئیتر ئەمـە ناڵـێم تـا گلەییـتان لـێبکەم، چـونکە لـەپێشـا پـێم ووتـون ئـێوە لـەدڵمانداان بـە شـێوەیەك ئامـادەین لەگەڵـتان بمـرینو بژیـن. [4]مـن زۆر پشـتتان پێدەبەسـتمو زۆر شـانازیتان پـێوە دەکـەم، لەگـەڵ ئـەو هـەموو تەنگانــەو ناخۆشــیانەدا دڵــم پــڕە لــەدڵنەوایيو خۆشییەك بە دەم باسی ناکرێ.

[5]ڕاسـتە، لەوکاتـەی گەیشتووینە مەکدۆنیا لەشمان هیچ نەحەساوەتەوە، بـەڵکو لەهەموو لایەك تەنگوچەڵەمە ڕووی لـێـناوین، ئەمــەش ئــەو ناکۆکـیەی دەوروبەرمان بوو، ترسی لــەدڵمان زیادکــرد. [6]بــەڵام ئــەو خودایەی دڵنەوایيکەری ئەوانەیە کە ووڕەیــان بــەرداوە، دڵــنەوایی ئێمەیکرد بە هاتنی تیتۆس بۆ لامان، [7]ئەمەش نەك تەنها لەبەرئەوەی تیتۆس بـۆ لامـان هاتووە، بەڵکو لەوە زیاتر دڵمـان بـەوە خۆشبوو تیتۆس چەند دڵـنەوایی کراوە لەلایەن ئێوە. ئەوسا بـۆی گێڕامەوە سەبارەت بەپەرۆشیو غەمـباری ئێوە، هەروەها دڵگەرمیتان بـۆ مـن، لـێرە نـاتوانم دەریبڕم چەند بەوە دڵشادبووم.

[8]هەرچـەندە دڵـتەنگم کـردوون بـەو نامەیـەی بـۆم نـاردن، لەگـەڵ ئەوەشــدا من ئێستا لێی پەشیمان نیم، ڕاسـتە مـن پەشـیمان بوومەوە، کاتێ زانـیم نامەکـەم بۆ ماوەیەك دڵگرانی کـردوون، [9]بەڵام ئێستا دڵشادم، ئەو

نامەیەم نووسیووە، ئەمەش لەبەرئەوە نییە کەوا غەمبارم کردوون، بەڵکو لەبەر ئەوەی غەمباریتان بووە هۆی تۆبەکردنتان، ئەمەش غەمێك بوو لەلایەن خوداوە بوو، تا ئیتر بەهۆی ئێمەوە ئازار نەچێژن. [10]چونکە ئەو غەمباریەی لەخوداوەیە، دەبێتە هۆی تۆبەکردن، ئەمەش ڕزگاری تیادایەو پەشیمانبوونەوە لەسەری پێویست ناکات، بەڵام ئەو غەمباریەی لە جیهانەوەیە دەبێتە هۆی مردنمان. [11] کەواتە سەیرکەن ئەو غەمباریەی لەخوداوە هات، چی لەئێوە دروستکردووە، چ پەرۆشییەك، چ چالاکییەك بۆ پاکانەکردن لەخۆتان، چ تووڕەییەك، چ ترسێك، چ ئارەزوویەکی بەهێز، چ دڵگەرمییەك، چ حەزێك بۆ دادپەروەری! بەمانە ئێوە دەرتانخست لەو شتانە هەمووی بێتاوانن کە ڕوویداوە. [12]کەواتە ئەم شتانەم بۆ نەنووسیون لەپێناوی تاوانبار یاخود تاوان لێکراو، بەڵکو تا دەرکەوێ لەبەردەم خودا چ دڵگەرمییەکتان هەیە سەبارەت بەئێمە، [13]ئەمەش بووە هۆی دڵنەواییمان.

لەمەش زیاتر دڵخۆش بووین بە دڵخۆشی تیتۆس، کە چۆن بەهۆی هەمووتان حەساوەتەوە. [14]گەر من شانازیم بەئێوە کردبێ ئەوە پێم شەرم نییە، هەروەك ڕاستی هەموو شتێکم بۆ باسکردن، هەروەها تیتۆسیش ڕاستی شانازی ئێمەی بۆ دەرکەوت. [15]ئەو ئێستا لەدڵەوە زیاتر لە جاران ئێوەی خۆشدەوێ، کاتێ ئەوەی دەکەوێتەوە یاد چۆن ئێوە بەگوێڕایەڵی‌و ڕێزو ترسەوە پێشوازیتان لێکرد. [16]من دڵشادم بەوەی دەتوانم لەهەموو شتێك بەتەواوی پشتتان پێببەستم.

## بەخشین بەدڵفراوانی

# 8

دەمەوێ، ئەی برایان، ئێوەش بزانن سەبارەت بەو بەرەکەتەی خودا کە دەرکەوتووە بۆ کۆمەڵە باوەڕدارەکانی مەکدۆنیا. [2]چونکە لەتاقیکردنەوەی تەنگانەی توند خۆشیان لێدەڕژاوە، هەروەها لەنەبوونییەکی سەخت دەوڵەمەندییەکی بەدڵفراوانیان لێدەڕژا. [3]من شایەتی ئەوە دەدەم لەخۆیانەوە بەپێی توانای خۆیان

بەڵکو زیاتر لەتوانای خۆیان پارەیان داوە. [4]زۆر بەگەرمی داوایان لێکردین بەشداریان پەسەند بکەین بۆ یارمەتیدانی خوشکو برا پیرۆزەکان. [5]بەمە ئەوان زیاتریان کرد لەوەی چاوەڕێمان دەکرد، چونکە یەکەمجار خۆیان دایەدەست خوداوەند ئینجا ئێمە بەگوێرەی خواستی خودا. [6]ئیتر داوامان لەتیتۆس کرد ئەم بەرەکەتەی دەستی پێکردوە لاتان تەواوی بکات. [7]هەروەك ئێستا لەهەموو شتێك زیادتان کردووە، لەباوەڕ، لەقسەکردن، لەزانین، لەچالاکی، لەخۆشەویستیان بۆ ئێمە، هەوڵ بدەن لەم بەرەکەتەش زیاد بکەن.

[8]من نامەوێ فەرمان بەسەرتان بدەم، بەڵکو تا ڕاستی خۆشەویستیتان دەرکەوێ، دەمەوێ تاقیتان بکەمەوە لەچاو خەڵکی کەدا. [9]چونکە دەزانن بەرەکەتی عیسای مەسیحی خوداوەند چییە، هەرچەندە ئەو دەوڵەمەند بوو بەڵام لەپێناوی ئێوەدا بووە هەژار، هەتا ئێوە بە هەژاری ئەو دەوڵەمەند بن.

[10]ئەمە ڕای منە لەو بارەیەوە، ئەوەش بۆ بەرژەوەندی ئێوەیە: ئەوەی سالی ڕابردوو دەستتان پێکرد، تەنها بەکردەوە نا بەڵکو بە خواست. [11]ئێستا ئەم کارە تەواو بکەن، بەو پەرۆشییەی دەستتان پێ کردووە، ئەوەندە بدەن لە تواناتاندایە. [12]گەر بەڕاستی ئامادەییتان هەبێ، ئەوا خودا پێی ڕازی دەبێ بەگوێرەی ئەوەی هەتانە نەك ئەوەی نیتانە.

[13]مەبەستم ئەوە نییە خەڵکی تر دەبێ بحەسێنەوەو بارگرانی بۆ ئێوە بێ. [14]بەڵام مەبەستم لە یەکسانی ئەوەیە: لە داهاتوودا با پڕی ئێوە کەموکوڕی ئەوان پڕ بکاتەوەو پڕی ئەوانیش کەموکوڕی ئێوە پڕ بکاتەوە، تاکو یەکسان بێ. [15]لەم بارەیەوە کتێبی پیرۆز دەڵێ: {ئەوەی زۆری کۆکردۆتەوە زۆر زۆری نییە، هەروەها ئەوەی کەمی کۆکردۆتەوە زۆر کەمی نییە.}

**ناردنی تیتۆس بۆ کورنسۆس**

[16]من لە دڵەوە سوپاسی خودا دەکەم، کەوا تیتۆس زۆر بەپەرۆشەوەیە بۆ ئێوەو بایەختان پێدەدات. [17]ئەو پێشوازی لە داواکاریەکەی ئێمە کردو لەمەش زیاتر یەکسەر ئامادەبوو بۆ لاتان

بێت بێ ئەوەی من داوای لێ بکەم.
[18]لەگەڵ ئەو برایەکمان نارد کە ناوبانگی دەرکردووە بە مزگێنیدانی لەلای هەموو کۆمەڵە باوەڕدارەکان.
[19]تەنها هەر ئەمە نا بەڵکو ئەو برایە لەکۆمەڵەکانەوە هەڵبژێراوە لەگەڵمان گەشت بکات بۆ ئەو خزمەتە بەرەکەتدارەی هەڵمان گرتووە، بۆ شکۆمەندی خوداوەندو پێشاندانی خواستە باشەکەمان. [20] ئێمە بایەخ بەوە دەدەین، کەس سەرزەنشتمان نەکات لەسەر شێوەی دابەش کردنی ئەو بەخشینە زۆرە. [21] چونکە مەبەستمان چاکەیە، نەك تەنها لەبەرچاوی خوداوەند، بەڵکو لەبەرچاوی خەڵکیش. [22]لەگەڵ ئەو دووانە برایەکی ترمان نارد، ئەویش زۆر جار تاقیمان کردۆتەوە سەیرمان کرد لە زۆر شت چالاکە، ئەو ئێستا چالاکتر بووە چونکە زۆر پشتتان پێ دەبەستێ. [23]تیتۆس هاوڕێ‌و ئیشکەرە لەگەڵم لەپێناوی بەرژەوەندی ئێوە، بەڵام ئەو دوو برایەی لەگەڵیان، نێرراوانی کۆمەڵەکانن، شکۆمەندی مەسیحن.
[24]کەواتە لەبەردەم کۆمەڵەکان خۆشەویستی خۆتانیان بۆ دەرخەن، تا ڕاستی شانازیمان بەئێوە بۆ ئەوان دەرکەوێ.

## بەخشین بەدڵشادیەوە

# 9

من بەپێویستی نازانم لەبارەی یارمەتیدانی خوشك‌و برا پیرۆزەکان بۆتان بنووسم، [2]چونکە ئامادەییتان دەزانم‌و شانازیم پێوە کردووە لای مەکدۆنیەکان‌و پێم وتن، ناوچەی ئەخائیە لە ساڵی ڕابوردووەوە ئامادەن، ئەم دڵگەرمیەی ئێوە بووە هۆی هاندانی زۆربەیان. [3]من ئەو برایانەم ناردە لاتان، تا وا دەرنەکەوێ شانازیمان لەو بارەیەوە هەروا بەخۆڕایی بوو بێت، بەڵکو دەمەوێ بەتەواوی ئامادەبن بەو شێوەیەی باسم کردووە. [4]تا شەرمەزار نەبین بەرامبەر ئەو باوەڕە زۆرەی هەمانە پێتان، کاتێ هەندێ لەمەکدۆنیەکان هاتن لەگەڵمان بۆ لاتان‌و بینیان ئێوە ئامادە نین. [5]لەبەرئەوە بەپێویستم زانی داوا لەو برایانە بکەم کە پێش من بۆ لاتان دێن، سەرپەرشتی کۆکردنەوەی ئەو بەخشینە بکەن کە بەڵێنتان داوە بیدەن، تاکو ئامادەبێ، هیوادارم ئەمەش دەربڕینێك بێ

لەدەستو دڵفراوانیتان نەك وەك سەرانە.
[6]لەڕاستیدا ئەوەی کەم بچێنێ، کەم دروێنە دەکات، هەروەها ئەوەی زۆر بچێنێ، زۆر دروێنە دەکات. [7]با هەر یەکەتان ئەوەندەی خۆی دەیەوێ بیدا، ئەمەش با بە ئارەزووی خۆی بێ نەك بە ناچاری، چونکە ئەوەی بەدڵخۆشییەوە دەبەخشێ خودا خۆشیدەوێ. [8]خوداش دەتوانێ هەموو بەرەکەتتان پێ ببەخشێ تا پڕی، بۆ ئەوەی هەموو کاتێكو لەهەموو شتێك بەگوێرەی پێویستتان هەبێ هەروەها تا پێتان ببەخشێ بەپڕییەوە بۆ هەموو کردارێکی باش. [9]هەروەك لەزەبوور نووسراوە: {بەدەستو دڵفراوانییەوە یارمەتی هەژارانیدا، ڕاستودروستیەکەی تاهەتایە دەمێنێتەوە.} [10]جا ئەو خودایەی تۆو دەدات بە جوتیارو نان دەبەخشێ بۆ خۆراك، تۆو بە ئێوەش دەداتو دروێنەی ڕاستودروستیتان زیاد دەکات. [11]لەهەموو شتێك دەوڵەمەند دەبن، تا هەموو کاتێ دڵفراوانبن، بەمەش دەبینە هۆی ئەوەی خەڵکێکی زۆر سوپاسی خودا بکەن. [12]هەستانتان بەم خزمەتە پیرۆزە تەنها پێویستیەکانی برا پیرۆزەکان جێبەجێ ناکات، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکێکی زۆر سوپاسی خودا بکەن. [13]بەتاقیکردنەوەی خزمەتەکەتان، دەبنە مایەی ستایشکردنی خودا بەهۆی ملکەچیتان لەدانپیانان بەمزگێنی مەسیح، هەروەها دڵفراوانیتان لەبەشداریکردن لەگەڵ ئەوانو لەگەڵ هەمووان. [14]ئەوان نوێژتان بۆ دەکەنو بەپەرۆشن بۆ بینینتان، چونکە بەرەکەتی خودا کە لەسەرووی بیری مرۆڤە لە ئێوەدا دەرکەوت. [15]سوپاس بۆ خودا بەرامبەر ئەو بەخشینەی کە بەدەم باسی ناکرێ.

## بەرگری پۆڵس لەخزمەتەکەی

## 10

من پۆڵسم، بەڕۆح سووکیو نیانی مەسیح داواتان لێدەکەم، من ساکارم کاتێ ڕووبەڕووم لەگەڵ ئێوە، بەڵام زۆر چاونەترسم سەبارەت بە ئێوە کاتێ لێتان دوورم. [2]ناچارم مەکەن بەڕاستی ڕەقبم لەگەڵتان کاتێ دێم بۆ لاتان،

بەتایبەتی لەگەڵ ئەوانەی وا بیردەکەنەوە بەپێی خواستی لەش هەڵسوکەوت دەکەم. [3]ڕاستە ئێمە مرۆڤین‌و لەم جیهانەدا دەژین بەڵام ئێمە وەك خەڵکی ئەم جیهانە شەڕ ناکەین. [4]چونکە ئەو چەکەی شەڕی پێ دەکەین جیهانی نییە، بەڵکو چەکی خودایە، توانای لەناوبردنی هەموو قەڵایەکی پتەوی هەیە. [5]هەموو شەڕەقسەیەك‌و هەموو شتێك لەناودەبین کە خۆی دەردەخات بۆ بەرهەڵستی زانیاری خودا، هەروەها هەموو بیرێکی مرۆڤانە بەدیل دەگرین بۆ ملکەچی مەسیح. [6]ئامادەین سزای هەموو کارێکی یاخیبووانە بدەین، گەر ئێوە بەتەواوی گوێڕایەڵی خودا بن.

[7]ڕاستییەك هەیە پێویستە چاوی لێ‌تەپۆشرێ‌و ڕووبەڕووی بنەوە. کاتێ یەکێك لەو باوەڕەدابێ سەر بەمەسیحە، با بێتەوە یادی ئەو چەند سەر بەمەسیحە، ئێمەش هەروەها. [8]من شەرم ناکەم، گەر بێتو تۆزێ زیاتر لەوەی پێویستە شانازیم بەو دەسەڵاتە کردبێ کە خودا داویەتی پێمان، ئەمەش بۆ بنیادنانتانە نەك بۆ ڕووخاندنتان. [9]نامەوێ وا دەرکەوم کە هەوڵ دەدەم بە نامەکانم بتانترسێنم. [10]چونکە هەندێك دەڵێن: (نامەکانی توندوتیژو بەهێزە، بەڵام ئامادەبوونی خۆی کاریگەر نییەو قسەکانی بەتاڵە.) [11]با ئەو کەسەی ئەمە دەڵێ بزانێ، ئەو شتانەی لەنامەکانم دەینووسم‌و لەوێ نیم، هەمان شت دەکەم کاتێ خۆم هاتم بۆ ئەوێ.

[12]ئێمە ناوێرین خۆمان لەگەڵ ئەوانە بەراورد بکەین یاخود خۆمان بخەینە ڕیزی ئەوانەی شانازی بەخۆیان دەکەن. کاتێ خۆیان بە خۆیان بەراورد دەکەن‌و دەپێون، ئیتر هیچ تێناگەن! [13]بەڵام ئێمە زیاد لەئاستی پێویست شانازی بەخۆمان ناکەین. بەڵکو بەو شێوەیەی بگونجێ لەگەڵ ئەو سنوورەی خودا بۆی داناوین تا ئەو ئاستەی بتوانین بگەینە لاتان. [14]ئێمە سنووری خۆمان نابڕین‌و واش دانانێین پێتان نەگەیشتووین، چونکە ئێمە یەکەم کەس بووین هاتین‌و مزگێنی مەسیحمان پێ ڕاگەیاندن. [15]شانازی ناکەین زیاتر لەپێویست بە ماندووبوونی خەڵکی، بەڵکو هیوادارین باوەڕتان بەهێز بێ‌و ماوەی کارکردنمان لەنێوانتان فراوان بێ، [16]

تا مزگێنی بۆ دوورتر لەوولاّتانی ئێوە ببەین، نابێ شانازی بکەین بەو کارەی یەکێکی‌تر کردوویەتی. [17] {ئەوەی دەیەوێ شانازی بکات، با شانازی بەخوداوەند بکات.} [18] چونکە ئەوەی خوداوەند ستایشی بکات پەسەند کراوە، نەك ئەوەی ستایشی خۆی بکات.

## پۆڵسو نێرراوە درۆزنەکان

# 11

هیوادارم لەئاستی هەندێ گێلایەتی من ئارام بگرن، هەرچەندە بەڕاستی ئارام دەگرن. [2] من دڵگەرمیەکی خودایی دایگرتووم سەبارەت بە ئێوە، چونکە نیشانم کردوون بۆ مرۆڤێك کە مەسیحەو دەمەوێ پێشکەشی ئەوتان بکەم وەك کچێکی بێگەرد کە تەنها هی مێردەکەیەتی. [3] بەلاّم دەترسم ئەمەم بۆ نەکرێ، هەروەك چۆن مارەکە توانی حەوا لە بەهەشت بە فێڵ هەڵخەڵەتێنێ، هەرواش دەتوانرێ ئێوە لە دڵسۆزیو پاکی مەسیح دووربخرێنەوەو چەواشە بکرێن. [4] چونکە گەر هەندێ کەس هاتنە لاتانو عیسایەکی تریان ڕاگەیاند جگە لەوەی پێمان ڕاگەیاندن، یاخود ڕۆحێك وەرگرن جگە لەو ڕۆحەی وەرتانگرتووە، یان مزگێنییەکی‌تر قبوڵ بکەن جگە لەوەی قبوڵتانکرد، ئەوا خۆتانی دەدەنە دەست بەوپەڕی ئامادەییەوە. [5] لەو باوەڕەدام من نرخم کەمتر نییە لەو نێرراوە ناودارانە. [6] لەوانەیە لەقسەکردن ئەوەندە زمانپاراو نەبم، بەلاّم زانیاریم هەیە، لە هەموو شتێکیش ئەوەمان بۆتان ڕوونکردەوە. [7] ئایا من گوناهم کردووە کاتێ بەخۆڕایی مزگێنی خودام بۆ داونو خۆم نزمکردەوە هەتا ئێوە بەرزبنەوە؟ [8] من دزیم لە کۆمەڵە باوەڕدارەکانی تر دەکرد، کاتێ پارەم لێوەرگرتن لەجیاتی ئەو خزمەتەی بۆ ئێوەی دەکەم، [9] هیچ قورساییەکم نەخستبووە سەر شانتان، لەکاتی پێویستیم کە لەناوتان بووم، چونکە ئەو برایانەی لەمەکدۆنیاوە هاتبوون پێویستیەکانمیان جێبەجێکرد. بەم شێوەیە سوور بووم لەسەر ئەوەی خۆم بپارێزم لەوەی قورسایی بخەمە سەر شانتانو سووریش دەبم. [10] وەك ڕاستی مەسیح لەمن دایە، هیچ کەسێ ناتوانێ لەناوچەی ئەخائیە ئەم

شانازیەم لێ بسێنێتەوە. [11]بەڵام بۆچی؟ ئایا چونکە من ئێوەم خۆش ناوێ؟ خودا دەزانێ من چەند ئێوەم خۆش دەوێ!

[12]لەگەڵ ئەمانەش ئەوەی دەیکەم لەسەری بەردەوام دەبم، هەتا بیانوی ئەوانە ببڕم کە دەیانەوێ وای دەربخەن ئەوانیش وەکو ئێمەن سەبارەت بەوەی شانازی پێوە دەکەن. [13]ئەوانە نێرراوی درۆزنو ئیشکەری فێڵبازن خۆیان لەشێوەی نێرراوی مەسیح دەردەخەن. [14]جێی سەرسوڕمان نییە، چونکە شەیتان خۆی لەشێوەی فریشتە دەردەخات. [15]کەواتە شتێکی سەیر نییە گەر خزمەتکارانی لەشێوەی خزمەتکاری ڕاستودروستی خۆیان دەرخەن. دوارۆژی ئەوانە بەپێی کرداریانە.

**ئازاری پۆڵس لەخزمەتی مەسیح**

[16]من جارێکیتر دووبارەی دەکەمەوە، کەس من بەنەزان دانەنێ، بەڵام گەر بێتو من وا دابنێن، ئەوا وەك نەزانێك قبولم بکەن، تاکو منیش تۆزێ شانازی بەخۆم بکەم. [17]ئەوەی ئێستا دەیلێم بەگوێرەی خوداوەند نییە، بەڵکو وەك نەزانێك دەیلێم کە بەباوەڕ شانازی بەخۆی دەکات، [18]چۆن زۆر لەخەڵکی دەیانەوێ شانازی بەشتی ئەم جیهانە بکەن، منیش دەمەوێ جارێك ئەو شانازیە بەخۆم بکەم. [19]جا ئێوە بەدڵشادیەوە لەنەزانان قبوڵ دەکەن، چونکە خۆتان ئەوەندە تێگەیشتوون! [20]چونکە قبوڵ دەکەن لەوانەی دەتانکەن بەکۆیلە یان نێچیر، یاخود خۆیان بەگەورە دادەنێن بەسەرتان، تالاَنتان دەکەن، لەدەمو چاوتان دەدەن. [21]من ئێستا شەرمەزارم، پێویستە بلێم ئێمە چەند لاواز بووین سەبارەت بەم شتانە!

بەڵام لەبەرئەوەی من وەك نەزانێك دەدوێم، هەرچیەك ئەوان دەتوانن بەچاونەترسیەوە شانازی پێوە بکەن منیش هەروەها دەتوانم. [22]گەر بێتو ئەوان عیبرانی بن؟ منیش هەروەها. یان ئیسرائیلی؟ منیش هەروەها. یاخود لەنەوەی ئیبراهیم؟ منیش هەروەها. [23]یان خزمەتکاری مەسیح؟ من لەوان زیاتر (وەك شێتێك قسەدەکەم.) زۆر زیاتر ماندووبووم، بەندیخانەم زیاتر چێشتووە، زۆر زیاتر دارکاری کراوم، چەندین جار مردنم بەچاو

بینیوە. [24]جوولەکەکان بەقامچی پێنج جار سیو نۆ قامچیان لێداوم، [25]هەروەها سێ جار دارکاری کراوم، جارێك خەڵك بەردبارنیان کردووم، سێ جار لەکەشتیدا بوومو شکاوە، جارێکیان شەو و ڕۆژێکی تەواو لەناو ئاوی دەریا ماومەوە. [26]بەهۆی گەشتی زۆرم هەمیشە کەوتوومە مەترسی ڕووبارو مەترسی دزو جەردە، هەروەها مەترسی گەلەکەمو مەترسی میللەتان، مەترسی لەشارەکانو مەترسی لەدەشتو مەترسی لەدەریاو مەترسی برایانی درۆزن. [27]زۆر تووشی زەحمەتیو ماندوویيو شەونخونی زۆر، برسێتیو تینوێتیو ڕۆژوگرتنی زۆر، سەرماو ڕووتی بووم. [28]ئەمانەش هەموو لەلایەك، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەبێ زیاتر خەمی هەموو کۆمەڵە باوەڕدارەکان بخۆم. [29]جا کێ هەیە لاواز بێو من لەگەڵی لاواز نەبم؟ یاخود کێ هەیە بکەوێتە گوناهو من لەخەفەتا بۆی نەسووتێم؟

[30]گەر بێتو شانازی بەخۆم بکەم، ئەوا شانازی بەدەرخستنی لاوازیم دەکەم. [31]خودای باوکی عیسای خوداوەندمان دەزانێ درۆ ناکەم ئەوەی تاهەتایە پیرۆزە، [32]ئەو پارێزگارەی لەلایەن هارتسی پادشاوە بۆ شاری دیمەشق دانرابوو، چاودێرییەکی زۆری خستبووە سەر شاری دیمەشق بۆ گرتنم، [33]بەڵام منیان خستە ناو سەبەتەو لەپەنجەرەی شوورەی چوار دەوری شارەکە منیان شۆڕکردە خوارەوە، ئیتر بەو شێوەیە ڕزگارم بوو لەدەستی.

### بینینی پۆڵسو دڕکی لەش

## 12

پێویستە شانازی بکەم، هەرچەندە هیچ سوودی نییە، بەردەوام دەبم لەسەر بینینو ئەو شتانەی خوداوەند بۆم ئاشکرا دەکات. [2]من پیاوێك دەناسم لەمەسیحدا بوو، پێش چواردە ساڵ فڕاندیان بۆ سێهەم تەبەقەی ئاسمان. ئایا بە لەشەوە بوو یاخود بێ لەش؟ نازانم! خودا دەزانێ. [3]هەروەها دەزانم ئەو پیاوە بۆ بەهەشت فڕێندرا، بەلەشەوە بوو یاخود بێ لەش؟ نازانم! خودا دەزانێ. [4]لەوێ گوێی لە قسەیەك بوو مرۆڤ نابێ بیڵێو ناتوانێ باسی بکات. [5]سەبارەت بەو پیاوە شانازی دەکەم، بەڵام

سەبارەت بەخۆم شانازی ناکەم، تەنها بە لاوازیەکانم شانازی دەکەم. [6]گەر بێتو بمەویٚ شانازی بە خۆمەوە بکەم، بێ مێشکی نییە، چونکە من ڕاستی دەڵێم، بەڵام من دەترسم لەوەی یەکێك وا لە من بگات زیاتر لەوەی دەیبینن‌و لێم دەبیستن. [7]تا لووت‌بەرز نەبم بەو شتە گەورانەی خودا بۆی ئاشکرا کردووم، دڕکێکم لێدرا لەلەشم، وەك لەنێرراوی شەیتان بێت، تا ئازارم بداو خۆم هەڵنەکێشم. [8]بۆ ئەم مەبەستە سێ جار لەخودا پاڕامەوە ئەوەم لەکۆڵ بکاتەوە، [9]بەڵام خودا پێی ووتم: (بەرەکەتی منت بەسە، چونکە توانای من لەلاوازی تەواو دەبێ.) لەبەر ئەوە بەدڵشادیەوە شانازی بە لاوازی خۆم دەکەم، هەتا توانای مەسیح بێتە سەرم، [10]جا لەپێناوی مەسیح، ڕازی دەبم بەرگەی لاوازی‌و سووکایەتی‌و ناخۆشی‌و چەوسانەوەو ماڵوێرانی بگرم، چونکە هەر کاتێ لاوازبم بەهێز دەبم.

[11]ناچارتان کردم وەك شێتم لێ بێت! چونکە کەمتر نیم لەنێرراوە ناودارەکان، هەرچەندە هیچ نیم، لەگەڵ ئەوەشدا پێویست بوو لەسەرتان ستایشم بکەن. [12]ئەو نیشانانەی نێرراو دەردەخات، بەوپەڕی ئارام‌گرتنەوە لەنێوانتان ئەنجامم داوە، بەهۆی نیشانەو کاری سەرسوڕهێنەرو کردارەوە. [13]ئایا ئێوەم بەکەمتر زانیوە لەکۆمەڵە باوەڕدارەکانی تر، جگە لەوەش بارگرانیم نەبووە بۆ ئێوە؟ گەر وایە لەم هەڵەیەم ببورن!

[14]ئێستا ئامادەم بۆ سێهەم جار بۆ لاتان بێم، هەروەها نابمە بارگرانی بەسەرتان، چونکە خۆتانم دەوێ نەك پارەتان. لەبەرئەوەی ڕۆڵە پارە بۆ دایك‌و باوك کۆناکەنەوە، بەڵکو لەسەر دایك‌و باوکە بۆ ڕۆڵەکانیان ئەوە بکەن. [15]بە دڵشادیەوە پارەو هەرچیەکم هەیە خەرجی دەکەم لەپێناوی ئێوە. گەر ئێوەم زۆرتر خۆشەویست، ئایا کەمتر منتان خۆش دەوێ؟ [16]بەڵام با وابێ من بارگرانیم نەبووە بۆ ئێوە. ئێوە دەڵێن: من کابرایەکی فێڵبازم‌و بە فێڵ دەستم بەسەرتاندا گرتووە. [17]ئایا بەهۆی ئەوانەی ناردوومە بۆ لاتان فێڵم لێ کردوون؟ [18]کاتێ لەسەر داواکاری من تیتۆس لەگەڵ

یەکێك لەبرایان هات بۆ لاتان، ئایا تیتۆس فێڵی لێکردوون؟ ئایا ئێمە بە هەمان ڕۆح کار ناکەین، بەهەمان ڕێگادا ناڕۆین؟

[19]ئایا ئێوە لەو باوەڕەدان، ئێمە ئەم هەموو شتەی دەیلێین بۆ بەرگری کردنە لە خۆمان؟ بەڵام ئەی خۆشەویستان ئێمە لەبەردەم خودا لەمەسیحدا دەدوێین‌و هەمووی بۆ بنیادنانتانە. [20]من دەترسم کاتێ بێم بۆ لاتان، بە شێوەیەك بتانبینم کە نامەوێ، ئێوەش بە شێوەیەك من ببینن کە نەتانەوێ. بەواتای لە نێوانتان ناکۆکی، چاوپیسی، توڕەیی، خۆویستی، بوختان، قسە هێنانو بردن، لەخۆبایی، بەرەڵلایی هەبێ. [21]من دەترسم کاتێ بێم بۆ لاتان خودا نزمم بکات لەنێوانتان، بەوەی زۆر خەفەت بخۆم بۆ ئەو کەسانەی لەپێشا گوناەو هەڵەیان کردووە، کەچی تۆبەیان نەکردووە لەوەی کردوویانە لە گڵاوی‌و داوێن پیسی‌و بەدڕەوشتی.

**خۆتان تاقی‌بکەنەوە**

# 13

ئەمە سێهەم جارە دێم بۆ لاتان، {هەر مەسەلەیەك پێویستە بەشایەتی دووان یان سیان بچەسپێ.} [2]جاری پێشوو کە لاتان بووم ئێوەم ئاگادارکردەوە، ئێستاش جارێکی‌تر لەم نامەیە ئەوانەی جاران گوناهیان کردووە لەگەڵ هەموو ئەوانی‌تر ئاگاداریان دەکەمەوەو پێیان ڕادەگەیەنم گەر هاتوو جارێکی‌تر بۆ لاتان بێم بەزەییم بە کەس نایەتەوە، [3]چونکە ئێوە داوای بەڵگە لەمن دەکەن کەوا عیسا بەهۆی من دەدوێ لەگەڵتان. ئەو سەبارەت بە ئێوە لاواز نییە، بەڵکو بەتوانایە لەناوتان. [4]ڕاستە عیسا لەلاوازی لەخاچدرا، بەڵام ئێستا زیندووە بەهۆی توانای خوداوە، چونکە ئێمە لاوازین لەئەودا، بەڵام لەلایەن ئێو ئێمە پێویستە لەئەودا بژین بەهێزو توانای خودا.

[5]جا خۆتان تاقی‌بکەنەوەو سەیری خۆتان بکەن بزانن بە باوەڕ دەژین! لەخۆتان بکۆڵنەوە، ئایا نازانن عیسای مەسیح لەناوتاندایە؟ گەر ئەمە نەزانن ئەوا ئێوە سەرنەکەوتوون لەتاقی کردنەوە. [6]بەڵام

هیوادارم، بزانن ئێمە لەو تاقیکردنەوەیە دەرچووین. [7] ئێمە نوێژ دەکەین بۆ خودا تا یارمەتیتان بدات و هەڵە نەکەن، ئەمەش لەبەرئەوە نییە تا دەرکەوێ ئێمە مرۆڤی چاکین، بەڵکو تەنها بۆ ئەوەیە ئێوە چی چاک و ڕاستە بیکەن، هەرچەندە خەڵکی بە سەرنەکەوتوومان دابنێن. [8] چونکە ناتوانین هیچ شتێ بکەین دژی ڕاستی، بەڵکو دەمانەوێ خزمەتی بکەین. [9] ئەوسا چەند دڵشاد دەبین گەر لە بێ هێزی ئێمە ئێوە بەهێز بن، نوێژی ئێمەش بۆ تەواوی ئێوەیە. [10] وا پێش ئەوەی بۆ لاتان بێم هەموو شتێکم بۆ نووسین، هەتا کاتێ هاتم بۆ لاتان ناچار نەبم بە ڕەقی لەگەڵتان بجوڵێمەوە، چونکە خوداوەند دەسەڵاتی داوە پێم تا بنیادتان بکەم نەك هەڵتانبوەشێنم.

**هاندان و سڵاوی کۆتایی**

[11] لەکۆتاییدا ئەی برایان، خواحافیز، بۆ تەواوی هەوڵبدەن، ئاگاتان لەداواکاریەکانم بێ، ڕێك بکەون، لەگەڵ یەکتری بەئاشتی بژین، ئەوسا خودای ئاشتی و خۆشەویستی لەگەڵتان دەبێ. [12] بەماچی پیرۆز سڵاو لەیەکتری بکەن. [13] هەموو خوشك و برا پیرۆزەکانی ئێرە سڵاوتان لێ دەکەن.

[14] بابەرەکەتی عیسای مەسیحی خوداوەندمان و خۆشەویستی خوداو بەشداری ڕۆحی پیرۆز لەگەڵ هەمووتان بێ.

*غەلاتـیە ولایەتێکی ڕۆمانی بوو لەئاسیای بچووك، هەندێ مامۆستا لەوێ بەرهەڵستی پۆڵسیان کـرد و ووتـیان پێویستە باوەڕدار خەتەنەبکرێو کار بەشەریعەتی موسا بکات تاوەکو خودا بێتاوانی بکات (2:14).*

*لەبەرئەوە نامەکەی پۆڵس بۆ کۆمەڵە باوەڕدارەکانی غەلاتیە ئامانجی ئەوە بـوو، ئەو کەسانەی چەواشە کراون بەم فێرکردنە نادروستە بگەڕێنێتەوە سەر باوەڕی ڕاستەقینە.*

*پۆڵـس سـەرەتا بەرگـری لـەمافی خـۆی دەکـات پـێی بووترێ نیرراوی عیسای مەسیح، ئەمەش لەدژی ئەو کەسانەی دەیانووت نێرراوێکی ڕاستەقینە نیـیە، پێش لەسەر ئەوە دادەگرێ کە نێرراویەکەی لەلایەن هیچ دەسەلاتێکی مـرۆڤەوە نـەهاتووە، بـەڵکو لـەلای خـوداوە هاتووە، بەشێوەیەکی تایبەتیش بـانگ کـراوە بۆ ئەوەی کار لەناو ناجوولەکەکان بکات. پاشان پۆڵس باسی ئـەوە دەکـات چـۆن مـرۆڤ تـەنها بەباوەڕ بێتاوان دەبێ، ئەمەش بەرەکەتێکی خودایـە. لەکۆتاییدا دەیسەلمێنێ ژیان لەمەسیح لەو خۆشەویستیە هەڵدەقوڵێ کە سەرچاوەکەی باوەڕ بەمەسیحە.*

# 1

[1] لەپۆڵسەوە، ئـەوەی نەلەلایـەن خەڵکـەو نـە بەهۆی خەڵك نێرراوە، بـەڵکو لەلایـەن عیسـای مەسـیحو خـودای باوك ئەوەی مەسیحی لەنێو مـردووان زیندووکردەوە. [2] هەروەها لـەهەموو ئەو خوشكو برایانەی لێرە لەگـەڵمدان. بـۆ ئـەو کۆمەڵـە باوەڕدارانـەی لەناوچەی غەلاتیەن. [3] بـا ئاشـتیو بەرەکەتی خودای باوكو عیسای مەسیحی خوداوەندتان لەگەڵ بـێ، [4] ئـەوەی خـۆی کرد بە قوربانی لەپێـناوی گوناهەکانمان، تا ڕزگارمان بکـات لـەم جـیهانە خـراپەی ئێستا، بەپێی خواستی خودای باوکمان. [5] بۆ ئەوە شکۆمەندی تاهەتایە. ئامین.

### مزگێنییەکی دیکە نییە

[6] مـن سـەرم سـوڕماوە. چۆن وا بەخـێرایی واز لـەو کەسە دەهێنن کە

بەبەرەکەتی مەسیح بانگی کردوون، شوێنی مزگێنییەکی دیکە دەکەون؟ [7] مەبەستم ئەوە نییە مزگێنیەکی دیکە هەبێ، بەڵکو هەندێك لەناوتان دەیانەوێ سەرتان لێبشێوێنن و مزگێنی مەسیح تێكبدەن. [8] بەڵام تەنانەت گەر ئێمە مزگێنیەکمان پێدان، یاخود فریشتەی ئاسمان مزگێنییەکی پێدان، جگە لەوەی لەئێمەوە پێتان دراوە، با نەفرەتی لێ بێت. [9] هەروەك پێشتر پێمان ووتون ئێستاش پێتان دەڵێمەوە، گەر یەکێك مزگێنییەکی پێدان جگە لەوەی لە ئێمەوە پێتان دراوە، با نەفرەتی لێبێ.

[10] ئایا ئێستا هەوڵ دەدەم بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خەڵکی یاخود ڕەزامەندی خودا؟ یان داوای ئەوە دەکەم خەڵکی ڕازی بکەم؟ گەر تا ئێستا خەریکی ڕازیکردنی خەڵکی بوومایە نەدەبوومە بەندەی مەسیح.

**چۆن پۆڵس بوو بە نێرراو؟**

[11] برایان باش بزانن ئەو مزگێنییەی ڕامگەیاندووە، مزگێنییەك نییە لەمرۆڤ بێ، [12] لەکەسیشم وەرنەگرتوە، کەسیش فێری نەکردووم، بەڵکو بەڕاگەیاندنی عیسای مەسیح بۆم هاتووە.

[13] چونکە دەزانن، چۆن جاران وەك جوولەکەیەك ژیاوم، چۆن کۆمەڵە باوەڕدارەکانی خودام دڕندانە چەوساندۆتەوەو هەوڵمداوە لەناویان ببەم، [14] هەروەها چۆن لەبارەی جێبەجێکردنی کاروباری ئایینی جوولەکە باشتر بووم لەزۆربەی هاوڕێیەکانم، هەروەها زۆر دڵگەرمتر بووم لەوان بۆ داب‌ونەریتی باوباپیرانمان. [15] بەڵام خودا بە بەرەکەتی خۆی پێش لەدایكبوونم هەڵیبژاردمو بانگی کردم، [16] خۆشحاڵ بووم ڕۆڵەکەی بۆ من ڕابگەینێ، هەتا منیش مزگێنی پێبدەم لەناو میللەتان، ئەو کاتە ڕاوێژم لەگەڵ هیچ کەس نەکرد. [17] نەچووم بۆ قودس بۆ لای ئەوانەی پێش من نێرراو بوون، بەڵکو یەکسەر ڕۆیشتم بۆ عەرەبستان، لەوێشەوە گەڕامەوە بۆ دیمەشق.

[18] ئینجا دوای سێ ساڵ ڕۆیشتم بۆ قودس، تاکو پەترۆس ببینم، پانزە ڕۆژ لای ئەو مامەوە. [19] بەڵام لەوێ هیچ نێرراوێکی ترم نەدی جگە

لــەیـاقوبی بـرای خوداوەند نەبێ.[20] ئــەوەی بۆتــانی دەنووســم، خــودا دەزانــێ درۆ نیــیە.[21] دوایــی بــۆ هەرێمەکانی سوریاو کیلیکیە چووم.[22] بەڵام هێشتا کۆمەڵە باوەڕدارەکانی ناوچەی یەهودیە کە لەمەسیحن منیان نەدەناسی.[23] تەنها بیستبوویان: (ئەو پیاوەی جاران ئێمەی دەچەوساندەوە، ئێستا خـۆی مزگێـنی ئـەو بـاوەڕە دەدات، کــە جــاران هــەولـێ لەناوبــردنی دەدا.)[24] ئــیتر ئــەوان ستایشی خودایان کرد بەهۆی منەوە.

## رازیبوون بە خزمەتی پۆڵس

## 2

دوای چـواردە سـاڵ جـارێکی دیکە لەگـەڵ بـەرنابا ڕۆیشـتم بـۆ قودس، تیتۆسیشـم لەگەڵ خۆم برد.[2] چوونم بـۆ ئـەوێ بەڕاگـەیاندن بـوو، ئـەو مزگێنییەی دەیدەم بەمیللەتان لەپێشا تـەنها خسـتمە بـەردەم گەورە پیاوان لــەوێ، تـا هـەوڵدانی ڕابـوردوو و ئێسـتام بـە فـیرۆ نـەڕوات.[3] بـەڵام تەنانـەت تیتۆسـی هاورێی گەشتیشم کـە یۆنـانی بـوو، ناچـارنەکرا خۆی خەتەنـە بکـات.[4] جـا ئـەم مەسەلەیە تەشەنەی کرد، بەهۆی هەندێ برایانی درۆزن کـە بەنهێنی هاتبوونە ناومان، تـاکو سەربەسـتی عیسای مەسیحمان لــێبسـێننەوەو بمـانگەڕێـنەوە بـۆ کۆیلایـەتی.[5] بــەڵام تەنانــەت بــۆ چـاوتروکانێك ملکەچـیان نەبووین و خۆمــان نــەدا بەدەســتیان، هــەتا پارێــزگاری ڕاســتی مزگێنیــتان بــۆ بکەین.

[6] ئەوانــەی بەگــەورە پــیاوان دادەنران ﴿لـێپرسراوان﴾، بەلای من هـیچ گـرنگ نەبوون، چونکە خودا تەماشـای ڕووالەتی مرۆڤ ناکات. من دەڵـێم، ئەوانـە هـیچ شتێکی تازەیان نـەبوو بـۆ مـن.[7] بـەڵکو بەپێچەوانە، بۆیـان ئاشـکرا بـوو، خـودا کـاری بڵاوکـردنەوەی مزگێـنی بە من داوە لەنـێوان ئەوانـەی جوولەکـە نـین، هــەروەك چــۆن هــەمان کــاری بـەپەتـرۆس داوە لەنـێوان ئەوانـەی جوولەکـەن.[8] چـونکە ئەوەی کاری کــردووە لەخــزمەتی پەتــرۆس بــۆ جوولەکـەکان، کـاری لەخـزمەتی منـیش کردووە بۆ ناجوولەکەکان.[9] دوای ئــەوەی یــاقوبو پەتــرۆس و یۆحەنـنا کـە بـە کۆڵەکـە دانرابوون زانیـیان خـودا ئەم بەرەکەتەی بە من داوە. ئەوسـا ئەوان دەستی برایانەیان

خستە ناو دەستی منو بەرنابا، لەسەر ئەوە ڕێککەوتین ئەوان بۆ لای جوولەکەکان بچن، ئێمەش بۆ لای ناجوولەکەکان. [10]تەنها داوای ئەوەیان لێکردین، هەژاران لەیاد نەکەین، ئەمەش شتێکە هەمیشە بایەخم پێداوە.

**سەرزەنشتکردنی پەترۆس**

[11]کاتێ پەترۆس بۆ شاری ئەنتاکیا هات، ڕوو بەڕوو بەربەرەکانیم کرد، چونکە شایانی گلەیی لێکردن بوو. [12]پێش ئەوەی هەندێ کەس لەلای یاقوبەوە بێن، پەترۆس بەبێترس نانی دەخوارد لەگەڵ ناجوولەکەکان، بەلاَم کاتێ ئەوان هاتن، خۆی کێشایە دواوە لەترسی خەتەنەکراوان. [13]لەوێدا باوەڕدارە جوولەکەکانی دیکەش لەگەڵ پەترۆس دەستیان کرد بە دووڕوویی، تەنانەت بەرناباشیان والێکرد بچێتە ڕیزیان بەهۆی دووڕووییان.

[14]کاتێ ئەمانەم بینی لەڕێگای ڕاستی مزگێنی نارۆن، لەبەر چاوی هەموو ئەوانەی لەوێدا بوون بە پەترۆسم ووت: (گەر تۆ کە جوولەکەی، وەك ناجوولەکە دەژی نەك وەك جوولەکە. ئیتر چۆن ئەو ناجوولەکانە ناچار دەکەیت وەك جوولەکە بژین؟)

[15]هەرچەندە ئێمە بە جوولەکەیی لەدایك بووینو لەمیللەتانی گوناهبار نین، [16]لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە دەزانین مرۆڤ بێتاوان نابێ بەکارکردن بەشەریعەت، بەڵکو بەباوەڕ بەعیسای مەسیح، جا ئێمەش باوەڕمان هێنا بەعیسای مەسیح تاکو بێتاوان بین بە باوەڕمان بە مەسیح، ئەمەش نەك بەکارکردن بەشەریعەت، چونکە کارکردن بەشەریعەت هیچ کەسێ بێتاوان ناکات.

[17]بەلاَم گەر ئێمە لەهەوڵدانمان بۆ بێتاوان بوون لەمەسیح، خۆمان دۆزیەوە گوناهبارین، ئیتر ئایا مەسیح خزمەتکاری گوناهە؟ بێگومان نەخێر! [18]بەلاَم گەر شتێك بنیادبنێمەوە کە لەپێشا تێکمدابێ، ئەوا دەیسەلمێنم سەرپێچی شەریعەتم کردووە. [19]چونکە بەهۆی شەریعەت مردم بۆ شەریعەت، هەتا بۆ خودا بژیم. [20]من لەگەڵ مەسیح لەخاچدراوم، ئیتر من نیم ئەوەی دەژی، بەڵکو مەسیحە لەمن دەژی، هەروەها ئەو ژیانەی ئێستا بەلەش

دەژیم ئەوە بەباوەڕە بەڕۆڵەی خودا، ئەوەی منی خۆشویستو خۆی کرد بەقوربانی بۆ من. [21] من بەرەکەتی خودا پووچ ناکەمەوە، چونکە گەر بێتاوانی بە شەریعەت بووایە، ئیتر مردنی مەسیح بێسوود دەبوو.

### باوەڕ یاخود شەریعەت؟

# 3

ئەی دانیشتوانی بێمێشکی غەلاتیە! کێ جادووی لێکردوون؟ ئایا لەپێش چاوتان وێنەی عیسای مەسیح بە لەخاچدراوی بەڕوونی نەکێشراوە؟ [2] تەنها وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەنەوە: ئایا ڕۆحی پیرۆزتان بەهۆی کارکردن بەشەریعەت وەرگرت، یاخود بەهۆی باوەڕتان بەوەی بیستتان؟ [3] باشە چۆن دەبێت ئەوەندە بێمێشك بن؟ ئەوەی بەڕۆح دەستتان پێکرد، ئایا ئێستا بەلەش کۆتایی پێدەهێنن؟ [4] ئایا ئازارکێشانتان بێ سوود بوو؟ گەر بەڕاستی بێسوود بوو. [5] ئایا ئەوەی ڕۆحتان پێ دەبەخشێو کاری سەرسوڕهێنەرتان لادەکات، ئەمە بەهۆی کارکردن بەشەریعەتە، یاخود بەهۆی باوەڕتان بەوەی بیستتان؟

[6] وەك چۆن ئیبراهیم {باوەڕی بەخودا هێنا، ئەمەش بە ڕاستودروستی بۆی دانرا.} [7] جا بزانن ئەوانەی لەسەر ڕێگای باوەڕ دەڕۆن نەوەی ئیبراهیمن. [8] کتێبی پیرۆزیش پێشبینی دەکات، گەلان بێتاوان دەبن بەهۆی باوەڕ. خودا مزگێنی بە ئیبراهیمداو ووتی: { بەهۆی تۆوە هەموو گەلان پیرۆز دەبن.} [9] کەواتە ئەوانەی باوەڕدارن پیرۆزبوون لەگەڵ ئیبراهیمی باوەڕدار.

[10] هەموو ئەوانەی پشت بەکرداری شەریعەت دەبەستن، لەژێر نەفرەت دان، چونکە لەکتێبی پیرۆز نووسراوە: {نەفرەت لێکراوە ئەوەی لەسەر هەموو نووسراوەکانی شەریعەت ناچەسپێتو پەیڕەویان ناکات.} [11] ئەوەش ئاشکرایە کەس بەشەریعەت لەبەرامبەر خودا بێتاوان نابێت، چونکە کتێبی پیرۆز دەڵێ: { ئەوەی بە باوەڕ بێتاوان دەبێ، دەژی.} [12] بەڵام شەریعەت پشتنابەستێ بە باوەڕ، چونکە کتێبی پیرۆز دەڵێت: {ئەوەی کار بەڕاسپاردەکانی شەریعەت بکات، بەشەریعەت دەژی.} [13] مەسیح

ئـێمەی بـەخوێن کڕیـیەوە لـەنەفرەتی شـەریعەت بـەوەی بـوو بەنەفـرەت لـێکراو لـەپێـناوی ئـێمە، چـونکە نووسـراوە: {نەفـرەت لـێکراوە ئـەوەی لـەسەر دار هەڵبواسریێ}.[14] ئـێمەی بـەخوێن کـڕیەوە بـۆ ئەوەی پـیرۆزی ئـیبراهیم بـەهۆی عیسـای مەسـیح بەمیللـەتانـیش ببەخشـرێو بەڵێـنی ڕۆح وەرگـرین ئـەوەی بەباوەڕە.

**پەیمانو شەریعەت**

[15]ئـەی بـرایان، بـا نموونەیـەکی مـرۆڤانەتان بـۆ بهێـنمەوە، شـتێکی ئاشـکرایە گـەر یەکـێك پەیمانـێکی مۆرکـراوی پـێ بـێ، یەکـێکی تـر نـاتوانێ بەتاڵی بکاتەوە یاخود شتێکی بخاتە سەر.

[16]کـاتێ خـودا بەڵێـنیدا بـە ئـیبراهیمو نەوەکـەی، مەبەسـت لـە ووشـەی نەوەکەی تەنها مەسیحە کە شێوەی تاکی هەیە، چونکە نەیووتوە نەوەکانی تا شێوەی کۆمەڵ وەرگرێ. [17]مەبەسـتم ئەوەیـە: ئـەو شەریعەتەی دوای چـوارسـەدو سـی سـاڵ هات، پـاش پـەیمانی خـودا لەگەڵ ئیبراهیم، پـەیمانی چەسـپاوی پێشـووی خـودا بـەتاڵ ناکاتـەوە، تـاکو بەڵێـنەکە بشـکێنێ. [18]گـەر میراتـی خـودا بـە شەریعەت بێ، ئیتر پەیوەندی بە بەڵێن نییە. بـەڵام خودا بە بەرەکەتی خۆی بەڵێـنی بـە ئـیبراهیمداو کـردی بـە میراتگر.

**مەبەستی شەریعەت**

[19]کـەواتـە شـەریعەت بـۆ چییە؟ خودا دایناوە بەهۆی پێشێلکاریەکان، کاریشـی پێکـرا تـا ئـەو کاتـەی نـەوەکـەی ئـیبراهیم هات، ئەوەی خـودا بـەڵێـنی پـێـدابوو. ئـەم شـەریعەتەش لـەفریشتەکانەوە بەهۆی پەیوەندیڕێکخـەرێك بۆ ئێمە هێنرا. [20]هـەر چۆنێك بێ پەیوەندیڕێکخەر تـەنها نوێـنەری یەك لایەن نییە، بەڵام خودا یەکە.

[21]ئایـا ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێ شـەریعەت دژی بەڵێنەکانی خودایە؟ نەخێر بێگومـان، چـونکە گـەر ئەو شـەریعەتەی دراوە بە مرۆڤ بێتوانیایە ژیـان ببەخشێ، ئەوا بەراستی بێتاوانی بـەشـەریعەت دەبـوو. [22]بەڵام کتێبی پـیرۆز هـەموو شتێکی کردۆتە دیلی گونـاە، تـا ئەو بەڵێنەی بەهۆی باوەڕ دراوە لـەعیسـای مەسـیح، بـدرێ

بەوانەی باوەڕ دەهێنن.
[23]پێش ئەوەی باوەڕمان بۆ بێت، لەلایەن شەریعەتەوە بەندکرا بووین، بەبەستراوی مابووینەوە تا ڕاگەیاندنی باوەڕ. [24]کەواتە، تا هاتنی مەسیح شەریعەت تەمێکەرمان بوو، تاکو بەباوەڕ بێتاوان بین، [25]بەلاّم ئێستا باوەڕ هاتووە، ئێمە ئیتر لەژێر سایەی تەمێکەر نین.
[26]چونکە ئێوە بەهۆی باوەڕ لەعیسای مەسیحدا هەموو ڕۆڵەی خودان. [27]ئیتر مەسیحتان لەبەرکردووە، چونکە بەناوی ئەوەوە لەئاوهەڵکێشراون. [28]ئێستا جیاوازی نییە، گەر جوولەکە یاخود یۆنانی، کۆیلە یاخود ئازاد، ژن یاخود پیاوبن، چونکە هەمووتان یەکن لەعیسای مەسیح. [29]جا گەر ئێوە سەر بە مەسیح بن، ئەوا لەنەوەی ئیبراهیمن، میراتگرن بەپێی بەڵێنەکە.

### کۆیلە نا، بەڵکو ڕۆڵەی خودا

## 4

با پێتان بڵێم: گەر میراتگر منداڵ بێت، لەنێوان ئەو میراتگرەو کۆیلەیەك هیچ جیاوازی نییە، هەرچەندە میراتەکە هەمووی هی ئەوە، [2]چونکە دەبێ لەژێر دەسەڵاتی سەرپەرشتیکارو بریکار بمێنێتەوە، تاکو ئەو ماوەیە تەواو دەبێ کە باوکی دایناوە. [3]ئێمەش بەهەمان شێوە، کاتێ منداڵ بووین کۆیلەی دەستی هێزەکانی جیهان بووین، [4]بەلاّم کاتێ تەواو بوونی زەمانە هات، خودا ڕۆڵەی خۆی ﴿مەسیح﴾ نارد بۆ لامان، لە ژنێك لەدایك بوو، لەژێر سایەی شەریعەت لەدایك بوو، [5]بۆ ئەوەی ئەوانەی لەژێر سایەی شەریعەتن بەخوێن بیان کڕێتەوە، تاکو خودا ئێمە وەکو ڕۆڵەی خۆی قبوڵ بکات. [6]چونکە ئێوە ڕۆڵەن، خودا ڕۆحی ڕۆڵەکەی خۆی خستە ناو دڵمانەوە، هاوار دەکەین: (بابە! باوك!) [7]کەواتە ئیتر ئێوە کۆیلە نین، بەڵکو ڕۆڵەن، هەروەها چونکە ئێوە ڕۆڵەن خودا ئێوەی کرد بە میراتگر.

### ئامۆژگاری پۆڵس بۆ غەلاتیەکان

[8]ئەو کاتەی ئێوە خوداتان نەدەناسی، کۆیلەی ئەوانە بوون کە بەسروشت خودا نین، [9]بەلاّم دوای ئەوەی خوداتان ناسی، یاخود باشترە بڵێین دوای ئەوەی خودا ئێوەی ناسی، چۆن دەبێ جارێکی دیکە

بگەڕێنەوە لای لاوازیو هەژاری ئەم جیهانە، بتانەوێ ببنەوە کۆیلەی ئەوانە سەر لەنوێ؟ [10]ئێوە بایەخ دەدەن بە ڕۆژو مانگو ساڵو وەرزی تایبەتی! [11]لەوە دەترسم بەخۆڕایی ماندوو بووبم لەپێناوتان.

[12]ئەی برایان داواتان لێدەکەم، خۆتان وەك من لێبکەن، چۆن من خۆم وەکو ئێوە لێکردووە. ئێوە هیچ هەڵەتان نەکردووە سەبارەت بە من، [13]هەرچەندە دەتانزانی من نەخۆش بووم کاتێ یەکەمجار مزگێنیم پێدان، [14]نەخۆشیەکەم شتێکی ئاسان نەبوو بۆتان، لەگەڵ ئەوەشدا لێم بێزار نەبوونو خۆتان دوور نەخستەوە لێمو هیچ خراپەیەکتان لەگەڵ نەکردم، بەڵکو پێشوازیتان لێکردم وەك فریشتەی خودا، وەك عیسای مەسیح. [15]ئەو خۆشیەتان چی لێهات؟ من شایەتیتان بۆ دەدەم گەر بتانتوانیبایە، چاوی خۆتان دەردەهێناو دەتاندا پێم. [16]ئایا ئێستا بووم بە دوژمنتان چونکە ڕاستیتان پێدەڵێم؟

[17]هەندێك خۆیان بەدڵگەرم دەردەخەن بۆ ئێوە، بەڵام نەك بە نیازی باش، بەڵکو تا لەئێمەتان دووربخەنەوەو دڵگەرم بن بۆ ئەوان. [18]دەرخستنی بایەخ پێدان شتێکی جوانە، گەر هەموو کاتێ بەمەبەستێکی پاك بێت، نەك تەنها ئەو کاتەی من لەگەڵتاندام. [19]منداڵەکانم، ئەی ئەوانەی دەبێ لەپێناوتان جارێکی دیکە ئازار بچێژم، هەتا وێنەی مەسیح لەژیانتان دەرکەوێ، [20]چەند حەزم دەکرد ئێستا لەناوتانابم، تا بەشێوەیەکی دیکە لەگەڵتان بدوێم، چونکە سەرم سوڕماوە لێتان.

**نموونەی هاجەرو سارا**

[21]پێم بڵێن ئەی ئەوانەی حەز دەکەن لەژێر سایەی شەریعەت بن، ئایا ئەوەی لەشەریعەت باسکراوە نەتانبیستووە؟ [22]چونکە لەکتێبی پیرۆز نووسراوە، ئیبراهیم دوو کوڕی هەبووە، یەکێکیان لەهاجەری کۆیلە بوو، ئەوی دیکەیان لەسارای ژنی کە ئازاد بوو. [23]ئیبراهیم کوڕێکی لەکۆیلەکە بوو بە پێی خواستی لەش، بەڵام لەسارای ژنی کوڕێکی بوو بەهۆی بەڵێن.

[24]ئەم ڕاستیە مانایەکی ڕەمزی هەیە. ئەو دوو ژنە نموونەی دوو

پەیمانن: یەکەم پەیمان لە شاخی سینایە، مندالّی لیّدەبیّت بۆ کۆیلایەتی ئەوەش هاجەرە، [25]هاجەر بە شاخی سینا دەوتریّ، لەعەرەبستان رەمزیّکە بۆ قودسی ئیّستا، ئەو لەگەلّ مندالّەکانی کۆیلەن. [26]بەلاّم قودسی ئاسمانی کە دایکی هەموومانە ئازادە، [27]چونکە لەکتیّبی پیرۆز نووسراوە:

{دلّشادبە ئەی نەزۆك،
ئەی ئەوەی مندالّت نییە،
بەدەنگی بەرز ستایشی خودا بکە،
ئەی ئەوەی ژانی مندالّبوون نازانی،
چونکە تۆ ئەی ئەوەی بەتەنهای،
ژمارەی مندالّەکانت زیاترە لەوەی
میّردەکەی لەگەلّیەتی.}

[28]بەلاّم ئیّوە ئەی برایان، رۆلّەی بەلّیّنن وەك ئیسحاق. [29]جا چۆن لەسەردەمی رابووردوو ئەوانەی بەپیّی لەش لەدایك بوون، ئەوانەیان دەچەوساندەوە کە بەپیّی رۆح لەدایك بوون، ئیّستاش هەمانشت روو دەدات. [30]کتیّبی پیرۆز لەم بارەیەوە دەلّیّ چی؟ دەلّیّ: {کۆیلەکە لەگەلّ کورەکەی بکەدەرەوە، تا کوری کۆیلەکە میراتگر نەبیّ لەگەلّ کوری ئازادەکە. } [31]کەواتە ئەی برایان ئیّمە رۆلّەی کۆیلەکە نین، بەلّکو رۆلّەی ئازادەکەین.

## ئازادی لە مەسیح

# 5

چونکە مەسیح ئازادیکردین تا بە ئازادی بژین. بۆیە خۆتان راگرنو جاریّکی دیکە ملکەچی نیری کۆیلەیی مەبن.

[2]ئاگاداربن، من پۆلّسم پیّتان دەلّیّم: بەخەتەنەکردنتان مەسیح هیچ سوودیّکی نابیّ بۆتان. [3]جاریّکی کەش روونی دەکەمەوە، ئەوەی خەتەنە دەکات، دەبیّ لەسەر هەموو خالّەکانی شەریعەت بروات. [4]ئەی ئەوەی دەتەویّ بەهۆی شەریعەت بیّتاوان بیّت، تۆ لەمەسیح جیابوویتەوەو سەبارەت بە بەرەکەتی خودا کەوتیت. [5]چونکە بەهۆی رۆح کە لەباوەرەوەیە چاوەروانی هیوای راستودروستیین، [6]چونکە لەعیسای مەسیح خەتەنەکراو و خەتەنە نەکراو سوودیان نییە، تەنها باوەر نەبیّ کە بەهۆی خۆشەویستی کار دەکات.

[7]ئیّوە لەپیّشا زۆر باش راتان دەکرد، کیّ ریّی پیّگرتن تا

ملکەچـی ڕاسـتی نەبن؟ [8]ئەو هاندانە لەلایـەن خوداوە نییە کەبانگی ئێوەی کـردووە. [9]سـەیرکەن هەویرترشێکی بچـــووکە، هـــەموو هەویـــرەکە هـەڵدەهێـنێ. [10]بـەڵام بـاوەڕم هەیـە لـەخوداوەند، کـەوا ئێوە بیروڕایەکی تـر وەرناگـرن. جـا ئـەوەی بـیەوێ لـەناوتان ببێتە کۆسپ، هەر کەسێك بێ سزای خۆی وەردەگرێ. [11]بەڵام ئـەی بـرایان، گـەر من خەتەنەکردن ڕادەگەیـنم، ئیتر بۆچی جوولەکەکان تـا ئێسـتا دەمچەوسـێننەوە؟ کەواتـە کۆســـپی خـــاچ لادراوە. [12]ئـــەو کەسـانەی ڕێگـای باوەڕتان لـیَتێك دەدەن، با ببڕێنەوە.

[13]بـرایان، ئـێوە بـانگ کـران بۆ ئـازادی، بەڵام ئازادی مەکەن بە هەل بـۆ ڕازیکردنی لەش، لـەجیاتی ئەوە بـە خۆشەویسـتی خـزمەتی یـەکتری بکـەن. [14]چونکە شەریعەت هەمووی لەیـەك ڕاسـپاردەدا تـەواو دەبـێ: { ئـەوەی لـێـت نـزیکە وەك خـۆت خۆشـــت بـــوێ} [15]ئەگـــەر ئـــێوە لەڕابوردوو پەلاماری یەکترتان دەداو ڕاوی یـــەکترتان دەکـــرد، ئێســـتا ئاگاداربن یەکتری لەناونەبەن.

**ژیان لەڕۆحی پیرۆز**

[16]مەبەسـتم ئەوەیـە پێتان بڵێم: با ژیانـتان بـەڕۆحی پیرۆز بەڕێوە بچێ، هـەروەها ئارەزووەکـانی لـەش تـێر مەکـەن. [17]چـونکە خواسـتی لـەش دژی ڕۆحـە، هەروەها خواستی ڕۆح دژی لەشە. هەریەکەیان بەربەرەکانی ئەوی‌تـر دەکـات، تا ئەوە نەکەن کە دەتانـەوێ. [18]بـەڵام گـەر ئێوە ڕۆح بـەڕێوەتان بـبات، ئـەوا لەژێر سایەی شەریعەت نین.

[19]کـــردارەکانی لـــەش دیـــارن: داوێن‌پیسی، گلاوی، بەدڕەوشتی، [20]بـــت‌پەرســـتی، جادوگـــەری، دوژمنایەتی، شەڕنانەوە، دڵگەرمی بۆ خـــراپە، تووڕەبـــوون، خۆپەرســـتی، دووبـەرەکی، ناکۆکی، [21]چاوپیسی، سەرخۆشـی، ڕابواردن، هتد... ئێستا ئاگادارتـان دەکەمەوە، هەروەك چۆن لەپێشـا ئاگـادارم کردوون، ئەوانەی ئـــەو کارانـــە دەکـــەن میراتگـــری پادشاهێتی خودا نین.

[22]بەڵام بەرووبوومی ڕۆح بریتییە لـــە: خۆشەویسـتی‌و خۆشی‌و ئاشتی، ئـارامگـرتن، ڕۆح سووکی‌و چاکە، بـاوەڕ، [23]نـیانی‌و خۆڕاگـرتن. هیچ شـەریعەتێکیش نـیـە دژی ئـەم شتانە

بـیێ. [24]ئەوانـەی سـەر بـە عیسـای مەسـیحن، خواسـتو ئارەزووەکانی لەشـیان لـەخاچـداوە. [25]گـەر ئـێمە بەپـێی ڕۆحی پیرۆز بژین، لـەسەرمانە بـەڕێگای ڕۆحـی پیرۆز بڕۆین. [26]با لــەخۆبایی نـەبین، ڕقوکینەمان نەبێ لەگــەڵ یــەکتری، چــاوپیس نــەبین لەگەڵ یەکتری.

## باری یەکتری هەڵگرن

# 6

ئـەی بـرایان، گـەر یەکێکتان کەوتە هەڵــەوە، بـا ئـێوەی ڕۆحـی، ڕاستی بکەنـەوە بـە شـێوەیەکی نـەرم. تۆش ئاگـاداری خـۆت بە، نەوەك بکەویتە تــاقیکــردنەوە. [2]بــاری یــەکتری هەڵگــرن، بــەم شــێوەیە شــەریعەتی مەسیح تەواو دەکەن. [3]ئەگەر یەکێك واسەیری خۆی کرد شتێکی گرنگە، بـەڵام لە ڕاستیدا هیچ نەبێ، ئەوا ئەو کەسە خۆی دەخڵەتێنێ. [4]باهەر یەکە کـردارەکانی تاقیبکاتـەوە، ئیـنجا با شـانازیکردنی تەنها بەخۆی بێ نەك بەنـزیکەکەی، [5]چـونکە هـەر کـەس باری خۆی هەڵدەگرێ.

[6]ئـــەوەی ووشـــەی خـــودای فێردەکرێ، لەسەریەتی فێرکەرەکەی بەشـدار بکات لـەهەموو شتێکی باش کە هەیەتی.

[7]خۆتـان هەڵمەخەڵەتێـنن، خودا فـێڵی لــێ ناکرێـت، چونکە ئەوەی ڕواندووتانـە، هـەمان شـت دروێـنە دەکـەن. [8]چـونکە ئـەوەی بۆ لەشی خـۆی بڕوێـنێ لــە لەشـیدا گـڵاوی دروێنە دەکات، بەڵام ئەوەی بۆ ڕۆح بڕوێـنێ لەڕۆحـەوە ژیانی هەتاهەتایی دروێـنە دەکات. [9]کەواتە با لـەکاری چـاکە نەکـەوین، چـونکە گەر وورە بەرنـەدەین لــەکاتی خـۆی دروێـنەی زۆر دەکـەین. [10]جـا تـا دەرفـەتمان هەیە، با چاکە لەگەڵ هەموو کەسێك بکـەین، بـەتایـبەتی لەگـەڵ خوشكو برایانی باوەردار.

## بوونەوەرێکی نوێ

[11]سـەیرکەن، ئەو پیتە گەورانەی ئێسـتا دەیخوێننەوە، من بەدەستی خۆم نووسیومە.

[12]ئەوانـەی دەیانـەوێ بەڕواڵەت خۆیـان بـەچـاك نیشـان بدەن، هەوڵ دەدەن ناچـارتان بکەن خۆتان خەتەنە بکـەن، تـاوەکو تووشـی چەوسانەوە نـەبن بـەهۆی خاچی مەسیحەوە. [13] چـونکە ئـەو خەتەنەکـراوانە خۆیـان

بەپێی شەریعەت هەڵسوکەوت ناکەن، بەڵکو دەیانەوێ ئێوە خەتەنەبکرێن، هەتا شکۆمەندیان دەسکەوێ بە لەشی ئێوە. [14]بەڵام هیچ شکۆمەندیەکم ناوێت گەر لەخاچی عیسای مەسیحی خوداوەندمان نەبێ، کە بەهۆی ئەوەوە جیهان سەبارەت بە من لەخاچدراوە، هەروەها منیش سەبارەت بە جیهان لەخاچدراوم. [15] گرنگ نییە مرۆڤ خەتەنەکرا بێت یاخود خەتەنە نەکرا بێ، بەڵکو بووبێ بە بوونەوەرێکی نوێ. [16]با ئاشتیو بەزەیی بۆ هەموو ئەوانە بێ کە دوای ئەم یاسایە کەوتوون، هەروەها بۆ هەموو ئیسرائیلی خودا.

[17]ئیتر لەمەولا گیروگرفتی ترم بۆ مەهێننەکایەوە، چونکە لەلەشمدا هێماکانی عیسام هەڵگرتووە.

[18]خوشكو برایان، ئیتر بابەرەکەتی عیسای مەسیحی خوداوەندمان لەگەڵ ڕۆحتان بێت. ئامین.

*قوڵترین ڕاستییەکانی باوەڕ لەم نامەیە دایە، باسی ئەو بانگەوازە ئاسمانیە دەکات کە خودا خەڵکی گوناهباری بۆ باوەڕی مەسیح پێ بانگکرد، چونکە خودا ئەوانی بەخوێنی مەسیح کڕییەوەو بڵندیکردن بۆ بەرزترین شوێن. هەروەها باسی دڵی بەسۆزی خودا دەکات چۆن پڕە لەبەزەییو بەرەکەتو سۆز سەبارەت بە ئێمە لەمەسیحدا. باسی ئەو ئاسمانە دەکات کە مەسیح بۆی بەرزبووەوەو لەوێ لەسەرووی هەموو سەرۆکایەتیو دەسەڵاتێك دانیشت، لەسایەی بەرەکەتی خودا هەموو باوەڕداران دەچنە ئەوێ. لێرە باسی ئەو شتە دەکرێ کە خودا ئەنجامی داوە لەڕێی مەسیح، چۆن باوەڕدارانی کردووە بە یەك لەگەڵ مەسیح، هەروەها بەشداری کردوون لەشکۆمەندیەکەی. ئەمەش لەکۆمەڵەی باوەڕداران لەلاشەی مەسیحو پەرستگای خودایە، خودا بە ڕۆحی خۆی تیایدا نیشتەجێ دەبێ، ئەم پەرستگایەش لەدوارۆژدا شکۆدار دەبێ. بەشێکی گەورەی ئەم نامەیەش بەندە بەهەڵسوکەوتەوە.*

# 1

[1] لە پۆڵس، نێرراوی عیسای مەسیح لەسەر خواستی خودا، بۆ خوشکو برا پیرۆزە باوەڕدارەکان لە عیسای مەسیح کە لە شاری ئەفەسۆسن. [2] با بەرەکەتو ئاشتی خودای باوکمانو عیسای مەسیحی خوداوەندتان لەگەڵ بێ.

**پیرۆزی ڕۆحی لەمەسیح دایە**

[3] پیرۆزە خودای باوکی عیسای مەسیحی خوداوەندمان، ئەوەی پیرۆزی کردووین بەهەموو پیرۆزییەکی ڕۆحی لە ئاسماندا لەمەسیح، [4] هەروەك پێش دروستکردنی جیهان هەڵیبژاردین، هەتا پاكوپیرۆزو بێکەموکوڕی بین لەبەردەمی. [5] ئەو بەخۆشەویستی پێشتر دیاریکردین بەپێی خواستو خۆشحاڵی خۆی تا بمانکات بەڕۆڵەی خۆی بەهۆی عیسای مەسیح، [6] بۆ ئەوەی ستایشی بکەین بۆ ئەو بەرەکەتە شکۆدارەی بەخۆڕایی داوێتی پێمان بەهۆی ڕۆڵە

خۆشەویستەکەیەوە. [7]ئێمە لەمەسیح کڕاینەوە بەخوێنی ئەو، گوناهمان بەخشرا، ئەمەش بەپێی دەوڵەمەندی بەرەکەتی خودا بوو، [8]بەدەست‌و دڵفراوانی ڕشتی بەسەرماندا بەوپەڕی دانایی‌و تێگەیشتن. [9]نهێنی خواستی خۆی بۆ دەرخستین، بەپێی خۆشحاڵی خۆی ئەوەی مەبەستی بوو لەمەسیح، [10]وەك پلانێك بۆ تەواوی زەمانە بۆ ئەوەی هەموو شتێك بە یەکەوە کۆبکاتەوە لەمەسیحدا، لەوانەی لە ئاسمان‌و لەسەر زەوین.

[11]لەمەسیحدا خودا هەڵیبژادین بەپێی بڕیاری پێشووی خۆی، ئەوەی هەموو شتێك دەکات بەپێی مەبەستی خواستی خۆی. [12]ئێمە دیاری کراین‌و دەستنیشان کراین هەتا بۆ ستایش‌کردنی شکۆمەندی ئەو بژین، چونکە لە زووەوە هەموو هیوایەکمان لەسەر مەسیح داناوە. [13] هەر بەهۆی ئەویشەوە بوو کاتێ ووشەی ڕاستیتان بیست واتە مزگێنی ڕزگاریتان، هەروەها کاتێ باوەڕتان هێنا، مۆرکران بە ڕۆحی پیرۆزی بەڵێن پێدراو، [14]ئەو ڕۆحە وەك پێشەکییەك وایە بۆ میراتەکەمان، تا کڕینەوەی ئەوانەی هی خودان، بۆ ستایشی شکۆمەندی ئەو بێ.

**نوێژ بۆ ڕۆحی دانایی**

[15]لەبەرئەوە منیش لەو کاتەی هەواڵی باوەڕتانم بەعیسای خوداوەند بیستووە، هەروەها خۆشەویستیتان بەرامبەر هەموو خوشك‌و برا پیرۆزەکان، [16]ناوەستم لەسوپاس‌کردنی خودا لەپێناوتان، یادتان دەکەم لە نوێژەکانم، [17]تا باوکی شکۆدار، خودای عیسای مەسیحی خوداوەندمان، ڕۆحی دانایی‌و ڕاگەیاندنتان لەزانینی خۆی پێ‌ببەخشێ. [18]ئەو مێشکتان ڕووناك دەکاتەوە هەتا بزانن چییە ئەو هیوایەی ئێوەی بۆ بانگ‌کراوە، هەروەها بزانن میراتەکەی چەند شکۆدارو دەوڵەمەندە بۆ خوشك‌و برا پیرۆزەکان، [19]هەروەها چ هێزێکی مەزنی بێ‌سنووری لەئێمە دایە کە باوەڕدارین، بەپێی کاری توانا مەزنەکەی، [20]ئەوەی تەواو بوو لەمەسیحداو بەهۆیەوە مەسیحی لەنێو مردووان هەستاندەوە، لەلای ڕاستی خۆیەوە لەئاسمان داینا، [21]لەسەرووی هەموو فەرمانڕەوایان‌و سەرۆك‌و

پێشەواو دەسەڵاتدارانو هەموو ئەوانەی ناویان هەیە داینا، نەك تەنها لەم زەمانە، بەڵكو لەزەمانی داهاتووش. [22] هەروەها هەموو شتێكی لەژێر پێیەكانی داناوە، كردوویەتی بەسەری هەموو شتێك بۆ كۆمەڵی باوەڕداران، [23] كە لەشی مەسیحەو تەواویەتی، ئەوەی هەموو شتێك تەواو دەكات لەهەموو شتێك.

### زیندووبوونەوە لەگەڵ مەسیح

## 2

ئێوە لە ڕابوردوودا مردوو بوون لای خودا بەهۆی گوناهو هەڵەكانتان، [2] ئەوەی لەسەری دەڕۆیشتن، دوای ڕێبازی ئەم جیهانە كەوتبوون، دوای سەرۆكی هێزی هەوا كەوتبوون، كە ئەو ڕۆحەیە ئێستا لەڕۆڵەكانی یاخیبوون كار دەكات. [3] ئێمەش لەكۆندا هەموو لەوانە بووین، بەپێی ئارەزووی لەش دەژیاین، شوێنی لەشو مێشك كەوتبووین، بە سروشت ڕۆڵەی تووڕەیی بووین وەكو هەموو خەڵكانیتر. [4] بەڵام خودا كە دەوڵەمەندە لەبەزەیی، لەبەر ئەو خۆشەویستیە مەزنەی بۆ ئێمەی دەربڕیوە، [5] زیندووی كردینەوە لەگەڵ مەسیح، دوای ئەوەی مردووبووین بەهۆی گوناهەكانمان، خودا ڕزگاری كردین بە بەرەكەتی خۆی. [6] چونكە ئێمە سەر بەعیسای مەسیحین، خودا لەگەڵ ئەودا هەڵیساندین لەئاسمان دایناین. [7] تا لەسەردەمی داهاتوو دەوڵەمەندی بەرەكەتی بێسنووری خۆی، بەنیانی لەگەڵمان لەعیسای مەسیح دەربكەوێ. [8] خودا بە بەرەكەت بەهۆی باوەڕتان ڕزگاری كردن، ئەمەش لەئەنجامی هەوڵدانی خۆتان نەبوو، بەڵكو دیاری خودا بوو، [9] هەروەها بەهۆی كردار نەبوو، تا یەكێك بتوانێ شانازی پێوە بكات. [10] ئێمە كرداری خوداین، ئەو دروستی كردین لەعیسای مەسیح بۆ كاری چاكە، ئەوەی خودا لەپێشا ئامادەی كردووە بۆمان تا لەسەری بڕۆین.

### مەسیح ئاشتی ئێمەیە

[11] لەبەر ئەوە بەبیرتان بێتەوە ئێوەی لە پێشا بەلەش جوولەكە نەبوون، پێتان دەوترا خەتەنە نەكراو لەلایەن ئەوانەی لەشیان بەدەست خەتەنە كراوە، [12] ئەو كاتە بێ مەسیح

بوون، دوور بوون لەکۆمەڵی گەلی ئیسرائیل، هەروەها بێگانە بوون سەبارەت بە پەیمانەکانی بەڵێن، هیچ هیوایەکتان نەبوو، بێ خودا بوون لەم جیهانە. [13] بەڵام لەعیسای مەسیح هەرچەندە دوور بوون ئێستا نزیك بوونەوە بەهۆی خوێنی مەسیح.

[14] مەسیح ئاشتی ئێمەیە، جوولەکەو ناجوولەکەی کرد بەیەك، دیواری دوژمنایەتی ڕووخاند کە لەیەکتر جیای دەکردنەوە، [15] بەپووچەڵکردنەوەی شەریعەتی ڕاسپاردەکانو ئەرکە ئاینییەکان لەلەشی خۆی، تا لەهەردووکیان لەخۆیدا مرۆڤێکی تازە دروست بکاتو ئاشتی بنێتەوە، [16] بەمە هەر دووکیانی لەگەڵ خودا ئاشت کردەوە، بە خاچەکەی کۆتایی بە دوژمنایەتی نێوانیان هێناو کردنی بەیەك لەش. [17] مەسیح هاتو مزگێنی ئاشتی بۆتان هێنا، کە دوورن، هەروەها بۆ ئەوانەی نزیکن. [18] چونکە ئێمە هەردوو لامان ﴿جوولەکەو ناجوولەکە﴾ بەهۆی مەسیح لەیەك ڕۆح دەچینە لای باوك.

[19] ئیتر ئێوە لەمەولا نامۆ و بێگانە نین، بەڵکو ئێستا هاوولاتین لەگەڵ خوشكو برا پیرۆزەکان، سەر بەبنەماڵەی خودان. [20] دروستکراون لەسەر بناغەی نێرراوانو پێغەمبەران، عیسای مەسیح خۆی بەردی بناغەکەیەتی. [21] ئەوەی بە هۆیەوە هەموو خانووەکە بەیەکەوە ڕادەگریو تەواوی دەکات، تا ببێ بە پەرستگایەکی پیرۆز لەخوداوەند. [22] بەهۆی ئەوەوە ئێوەش بەشێکن لەو خانووەی خودا تیایدا نیشتەجێ دەبێ لەڕۆح.

## پەیامی پۆلس بۆ ناجوولەکە

## 3

من کە پۆڵسم لەپێناوی ئێوەی ناجوولەکە ئێستا بەندێکی عیسای مەسیحم...

[2] بێگومان بەو ئەرکەتان بیستووە کە خودا داویەتی پێم، ئەویش بەڕێوەبردنی بەرەکەتی خودایە بۆ ئێوە، [3] ئەوەش بەهۆی ڕاگەیاندنەوە نهێنی بۆ من ئاشکرا کرد، هەروەك بەکورتی بۆم نووسیون. [4] گەر ئێوە نامەکەم بخوێننەوە، هەست دەکەن خودا چ شارەزاییەکی داوە پێم لەنهێنی مەسیح. [5] ئەو نهێنییەی بۆ

هیچ مرۆڤێك ئاشكرا نەكراوە لەنەوەكانی‌تر، ئەوەی ئێستا خودا بۆ نێرراوە پیرۆزەكانو ئەوانەی بەووشەكانی ئەو دەدوێن بەهۆی ڕۆحی پیرۆزەوە ئاشكرای كردووە.
6 ئەم نهێنیەش ئەوەیە كە ناجوولەكە بەشداری جوولەكە دەكەن لەمیراتو لەلەش، هەروەها لەبەدەست هێنانی بەڵێن كە لەعیسای مەسیحە بەهۆی مزگێنی.

7 ئەوەی خودا كردمی بە خزمەتكار بۆی، بەو بەرەكەتەی پێی بەخشیووم بەهۆی كرداری هێزی خۆی. 8 بۆ من كە بچووكترم لەهەموو برا پیرۆزەكان، ئەم بەرەكەتەی پێ بەخشیووم، تا مزگێنی دەوڵەمەندی بێ سنووری مەسیح بدەم بە ناجوولەكەكان، 9 تا ڕوونی بكەمەوە بۆ هەمووان، ئەوەی خودای دروستكەری هەموو شتێك، چەند نەوەیە بە نهێنی هێشتویەتیەوە.
10 بۆ ئەوەی ئێستا بەهۆی كۆمەڵی باوەڕداران دانایی هەمە جۆرەی خودا ئاشكرابێ بۆ سەرۆكەكانو فەرمانڕەوایان لەئاسمان. 11 ئەمەش بەپێی خواستی هەتاهەتایی بوو كە بەهۆی عیسای مەسیحی خوداوەندمانەوە هێنایەدی.
12 ئەوەی لە ئەوەوە دەتوانین بێ‌ترسو دڵنیا لە خودا نزیك‌بینەوە، بەهۆی باوەڕمان پێی. 13 بۆیە داواتان لێ‌دەكەم نائومێد مەبن بەو ناخۆشیانەی لەپێناوی ئێوە دەیچێژم، چونكە شكۆمەندیە بۆ ئێوە.
14 لەبەرئەوە چۆك دادەدەم بۆ خودای باوك، 15 ئەوەی لە ئەودا هەموو باوكایەتیەك لەئاسمانو لەزەویدا ناونراوە. 16 لێی دەپاڕێمەوە بەپێی دەوڵەمەندی شكۆمەندی خۆی هێزتان پێ ببەخشێ بەهۆی ڕۆحی خۆی لەناخی مرۆڤ، 17 تا مەسیح بە باوەڕ لەدڵتان نیشتەجێ بێ، ڕەگو بناغەتان لەسەر خۆشەویستی دامەزرێ، 18 هەروەها هێزتان هەبێ بۆ تێگەیشتن لەگەڵ هەموو خوشكو برا پیرۆزەكان سەبارەت بە درێژیو پانیو قووڵیو بەرزی خۆشەویستی مەسیح، 19 ئەوسا ئەو خۆشەویستیە دەناسن كە لە سەرووی هەموو زانستێكە، بۆ ئەوەی پڕ بن لەهەموو پڕی خودا.
20 بۆ خودای توانادار بەپێی ئەو هێزەی تیاماندایە كار دەكات، زۆر زیاتر لەوەی داوای دەكەین یاخود

بـیری لـیّدەکەیـنەوە، [21]بـۆ ئـەوە شـکۆمەندی لەکۆمەڵی باوەڕدارانو لەعیسـای مەسیح بۆ هەموو نەوەکان تاهەتایە. ئامین.

## یەك لەشو یەك ڕۆح

# 4

مـنی بەندکـراو لـەپێناوی خوداوەند، داوتـان لێدەکـەم بەشـێوەیەك بژیـن شـایانی ئـەم بانگەوازە بێ کە ئێوەی پێ بانگ‌کراوە. [2]بە هەموو ساکاریو نـەرمونـیانیو ئـارام گرتـنەوە، بـە خۆشەویستی لەیەکتری قبوڵ بکەن. [3]بەپـەرۆش بـن بـۆ پاراسـتنی یەکێتی ڕۆح بـەو ئاشـتییەی بەیەکـەوە دەتان بەسـتێتەوە. [4]چـونکە یەك لـەشو یەك ڕۆحـتان هەیـەو لەیـەك هـیوادا ئێوە بـانگ کراون، [5]یەك خوداوەندو یەك باوەڕو یەك لەئاوهەڵکێشانمان هەیە. [6]یــەك خــودا بــاوکی هەموانــە، لــەســەرووی هەموانــە، بــەهۆی هەموانەوەیەو لەناو هەمواندایە.

[7]بـەڵام هـەر یەکەمان بەشی هەیە لـە بەرەکـەتی خـودا، بەپێی پێوانەی بەرەکـەتی مەسـیح، [8]لـەم بارەیـەوە کتێبی پیرۆز دەڵێ:

}کاتێ ئەو بەرزبووەوە بۆ ئاسمان،
خەڵکی بەدیل‌گرت،
دیاری بەخەڵکی بەخشی.{

[9]کە دەووترێ (بەرزبووەوە) تەنها مانـای ئەوەیـە، هەر ئەویش بوو هاتە خـوارەوە بۆ نزمترین شوێنی زەوی. [10]ئەوەی هاتە خوارەوە بۆ سەر زەوی هـەر ئەویش بوو بەرزبووەوە بۆ سەر هەموو ئاسمانەکان، تا هەموو شتێك پڕ بکاتـەوە. [11]بەهەندێکی بەخشیوە ببن بـە نێرراو، هەندێك بە ووشەی خودا بدوێـن، هەندێك ببن بە مزگێنیدەرو هەندێکی تر ببن بە شوانو مامۆستا، [12]بـۆ ئامادەکـردنی خوشـكو بـرا پیرۆزەکـان بـۆ کـاری خزمەتکـردن لەپێـناوی بنیادنانی لـەشی مەسیح، [13]هـەتا هـەموومان بگـەین بـە یەکێـتی بـاوەڕو ناسـینی ڕۆڵـەی خودا، ببین بەمرۆڤـێکی پێگەیشـتوو، بگـەین بـە ئاستی تەواوی باڵای مەسیح.

[14]ئەمـەش بـۆ ئـەوەی ئـیتر وەك مـندالْ نەمێنینـەوە، شـەپۆڵ بمانهێنێو بمانـبات، هـەروەها هـەر بایـەکی فـێرکردنەکان هەڵـبکات لەگـەڵ خۆیـان بـبات، بەسـاختەی مـرۆڤ بەلێزانینـیان لەفێڵـبازی کـە بـەرەو تاریکـیمان دەبات. [15]بەڵکو لەجیاتی ئەمـە ڕاسـتگۆ بـن لەخۆشەویسـتی،

گەشە بکەن لەهەموو شتێك بەهۆی ئەو، ئەوەی سەرە، واتە مەسیح. [16] بەهۆی ئەو هەموو ئەندامەکانی لەش تێك هەڵکێشراوەو بەیەکەوە بەستراوەتەوە بەجومگەکان، بەگوێرەی پێوانەی کارکردنی هەر ئەندامێك، بەمە لەش گەشە دەکاتو خۆی بنیاد دەنێ لەخۆشەویستی.

**ژیانی نوێ لەمەسیح**

[17] من ئەمەتان پێ دەڵێم، بەناوی خوداوەندەوە شایەتی دەدەم، ئێوە پێویستە ئیتر لەمەولا وەك گەلانی بێ باوەڕ نەژین، ئەوانە بیریان هیچو پووچە، [18] مێشکیان تاریکەو دوورن لەژیانی خودا بەهۆی ئەو نەزانیەی تیایاندایەو بەهۆی دڵڕەقیان. [19] هەستیان نەماوەو خۆیان داوەتە دەست بەرەڵایی، چاوچنۆکن بۆ کردنی هەموو جۆرە کردارێکی گڵاو.

[20] بەڵام ئێوە بەم شێوەیە مەسیح فێرنەبوون. [21] گەر گوێتان لێی گرتووەو ئەو شتانەی لێ فێربوون هەروەك ڕاستە لەعیسا، [22] بۆ داکەندنی مرۆڤە کۆنەکە کە بەگوێرەی ڕەفتاری پێشووتانە، گەندەڵە بەهۆی ئارەزووە ساختەکانی، [23] هەروەها بەهۆی ڕۆحی پیرۆز مێشکتان تازە بکەنەوەو [24] مروڤی نوێ لەبەر بکەن کە لەشێوەی خودا دروستکراوە لەڕاستودروستیو پاكوپیرۆزی ڕاستەقینە.

[25] لەبەرئەوە واز لەدرۆ بهێنن، {با هەر یەکە ڕاستگۆ بێ لەگەڵ نزیکەکەی}، چونکە ئێمە ئەندامین بۆ یەکتری. [26] {تووڕەبن بەڵام گوناە مەکەن}، بە تووڕەیی مەمێننەوە تا ڕۆژئاوا دەبێ، [27] دەرفەت بە شەیتان مەدەن. [28] ئەوەی جاران دز بووە، بائیتر لەمەولا دزی نەکا، بەڵکو لەجیاتی ئەوە بەدەستی کارێکی پاك بکات، تا بەوەی هەیەتی یارمەتی ئەوانە بدات کە پێویستیان بە یارمەتییە.

[29] با ووشەی خراپ لە دەمتان نەیەتە دەرەوە، بەڵکو باش بێت بۆ بنیادنانو بەگوێرەی پێویست بێ، تا بەرەکەت بدات بەوانەی دەیبیستن. [30] خەفەت بەڕۆحی پیرۆزی خودا مەدەن، ئەوەی پێی مۆرکران بۆ ڕۆژی ڕزگاری. [31] خۆتان دووربخەنەوە لەتاڵی، ڕقوکینە،

تووڕەیـــی، هاوارکـــردن بەســـەر یەکتری، بوختانو هەموو دڵڕەشیەك. [32]زمـان شـیرین بـن لـەگەڵ یەکتری، بەبـەزەیی بـن، لـە یەکتری خۆش بن هـەروەك چـۆن خودا بەهۆی مەسیح لەئێوە خۆش بووە.

## وەکو ڕۆڵەی ڕووناکی بژین

# 5

کەواتـە لاسـایی خودا بکەنەوە، وەك ڕۆڵـــەی خۆشەویســـتی، [2]بـــە خۆشەویستی هەڵسـوکەوت بکەن، وەك مەســـیح چـــۆن ئـــێمەی خۆشویســـتو لەپێناوی ئـێمە خۆی کـرد بەقوربانی، ئەو قوربانییەی لای خودا بۆنخۆشو پەسەندکراوە.

[3]بـەڵام داوێـنپیسـیو گـڵاویو چاوچـــنۆکی لەخوشـــكو بـــرا پیرۆزەکـــان ناوەشـــێتەوە، ئـــێوەش لەنێوانتان با ئەو شتانە ناویشی نەبێ. [4]هـــەروەها قســـەی ناشـــیرینو ســـووكو هـیچوپووچ شـایـانـی ئـێوە نـیـە، بـەڵكو باشترە بۆتان دەم بەسـوپـاس بـــن، [5]بێگومــان بـــن لـــەوەی هـــەمـــوو داوێـنپیسو گـڵاو و چاوبرسییەك بـتپەرسـتە، میراتـی نیـە لەپادشـاهێتی مەسـیحو خودا. [6]باکەس بەووشەی هیچوپووچ هەڵـتاننەخەڵەتێـنیێ، چـونکە بەهۆی ئـەو شـتانە تووڕەیـی خـودا بەسـەر ڕۆڵـەکانی یـاخیبوون دێت. [7]لەبەر ئـەوە لەگـەڵ ئەو کەسانەدا بەشداری هیچ شتێك مەکەن.

[8]جـاران ئـێوەش تـاریکی بوون، بـەڵام ئێسـتا ڕووناکین لەخوداوەند، کەواتـــە وەك ڕۆڵـــەی ڕوونـــاکی هەڵســـوکەوت بکـــەن- [9]چـــونکە بـەروبوومی ڕووناکی لەهەموو باشەو دروسـتیو ڕاسـتیەك دایە – [10]هەوڵ بدەن ڕەزامەندی خودا بدۆزنەوە. [11] بەشـــداری کـــاری هـــیچو پووچـــی تـاریکی مەکـەن، بـەڵكو ئاشـکرای بکەن. [12]ئەو کارانەی ئەوان بە نهێنی دەیکـــەن، تەنانـــەت ناوهێـــنانی شـەرمەزارییە. [13]بـەڵام هەموو شتێك کە ئاشکرا کرا بەڕووناکی دەبینرێ، [14]چـونکە هـەر شتێك کە بینرا ئەوە ڕووناکییە. بۆیە ووتویەتی:

(ئەی نووستو خەبەرت بێتەوە،
لەنێو مردووان هەستەوە،
تامەســـــیح بەســـــەرت
بدرەوشێتەوە.)

[15]کەواتــە بـــەووردی ئاگاتـــان لەهەڵسوکەوتی خۆتان بێ، نەك وەك

خـەڵكی نـەفام، بـەڵكو وەك مرۆڤی دانـا. [16]هـیچ كاتـێك بەفیرۆ مەدەن، چونكە زەمانە بەدكارە. [17]لەبەر ئەوە نـەفام مـەبن، بەڵكو تێبگەن خواستی خوداوەنـد چـییە. [18]خۆتـان بەمـەی سەرخۆش مەكەن، چونكە بەرەڵڵایی تـیادایە، بەڵكو خۆتان بەرۆحی پیرۆز پـڕ بكـەن، [19]لەگـەڵ یـەكتری بـەزەبوورو سـروودو گۆرانی رۆحی بدوێـن، بەهـەموو دڵـتان گۆرانـیو سـتران بۆ خوداوەند بڵێن، [20]هەموو كاتێ سوپاسی خودای باوك بكەن بۆ هـەموو شـتێك بـەناوی عیسـای مەسـیحی خوداوەنـد، [21]ملكەچـی یەكتری بن بەترسی عیسای مەسیح.

### ژنو مێردەكان

[22]ئـەی ئافـرەتان ملكەچـی مێردەكانـتان بـن هـەروەك بـۆ خوداوەنـد، [23]چـۆن مەسـیح سەری كۆمەڵـەی باوەڕدارانـە كـە لەشـی خۆیـەتیو خۆی رزگاركەریەتی، ئاوا پیاو سەری ژنە. [24]جا چۆن كۆمەڵی بـاوەڕداران ملكەچ دەبێ بۆ مەسیح، هـەروەها بـا ژنانـیش ملكـەچ بن بۆ مێردەكانیان لەهەموو شتێك.

[25]ئـێوەش ئەی پیاوان، ژنەكانتان خـۆشبـوێ هـەروەك مەسـیح چۆن كۆمەڵـەی باوەڕدارانی خۆشویستو خۆیكـرد بە قوربانی لەپێناوی. [26]تا پـیرۆزی بكـاتو پاكیبكاتـەوە بەشووشـتن بـەئـاو و بەووشـە، [27]تا كۆمەڵـێكی شكۆدار بۆ خۆی ئامادە بكات، بێ لەكەو لۆچو هەر شتێكی وەك ئەوانـە بـێ، پـاكو پـیرۆزو بـێ كـەموكـوڕی بـێ. [28]پێویستە لەسەر پـیاوان ژنـی خۆیان خۆشبوێ، وەك لەشـی خۆیـان خـۆشدەوێ، ئەوەی ژنەكـەی خـۆشبـوێ خـۆی خۆشدەوێ. [29]هەرگیز هیچ كەسێك رقـی لە لەشی خۆی نابێتەوە، بەڵكو خۆراكی دەداتیو بایەخی پێدەدات، بـە هـەمان شـێوە مەسـیح بایـەخ بەكۆمـەڵی بـاوەڕداران دەدات. [30] [31]چونكە ئێمە ئەندامی لەشی ئەوین، {لەبەرئـەوە پیاو دایكو باوكی خۆی بەجێدەهـێڵێو لەگـەڵ ژنەكـەی یـەكدەگـرێ، ئەوسـا هـەر دووكیان دەبـن بەیەك لەش.} [32]ئەمە نهێنیەكی گەورەیـە، ئەمـە دەڵـێم سـەبارەت بـەپـەیوەندی مەسـیح بەكۆمـەڵی بـاوەڕداران. [33]لەبەرئەوە با هەر یەك لەئـێوە ژنەكـەی وەك خـۆی خـۆشبـوێ، ژنـیش دەبـێ رێـزی

مێردەکەی بگرێ.

### دایكو باوكو منداڵ

# 6

ئـەی مـندالاَن گوێـڕایەڵی دایـكو باوکتان بن لەخوداوەند، چونکە ئەمە ڕاسـتە. [2]{ڕێـزی دایـكو باوکـتان بگـرن}، ﴿ئەمـە یەکەم ڕاسپاردەیە بە بەڵێـنەوەیە﴾، [3]{تـاوەکو چـاکە بێتە ڕێگـاتو تەمەنـت درێژ بێت لـەسەر ئەم زەویە.}

[4]ئـێوەش ئـەی باوکـان، ڕقـی منداڵەکانـتان هـەڵمەسـتێنن، بـەڵکو بەخـێویان بکـەن بەپـێی ڕاسـپاردەو تەمێکردنی خوداوەند.

### کۆیلەو گەورەکانیان

[5]ئـەی کۆیلـەکان، گوێـڕایەڵی گەورەکانـتان بـن لەسـەر ئەم زەویە بەترسو لەرزو دڵسۆزییەوە، هەروەك بـۆ مەسـیح بێـت. [6]خزمەت مەکەن لەبەرچـاو تا خەڵکی لێتان ڕازی بێ، بـەڵکو بـەهـەمـوو دڵـتانەوە وەك کۆیلەیـەکی مەسیح بەخواستی خودا کـار بکـەن. [7]باخـزمەت کردنـتان بـەدڵسـۆزی بێ وەك بۆ خوداوەندی بکـەن نـەك بـۆ خـەڵکی. [8]بـزانن خـوداوەنـد پاداشتی هەموو کەسێك دەداتـەوە، کۆیلـە بێـت یاخود ئازاد بەپێی کرداری چاکی.

[9]ئـێوەش ئـەی گـەورەکان، بـە هـەمان شـێوە هەڵسـوکەوت بکـەن لەگەڵ کۆیلەکانتان، لەهەڕەشەکردن دووربکـەون، بزانن گەورەی ئەوانو ئـێوە لـەئاسمانـە، ئـەویش لایەنگیری کەس ناکات.

### چەکی تەواوی خودا

[10]لـە کۆتایـیدا بەهـێزبن لـە خوداوەنـدو لـە هێزە مەزنەکەی. [11]خۆتـان چـەکدار بکـەن بەچـەکی تـەواوی خـودا، تـا بـتوانن بەرامبەر پلانـەکانی شەیتان خۆتان ڕاگرن. [12]چـونکە زۆرانـبازی ئـێمە لەگـەڵ گۆشـتو خوێـن نیـیە، بـەڵکو دژی سـەرۆکەکانو دەسـەڵاتدارانی ڕۆحە بەدکارەکانـە، هـەروەها دژی فەرمانڕەوایانی تاریکی ئەم سەردەمەی

---

❖ سـپەر: بـە عـەرەبی (درع)، پۆشـاکێکە لـەمیـتاڵ دروسـت دەکـرێ، جـەنگاوەران بۆ خۆپاراستن لـەکاتی شەڕدا لـەبەری دەکەن.

جیهانە، دژی سەربازە ڕۆحیەکانی شەیتانە لەئاسمان. [13] لەبەر ئەوە خۆتان چەکدار بکەن بە چەکی تەواوی خودا، هەتا لەڕۆژی بەدکار، بتوانن دژی بوەستن، هەروەها دوای تەواو بوونی هەموو شتێك، بچەسپێن. [14] بۆیە چەسپاوبن. با ڕاستی پشتێن بێت بەناو قەدتان، سپەری* ڕاستودروستی بە سنگتانەوە بێت، [15] هەروەها ئامادەبوونتان بۆ بڵاوکردنەوەی مزگێنی ئاشتی پێڵاو بێت لەپێتان، [16] لەسەرووی هەموو ئەوانە، قەڵغانی باوەڕ هەڵگرن، بەهۆیەوە هەموو تیرە گڕدارەکانی شەیتان دەکوژێننەوە. [17] هەروەها کڵاوی ئاسنینی ڕزگاری لەسەرتان بکەن، شمشێری ڕۆح هەڵگرن کە ووشەی خودایە. [18] هەموو کاتێك لەنوێژکردن بن بەڕۆح، بۆ هەموو نوێژکردنو پاڕانەوەیەك شەوارە بگرنو هەر بەردەوامبن لەسەر پاڕانەوەکەتان لەخودا لەپێناوی خوشكو برا پیرۆزەکان.

[19] هەروەها بۆ منیش تاخودا ووشەی گونجاوم بداتێ کاتی دەمم دەکەمەوە، تابتوانم بێترس نهێنی مزگێنی ڕابگەێنم، [20] ئەوەی لەپێناوی‌دا باڵیۆزم لەناو کۆتو زنجیر، هەتا بەچاونەترسی ئاشکرای بکەم، بەو شێوەیەی پێویستە لەسەرم بدوێم.

**سڵاوی کۆتایی**

[21] جا تا ئێوەش بزانن هەواڵم چییەو خەریکی چیم، تیخیکۆس، برای خۆشەویستمو خزمەتکاری سەرڕاست لە خوداوەند، هەموو شتێکتان پێ ڕادەگەینێ. [22] بەتایبەتی ئەو دەنێرم بۆ لاتان تا هەواڵی ئێمەتان بداتێو وورەتان بەرزبکاتەوە.

[23] با ئاشتی بۆ برایان بێت لەگەڵ خۆشەویستی بەباوەڕ لەخودای باوكو عیسای مەسیحی خوداوەند. [24] بەرەکەت لەگەڵ هەموو ئەوانە بێت، کە عیسای مەسیحی خوداوەندیان خۆشدەوێت بەخۆشەویستیەکی نەفەوتاو.

# نامەی پۆڵس بۆ باوەڕدارانی فیلیپی

*فیلیپی یەکێك بوو لەشارەکانی ولایەتی مەکدۆنییەی ڕۆمانی. یەکەم کۆمەڵەی باوەڕداران لەئەورووپا لەم شارە دامەزرا لەسەر دەستی پۆڵس.*

*ئەم نامەیەش لەکاتێکدا نووسرا کە پۆڵس زیندانی بوو لەڕۆما. تیایدا باسی یەکبوون لەمەسیحو ئەو خۆشییەی لەخوداوەند هەیە دەکات. ڕێگای باوەڕ بەمەسیح وەك ڕێگای شادیو بەختەوەری دەردەخات لەژێر هەر بارودۆخێك بێ، چونکە مەسیح بەتەنیا بەسە بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەر بارودۆخێك. سروودی باوەڕی سەرکەوتوو و خۆشی پیرۆزە، پۆڵسی زیندانکراو لەپێناوی خوداوەند لەم نامەیە دووپاتی دەکاتەوە کە ئەو مەسیحی هەیەو مەسیحیش هەموو شتێکە لەلای ئەو. هەروەها هەوڵدەدا بەو ئەنجامە شکۆدارە بگات کە کۆتایی هەموو ئامانجەکانە، لەو کاتەشدا پاداشتی خۆی بەدەستدەهێنێ.*

# 1

لەپۆڵسو تیمۆساوسی کۆیلەکانی عیسای مەسیح، بۆ هەموو خوشكو برایانی پیرۆز لەعیسای مەسیح لەشاری فیلیپی، هەروەها بۆ چاودێرانو خزمەتکارانیش. [2]با بەرەکەتو ئاشتی خودای باوکمانو عیسای مەسیحی خوداوەندتان لەگەڵ بێ.

**سوپاسی خوداو پاڕانەوە**

[3]سوپاسی خودا دەکەم هەرکاتێك یادتان بکەم، [4]هەموو کاتێك بەخۆشییەوە بۆ هەمووتان دەپاڕێمەوە لای خودا، [5]چونکە ئێوە لەیەکەم ڕۆژەوە تا ئێستا بەشداریتان کردووە لەمزگێنی. [6]هەروەها دڵنیام ئەو ئیشە چاکەی خودا لەئێوە دەستی پێکردووە، بەردەوام دەبێت لەتەواوکردنی هەتا ڕۆژی عیسای مەسیح.

[7]ئەوەش مافی خۆمە گەر واهەست بکەم سەبارەت بە هەمووتان، چونکە ئێوەم لەدڵی خۆم پاراستووە، هەمووتان لەگەڵم بەشداری دەکەن لەبەرەکەت، گەر ئێستا بێت بەم کۆتو زنجیرە لەبەندیخانەدا، یاخود کاتێك بەرگری

لـەمزگێنی دەکـەمو دەیچەسپێنم. [8] خـودا دەزانێـت تـا چ ڕادەیەك دڵم ئـارەزووی هـەمووتان دەکـات بەهەستو سۆزی عیسای مەسیح.

[9] لـەخودا دەپاڕێمـەوە خۆشەویستیتان زیاترو زیاتر بکات بۆ زانینو تێگەیشتنی تەواو، [10] تا ئەوەی باشـە هەڵبـژێرن، هەروەها پاكو بێ کـەموکووڕی بن بۆ ڕۆژی مەسیح. [11] ژیانـتان پڕبێـت لـەبـەرووبوومی ڕاسـتودروسـتی، ئـەوەی عیسـای مەسـیح دەیهێنێـتە بەرهەم، بۆ شکۆو ستایشی خودا.

**لەلای من، ژیان مەسیحە**

[12] ئـەی بـرایان، ئێسـتا دەمـەوێ بـزانن ئـەوەی بەسەرم هات بەڕاستی مزگێـنی بـەرەو پێش برد، [13] تەنانەت هـەموو پاسەوانانی ئیمپراتۆرو هەموو خـەڵکی ئـێرە، دەزانـن من لەپێناوی مەسـیحدا بەندکـراوم، [14] هـەروەها بەندکـردنو کـۆتو زنجـیری مـن وای‌کـرد زۆربـەی خوشـكو برایان پشت بەخوداوەند ببەستنو زۆر زیاتر بـە چاونەترسـی سەبارەت بەووشەی خودا بدوێن.

[15] بێ‌گومـان هەندێکـیان مزگێنی مەسـیح دەدەن تەنها لـەبەر ناحەزیو ڕقەبەرایـەتی، بـەڵام هەندێکی‌تـریان بەخواستێکی باش مزگێنی دەدەن. [16] هەروەها ئەوانەی خۆشەویستی پاڵیان پێوە دەنێت مەسیح ڕابگەێنن، دەزانن مـن خـراومەتە بەندیخانـەوە بـەهۆی بەرگـریم لەمزگێـنی. [17] ئەوانـەی ناحـەزی پاڵـیان پـێوە دەنێـت باسی عیسا بکەن، بەبێ دڵسۆزی دەیکەن، چـونکە لـەو بـاوەڕەدان بەمـە ناخۆشـییەکی تـر دەخەنـە پـاڵ ئـەم کـۆتو زنجـیرە. [18] ئیتر چی؟ گرنگ ئەوەیـە باسی مزگێنی مەسیح دەکرێ ئـیتر بـە هـەر شـێوەیەك بێـت بـۆ خـۆدەرخسـتن بێـت یـاخود بـە دڵسـۆزی بێت، بەمەش من دڵشادم. بـەڵێ پێویسـتە مـن دڵشـاد بم، [19] چـونکە مـن دەزانم بـەهۆی نوێژەکانـتانو بـەیارمـەتی ڕۆحـی عیسـای مەسیح ئەوەی بەسەرم هات دەبێتە هۆی ڕزگار بوونم. [20] پەرۆشی چاوەڕوانمو ئومێدم ئەوەیە، شەرمەزار نـەبم، بـەڵکو بەوورەیـەکی بـەرزەوە ئێسـتا وەك هـەموو کاتـێك مەسـیح لەلـەشمدا ڕێـزداربێ، گـەر ئەمـە بـە مـردوویی بێت یاخود زیندوویی. [21] چـونکە لـەلای مـن، ژیان مەسیحە،

مردنیش قازانجە. [22]بەڵام گەر ژیان لەلەش بێ، مانای ئەوەیە بەرووبوومی کردارەکانە بۆ من، لەگەڵ ئەوەشدا نازانم کامیان هەڵبژێرم! [23]چونکە سەرسام ماوم لە نێوان ئەم دوو بڕیارەدا، حەز دەکەم ئەم ژیانە بەجێ بهێڵم تا بچمە لای مەسیح، ئەمەش باشترە، [24]بەڵام مانەوەم لە لەش پێویستترە بۆتان، [25]دڵنیام لەمە بۆیە دەزانم دەبێ لەناوتان بمێنمەوەو لەگەڵ هەمووتان بەردەوام بم، لەپێناوی دڵخۆشیو پێشکەوتنتان لەباوەڕ، [26]تا جارێکی تر هاتم بۆ لاتان، بەهۆی من شانازیتان زیاد بکات بەعیسای مەسیح.

[27]ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئێوە بە شێوەیەك بژین شایستەی مزگێنی مەسیح بێ، تا کاتێ هاتمو ئێوەم بینی یاخود لەناوتان نەبووم، هەواڵتان ببیستمو بزانم ئێوە لەیەك ڕۆح چەسپاونو بەیەك مێشك تێدەکۆشن لەپێناوی باوەڕی مزگێنی، [28]بێ ئەوەی بترسن لەوانەی بەربەرەکانیتان دەکەن. چونکە ئەوە نیشانەی لەناوچوونە بۆیانو ڕزگاریە بۆ ئێوە، ئەمەش لەخوداوەیە. [29]خودا لەبەر مەسیح تەنها باوەڕهێنان بە ئەوی پێ‌تەبەخشیون، بەڵکو چەشتنی ئازاریش لەپێناوی ئەو. [30]جا کۆشش بکەن بۆ هەمان ململانێ کە لەپێشا بینیوتانە، ئەوەی ئێستاش دەیبیستن لەمن.

### نموونەی ڕۆح سووکی عیسا

## 2

گەر هاندانێك هەبێت لەمەسیحدا، یاخود بزوێنەرێك هەبێ لەخۆشەویستی، یابەشداری کردنێك هەبێ لەڕۆح، یاهەستو سۆزو خۆشەویستی، [2]کەواتە خۆشیەکەم تەواوکەن بەوەی یەك بیروڕاو خۆشەویستیتان هەبێ، یەك دڵو یەك مەبەستتان هەبێ. [3]هیچ شتێك بە مەبەستی خۆپەرستیو خۆهەڵکێشان مەکەن، بەڵکو ڕۆح سووك بن بە شێوەیەك خەڵکی کە بە باشتر بزانن لەخۆتان. [4]تەنها بایەخ بە بەرژەوەندی تایبەتی خۆتان مەدەن، بەڵکو بایەخ بە بەرژەوەندی خەڵکی تریش بدەن.

[5]ئەم بیروڕایەتان تیادا بێ، ئەوەی
لە عیسای مەسیح دایە:
[6]ئەوەی لەشێوەی خودا بوو،
نەیویست یەکسانیەکەی لەگەڵ خودا

بکات بەدەسکەوتێك بۆ خۆی،
[7]بەڵکو خۆی کردە هیچو
شێوەی کۆیلەی وەرگرت،
وەکو مرۆڤی لێهات،
[8]هەروەها لەگەڵ ئەوەی ئەو لەشێوەی
مرۆڤ بینرا،
خۆی نزم کردەوەو
ملکەچ بوو تا مردن،
مردن لەسەر خاچ.
[9]بۆیە خودا بەرزی کردەوەو
ناوێکی دایە کە لەسەرووی هەموو ناوێکە،
[10]تاکو بۆ ناوی ئەو هەمووان چۆك دابدەن،
لە ئاسمانو سەر زەویو ژێر زەویش،
[11]هەروەها تا هەموو زمانێك دان بنێت کە عیسای مەسیح خوداوەندە،
بۆ شکۆمەندی خودای باوك.

**ڕۆڵەکانی خودا بێکەموکوڕین**

[12]جا ئەی خۆشەویستانم، چۆن گشت کات گوێڕایەڵ بوون هەر وابن، نەك هەر ئەم کاتەی لێرەم، بەڵکو زیاتریش دوای من، بۆ ڕزگاربوونتان بەترسو لەرزەوە کار بکەن، [13]چونکە خودا خۆی لەئێوە کار دەکات تا ئارەزووی کارکردنتان پێبەخشێ بۆ ڕەزامەندی خۆی.

[14]هەموو شتێك بکەن بێ بۆڵەبۆڵو شەڕەقسە، [15]تا بێکەموکوڕیو پاكبن، ڕۆڵەکانی خودا بێ لەکەن لەناو نەوەیەکی خراپو چەوتو خواردا، ئێوە لەنێوان ئەواندا وەك ڕووناکی جیهان دەدرەوشێنەوە. [16]دەست بەووشەی ژیانەوە بگرن، تا لەڕۆژی مەسیح شانازی بکەم بەوەی بەخۆڕایی تێنەکۆشاومو بێسوود ماندوونەبووم. [17]گەر بمرمو خوێنم بەسەر قوربانی باوەڕتان بڕژێ، ئەوا لەگەڵتان دڵشادو دڵخۆشم. [18]کەواتە ئێوەش پێویستە لەگەڵم دڵشادو دڵخۆش بن.

**تیمۆساوسو ئەپفرۆدیتۆس**

[19]هیوادارم لەعیسای خوداوەند بتوانم بەم زووانە تیمۆساوس بنێرم بۆ لاتان، تا هەواڵتان بزانمو پێی دڵخۆش بم. [20]جگە لەو کەسیترم نییە وا بەدڵسۆزی بایەختان پێبدات، [21]چونکە هەموو ئەوانیتر بەدوای

کاروباری تایبەتی خۆیان دەگەڕێن، نەك هی عیسای مەسیح. [22]ئێوە لەشارەزایی تیمۆساوس ئاگادارن، وەك کوڕێك لەگەڵ باوکی لەگەڵم کاری کردووە لەمزگێنی. [23]ئەو دەنێرم بۆ لاتان، هەر کاتێك لێرە چارەنووسم دەربکەوێ. [24]دڵنیام لەخوداوەند کە خۆشم بەم نزیکانە دێم بۆ لاتان.

[25]بەڵام بەپێویستم زانی لەپێشا ئەپفرۆدیتۆس بنێرمەوە بۆ لاتان، کە برامەو لەگەڵم ئیشکەرو سەربازە، ئەوەی نێرراوی ئێوەیە بۆ جێبەجێ کردنی پێویستیەکانم. [26]ئەو بیری هەمووتان دەکاتو دڵتەنگە چونکە هەواڵی نەساغی ئەوتان بیستووە. [27]بەراستی زۆر نەساغ بوو، هەتا خەریك بوو بمرێت، بەڵام خودا بەزەیی پیاهاتەوە، هەروەها بە منیش، تا خەفەت بەدوای خەفەتم بەسەرنەیەت. [28]بەمەش وای لێکردم خێرا بینێرمەوە بۆ لاتان، بۆ ئەوەی دڵشادبن کاتێك بینیتان، منیش خەفەتم کەمبێتەوە. [29]کەواتە بەدڵشادیەوە لەخوداوەند پێشوازی لێبکەن، هەروەها ئەوانەی وەك ئەون ڕێزیان لێبگرن. [30]چونکە لەپێناوی ئیشی مەسیح ژیانی خۆی خستە مەترسیەوەو خەریك بوو بمرێت، تا ئەو خزمەتە تەواو بکات ئەوەی ئێوە بۆ من دەیکەن.

## بێتاوان بوون بەهۆی باوەڕ

# 3

لە کۆتاییدا، ئەی برایان، دڵشادبن بەخوداوەند، لای من نووسینەوەی ئەم شتانە کارێکی گران نییە چونکە دڵنیایی ئێوەی تیایە.

[2]چاوبڕنە سەگەکان، چاوبڕنە بەدکاران، چاوبڕنە ئەوانەی لەش دەبڕنەوە. [3]ئێمەین خەتەنەکراوی ڕاستەقینە، چونکە خودا بەڕۆح دەپەرستینو شکۆمەندیمان لەعیسای مەسیحەوەیە، پشت بەلەش نابەستین، [4]هەرچەندە من هۆم هەیە تا پشت بە لەش ببەستم.

گەر یەکێك لەو باوەڕە بێت هۆی هەیە پشت بە لەش ببەستێ، یەکەمجار مافی منە ئەوە بکەم: [5]کاتێك تەمەنم هەشت ڕۆژ بووە خەتەنەکراوم، بە نەوە ئیسرائیلی بووم، لەتیرەی بینیامین، عیبرانی* کوڕی عیبرانی. هەروەها بەپێی شەریعەت فەریسی بووم، [6]لەبارەی

دڵگەرمی چەوسێنەری کۆمەڵەی باوەڕداران بووم، لەڕاستودروستی بەپێی شەریعەت بێکەموکوڕی بووم.

[7] بەڵام ئەم شتانەی من بە قازانجم دادەنا، ئێستا لەلای من زیانە لەپێناوی مەسیح. [8] بەڵکو لەمەش زیاتر، ئەو شتانە هەمووی زیانە لای من گەر بەراورد بکرێت لەگەڵ مەزنی بێسنووری ناسینی عیسای مەسیحی خوداوەندم، ئەوەی لەپێناویدا هەموو شتێکم لەکیسچوو، جا ئەم شتانە هەمووی بە زبڵ دادەنێم، بۆ ئەوەی مەسیح بەدەست بهێنمو [9] خۆم لەمەسیح بدۆزمەوەو ڕاستودروست بم، نەك بەشەریعەت، بەڵکو بەهۆی باوەڕ بەعیسای مەسیح، چونکە بێتاوان بوون لای خودا پشت بەباوەڕ دەبەستێت. [10] ئەوەی مەبەستی منە ناسینی مەسیحو هێزی هەستانەوەیەتی، هەروەها بەشداری بکەم لەئازاری، وەك ئەو بم لەمردنی، [11] تاکو گەر ببێ بگەم بەئاستی هەستانەوەی لەنێو مردووان.

**کۆششکردن بەدوای ئامانج**

[12] من ناڵێم ئەم شتانەم هەموو بەدەستهێناوە یاخود گەیشتوومە تەواوی، بەڵکو هەر چییەکم لەتوانا هەیە دەیکەم تا بیکەم بەهی خۆم، ئەوەی مەسیح لەپێناویدا منی کردووە بەهی خۆی. [13] ئەی برایان، جارێ وایدانانێم گەیشتوومە ئامانج، بەڵام تەنها یەك شت دەکەم، ئەویش ئەوەیە، ئەوەی بەسەرچووە لەیادی دەکەم، دەڕۆم بەرەو ئەوەی لەپێشمە. [14] من بەرەو ئامانج هەوڵ دەدەم، بەرەو پاداشتی بانگەوازی بەرزی خودا کە لەعیسای مەسیحە.

[15] با وا بیربکەینەوە ئێمە پێگەیشتووین، گەر ئێوەش لەخاڵێك یان لەبیرورایەك هەمان بیرورای منتان نەبوو، ئەوا خودا بۆتان ئاشکرا دەکات. [16] جا ئەوەی پێی گەیشتووین با بەدڵسۆزی دەستی پێوە بگرین.

[17] ئەی برایان بەیەکەوە لاسایی من بکەنەوەو تەماشای ئەوانە بکەن کە وەك نموونەی من دەژین. [18] زۆر پێموووتون، ئێستاش بەگریانەوە پێتان دەڵێم، زۆر کەس هەن ژیانیان بەشێوەیەکە وەك دوژمن وایە بۆ خاچی مەسیح. [19] ئەوانە پاشەڕۆژیان

لەناوچوونە، چونکە سکیان دەپەرستن‌و شکۆمەندیان جێی شەرمەزارییە، هەموو بیرو هۆشیان لەسەر شتی جیهانیە. [20]بەڵام ئێمە وولاتمان لەئاسمانە، لەوێ بەئارەزووەوە چاوەڕێی هاتنەوەی ڕزگارکەر، عیسای مەسیحی خوداوەندی تیادا دەکەین، [21]ئینجا ئەو لەشی بێ‌ترخمان دەگۆڕێت بۆ شێوەی لەشی شکۆداری خۆی، بەهێزی خۆی کە توانای هەیە زاڵبێت بەسەر هەموو شتێك.

## دڵشادبن بەخوداوەند

# 4

لەبەرئەوە برایانی خۆشەویست، ئەی ئەوانەی زۆر بیرتان دەکەم، ئێوە خۆشی‌و تاجی سەری منن، با باوەڕتان چەسپاو بێت بەخوداوەند.

[2]لەخوشکان ئەفودیەو سینتخی دەپاڕێمەوە، لەگەڵ یەکتری ڕێك‌بکەون لەخوداوەند. [3]تۆش ئەی هاوڕێی دڵسۆزم، داوات لێ‌دەکەم یارمەتی ئەو دوو ئافرەتە بدەیت، چونکە هەر دووکیان لەگەڵم لەمزگێنی تێکۆشاون، ئەوان لەگەڵ ئەکلیمندوس‌و ئەوانەی لەگەڵم ئیش دەکەن ناویان لەپەرتووکی ژیان نووسراوە.

[4]هەمیشە دڵشادبن بەخوداوەند، جارێکی‌تر پێتان دەڵێم، دڵشادبن. [5]با ڕووخۆشیتان دیار بێت لای هەموو خەڵك. هاتنەوەی خوداوەند نزیکە.

[6]دەربارەی هیچ شتێك دڵەڕاوکێ نەتانگرێ، بەڵکو لەهەموو شتێك داواکاریەکانتان پێشکەشی خودا بکەن بە نوێژو پاڕانەوەو سوپاس. [7]ئاشتی خودا، ئەوەی بەرزترە لەسنووری بیری مرۆڤ، دڵو بیرتان دەپارێزێت لەعیسای مەسیح.

[8]ئەی برایان لەکۆتاییدا پێتان دەڵێم: ئەو شتانەی ڕاست‌و ڕێزدارە، دادپەروەرو پاکە، مایەی خۆشەویستیەو پەسەندکراوە، ناوبانگی بە چاکە دەرکردووە، ڕەوشت بەرزو شایانی ستایشە، بیری لێ‌بکەنەوە. [9]بەشێوەیەك هەڵس‌وکەوت بکەن هەروەك لەمن فێربوون‌و وەرتانگرت‌و بیستتان‌و بینیتان، ئینجا خودای ئاشتی لەگەڵتان دەبێت.

## سوپاس بۆ بەخشینتان

[10]من زۆر دڵشادم بەخوداوەند،

کەوا ئێستا ئێوە دوای ماوەیەکی دوورو درێژ سەرلەنوێ بایەخم پێدەدەن، بەڵێ لە ڕابوردووشدا ئێوە ئەم بایەخ پێدانەتان هەر هەبووە، بەلاَم ئەو هەلەتان بۆ ڕێك‌نەكەوتووە. [11]من ئەمە ناڵێم تا دەریخەم لێ‌قەوماوم، چونكە فێربووم بە هەموو بارودۆخێكی ژیانم ڕازی بم. [12]من دەزانم چۆن لە هەبوونیو نەبوونیدا بژیم، هەموو بارودۆخێكم تاقی كردۆتەوە، لەتێریو برسێتیدا، [13]توانام هەیە هەموو شتێك بەهۆی مەسیح بكەم، ئەوەی بەهێزم دەكات. [14]لەگەڵ ئەوەشدا كارێكی چاكتان كردووە كە بەشداری تەنگانەم دەكەن. [15]ئەی باوەڕدارانی فیلیپی ئێوەش دەزانن، لەسەرەتای كارم كە بلاَوكردنەوەی مزگێنی بوو، لەو كاتەی لەناوچەی مەكدۆنیاوە دەرچووم، هیچ كۆمەڵێكی باوەڕدار بەشداری جێ‌بەجێ‌كردنی پێویستیەكانی نەكردووم جگە لەئێوە. [16]تەنانەت كاتێك لەشاری تەسالۆنیكی بووم، ئەوەی پێویستم پێی بوو چەند جارێك بۆتان ناردم. [17]مەبەستی من داواكردنی بەخشین نییە جارێكی‌تر، بەڵكو داواكردنی بەرووبوومی زیاترە بۆ تۆماركردن لەلای خودا. [18]هەموو ئەو شتانەی ئەپفرۆدیتۆس لای ئێوە بۆی هێنام پێم‌گەیشت، ئێستا هەرچیەكم پێویستە هەمە، بەڵكو لەمەش زیاتر، دیاریەكانی ئێوە قوربانییە دڵی خودا خۆش دەكاتو لای ئەو بۆنخۆشو پەسەندكراون. [19]خودا لە سامانی بێ‌ئەندازەی خۆی، بەهۆی شكۆمەندی عیسای مەسیح هەموو پێویستیەكانتان دابین دەكات.

[20]شكۆ و مەزنی بۆ خودای باوكمانە تاهەتایە. ئامین.

**سلاَوی كۆتایی**

[21]سلاَو بكەن لەهەموو خوشكو برایانی پیرۆز لەعیسای مەسیح. هەموو ئەو برایانەی لەگەڵمدان سلاَوتان لێ‌دەكەن. [22]ئەو خوشكو برا پیرۆزانەی لێرەن سلاَوتان لێ‌دەكەن، بەتایبەتی ئەوانەی دەستو پێوەندی قەیسەرن.

[23]بابەرەكەتی عیسای مەسیحی خوداوەند لەگەڵ ڕۆحتان بێت.

# نامەی پۆڵس بۆ باوەڕدارانی کۆلۆسی

*کۆلۆسی شارێك بوو لەئاسیای بچووك، دەکەوتە ڕۆژهەڵاتی شاری ئەفەسۆس. پۆڵس ئەم نامەیەی بۆ کۆمەڵەی باوەڕدارانی کۆلۆسی نووسی، کاتێ بیستی لەوێ هەندێ کەس بیروڕای سەیر بڵاودەکەنەوە، ئەو بیروڕایانەش بەکورتی ئەوەیە: ناسینی خوداو ڕزگاری تەواو لەفریشتە پەرستن‌و خۆبرسی‌و تینووکردن‌و گرنگی‌دان بەهەندێ بابەتی شەریعەتی جوولەکە.*

*پۆڵسیش سەبارەت بەو شتانە دەڵێ مەسیح توانای ڕزگاری بەخشینی تەواوی هەیەو ئەو بیروڕاو بابەتانە مرۆڤ لەڕزگاربوون دوور دەخەنەوە. چونکە جیهان بەهۆی مەسیح دروستکراوە هەروەها بەهۆی ئەو جیهان لەگەڵ خودا ئاشتبووەوە، هەروەها خودا بە هەموو خودایەتی خۆی لە لەشی مەسیح نیشتەجێ بووە، مرۆڤیش بە ئەو پڕ دەبێ لەژیان.*

## 1

لەپۆڵس نێرراوی عیسای مەسیح لەسەر خواستی خودا، هەروەها لەتیمۆساوسی برامانەوە، [2] بۆ خوشك‌و برایانی پیرۆزو سەرڕاست لەشاری کۆلۆسی، با بەرەکەت‌و ئاشتی خودای باوکتان لەگەڵ بێ.

### سوپاس‌و نوێژکردن

[3] ئێمە هەر کاتێك نوێژ دەکەین بۆتان، هەمیشە سوپاسی خودای باوکی عیسای مەسیحی خوداوەندمان دەکەین، [4] چونکە هەواڵی باوەڕتان بە عیسای مەسیح پێمان گەیشت لەگەڵ ئەو خۆشەویستیەی هەتانە بەرامبەر هەموو خوشك‌و برایانی پیرۆز، [5] لەپێناوی ئەو هیوایەی خودا ئامادەی‌کردووە بۆتان لەئاسمان، ئەو هیوایەی لەپێشا لەووشەی ڕاستیتان بیست، واتە مزگێنی. [6] ئەو مزگێنییەی بەرهەم دەهێنێت‌و بڵاودەبێتەوە لەهەموو جیهان، هەروەك چۆن بەرهەمی هێناو بڵاوبووەوە لەنێواتان لەو ڕۆژەی بەڕاستی بەرەکەتی خوداتان بیستووەو ناسیووتانە. [7] هەروەك لەئەپفراسی بەندەی هاوڕێی خۆشەویست فێربوون، ئەو

خـزمەتکارێکی سەرڕاسـتی مەسـیحە لەپێناوی ئێمە. [8]هەر ئەویش بوو بۆی بـــاس کـــردین ســـەبارەت بـــەو خۆشەویستیەی ڕۆح پێی بەخشیون.

[9]لەبـــەر ئـــەوە لـــەو ڕۆژەوەی ئەمـــەمان بیســـتووە، بێ‌ڕاوەســـتان نوێژتـان بـۆ دەکـەین، داوا لـەخودا دەکەین دانایی‌و تێگەیشتنی ڕۆحیتان بداتـێ، تـا خواسـتی ئـەو بەتەواوی بـــزانن. [10]هـــەتا بەشـــێوەیەك هەڵسـوکەوت بکـەن لەژیان شایانی خوداوەنـد بێـت‌و بەتەواوی جێگای ڕەزامـەندی ئـەو بێـت، بـۆ ئـەوەی بەرهەم‌بهێنن لەهەموو کارێکی چاك‌و پێ‌بگـەن لەناسینی خودا، [11]هەروەها بـۆ ئـەوەی بەهێزتان بکات بەهەموو هێزێك بەگوێرەی توانای شکۆداری خـۆی، تـا خۆتـان ڕاگـرن لەئاست هـــەموو شـــتێك‌و ئـــارام بگـــرن، بـەخۆشیەوە [12]سوپاسی باوك بکەن، ئـەوەی ئـێوەی ئامـادەکـردووە بـۆ بەشـداری‌کردنی میراتـی خوشـك‌و بـرایانی پـیرۆز لـەڕووناکی. [13]هـەر ئـــەوە ئـــێمەی ڕزگارکـــردووە لـــەدەســـەڵاتی تـــاریکی‌و ئـــێمەی گواسـتەوە بـۆ پادشـاهێتی ڕۆڵـەی خۆشەویسـتی. [14]ئـەوەی بەخوێـنی خـۆی ئـێمەی کڕیەوە لەکۆیلەیەتی گونـاه، ئـەویش بـە لـــێخۆش‌بوونی گوناه.

**عیسا وێنەی خودای نەبینراوە**

[15]عیسا وێنەی خودای نەبینراوە، نۆبـەرەی هەموو بوونەوەرانە. [16]هەر بەویش هەموو شتێك دروست بووە، ئـەوەی لـەئاسمـانو لەسـەر زەوییە، ئـەوەی دەبیـنرێ‌و نابیـنرێ، خاوەن تەخـــت‌و تـــاج یـــان ســـەرۆك‌و دەسەڵاتدار، خودا هەمووی بەعیساو بـۆ عیسـا دروست‌کرد. [17]ئەو پێش هـەموو شتێك بووەو هەر لەئەویشدا هـەموو شتێك دەبێت. [18]ئەو سەری لەشـــە، واتـــە ســـەری کۆمەڵـــەی بـــاوەڕداران، ســـەرەتاو نۆبـــەرەی زیـندووبوونەوەی دوای مـردنە، تـا لـەسـەرووی هەموو شتێك بێت. [19]چـونکە خـودا حەزی کرد بەهەموو پڕی خۆی لەئەودا بەرجەستە بێ. [20]تـا بـەهۆی ئـەو ئاشـت‌بێتەوە لەگەڵ هـــەموو ئەوانـــەی لەســـەر زەوی‌و لـەئاسماندایە، بە خوێن‌ڕشتنی ئەویش لەسەر خاچ ئاشتی هاتەدی.

[21]ئـێوە جـاران بـەهۆی کرداری خراپـــتان نـــامۆ و دوژمـــن بـــوون

لەبیرکردنەوە، [22] بەڵام ئێستا ئاشتی کردنەوە بەمردنی، بەلەشی مرۆڤانەی خۆی، تا ئێوە بە پاکوپیرۆزیو بێ کەموکوڕیو بێ گلەیی بێنە بەردەمی. [23] بەمەرجێك بەردەوامبن لەسەر باوەڕتان، باوەڕێکی چەسپاو و ڕەگ داکوتراوتان هەبێ، لانەدەن لەهیوای ئەو مزگێنییەی بیستتانو هەموو بوونەوەرانی ژێر ئاسمان پێی ڕاگەیەنرا، خۆشمبووم بەخزمەتکار بۆی.

**تێکۆشانی پۆڵس بۆ باوەڕداران**

[24] من ئێستا دڵشادم بەو ئازارەی لەپێناوتان دەیچێژم، چونکە لەلەشی خۆمدا کەموکوڕی تەنگانەی مەسیح تەواو دەکەم، لەپێناوی لەشی ئەو کە کۆمەڵەی باوەڕدارانە، [25] ئەوەی من بووم بە خزمەتکار بۆی، لەسەر خواستی خودا بەمن دراوە لەپێناوتان، تا ووشەی خوداتان بە تەواوی پێبناسێنم، [26] ئەم نهێنیەش لای نەوەکانی ڕابردوو شاراوە بوو، بەلام ئێستا خودا دەریخست بۆ خوشكو برا پیرۆزەکان. [27] ئەوانەی خودا خۆی ویستی دەوڵەمەندی شکۆداری ئەم نهێنییە بۆ هەموو میللەتان دەربخات، ئەوەیە مەسیح لەناوتاندایە، هیوای شکۆمەندییە.

[28] ئەوەی بانگەوازی پێدەدەین، هەموو مرۆڤێکی پێ ئاگادار دەکەینەوە، هەروەها هەموو مرۆڤێکی پێ فێر دەکەین بەهەموو ژیرییەوە، تاهەموو مرۆڤێك لەمەسیحدا بەتەواوی ئامادە بکەین.

[29] لەپێناوی ئەمە منیش ماندوو دەبمو تێدەکۆشم بەهەموو توانایەك، ئەوەی بەهێز لەمندا کار دەکات.

## 2

دەمەوێ بزانن من چەند تێدەکۆشم لەپێناوتانو لەپێناوی ئەوانەی لەشاری لاودکیەن، هەروەها ئەوانەی منیان ڕووبەڕوو نەبینیوە، [2] تاوەکو وورەیان بەرزبێتەوە، یەكبگرن بە خۆشەویستیو دانایيو تێگەیشتنی تەواویان هەبێت بۆ ناسینی نهێنی خودا کە مەسیحە، [3] ئەوەی هەموو گەنجینەی دانایيو زانستی تیادا شارراوەتەوە.

[4] ئەمەتان پێدەڵێم تا کەس بە قسەی درەوشاوە هەڵتان نەخەڵەتێنێ. [5] هەرچەندە بە لەش لەناوتان نیم،

بەڵام بە ڕۆح لەگەڵتانم، دڵشاد دەبم کاتێ باوەڕی چەسپاو و تەواوتان بەعیسای مەسیح ببینم.

**تێرو پڕی مەسیح**

[6]جا چۆن عیسای مەسیحتان قەبووڵ کرد وەك خوداوەندی خۆتان، لەئەویش بژین، [7]با ڕەگتان لەئەو پنج داکوتێ، باوەڕتان بەهێزو چەسپاو بێت بەو شێوەیەی فێربوون، هەمیشە دەم بەسوپاس‌بن.

[8]ئاگاداربن کەس نەتانخاتە داوی فەلسەفەو چەواشەی بە خۆڕایی، ئەوەی لەسەر خووڕەوشتی خەڵکی‌و یاسای سەرەکی ئەم گەردوونە وەستاوە نەك لەسەر مەسیح. [9]چونکە خودا بە هەموو پڕی خۆی لە لەشی مەسیح نیشتەجێ بووە، [10]ئێوەش بە ئەو پڕ دەبن لەژیان، ئەوەی سەری هەموو پێشەواو حوکمڕانێکە. [11] لەعیساوە خەتەنەیەك کراون بەدەست نەکراوە، بەڵکو بەداماڵینی سروشتی گوناهبار بە خەتەنەکردنی مەسیح. [12]کاتێ لەئاوهەڵکێشران بەناوی عیسا، ئەوا لەگەڵ ئەو نێژرانو لەگەڵی زیندووبوونەوە، چونکە باوەڕتان بەکرداری خودا کرد کە لەناو مردووان زیندووی کردەوە.

[13]ئێوە بەهۆی گوناهو بەهۆی خەتەنە نەکردنی لەشی گوناهبارتان مردبوون، بەڵام خودا لەگەڵ عیسا زیندووی‌کردنەوەو لەهەموو گوناهەتان خۆش بوو. [14]ئەو شکاتنامەیەی لەسەرمان نووسرابوو، ئەوەی دژی ئێمە بوو، عیسا سڕییەوەو بەخاچەوە بزمارکوتی کرد. [15]سەرۆکو حوکمڕانەکانی چەك‌کردو کردنی بەپەند، لەخۆپیشاندانە سەرکەوتووەکەی وەك دیل ڕاپێچی‌کردن.

[16]باکەس حوکمی خواردنو خواردنەوەو جۆری هەڵسوکەوتی جەژنو سەری مانگانو شەممانتان بەسەر نەدات. [17]ئەمانە هەمووی سێبەری داهاتوون، بەڵام ڕاستیەکەی تەنها لای مەسیحە. [18]باکەس مافتان لێ‌داگیر نەکات بەوەی داوای ساکاری‌و پەرستنی فریشتەکانتان لێ‌بکات، بەو بینینانەی خۆی دەیبینێ، خۆی بە زل دەزانێ بەخەیاڵە مرۆڤانیە پووچەکانی. [19]بێ‌ئەوەی بایەخ بدات بە سەر، ئەوەی هەموو لەش

خواردنـــــی لـیّوەردەگـــــریّو دەیبەســتیّت بــە هــەموو جومگــەو پارچەکانی لەشەوە، تا نەشونما بکات بەو شیّوەیەی خودا دەیەویّ.

[20]گــەر ئـیّوە مـردوون لەگــەلّ مەســـــیح ســــەبارەت بەیاســـــا ســەرەکیەکانی ئـەم جـیهانە، کەواتـە بۆچـی وا دەژیـن هـەروەك سـەربەم جـیهانە بن؟ بۆچی ملکەچ دەکەن بۆ ئـەم ڕاسـپاردانە: [21](مەیگـرە! تـامی مەکـە! دەسـتی لـیّمـەدە!)؟ [22]ئـەم ڕاسـپاردانە هــەموویان شــتیّکن بــە بەکارهیّـــنان لەناودەچـــن، چـــونکە بەگویّـــــرەی فــــــیّرکردنەکانو ڕاسـپاردەکانی مـرۆڤن. [23]بەڕوالّەت دانـــایی دەردەخــــات، چـــــونکە پەرســـتنیّکی تایــبەتیو ملکەچـــیو توندوتـیژی تیادایە سەبارەت بەلەش. بەلاّم نرخیّکی وای نییە لەدامرکاندنی ئارەزوو و داواکاری لەش.

**باوەڕدارو مەسیح**

# 3

گـــــەر ئــــیّوە لەگــــەلّ مەســــیح هەســــتاونەتەوە، هــــەولّبـــدەن بـــۆ کاروبـاری ئاسمـانی، مەسـیح لــەویّ لـــەلای دەســـتە ڕاســـتی خــــودا دانیشـــتووە. [2]بایــەخ بــەکاروباری ئاسمـانی بدەن، نەك بەکاروباری سەر زەوی، [3]چونکە ئیّوە مردن، هەروەها ژیانـتان شـارراوەتەوە لـەگەلّ مەسیح لای خــودا. [4]کــاتیّ عیســا ئــەوەی ژیانـتانە دەرکــەوت، ئەوسـا ئـیّوەش بەشکۆمەندی لەگەلّی دەردەکەون.

[5]کەواتــە دەبــیّ هەرچی شتی ئەم جــیهانە هەیــە تــیاتان بیمریّــنن وەك: داویّــنپیســی، گــلاّوی، ئــارەزووی خــراپ، خواســتی بەد، چاوبرسیّتی، ئەمانــە جۆریّکــن لــە بت پەرستی، [6]چـونکە بەهۆی ئەو شتانەوە تووڕەیی خودا دیّتەخوارەوە. [7]هەروەها ئیّوەش جاران وا دەژیان. [8]بەلاّم ئیّستا هەموو ئەوانە فڕیّبدەن: تووڕەیی، ڕقوکینە، بوخـــتان، قســـەی ناشــیرین، [9]درۆ مەکەن لـەگەلّ یەکتری، چونکە مرۆڤە کۆنەکـــەو هـــەموو کردارەکانیـــتان داکـــەندوەو [10]مرۆڤــیّکی نویّـــتان لەبەرکردوە، ئەوەی لـەنویّبوونەوەیە لەناسـین بەپیّی ویّنەی دروستکەری. [11]جوولـەکـەو یۆنانی، خەتەنەکراو و خەتەنـەنەکـراو، بەربەریو سکیسی، کۆیلــەو ئــازاد نیـیە، بـەلّکو مەسیح خــۆی هــەموو شــتیّکەو لەهــەموو شتیّكدایە.

**باوەڕدارو کۆمەڵە**

[12]ئێوەی پیرۆزکراو، خۆشەویست، هەڵبژێرراو لەلایەن خودا :بەزەیی، زمانشیرینی، ڕۆح سووکی، ساکاری، ئارام گرتن لەبەر بکەن. [13]لەیەکتری قەبووڵ بکەن، لە یەکتر خۆشبن، گەر یەکێکتان شکاتی دژی ئەوی‌کە هەبوو، دەبێ لیێ خۆشبێت هەروەك مەسیح لێتان خۆش بووە. [14]بەڵام لەسەرووی ئەمانە هەموو بەرگی خۆشەویستی لەبەر بکەن، چونکە هەموو شتێك بەتەواوی بەیەکەوە دەبەستێت.

[15]با ئاشتی مەسیح دەستبگرێ بەسەر دڵتان، ئەوەی ئێوەی بۆ بانگ‌کراوە تا ببن بە یەك لەش، هەروەها دەم بەسوپاسبن.

[16]با ووشەی مەسیح بەدەوڵەمەندی لەدڵتان جێگیر بێت، یەکتری فێر بکەنو ڕێ‌نیشانی یەکتری بدەن بە هەموو داناییەوە، زەبوورو سروودو گۆرانی ڕۆحی بلێن، بەناخی دڵ سوپاسی خودا بکەن. [17]هەر شتێك دەڵێنو دەیکەن با بەناوی عیسای خوداوەند بێت، بەئەو سوپاسی خودای باوك بکەن.

**باوەڕدارو خێزان**

[18]ئەی ئافرەتان ملکەچ بکەن بۆ مێردەکانتان، بەشێوەیەك لێوەشاوە بێت لەخوداوەند.

[19]ئەی پیاوان، ژنەکانتان خۆش‌بوێ، لەگەڵیان ڕەق‌مەبن.

[20]ئەی مندالان، گوێڕایەڵی دایكو باوکتان بن لەهەموو شتێك، چونکە ئەمە مایەی ڕەزامەندی خوداوەندە.

[21]ئەی باوکان، منداڵەکانتان تووڕە مەکەن، تا ترسنۆكو سەرنەکەوتوو دەرنەچن.

**باوەڕدار لە کارکردن**

[22]ئەی کۆیلەکان، لەهەموو شتێك ملکەچی گەورەکانتان بن لەم جیهانە، بەدڵسۆزی کار مەکەن تەنها کاتێ چاویان لێتانە هەروەك بتانەوێ خەڵکی ڕازی بکەن، بەڵکو بە دڵسۆزیو بەترسی خوداوەند بیکەن. [23]هەر چییەك دەکەن، بەهەموو دڵ بیکەن، هەروەك بۆ خوداوەندی بکەن نەك بۆ خەڵکی. [24]بزانن لەخوداوەندەوە میرات بەپاداشت وەردەگرن، چونکە ئێوە خزمەتی مەسیحی خوداوەند دەکەن. [25]بەڵام

ئەوەی کاری خراپ بکات سزای خراپەی خۆی وەردەگرێ، گرنگ نییە بەلای خوداوە ئەو کەسە کێ بێت.

# 4

ئەی گەورەکان، بەدادپەروەری‌و یەکسانی هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ کۆیلەکانتان، بزانن ئێوەش گەورەیەکتان هەیە لە ئاسمان.

## هاندان بۆ نوێژکردن

[2] بەردەوام بن لەسەر نوێژکردن، ئاگاداربن لەکاتی نوێژ سوپاس بکەن، [3] لەهەمان کات بۆ ئێمەش نوێژ بکەن، بۆ ئەوەی خودا دەرگای قسەکردنمان بۆ بکاتەوەو نهێنی مەسیح ڕابگەیێنین، ئەوەی من لەپێناویدا بەندکراوم. [4] تا ئاشکرای بکەم لای خەڵکی بەو شێوەیەی پێویستە لەسەرم بدوێم. [5] بەژیرانە هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ ئەوانەی باوەڕدار نین، هەموو هەلێك بقۆزنەوە. [6] باهەمیشە قسەتان بەرەکەتدار بێت، بەخوێ سوێر کرابێ، ئەوسا دەزانن چۆن وەڵامی خەڵکی دەدەنەوە.

## سڵاوی کۆتایی

[7] تیخیکۆس هەموو هەواڵێکی منتان دەداتێ، برای خۆشەویست‌و خزمەتکاری سەرڕاست‌و کۆیلەی هاوڕێم لەخوداوەند. [8] بەتایبەتی ئەوم ناردە لاتان بۆ ئەم مەبەستە تا هەواڵی ئێمەتان پێ بگەیەنێت‌و وورەتان بەرز بکاتەوە، [9] لەگەڵ ئۆنسیمۆس برای خۆشەویست‌و سەرڕاست، خەڵکی لای خۆتانە، هەردووکیان هەواڵی هەموو شتێکتان دەدەنێ کە لێرە ڕوویداوە.

[10] ئەرستەرخۆس هاوڕێی بەندیخانەم سڵاوتان لێدەکات، لەگەڵ مەرقۆسی ئامۆزای بەرنابا، ئەوەی ڕامسپاردن بەگەرمی پێشوازی لێبکەن کاتێ هات بۆ لاتان، [11] هەروەها یەسوع کە بەیستۆس ناودەبرێ. تەنها ئەمانە جوولەکەن لەنێوان ئەو یارمەتیدەرە ئیشکەرانەم بۆ پادشاهێتی خودا، ئەوان بوونە هۆی دڵخۆشییەکی زۆر بۆم. [12] ئەپەفراسی بەندەی عیسای مەسیح، خەڵکی لای خۆتانە سڵاوتان لێدەکات، هەموو کاتێ لای خودا لەپێناوتان تێدەکۆشێ لەنوێژ تاباوەڕتان چەسپاو بێت‌و

پێگەیشتوو بن‌و هەموو کاتێ پڕ بن لەهەموو خواستی خودا. [13]من شایەتی بۆ دەدەم ئەو زۆر ماندوو دەبێت لەو کارانەی دەیکات لەپێناوی ئێوەو ئەوانەی لەلاودکیەو هیراپۆلیسن. [14]هەروەها لۆقای پزیشکی خۆشەویست‌و دیماس سڵاوتان لێ دەکەن. [15]سڵاو لەخوشك‌و برایان بکەن لەلاودکیەو لەخوشکە نەمفاس‌و ئەو کۆمەڵە باوەڕدارەی کۆدەبنەوە لەماڵەکەی.

[16]دوای ئەوەی ئەم نامەیەتان بۆ خوێنرایەوە، بینێرن بۆ کۆمەڵە باوەڕدارانی لاودکیە تا ئەوانیش بیخوێننەوە، ئینجا ئێوەش ئەو نامەیەی لایانە لێیان وەرگرن‌و بیخوێننەوە.

[17]بە ئەرخیپۆس بڵێن: (ئەو خزمەتەی خوداوەند داویەتی پێی با بەتەواوی بیهێنیتەدی.)

[18]من پۆڵس، سڵاوی منتان لێبێت، بەخەتی خۆم بۆتان دەنووسم. یادی کۆت‌و زنجیرەکانم بکەن. با بەرەکەتی خوداتان لەگەڵ بێت.

# یەکەم نامەی پۆڵس بۆ باوەڕدارانی تەسالۆنیکی

*تەسالۆنیکی پایتەختی ولایەتی مەکدۆنیای ڕۆمانی بوو، دوای ئەوەی پۆڵس فیلیپی بەجێهێشت کۆمەڵی باوەڕدارانی لەتەسالۆنیکی دامەزراند. لەوێ هەندێ جولەکە هەبوون دانیشتوانی ئەو شارەیان هاندا دژی پۆڵس و هەموو باوەڕداران، بۆیە پۆڵس ناچاربوو بڕواتە بیریەو لەوێشەوە بۆ کۆرنسۆس. لەکۆرنسۆس دوای ئەوەی تیمۆساوس لەتەسالۆنیکی هاتەوەو هەواڵی ئەوێی بۆ هێنا، پۆڵس ئەم نامەیەی بۆ نووسین.*

*لەم نامەیەدا پۆڵس پیرۆزبایی لەباوەڕدارانی تەسالۆنیکی دەکات و هانیان دەدات تاچەسپاوبن لەباوەڕیان، هەروەها ئەوەیان دێنێتەوە یاد کە چۆن بوون کاتێ ئەو لەنێوانیان بووە، ئینجا وەڵامی ئەو باوەڕدارانە دەداتەوە کە دڵەڕاوکێ دایگرتبوون سەبارەت بەو کەسانەی دەمرن پێش هاتنەوەی مەسیح: ئایا ژیانی هەتاهەتاییان دەست دەکەوێ لەگەڕانەوەی دووەمی مەسیح؟ گەڕانەوەی دووەم کەی دەبێ؟ پۆڵس وورەیان بەرزدەکاتەوەو داوایان لێدەکات بە هێمنی کاربکەن و بە بەروبووم بن، بە هیوای گەڕانەوەی مەسیح.*

## 1

لە پۆڵس و سیلوانس و تیمۆساوسەوە بۆ کۆمەڵەی باوەڕدارانی شاری تەسالۆنیکی، با بەرەکەت و ئاشتی خودای باوک و عیسای مەسیحی خوداوەندتان لەگەڵ بێ.

**سوپاس بۆ باوەڕداران**

[2]ئێمە هەموو کاتێ سوپاسی خودا دەکەین لەپێناوی هەمووتان و هەردەم یادتان دەکەین لەنوێژەکانمان، [3]هەمیشە لەبەردەم خودای باوك یادی کرداری باوەڕو ماندووبوونی خۆشەویستی و ئارام گرتنی هیواتان لەعیسای مەسیحی خوداوەند دەکەین.

[4]ئەی برایانی خۆشەویستی خودا، ئێمە دەزانین خودا ئێوەی هەڵبژاردووە. [5]کاتێ ئێمە مزگێنی عیسای مەسیحمان بۆتان هێنا، ئەوە تەنها ووشە نەبوو، بەڵكو توانای خوداو پڕبوون بوو لەڕۆحی پیرۆزو

لەدڵنیایی تەواو بە خودا. خۆتان دەزانن، چۆن لەناوتان لەبەر بەرژەوەندی ئێوە چ جۆرە کەسێك بووین، [6]ئێوە شوێنی ڕێگای خوداوەندو ئێمە کەوتن، چونکە ئێوە لەتەنگانەیەکی زۆردا ووشەی خوداتان بەخۆشیەوە لەڕۆحی پیرۆز وەرگرت. [7]بە شێوەیەك ئێوە بوون بە نموونە بۆ هەموو باوەڕدارانی ناوچەی مەکدۆنیاو ئەخائیە. [8]تەنها دەنگوباسی بلاوکردنەوەی ووشەی خوداوەندتان لەناوچەی مەکدۆنیاو ئەخائیە بلاونەبووەتەوە، بەڵکو دەنگوباسی باوەڕتان لەهەموو شوێنێك بلاوبووەتەوە، ئیتر پێویست ناکات لەو بارەیە هیچ شتێك بڵێین. [9]چونکە باوەڕداران خۆیان هەواڵی ئەوەیان پێماندا، هاتنمان بۆ لاتان یەکەمجار چ کارێکی کردە سەرتان، بەوەی وازتان لەبتپەرستی هێناوەو ڕووتان کردووەتە خودا، واتە پەرستنی خودای ڕاستو زیندوو. [10]هەروەها چاوەڕێی هاتنەوەی ڕۆڵەی خودا دەکەن لەئاسمان، ئەوەی خودا هەڵیساندەوە لەنێو مردووان، واتە عیسا ئەوەی ڕزگارمان دەکات لە تووڕەیی داهاتووی خودا.

## خزمەت کردنی پۆڵس

## 2

بۆیە ئەی برایان، خۆتان دەزانن هاتنمان بۆ لاتان بێسوود نەبوو. [2] هەرچەندە ئازارمان چێژتو بەسووکی هەڵسوکەوتیان لەگەڵمان کرد لەشاری فیلیپی هەروەك دەزانن، لەگەڵ ئەوەش خودا یارمەتی داین بەچاونەترسی مزگێنیتان پێبدەینو ڕووبەڕووی ئەوانە بینەوە کە بەرهەڵستیمان دەکەن. [3]ئەوەی دەمانەوێ بەئێوەی بڵێین بەمەبەستی خراپەو گلاویو خەڵەتاندن نییە، [4] بەڵکو هەروەك ئێمە ڕەزامەندی خودامان بەدەست هێناوە بۆ ئەوەی مزگێنیمان بدرێتە دەست، بەم شێوەیە دەدوێین، ئەمەش نەك لەبەر ڕەزامەندی خەڵکی، بەڵکو بۆ ڕەزامەندی ئەو خودایەی دڵمان تاقی دەکاتەوە. [5]خودا شایەتە نە قسەی پێهەڵدانتان بۆ دەکەینو نەبیانوو دێنینەوە بۆ چاوچنۆکی، [6]هەولی بەدەستهێنانی ستایشی خەڵکمان نەداوە، نەلەلایەن ئێوە نەلەلایەن خەڵکیتر، هەرچەندە مافی زۆرمان بەسەرتان بوو، چونکە نێرراوی مەسیحین، [7]بەڵام کاتێ هاتین بۆ لاتان

بە خۆشەویستیو بەزەیی ڕەفتارمان کرد لەگەڵتان وەك دایەنێك منداڵەکانی بەخێو بکات. [8]تەنانەت ئێمە بە شێوەیەك ئێوەمان خۆشویست، ئامادەبووین نەك تەنها مزگێنی خوداتان پێشکەش بکەین، بەڵکو ژیانی خۆشمان، چونکە ئێوە بوون بە خۆشەویستمان. [9]ئەی برایان لەیادتانە، چۆن هەوڵمانداوەو ماندووبووین، دەزانن کاتێ لەناوتان مزگێنی خودامان دەدا لەهەمان کات شەو و ڕۆژ کارمان دەکرد تا نەبین بە بار بەسەر کەستان.

[10]ئێوە شایەتنو خوداش شایەتە، چۆن ڕەفتارمان کردووە لەنێو ئێوەی باوەڕدار، بەپاکیو ڕاستودروستیو بێ کەموکوڕی، [11]هەروەك دەزانن ئێمە بۆ ئێوە وەك باوك وابووین بۆ منداڵەکانی، وورەمان بەرز کردنەوەو دڵنەواییمان کردنو داوامان لێکردوون [12]تا بە شێوەیەك بژین جێی ڕەزامەندی خودا بێت، ئەوەی بانگتان دەکات بۆ پادشاهێتیو شکۆمەندی خۆی.

[13]شتێکی دیکەش هەیە بەردەوام لەپێناوی سوپاسی خودا دەکەین، چونکە کاتێ ووشەی خوداتان لەئێمە بیست ئەوەی پێمان ڕاگەیاندن، وەرتانگرت لێمان نەك وەك ووشەیەك لەمرۆڤ بێت، بەڵکو چۆن لەڕاستی ووشەی خودا بێتو کار لەناو ئێوەی باوەڕدار دەکات. [14]ئەی برایان ئێوە وەك کۆمەڵەکانی خوداتان لێهات لە ناوچەی یەهودیە، واتە ئەوانەی لە عیسای مەسیح بوون. ئێوەش بەدەستی هاوڕەگەزەکانی خۆتان ئازاردران، وەك ئەوان بەدەستی جوولەکەکان ئازاردران، [15]ئەوانەی عیسای خوداوەندو پێغەمبەرانیان کوشتو ئێمەیان چەوساندەوە، ئەوانە شتێك ناکەن خودا ڕازی بکات، دوژمنی هەموو خەڵکن، [16]چونکە دەیانەوێ بە هەموو شێوەیەك ڕێگا لەئێمەش بگرن بۆ گەلانی تر بدوێین تا ڕزگاریان نەبێ، ئەوانە پێوانەی گوناهیان پڕ بووە، بەمەش لەکۆتاییدا تووڕەیی خودا بەتەواوی هاتە خوارەوە بەسەریان.

[17]کاتێ لەئێوە جیابووینەوە، دوای ئەوە بەماوەیەکی کورت بیرمان دەکردن، حەزمان دەکرد جارێکی تر ڕووبەڕوو بتانبینینەوە ئەی خۆشەویستانمان، ئێوە لەبەر چاومان

دووربوون، بەڵام لەدڵمان بوون. [18] لەبەر ئەوە ویستمان دیدەنیتان بکەینەوە، بەتایبەتی خۆم کە پۆڵسم چەند جارێك ویستم بۆ لاتان بێم، بەڵام شەیتان ڕێگای لێ دەگرتین. [19] جا چییە هیواو خۆشیو تاجی شانازیمان لەبەردەم عیسای خوداوەندمان لەکاتی گەڕانەوەی؟ ئایا ئێوە نین؟ [20] بەڵێ، چونکە ئێوە شکۆمەندیو خۆشی ئێمەن.

## ناردنی تیمۆساوس بۆ تەسالۆنیکی

## 3

کاتێ زانیمان لەدووریتان ناتوانین دانبگرین بەخۆمان، ئیتر بە باشترمان زانی بەتەنها خۆمان لەئەسینا بمێنینەوە، [2] تیمۆساوسی برامان نارد بۆ لاتان ئەوەی لەگەڵ خودا کار دەکات لەبلاوکردنەوەی مزگێنی مەسیح، تا وورەتان بەرز بکاتەوەو باوەڕتان بچەسپێنێ، [3] تا باوەڕتان لاواز نەبێ لەکاتی ناخۆشی. ئێوە دەزانن ئەم ناخۆشییە بەشی ئێمەیە، [4] چونکە کاتێ لاتان بووین، لەپێشا پێمان ووتن تووشی ناخۆشی دەبین، ئەمەش بەڕاستی ڕوویدا هەروەك دەزانن، [5] لەبەرئەوە کاتێ نەمتوانی زیاتر دانبگرم بەخۆم، تیمۆساوم نارد تا هەواڵی باوەڕتانم بۆ بهێنێ، نەوەك تاقیکەرەوە «شەیتان» هاتبێو تاقیکردبنەوە ئەوسا هەوڵمان بەفیڕۆ بڕوات.

[6] ئێستا تیمۆساوس لای ئێوە گەڕایەوە بۆ لامان، مزگێنی باوەڕو خۆشەویستی ئێوەی داپێمان، هەروەها پێیووتین ئێوە هەموو کات یادمان دەکەنو ئارەزووی بینینمان دەکەن، هەروەك ئێمە ئارەزووی بینینی ئێوە دەکەین. [7] ئەی برایان باوەڕتان بەو شێوەیە وورەی ئێمەی بەرزکردەوە، لە کاتی تەنگانەو ناخۆشیمان. [8] ئێستا ئێمە دەژین، چونکە باوەڕتان بە خوداوەند چەسپاوە. [9] چۆن بتوانین سوپاسی خودا بکەین، چونکە بەهۆی ئێوەوە ئەوەندە دڵخۆش بووین لەبەردەم خودامان؟ [10] ئێمە شەو و ڕۆژ لەخودا دەپاڕێینەوە تا بتانبینینو یارمەتیتان بدەین بۆ پڕکردنەوەی کەموکوڕی باوەڕتان.

[11] داواکارین لەخودای باوکمانو عیسای مەسیحی خوداوەندمان ڕێگای هاتنمان بۆ لاتان ئاسان بکات، [12] هەروەها داواکارین

خوداوەند خۆشەویستیتان زیادو تێرو پڕ بکات لەناو یەکو لەگەڵ هەموو خەڵکی بە قەدەر خۆشەویستی ئێمە بۆتان. [13]تاوەکو دڵتان بەهێز بێتو بێ کەموکوڕی بێت لەپاکوپیرۆزیدا، لەلای خودای باوکمان ڕۆژی گەڕانەوەی عیسای خوداوەند لەگەڵ هەموو خوشکو برا پیرۆزەکانی.

## ژیانێك بۆ ڕازیکردنی خودا

# 4

ئەی برایانی خۆشەویست، ئێوە لە ئێمەوە فێربوون چۆن هەڵسوکەوت بکەن لەژیان بۆ ڕازیکردنی خودا، وە ئەمەشتان کردووە، ئێستا داواتان لێدەکەینو ئاگادارتان دەکەینەوە بەناوی عیسای خوداوەندەوە زیاتر هەوڵی پێشکەوتنتان بدەن لەم بارەیەوە. [2]چونکە ئێوە دەزانن ئەو ڕاسپاردانەی دامان پێتان بەهۆی عیسای خوداوەندەوەیە. [3]چونکە خواستی خودا ئەوەیە دەیەوێ ئێوە پاکوپیرۆزبن، لەداوێن پیسی خۆتان دووربخەنەوە، [4]هەریەکەتان بزانێ چۆن بەپاکیو ڕەوشت بەرزیەوە ئافرەتێك بۆ خۆی هەڵبژێرێ، [5]نەك بەئارەزووی هەوەسبازی وەك ئەو میللەتانەی خودا ناناسن، [6]با کەستان دەستدرێژ نەکات بۆ سەر براکەی یاخود خراپە بەرامبەری بکات لەم بارەیەوە، خوداوەندە تۆڵەدەسێنێ لەهەموو ئەوانەی ئەم خراپانە دەکەن هەروەك لەپێشا پێمان ووتونو ئاگادارمان کردوونەتەوە. [7]چونکە خودا بانگیکردووین بۆ ژیانی پاکو پیرۆز، نەك بۆ گلاوی. [8]کەواتە ئەوەی ئەم فێرکردنە ڕەتبکاتەوە، ئەوا مرۆڤ ڕەتناکاتەوە، بەڵکو خودا ڕەتدەکاتەوە، ئەوەی ڕۆحی پیرۆزی خۆی بەخشی پێتان.

[9]دەربارەی خۆشەویستی خوشکو برایانە، پێویست ناکات بۆتان بنووسم، چونکە خۆتان لەخوداوە فێربوون یەکتریتان خۆشبوێ. [10]ئەمەشتان کردووە لەگەڵ هەموو خوشکو برایانی مەکدۆنیا، بەڵام ئەی برایان داواتان لێدەکەین لەم بارەیەوە زیاتر هەوڵ بدەن، [11]ئاگاداربن بەئاسوودەییو بێ ئاژاوە بژین، بایەخبدەن بەکاروباری تایبەتی خۆتان، نانی خۆتان بەدەستی خۆتان پەیدا بکەن هەروەك ڕامانسپاردوون، [12]تا ناوبانگتان باش بێت لای ئەوانەی باوەڕدارنین،

پێویستیتان بەکەس نابێت.

**هاتنەوەی عیسای خوداوەند**

[13]بەلاّم ئەی برایان نامانەوێ نەزان بن سەبارەت چارەنووسی خەوتووان، هەتا غەمبار نەبن وەك ئەوانەی هیوایان نییە. [14]گەر ئێمە باوەڕمان بەوەکرد کە عیسا مردوو ئینجا زیندووبووەوە، ئەوا باوەڕ دەکەین کە خودا خەوتووانی باوەڕدار بەعیسا بۆ لای خۆی دەبات. [15]ئەوەی خوداوەند ووتویەتی پێتانی دەڵێین ئەوەش ئەمەیە: ئێمەی هێشتا زیندوو هەتا کاتی گەڕانەوەی خوداوەند، پێش خەوتوان ناکەوین، [16]چونکە خوداوەند خۆی دێتە خوارەوە لە ئاسمان، کاتێ فەرمانی کۆکردنەوە دەدرێتو سەرۆکی فریشتەکان بانگەواز دەکاتو کەڕەنایی خودا فووی پیادەکرێ، یەکەم جار ئەوانەی لە مەسیح مردوون هەڵدەستنەوە. [17]ئینجا ئێمە، ئەوانەی هێشتا زیندووین هەموومان بەرەو ڕووی خوداوەند دەڕفێنرێن لەهەوردا تا لەئاسمان بەخوداوەند بگەین، ئیتر بەردەوام لەگەڵ خوداوەند دەمێنینەوە. [18]جا بەم ووشانە وورەی یەکتری بەرزبکەنەوە.

# 5

برایان، سەبارەت بەکاتو بەروار پێویست ناکات بۆتان بنووسین، [2] چونکە ئێوە خۆتان باش دەزانن، ڕۆژی گەڕانەوەی خوداوەند وەك هاتنی دزێکە لەشەو. [3]کاتێ خەڵکی دەڵێن: (ئەوا ئاشتیو ئاسایشە!) لەناوچوون وەك ژانی ژنی سكپڕ لەناکاو خۆی دەدات بەسەریان، ئەو کاتەش هەرگیز ناتوانن هەڵبێن.

[4]بەلاّم ئەی برایان، ئێوە لە تاریکیدا نین هەتا ئەو ڕۆژە لەپڕا وەك دزێك بێتە سەرتان. [5]ئێوە هەمووتان ڕۆڵەی ڕووناکیو ڕۆژن، ئێمە سەربە شەو و تاریکی نین. [6]کەواتە نابێ بخەوین وەك خەڵکی کە، بەڵکو با ئێشکبگرینو بەخەبەربین. [7]چونکە

---

❖ سپەر: بڕوانە ئەفەسۆس 6:14

لەشەو دەخەون ئەوانەی خەویان دێت‌و سەرخۆش دەبن ئەوانەی لەشەو مەی دەخۆنەوە. [8]بەڵام ئێمەی ڕۆڵەی ڕۆژ بابەخەبەر بین، سپەری* باوەڕو خۆشەویستی لەبەرکەین، کڵاوی ئاسنینی هیوای ڕزگاری لەسەر بکەین. [9]چونکە خودا ئێمەی دەست نیشان نەکردووە تا تووڕەیی خۆی بهێنێتە خوارەوە بەسەرمان، بەڵکو دەیەوێ ڕزگاری بەدەست بهێنین بەهۆی عیسای مەسیحی خوداوەندمان، [10]ئەوەی لەپێناوی ئێمەدا مرد، تا گەر بەخەبەر بین یاخود خەوتوو لەگەڵ ئەو بژین. [11]لەبەرئەوە وورەی یەکتری بەرز بکەنەوەو یەکتری بنیادبنێن، هەروەك تا ئێستا کردوتانە.

[12]ئەی برایان داواتان لێ‌دەکەین، ڕێزی ئەوانە بگرن کە لەنێوانتان ماندوو دەبن، سەرپەرشتیتان دەکەن لەخوداوەندو سەرزنشتتان دەکەن، [13]جا لەبەر ئەو کارانەیان بەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستییەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن. بەئاشتی لەگەڵ یەکتری بژین. [14]بێجگە لەوانە ئەی برایان داواتان لێ‌دەکەین: سەرزەنشتی تەمبەڵەکان بکەن، وورەی ترسنۆکەکان بەرزبکەنەوە. یارمەتی لاوازەکان بدەن، ئارام‌بگرن لەگەڵ هەموو کەسێك، [15]ئاگاداربن پاداشتی خراپە بەخراپە مەدەنەوە، بەڵکو هەمیشە چاکە بکەن لەگەڵ یەکتری‌و لەگەڵ هەموو خەڵك.

[16]هەمیشە دڵشادبن، [17]بەردەوام نوێژبکەن، [18]بۆ هەموو شتێك دەم بەسوپاس‌بن، چونکە ئەمانەیە خواستی خودا سەبارەت بە ئێوە لەعیسای مەسیح.

[19]ڕۆح مەکوژێنەوە، [20]بەسووکی سەیری پێشبینی مەکەن، [21]بەڵکو هەموو شتێك تاقی‌بکەنەوەو چی باشە دەستی پێوە بگرن، [22]لەهەموو جۆرە خراپەیەك دوورکەونەوە.

### سڵاوی کۆتایی

[23]خودای ئاشتی خۆی هەمووتان بەتەواوی پیرۆز بکات‌و ڕۆح‌و دەروون‌و لەشتان بپارێزێ، هەتا بێ کەم‌وکوڕی بن لەکاتی گەڕانەوەی عیسای مەسیحی خوداوەندمان. [24]ئەو خودایەی بانگتان دەکات ڕاستگۆیە بەڵێنی خۆی دەباتەسەر.

[25]ئەی برایان نوێژمان بۆ بکەن.

[26]بـەماچـی پـیرۆز سـلاو لەهـەموو خوشـك‌و بـرایان بکـەن. [27]بـەناوی خوداوەنـدەوە داواتان لـی‌دەکەم ئەم نامەیە بۆ هەموو برایان بخوێننەوە.

[28]بەرەکـەتی عیسـای مەسـیحی خوداوەندمان لەگەڵتان بێت.

# دووهەم نامەی پۆڵس بۆ باوەڕدارانی تەسالۆنیکی

*پۆڵس ئەم نامەیەی نووسی کاتێ زانی باوەڕداران دڵەڕاوکێ دایگرتوون سەبارەت بەڕۆژی هاتنەوەی عیسای مەسیحو هەندێکیان وایتێگەیشتوون کە عیسا هاتۆتەوە.*

*لێرەدا پۆڵس ئەو بیروڕایە ڕاست دەکاتەوە کاتێ دەڵێ ڕۆژی گەڕانەوەی عیسای مەسیح نایێت تاکو خراپەکاریو گەندەڵی نەگاتە ئەوپەڕی، لەو کاتەشدا دژە مەسیح دەردەکەوێ.*

*هەروەها پۆڵس گرنگی چەسپانی باوەڕداران لەباوەڕ دووپات دەکاتەوە گەر تووشی ناخۆشیو ئازاریش هاتبن، داوایان لێدەکات چاو لەئەو و یاوەرەکەی بکەن، چۆن کار دەکەن بۆ پەیداکردنی نانی خۆیان، هەروەها بەردەوامبن لەکرداری چاك.*

# 1

لە پۆڵسو سیلوانسو تیمۆساوسەوە بۆ کۆمەڵەی باوەڕدارانی تەسالۆنیکی لەخودای باوكو عیسای مەسیحی خوداوەندمان. [2]با بەرەکەتو ئاشتی خودای باوكو عیسای مەسیحی خوداوەند لەگەڵتان بێ.

### سوپاسو نوێژکردن

[3]ئەی برایان پێویستە هەموو کاتێ لەپێناوی ئێوەدا سوپاسی خودا بکەین، هەروەك پێویستە، چونکە باوەڕتان زۆر لەپەرەسەندندایە، هەروەها خۆشەویستیتان لەگەڵ یەکتری لەزیاد بوون دایە، [4] تەنانەت ئێمە خۆشمان، لە کۆمەڵەکانی خودا شانازی دەکەین بەباوەڕو بەخۆڕاگرتنتان بەرامبەر بەو چەوسانەوەو ناخۆشیانەی بەرگەی دەگرن.

[5]ئەمە نیشانەیە بۆ حوکمی دادپەروەرانەی خودا، کە ئێوە شیاوی پادشاهێتی ئەون. ئەوەی لەپێناویدا تووشی ئازاردان بوون. [6] لای خودا شتێکی دادپەروەرانەیە، ئازاری ئەوانە بدات کە ئازارتان دەدەن، [7]لەگەڵ ئێمە حەسانەوە بەئێوەش ببەخشی کە ئێستا

لەناخۆشیدان، کاتێ عیسای خوداوەند لەئاسمان ئاشکرا دەکرێ لەگەڵ فریشتە بەتواناکانی لەئاگرێکی گڕدار، [8]سزای تۆڵە دەدات بەسەر هەموو ئەوانەی خودا ناناسنو گوێڕایەڵی مزگێنی عیسای خوداوەند نابن، [9]سزای ئەوانە لەناوچوونی هەتاهەتاییە، دەرکردنیانە لەبەر ڕووی خوداوەندو بێبەش بوونە لەشکۆو توانای ئەو. [10]کاتێ عیسا دەگەڕێتەوە، لەو ڕۆژەدا ستایشی دەکرێ لەلایەن خوشكو برا پیرۆزەکانی، دەبێتە مایەی سەرسوڕمان لەلای ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، چونکە شایەتیمان لای ئێوە باوەڕپێکراو دەبێت.

[11]بۆیە هەموو کاتێك نوێژتان بۆ دەکەینو داوا لەخودا دەکەین تا شایستە بن بۆ بانگەوازەکەیو چی ئارەزووی چاكو کردارێکتان هەیە کە لەباوەڕ سەرچاوە دەگرێ بەتواناوە جێبەجێی بکات. [12]تا ناوی عیسای خوداوەند لەناوتان شکۆدار بێتو ئێوەش شکۆداربن لەئەو بەگوێرەی بەرەکەتی خودامانو عیسای مەسیحی خوداوەند.

## ڕۆڵەی یاخیبوو*

## 2

لەبارەی هاتنەوەی عیسای مەسیحی خوداوەندمانو بوونمان بەیەك لەگەڵ ئەو، شتێك هەیە برایانی خۆشەویست داواتان لێ دەکەین، [2]خێرا بیرتان مەگۆڕنو مەترسن بەهۆی ڕۆحێك یان بیستنی قسەیەك یان پەیامێك خرابێتە پاڵ ئێمە، وا دەریخات گوایە ڕۆژی خوداوەند هاتووە. [3]بەهیچ شێوەیەك ڕێگا مەدەن بەکەس هەڵتانخەڵەتێنێ، چونکە پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە بێت، دەبێ لەپێشا گومڕایی بڵاوبێتەوەو ڕۆڵەی یاخیبوون* دەربکەوێ کە چارەنووسی لەناوچوونە. [4]ئەوەی بەرهەڵستی دەکاتو خۆی بەرزدەکاتەوە بەسەر ئەوەی هەموو خەڵکی پێی دەڵێن خودا یاخود پەرستنو

*ڕۆڵەی یاخیبوون: سەرۆکی هێزەکانی خراپەیە لە کۆتایی زەمانە.

گوێڕایەڵی خودا. تەنانەت لە پەرستگای خودا دادەنیشێت و هەوڵ دەدات بیسەلمێنێ کەوا ئەو خودایە.
[5]لەیادتان نییە من ئەو شتانەم پێ ووتن کاتێ لاتان بووم؟ [6]ئێوە دەزانن چی ناهێڵێ ئەو ڕۆڵە یاخیبووە ئێستا دەربکەوێ، هەتا لەو کاتەی بۆی دیاری کراوە دەربکەوێ. [7]نهێنی ئەو یاخیبوونە ئێستا لەکاردایە، تەنها ئەوەندەی بەسە ئەو بەربەستە لاچێت، [8]ئەوسا ڕۆڵەی یاخیبوون بە ئاشکرا دەردەکەوێ، ئیتر خوداوەند بەهەناسەیەکی دەمی خۆی لەناوی دەبات و بە دەرکەوتنی شکۆی هاتنەوەی کۆتایی پێ دەهێنێت. [9]دەرکەوتنی ئەو یاخیبووە بەهۆی چالاکی شەیتان دەبێت، هەموو هێزو نیشانەو کاری سەرسوڕهێنەری درۆ و دروستکراوی لەگەڵ دەبێت، [10]هەموو جۆرە فێڵێك بەکار دەهێنێت تا لەناوچووان بخەڵەتێنێت، چونکە ئەوان خوشەویستی ڕاستیان ڕەتکردەوە، ئەوەی ڕزگاری ئەوانی تیادایە. [11]لەبەرئەوە خودا چەواشەی گەورەیان بۆ دەنێرێت، تا باوەڕ بە درۆ بکەن، [12]بەمەش تاوانبار دەکرێن ئەوانەی باوەڕ بەراستی ناکەن، بەڵکو حەز لەخراپە دەکەن.
[13]بەلاّم ئێمە ئەی برایانی خۆشەویستی خوداوەند، هەموو کاتێ دەبێ سوپاسی خودا بکەین لەپێناوتان، چونکە خودا لەسەرەتاوە ئێوەی هەڵبژاردووە، تا ڕزگارتان بکات بە پاكو پیرۆزکردنی ڕۆح و باوەڕکردنی ڕاستی. [14]بۆ ئەمە خودا بانگی کردوون بەهۆی مزگێنیمان، تاکو بەشتان هەبێ لەشکۆمەندی عیسای مەسیحی خوداوەندمان. [15]کەواتە ئەی برایان چەسپاوبن لەباوەڕ، لەسەر ئەو فێرکردنانە بڕۆن کە لەئێمە وەرتانگرتووە، گەر پێمان ووتبن یان بۆمان نووسی بن.
[16]باعیسای مەسیحی خوداوەندمان خۆی لەگەڵ خودای باوکمان، ئەوەی خۆشیویستین و دڵنەوایی و هیوای هەتاهەتایی بە بەرەکەت پێ بەخشین، [17]وورەتان بەرز بکاتەوەو بەهێزتان بکات لەهەموو قسەو کردارێکی چاك.

## داوای نوێژکردن

# 3

لەکۆتاییدا ئەی برایان، نوێژمان بۆ بکەن، لێرەش ووشەی خوداوەند ڕێچکەی خۆی وەرگریو شکۆدار بێت وەك لای ئێوە. [2] هەروەها بمانپارێزێت لەمرۆڤی بەدو خراپ، چونکە باوەڕهێنان بەشی هەموو کەس نییە. [3] بەلاَم خوداوەند پشتی پێ دەبەستریّ، بەهێزتان دەکاتو دەتانپارێزیّ لەخراپە. [4] بەهۆی خوداوەند باوەڕمان پێتان هەیە ئەوەی ڕامانسپاردوون کارتان پیّکردووەو کاری پیّدەکەن. [5] با خوداوەند خۆشەویستی خوداو ئارامگرتنی مەسیحتان بخاتە دڵ.

**ئاگاداری بۆ تەمبەڵەکان**

[6] ئەی برایان بەناوی عیسای مەسیحی خوداوەندمان فەرمانتان پێ دەدەین، دووربکەونەوە لەو خوشكو برایانەی بەتەمبەڵی دەژین، بەپێچەوانەی ئەو فێرکردنانەی لەئێمە وەریانگرتووە. [7] ئێوە باش دەزانن چۆن دەبێ ئێمە بکەن بەنموونە بۆ خۆتان، چونکە ئێمە تەمبەڵ نەبووین کاتێ لەناوتان بووین، [8] هیچ نانێکمان بەخۆڕایی لای کەس نەخواردووە، بەڵکو شەو و ڕۆژ ڕەنجمانداوەو ماندووبووین تا نەبین بەقورسایی بەسەر کەستان. [9] ئەمەش ئەوە ناگەیەنیّ مافی ئەوەمان نییە، بەڵکو بۆ ئەوەی خۆمان بکەین بەنموونە بۆتان تا لەسەر ڕێگای ئێمە بڕۆن. [10] کاتێ لەناوتان بووین ئەم ڕاسپاردەیەمان پێتانداوە: (ئەوەی کار نەکات ناخوات.)

[11] چونکە بیستوومانە هەندێك لەناوتان بەتەمبەڵی دەژینو هیچ کارێك ناکەن، دەست لەکاروباری خەڵکی وەردەدەن. [12] ئەوانە بەناوی عیسای مەسیحی خوداوەند فەرمانیان پێ دەدەینو ئاگاداریان دەکەینەوە، بەبیّدەنگی کار بکەنو نانی خۆیان پەیدا بکەن. [13] جا ئەی برایان ماندوو مەبن لەکاری چاکە.

[14] گەر یەکێك لەناوتان گوێڕایەڵ نەبوو بۆ ئەو ووشانەی لەم نامەیە دایە، ئاگاداری بنو پەیوەندی لەگەڵ مەبەستن تا شەرمەزار بێت. [15] بەلاَم وەك دوژمن سەیری مەکەن، بەڵکو ڕێی نیشانبدەنو ئاگاداری بکەنەوە وەك برایەك.

### سڵاوی کۆتایی

[16]ئێستا داوا لەخوداوەندی ئاشتی دەکەم لەهەموو کات‌و بارودۆخێك ئاشتی خۆی ببەخشێ پێتان. خوداوەند لەگەڵ هەمووتان بێت.

[17]من پۆڵسم ئەم سڵاوانە بەخەتی خۆم دەنووسم، ئەمەش نیشانەیەکی دیارە، لەهەموو نامەیەکی من دەریدەخات نووسینی منە. [18]بەرەکەتی عیسای مەسیحی خوداوەندمان لەگەڵ هەمووتان بێت.

# یەکەم نامەی پۆڵس بۆ تیمۆساوس

*تیمۆساوس لە لەسترە لەدایكبووە کە کەوتۆتە وولاٌتی لیقۆنەی ئاسیای بچووك، لەدایکێکی جولەکەو باوکێکی یۆنانی. کاتێ پۆڵس گەڕایەوە لەسترە تیمۆساوسی کردە هاوڕێو یارمەتیدەری خۆی، کە بینی باوەڕدارەکانی ئەوێ بەچاکە باسی دەکەن.*

*نامەی یەکەمی پۆڵس بۆ تیمۆساوس پێش هەموو شتێك ئاگادارکردنەوەیە لەبلاٌوبوونەوەی فێرکردنی چەواشە لەنێوان باوەڕداران. هەروەها ئەم نامەیە هەندێ ڕاسپاردەی جیاجیای پۆڵسی تیادایە بۆ تیمۆساوس دەربارەی بەباشی بەڕێوەبردنی کۆمەڵی باوەڕدارانی ئەفەسۆس و ئەو مەرجانەی پێویستە لەچاودێران و خزمەتکاران بێ. هەروەها ئەو ئەرکانەی دەکەوێتە ئەستۆی تیمۆساوس سەبارەت بەباوەڕداران.*

## 1

[1]لەپۆڵسەوە نێراوی عیسای مەسیح بەفەرمانی خودای ڕزگارکەرمان و عیسای مەسیح کە هیوامانە، [2]بۆ تیمۆساوس ڕۆڵەی ڕاستەقینەم لەباوەڕ. با بەرەکەت و بەزەیی و ئاشتی خودای باوك و عیسای مەسیحی خوداوەند لەگەڵت بێت.

**مەترسی فێرکردنی خراپ**

[3]کاتێ بۆ ناوچەی مەکدۆنیا چووم، داوام لێ کردی لەشاری ئەفەسۆس بمێنیتەوە، تا لەوێ ئەوانە ڕاسپێری کە خەڵکی فێری فێرکردنێك دەکەن لەگەڵ فێرکردنی ئێمە ناگونجێت و [4]گوێ ئەدەن بەشتی ئەفسانەو باسی ڕەچەڵەك کە کۆتایی نییە، چونکە ئەو شتانە دەبێتە هۆی دەمەقاڵێ و ناکۆکی، نایەڵێ خواستی خودا پێشبکەوێت ئەوەی لەباوەڕە. [5]مەبەستی ئەم ڕاسپاردەیە خۆشەویستییە لەدڵێکی پاك و ویژدانێکی چاك و باوەڕێکی بێ دووڕوویی هەڵقوولاٌ بێ. [6]هەندێ کەس ڕوویان وەرگێڕاوە لەم شتانە، لایان باشترە ڕووبکەنە قسەی هیچ و پووچ، [7]ئەوانە دەیانەوێ ببن بە مامۆستای شەریعەت، هەرچەندە ئەوەی دەیڵێن و بڕیاری بۆ دەدەن تێی ناگەن.

[8]ئێمە دەزانین شەریعەت خۆی شتێکی چاکە، گەر یەکێك بەڕاستی وەك شەریعەت بەکاری بهێنێتو [9]بزانێ شەریعەت بۆ مرۆڤی ڕاستودروست دانەنراوە، بەڵکو بۆ بەدکارانو یاخیبووان، خودانەناسانو گوناهباران، پیسو گلاوەکان، دایكوباوك کوژان، خوێن ڕێژەکان، [10]بۆ داوێنپیسانو هەتیوبازان، ڕفێنەری خەڵکی، درۆزنو سوێندخۆرانی بەدرۆ، ئەوانەی دژی فێرکردنی ڕاستن، [11]ئەوەی لەگەڵ مزگێنی شکۆداری خودای پیرۆز ڕێك دەکەوێ، ئەوەی خودا بە متمانە پێی بەخشیووم.

**سوپاسکردن بۆ بەزەیی خودا**

[12]سوپاسی عیسای مەسیحی خوداوەندمان دەکەم کە هێزی پێم بەخشیووەو کردوومی بەجێگەی بڕوای خۆی، دەستنیشانیکردم بۆ خزمەتکردنی. [13]هەرچەندە جاران کفرم بەرامبەر کردووەو چەوساندومەوەو جنێوم پێداوە. بەڵام بەزەیی پێمهاتەوە، چونکە بە نەزانیو بێ باوەڕی ئەو کارانەم کردبوو، [14]لەگەڵ ئەوەش خوداوەند بەرەکەتی خۆی بەسەرمدا ڕژاند لەگەڵ باوەڕو خۆشەویستی ئەوەی لەعیسای مەسیحدایە.

[15]بێگومان ئەم قسەیە ڕاستەو شایانی قبوولکردنە: (عیسای مەسیح هاتووە بۆ جیهان بۆ ڕزگارکردنی گوناهباران)، کە من یەکەمیانم. [16]هەر لەبەرئەوە بوو خودا بەزەیی پێمداهاتەوە، تا یەکەمجار لەمن دەرکەوێ عیسای مەسیح چەند ئارامیگرتوو، هەروەها من بکات بە نموونەیەك بۆ ئەوانەی باوەڕی پێدەهێنن بۆ بەدەستهێنانی ژیانی هەتاهەتایی. [17]بۆ پادشای زەمانەکان، نەفەوتاو و نەبینراوە، خودای تاكو تەنیا، ڕێزدارو شکۆدار بێت تاهەتایە! ئامین.

[18]کوڕم تیمۆساوس، ئەم ڕاسپاردانەت پێدەسپێرم، بەپێی ئەو پێشبینیانەی لەزووەوە دەربارەی تۆ ووتراوە، تاوەکو بەهۆی بەدواچوونی ئەوانەوە بتوانی باش تێبکۆشی لە جەنگی ڕۆحیدا، [19]ئەمەش بە باوەڕی بەهێزو ویژدانی چاك دەبێت کە هەندێکیان ڕەتیان کردۆتەوە، بەمەش کەشتی باوەڕیان تێكشکا. [20]لەوانە هیمینایۆسو ئەسکەندەر، جا ئەوانم

دایە دەستی شەیتان، تا هۆشیان بەخۆیان بێتەوەو کفر نەکەن.

## نوێژکردن بە کۆمەڵ

# 2

لەپێش هەموو شتێك داوا دەکەم، داخوازی بەکوڵتان بەرزبکەنەوە بۆ لای خوداو نوێژی بۆ بکەنو لێی بپارێنەوەو سوپاسی بکەن بۆ هەموو خەڵکی، [2]هەروەها بۆ پادشاو دەسەڵاتدارەکان، تا بە هێمنیو ئاشتی بژین بە خوداترسیو ڕێزەوە. [3]ئەمەش شتێکی چاكو پەسەندکراوە لای خودای ڕزگارکەرمان، [4]ئەوەی دەیەوێ هەموو خەڵکی ڕزگاریان بێتو بۆ ڕاستی ناسین بێن. [5]چونکە هەر یەك خودا هەیەو یەك پەیوەندیڕێکخەر هەیە لەنێوان خوداو مرۆڤدا، ئەویش عیسای مەسیحی مرۆڤە. [6]ئەوەی خۆی بەختکرد وەك کەفارەت بۆ هەمووان، شایەتی ئەمەش لەکاتی خۆی بوو، [7]خودا منی کردووە بە مزگێنیدەرو نێرراوی خۆی بۆ ئەمە. من ڕاستیتان پێ دەڵێمو درۆ ناکەم، فێرکەری باوەڕو ڕاستیم بۆ گەلان.

[8]دەمەوێ پیاوان لەهەموو شوێنێك نوێژ بکەن، دەستی پاکیان بەرزبکەنەوە بێ تووڕەییو ناکۆکی. [9]ژنانیش با خۆیان بە جلێك برازێننەوە ڕێزو ئابڕووی تیابێت، نەك خۆیان برازێننەوە بە پرچی ئەگریجەکراو و بەزێرو مرواریو جلی گرانبەهاوە، [10]بەڵکو بە کرداری چاك شایانی ژنێکی لەخواترس بێت.

[11]ژن دەبێت بە بێدەنگیو ملکەچی فێر بێت. [12]من ڕێگا نادەم بەژن خەڵکی فێربکاتو زاڵ بێت بەسەر پیاو، بەڵکو دەبێت بێدەنگ بێت، [13]چونکە خودا یەکەمجار ئادەمی دروستکرد ئینجا حەوا، [14]هەروەها ئادەم نەبوو هەڵخەڵەتا، بەڵکو ژن بوو هەڵخەڵەتاو کەوتە گوناهەوە. [15]بەڵام ژن بە منداڵبوون ڕزگاری دەبێت گەر لەسەر خۆشەویستیو باوەڕو پیرۆزیو ڕەفتار جوانی بەردەوام بێت.

## مەرجەکانی چاودێر

# 3

ئەم ووشەیە ڕاستە: کێ بیەوێ ببێ بەچاودێر، ئەوە دەیەوێ کارێکی چاك بکات. [2]چاودێر دەبێ بێ

کەموکوڕی بێت، یەك ژنی هەبێت، ژیرو ووریا بێت، بەئابڕوو و بەرێز بێت، میوانداری نامۆ بکات، بتوانێ خەڵکی فێر بکات، [3]سەرخۆش‌و شەڕفرۆش نەبێت، بەڵکو زمانشیرین بێت، حەزی لەناکۆکی نەبێت، چاوی لە پارە نەبێت، [4]خێزانەکەی بەباشی بەڕێوە ببات، منداڵی ملکەچو بەڕێز بن. [5]گەر یەکێك نەتوانێ بەباشی خێزانەکەی بەڕێوە ببات، ئیتر چۆن دەتوانێت بایەخ بەکۆمەڵی خودا بدات؟ [6]چاودێر دەبێ تازە نەبێت لەباوەڕ، تا تووشی لووت‌بەرزی‌و ئەو سزایە نەبێت کە بەسەر شەیتان دراوە، [7]دەبێت ناوبانگی باش بێت لای ئەوانەی لەدەرەوەن، تاوەکو قسەی نەیەتەسەرو بکەوێتە داوی شەیتان.

**مەرجەکانی خزمەتکار**

[8]هەروەها خزمەتکاران دەبێ بەڕێز بن، دوو زمان نەبن، سەرخۆش نەبن، هەوڵی بە دەست‌هێنانی دەستکەوتی حەرام نەدەن، [9]دەبێ بە ویژدانێکی پاك دەست بە نهێنی باوەڕەوە بگرن، [10]یەکەمجار دەبێت تاقی‌بکرێنەوە، کە دەرکەوت بێ کەموکوڕین، ئینجا بۆیان هەیە دەست‌بکەن بەکاری خۆیان وەك خزمەتکار.

[11]هەروەها ژنەکانیشیان دەبێ بەڕێز بن، بوختانکەر نەبن، بەڵکو ژیرو ووریابن، سەرڕاست‌و پاك بن لەهەموو شتێك. [12]ئەو خزمەتکارانە تەنها دەبێ یەك ژنیان هەبێ، بەباشی ماڵو منداڵیان بەڕێوەببەن، [13]چونکە ئەو خزمەتکارانەی بەڕێك‌و پێکی بەکاری خۆیان هەڵدەستن، ناوبانگی باش‌و متمانەیەکی مەزن لەباوەڕیان بەعیسای مەسیح بەدەست دەهێنن.

**مەزنترین نهێنی**

[14]من هەموو ئەو شتانەم بۆ نووسیوی، هەرچەندە هیوادارم ماوەیەکی کەم خۆم بێم بۆ لات، [15]بەڵام گەر نەمتوانی بێم بۆ لات، خۆت دەزانی چۆن ڕەفتار دەکەیت لەماڵی خودا، واتە کۆمەڵی خودای زیندوو، کە کۆڵەکەو بناغەی ڕاستییە. [16]هیچ گومانی تیادا نییە، ئێمە نهێنی خواترسی ڕادەگەیێنین:

(ئەو لەشێوەی لەش دەرکەوت،
ڕۆحی پیرۆز شایەتی

ڕاستییەکەیدا،
لەلایەن فریشتەکان بینرا،
لەنێو گەلان مزگێنی پێدرا،
لەجیهان باوەڕی پێکرا،
بەرزکرایەوە بۆ شکۆداری.)

### فێرکەرانی دووڕوو و درۆزن

# 4

ڕۆحی پیرۆز بەڕوونو ئاشکرا پێمان دەڵێ، لە کۆتایی زەمانە هەندێ کەس لەباوەڕیان هەڵدەگەڕێنەوە، شوێنی ڕۆحی چەواشەو فێرکردەکانی شەیتان دەکەون، [2]هی ئەوانەی دووڕوو و درۆزنن، ویژدانیان داخکراوەو مردووە، [3]ئەوانە ڕێگای ژنهێنانو شووکردن لەخەڵکی دەگرن، هەروەها جۆرەها خواردن کە خودا دروستی کردووە تا بەسوپاسەوە لەگەڵ باوەڕدارانو ئەوانەی ڕاستییان ناسیووە بخورێ، ئەوانە قەدەغەی دەکەن. [4]هەموو ئەو شتانەی خودا دروستیکردووە چاکە، هیچی خراپی تێدا نییە گەر مرۆڤ بەسوپاسەوە وەریگرێت، [5]چونکە هەموو ئەو شتانە بەهۆی ووشەی خوداو نوێژەوە پیرۆز دەبێت.

### خزمەتکاری باشی مەسیح

[6]گەر تۆ ئەم شتانە وا بەبیری خوشكو برایان بخەیتەوە، ئەوا دەبیت بەخزمەتکارێکی باشی عیسای مەسیح، لەسەر ووشەی باوەڕو فێرکردنی ڕاست دەڕۆیت، ئەوەی تۆ شوێنی کەوتووی. [7]خۆت دووربخەوە لەخوانەناسو ئەفسانەی هیچو پووچ، [8]خۆت ڕابهێنە لەسەر خواترسی. وەرزشی لەش بۆ هەندێ شت باشە، بەڵام خواترسی بۆ هەموو شتێك باشە، چونکە بەڵێنی ژیانی ئێستاو داهاتووی تێدایە.

[9]ئەم ووتەیە ڕاستەو شایانی قبوڵ کردنی تەواوە. [10]ئێمە بۆ ئەوە ماندوو دەبینو تێدەکۆشین، چونکە هیوامان بە خودای زیندووە، ئەوەی ڕزگارکەری هەموو خەڵکە بەتایبەتی باوەڕداران.

[11]بەم شتانە خەڵکی فێر بکەو ڕایانسپێرە. [12]ڕێگا بەکەس مەدە گاڵتە بەگەنجێتیت بکات، بەڵکو ببە بەنموونە بۆ باوەڕداران لەقسەو هەڵسوکەوت، لەخۆشەویستیو باوەڕو پاکیت. [13]تا کاتی هاتنم لەسەر خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز بەردەوامبە، هەروەها لەسەر

ووتاردانو فێرکردنیان. [14]ئەو بەهرەیەی هەتە پشت‌گوێی مەخە، ئەوەی بە وەحی وەرت‌گرتووە کاتێ پیران دەستیان خستە سەرت.

[15]بایەخ بەم شتە بدە، هەموو توانای خۆتی تیادا بەکار بهێنە تا پێشکەوتنت دەربکەوێ لەهەموو شتێك بۆ هەموو خەڵکی. [16]باش ئاگاداری خۆت‌و فێرکردنت‌بە، بەردەوامبە لەسەر ئەوە، چونکە گەر ئەمەت‌کرد خۆت‌و گوێگرانیشت ڕزگاریان دەبێت.

### شێوەی هەڵسوکەوتی باوەڕداران

## 5

بەڕەقی هەڵسوکەوت لەگەڵ پیاوی بەتەمەن مەکە، بەڵکو وەك باوکی خۆت بەنەرمونیانی وورەی‌بەرز بکەوە، لەگەڵ گەنجان وەك برای خۆت، [2]هەروەها لەگەڵ پیرێژنان وەك دایکی خۆت، لەگەڵ کچان وەك خوشکی خۆت بە پاکی.

### دەربارەی بێوەژنان

[3]ڕێز لەو بێوەژنانە بگرە کە بەڕاستی بێوەژنن. [4]جا گەر بێوەژنێك منداڵو وەچەی هەبێت، با فێربن یەکەم ئەرکی سەرشانیان ئەوەیە چاکە بکەن لەگەڵ کەسوکاریانو پاداشتی دایك‌و باوکیان بدەنەوە، چونکە ئەمە پەسەندکراوە لای خودا. [5]بێوەژنی ڕاستەقینە ئەوەیە کەسی نییە بەخێوی بکات، هەموو هیوایەکی خودایە، شەو و ڕۆژ نوێژی بۆ دەکات‌و لێی‌دەپاڕێتەوە. [6]بەڵام ئەو بێوەژنەی خۆی داوەتە دەستی خۆشی ژیان، ئەوە مردووە هەرچەندە زیندووش بێت. [7]جا ئەم شتانەیان پێ ڕاسپێرە تادوایی بێ کەموکوڕی بن. [8]کێ نایەوێ بایەخ بەکەس‌وکاری بدات بەتایبەتی بەئەندامانی خێزانەکەی، ئەوە باوەڕی ڕەتکردووەتەوەو خراپترە لە بێ باوەڕان.

[9]بێوەژن کاتێ لە لیستەی بێوەژنان ناوی دەنووسرێت کە بەلایەنی کەمەوە تەمەنی شەست ساڵ بێت‌و یەك مێردی هەبوو بێت. [10]ناسراو بێت بەوەی کاری چاکەی کردووە، منداڵەکانی بەباشی بەخێوکردووە، میوانداری خەڵکی کردووە، پێی خوشك‌و برا پیرۆزەکانی شتووە، یارمەتی لێقەوماوانی داوە، بە هەموو کارێکی چاك هەستاوە.

[11]بـــــــێوەژنانی گـــــــەنج ڕەتدەکرێنەوە لەم لیستەیە، چونکە گــەر ئارەزووەکانــیان لەمەســیح دووریـان بخاتــەوە، حەز دەکەن شوو بکەنـەوە. [12]ئیـنجا تاوانبار دەکرێن، چونکە بەڵێنی یەکەمیان شکاندووە. [13]بێجگـە لـەمـەش فـێری بێئیشیو ماڵەو ماڵکردن دەبن، هەروەها فێری زۆر قســەکردنو خۆخســتنە نــاو کاروباری خەڵك دەبن، باسی شتێك دەکـەن پـەیوەندی بـەوان نیـیە. [14]کەواتــە بـا بـێوەژنانی گـەنج شـوو بکەنـــەوە، تـــا منداڵـــیان ببێـــت، کاروبـاری ماڵـیٚ خۆیان بەڕێوەببەن، ڕێگا بەدوژمن نەدەن قسەیان پێبڵێن. [15]ئەمـــەش بەڕاســـتی لەبەرئـــەوەی هەندێکـیان لـەڕێ دەرچوونو دوای شەیتان کەوتوون.
[16]گـەر یەکـێك لـەکەسـوکاری بـاوەڕداران بـێوەژن بـوو، پێویسـتە لەسـەریان یارمـەتیبـدەن، تـا نەبێت بـەبار بەسـەر کۆمەڵی باوەڕداران بۆ ئـەوەی کۆمەڵە بتوانێ یارمەتی ئەوانە بدات کە بەڕاستی بێوەژنن.

**پیرانی کۆمەڵە**

[17]ئــەو پیرانـــەی بـــەباشـــی بەڕێوەبەرایـــەتی دەکـــەن، شـــایانی ڕێـزێکی زۆرن، بـە تایـبەتی ئەوانەی ماندوو دەبن لەووشەو فێرکردن. [18] چونکە کتێبی پیرۆز دەڵێ: {دەمی گا لـەکاتی ئالـیك خـواردن مەگـرە}، هەروەها دەڵێ: {کرێکار مافی کرێی خۆی هەیە.} [19]ڕازی مەبە بەشکاتێك دژی پیران بکرێت، تەنها مەگەر دوو یان سێ کەس شایەتی بۆ ئەوە بدەن. [20]گەر دەرکەوت ئەو کەسە بەڕاستی هەڵـەی کردووە، لەبەردەم هەمووان سەرزەنشـتی بکـە، تـا ئـەوانی دیکە بترسن.
[21]داوات لـێدەکـەم لەبــەردەم خــوداو عیســای مەسـیحو فریشـتە هەڵـــبژێراوەکانی، لەســـەر ئـــەم ڕاسپاردانە بڕۆیـت، بـێ جیاوازیو لایــەنگیری، لەهـــەر شـــتێك کـــە دەیکەیت.
[22]بەپەلــە دەســت مەخــە ســەر کـەس، بەشداری لەگوناهی خەڵکی دیکە مەکە، خۆت بەپاکی ڕابگرە.
[23]لەمــەولا تــەنها ئــاو مــەخۆوە، بـەڵکو تۆزێ شەرابیش لەبەر گەدەو ئەو نەخۆشیە زۆرانەی هەتە.
[24]هــەندێ کــەس پــێش ڕۆژی لــێپرسـینەوە گوناهەکانیان ئاشکرایە

بەرەو حوکمدان دەڕوات، هەندێکی دیکە گوناهەکانیان دواتر دەردەکەوێ. [25]بەهەمان شێوە کرداری چاکیش ئاشکرا دەبێ، تەنانەت ئەوانەی ئاشکراش نین ناتوانرێ بەشاراوەیی بمێنێتەوە.

### مەسەلەی کۆیلە

## 6

با هەموو ئەوانەی لەژێر نیری کۆیلایەتین، ئەوپەڕی ڕێز لەگەورەکانیان بگرن، تا قسەی خراپ نەخرێتە پاڵ ناوی خوداو فێرکردنەکەی. [2]ئەوانەی گەورەکانیان باوەڕدارە نابێ بەسووکی سەیریان بکەن، چونکە بران لەباوەڕ، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێ بەملکەچی خزمەتیان بکەن، چونکە ئەوانەی خزمەتیان دەکەن باوەڕدارو خۆشەویستن. جا هەمووان فێری ئەم شتانە بکەو ئاگاداریان بکەوە.

### خۆشەویستی پارە

[3]گەر یەکێك فێرکردنیکی تری فێرکرد کە نەگونجێت لەگەڵ ووشەی ڕاستی عیسای مەسیحی خوداوەندمانو لەگەڵ ئەو فێرکردنەی لەسەر خوداترسی وەستاوە. [4]ئەوە یەکێکە لووتبەرزی کوێری کردووەو هیچ شتێك تێناگات، حەز لەشەڕەقسەو دەمدەمانێ دەکات کە دەبێتە هۆی چاوپیسی، ململانێ، جنێو، بیری خراپو [5]جۆرەها ناکۆکی، ئەمانەش ئەو کەسانە دەیکەن کە بیریان خراپ بووەو ڕاستییان وونکردووە، خواترسی بەبازرگانی دادەنێن.

[6]ڕاستە خواترسی گەر بەقەناعەتەوە بێت قازانجێکی گەورەیە، [7]چونکە هیچمان نەهێناوە بۆ جیهان، ئاشکرایە ناتوانین هیچیشی لێبەینە دەرەوە. [8]جا گەر خواردنو بەرگمان هەبوو با پێی ڕازیبین. [9]بەڵام ئەوانەی حەز دەکەن دەوڵەمەند بن، دەکەونە تاقیکردنەوەو داو، هەروەها دەکەونە زۆر ئارەزووی کوێرانەی زیانبەخش کەوا دەکات مرۆڤ تێبکەوێتو لەناوبچێ. [10]چونکە خۆشەویستی پارە سەرچاوەی هەموو خراپەیەکە، گەر خەڵکی بەدوایدا بگەڕێن ووندەبن لەباوەڕیانو خۆیان تووشی

ئازارێکی زۆر دەکەن.

**تێکۆشانی باوەڕ**

[11]بەڵام تۆ، ئەی پیاوی خودا لەم شتانە دووربکەوە، شوێنی ڕاستودروستیو لەخواترسیو باوەڕ، خۆشەویستیو ئارامگرتنو زمان شیرینی بکەوە. [12]تێکۆشانێکی باش تێبکۆشە لەباوەڕدا، دەست بەژیانی هەتاهەتاییەوە بگرە، ئەوەی خودا بانگی کردووی بۆی، کاتێ زۆر باش دانتپیاناوە لەبەردەم شایەتی زۆر. [13]ڕاتدەسپێرم لەبەردەم ئەو خودایەی ژیان بە هەمووان دەداتو لەبەردەم عیسای مەسیح، ئەوەی باشترین شایەتیدا لەلای پیلاتۆسی پونتی، [14]کەوا لەسەر ئەو ڕاسپاردانە بڕۆیت بەپاکیو بێکەموکوڕی هەتا ڕۆژی دەرکەوتنی عیسای مەسیحی خوداوەندمان. [15]ئەوەی خودا لەکاتی دیاریکراو دەریدەخات، پیرۆزو تاقە سەرۆك، پادشای پادشایان، گەورەی گەورەکان، [16]تەنها ئەو نەمرە، لەڕووناکی نیشتەجێیەو کەس لێی نزیك نابێتەوە، ئەوەی کەس نەیبینیوەو ناتوانێ ببینێت، بۆ ئەوە ڕێزو توانای هەتاهەتایی! ئامین.

[17]دەوڵەمەندەکانی ئەم جیهانە ڕاسپێرە لووتبەرز نەبنو هیوایان بەسامانی لەناوچوو نەبێت، بەڵکو بەخودا کە هەموو شتێکمان بەتێروپڕی دەداتێ هەتا خۆشی لێببینین. [18]با چاکە بکەنو لەکاری چاکە دەوڵەمەند بن، لەبەخشین دڵفراوان بن، ئامادەبن بەشی خەڵکیتر لەسامانیان بدەن، [19]بەم شێوەیە گەنجینەو بناغەیەکی چاك بۆ دوارۆژ دادەنێنو ژیانی ڕاستەقینە بەدەست دەهێنن.

[20]تیمۆساوسی خۆشەویست، بەباشی پارێزگاری ئەو شتە بکە کە خودا داویەتی پێت، خۆت دووربخەوە لەهەموو ووتەیەکی هیچو پووچو لەو ووتە بێکەڵکانەی خەڵکی ناویانناوە زانست، [21]جا هەندێك هەن باوەڕیان لەدەستچووە، چونکە دوای ئەو زانستە کەوتوون.

بەرەکەتتان لەگەڵ بێت.

# دووەم نامەی پۆڵس بۆ تیمۆساوس

*ئەم نامەیە هەندێ ڕاسپاردەی تایبەتی پۆڵسی تێدایە بۆ تیمۆساوس، مەبەستە سەرەکیەکەی ئەوەیە، پێویستە پارێزگاری لەپەیامی مزگێنی بکات، وەك چۆن خۆی پارێزگاری کردووە. پۆڵس تیمۆساوسی یارمەتیدەری هاندەدا بۆ ئەوەی بەئەرکی خۆی هەستێ وەك مامۆستاو مزگێنیدەر سەرەڕای ئازارو ناخۆشی زۆر، هەروەها ئاگاداری دەکاتەوە لەمەترسی مامۆستا درۆزنەکانو بیروڕا تاریكو خراپەکانیان، چونکە ئەوەی گوێیان لێبگرێ ژیانی تێکدەچێ.*

*لەهەموو ئەمانەشدا پۆڵس ئەوە بەیادی تیمۆساوس دەهێنێتەوە کە ژیانی چۆن بووەو چۆن ئەو نموونەی باوەڕو ئارامگرتنو خۆشەویستیو چالاکیو بەرگەگرتن بووە لەئازاری چەوسانەوە، چونکە بەهۆی ڕۆحی پیرۆز دەیزانی کاتی ئەوە هاتووە بچێتە لای خودای خۆی، بۆیە ئەم شتانە وەك دوا ڕاسپاردە، دەیهێنایەوە یادی.*

## 1

لەپۆڵسەوە ئەوەی لەسەر خواستی خودا نێرراوی عیسای مەسیحە لەپێناوی بەڵێنی ژیان کە لەعیسای مەسیح دایە، [2]بۆ کوڕی خۆشەویستم تیمۆساوس، با بەرەکەتو بەزەییو ئاشتی خودای باوكو عیسای مەسیحی خوداوەندمان لەگەڵت بێ.

### هاندان بۆ ئازار چەشتن

[3]سوپاسی خودا دەکەم ئەوەی بەویژدانێکی پاك دەیپەرستم هەروەك باپیرانم پەرستوویانە، کاتێ بە شەو و ڕۆژ لەنوێژەکانم یادت دەکەم، [4]کاتێ یادی فرمێسکەکانت دەکەمەوە زیاتر ئارەزووی بینینت دەکەم تا دڵخۆش بم. [5]هەروەها یادی باوەڕی ڕاستت دەکەم، ئەوەی یەکەمجار لەدڵی لوئیسی دایەگەورەتو ئەفنیکی دایکت بوو، من دڵنیام لەدڵی تۆشدایە. [6]لەبەرئەوە ئەو بەهرەیەی خودا کە تیاتدایە بەبیرت دەهێنمەوە هەڵیگیرسێنی، ئەوەی وەرتگرت کاتێ دەستم خستە سەرت. [7]چونکە خودا ڕۆحی ترسی

بەئێمە نەداوە، بەڵکو ڕۆحی هێزو خوشەویستیو خۆڕاگری.

[8]بۆیە شەرمت بەوە نەبێ شایەتی بۆ خوداوەندمان بدەیت، هەروەها شەرمت بەمن نەبێ کە ئێستا لەپێناوی ئەودا بەندکراوم، بەڵکو بەشداری ئازار بکە بۆ مزگێنی، لەوەش پشت بەهێزی خودا ببەستە.

[9]ئەوەی ڕزگاری کردینو بانگی کردین بەبانگەوازێکی پیرۆز، ئەمەش بەهۆی کردارمان نەبوو، بەڵکو ئەوە خواستو بەرەکەتی خودایە بۆ ئێمە کە لەسەرەتاوە بەهۆی عیسای مەسیحەوە داویەتی پێمان، [10]ئێستا ئاشکرا بوو بەدەرکەوتنی عیسای مەسیحی ڕزگارکەرمان، ئەوەی مردنی لەناوبردو ڕووناکی خستە سەر ژیانو نەمری بەهۆی مزگێنیەوە، [11]ئەو مزگێنییەی من بۆی بووم بە ووتاردەرو نێرراو و مامۆستا. [12] لەپێناوی ئەوە ئێستا ئەم ئازارانە دەچێژم، بەڵام شەرمی پێوە ناکەم، چونکە دەزانم باوەڕم بەکێ هەیە، دڵنیام خودا دەتوانێ پارێزگاری ئەو شتەم بۆ بکات کەوا بۆی داناوم تا ئەو ڕۆژە.

**ئەوەی لات دانراوە بیپارێزە**

[13]دەست بەو ووشە ڕاستانە بگرە کە لەمنەوە بیستووتە، بەو باوەڕو خۆشەویستیەی لەعیسای مەسیح دایە. [14]ئەو شتە چاکەی لای تۆ دانراوە، پارێزگاری بکە بەڕۆحی پیرۆز کە لەئێمە دایە.

[15]تۆ دەزانی هەموو ئەوانەی لەناوچەی ئاسیان وازیان لێ هێنام، لەوانە فیجلۆسو هرمۆجینیس.

[16]خودا بەزەیی بەخێزانی ئونیسیفورس بێتەوە، چونکە زۆرجار ووڕەی بەرزکردومەوەو یارمەتیداوم، شەرمی نەکردووە بە کۆتو زنجیرم. [17]بەڵکو کاتێ هات بۆ ڕۆما زۆر بەدوامدا گەڕا تا منی دۆزیەوە. [18]داواکارم لەڕۆژی لێپرسینەوە خوداوەند بەزەیی پیابێتەوە، تۆ باش دەزانیت کاتێ لەئەفەسۆس بووم ئەو چەند خزمەتی کردم.

**بەشداری ئازار بکە**

## 2

تۆ ئەی کوڕی خۆم، بەهێزبە بەو بەرەکەتەی لەعیسای مەسیحدایە. [2] هەروەها ئەوەی لەمنەوە بیستووتە

لەبەردەم چەندەها شایەت، بیدە بەو کەسانەی پشتیان پێدەبەسترێ‌و توانای ئەوەیان هەیە خەڵکی‌تر فێر بکەن. [3]بەشداری ئازار بکە وەك سەربازێکی چاك بۆ عیسای مەسیح. [4]سەربازێك بیەوێ سەرۆکەکەی ڕازی بکات، خۆی خەریك ناکات بەکاروباری ژیانی ڕۆژانە. [5]یاریزان هەرگیز پاداشتی سەرکەوتن وەرناگرێ گەر پێشبڕکێ بەگوێرەی یاسای یاریەکە نەبێت. [6]هەروەها ئەو جوتیارەی ماندوو دەبێت دەبێ یەکەم کەس بێت بەشی خۆی وەرگرێ لە بەروبوومدا. [7]بیرکەوە لەوەی دەیلێم، خوداوەند یارمەتیت دەدات لەهەموو شتێك تێبگەیت.

[8]یادی عیسای مەسیح بکە، ئەوەی لەنێو مردووان هەستایەوە، لەنەوەی داود بوو بەگوێرەی مزگێنی من، [9]ئەوەی لەپێناوی‌دا ئازار دەچێژم‌و کۆت‌کراوم وەك تاوانبارێك، بەڵام ووشەی خودا بەزنجیر نابەسترێتەوە. [10]لەبەرئەوە بەرگەی هەموو شتێك دەگرم، لەپێناوی ئەوانەی خودا هەڵیبژاردن، تا ئەوانیش ڕزگاری‌و شکۆمەندی هەتاهەتایی بەدەست‌بهێنن کە بەهۆی عیسای مەسیحە.

[11]ئەمە بەدڵنیایی ڕاستە:
(گەر لەگەڵ مەسیح بمرین،
لەگەڵ ئەو دەژین،
[12]گەر لەپێناوی‌دا دان‌بگرین،
لەگەڵی فەرمانڕەوایی دەکەین،
گەر ئێمە نکۆڵی لێ‌بکەین،
ئەویش نکۆڵیمان لێ‌دەکات،
[13]گەر ئێمە دڵسۆز نەبین،
ئەو بەدڵسۆزی دەمێنێتەوە،
چونکە ناتوانێ نکۆڵی لەخۆی بکات.)

**ئیشکەری ووشەی ڕاست**

[14]ئەم شتانەیان بیربخەوەو لەشەڕەقسە ئاگاداریان بکەوە لەبەردەم خودا، چونکە ئەمە هیچ سوودێکی نیە جگە لەسەر لی‌تێکدانی ئەوانە نەبێت کە گوێی بۆ دەگرن. [15]هەوڵبدە ڕەزامەندی خودا بەدەست‌بهێنیت، ببیت بەئیشکەرێك کەوا شتێك ناکات جێی شەرم بێت‌و ووشەی ڕاستی بەراستی ڕوون بکەیتەوە. [16]خۆت دووربخەوە لەقسەی هیچ‌و پووچی

هەندێ کەس، ئەوەی زیاتر خەڵکی لەخودا دووردەخاتەوە، [17]ئەوانە ووشەکانیان دەوروبەرەی دەخوات وەك نەخۆشیەکی کوشندە، مەبەستم لەهیمینایۆس‌و فیلیتۆسە، [18]ئەوانە لەرێگای ڕاست دەرچوون‌و دەڵێن هەستانەوە ڕوویداوە، بەم شێوەیە باوەڕی هەندێ کەسیان تێکداوە. [19] بەڵام ئەو بناغە بەهێزەی خودا دایناوە بەپتەوی دەمێنێتەوە، ئەم مۆرەی لەسەرە: {خوداوەند ئەوانەی هی خۆیەتی دەیانناسێت.} و (ئەوەی ناوی خوداوەند بهێنێت، دەبێ لە گوناە دووربکەوێتەوە.)

[20]لەماڵێکی گەورەدا هەر جامی زێڕو زیوی تێدا نییە، بەڵکو جامی تەختەو لەقوڕ دروست کراویش، هەندێکیان بۆ ڕێزلێنانن ئەوانی تر بۆ کاروباری ئاسایین. [21]جا ئەگەر یەکێك خۆی پاك‌کردەوە لەهەموو ئەو خراپانەی، ئەوا دەبێت بەجامێك بۆ ڕێزلێنان، پیرۆزو سوودبەخشە بۆ خاوەنەکەی، ئامادەیە بۆ هەموو کارێکی چاك.

[22]لەئارەزووەکانی گەنجێتی دووربکەوە، بەدوای ڕاستودروستی‌و باوەڕو خۆشەویستی‌و ئاشتی بگەڕێ لەگەڵ ئەوانەی بەدڵێکی پاك خوداوەند بانگ‌دەکەن. [23]لەگفتوگۆی هیچ‌و پووچ دووربکەونەوە، تۆ دەزانی ئەوە دەبێتە هۆی شەڕو ناکۆکی. [24] بەندەی خوداوەند نابێ شەڕفرۆش بێت، بەڵکو دەبێ بەبەزەیی‌و زمان شیرین بێت لەگەڵ هەمووان، توانای فێرکردنی هەبێ، لەکاتی تەنگانە دان بەخۆی‌بگرێ. [25]ئەوانەی بەربەرەکانی دەکەن بەنەرم‌و نیانی ڕاستیان بکاتەوە، لەوانەیە خودا بەرەو تۆبەکردن‌و ناسینی ڕاستیان ببات، [26]تا هۆشیان‌بێتەوە بەخۆیان‌و لەداوی شەیتان ڕابکەن، ئەوەی بەندی‌کردوون تا خواستی ئەو جێ‌بەجێ بکەن.

## نیشانەکانی ڕۆژانی دوایی

3

شتێکی‌تر هەیە بیزانە، کاتێکی ناخۆش‌و خراپ دێت لەڕۆژانی دواییدا، [2]خەڵکی خۆیان خۆش‌دەوێ، پارەیان خۆش‌دەوێ، لووت‌بەرز دەبن، شانازی بەخۆیان دەکەن، جنێودەدەن، گوێڕایەڵی دایك‌و باوك نابن، هیچیان لەبەرچاو

نابێت، گلاۆن، [3] بێبەزەیی دەبن، لەیەکتر خۆشنابن، قسە دروست دەکەن، بەرەڵلا دەبن، درندەن، حەز لەچاکە ناکەن، [4] ئەوانە ناپاکن، سەرەڕۆن، لەووتبەرزی کوێری‌کردوون، ڕابواردنیان بەلاوە باشترە لەخۆشەویستی خودا، [5] بەڕواڵەت لەخواترس دیارن، بەڵام هێزو ناوەڕۆکی خواترسی ڕەتدەکەنەوە، جا لەو کەسانە دوور بکەونەوە.

[6] تەنانەت هەندێك لەوانە دەگەڕێن بەماڵاندا، هەوڵدەدەن ئەو ژنە لاوازو گوناهبارانە بخەڵەتێنن کە شوێنی هەموو جۆرە ئارەزوویەکی خراپ کەوتوونو [7] هەمیشە گوێ بۆ فێرکردن دەگرن، بەڵام هەرگیز ناتوانن بەتەواوی ڕێگای ڕاستی بناسن! [8] هەروەك یەنیسو یەمبریسی ﴿جادوگەران﴾ بەربەرەکانی موسایان‌کرد، هەروەها ئەوانەش بەربەرەکانی ڕاستی دەکەن، ئەو کەسانە مێشکیان تێکچووەو لەلایەن باوەڕەوە ڕەتکراونەتەوە. [9] جا ئەوانە زیاتر پێش ناکەون، چونکە بێمێشکییان بۆ هەموو کەسێك دەردەکەوێ، هەروەك بێمێشکی یەنیسو یەمبریس دەرکەوت.

**لەسەر باوەڕت بمێنەوە**

[10] بەڵام تۆ، هەموو شتێك دەزانی دەربارەی: فێرکردنم، هەڵسوکەوتم، ئامانجم لەژیان، باوەڕم، دان بەخۆگرتنم، خۆشەویستیم، چەسپاویم، [11] چەوسانەوەمو ئازارم، هەروەها ئەو شتانەی لەشاری ئەنتاکیاو ئیقونیەو لەستەرە بەسەرم هات، ئەو چەوسانەوەی بەرگەیم گرت، بەڵام خوداوەند لە هەموویان ڕزگاری کردم. [12] هەموو ئەوانەی دەیانەوێ بە لەخواترسی بژین لەعیسای مەسیح، دەچەوسێنەوە. [13] بەڵام خراپەکارو فێڵبازەکان بەرەو خراپتر دەڕۆن، خەڵکی دیکە هەڵدەخەڵەتێننو کەسانی دیکەش ئەوان هەڵدەخەڵەتێنن! [14] بەڵام تۆ، بەردەوامبە لەسەر ئەوەی فێری‌بوویتو بێ گومان بووی‌و زانیت لەسەردەستی کێ فێربوویت. [15] تۆ لەمنداڵیەوە کتێبی پیرۆز دەناسیت، ئەوەی داناییت دەداتێ بۆ ڕزگاری بەهۆی باوەڕ بەعیسای مەسیح. [16] هەموو کتێبی پیرۆز

بەوەحی لەخودا هاتووەو سوودبەخشە بۆ فێرکردنو سەرزەنشتو ڕاستەڕێکردن، هەروەها بۆ تەمێکردن بۆ ڕاستودروستی، [17]تاوەکو مرۆڤی خودا ئامادەبێت بۆ هەموو کردارێکی باش.

**ووشەی خودا ڕابگەیێنە**

# 4

لەبەردەم خوداو عیسای مەسیحی خوداوەند، ئەوەی حوکم بەسەر زیندووانو مردووان دەدات، لەکاتی گەڕانەوەی پادشاهێتیەکەی، داوات لێدەکەم: [2]ووشەی خودا ڕابگەیێنە، خۆتی بۆ تەرخان بکە لەکاتی باشو خراپ، خەڵکی ڕاستەڕێ بکە، سەرزەنشت بکە، وورەیان بەرزبکەوە بەئارامگرتنو فێرکردن. [3]چونکە کاتێك دێت خەڵکی نایانەوێ هیچ دەربارەی فێرکردنی ڕاست بزانن، بەڵکو بەپێی ئارەزووی تایبەتی خۆیان مامۆستایەك هەڵدەبژێرن کەوا بەشێوەیەك لەگەڵیان بدوێ ئەوان حەز بکەن گوێی لێ بگرن. [4]ئەوانە نایانەوێ ڕاستی ببیستن، چەواشە دەبن بەئەفسانەو شتی هیچو پووچ. [5]بەڵام تۆ، لە هەموو شتێك وریابە، لەئازاردا دانبگرە، بەکاری مزگێنیدەر هەستە، بەکاری خۆت هەستە بەتەواوی.

[6]لەبارەی من، کاتی ئەوە هاتووە ژیانم بکەم بە قوربانی، کاتی کۆچکردنم نزیكبووەتەوە. [7]تێکۆشانیکی باش تێکۆشاوم، قوناغی خۆم بڕیوە، پارێزگاری باوەڕم کردووە. [8]ئێستا تاجی ڕاستودروستی چاوەڕێم دەکات، ئەوەی خوداوەند کە دادوەری ڕاستودروستە لەو ڕۆژە دەمداتێ، ئەمەش تەنها بۆ من نییە، بەڵکو بۆ هەموو ئەوانەیە کە بەدڵ ئارەزووی هاتنەوەی دەکەن.

**دوا ڕاسپاردە**

[9]هەوڵ بدە بەخێرایی بۆ لام بێیت، [10]چونکە دیماس لەبەر خۆشەویستی ئەم جیهانە منی بەجێهێشتو بۆ شاری تەسالۆنیکی ڕۆیشت، کریسکیسیش بۆ ناوچەی غەلاتیە ڕۆیشتو تیتۆسیش بۆ دلماتیە. [11]لە لۆقا زیاتر کەسی ترم لا نییە. بڕۆ بۆ لای مەرقۆسو لەگەڵ خۆت بیهێنە، چونکە زۆر سوودی

لـیۆوەردەگـرم لەخزمەتکـردن. [12] تیخیکۆسم ناردووە بۆ ئەفەسۆس. [13] کـاتێ هاتی لەگەڵ خۆت عەباکەم بۆ بهێنە، ئـەوەی لـەشاری ترواس لای کـارپۆس بەجـێم هێشتووە، هەروەها پەرتووکـەکانم بەتایـبەتی ئـەو دەسـتخەتانەی لەسـەر چـەرم نووسراون.

[14] ئەسـکەندەری مسـگەر زۆر خـراپەی بەرامـبەر کردم، خوداوەند تۆڵـەی لـێدەکاتـەوە لەسـەر ئـەو کارانەی. [15] تۆش خۆت لێی بپارێزە، چـونکە زۆر بـەتوندی بەرهەڵسـتی قسەکانمانی کرد.

[16] کاتێ یەکەمجار بەرگریم لەخۆم کـرد کـەس لەگەڵم نەهات، بەڵکو هـەموویان بەجێـیانهێشـتم، خـودا لەسـەر ئەمـە بـیانبەخشێت. [17] بەڵام خوداوەنـد لەگـەڵم بـوو بەهـێزی کـردم، بەمـەش توانـیم مزگێـنی ڕابگەیێـنم تـا هـەموو گەلان ببیستن، ئـەوە بـوو ڕزگـاری کردم لە دەمی شـێر، [18] هـەر خوداوەندیـش ڕزگارم دەکـات لــە هــەموو خــراپەیەکو دەمپارێزێـت بـۆ پادشـاهێتی ئاسمـانی خـۆی. بۆ ئەوە شکۆمەندی تاهەتایە! ئامین.

[19] سـلاو لـە پریسـکلاو ئەکیلاو خـێزانی ئۆنیسـیفورس بکـە. [20] ئەراسـتۆس لـەکۆرنسـۆس مایـەوە، بـەلام تروفیمۆس بەنەخۆشی لەشاری میلیـتس بەجـێمهێشـت. [21] خـێرابە لـەهـاتن پـێش ئـەوەی زستان بێت. ئوپولـۆسو پودیـسو لیـنۆسو کلودیـاو هـەموو خوشـکو بـرایانی ئێرە سلاوت لـێدەکەن.

[22] خوداوەنـد لەگـەڵ ڕۆحـت بێـتو بەرەکـەت لەگـەڵ هەمووتان بێت. ئامین.

*تیتۆس پیاوێکی یۆنانی بوو، پۆڵس هێنایە باوەڕو کردی بەهاوڕێو یارمەتیدەری خۆی. نامەکەی پۆڵس بۆ تیتۆس ڕوونکردنەوەی ئەو کارەیە کە پۆڵس بۆ تیتۆسی بەجێهێشت، ئەویش ڕێکخستنی کۆمەڵی باوەڕدارانە لەکریت. ئەم نامەیە سێ شتی تیادایە:*

*1–بەیادهێنانەوەی تیتۆس سەبارەت بەو مەرجانەی پێویستە لەپیرانی کۆمەڵی باوەڕداران هەبێ، بەتایبەتی چونکە خەڵکی کریت ناوبانگیان بەخراپ دەرکردبوو.*

*2–ئامۆژگاری کردنی تیتۆس بۆ فێرکردنی هەموو ئەو کەسانەی لەنێو کۆمەڵی باوەڕدارانن لەپیرو گەنجو کۆیلە.*

*3–بەیادهێنانەوەی تیتۆس سەبارەت بەڕەوشتی باوەڕدار کەدەبێ چۆن بێ، وەك ئاشتیو خۆشەویستیو دوورکەوتنەوە لەرقوکینەو شەڕەقسە.*

# 1

لەپۆڵسەوە، بەندەی خوداو نێرراوی عیسای مەسیح، لەپێناوی باوەڕی ئەوانەی خودا هەڵیبژاردون، هەروەها بۆ ناسینی ڕاستی ئەوەی بەرەو خواترسی دەڕوات، [2] لەسەر بناغەی هیوای ژیانی هەتاهەتایی، ئەوەی خودای ڕاستگۆ لە زووەوە بەڵێنی پێداوە، [3] هەروەها لەکاتی پێویست ووشەکەی دەرخست بەهۆی ئەو ڕاگەیاندنەی بەڕاسپاردەی خودای ڕزگارکەرمان دراوەتە دەستی من.

[4] بۆ تیتۆس ڕۆڵەی ڕاستەقینەم لە باوەڕی هاوبەشمان، با بەرەکەتو ئاشتی خودای باوكو عیسای مەسیحی ڕزگارکەرمان لەگەڵت بێ.

### ڕاسپاردەی دانانی پیران

[5] لەدوورگەی کریت بەجێمهێشتی تا ئەو شتانەی کەموکوڕی هەیە تەواوی بکەیتو پیران دابنێیت لەهەموو شارێك بەو شێوەی ڕامسپاردووی. [6] دەبێ ئەو پیاوە بێ کەموکوڕی بێت، یەك ژنی هەبێت، منداڵەکانی باوەڕداربن کەس بە بەڕەڵڵاو یاخیبوو ناویان نەبات. [7] چونکە چاودێر نوێنەری خودایە پێویستە بێکەموکوڕی بێت،

لـووتبـەرزو تـوورەو سـەرخۆشو شـەڕفرۆش نەبێـت، چاوبرسی نەبێت بـۆ مـاڵی حەرام، [8]بەڵکو میوانداری نـامۆ بکـاتو حـەز لەچاکە بکات، سـەنگینو ژیـر بێـت، ڕاسـتودروسـتو پـاكوپـیرۆزو خۆڕاگـر بێـت. [9]دەسـتبگـریٚ بەو ووشە ڕاستانەی بەگوێرەی فێرکردنە، تـا بـتوانیٚ خـەڵکی هانـبدات بەفێرکردنـێکی ڕاسـت، هـەروەها سەرزەنشـتی ئەوانـە بکـات کـە بەربەرەکانی دەکەن.

**دژایەتی مامۆستا درۆزنەکان**

[10]چـونکە زۆر کـەس هـەن بەتایـبەتی ئەوانـەی خەتەنەکـراون، یـاخیبوونو خـەڵکی بەقسـەی هیچوپووچ هەڵدەخەڵەتێنن، [11]ئەوانە دەبـیٚ دەمـیان دابخرێـت، چـونکە چـەندەها خێزانـیان بـەتـەواوی هەڵگـێڕاوە بەفێرکردنـێکی ناڕاسـت لەپێـناوی قـازانجی حەرام. [12]یەکێك لـەناویان پێغەمـبەرێکی تایـبەت بـوو بـەخۆیان، ووتویـەتی: (دانیشـتوانی کریـت هەمیشـە درۆزنـن، ئـاژەڵی بەدکارن، تەمبەڵو زۆرخۆرن.) [13]ئەم قسـەیە ڕاسـتە، لەبەرئـەوە پێویسـتە بـەتوندی سەرزەنشـتیان بکـەین، تـا لەباوەڕ ڕاست بن. [14]گوێنەگرن بۆ ئەفسـانەکانی جوولـەکەو ڕاسپاردەی ئـەوانەی لەڕاستی هەڵگەڕاونەوە. [15]بۆ پاکەکان هەموو شتێك پاکە، بەڵام بـۆ پیسـەکانو بـێباوەڕەکـان هـیچ شـتێك پـاك نـیـە، چـونکە بـیرو ویژدانـیان پیسـە. [16]بـەدەم وا دەریدەخـەن خـودا دەناسـن، بەڵام بەکردەوەیان نکۆڵی لیٚدەکەن، ئەوانە خۆشەویسـت نینو یاخین، بەکەڵکی هیچ کردارێکی چاك نایەن.

**ڕاسپاردە بۆ باوەڕداران**

# 2

بـەڵام تـۆ بەشـێوەیەك فـێر بکـە، بگونجێت لەگەڵ فێرکردنی ڕاست. [2]پـیاوانی پـیر ڕاسـپێرە ووریاو بەرێزو ژیـربـن، لـەباوەڕو خۆشەویسـتیو دانبەخۆگرتن ڕێكو ڕاستبن.

[3]هـەروەها پیرێژنـەکان ڕاسـپێرە بـەپـیرۆزی بژیـن، لەپاشـەملە قسـەنەکـەن، سـەرخۆشنەبن، بەڵکو شـتی چـاك فـێری خەڵکی بکەن. [4]ژنـانی گـەنج فـێری خۆشەویسـتی مـێردو منداڵەکانـیان بکـەن، [5]ژیـرو پـاکبـن بـەرێكو پـێکی ماڵـێان

بەڕێوەببەن، باشبن، گوێڕایەڵی مێردەکانیانبن، هەتا کەس بەخراپە باسی ووشەی خودا نەکات.

[6]هەروەها ئامۆژگاری گەنجەکان بکە خۆڕاگربن. [7]خۆت لەهەموو شتێك ببە بەنموونە بۆیان لەکاری چاکە، بەڕێزو پاكو دڵسۆزبە لەفێرکردنت. [8]باووتەکانت ڕاستبنو قسەی لەسەر نەکرێ، تا ناحەز شەرمەزار بێت کاتێ هیچ خراپەیەك نادۆزێتەوە بیلێت لەدژتان.

[9]کۆیلەکان ڕاسپێرە ملکەچی گەورەکانیانبن، لەهەموو شتێك شوێنی ڕەزامەندییانبن، بەرپێچیان نەکەن، [10]هیچیان لێنەدزن، بەڵکو لەهەموو شتێك چاکەو دڵسۆزی خۆیان دەرخەن، هەتا ئەوان فێرکردنی خودای ڕزگارکەرمان برازێننەوە لەهەموو شتێك.

[11]چونکە بەرەکەتی خودا ڕزگاریە، بۆ هەموو مرۆڤێك دەرکەوت، [12]ئەوەی فێرمان دەکات خۆمان دووربخەینەوە لەهەموو خراپەو ئارەزووەکانی ئەم جیهانە، تا لەم ژیانەی ئێستا بەژیریو ڕاستودروستیو لەخواترسی بژین، [13]لەچاوەڕوانی هیوای پیرۆز، ڕۆژی دەرکەوتنی شکۆمەندی خودای مەزنو عیسای مەسیحی ڕزگارکەرمان. [14]ئەوەی بەخوێنی خۆی ئێمەی کڕیەوە، تابیێتە قوربانی بۆ هەموو گوناهێكو پاکمان بکاتەوەو بمانکات بەگەلی تایبەتی خۆی کە دڵگەرمە بۆ کاری چاکە.

[15]ئاوها قسە بکەو ووتار بدەو سەرزەنشتی خەڵکی بکە بەهەموو دەسەڵاتێك. ڕێگا مەدە کەس گاڵتەت پێبکات.

### ڕزگاری بەهۆی ڕوحی پیرۆز

## 3

یادی باوەڕداران بخەرەوە ملکەچی فەرمانڕەوایانو دەسەڵاتدارانبن، گوێڕایەڵبن، ئامادەبن بۆ هەموو کارێکی چاك، [2]قسەی خراپ بەکەس نەڵێن، شەڕفرۆش نەبن، بەڵکو زمانشیرینیونیانی پیشانبدەن لەگەڵ هەموو خەڵکی.

[3]ئێمەش جاران بێمێشكو یاخیو گومڕا بووین، بەندەی ئارەزووی خراپو هەموو جۆرە خۆشییەك بووین، بەکینەو چاوپیسی دەژیاین، خەڵك ڕقی لێمان بوو، ئێمەش ڕقمان لەیەکتری بوو. [4]بەڵام

ئـێمه کاتێ نەرمونیانیو خۆشەویستی خـــودای ڕزگـــارکـــــەرمـــان بـــۆ دەرکـــەوت، [5]کـــە ڕزگاری کردین، ئەمـــە بەهۆی کاری ڕاستودروستی خۆمـــان نـــەبوو، بەڵکو بەپێی بەزەیی خۆی، بە شوشتنی لەدایكبوونەوەی دووەمو تازەبوونەوەی ڕۆحی پیرۆز، [6]ئـــەوەی خـــودا ڕشـــتی بەســـەرمان بـــــەهۆی عیســـــای مەســـــیحی ڕزگارکـــەرمان، [7]تـــا کاتێك بێتاوان بـــین بەبەرەکـــەتی ئەو، ببین بەمیراتگر بەگـــوێـــــرەی هـــــیوای ژیــــانی هەتاهـــەتایی. [8]ئـــەم قـــسەیە بەتەواوی ڕاســـتە. دەمەوێ ســـوور بیت لـــەسەر ئـــەم شـــتانە، هـــەتا ئەوانـــەی باوەڕیان بـــەخـــودا هەیـــە کرداری چاك بکەن، ئەمەش باشو سوودبەخشە بۆ هەموو خەڵکی.

[9]بەڵام دووربکەوە لـەشەڕەقسەی شــــێتانەو باســــــی ڕەچـــــەڵەكو دوژمــــــــنایەتیو نـــــــاکۆکیو دووبەرەکایـــەتی لـــەسەر شەریعـــەت، چــــونکـــە ســـوودبـــەخش نیـــیەو هـــیچوپووچـــە. [10]لـــە دروســـتکەری ئـــاژاوە دووربکــــەوە، دوای ئەوەی جـــارێك یـــاخود دووجـــار ئاگادارت کـــردەوە. [11]تۆ دەزانیت ئەوەی وەك ئەو بێت گـــومـــڕاو گوناهبارە خۆی حوکمی بەسەر خۆی داوە.

**دوا ڕاسپاردە**

[12]کـــاتێ ئەرتـــیماس یـــاخود تیخـــیکۆس بـــۆ لات دەنـــێرم، خـــێرا وەرە بـــۆ لام بـــۆ شاری نیکۆپۆلیس، چـــونکە نـــیازم وایـــە وەرزی زســـتان لـــەوێ بەســـەر ببەم. [13]بەپێی توانـــا یارمـــەتی زیناســـی پارێزەرو ئەپۆلۆس بدە، کاروباری سەفەریان بۆ ڕێكبخە هـــەتا لەهـــیچ شـــتێك کـــەموکوڕییان نەبێـــت. [14]پێویســـتە کۆمەڵەکـــەمان فـــێربن بەباشترین شێوە کرداری چاك بکـــەنو بەپێی پێویست یارمەتیبدەن، هەتا بێبەرهەم نەبن.

[15]هـــەموو ئەوانـــەی لـەگـــەڵمدان ســـڵاوت لـــێدەکـــەن، ســـڵاو لـەوانە بکـــە کـــە ئـــێمەیان خـــۆشدەوێـــت لەباوەڕدا.

بەرەکەت لـەگەڵ هەمووتان بێت.

ئامین.

# نامەی پۆڵس بۆ فلیمۆن

*فیلیمۆن ئەندامێکی دیاری کۆمەڵەی باوەڕدارانی کۆلۆسی بوو. کۆیلەیەکی هەبوو ناوی ئۆنسیمۆس بوو، لەلای هەڵدێو لەبەندیخانە تووشی پۆڵس دەبێ، لەوێ پۆڵس ڕێگای باوەڕی مەسیحی نیشان دەدات. پاشان ئەم نامەیە بۆ فیلمۆن دەنووسێ، تیایدا داوای لێدەکات لەکۆیلەکەی خۆشبێو لای خۆی وەری‌گرێ نەك وەکو کۆیلەیەکی بەخشراو بەڵکو وەك برایەك لەباوەڕ.*

[1]لە پۆڵسی بەندکراو لەپێناوی عیسای مەسیح، هەروەها لەتیمۆساوسی براوە، بۆ فلیمۆنی هاوکاری خۆشەویست، [2]هەروەها بۆ خوشکە ئەپفییەی خۆشەویستو ئەرخیپۆسی هاوڕێمان لەتێکۆشانو بۆ ئەو کۆمەڵە باوەڕدارەی لەماڵەکەت دایە. [3]با بەرەکەتو ئاشتی خودای باوکمانو عیسای مەسیحی خوداوەند بۆ ئێوە بێ.

## خۆشەویستیو باوەڕی فلیمۆن

[4]هەر کاتێ یادت بکەم لەنوێژەکانم سوپاسی خودا دەکەم، [5]چونکە هەواڵی باوەڕو خۆشەویستی تۆم بیستووە بەرامبەر بە عیسای مەسیحو هەموو برایانی پیرۆز، [6]داواکارم لەخودا ئەو باوەڕە بەهێز بکات کە بەیەکەوە دەمانبەستێتەوە لەناسینی هەموو ئەو چاکانەی هەمانە بەهۆی مەسیحەوە. [7]ئەی برا چەند دڵشادو وورە بەرزم بە خۆشەویستی تۆ، چونکە دڵی برایانی پیرۆزت گەشاندەوە.

## داواکاری پۆڵس

[8]هەرچەندە مافی ئەوەم هەیە بەهۆی مەسیح، فەرمانت بۆ دەربکەم سەبارەت بەو کارەی پێویستە بیکەیت، [9]بەڵام لەبەر ئەو خۆشەویستیەی هەمانە داوات لێدەکەم، وەك نوێنەرێك کە ئێستا بەندکراوە لەپێناوی عیسای مەسیح، [10]سەبارەت بە ئۆنسیمۆسی کوڕم، ئەوەی لەبەندیخانە بەهۆی من باوەڕی هێنا، [11]ئەوەی جاران بێ کەڵك بوو بۆ تۆ، بەڵام ئێستا کەڵکی بۆ منو بۆ تۆ هەیە.

[12]ئـــەو دەنـــێرمەوە بـــۆ لات، وەریبگرە وەك پارچەیەك لەجگەرم. [13]حـــەزم دەکـــرد لـــێرە لای خـــۆم بیهـێڵمەوە، تا خزمەتی منی بەندکراو لەپێناوی مزگێنی بکات لەجیاتی تۆ. [14]بـەڵام نەمویسـت هـیچ شـتێك بێ ڕەزامەندی تۆ بکەم، تاوەکو ئەم کارە چـاکە بەخواسـتی خـۆت بێـت نەك بەناچـاری. [15]لەبەرئەمـە ئۆنسیمۆس بـۆ ماوەیـەك لێـت دوورکەوتـەوە، تاوەکو بۆ هەتاهەتایە بگەڕێتەوە لات، [16]جـا لەئەمـڕۆ بـەدواوە کۆیلە نییە، بـەڵکو باشـتر لەکۆیلـە، بـرایەکی خۆشەویسـتە لـەمەسـیح. بـرایەکی خۆشەویستە بۆ من ئاخۆ چەند زیاتر بێـت بـۆ تۆ؟ کە لـەلەش‌و خوداوەند هاوبەشن.

[17]گـەر تـۆ من بەهاوبەشی خۆت دادەنێـیت، پێشـوازی لـیّبکـە وەك پێشـوازی لـەمن بکەیـت. [18]گەر لە شـتێك خـراپەی بەرامـبەر کردووی یـاخود قەرزێکـت بەسـەریەوە هەیە، لەسـەر مـنی بنووسـە. [19]من پۆڵـسم بـەخەتی دەستی خۆم دەینووسم کەوا دیدەمـەوە، نامـەوێ پێـت بڵـێم تـۆ خۆشت قەرزاری منی. [20]جا براگیان ئـەم چـاکەیەم لەگـەڵ بکـە لەپێناوی خوداوەند، دڵخۆشم بکە لەمەسیح. [21]لـەکاتێ ئەم نامەیە دەنووسم بۆت، بـاوەڕم پێـت هەیـە داواکاریەکـەم جێبـەجێ دەکەیـت، بـەڵکو دڵنـیام زیاتـر دەکەیـت لـــەوەی داوات لـیّدەکەم.

### سڵاوی کۆتایی

[22]بێجگە لەمەش، شوێنی مانەوەم بۆ ئامادە بکە، چونکە هیوادارم خودا نوێژەکانتان قبوڵ بکات‌و بمگەڕێنێتەوە لاتان.

[23]ئەپەفـــراس کـــە لەگـــەڵم بەندکـراوە لـەپێناوی عیسای مەسیح سـڵاوت لـیّدەکـات، [24]هـەروەها مـەرقۆس‌و ئەرسـتەرخۆس‌و دیمـاس‌و لۆقـای ئیشـکەران لەگەڵم سڵاوت لـیّدەکەن.

[25]بەرەکـەتی عیسـای مەسـیحی خوداوەندمـان لەگـەڵ ڕۆحتان بێت. ئامین.

*ئەم نامەیە بۆ ئەو جوولەکانە نووسراوە کە باوەڕیان بەمەسیح هێنا، پاشان تووشی چەوساندنەوە هاتن لەلایەن هاوڕەگەزەکانیانەوە بۆ ئەوەی واز لەباوەڕەکەیان بهێنن.*

*باسێکی وورده دەربارەی سەرکەوتوویی مەسیح وەکو ڕزگارکەری مرۆڤو ڕۆڵەی مرۆڤو ئەو کاهینە بەرزەی کارەکانی خۆی لەئاسمان جێبەجێ دەکات.*

*نووسەر وێنەیەکی جوانی مەسیحی شکۆدار دەکێشێ، ئەو کەسەی خۆی هێنایە ڕیزی مرۆڤو بەمردنی ڕزگاری تەواوی بۆ مرۆڤایەتی بەدەست هێناو لەلای ڕاستی خودا دانیشت. هەروەها جیاوازیەکانی نێوان مەسیحو فریشتەکان، مەسیحو موسا، کاهینێتی مەلکی سادیق کە ڕەمزی مەسیحو کاهینێتی هارون، قوربانیەکانی پەیمانی کۆنو قوربانیە تەواو و بێ کەموکورەکەی مەسیح دەردەخات. نامەکە زۆر هاندانو ئامۆژگاری بەسوودی تێدایە بەمەبەستی چەسپاندنی باوەڕداران لەمەسیحو گەشەپێکردنیان تا دەگەنە ڕاستی تەواوەتیو هاندانیان بۆ بەرگەگرتنی ئازار.*

## مەزنی عیسای مەسیح

# 1

خودا لەسەردەمی کۆن، چەند جارێك بەرێگای جۆراوجۆر بەهۆی پێغەمبەران لەگەڵ باوباپیرانمان دوا. [2] بەلاَم ئێستا لەم سەردەمەی دواییدا بەهۆی ڕۆڵەکەی لەگەڵمان دوا، ئەوەی خودا کردوویەتی بەمیراتگری هەموو شتێكو بەهۆی ئەوەوە هەموو جیهان دروستبووە. [3]ئەو تیشکی شکۆمەندی خودایەو وێنەی جەوهەریەتی، دەستی گرتووە بەگەردوون بەهۆی ووشە تواناداره‌کەی دوای ئەوەی خۆی گوناهەکانمانی پاك‌کردەوە، لەلای دەستە ڕاستی خودای مەزن لەئاسمان دانیشت. [4]بەم شێوەیە عیسا مەزنتربوو لەفریشتەکان، هەروەها ئەو ناوەی بەمیرات بۆی مایەوە، لەناوی هەموو فریشتەکان لەپێشترو مەزنترە.

[5]جا چ جارێك خودا بە یەکێك لەفریشتەکانی ووتوە: {تۆ ڕۆڵەی منی، ئەمڕۆ بووم بە باوکی تۆ؟} یاخود ووتویەتی: {من دەبم بەباوکی، ئەویش دەبێ بەڕۆڵەم؟} [6]هەروەها کاتێ خودا نۆبەرەکەی دەنێرێت بۆ جیهان، دەڵێ: {هەموو فریشتەکانی خودا دەبێ کڕنووشی بۆ ببەن.} [7] لەبارەی فریشتەکانیش دەڵێ: {فریشتەکانی وەك ڕەشەبایان لێهات، هەروەها خزمەتکارەکانی وەك گڕی ئاگریان لێهاتووە.} [8]بەڵام لەبارەی ڕۆڵەوە دەڵێ: {تەختی حوکمڕانیت ئەی خودا بۆ هەتاهەتاییە، گۆچانی حوکمڕانیت ڕاستودروستە. [9]تۆ ڕاستودروستیت خۆشویستو ڕقت لەگوناهە، بۆیە خودا، خودای خۆت دەستنیشانی کردی جیا لەهەموو ئەوانی دیکە ڕۆنی شادی بەسەردا ڕژاندی.} [10]هەروەها دەڵێ: {ئەی خوداوەند، تۆ لەسەرەتاوە بناغەی زەویت داناوە، ئاسمانیش کاری دەستەکانتە. [11]زەویو ئاسمان لەناودەچن بەڵام تۆ دەمێنیت، هەموویان لەناودەچن وەك جلێکی کۆنی ڕزیو. [12]تۆ هەموویان وەك جلێکی کۆن دەپێچیتەوە، ئینجا دەیانگۆڕی وەك کراسێك، بەڵام تۆ دەمێنیتەوە، ساڵانت هەرگیز کۆتایی بۆ نییە.} [13]جا کەی خودا جارێك بە یەکێ لەفریشتەکانی ووتوە: {لەلای دەستە ڕاستم دانیشە هەتا دوژمنەکانت بخەمە ژێر پێتەوە}؟ [14] ئایا فریشتەکان ڕۆحێکی خزمەتکار نین، دەنێررێن لەپێناوی ئەوانەی ڕزگارییان بە میرات بۆ ماوەتەوە؟

## پشتگوێ نەخستنی ڕزگاری

## 2

تا گومڕا نەبین دەبێ زیاتر ئاگاداری ئەو قسانە بین کە بیستوومانە. [2] چونکە ئێمە دەزانین هەموو ووشەیەك کە فریشتەکان بۆیان هێناوین، بەتەواوی ڕاستە، بەشێوەیەك هەر کەسێ دەستدرێژیو بەرپێچی کردووە، سزای دادپەروەرانەی خۆی وەرگرتووە. [3]جا چۆن دەتوانین هەڵبێین گەر ئەم ڕزگاربوونە مەزنە پشت گوێ بخەین؟ ئەوەی خوداوەند یەکەمجار بلاوی کردەوە، دوایی سەلمێنرا لەلایەن ئەوانەی خۆیان گوێیان لێبوو. [4]خوداش لەگەڵیان شایەتیدا، بەنیشانەو شتی سەیرو کاری سەرسوڕهێنەری جۆراوجۆر،

هەروەها بەبەهرەکانی ڕۆحی پیرۆز کە بەخواستی خۆی دابەشی دەکات.

**مەسیح وەك براكانیەتی**

[5]ئەو جیهانەی لە داهاتوو دێت، ئەوەی ئێمە ئێستا باسی دەکەین، خودا لەژێر فەرمانڕەوایی فریشتەکانی دانەناوە. [6]وەك هەندێك لەکتێبی پیرۆزدا دەڵێن: {مرۆڤ چییە تا ناوی بهێنیت؟ ڕۆڵەی مرۆڤ چیە تا ئەوەندە بایەخی پێبدەی؟ [7]ڕاستە بۆ ماوەیەکی کورت ئەوت بەنزمتر دانا لەفریشتەکان، بەڵام دوایی تاجی شکۆو ڕێزت خستە سەری، [8]هەروەها هەموو شتێکت خستۆتە بەرپێی.} جا چونکە خودا هەموو شتێکی ملکەچی کردووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ خودا هیچ شتێکی نەهێشتۆتەوە ملکەچی ئەوی نەکات. بەڵام ئێستا هەموو شتێك نابینین لەژێر دەسەڵاتی ئەو. [9]بەڵکو عیسا ئەوەی خودا بۆ ماوەیەك لەفریشتەکان بەکەمتری دانا، دەبینن ئێستا تاجی شکۆو ڕێزی خراوەتە سەر، چونکە ئازاری مردنی چێژت، ئەمەش بەرەکەتی خودا بوو بۆ ئێمە، عیسا دەبووایە بەو شێوەیە ئازاری مردن بچێژێ لەپێناوی هەموو مرۆڤ.

[10]لەهێنانی ڕۆڵەی زۆر بۆ شکۆمەندی، شیاوی خودا بوو، ئەوەی بۆ ئەوەو بەهۆی ئەوە هەموو شتێك بوونی هەیە، پێشڕەوی ڕزگاریان بە ئازار تەواو بکات. [11]چونکە ئەوەی پیرۆز دەکاتو هەموو ئەوانەی پیرۆزکراون یەك سەرچاوەیان هەیە. بۆیە عیسا پێی شورەیی نییە ئەوانەی باوەڕیان پێیەتی بەبرا ناویان ببات. [12]کە دەڵێ: {ئەی خودا ناوت ئاشکرا دەکەم لای برایانم، ستایشت دەکەم لەنێو کۆمەڵیان.} [13]هەروەها دەڵێ: {تەنها پشت بە خودا دەبەستم}. دیسان دەڵێ: {ئا ئەوەتا من لێرەم، لەگەڵ ئەو ڕۆڵانەی خودا پێی بەخشیوم.} [14]چونکە ڕۆڵەکان لەگۆشتو خوێن هاوبەشن، لەبەرئەوە مەسیح خۆی بوو بەمرۆڤ، تا بەشداری سروشتی مرۆڤایەتیمان بکات، تا بەمردنی خۆی لەناوی ببات ئەوەی دەسەڵاتی مردنی هەیە، واتە شەیتان. [15]بەمەش ئەوانە ڕزگار بکات کە بەدرێژایی ژیانیان ترسیان لەمردنەو ملیانکەچ کردبوو بۆ کۆیلایەتی. [16]شتێکی ئاشکرایە عیسا نەهاتووە بۆ

فریشتەکان، بەڵکو بۆ نەوەی ئیبراهیم. [17]جا دەبووایە وەك براکانی بووایە لەهەموو ڕوویەك، تا ببێ بەسەرۆك کاهینێکی میهرەبانو سەرڕاست لەخزمەتکردنی خودا، هەروەها ببێ بەکەفارەت لەپێناوی گوناهەکانی خەڵك، [18]چونکە عیسا خۆی ئازاری چێشتووەو تاقیکراوەتەوە لەلایەن شەیتانەوە، توانای ئەوەی هەیە یارمەتی ئەوانە بدات کە لەلایەن شەیتانەوە تاقیدەکرێنەوە.

### عیسا مەزنترە لەموسا

## 3

کەواتە ئەی برا پیرۆزەکان، ئەی ئەوانەی بەشداری بانگەوازی ئاسمانی دەکەن، سەیری عیسا بکەن کە نێرراوەو کاهینی بەرزی دانپیانانمانە، [2]ئەو سەرڕاستو پاك بوو بەرامبەر ئەوەی دەستنیشانی کردبوو، هەروەك چۆن موسا سەرڕاستو پاكبوو سەبارەت بەماڵی خودا. [3]بەڵام عیسا بۆی دانرا شایانی شکۆیەکی مەزنتر بێت لەموسا، هەروەك چۆن یەکێك خانوویەك دروست دەکات ڕێزی زیاترە لەخانووەکە خۆی. [4]شتێکی ئاساییە، هەموو خانوویەك دەبێ یەکێك هەبێ دروستی کردبێ، بەڵام ئەوەی هەموو شتێکی دروستکردووە خودایە. [5]موسا سەرڕاستو پاك بوو لەهەموو ماڵی خودا، وەك خزمەتکارێك، ئەمەش شایەتییەك بوو بۆ ئەوەی خودا لەدوایيدا ڕایدەگەیێنێ. [6]بەڵام مەسیح، سەرڕاستو پاك بوو وەك ڕۆڵە لەماڵی خودا، ئەو ماڵەش ئێمەی باوەڕدارین، گەر دەست بگرین بەو متمانەو هیوایەی شانازی پێوە دەکەین.

### ئاگادارکردنەوە دژی بێباوەڕان

[7]لەبەرئەوە، هەروەك ڕۆحی پیرۆز دەڵێ: {ئەمڕۆ، گەر گوێتان لەدەنگی خودا بوو، [8]دڵتان ڕەق نەبێ وەك یاخیبوونەکە ئەوەی لەڕۆژانی تاقیکردنەوە لەبیابان ڕوویدا، [9]کاتێ باوباپیرانتان منیان تاقیکردەوەو بۆ ماوەی چل ساڵ کردارەکانی منیان بینی. [10]لەبەرئەوە ڕقم هەڵسا لەم نەوەیەو ووتم: چونکە دڵیان هەمیشە بەرەو گومڕایی دەڕواتو ڕێگای من هەرگیز ناناسن. [11]وەك سوێندم خوارد لەتوڕەبوونم، ئەوانە هەرگیز

ناچنە شوێنی حەسانەوەی من.}

[12]کەواتــە ئــەی بــرایان، بــاش ئاگاداری خۆتان بن، تا دڵی کەستان بــێ بـاوەڕو بــەد نــەبێ، ئەمەش ببێتە هــۆی ئــەوەی لــە خــودای زیــندوو هەڵگەڕێنەوە. [13]جا لەبەرئەوە هەموو ڕۆژێـــــــک ووردەی یـــــــەکتری بەرزبکەنــەوە، ئەوەندەی کاتەکە پێی دەوترێ {ئەمڕۆ}، تا کەستان دڵڕەق نەبێ بەتاریکی گوناه. [14]چونکە ئێمە سەر بە مەسیح دەبین، گەر تا کۆتایی دەســـت بگـــرین بـــەو بـــاوەڕەی لەســەرەتاوە هەمانــە. [15]کتێبی پیرۆز دەڵـــێ: {ئەمـــڕۆ، گـــەر گوێـــتان لــەدەنگــی خــودا بــوو، دڵتان ڕەق نەبێ وەك یاخیبوونەکە.} [16]جا کێن ئەوانــەی یــاخیبــوون دوای ئــەوەی گوێــیان لــەدەنگــی خــودا بوو؟ ئایا هــەموو ئەوانــە نــەبوون کە لە میسر هاتنە دەرەوە بەسەرۆکایەتی موسا؟. [17]هــەروەها خودا بۆ ماوەی چل ساڵ لــەکێ ڕقی هەڵساو تووڕە بوو؟ ئایا بەرامــبەر ئەوانــە نەبوو کە گوناهیان کــردو لــەبیابان لاشەکانیان کەوت؟ [18]هــەروەها خــودا ســوێندی لــەکێ خــوارد کــە نــابێ بچــنە شــوێنی حەسانەوەی ئەو، ئایا سوێندی لەوانە نــەخوارد کــە لێی یاخیبوون؟ [19]بەم شێوەیە دەبیــنین بێبــاوەڕی ڕێگــای چـــوونی شـــوێنی حەســـانەوەی لــێگرتن.

### بەڵێنی حەسانەوەی خودایی

# 4

لەبەرئــەوەی تــا ئێســتا بەڵێنی چوونە شــوێنی حەسانەوەی خودا هەر ماوە، بۆیــە دەبــێ بترسین نەوەك یەکێك وا بــیر بکاتــەوە ئــەو هەلــەی لــەکیس چــووە. [2]چــونکە ئــێمە مزگێنــیمان بیستووە وەك ئەوان بیستوویانە، بەڵام ئــەو مزگێنییــەی ئــەوان بیستیان هیچ ســوودێکی نــەبوو بۆیــان، چــونکە بــەباوەڕ نــەبووە. [3]چــونکە ئــێمەی بــاوەڕدار دەچینە شوێنی حەسانەوەی خــودا، هــەروەك ووتویــەتی: {وەك ســوێندم خــوارد لەتوڕەبوونم، ئەوانە هەرگیز ناچنە شوێنی حەسانەوەی من }، لەگەڵ ئەوەی کارەکان تەواوبوون لەگــەڵ دروســت بوونــی جــیهان. [4] چــونکە دەربــارەی ڕۆژی حەوتــەمی هەفــتە لــەشــوێنێك لــەکتێبی پیرۆز هــاتووە: {خودا دوای ئەوەی هەموو کارەکــانی بەشــەش ڕۆژ تەواو کرد، ڕۆژی حەوتەم حەسایەوە.} [5]هەروەها

خودا لە هەمان دەقی پێشوو وتویەتی: {ئەوانە ناچنە شوێنی حەسانەوەی من.} [6]ئەوانەی یەکەمجار مزگێنیان بیست، نەیانتوانی بچنە شوێنی حەسانەوەی خودا، چونکە ملکەچی خودا نەبوون. شتێکی ئاشکرایە ئیتر شوێنی حەسانەوەی خودا چاوەڕێی کەسانی تر دەکات. [7]چونکە خودا ڕۆژێکی دیکەی تەرخانکرد، جا لەو بارەیەوە خودا لەسەر زمانی داود پێغەمبەرەوە دەڵێ: {ئەمڕۆ..} دوای ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەوەی لەپێشا وتبووی: {ئەمڕۆ، گەر گوێتان لە دەنگی خودا بوو، دڵتان ڕەق مەکەن.} [8]گەر یەشوع گەلی بخستایە شوێنی حەسانەوەی خودا، ئیتر بۆچی خودا دوای ئەوە باسی ڕۆژێکی تر دەکات. [9]کەواتە هێشتا ڕۆژی حەسانەوە بۆ گەلی خودا ماوە. [10]چونکە ئەوەی دەچێتە شوێنی حەسانەوەی خودا، ئەویش لەکارەکانی پشوو دەدات، هەروەك چۆن خودا لەڕۆژی حەوتەمی هەفتە لەکارەکانی پشوویدا. [11]جا هەرچیەك لەتوانامان هەیە دەبێ بیکەین، تاکو بچینە شوێنی حەسانەوەی خودا، هەتا کەسمان نەکەوێتە هەمان ڕێگای سەرپێچیکردن، [12]چونکە ووشەی خودا زیندووە، کاریگەرە، لەشمشێری دوودەم تیژترە، دەچێتە ناو قوڵایی مرۆڤ، بۆ ناو دەروونو ڕۆحو ماسولکەو دەمارو ئێسقانەکانی، حوکم دەدات سەبارەت بەمەبەستی دڵو بیری مرۆڤ. [13]هیچ دروستکراوێك نییە شاراوە بێت لەبەرچاوی خودا، بەڵکو هەموو شتێك ئاشکراو دیارە لەبەرچاوی خودا، ئەوەی حیسابی خۆمانی دەخەینە بەردەست.

**عیسا کاهینی بەرزی مەزنە**

[14]لەبەرئەوەی ئێمە عیسای ڕۆڵەی خودامان هەیە، ئەو کاهنە بەرزە مەزنەی بەئاسمانەکان تێپەڕی، دەبێ هەمیشە دانپیابنێینو دەستی پێوە بگرین. [15]جا ئەم کاهینە بەرزەی هەمانە، بێتوانا نییە لەتێگەیشتنو هاوخەمی دەربڕین سەبارەت بەکەموکوڕیو لاوازیەکان، چونکە خۆی هەرچەندە بێگوناهیش بووە، کەوتۆتە ئەو تاقیکردنەوانەی ئێمە تێیدەکەوین. [16]با بەبێ ترسو

بەدڵنیاییی بەرەو تەختی شاهانەی بەرەکەت بڕۆین، تابەزەیی وەرگرین و بەرەکەت بدۆزینەوە بۆ یارمەتیدانمان لەکاتی پێویست.

# 5

هەموو کاهینێکی بەرز لەناو خەڵك هەڵبژێراوە، دەستنیشانکراوە بێ بەنوێنەریان لەخزمەتکردن بۆ خودا، قوربانیو ئاژەڵی سەربڕاو پێشکەشی خودا دەکات لەپێناوی گوناه. [2] چونکە خۆی وەکو مرۆڤیتر لاوازە، دەتوانێ بەزەیی بەنەزانو گومڕاکان بێتەوە. [3] لەبەر ئەوەیە لەپێناوی گوناهی خەڵکی دیکە قوربانی پێشکەش دەکات، هەروەها لەپێناوی گوناهە تایبەتیەکانی خۆشی. [4] کەس ناتوانێ لە خۆیەوە ئەم کارە پەسەندە وەرگرێ، تەنها ئەوە نەبێ کە خودا بانگی کردووە، هەروەك چۆن هارونی بانگ کرد.

[5] هەروەها مەسیحیش، ئەم شوێنە بەرزە بەخۆی نادات، تا ببێ بە سەرۆك کاهین، بەڵکو خودا دەستنیشانی کردوەو پێی ووتوە: {تۆ ڕۆڵەی منی، من ئەمڕۆ بووم بەباوکت.} [6] هەروەك چۆن لەشوێنێکی دیکە پێی ووتوە: {تۆ کاهینی هەتاهەتایی لەپلەی مەلکیسادق.}

[7] مەسیح، کاتێ وەك مرۆڤ لەسەر ئەم زەوییە بووە، نوێژی کردووەو پاڕاوەتەوە بەگریانو هاوارەوە، بۆ ئەو خودایەی توانای هەیە ڕزگاری بکات لەمردن، ئیتر خودا داواکارییەکەی جێبەجێ کرد لەبەر خواترسییەکەی. [8] هەرچەندە عیسا ڕۆڵەی خودا بوو، بەهوێ ئەو ئازارانەی چەشتی فێری گوێڕایەڵی بوو، [9] هەروەها بەو ئازارانە بوو بە مرۆڤێکی تەواو و بوو بەسەرچاوەی ڕزگاری هەتاهەتایی بۆ هەموو ئەوانەی گوێڕایەڵی دەبن. [10] ئیتر خودا لەپلەی مەلکی سادق کردی بە کاهینی بەرز.

[11] لەم بارەیەوە قسەم زۆرە بۆتانی بکەم، بەڵام ڕوونکردنەوەی گرانە، چونکە ئێوە گوێتان گران بووە. [12] دەبووایە ئێستا باوەڕتان گەشەی بکردایەو ببونایە مامۆستا لەبەر ئەوکاتە زۆرەی هەتان بوو، بەڵام ئێوە پێویستیتان بەیەکێك هەیە بنچینەی ووشەی خوداتان فێر بکات. وەك منداڵێکی شیرەخۆر تەنها دەتوانرێ

شیرتان بدرێتێ، نەك خواردنی تەواو. [13]بۆیە هەر یەکێك بەشیر بژیت ئەوا کەمزانە لەووشەی ڕاستودروستی، چونکە هێشتا مندالە. [14]بەلام ئەوانەی شارەزاییان هەیەو پێگەیشتوون، دەتوانن خواردنی بەهێز بخۆن، چونکە بەکردار توانایەکی مەشق پێکراویان لەلا دروست بووە. ئیتر دەتوانن چاکەو خراپە لەیەکتری جیابکەنەوە.

## پاشگەزبوونەوە لەباوەڕ

## 6

کەواتە باواز لەفێرکردنە سەرەتاییەکانی دەربارەی مەسیح بهێنینو بەرەو دروستیو تەواوی بڕۆین، هەروەها بابناغەی تۆبەکردنمان لەکردارە مردووەکانو باوەڕهێنان بەخوداو [2]فێرکردن دەربارەی لەئاوهەلکێشان، دەست لەسەر دانانو زیندووبونەوەی مردووانو لێپرسینەوەی هەتاهەتایی نەبێت. [3]جا ئێمە ئاوا دەکەین گەر خودا ڕێگامان بدات. [4]چونکە ناکرێ ئەوانەی جارێك ژیانیان ڕوونـاك کراوەتەوەو تامی بەهرەی ئاسمانیان کردووەو بەشیان هەبووە لەڕۆحی پیرۆز دووبارە بگەڕێنەوە بۆ تۆبەکردن، [5]هەروەها تامی باشی ووشەی خوداو هێزەکانی سەردەمی داهاتوویان کردووە، [6]لەگەل ئەوەشدا لەباوەڕ هەلگەڕانەوە. ناکرێ جارێکی تر نوێ بکرێنەوەو بۆ تۆبەکردن بگەڕێنەوە، چونکە ڕۆلەی خودا بەدەستی خۆیان لەخاچ دەدەنەوە، بۆ سووکایەتی دەریدەخەن. [7]چونکە ئەو زەوییەی بارانی بەسەر دەبارێو تێر ئاوە، ڕووەکی سوودبەخش دەدات بۆ ئەوانەی زەوییەکەیان کێلاوە، لەلایەن خوداشەوە پیرۆز دەکرێ. [8]بەلام گەر زەوییەکە دڕكو گژوگیای بێسوودی بەرهەم هێنا، ئەوسا گوێی نادرێتێ، شایانی نەفرەت لێکردنە، ئەنجامیشی سووتانە. [9]هاوڕێیانی خۆشەویست، هەرچەندە بەو شێوەیە قسەتان لەگەل دەکەین، لەگەل ئەوەش دلنیاین شتی باشتر بۆ ئێوەیەو لەگەلتان دەبێ بۆ ڕزگاریتان. [10]جا خودا زۆردار نییە، بیری ناچێتەوە ئەو کردارو خۆشەویستییەی لەپێناوی ئەو دەرتانبڕی لەخزمەتکردنی خوشكو برا پیرۆزەکانو بەردەوامن لەسەری. [11]ئێمەش دەخوازین هەر

یەك لەئێوە هەمان پەرۆشی دەربخات بەباوەڕێکی تەواو بەو هیوایەی هەمانە تاکۆتایی، [12]تاکو تەمبەڵ نەبن، بەڵکو ڕێگای ئەوانە بگرن کە بەهۆی باوەڕو ئارامگرتن بوون بەمیراتگری بەڵێنی خودا.

### خودا بەڵێنی خۆی دەباتەسەر

[13]کاتێ خودا بەڵێنی بەئیبراهیمدا، سوێندی بەخۆی خوارد، چونکە لەخۆی مەزنتر کەسی تری نییە سوێندی پێبخوا. [14] بەئیبراهیمی ووت: {بێگومان پیرۆزت دەکەم، نەوەیەکی زۆرت پێدەبەخشم.} [15]ئیتر ئیبراهیم دانی بەخۆی گرت تا بەڵێنەکەی بەدەستهێنا. [16]لەڕاستیدا خەڵکی سوێند دەخۆن بەوەی گەورەترە لەخۆیان، تا دەریخەن ئەوەی دەیلێن ڕاستەو ئەو ناکۆکیەی لەنێوانیان هەیە نەمێنێ. [17]خودا ویستی، ئەوانەی میراتگری بەڵێنن دڵنیایان بکات، کەوا هەرگیز بڕیاری خۆی ناگۆڕێ، بۆیە سوێندی بۆ خواردن. [18]چونکە خودا هەرگیز درۆ ناکات، ئێستا دوو شتی ڕاستەقینەمان هەیە دەتوانین پشتی پێببەستین. هەروەها هەموو ئەوانە بەهێز دەکاتو وورەیان بەرز دەکاتەوە کە خۆیان داوەتەدەست خوداو دەستیان گرتووە بەو هیوایەی بۆ ئەوانە. [19]ئەم هیوایە بۆ گیانمان وەك لەنگەر وایە، چەسپاو و ڕاگرە، دەچێتە ناو شوێنی هەرە پیرۆزی پەرستگا لەپشتی پەردە. [20]ئەو شوێنەی لەپێناوی ئێمەدا عیسای مەسیح پێشتر بۆی چوو، لەوێ بوو بەکاهینی بەرز بۆ هەتاهەتایە، لەپلەی مەلکیسادق.

### مەلکیسادقی کاهین

## 7

ئەم {مەلکیسادقە پادشای شاری سالیم بوو، هەروەها کاهینی بەرزی خودا بوو. کاتێ حەزرەتی ئیبراهیم لەشەڕی دژی پادشاکان بە سەرکەووتویی گەڕایەوە، مەلکیسادق بۆ پێشوازی لێکردنی ڕۆیشتو پیرۆزیکرد.} [2] ئیبراهیمیش دەیەکی هەموو دەسکەوتەکانی شەڕی دا بە ئەو. مەلکیسادق یەکەمجار بەواتای (پادشای ڕاستودروستی) دێت، هەروەها {پادشای سالیم} بەواتای

(پادشای ئاشتی). [3] دایكو باوكو ڕەچەڵەكی نییە، لەدایك بوونو كۆتایی ژیانی نییە، بەڵام وەك ڕۆڵەی خودا وایە، هەر بەكاهین دەمێنێتەوە تاهەتایە.

[4] سەیربكەن ئەم مەلكیسادقە چەند مەزنبووە، تەنانەت ئیبراهیمی باوكی گەورەمان، دەیەكی دەسكەوتی شەڕی داوەتێ. [5] ئێمە دەزانین شەریعەتی موسا ئەو كاهینانەی ڕاسپاردووە كە لەنەوەی لاوی پەیدا بوون، دەیەك لە گەل وەرگرن، بەواتای لەبرایانیان، هەرچەندە بەبنەچە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ ئیبراهیم. [6] بەلام لەگەڵ ئەوەی مەلكیسادق سەر بە نەوەی لاوی نەبوو، دەیەكی لەئیبراهیم وەرگرتو پیرۆزیكرد، هەرچەندە ئیبراهیم بەڵێنی لەخودا وەرگرتبوو. [7] كەواتە بەبێ گومان نزمتر لەلایەن بەرزترەوە پیرۆز دەكرێ. [8] جا ئەو كاهینانەی سەر بەنەوەی لاوین، ئەوانەی بەپێی شەریعەت دەیەك وەردەگرن، ئەوانە مرۆڤێكن دەمرن، بەلام مەلكیسادق، ئەوەی دەیەكی لەئیبراهیم وەرگرت، كتێبی پیرۆز شایەتی بۆ دەدات كەوا زیندووە، [9] بەڵكو لەمە زیاتر، دەتوانین بڵێین ئەو لاوییەی دەیەك وەردەگرێ، خۆی دەیەكی داوە بەهۆی ئیبراهیم. [10] هەرچەندە ئەو كاتە هێشتا لاوی لەدایك نەبوو بوو، لەپشتی ئیبراهیمی باپیری بوو كاتێ ئیبراهیمو مەلكیسادق یەكتریان بینی.

**عیسا وەك مەلكیسادقە**

[11] ئێستا گەر تەواوی بەكاهینێتی لاوی بێتەدی، ئەوەی گەل شەریعەتی لەسایەیدا وەرگرت، ئایا پێویست بوو كاهینێكی تر دەربكەوێ لەپلەی مەلكیسادق نەك لەپلەی هارون؟ [12] گەر بێتوو كاهینێتی بگۆڕێ، ئەوسا دەبێ شەریعەتیش بگۆڕێ. [13] ئەوەی ئەو باسەی لەسەر دەكرێ ﴿مەسیح﴾ لەهۆزی لاوی نەبوو، هەروەها كەس لەهۆزەكەی ئەو خزمەتی قوربانگای نەكردووە. [14] شتێكی ئاشكرایە، بنەچەی مرۆڤایەتی عیسای خوداوەندمان دەگەڕێتەوە بۆ تیرەی یەهوزا، هەرچەندە موسا باسی نەكردووە لەو تیرەیە كاهینێك پەیدا دەبێ.

[15] ئەوەی زیاتر ئەم باسە

ڕووندەکاتەوە ئەوەیە، کاهینی تازە ﴿مەسیح﴾ وەك مەلکیسادق [16] دانەنرا بەکاهین بەپێی شەریعەت بەگوێرەی ڕەچەڵەك، بەڵکو لەسەر بناغەی هێزی ژیانی نەفەوتاو. [17] کتێبی پیرۆز لەم بارەیەوە دەربارەی عیسا دەڵێ: {تۆ تاهەتایە کاهینی لەپلەی مەلکیسادق.}

[18] ئیتر لەلایەك ڕاسپاردەی پێشوو لابرا، چونکە بەهێزو سوودبەخش نەبوو. [19] لەلایەکی تر، چونکە شەریعەت هیچ شتێکی تەواو نەکرد، ئەوە بوو هیوایەکی باشترمان بۆ دەرکەوت تا بەهۆیەوە لەخودا نزیك بینەوە. [20] ئەوەش بەبێ سوێند نەبوو. ئەوانی دیکە بوون بەکاهین بەبێ سوێند. [21] بەڵام دانانی مەسیح وەك کاهین بەسوێندەوە بوو، { خوداوەند سوێندی خواردووەو لێی پەشیمان نابێتەوە، تۆ دەبێ تاهەتایە کاهین بی.} [22] بەم شێوەیە عیسا بوو بە گەرەنتی پەیمانێکی باشتر. [23] هەرچەندە لەسەردەمی کۆن زۆر سەرۆك کاهین هەبوون، لەگەڵ ئەوەش هەموویان بەهۆی مردن نەیانتوانی بەردەوام بن لەئەرکەکانیان. [24] بەڵام عیسا، چونکە تاهەتایە دەژی، بۆیە کاهینێتی ئەو هەر دەمێنێ. [25] کەواتە ئەو دەتوانێ هەموو ئەوانە ڕزگار بکات کە بەهۆی ئەوەوە دەچنە لای خودا، چونکە ئەو هەمیشە دەژی، بۆیە تکاشیان بۆ دەکات لای خودا.

[26] کەواتە، ئەم ئەو جۆرە کاهینە بەرزەبوو کە پێویستمان پێیەتی، پیرۆزو بێکەموکوڕیو بێهەڵەبوو، لەگوناهباران جیاکرایەوە، بەرزکرایەوە بۆ سەرووی ئاسمان. [27] ئەو پێویستی بەوە نەبوو هەموو ڕۆژێك لەبەر گوناهەکانی خۆیو گەلەکەی قوربانی پێشکەش بکات، هەروەك سەرۆك کاهینەکان لەکۆندا کردوویانە، چونکە ئەو تەنها جارێك کردی کاتێ خۆی کرد بەقوربانی لەپێناوی گوناهی هەموو خەڵك. [28] ئەوە بوو شەریعەت سەرۆك کاهینی لەمرۆڤ دەستنیشان دەکرد کە ناتەواوی خۆی هەیە، بەڵام بەووشەی سوێند ئەوەی دوای ئەم شەریعەتە هات، خودا ڕۆڵەی خۆی دەستنیشان کرد ئەوەی تەواوی کرد بۆ هەتاهەتایە.

## کاهینی بەرزی پەیمانی نوێ

# 8

گرنگترین خاڵ دەربارەی ئەوەی لێیدواین ئەمەیە: کەوا ئێمە مەسیحمان هەیە، ئەو کاهینە بەرزەی وا لەلای ڕاستی تەختی مەزنی خوداوە لەئاسمان دانیشتووە. [2] خزمەت دەکات لەپیرۆزترین شوێن واتە لەچادری پەرستنی ڕاستەقینە، ئەوەی خوداوەند دایناوە نەك مرۆڤ. [3]جا چونکە ئەرکی هەموو سەرۆك کاهینێك پێشکەش‌کردنی قوربانیو ئاژەڵ سەربڕینە بۆ خودا، کەواتە پێویستە سەرۆك کاهینی ئێمەش «مەسیح» شتێکی هەبێ بیکات بەقوربانی. [4]گەر مەسیح لەسەر ئەم زەوییە بووایە، شەریعەت ڕێگای نەدەدا ببێ بەسەرۆك کاهین. چونکە ئێستا سەرۆك کاهین هەیە بەپێی شەریعەت قوربانی پێشکەش بکات. [5]ئەوانە خزمەتی وێنەو سێبەری شوێنی پیرۆزی ئاسمان دەکەن، چونکە کاتێ موسا دەیویست چادر هەڵبدات، خودا ڕایسپاردو ووتی: {تەماشا بکەو هەموو شتێك بکە لەسەر ئەو نموونەیەی پێم نیشانداوی لەسەر چیا. } [6]بەلآم مەسیح خزمەتێکی زۆر مەزنتری دەسکەوت لەوەی ئەوان، هەرووەك خۆی پەیوەندیڕێکخەری پەیمانێکی باشترە، چونکە لەسەر بناغەی بەڵێنی باشترە.

[7]گەر پەیمانە کۆنەکە بێ کەموکوڕی بووایە، ئیتر پێویستی بەپەیمانێکی تر نەدەکرد. [8]چونکە خودا کەموکوڕی دۆزیەوە لە گەڵ کاتێ دەڵێ:

{دەبێ ڕۆژێك بێ، سەرلەنوێ پەیمانێکی دیکە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیلو نەوەی یەهوزا ببەستم. [9] ئەمەش وەك ئەو پەیمانە نییە کە لەگەڵ باوباپیرانیان بەستم، کاتێ دەستم گرتنو لەخاکی میسر دەرمهێنان، چونکە لەسەر پەیمانەکەم نەڕۆیشتن، ئیتر منیش پشتگوێم خستن، خوداوەند دەڵێ. [10]ئەمەش ئەو پەیمانەیە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل دەیبەستم، لەڕۆژانی داهاتوو یاساکانم دەخەمە ناو مێشکیانو لەناو دڵیان دەینووسم، دەبم بەخودایانو ئەوانیش دەبن بە گەلی من، [11]دوای ئەوە کەس براکەی یاخود نەوەی ووڵاتەکەی فێرناکات پێی بڵێ: خوداوەند بناسە، چونکە هەموویان دەمناسن، لە بچووکیانەوە تا گەورەیان. [12]من لەگوناهەکانیان

خۆش دەبم، ئیتر هەرگیز باسی گوناهەکانیان ناکەم.} [13]جا کە خودا بەمە بڵێ (پەیمانی نوێ) مانای وایە، پەیمانەکەی یەکەمجار کۆن بوو، شتێکی ئاساییە هەر شتێك کۆن بوو بێ بەرەو نەمان دەڕوات.

## پاراستنی پەیمانی کۆن

# 9

ڕاستە لەپەیمانی کۆن مەراسیمو یاسای تایبەتی بۆ پەرستنی خوداو شوێنی هەرە پیرۆزی سەر زەوی هەبووە لەچادری پیرۆز. [2]ئەم چادرە گەورەیە ژوورێکی هەبووە ناوی شوێنی پیرۆز بووە، چرایەكو مێزێكو نانی قوربانی تێدابوو. [3]ژوورێکی دیکەش کەوتبووە پشتی پەردەیەك، پێی دەووترا شوێنی هەرە پیرۆز*، [4] ئاگردانێکی زێڕینی تێدابوو بۆ بخورد سوتاندن، لەگەڵ سندوقی پەیمان کە ڕووکەش کرابوو بە زێڕ، لەناو سندوقەکە قاپێکی زێڕین هەبوو نانی مەنی ئاسمانی تێدابوو، لەگەڵ گۆچانەکەی هارون کە گەڵای سەوزی دەرکردبوو، هەروەها دوو تەختە بەردەکەی پەیمان. [5]بەڵام لەسەر سندوقەکە، کروبەکانی* شکۆ کرابوو سێبەریان کردبوو بەسەر سندوقەکە ئەمەش پێیدەوترا ﴿کورسی بەزەیی﴾. لێرەدا ئەوەندە بەسە دەربارەی ئەم باسە، چونکە ماوەی باسکردن لەمە زیاتر نییە.

[6]کاتێ کاروبارەکان بەو شێوەیە ڕێکخرابوون، سەرۆك کاهینەکان هەموو کاتێ دەیانتوانی بچنە ژووری یەکەم ﴿شوێنی پیرۆز﴾ بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە ئاینیەکان. [7]بەڵام ژووری دووەم ﴿شوێنی هەرە پیرۆز﴾ کەس نەیدەتوانی بچێتە ناوی تەنها سەرۆك کاهین نەبێ ئەویش ساڵی جارێك، پێویستبوو لەسەری خوێنی قوربانی لەگەڵ خۆی بباتو بیپرژێنێ بەسەر ﴿کورسی بەزەیی﴾ لەجیاتی خۆیو ئەو گوناهانەی گەلەکەی بێئەوەی بزانن کردوویانە. [8]بەمەش ڕۆحی پیرۆز بۆمان ڕوون دەکاتەوە، ئەو ڕێگایەی بەرەو شوێنی هەرە پیرۆزی ڕاستەقینە دەڕوات کە لەئاسماندایە، ئەمەش جارێ نەکرابووەوە. چونکە هێشتا ڕێگەی یەکەم ﴿چادری پیرۆز﴾ هەر مابوو. [9]ئەمەش هێمایە بۆ ئەم سەردەمەمان، کە هێشتا قوربانیو ئاژەڵ سەربڕینی تیادا

دەکرێ بەپێی سەردەمی کۆن. ئەو قوربانییانەش ناتوانێ ئاسوودەیی بخاتە ویژدانیان بەتەواوی. [10]چونکە ئەوانە تایبەتی بوون بەکاروباری لەش «شتی ڕواڵەتی» وەك خواردنو خواردنەوە، هەروەها ڕێگا جۆراوجۆرەکانی پاككردنەوە، ئیتر ئەم یاسایە مایەوە، هەتا کاتی سیستەمی نوێ.

**مەسیح پەیوەندیڕێکخەرە**

[11]بەڵام کاتێ مەسیح دەرکەوت وەك سەرۆك کاهین بۆ شتە باشەکانی داهاتوو، بەچادری تەواوترو مەزنتر کە بەدەست دروست نەکرا بێ، واتە سەر بەدروست کراو نەبێ. [12]ئەو تەنها یەکجار چووە ناو شوێنی هەرە پیرۆز، بۆ ئەوەش خوێنی بزنو گوێرەکەی لەگەڵ خۆی نەبرد، بەڵکو خوێنی خۆی، بەم خوێنەش کڕینەوەی هەتاهەتایی بەدەستهێنا. [13]گەر بەپێی سەردەمی کۆن خوێنی مەڕو گوێرەکەو خۆڵەمێشی بەرخی سووتێنراو، گلاوەکان پیرۆز بکات بۆ پاككردنەوەی لەش، [14]ئیتر دەبێ خوێنی مەسیح چەند لەوە زیاتر بێ، ئەوەی خۆی پێشکەشی خودا کرد بە ڕۆحێکی هەتاهەتایی بێ کەموکوڕی، ئەوەی ویژدانتان پاك دەکاتەوە لەکردارە مردووەکان تاخزمەتی خودای زیندوو بکەن.

[15]بۆیە مەسیح پەیوەندی ڕێکخەری پەیمانی نوێیە، تا ئەوانەی بانگکراون میراتی هەتاهەتایی بەدەستبهێنن، ئەوەی خودا بەڵێنی پێدابوو، چونکە عیسا مرد تا بەخوێنی خۆی بیانکڕێتەوە لەو گوناهانەی لەپەیمانی کۆن کردوویانە. [16]گەر وەسیەتنامە هەبێ، پێویستە بسەلمێنرێ خاوەن وەسیەتەکە مردووە، [17]چونکە وەسیەتنامە کاتێك کاری پێدەکرێ کە خاوەنەکەی مردوو بێ، بەڵام گەر زیندوو بێ هیچ کاری پێ ناکرێ. [18]بەم شێوەیە، پەیمانی کۆن کاتێك کاری پێکرا کە بەخوێن مۆرکرا. [19]چونکە موسا، دوای ئەوەی هەموو ڕاسپاردەکانی شەریعەتی بۆ هەموو گەل ڕاگەیاند، خوێنی مەڕو گوێرەکەی لەگەڵ ئاو تێکەڵکرد، پرژاندی بەسەر شەریعەتو هەموو گەل، بە چەپکێ لەڕووەکی زوفاو پارچەیەك لە خوری سوور. [20]ئەوسا

ووتی: {ئەم خوێنە مۆری ئەو پەیمانەیە کە خودا لەگەڵ ئێوەی بەست}. [21]بەهەمان شێوە خوێنەکەی پرژاند بەسەر چادری پەرستنو ئەو کەلوپەلانەی بۆ خزمەت بەکار دێن. [22]بەپێی شەریعەت نزیکەی هەموو شتێك بەخوێن پاك دەبێتەوە، لێی خۆشبوونی گوناهیش بێ خوێنڕشتن نابێ.

### مەسیح مەزنترین قوربانییە

[23]گەر پاككردنەوەی وێنەی شتە ئاسمانیەکان ئەوەندە پێویستی بەو مەراسیمانە هەبێ، جا دەبێ شتە ئاسمانیەکان خۆیان چەند پێویستیان بەخوێنی قوربانیەکی باشتر بێ! [24]چونکە مەسیح، نەچووە شوێنی هەرە پیرۆزی سەر زەوی، ئەوەی مرۆڤ تەنها لەسەر نموونەی شوێنی هەرە پیرۆزی ڕاستەقینە دروستی کردووە، بەڵکو چووە ناو ئاسمان، ئێستا لەوێ نوێنەری ئێمەیە لەبەردەم خودا. [25]ئەو نەچووە ئەوێ تا چەند جارێك، خۆی بکات بەقوربانی، هەروەك چۆن سەرۆك کاهینی سەر ئەم زەوییە ساڵێ جارێك دەچووە شوێنی هەرە پیرۆز، بەخوێنێك کە خوێنی خۆی نەبوو. [26]ئەگینا دەبوایە عیسا لەدروستکردنی جیهانەوە چەند جارێك ئازار بدرایە. بەڵام ئێستا لەکۆتایی زەمان یەکجار هات تا گوناهمان بسڕێتەوە، بەوەی خۆیکرد بەقوربانی لەپێناوی ئێمە. [27]هەروەك چۆن دوارۆژی مرۆڤ ئەوەیە جارێك بمرێ، دوایی ڕۆژی لێپرسینەوە دێت، [28]مەسیحیش، جارێك خۆیکرد بەقوربانی تا گوناهی خەڵکێکی زۆر لاببات. بەڵام هاتنەوەی عیسا بۆ جاری دووەم بۆ لابردنی گوناه نییە، بەڵکو بۆ ڕزگارکردنی ئەوانەیە کە بەپەرۆشەوە چاوەڕێی دەکەن.

## 10

چونکە شەریعەت تەنها سێبەری شتە باشەکانی داهاتووە، نەك وێنەی تەواوی ڕاستیەکان، بۆیە هەرگیز ناتوانێ بەو قوربانیانەی بە بەردەوامی پێشکەش دەکرێ ساڵ لەدوای ساڵ ئەوانە دروستو تەواو بکات کە لەخودا نزیك دەبنەوە بۆ پەرستن. [2]ئەگینا پێویستی نەدەکرد بەردەوامبن لەپێشکەشکردنی قوربانی، چونکە ویژدانی خواپەرستان، کەی بەتەواوی

جارێك پاكبووەوە، ئیتر جارێکیتر پێویستی بەپاكبوونەوە نییەو هەست بەگوناهی ڕابووردووی ناكات. [3] لەڕاستیدا، ئەو قوربانیانە ساڵ بەساڵ گوناهی بەبیر مرۆڤ دەخستەوە، [4] ئەگینا بەهیچ جۆرێك خوێنی مەڕو گوێرەکە گوناهی ئێمە لانابات. [5] لەبەرئەوە کاتێ مەسیح هاتە ئەم جیهانە ووتی: {تۆ قوربانیو خێرت نەویست، بەڵکو لەشێکت داوە پێم. [6] بەقوربانی سووتاو و قوربانی گوناه دڵخۆش نەبووی. [7] جا ئەوکاتە پێم ووتی: (ئەوەتا هاتووم تابەخواستی تۆ کار بکەم، ئەمە ئەوەیە لەکتێبی پیرۆز لەسەرم نووسراوە.)}

[8] ئەو یەکەمجار ووتی: {تۆ قوربانیو خێرو قوربانی سووتاو و قوربانی گوناهت نەویستو پێی دڵخۆش نەبووی}، هەرچەندە هەمووی بەپێی شەریعەت دەکرد، [9] ئینجا مەسیح ووتی: {ئەوەتا هاتووم تا بەخواستی تۆ کار بکەم.} کەواتە بەمە یاسای یەکەمی لابرد، تا یاسای دووەم دابنێ. [10] بەپێی ئەم خواستەی خودا، ئێمە پیرۆز بووین کاتێ عیسای مەسیح یەکجار لەشی خۆی کرد بەقوربانی لەپێناوی هەمووان.

[11] لەکۆندا سەرۆك کاهینەکان هەموو ڕۆژێك سەرلەنوێ دەبووایە قوربانگایان ئامادە بکردایە، لەبەر پێشکەشکردنی قوربانی بۆ خودا، هەرچەندە ئەو جۆرە قوربانیانە نەیاندەتوانی گوناهی هیچ مرۆڤێك لاببەن. [12] بەڵام ئەو کاهینە بەرزە ﴿مەسیح﴾ یەکجار قوربانیەکی پێشکەشکرد لەجیاتی هەموو گوناهێك، ئەوسا بۆ هەتاهەتایە لەلای دەستە ڕاستی خودا دانیشت. [13] ئەو لەوێ چاوەڕێ دەکات، هەتا خودا هەموو دوژمنەکانی دەخاتە ژێر پێیەوە. [14] چونکە ئەو بەیەك قوربانی، ئەوانەی پیرۆزکراون، دروستو تەواوی کردن. [15] ڕۆحی پیرۆزیش خۆی شایەتیمان بۆ دەدات، دوای ئەوەی خودا دەڵێ: [16] {ئەمە ئەو پەیمانەیە کە لەگەڵیان دەیبەستم، دوای ئەو ڕۆژانە خوداوەند دەڵێ: یاساکانم دەخەمە ناو دڵیان، هەروەها لەناو مێشکیان دەینووسم.} [17] ئینجا بەردەوام دەبێو دەڵێ: {جارێکیتر هەرگیز یادی گوناهەکانو هەڵەکانیان ناکەمەوە.} [18] هەروەها کاتێ ئەم گوناهانە بەخشران، ئیتر پێویست ناکات قوربانی بۆ گوناه

بکرێ.

**ئەنجامی قوربانی مەسیح**

[19]بەم شێوەیە برایانی خۆشەویست، ئێستا بەتەواوی باوەڕمان بەوە هەیە، بەهۆی خوێنی عیسای مەسیح، دەتوانین بڕۆینە شوێنی هەرە پیرۆز. [20]بەو ڕێگا زیندوو و تازەیەی بەدڕاندنی پەردەی پەرستگا کرایەوە، واتە بەلەشی خۆی. [21]هەروەها لەبەرئەوەی کاهینی بەرزمان هەیە سەرپەرشتی ماڵی خودا دەکات، [22]کەواتە، پێویستە نزیك بکەوینەوە لەخودا بەدڵێکی پاكو پڕ لەمتمانەی باوەڕ، دوای ئەوەی دڵمان پاك کرایەوە لەیژدانێکی خراپ بەپرژاندنی خوێن بەسەری، هەروەها لەشمان بەئاوی پاك خاوێن کراوەتەوە. [23]با دەستبگرین بەو هیوایەی شایەتی بۆ دەدەین، بێ‌ئەوەی لەهاتنەدی دوودڵ بین، چونکە ئەوەی بەڵێنی پێداوین ڕاستگۆیە، [24]هەروەها با ئاگاداری یەکتری بینو یەکتری هانبدەین بۆ خۆشەویستیو کرداری چاك. [25]واز لەکۆبوونەوەکانتان مەهێنن، هەروەك هەندێکتان لەسەری ڕاهاتوون، بەڵکو یەکتری هانبدەن بۆ ئامادەبوون، لەمەش زیاتر چونکە دەبینن ڕۆژی خوداوەند نزیكبووەتەوە.

[26]گەر ئێمە بەدەستی ئەنقەست گوناه بکەین، دوای ئەوەی ڕاستیمان ناسی، ئەوسا هیچ قوربانیەك نییە بۆ لێخۆشبوونی گوناهمان. [27]هیچ شتێکی دیکەمان بۆ نامێنێتەوە جگە لەوەی چاوەڕێی ڕۆژی لێپرسینەوەی ترسناكو تووڕەیی ئەو ئاگرە بکەین کە دوژمنانی پێ دەسووتێنرێ. [28]دەزانن گەر یەکێك دوو یان سێ شایەتی بەسەرەوە بێ کەوا بەرپێچی شەریعەتی موسای کردووە، بێ بەزەییانە سزای مردنی بەسەر دەدرێ. [29]کەواتە بەڕای ئێوە، دەبێ چەند زیاتر بێ سزای ئەوەی بە سووکی سەیری ڕۆڵەی خودا دەکاتو لەهەمان کات خوێنی پەیمان بە پیس دادەنێ کە پیرۆزی کردووە، هەروەها گاڵتە بە بەرەکەتی خودا دەکات؟ [30]چونکە ئێمە ئەوە باش دەناسین کە ووتویەتی: {تۆڵە سەندن هی منە، منم پاداشت دەدەمەوە.} هەروەها نووسراوە: {خوداوەند حوکم بەسەر گەلەکەی دەدات.} [31]

زۆر ترسناکانە کەوتنە بەردەستی خودای زیندوو.
[32]بەڵام ڕۆژانی ڕابردووتان لەیاد بێ، کاتێ ژیانتان ڕووناك کرایەوەو چەند دانتان بەخۆتان گرتو تووشی ئازار هاتن بەتێکۆشانێکی سەختو درێژ. [33]لەلایەك ئێوە تووشی جنێو و چەوسانەوە هاتوون، لەلایەکی دیکە بەشداری ئەوانەتان کرد کە بەهەمان شێوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرا. [34]هەروەها بەشداری بەندکراوانتان کرد لەئازارەکانیان، کاتێ دەستیان بەسەر ماڵو سامانتان گرت، بەخۆشیەوە دانتان بەخۆتان گرت، چونکە دەزانن لەئاسمان سامانێکی باشترو نەفەوتاوتان هەیە. [35]کەواتە بێ متمانە مەبن، چونکە پاداشتی مەزنە. [36]ئێوە پێویستتان بەدان بەخۆگرتن هەیە، تا کاربکەن بەخواستی خوداو بەڵێنەکەی بەدەستبهێنن. {[37]چونکە ئەوەی چاوەڕێی دەکرێ بێت، دوای ماوەیەکی زۆر کورت دێتو دواناکەوێ. [38]خودا دەڵێ: ئەوەی بەباوەڕ بێتاوان دەبێ، دەژی، هەروەها ئەگەر هەڵگەڕایەوە، ئەوە جێی ڕەزامەندی من نابێ.} [39]جا ئێمە سەربەو هەڵگەڕاوانە نین کە لەناودەچن، بەڵکو سەربەوانەین کە باوەڕیان هەیەو ڕزگار دەبن.

## باوەڕی باپیرانمان

# 11

باوەڕ دڵنیایی تەواوە بەوەی هیوامان لەسەریەتی، هەروەها بێگومانبوونە ئەوەی نایبینین هەیە. [2]بەم باوەڕە، خەڵك لەکۆندا ڕەزامەندی خودایان بەدەستهێناوە.

[3]بەباوەڕ دەزانین هەموو جیهان بەهۆی ووشەی ئەوەوە دروستبووە، تەنانەت هەموو ئەو شتانەی دەیبینین، لەشتێك هاتۆتەکایەوە کەوا نایبینین.

[4]بەباوەڕ هابیل قوربانی پێشکەش کرد، قوربانییەکەی لای خودا باشتر بوو لەوەی قابیلی برای. هەر بەهۆی باوەڕیەوە بوو خودا قوربانییەکەی پەسەندکردو شایەتی بۆدا کە ڕاستودروستە، هەرچەندە هابیل مرد، بەڵام تائێستاش بەباوەڕی هەروا دەدوێ.

[5]بەباوەڕ ئەخنوخ بەرزکرایەوە لای خودا بێ ئەوەی بمرێت، لەسەر ڕووی ئەم زەوییە نەما، چونکە خودا

بەرزیکردەوە بۆ لای خۆی، پێش ئەوەی ئەمە ڕووبدات، شایەتی بۆ دراوە کەوا ئەو جێی ڕەزامەندی خودا بووە. [6]بێباوەڕ ڕەزامەندی خودا بەدەستنایەت، چونکە ئەوەی بیەوێ لەخودا نزیكبێتەوە، دەبێ باوەڕی بەبوونی ئەو هەبێ. هەروەها باوەڕی بەوە هەبێ خودا پاداشتی ئەوانە دەداتەوە کە بەدوایدا دەگەڕێن.

[7]بەباوەڕ نوح ئاگادارکرایەوە سەبارەت بەوەی ڕوودەدات، هەرچەندە نیشانەی هیچ ڕووداوێك دیار نەبوو، ترسی خودا وای لەنوح کرد کەشتییەك دروست بکات تا خاوخێزانەکەی ڕزگار بکات، بەمە نوح حوکمی بەسەر جیهانداو خۆی بوو بەمیراتگری ڕاستودروستی.

**باوەڕی ئیبراهیم و باوکان**

[8]بەباوەڕ کاتێ ئیبراهیم بانگکرا بڕوات بۆ ئەو شوێنەی دواتر بەمیرات وەریدەگرێ، گوێڕایەڵی خودا بوو و ڕۆیشت، هەرچەندە نەیدەزانی بۆ کوێ دەچێ. [9]هەروەها بەباوەڕ لەخاکی بەڵێن پێدراو نیشتەجێبوو، هەروەك بلێی لەناوچەیەکی نامۆ بێ، لەچادر لەگەڵ ئیسحاق و یاقوب دەژیا کەئەوانیش میراتگری هەمان بەڵێن بوون. [10]چونکە ئیبراهیم چاوەڕێی چوونی شاری ئاسمانی دەکرد کە بناغەیەکی چەسپاوی هەیە، ئەوەی خودا دروستکەرو ئەندازیاریەتی.

[11]بەباوەڕ بوو، سارای ژنی ئیبراهیم تواناى سك پڕبوونی پێدرا، هەرچەندە تەمەنی منداڵبوونی بەسەرچوو بوو، چونکە دڵنیابوو لەوەی ئەو بەڵێنەی خودا پێی داوە دەیباتە سەر. [12]بەم شێوەیە لەیەك پیاو کەنزیکی مردن بوو نەوەیەکی گەورە دروستبوو، {ژمارەیان وەك ئەستێرەی ئاسمان، وەك لمی سەر کەناری دەریا لەژمار نەدەهات.}

[13]هەموو ئەوانە لەباوەڕ مردن، بێئەوەی ئەو بەڵێنەی پێیان درابوو بەدەستی بهێنن، بەڵام هەر لەدوورەوە بینییان پێشوازیان لێکرد، هەروەها ڕایانگەیاند کە ئەوان تەنها نامۆ و میوانن لەسەر زەوی. [14]ئەوانەی ئەمە دەڵێن، بەمە دەریدەخەن کەداوای وولات دەکەن. [15]گەر ئەوان باسی ئەو وولاتەیان بکردایە کە بەجێیان هێشتبوو، ئەوسا هەلی

گەڕانەوەیان بۆی دەبوو. [16] بەڵام، ئەوان ئارەزووی وولاتێکی باشتریان دەکرد کە لەئاسمانە. لەبەرئەوە خودا شەرمی پێیان نەبوو ناوبنرێ بەخودایان، چونکە لە ئاسمان شاری بۆ دروستکردن.

[17] بەباوەڕ ئیبراهیم ئیسحاقی کوڕی پێشکەشکرد وەك قوربانی کاتێ خودا تاقی دەکردەوە، ئەو تاقە کوڕەی بەبەڵێن لەخودا وەریگرتبوو، ئامادەبوو ئەویش بکات بەقوربانی. [18] سەبارەت بەئیسحاق خودا ووتی: {لەئیسحاقەوە هەموو نەوەی ئەو پەیدا دەبێ.} [19] ئیبراهیم باوەڕی بەوە هەبوو خودا توانای ئەوەی هەیە مردووان زیندووبکاتەوە، لەبەرئەوە خودا جارێکی دیکە ژیانی بەئیسحاق بەخشی وەك نیشانە. [20] بەباوەڕ بوو، ئیسحاق یاقوبو عیسۆی پیرۆزکرد، بۆ داهاتووی چاك.

[21] بەباوەڕ بوو، یاقوب لەسەرە مەرگدا هەردوو کوڕەزاکانی کە کوڕی یوسف بوون پیرۆزی کردن، ئینجا خۆیدا بەسەر گۆچانەکەیداو ستایشی خودای کرد.

[22] بەباوەڕبوو، یوسف لەکۆتایی ژیانی، باسی دەرچوونی ئیسرائیلیەکانی کرد لەمیسرو سەبارەت بەناشتنیشی وەسیەتی کرد.

**باوەڕی موساو باوکان**

[23] بەباوەڕ بوو، کاتێ موسا لەدایك بوو، بۆ ماوەی سێ مانگ دایكو باوکی شاردیانەوە، چونکە بینیان منداڵێکی جوانە، لە فەرمانەکانی پادشا نەترسان.

[24] بەباوەڕ بوو، کاتێ موسا گەورە بوو، نەیویست خەڵکی بە کوڕی کچی فیرعەون بانگی بکەن. [25] موسا بەلایەوە باشتر بوو لەگەڵ گەلی خودا ئازار بچێژێ، لەوەی بۆ ماوەیەکی کورت لەزەت لەخۆشی ژیان وەربگرێو بەگوناهەوە بژی. [26] بەلای موسا ئەو ڕیسواییەی لەپێناوی مەسیح چەشتی، نرخی زیاتر بوو لەگەنجینەی میسر، چونکە دەیزانی خودا چۆن پاداشتی دەداتەوە. [27] هەر بەباوەڕ بوو دوایی میسری بەجێهێشت، بێئەوەی لەتووڕەیی پادشا بترسێ. بە شێوەیەك وورەیبەرز بوو، هەروەك ئەوە ببینێ کە نەبینراوە. [28] هەر بەباوەڕ بوو موسا ڕۆژی تێپەڕبوونی کردو دوایی خوێنی قوربانیەکانی پرژاند

بەدەرگای جوولەکەکان، تا فریشتەی لەناوبەر ئەوەی کوڕە نۆبەرەکانی کوشت، دەست لەوان نەدات.

**باوەڕی دادوەرانو پێغەمبەران**

[29]بەباوەڕ بوو، جوولەکەکان توانییان لەدەریای سوور بپەڕنەوە، هەروەك بەسەر ووشکانیدا بڕۆن. بەلام میسریەکان کاتێ ویستیان بپەڕنەوە خنکان.

[30]بەباوەڕ بوو، شوورەی چواردەوری شاری ئەریحا ڕووخا، دوای ئەوەی حەوت ڕۆژ بەدەوری سوورانەوە.

[31]بەباوەڕ بوو، ڕاحابی داوێنپیس لەناونەچوو لەگەڵ یاخیبووان، چونکە پێشوازیەکی هاوڕێیانەی لەدوو سیخوڕەکەی یەشوع کرد.

[32]نموونەی تر زۆرە بۆتان بهێنمەوە، بەلام کاتی ئەوە نییە تاوەکو باسی: جەدعونو باراقو شەمشونو یەفتاحو داودو ساموئیلو پێغەمبەرانتان بۆ بکەم. [33]بەهۆی باوەڕیان ئەوانە توانییویانە: زاڵبن بەسەر پادشاهێتیەکان، دادپەروەری بهێننەکایەوە، بەڵێنی خودا بەدەستبهێنن، دەمی شێر دابخەن، [34]ئاگری گڕدار بکوژێننەوە، لەژێر تیخی شمشێر ڕابکەن، لەکاتی بێهێزی بەهێزبن، لەمەیدانی شەڕ بن بەپاڵەوان، لەشکری بێگانە بگەڕێننەوە دواوە، [35]هەندێك ژن مردووەکانیان گەڕایەوە لایان بەزیندووبوونەوە، هەندێکی دیکەیان دانیان بەئازارو ئەشکەنجە گرت هەتا مردن، نەیانویست ڕزگاریان بێ تا لەڕۆژی دواییدا زیندووبوونەوەیەکی باشتر بەدەستبهێنن. [36]هەندێکی تریان تووشی ئازارو سووکایەتیو بەقامچی لێدانو کۆتو زنجیرو بەندیخانە بوون. [37]هەندێکیان بەردبارانکران، پەرشوبلاوکران، بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە بەشمشێر ملیان پەڕێنراوە. بەشێکیان ئاوارە بوون لەجیاتی جل خۆیان بە پێستی مەڕو بزن داپۆشیوە، دەربەدەری شاران بوون، تووشی برسێتیو چەوسانەوەو تەنگانەیەکی زۆربوون. [38]هەروەك شایانی ئەم جیهانە نەبن، ئاوارەی ناو بیابانو شاخو ئەشکەوتەکانو کونو کەلەبەری زەوی بوون.

[39]هەرچەندە باوەڕی ئەوان

شوێنی ڕەزامەندی خودا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێنی خودایان بەدەست نەهێنا. [40]چونکە خودا پێشتر شتێکی باشتری بۆ ئێمە دانابوو، تا ئەوان بەبێ ئێمە تەواو دروست نەبن.

## تەمێکردنی خودای باوك

# 12

لەبەرئەوە گەر ئێمە بەهەورێکی ئاوا گەورەی شایەتیدان دەوردراوین، با لەهەموو بارگرانیو گوناهێك كە كۆتی كردووین ئازادبین، هەروەها بەپشوودرێژیەوە لەو پێشبڕكێیە ڕابكەین كە لەپێشمانە. [2]با هەمیشە سەیری عیسا بكەین، پێشڕەو و تەواوكەری باوەڕمان. ئەوەی لەپێناوی ئەو خۆشیەی چاوەڕێی دەكرد، دانی بەخۆیگرت كاتێ لەخاچیانداو شەرمەزاری پشتگوێ خست، دوایی لەلای دەستە ڕاستی خودا دانیشت. [3]سەرنج بدەنە ئەوەی دانیبەخۆیگرت سەبارەت بەو دژایەتیەی گوناهباران لەگەڵیان دەكرد، تا وورە بەرنەدەنو شەكەت نەبن. [4]هەرچەندە ئێوە لەململانێی گوناە تا ئێستا خوێنتان نەڕشتووە.

[5]ئایا ئەو ووشە هاندەرانەی خوداتان لەبیر چووەوە، كە هەروەك ڕۆڵەی خۆی لەگەڵ ئێوە دەدوا؟ كاتێ دەڵێ: {ڕۆڵەكەم، بەچاوی نزم سەیری تەمێكردنی خوداوەند مەكە، هەروەها وورە بەرمەدە كاتێ سزات دەدات، [6]چونكە ئەوەی خوداوەند خۆشیبوێ تەمێی دەكات، هەروەها هەر یەكێك وەك ڕۆڵەی خۆی وەریگرێت بەقامچیی لێیدەدات.}

[7]كەواتە، دانبگرن بەخۆتان كاتێ خودا تەمێتان دەكات، چونكە هەڵسوكەوتی باوكو ڕۆڵەتان لەگەڵ دەكات، چ ڕۆڵەیەك هەیە باوكی تەمێی نەكات؟ [8]گەر بێتو خودا تەمێتان نەكات وەك هەموو منداڵەكانی دیكەی، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ئێوە زۆڵنو منداڵی ئەو نین. [9]گەر باوكی سەر زەویمان تەمێمان بكات لەگەڵ ئەوەشدا ڕێزی بگرین، ئایا دەبێ چەند زیاتر ملكەچی باوكی ڕۆحیمان بین؟ بۆ ئەوەی ژیان بەدەست بهێنین. [10]باوكی سەر زەویمان بۆ ماوەیەك تەمێمان دەكات ئەوەندەی بەباشیان زانیوە، بەڵام خودا، تەمێمان دەكات لەپێناوی بەرژەوەندی ئێمە، هەتا لەپاكوپیرۆزی ئەودا بەشدار بین. [11]

چونکە تەمێکردن لەکاتی خۆی دەردەکەوێ کەمایەی ئازارە نەك خۆشی، بەڵام دواتر، لەئاشتیدا بەرووبوومی ڕاستودروستی لێدەکەوێتەوە بۆ ئەوانەی ڕاهێنراون، تا کەم ئەندامەکان لەڕێگا دەرنەچن، بەڵکو چاكببنەوە.

[12]کەواتە دەستە بێهێزو ماندووەکانتان جارێکی دیکە بەرز بکەنەوە، هەروەها ئەژنۆ لەرزۆکەکانتان بەهێز بکەن، [13]ڕێگای ڕاستو ڕەوان بۆ پێتان ئامادە بکەن.

[14]هەوڵ بدەن، بە ئاشتی بژین لەگەڵ هەموو کەسێك، داوای پاكوپیرۆزی بکەن، بەشێوەیەك بژین جێی ڕەزامەندی خودا بێ، ئەگینا بێ ئەوە کەس ناتوانێ خوداوەند ببینێ. [15]ئاگاداری ئەوە بن، کەستان خۆی لەبەرەکەتی خودا بێبەش نەکات، بەوەی ڕەگی تاڵیتان تیادا بڕوێ، ئەمەش بێزاری بهێنێتە کایەوەو ببێتە هۆی خراپبوونی بەشێکی زۆرتان. [16]ئاگادار بن، با کەستان داوێنپیسیو کفر نەکات لەگەڵ خودا وەك عیسۆ، ئەوەی مافی نۆبەرایەتی خۆی فرۆشت بە ژەمێ نانخواردن. [17]چونکە دەزانن دوای ئەوەی ویستی بیێتەوە میراتگری پیرۆزی، ڕەتکرایەوە چونکە دەرفەتی تۆبەکردنی بۆ نەمابوو، هەرچەندە بەگریانەوەش داوای دەکرد.

[18]چونکە ئێوە لەشاخێك نزیك نەکەوتنەوە دەستی لێبدرێ، لەئاگرێکی گڕدار، لەتاریکی، لەتەم، لەگەردەلوول، [19]هەروەها دەنگی کەرەنا، دەنگی دوانێك وا لەگوێگران بکات بپاڕێنەوە، تا ئیتر ئەم قسانەیان بۆ نەکرێ. [20]چونکە ئەوان نەیانتوانی خۆیان ڕاگرن لەئاست توندی فەرمانەکەی خودا، کە ووتبووی: {گەر ئاژەڵیش دەستی بەر ئەو شاخە بکەوێ، دەبێ بەردباران بکرێ.} [21]لەڕاستیدا دیمەنەکە ئەوەندە ترسناك بوو تەنانەت وای لەموسا کرد بڵێ: {من لەترسا دەلەرزم.}

[22]بەڵام ئێوە بۆ شاخی شاری داود هاتوون، بۆ شاری خودای زیندوو، کە قودسی ئاسمانییە، بۆ ئاهەنگێك فریشتەیەکی گەلێ زۆر تیایدا بەشداریکردووە. [23]بۆ کۆمەڵی ڕۆڵە نۆبەرەکانی خودا، ئەوانەی ناویان لەئاسمان نووسراوە.

ئێوە بۆ لای خودا خۆی هاتوون ئەوەی فەرمان بەسەر هەموو مرۆڤ دەدات، بۆ لای رۆحی راستودروستان کە تەواوکراون. [24]بەڵێ بۆ لای عیسا هاتوون، ئەوەی پەیوەندیڕێکخەری پەیمانی نوێیە، هەروەها بۆ خوێنێکی ڕشێنراو کە زۆر باشتر لەخوێنی هابیل دەدوێ.

[25]ئاگاداربە قسەکەر ڕەتمەکەوە، چونکە گەر ئەوانەی لەپێشا قسەکەری بە وەحییان ڕەتکردەوە لەسەر زەوی نەیانتوانی ڕابکەن، ئایا ئێمە چۆن دەتوانین لەسزا ڕابکەین گەر قسەکەری ئاسمان ڕەتبکەینەوە؟ [26]لەکۆنا دەنگی خودا زەوی خستە لەرزە، بەلاّم ئێستا ئەو بەڵێنیداوەو دەڵێ: { جارێکیتر تەنها زەوی ناخەمە لەرزە بەڵکو ئاسمانیش.} [27]مەبەست لە (جارێکیتر) ئەمەیە: هەموو ئەو شتانەی خودا دروستیکردووەو لەرزۆکە نامێنێ، لەبناغەدا دەیانگۆڕێ، تەنها شتە چەسپاوەکان دەمێنێتەوەو نالەرزێ. لەشوێنی خۆی ناجوڵێ.

[28]بۆیە با دەم بەسوپاس بین بۆ ئەو پادشاهێتیەی کە نالەرزێ، هەروەها بەترسو ڕێزەوە خودا بپەرستین، بەشێوەیەك کەجێی ڕەزامەندی بێت. [29]چونکە خودای ئێمە ئاگرێکی سووتێنەرە.

## ووتەی هاندان

## 13

با خۆشەویستی خوشكو برایەتی بچەسپێ. [2]میوانداری نامۆکان لەیاد مەکەن، چونکە بەمە هەندێ کەس میوانداری فریشتەکانیان کردووە بیئەوەی بزانن. [3]یادی بەندکراوان بکەن، هەروەك بەندکرابن لەگەڵیان، هەروەها زۆرلێکراوان، هەروەك زۆرتان لێکرا بێت لەلەش. [4]دەبێ لای هەموو کەسێك ژنو مێردایەتی ڕێزی هەبێ، جێگەی ژنو مێرد بەپاکی بمێنێتەوە، چونکە خودا بەرەڵلاّو داوێنپیس تاوانبار دەکات.

[5]خۆتان دووربخەنەوە لەخۆشەویستی پارە، ڕازیبن بەوەی هەتانە، چونکە خودا ووتویەتی: { هەرگیز پشتگوێت ناخەمو بەجێت ناهێڵم.} [6]کەواتە دەتوانین، بەباوەڕی تەواو بەبێترس بڵێین: {خوداوەند یارمەتیدەرمە، لەهیچ شتێك ناترسم،

ئیتر مرۆڤ دەتوانێ چی بەرامبەرم بکات؟}

[7] هەمیشە ڕابەرەکانتان لەیاد بێ، ئەوانەی ووشەی خوداتان پێڕادەگەیێنن، تەماشای سەربردەو ئەنجامی ژیانیان بکەن، هەروەها باوەڕی ئەوان بکەن بەنموونەیەك بۆ خۆتان. [8] عیسای مەسیح وەك خۆیەتی، دوێنێو ئەمڕۆ و تاهەتایە. [9] لەبەرئەوە ڕێمەدەن بەهۆی فێرکردنی نامۆ و جۆراو جۆرەوە گومڕابن. لەوە باشتر نییە گەر دڵ بەبەرەکەت بچەسپێ، نەك بەخواردن، ئەوەی هیچ سوودی نییە بۆ ئەوانەی هەوڵی بۆ دەدەن. [10] ئێمە قوربانگایەکمان هەیە، ئەوانەی خزمەتی چادری پەیمانی کۆن دەکەن بۆیان نییە لێی بخۆن، [11] چونکە ئەو ئاژەڵانەی سەرۆك کاهین بەهۆی خوێنیان دەچێتە شوێنی هەرە پیرۆز وەك قوربانی بۆ گوناه، کەلەشەکانیان لەدەرەوەی گەڕەك دەسوتێنرێ. [12] لەبەرئەوە عیساش لەدەرەوەی شار ئازار درا، تا بەخوێنی خۆی مرۆڤ پیرۆز بکات. [13] کەواتە با بچینە لای مەسیح بۆ دەرەوەی گەڕەك، بەشداری ڕیسوایی ئەو بکەین، ئەوەی لەپێناوی ئێمە بەسەری هات! [14] چونکە لەسەر ئەم زەوییە هیچ شارێك نییە بۆمان بمێنێتەوە، با هەوڵ بدەین بۆ شاری داهاتوو. [15] کەواتە با بەناوی عیسای مەسیح هەمیشە قوربانی ستایش پێشکەشی خودا بکەین، ئەمەش بەرووبوومی لێوەکانمانە، کەوا بەو شێوەیە دان بەناوی ئەو دەنێین. [16] هەروەها کاری چاكو یارمەتیدانی لێقەوماوان پشتگوێ مەخەن، چونکە ئەو جۆرە قوربانیانە خودا دڵشاد دەکات. [17] گوێڕایەڵی ڕابەرەکانتان بنو ملکەچی دەسەڵاتیان بن، چونکە ئەوان شەوارەتان بۆ دەگرن، هەروەك بڵێی حیسابیان پێشکەشی خودا بکەن، گوێڕایەڵیان بن تا بتوانن کارەکەیان بەدڵشادی بکەن نەك بەبێزاری، ئەگینا زیانی بۆ ئێوە دەبێ.

[18] نوێژمان بۆ بکەن، چونکە دڵنیاین لەپاکی ویژدانمانو دەمانەوێ لەهەموو شتێك هەڵسوکەوتمان چاك بێ، [19] هەروەها زۆر بەپەرۆشەوە داواتان لێدەکەم نوێژم بۆ بکەن لای خودا، هەتا بەخێرایی بگەڕێمەوە

لاتان.[20] داوا لەخودای ئاشتی دەکەم، ئەوەی بەهۆی خوێنی پەیمانی هەتاهەتایی، عیسای مەسیحی خوداوەندمان، کە شوانێکی مەزنە بۆ مەڕەکان، لەنێو مردووان زیندووی‌کردەوە، [21] تا هەموو شتێکی باشتان پێ‌ببەخشێ، تا بەخواستی ئەو کار بکەن‌و لەئێوە کار بکات بەڕەزامەندی ئەو بەهۆی عیسای مەسیح، بۆ ئەوە شکۆمەندی تاهەتایە. ئامین.

**سڵاوی کۆتایی**

[22] ئەی برایان داواتان لێ‌ دەکەم، بەسنگ فراوانیەوە وەری‌بگرن ئەو ووتە هاندانانەی لەم نامە کورتەدا بۆم نووسیون.
[23] هەروەها دەمەوێ پێتان ڕاگەیێنم تیمۆساوسی برامان لەبەندیخانە ئازادکراوە، هەر کاتێ هات بۆ لام دەمانەوێ بەیەکەوە دیدەنیتان بکەین.
[24] سڵاو لەهەموو ڕابەرەکانتان‌و خوشك‌و برا پیرۆزەکانتان بکەن. باوەڕدارانی ئیتالیا سڵاوتان لێ‌دەکەن.
[25] لەکۆتاییدا بابەرەکەتی خودا لەگەڵتان بێت.

*نامەکـەی یـاقوب کۆمەڵــە ئامۆژگاریـیەکە ئاڕاسـتەی هەموو گەلی خودا کـراوە کـە پەرش‌وبڵاوببوونەوە لـەجیهان. مەبەستی هاندانیانە بۆ بەرگەگرتنی ناخۆشـیو چەسـپان لـەباوەڕ. نووسـەر سەبارەت بەزۆر لایەنی چاکی باوەڕ بەمەسـیح دەدوێو داوایـان لـێدەکات پەیـڕەوی بکـەن لەهەڵسـوکەوتیان، وەکـو: دوورکەوتـنەوە لەپارەپەرسـتیو لووتبەرزیو زمان پاراستن لەقسەی خـراپو نـەخواردنی بەشـی هـەژاران. پێویستیشـە لەسـەر بـاوەڕداران ئـارامبگـرنو نوێژبکـەنو داناییان هەبێ. بەڵام نامەکە بەزۆری باسی باوەڕی ڕاستەقینە دەکات کە دەبێ بەکرداری چاکەوە بەند بێ.*

# 1

لــەیاقوبی بـەندەی خـوداو عیسـای مەسـیحی خوداوەنـدەوە، بـۆ دوانزە هۆزەکـەی نـەوەی ئیسـرائیل کـە پــەرش‌و بڵاوبوونەتــەوە، ســڵاوتان لـیٚبێت.

**تـاقیکردنەوە لەدەرەوە**

[2]ئـەی بـرایان بەخۆشـی دابنـێن، کـاتێ دەکەونە جۆرەها تاقیکردنەوەو ناخۆشـی، [3]چـونکە ئـێوە دەزانـن تاقـیکردنەوەی باوەڕتان ئارامگرتنتان تـیا دروسـت دەکات. [4]با ئارامگرتن بەتـەواوی کاری خۆی تیاتان بکات، تـا لــەهــەموو ڕوویــەك تـەواو و پێگەیشـــتووبن، لەهـــیچ شـــتێك کـەموکوڕیـتان نەبێت. [5]گەر یەکێك لەناوتان کەموکوڕی لەدانایی هەبوو، بـا داوا لـەخودا بکات، چونکە خودا بەدەســتو دڵفــراوانی بــەهــەموو کەسێکی دەداتو گلەییش ناکات. [6]بـەڵام با بەباوەڕ داوای بکاتو هیچ گومـانی تـیادا نەبێت، چونکە ئەوەی گومـان دەکات وەك شەپۆلـی دەریا وایـە بـا دەیهێنێـتو دەیبات. [7]ئـەو جـۆرە مـرۆڤە نـابێ بیر لـەوە بکاتەوە شتێك لەخوداوەند بەدەستدەهێنێ، [8]چـونکە ئەو مرۆڤە ڕاڕایە، لەهەموو ڕێگاکانی دوو دڵە.

[9]بابــرای پایـەنـزم شــانازی بــە بەرزیەکــەی بکـــات، [10]هـەروەها دەوڵـەمــەند بەنزمیەکەی، چونکە دەوڵـەمــەند وەك گوڵـی گژوگـیا لەناودەچێ. [11]کـاتێ ڕۆژ بەتیشکی

گەرمی هەڵهات، ئەو گژوگیایە ووشك دەكاتو گوڵەكەی هەڵدەوەرێ، دیمەنی جوانی نامێنێت، ئاوا مرۆڤی دەوڵەمەند لەناودەچێت كاتێ خۆی ماندوو دەكات بەكارەكانیەوە.

**تاقیکردنەوە لەژوورەوە**

[12]خۆزگە دەخوازرێ بەوەی بەرگە دەگرێ لەكاتی تاقیكردنەوە، چونكە كاتێ لەو تاقیكردنەوەیە دەردەچێ تاجی ژیان وەردەگرێ، ئەوەی خودا بەڵێنی داوە بیدات بەوانەی خۆشیان دەوێت. [13]با كەس نەڵێت كاتێ دەكەوێتە تاقیكردنەوە، (من لەلایەن خوداوە تاقی دەكرێمەوە.) چونكە خودا بە خراپە تاقیناكرێتەوە ئەویش كەس بە خراپە تاقیناكاتەوە، [14]بەڵام هەموو كەسێك تاقیدەكرێتەوە گەر ئارەزووە خراپەكانی خۆی هەڵیخەڵەتاندو رایكێشا. [15]ئینجا گەر ئارەزوو سكیپڕ بوو، ئەوا گوناهی لێ دەبێت، ئەگەر گوناهیش گەشەی كرد ئەوا مردنی لێ دێتەكایەوە.
[16]برایانی خۆشەویستم هەڵمەخەڵەتێن، [17]هەموو پێدراوێكی چاكو بەهرەیەكی تەواو لەسەرەوە دێت، لای باوكی ڕووناكی دێتەخوارەوە، ئەوەی ناگۆڕێو سێبەرو خولانەوەی نییە. [18]ئێمە بەخواستی ووشەی ڕاستی لەدایك بووین، تاببینە نۆبەرەی دروستكراوانی.

**گوێ بگرنو کاری پێبکەن**

[19]ئەمە بزانن ئەی برایانی خۆشەویست: با هەر یەكێكتان لەگوێگرتن خێرا بێت، پەلە نەكات لەقسەكردن، هێواش بێت لەتووڕەبوون. [20]چونكە تووڕەیی مرۆڤ كار بۆ ڕاستودروستی خودا ناكات. [21]كەواتە واز لەهەموو پیسیو زۆری بەدكاری بهێنن، ئەو ووشەیەی خودا تیاتان چاندوویەتی بەڕۆح سووكیەوە وەریبگرن، ئەوەی دەتوانێ گیانتان ڕزگار بكات. [22]تەنها گوێگری ووشەكان مەبن، بەڵكو كاری پێ بكەن، ئەگینا خۆتان هەڵدەخەڵەتێنن. [23]چونكە ئەوەی گوێ لەووشەی خودا بگرێو كاری پێ نەكات، وەك یەكێك وایە سەیری ڕوخساری خۆی بكات لەئاوێنە، [24]ئینجا دوای ئەوەی سەیری خۆی

دەکاتو دەڕوات، یەکسەر لەبیری دەچێت چۆن بووە. [25]بەڵام ئەوەی بەووردی سەیری شەریعەتی تەواو بکات، شەریعەتی سەربەستی، لەسەری بەردەوام بێتو ئەوەی بیستوویەتی بیری نەچێت بەڵکو کاری پێبکات، ئەوا ئەو کەسە خۆزگەی پێدەخوازرێت.

[26]ئەوەی خۆی بەدیندار دابنێو زمانی خۆشی نەپارێزێت، ئەوە خۆی هەڵدەخەڵەتێنێتو دینداریەکەی بێسوودە. [27]دینداری پاکو بێگەرد لای خودای باوکمان ئەمەیە: مرۆڤ هەتیوانو بێوەژنان بەسەر بکاتەوە لەکاتی تەنگانەیان، هەروەها خۆی بەپاکی بپارێزێت سەبارەت بەجیهان.

## بەجیاوازی هەڵسوکەوت مەکەن

## 2

برایانی خۆشەویست، گەر بەڕاستی باوەڕتان بەخوداوەند عیسای مەسیح هەیە، گەورەی شکۆمەندی، لەگەڵ خەڵکی بەجیاوازی هەڵسوکەوت مەکەن. [2]گەر دەوڵەمەندێك هاتە ناوتان ئەنگوستیلەی زێڕی لەپەنجە بوو، بەرگی نایابی لەبەر بوو، هەروەها هەژارێك هاتە ناوتانو بەرگی پیسو کۆنی لەبەر بوو. [3]پێشوازیتان لەدەوڵەمەندەکە کردو پێتان ووت: (فەرموو، لەپێشەوە دانیشە)، ئینجا بەهەژارەکەتان ووت: (تۆش لەوێ ڕاوەستە، یان لێرە دانیشە لەبەر پێمان)، [4]ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئێوە جیاوازی یەکێك لەگەڵ ئەوی دیکە دەکەنو بەبیری خراپ خۆتان دەکەن بەدادوەر؟

[5]گوێ بگرن ئەی برایانی خۆشەویست: ئایا خودا هەژارانی ئەم جیهانەی هەڵنەبژاردووە تا دەوڵەمەندبن لەباوەڕو ببن بەمیراتگری پادشاهێتی، ئەوەی خودا بەڵێنیداوە بیدات بەوانەی خۆشیاندەوێ؟ [6]ئێوە بەسووکی سەیری هەژاران دەکەن. ئایا دەوڵەمەندەکان نین لەگەڵتان زۆردارنو ڕاتاندەکێشن بۆ دادگاکان؟ [7]ئایا ئەوان نین گاڵتە بەناوی چاکی [مەسیح] دەکەن، ئەوەی پێی بانگکراون؟

[8]گەر ئێوە بەتەواوی کار بەشەریعەتی شاهانە بکەن بەپێی کتێبی پیرۆز کە دەڵێ: { ئەوەی لێت نزیکە وەك خۆت خۆشت بوێ}، ئەوا شتێکی چاك دەکەن. [9]بەڵام گەر

بەجیاوازی هەڵسوکەوتتان لەگەڵ خەڵك کرد، ئەوا گوناه دەکەنو شەریعەت تاوانبارتان دەکات وەك سەرپێچی‌کەر. [10] ئەوەی بەهەموو ڕاسپاردەکانی شەریعەت کار بکات، بەلاّم تەنها یەك ڕاسپاردەیان بشکێنێت بەوە هەڵەی لەهەمووداکردووە، [11] چونکە ئەوەی ووتویەتی: {داوێن پیسی مەکە} هەر ئەوە ووتویەتی: {مەکوژە}. گەر داوێنý پیسیت نەکرد بەلاّم یەکێکت کوشت، ئەوا سەرپێچی شەریعەتت‌کردووە. [12] بدوێنو کار بکەن وەك ئەو کەسانەی بەپێی شەریعەتی سەربەستی حوکمیان بەسەر دەدریێ. [13] چونکە حوکمدان بێ‌بەزەییانە دەبێت بۆ ئەوانەی بەزەییان نەبووە. بەزەییش بەسەر حوکمدان سەردەکەویێ.

**باوەڕو کردار**

[14] ئەی برایان چسوودێکی هەیە گەر یەکێك بڵێ باوەڕم هەیە، بەلاّم کرداری لەگەڵ نەبێت؟ ئایا ئەم جۆرە باوەڕە ڕزگاری دەکات؟ [15] گەر خوشكو برایەك پێویستیان بە جلوبەرگو خواردنی ڕۆژانە هەبوو، [16] یەکێکتان پێیان ووتن: (بەخێر بچن، جلی گەرم لەبەر بکەن، تێر بخۆن.) ئەمە چ سوودێکی هەیە گەر تۆ ئەوەی پێویستیان پێیەتی بۆ لەش نەیاندەیتیێ؟ [17] بەم شێوەیە دەبینین باوەڕ لەخۆیدا بەتەنها مردووە، گەر کرداری لەگەڵ نەبێت. [18] لەوانەیە یەکێکتان بڵێ: (تۆ باوەڕت هەیەو من ýکردار.) نیشانمýبدە باوەڕت چۆن بێ کردار دەبێت، ئەوسا منیش بەکردارەکانم نیشانت دەدەم باوەڕم چۆنە. [19] تۆ باوەڕت هەیە یەك خودا هەیە، شتێکی چاك دەکەیت. ڕۆحە پیسەکانیش باوەڕیان بەمە هەیەو دەلەرزن لەترسان.

[20] ئەی مرۆڤی گێل، پێویست بەسەلماندن دەکات کە باوەڕ بێ کردار بێ‌سوودە؟ [21] سەیری ئیبراهیمی باوکمان بکە، ئایا بەکردارەکەی نەبوو خودا بێ‌تاوانی کرد، کاتێ ئیسحاقی کوڕی پێشکەشýکرد لەسەر قوربانگا؟ [22] تۆ دەبینیت باوەڕەکەی بەکردارەوە چالاکە، هەروەها باوەڕەکەی بەکردارەوە تەواو بووە، [23] بەمە ووتەی کتێبی پیرۆز هاتەدی کە دەڵێ: {ئیبراهیم باوەڕی بەخودا هێنا،

ئەمەش بەڕاستودروستی بۆی دانرا} ، هەروەها ناویان نا دۆستی خودا. [24] دەبینین مرۆڤ تەنها بەباوەڕی بێتاوان نابێت بەڵکو بەکردارەکانیشی. [25] ئایا ڕاحابی داوێنپیس بەم شێوەیە بێتاوان نەبوو، چونکە پێشوازی لەنێرراوان کردو لەڕێگایەکی ترەوە دەربازی کردن؟ [26] چۆن لەشی مرۆڤ ڕۆحی تیا نەمێنێت دەمرێت، هەروەها باوەڕ گەر کرداری لەگەڵ نەبێت دەمرێت.

## خراپی زمان
## 3

ئەی برایان، زۆربەتان خۆتان مەکەن بەفێرکەر، دەزانن ئێمە لێپرسینەوەی مەزنترمان هەیە. [2] چونکە ئێمە هەمووومان لەزۆر شت هەڵە دەکەین، گەر یەکێك بتوانێ لەقسەکردن هەڵە نەکات، ئەوە مرۆڤێکی تەواوەو بەسەر هەموو لەشی زاڵبووە. [3] ئێمە لەغاو دەکەینە دەمی ئەسپ تا گوێڕایەڵمان بێتو بتوانین هەموو لەشی ئاراستە بکەین. [4] هەروەها سەیری کەشتی بکەن، هەرچەندە گەورەیەو ڕەشەبای بەهێز پاڵی پێوە دەنێت، کەچی کەشتیوان بەسەوڵێکی بچووك پێچی پێ دەکاتەوەو دەیبات بەهەر لایەك بیەوێت. [5] هەروەها زمانیش ئەندامێکی بچووکە، بەڵام زۆر لەخۆبایە. سەیرکەن ئاگرێکی بچووکە دارستانێکی گەورە دەسووتێنێت. [6] زمان وەك ئاگر وایە، جیهانێکە لەخراپە، زمان ئەو ئەندامەیە هەموو لەش پیس دەکاتو ئاگر لەچواردەوری سروشت هەڵدەگیرسێنێت بەگرێك لەدۆزەخەوەیە. [7] مرۆڤ دەتوانێ بەسەر ئاژەڵی کێویو باڵندەو خشۆكو بوونەوەری ئاوی زاڵ بێت، [8] بەڵام کەس ناتوانێت بەسەر زمان زاڵ بێت. خراپەیەکە ناگیرێت پڕە لەژەهری کوشندە.

[9] بەزمان خوداوەندو باوکمان پیرۆز دەکەین، بەئەویش نەفرەت لەخەڵکی دەکەین کە لەشێوەی خودا دروست کراون. [10] لەیەك دەم پیرۆزیو نەفرەت دێتە دەرەوە، ئەمەش نابێ بەم شێوەیە بێت ئەی برایان. [11] ئایا بیستووتانە لەیەك کانی ئاوی شیرینو سوێر هەڵبقوڵێت؟ [12] یاخود دەبێت دار هەنجیر زەیتون بگرێت، یان مێو هەنجیر بگرێت؟ ئەی

برایان بەم شێوەیەش کانی سوێر ئاوی شیرینی لــێ نایەتە دەرەوە.

**دانایی خودایی**

[13]ئـــەوەی لـــەناوتان دانـــاو تێگەیشـتووە، بـا دەریـبخات بەژیانی باشـیو کـردارەکانی لەڕۆحسووکی دانـایی. [14]بـەلاَم گەر چاوپیسی تاڵو خواسـتی خۆویسـتیتان لـەدڵ بـوو، شـانازی مەکـەنو درۆ سـەبارەت بەڕاسـتی مەکـەن. [15]دانـایی ئـاوا هەرگـیز لـەخوداوە نیـیە، بـەڵکو لـــەجـــیهانەو ڕۆحـــی نیـــیەو لەشـەیتانەوەیە. [16]چـونکە لـەکوێ چاوپیسـیو خۆویستی هەبوو، لەوێ پەشـۆکاویو هەموو جۆرە خراپەیەك بلاَودەبێـتەوە. [17]بـەلاَم ئـەو داناییەی لەسـەرەوە ﴿لەلای خوداوە﴾ دێت لەپـێش هـەموو شـتێك پاكـە، ئاشـتیخوازو ساکارە، گوێڕایەڵە، پڕ لـەبـەزەییو بـەرووبوومی چـاکە، ڕاسـتو ڕێـكو ڕەوانـە، دووڕوویی تـێدا نیـیە. [18]هـەروەها بەرووبوومی ڕاســـتودروســـتی لەلایـــەن ئاشتیخوازان لەئاشتیدا دەچێنرێت.

**ملکەچی خودا بن**

# 4

هۆی ئەم دوژمنایەتیو ناکۆکییە چییە لــەناوتان؟ ئایـا بـەهۆی ئـارەزووە خـراپەکانی ئەندامانی لەشتان نییە کە دەجەنگێـت لەگەڵـتان؟ [2]ئـارەزوو دەکـەنو دەسـتتان ناکـەوێ ئەوسـا دەکـوژن. چـاوتان لـەماڵی خەڵکەو ناگەنـە مەبەسـتی خۆتـان، ئەوسـا دوژمـنایەتیو شـەڕ دەکـەن. ئـەوەی دەتانەوێ دەستتان ناکەوێت، چونکە لـــەخـــودا داوا ناکـــەن. [3]گـــەر داواشـتانکـرد وەری‌ناگرن، چونکە بـەمەبەستی خراپ داوای دەکەن، تا ئارەزووەکانی خۆتانی پێ تێر بکەن.

[4]ئـەی داوێـنپیسـان، ئایـا نازانن خۆشەویسـتی جـیهان دوژمنایەتیـیە لەگـەڵ خـودا؟ ئـەوەی بیەوێ ببێت بـەخۆشەویستی جیهان، ئەوە بووە بە دوژمـنی خـودا. [5]ئایـا ئەوەی کتێبی پـیرۆز ووتویـەتی ڕاسـت نیـیە کـە دەڵێـت خـودا دڵگەرمـە بـۆ ئـەو ڕۆحـەی تـیاماندایە؟ [6]بـەلاَم خـودا بەرەکـەتی زۆرتـر دەدات بۆیە کتێب دەڵێـــت: {خـــودا بەرهەڵســـتی لووتـبەرزەکان دەکـاتو بەرەکـەتی بەسەر ڕۆحسووکان دەبارێنێ.}

[7]جا ملکەچی خودا بنو بەرهەڵستی شەیتان بکەن تا لێتان هەڵبێت. [8]نزیكبنەوە لەخودا ئەویش لێتان نزیك دەبێتەوە. دەستتان پاك بکەنەوە ئەی گوناهباران، دڵتان خاوێن بکەنەوە ئەی ڕاڕایەکان. [9]خەفەت بخۆنو بگرینو شیوەن بکەن، تا پێکەنینتان ببێت بەگریانو خۆشیتان ببێت بەناخۆشی. [10]لەبەردەم خوداوەند خۆتان بەنزم ڕاگرن ئەوسا خودا بەرزتان دەکاتەوە.

[11]ئەی برایان با کەستان بەخراپە باسی ئەوی دیکەتان نەکات، چونکە ئەوەی بەخراپە باسی براکەی بکات یاخود حوکمی بەسەر بدات ئەوا بەخراپە باسی شەریعەت دەکاتو حوکمی بەسەر دەدات. گەر تۆ حوکم بەسەر شەریعەت بدەیت، ئەوا تۆ کاری پێ ناکەیت بەڵکو خۆت دەکەیت بەدادوەر بەسەریەوە. [12]لەکاتێك یەك شەریعەتدانەرو یەك دادوەر هەیە، ئەوەی دەتوانێت حوکمی ڕزگاربوونو لەناوچوون بدات. بەڵام تۆ کێی تا حوکم بەسەر نزیکەکەت بدەیت؟

### پشتبەستن بەخودا

[13]ئێستا گوێبگرن، ئەی ئەوانەی کە دەڵێن: (ئەمڕۆ یان بەیانی دەڕۆین بۆ فلاَن شار لەوێ ساڵێك دەمێنینەوە، کاسبی دەکەینو پارە پەیدا دەکەین.) [14]ئێوە کە نازانن بەیانی چی ڕوودەدات، کەواتە ژیانتان چییە؟ هەڵمێکە ماوەیەکی کەم دەردەکەوێت دوایی نامێنێت. [15]لەجیاتی ئەوە پێویستە بڵێن: (گەر خوداوەند خواستی لەسەر بوو و ژیاین، ئەم کارەو ئەوی دیکە دەکەین.) [16]ئەگینا ئێوە بە لووتبەرزییەوە شانازی دەکەن، ئەم جۆرە شانازیەش خراپەیە. [17]بۆیە هەر کەسێك بزانێت چاکە بکاتو لەگەڵ ئەوەشدا نەیکات ئەوە گوناه دەکات.

### ئاگادارکردنەوەی دەوڵەمەندەکان

## 5

ئێستا گوێبگرن، ئەی دەوڵەمەندەکان بگرینو شیوەن بکەن بۆ ئەو نەگبەتیەی بەسەرتان دێت. [2]سامانەکەتان گەندەڵ بووە، بەرگە نایابەکانتان مۆرانە لێیداوە، [3]زێڕو زیوتان ژەنگ

لــێیداوە، ژەنگەکەشــیان دەبێــت بەشــایەت بەســەرتانو وەك ئاگــر گۆشــتتان دەخــوات، ئەمــەش ئــەو ســامانەیە کۆتــان کــردۆتەوە بــۆ ڕۆژانــی دوایــی. [4]ئــەوەتا کــرێی ئەو کــرێکارانەی کاریــان کــردووە لــە کــێڵگەکەتانو نــەتانداوە، هــاوار دەکــاتو شــکاتتان لێ دەکــات. وا هــاواری دروێنەکەران گەیشتە گوێی خوداوەنــدی دەســەڵاتدار. [5]لەســەر زەوی بــەنازو نــیعمەتو خۆشــی ژیــاون، خۆتــان تــێرکــردووە وەك بەرخــێکی قەڵەو بۆ ڕۆژی سەربڕین. [6]حوکمــتان بەســەر بــێتــاوانداوەو کوشــتووتانە، ئــەویش بەرهەڵستیتان ناکات.

**دانبەخۆگرتن لەئازار**

[7]بۆیە ئەی برایان دانبەخۆتانبگرن تــا هاتــنەوەی خوداوەند. سەیر بکەن چــۆن جوتــیار چــاوەڕێی زەویەکــەی دەکــات بــەرووبوومی چاکی بداتیّ دانبــەخۆیدا دەگرێ بۆ بارانی پایزو بــەهار. [8]ئــێوەش بەهــەمان شــێوە دانــبەخۆتان بگــرنو وورەتــان بــەرز بکەنەوە، چونکە هاتنەوەی خوداوەند نــزیك بووەتەوە. [9]ئەی برایان شکات لەیــەکتری مەکــەن، تــا حوکمــتان بەســەر نەدرێــت، ئــەوەتا دادوەر لەبەردەرگا وەستاوە.

[10]بــرایان، نموونــە وەرگــرن لــەدانــبەخۆ گرتــنی ئــەو پێغەمبەرانە لــەکاتی ئــازار کە بەناوی خوداوەند دواون [11]خۆزگەدەخوازرێ بەوانەی دانبــەخۆیان دەگرن، دانبەخۆگرتنی ئەیوبــتان بیســتووەو دەزانــن چــۆن خــوداوەنــد پاداشــتیدایەوە، چونکە خوداوەند دڵنەرمیو بەزیی زۆرە.

[12]بــرایان، لەپــێش هەموو شتێك ســوێند مــەخۆن، نــە بــەئاسمانو نــە بــەزەویو نــە بەشتی دیکە. بەڵکو با قســەتان بــە بەڵێ بێت گەر وابوو، بە نەخــێر بێــت گــەر وانــەبوو، ئەگــینا تاوانبار دەکرێن.

**نوێژ بەباوەڕەوە**

[13]گــەر لــەناوتان یەکــێك هەیە لــەناخۆشــی بێــت؟ بــا نوێــژ بکات. گــەر لــەناوتان یەکــێك هــەیــە لــەخــۆشــی بێــت؟ بــا بەگــۆرانی ستایشــی خــودا بکــات. [14]گــەر لــەناوتان یەکێك هەیە نەخۆش بێت؟ بــا پیرانــی کــۆمــەڵی بــاوەڕداران بــانگ بکات نوێژی لەسەر بکەنو

بەناوی خوداوەندەوە چەوری بکەن! [15]ئەو نوێژەی بەباوەڕ دەکرێت نەخۆش چاك دەکاتەوەو خوداوەند هەڵیدەسێنێتەوە، گەر گوناهێکی کردبێت خودا لێی‌خۆش دەبێت. [16]لای یەکتری دان بەگوناهەکانتان بنێن، نوێژ بکەن بۆ یەکتری تا چاكبنەوە، نوێژی گەرمی مرۆڤی ڕاست‌ودروست زۆر کاریگەرە.

[17]ئەلیاس مرۆڤێك بوو وەك ئێمە، بەگەرمی نوێژی‌کرد تا باران نەبارێت، ئیتر بۆ ماوەی سێ ساڵو نیو باران نەباری لەسەر زەوی. [18]ئینجا جارێکی دیکە نوێژی کردەوە، ئیتر باران باری‌و زەوی هاتەبەر.

[19]ئەی برایان، گەر یەکێکتان ڕێگای ڕاستی ونکردو یەکێکی دیکەتان گەڕاندیەوە، [20]ئەوا بزانن ئەوەی گوناهبارێك بگەڕێنێتەوە لەڕێگای گومرایی، دەرونێك لەمردن ڕزگار دەکات‌و زۆر گوناهیش دەشارێتەوە.

# یەکەم نامە پەترۆس

*پەترۆس نامەی یەکەمی بۆ ئەو باوەڕدارانە نارد، ئەوانەی بەگەلی خودا ناویان دەبات کە لەباکوری ئاسیای بچووك (تورکیای ئێستا) پەرش‌و بڵاوبووبوونەوە. مەبەستی سەرەکی ئەم نامەیە هاندانە بۆ بەرگە گرتنی چەوساندنەوەو ئازاردان لەپێناوی باوەڕەکەیان.*

*بۆ گەیشتن بەم مەبەستە نووسەر مزگێنی عیسای مەسیح بەبیر خوێنەرانی دەهێنێتەوە، ئەوەی بەمردن‌و هەستانەوەو هاتنەوەی هیوای بۆ جیهان هێنا. بۆیە لەسەریانە هەموو چەوساندنەوەیەك وەربگرن‌و بڕوا بکەن ئەوە تاقیکردنەوەی ڕاستی باوەڕیانە، لەسەر ئەمەش پاداشت وەردەگرن ڕۆژی دەرکەوتنی عیسا.*

## 1

[1] لەپەترۆس، نێرراوی عیسای مەسیح، بۆ نامۆکان‌و دەربەدەرەکان لەپۆنتس‌و غەلاتیەو کەپدۆکیەو ئاسیاو بیسینیە، [2] ئەوانەی هەڵبژێرراون بەگوێرەی زانینی پێشووی خودای باوك‌و بەڕۆحی خۆی پاك‌وپیرۆزی کردن بۆ گوێڕایەڵی‌و پڕژاندنی خوێنی عیسای مەسیح بەسەریان. بەرەکەت‌و ئاشتیتان بەسەردا بڕژێ.

### ستایشی خوا بۆ هیوای زیندوو

[3] پیرۆزە خودا باوکی خوداوەندمان عیسای مەسیح! کە لەسایەی بەزەییە مەزنەکەی ئەو ئێمە سەر لەنوێ لەدایك بووینەوە بۆ هیوایەکی زیندوو بەهەستانەوەی عیسای مەسیح لەنێو مردووان، [4] بۆ میراتێك بنبڕ نابێ‌و گڵاو نابێ‌و کۆتایی بۆ نییەو بۆ ئێوە لەئاسمان هەڵگیراوە، [5] ئێوە بەهێزی خودا پارێزراون بەباوەڕ، بۆ ئەو ڕزگارییەی ئامادەیە لەکۆتایی زەمانە ڕابگەینرێ. [6] ئەوەی پێی دڵخۆش دەبن، هەرچەندە بۆ ماوەیەکی کەم ئازار دەچێژن بەدەست تاقیکردنەوە جۆراوجۆرەکان، [7] تا ڕاستی باوەڕتان دەرکەوێ، کە لەزێڕی لەناوچوو بەنرخترەو بەئاگر تاقی دەکرێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی شکۆمەندی‌و ستایش‌و ڕێز لەکاتی ڕاگەیاندنی عیسای مەسیح. [8] ئەوەی نەتانبینیوە خۆشتان دەوێ، هەرچەندە ئەوەی

ئێستا نایبینن باوەڕی پێدەکەنو دڵخۆش دەبن بەشێوەیەك زمان ناتوانێ باسی بکات، خۆشییەکی مەزن، [9]چونکە لەئەنجامی باوەڕتان ڕزگاری دەروونتان بەدەست دەهێنن.

[10]ئەو ڕزگارییەی پێغەمبەران بەدوایدا دەگەڕانو پێشبینیان دەکرد سەبارەت بەو بەرەکەتەی بۆ ئێوەیە، [11]دەگەڕان چ بارودۆخێك یاچ کاتێك بوو ڕۆحی مەسیح دیاری کردووە لای ئەوان، کاتێ لەزووەوە باسی ئەو ئازارانەی مەسیحیان کردووە کە دەیچێژێو ئەو شکۆمەندیەی دوای دێت.[12]ئەوانە خودا بۆی ئاشکراکردن خزمەتی خۆیان نەدەکرد، بەڵکو خزمەتی ئێوەیان دەکرد، کاتێ دەربارەی ئەو شتانە قسەیان کرد کە ئێستا پێتان ڕاگەێنرا لەلایەن ئەوانەی مزگێنی ڕادەگەێنن بەڕۆحی پیرۆز، ئەوەی لەئاسمانەوە نێرراوە، فریشتەکانیش بە پەرۆشن بۆ بینینی.

**بانگەواز بۆ پاکو پیرۆزی**

[13]بۆیە بامێشکتان لەئامادەباشی بێت، ووریا بنو هیوای خۆتان بەتەواوی لەسەر ئەو بەرەکەتە دابنێن کە لەڕاگەیاندنی عیسای مەسیحەوە دێت. [14]وەك منداڵی گوێڕایەڵ بن، بەدوای ئارەزووە کۆنەکانتان مەکەون وەك کاتی نەزانیتان، [15]بەڵکو چۆن ئەوەی بانگی کردوون پاكوپیرۆزە، ئێوەش پاكو پیرۆز بن لەهەموو هەڵسوکەوتێك، [16]چونکە لەکتێبی پیرۆز نووسراوە: {پاكوپیرۆز بن، چونکە من پاكوپیرۆزم.} [17]ئەگەر بەباوك بانگی بکەن، ئەوەی بەبێ لایەنگیری حوکم دەدات، هەر کەسێك بەگوێرەی کردەوەکانی، کەواتە بەترسەوە بژین لەسەردەمی نامۆییتان. [18]ئێوەش دەزانن چۆن کڕانەوە لەو ڕێبازە پووچانەی لەباوكو باپیرانتان بۆتان مابووەوە. ئەو کڕینەوەیەش بەشتی لەناوچوو نەبوو وەك زێڕو زیو، [19]بەڵکو بەخوێنێکی گرانبەها هەروەك لەبەرخێکی بێکەموکوڕ، کە خوێنی مەسیحە. [20]لەپێش دروستکردنی جیهان هەڵبژێررابوو، بەلاّم لەم سەردەمانەی دوایی دەرکەوت کە لەپێناوی ئێوەدا بوو. [21]ئەوەی بەهۆیەوە باوەڕتان بەخودا کرد، ئەوەی لەنێو مردووان زیندووی

کـردەوەو شکۆمەندی پێبەخشی، تا هیواو باوەڕتان لەخوداوە بێ.

[22]دەروونـتان پـاك بکەنـەوە بەگوێڕایەڵیـتان بـۆ ڕاسـتیو بـۆ خۆشەویستیەکی ڕاستەقینەی برایانە، بەپەرۆشـەوە یەکتریـتان خـۆش بوێ لەدڵـەوە. [23]ئـێوە سـەر لـەنوێ لـەدایكبوونـەوە، نـەك بـەتۆوێکی لەناوچـوو، بـەڵکو بـەتۆوێکی نەمر، بەووشەی چەسپاو و زیندووی خودا. [24]چـونکە لەکتێبی پیرۆز نووسراوە: {هـەموو مرۆڤێك وەك گژوگیا وایەو هـەموو شـکۆمەندیەکەی وەك گوڵی بـاخ وایـە. گژوگـیا ووشـك دەبێو گـوڵ هـەڵدەوەرێ، [25]بەڵام ووشەی خوداوەنـد تاهەتایـە دەمێنێ.} ئەوەش ئەو ووشەیەیە کە مزگێنیتان پێدرا.

## بەردی زیندوو

# 2

کەواتـە خۆتـان لەهـەموو ڕقوکینەو فێڵـبازیو دووڕوویـیو چاوپیسـیو بوختانـێك دوور بکەنـەوە. [2]هەروەك مـنداڵی سـاوای تـازە لـەدایك بـوو حەزتان لەشیری ڕۆحی پاكو بێگەرد بـێ، چـونکە بەمە گەورە دەبن بەرەو ڕزگـاری. [3]چـونکە تـامی چـاکی خوداوەندتان چێژتووە.

[4]ئـەوەی بـۆ لای دێن، بەردێکی زیـندووە لەلایـەن خـەڵك ڕەتکـراوەتەوە، بـەڵام لەلایەن خودا هەڵـبژێرراوەو گرانبەهایە، [5]هەروەها ئـێوەش وەك بـەردی زیـندووی بنـیادنراون لەخانوویـەکی ڕۆحی، تا بـبن بەکاهیـنی پـیرۆز، بـۆ پێشکەش کـردنی قوربـانی ڕۆحـی کـە جـێی ڕەزامـەندی خودا بێ بەهۆی عیسای مەسـیحەوە. [6]چـونکە لەکتێبی پیرۆز هاتووە: {ئەوا لەشاری داود بەردێك دادەنـێم، ئـەوەش بـەردی بـناغەیەو هەڵـبژێرراوەو گرانـبەهایە. ئـەوەی بـاوەڕی پێبهێنێ شەرمەزار نابێ.} [7]بۆیـە بۆ ئێوە کە باوەڕتان هێناوە ئەوە گرانبەهایە، بەڵام بۆ ئەوانەی باوەڕیان نەهێـناوە، {ئـەو بـەردەی وەسـتاکان ڕەتـیان کردەوە بوو بەبەردی بناغە،} [8]هـەروەها: {ئـەو بـەردەی دەبێـتە کۆسـپ بـۆ خـەڵکیو دەبێتە مایەی کەوتنـیان.} ئەوانـە سـاتمە دەکـەن، چـونکە ملکەچی ووشەی خودا نین، هەر بۆ ئەو چارەنووسەن.

[9]بـەڵام ئـێوە ڕەگـەزێکی هەڵـبژێرراون، کاهیـنی پادشـاهانەن، نەتەوەیـەکی پـیرۆزن، گـەلی تایـبەتی

خـــودان، تـــا کـــردەوە ســـەیرەکانی ڕابگەیـێنن ئـەوەی بانگی کردوون لـە تاریکـــــــیەوە بـــــۆ ڕووناکـــــــیە سەرسـوڕهێنەرەکەی. [10]ئـێوە لـەپێشا گـەل نـەبوون، بـەڵام ئێسـتا گـەلی خـــودان، ئـــێوە لـەپێشـــا بەزەییـــتان وەرنەگرت بوو، بەڵام ئێستا بەزەییتان وەرگرت.

[11]خۆشەویستان داواتان لێدەکەم وەك نــــــــامۆ و بــــــــێگانەیەك لــــــــەئارەزووەکانی لــــــــەش دووربکەونەوە، ئەوەی دژی دەروون دەجـەنگێ. [12]با ڕەوشتتان باش بێت لەنــێو بێبــاوەڕان، تــاکو ئەوانــەی بوختانــتان پێدەکــەنو وەك بــەدکار ناوتــان دەبەن، باستایشی خودا بکەن کــاتێ کــردەوە چــاکەکانتان ببیــنن لەڕۆژی بەسەرکردنەوە.

**ملکەچی بۆ دەسەڵاتداران**

[13]هــەروەها ملکەچــی گشــت دەزگایــەکی مـرۆڤانە بــن لـەپێـناوی خوداوەنـد، بـۆ پادشا وەك بەرزترین دەســــەڵات، [14]هـــــەروەها بـــۆ پارێـزگارەکان وەك نـیرراوی پادشا، ئەوانــەی سـزای بــەدکاران دەدەنو ستایشی چاکەکان دەکەن. [15]چونکە ئەوەیـە خواسـتی خودا، تا بەکردەوە باشـەکانتان نەزانی گێلەکان بێدەنگ بکــەن. [16]وەك مــرۆڤی سەربەســت بژین، بەڵام سەربەستی نەکەن بەپەردە بـۆ بـەدکاری، بـەڵکو وەك بـەندەی خــودا بژین. [17]ڕێز لـەخەڵکی بگرن، برایانــتان خــۆش بــووێ، لـــەخودا بترسن، ڕێز لـەپادشا بگرن.

**نموونەی ئازارەکانی مەسیح**

[18]ئــەی کۆیلــەکان، ملکەچــی گەورەکانــتان بــن بەهــەموو ڕێزەوە، نــەك تەنها بۆ ڕۆحسووكو باشەکان، بەڵکو بۆ توندوتیژەکانیش، [19]چونکە گــەر کەسێك خودا بکات بەشایەت بەســەر ژیانی خۆیو بەرگەی ئازاری زۆرداری بگــرێ، ئەمە بەرەکەتە. [20]کەواتــە گــەر هەڵــەتان کــردو لێتان دراو دانــتان بەخۆتان گرت، ئەمە چ شانازییەکە؟ بەڵام گەر کرداری چاك بکــەنو لەگــەڵ ئەمەش ئازار بچێژنو دان بــەخۆتان بگــرن، ئەمــە بەرەکەتە لــەلای خــوداوە [21]چــونکە بـۆ ئەمە بـــانگ کـــراون، لەبەرئـــەوەی مەسـیحیش ئـازاری چێژت لەپێناوی ئـێوەو نموونـەی بـۆ بەجێهێشـتن، تا بەدوای هەنگاوەکانی بکەون. [22]{ئەو

هیچ گوناهێکی نەکردبوو، فڕوفێڵ لەلێوەکانی نەهاتبوونە دەرەوە.} [23] کاتێ جنێوی پێدەدرا، بەجنێو وەڵامی نەدەدایەوە، یاخود ئازار دەدرا، هەڕەشەی نەدەکرد، بەڵکو دەیدایە دەست ئەوەی حوکمی دادپەروەرانەیە. [24] ئەو گوناهەکانی هەڵگرتین لە لەشی خۆی لەسەر دار، تا ئێمە بمرین سەبارەت بەگوناەو بۆ ڕاستودروستی بژین. بەهۆی برینەکانی ئەو چاکبوونەوە. [25] چونکە ئێوە وونببوون وەك مەڕ، بەڵام ئێستا گەڕانەوە لای شوانو شوانیش چاودێری گیانتان دەکات.

### گوێڕایەڵی ناو ماڵ

## 3

هەروەها ئێوەش ئەی ژنەکان گوێڕایەڵی مێردەکانتان بن، گەر هاتوو هەندێکیان گوێڕایەڵی ووشەی خودا نەبوون، ئەوا ژنەکانیان دەتوانن بیانهێنن بۆ باوەڕ تەنها بەڕەوشتیانو بەبێ ووشە، [2] کاتێ ئەوان ترسو ڕێزو ڕەوشتی پاکتان ببینن. [3] هەروەها جوانیتان باجوانی دەرەکی نەبێت وەك ئەگریجەی قژو زێڕ بەخۆوەکردنو جلی باش لەبەرکردن، [4] بەڵکو با جوانیتان لەناو دڵتان شاراوە بێ، گەوهەرێکی لەناونەچوو، ڕۆحێکی نیانو ئارام، ئەوەی لای خودا زۆر گرانبەهایە. [5] بەم شێوەیە ژنە پیرۆزەکان لەکۆنا خۆیان بەوە جوان دەکرد، پشتیان بەخودا بەستبوو، گوێڕایەڵی مێردەکانیان بوون، [6] وەك چۆن سارە گوێڕایەڵی ئیبراهیم بوو، بەگەورە بانگیدەکرد. ئێوەش ئێستا کچی ئەون گەر کردەوەتان باش بێتو هیچ شتێك نەتانترسێنێ.

[7] ئێوەش ئەی مێردەکان بەشێوەیەك بژین هەستی ژنەکانتان لەبەرچاو بگرن، ڕێزیان بگرن، وەك ڕەگەزێکی لاوازتر بەشداریتان دەکەن لەمیراتی بەرەکەتی ژیان، تاکو نوێژەکانتان کۆسپی تێنەکەوێت.

### بەرگەگرتنی ئازار لە پێناوی ڕاستی

[8] لەکۆتاییدا، با هەمووتان یەك بیروڕاتان هەبێ، یەك هەستو خۆشەویستی برایانەتان هەبێ، [9] بەزەییدارو ڕۆح سووك بن. وەڵامی خراپە بەخراپە مەدەنەوە، هەروەها جنێو بەجنێو، بەڵکو

بەپێچەوانەوە داوای پیرۆزی بکەن‌و بزانن ئێوە بۆ ئەمە بانگ کراون، تاکو ببن بەمیراتگری پیرۆزی. [10] چونکە {ئەوەی بیەوێ خۆشەویستی ژیان‌و ڕۆژانی باش ببینێ، با زمانی لەخراپەو لێوەکانی لەفێڵبازی بپارێزێ، [11] با واز لەخراپە بهێنێت‌و چاکە بکات، با بەدوای ئاشتیدا بگەڕێ‌و هەوڵی بۆ بدات. [12] چونکە چاوەکانی خوداوەند لەسەر ڕاست‌ودروستانەو گوێی بۆ نوێژەکانیان ڕاگرتووە. بەڵام ڕووی خۆی وەرگێڕاوە لەبەدکاران.}

[13] کەواتە کێ ئازارتان دەدات گەر ئێوە دڵگەرم بوون بۆ چاکە؟ [14] بەڵام گەر ئازارتان چێژت لەپێناوی ڕاست‌ودروستی، ئەوا خۆزگەتان پێ‌دەخوازرێ. {لەوەش مەترسن کە ئەوان لێی دەترسن، مەتۆقن.} [15] بەڵکو مەسیح پیرۆز بکەن لەدڵتان‌و وەك خوداوەند ڕێزی لێ‌بگرن، هەروەها بەردەوام ئامادەبن بۆ وەڵامدانەوەی هەر یەکێك بپرسێ سەبارەت بەم هیوایەی لەئێوە دایە، ئەوەش دەکەن با بەرۆحسووکی‌و ڕێز بێت. [16] هەروەها ویژدانێکی باشتان هەیە، تا کاتێ جنێوتان پێدراو ئەوانەی بەخراپە باسی ڕەوشتە باشەکانتان دەکەن کە لەمەسیح دایە، شەرمەزار بن. [17] بۆیە باشترە لەبەر کردەوەی باش ئازار بدرێن، گەر خواستی خودای لەگەڵ بێ، نەك کردەوەی خراپ. [18] چونکە مەسیح لەپێناوی گوناه جارێك بۆ هەمووان مرد، واتە بێتاوان بۆ تاوانباران مرد، تا لەخودامان نزیك‌بکاتەوە، مردوو بەلەش‌و زیندوو بەرۆح، [19] ئەوەی ڕۆیشت‌و مزگێنی بەرۆحە بەندکراوەکاندا، [20] ئەوانەی لەکۆنا یاخی‌بوون، کاتێ خودا بە لەخۆبووردوویی چاوەڕوان بوو لەڕۆژانی نوح، لەکاتی دروست‌کردنی کەشتیەکە، ئەوەی ژمارەیەکی کەم، واتە تەنها هەشت کەس تیایدا ڕزگار بوون لەناو ئاو. [21] ئەمەش هێمای لەئاوهەڵکێشانە، کە ئێستا ئێوە ڕزگار دەکات، نەك بەسڕینەوەی پیسی لەش، بەڵکو بە پەیمانی ویژدانێکی پاك لەگەڵ خودا، بەهۆی هەستانەوەی عیسای مەسیح لەنێو مردووان، [22] ئەوەی بەرەو ئاسمان ڕۆیشت‌و لەدەستە ڕاستی خودا دانیشت، فریشتەکان‌و دەسەڵاتدارەکان‌و بەهێزەکان

ملکەچن بۆی.

## چەکداربوون بەو بیروڕایە

4

وەك مەسیح بەلەش ئازاری چێژت، ئێوەش خۆتان بەو بیروڕایە چەکدار بکەن، چونکە ئەوەی بەلەش ئازار بچێژێ لەگوناە کردن دەوەستێ، [2]تا ئەو کاتەی ماوە لەژیان بەلەش بۆ ئارەزووە مرۆڤیەکان نەژی، بەڵکو بۆ خواستی خودا. [3]جا بەستانە ئەو کاتەی بەسەرتان برد بەگوێرەی خواستی بێ باوەڕان، لەبەڕەڵلایی‌و هەوەسبازی‌و سەرخۆشی‌و ڕابواردن‌و ئاهەنگی مەی خواردنەوەو بت پەرستی گەندەڵ. [4]ئەوان سەرسام دەبن، چونکە ئێستا بەشداری ناکەن لەهەمان بەدڕەوشتی، جنێویشتان پێ‌دەدەن، [5]بەڵام ئەوان دەبێ حیسابی خۆیان بدەن بەوەی ئامادەیە حوکم بەسەر مردووان‌و زیندووان بدات. [6]بۆیە مزگێنی بەوانەش درا کە ئێستا مردوون، تاکو بەگوێرەی مرۆڤ لەلەش حوکم بدرێن، بەڵام بەگوێرەی خودا لەڕۆح بژین.

[7]کۆتایی هەموو شتێك نزیك بووەتەوە، بۆیە ژیرو چاوکراوە بن بۆ نوێژەکانتان. [8]لەسەرووی هەموو شتێکیش با خۆشەویستیتان بۆ یەکتری بەهێز بێت، چونکە خۆشەویستی زۆر گوناە دادەپۆشێ. [9]میوانداریەتی یەکتری بکەن بەبێ مشتومڕ. [10]باهەر یەك لەئێوە بەگوێرەی ئەو بەهرەیەی وەریگرتووە، خزمەتی پێ‌بکات لەنێوان یەکتری، وەك بریکارێکی باش لەسەر بەرەکەتە جۆراوجۆرەکانی خودا. [11]هەر یەکێك قسە بکات با وەك ووشەکانی خودا بێت، هەروەها گەر یەکێك خزمەتی‌کرد با وەك ئەوە بێت توانای لەخوداوە وەرگرتبێت، تاکو خودا لەهەموو شتێك شکۆدار بێت بەعیسای مەسیح، بۆ ئەوە شکۆمەندی‌و دەسەڵات تاهەتایە. ئامین.

## وەك قوتابی مەسیح ئازار بدرێن

[12]خۆشەویستان، لاتان سەیر نەبێ کاتێ تەنگوچەڵەمەی سوتێنەر توشتان دێت بۆ تاقیکردنەوەتان، وەك بڵێی شتێکی سەیرتان بەسەر هاتووە. [13]بەڵکو دڵخۆش بن هەروەك بەشداریتان کرد لەئازارەکانی

مەسیح، تاکو زیاتر دڵخۆش بن لەکاتی ڕاگەیاندنی شکۆمەندیەکەی. [14]گەر جنێوتان پێدرا لەپێناوی ناوی مەسیح، ئەوا خۆزگەتان پێدەخوازرێ، چونکە ڕۆحی شکۆمەندیو ڕۆحی خودا دێتە سەرتان. [15]با کەستان ئازار نەچێژێ وەك بکوژێك یا دزێك یا بەدکارێك یاخود وەك یەکێك دەست لەکاروباری خەڵکی وەربدات، [16]بەڵام گەر وەك قوتابی مەسیح ئازار بدرێن شەرم مەکەن، بەڵکو لەسایەی ئەو ناوە ستایشی خودا بکەن. [17]چونکە کاتی لێپرسینەوە هاتووەو بەخانەوادەی خودا دەست پێدەکات، گەر بەئێمەوە دەست پێبکات، باشە دەبێ کۆتایی ئەوانە چی بێت کە گوێڕایەڵی مزگێنی خودا نین. [18]کتێبی پیرۆز دەڵێ: {گەر مرۆڤی ڕاستودروست بەهەوڵو کۆشش ڕزگاری ببێ، دەبێ چارەنووسی گوناهبارو خوانەناس چی بێ؟} [19]بۆیە ئەوانەی ئازار دەدرێن بەگوێرەی خواستی خودا، باخۆیان بدەنە دەست دروستکەری سەرڕاست لەچاکە کردن.

## شوانی مێگەلی خودا

## 5

داوا لەو پیرانە دەکەم کە لەگەڵتانن، من وەك پیرێکی هاوڕێیانمو شایەتی ئازارەکانی مەسیحو بەشداربووی ئەو شکۆمەندیەم کەوا ڕادەگەیێنرێ، [2]مێگەلی خودا بلەوەرێنن کە لەنێوانتاندایەو چاودێریو خزمەتیان بکەن، ئەو کارەش بەزۆر نییە، بەڵکو با بەویستی خۆتان بێ هەروەك خودا دەیەوێ، هەروەها بۆ دەسکەوتی شەرمەزار نەبێ بەڵکو بەچالاکییەوە بێ، [3]هەروەها خۆتان مەسەپێنن بەسەر ئەوانەی میراتی خودان، بەڵکو خۆتان بکەن بە نموونە بۆ مێگەل. [4]کاتێکیش سەرۆکی شوانەکان دەردەکەوێ ئێوە تاجی نەمری شکۆمەندیتان دەستدەکەوێ.

[5]ئێوەش ئەی لاوەکان ملکەچی پیرەکان بن، هەروەها هەمووتان ڕۆحسووکی لەبەر خۆتان بکەن سەبارەت بەیەکتری، چونکە {خودا بەربەرەکانی لەخۆباییان دەکات، بەڵام بەرەکەتی دەبەخشێ بەڕۆحسووکەکان.} [6]بۆیە ڕۆحسووك بن لەژێر دەستی بەتوانای خودا، تا لەکاتی خۆی بەرزتان

بکاتەوە. [7]هەموو گیروگرفتەکانتان بخەنە سەر ئەو، چونکە ئەو بایەختان پێدەدات.

[8]چاوکراوە بن‌و ئێشك‌بگرن، چونکە شەیتانی دوژمنتان وەك شێرێکی بە نەڕەنەڕ لەدەوروپشتتان دەسوڕێتەوە، دەگەڕێ بەدوای یەکێك تا بیخوات. [9]بەربەرەکانی بکەن‌و چەسپاوبن لەباوەڕ، بزانن خوشك‌و براکانیشتان هەمان ئازار دەچێژن ئەوانەی وا لەجیهانن. [10]هەروەها خودای هەموو بەرەکەتێك، ئەوەی بانگی کردووین بۆ شکۆمەندییە نەمرەکەی لەعیسای مەسیحدا، دوای ئەوەی تۆزێك ئازارتان چێژت، هەر خۆی نوێ‌کەرەوەو چەسپێنەرو بەهێزکەرو بناغەدانەری ئێوەیە. [11]بۆ ئەوە دەسەڵات تاهەتایە.ئامین

**بەرەکەتی ڕاستی خودا**

[12]بەهۆی سلفانۆس، کە بەبرای سەرڕاستی خۆمی دەزانم، بەکورتی ئەم نامەیەتان بۆ دەنووسم، تیایدا هانتان‌دەدەم‌و شایەتی‌دەدەم ئەمە بەرەکەتە ڕاستەکەی خودایە. تیایدا بچەسپێن. [13]ئەوەی لەبابل وەك ئێوە هەڵبژێرراوە، سڵاوتان لێدەکات، هەروەها مەرقۆسی کوڕم سڵاوتان لێدەکات. [14]سڵاو لەیەکتری بکەن بەماچی خۆشەویستی. داوای ئاشتی بۆ هەموو لایەکتان دەکەم، ئێوە کە لەمەسیح‌دان.

# دووەم نامە پەترۆس

*نامەی دووەمی پەترۆس ئاڕاستەی ناوەندێکی فراوانی باوەڕداران کراوە. مەبەستیشی دژایەتی‌کردنی مامۆستا درۆزنەکان‌و ئەو بەڕەڵاییەی بە هۆی فێرکردنەکانیان بڵاودەبێتەوە. وەڵامدانەوەی ڕاستی باوەڕدارانیش دەبێ ئەوەبێ، خوداو خوداوەند عیسای مەسیح بەڕاستی بناسن. ئەم ناسینەش لەوانە وەرگرن کە خۆیان مەسیحیان بینیوەو ناسیویانە. پەترۆس لەم نامەیەدا زیاتر گرنگی بەوە داوە کە هەندێك کەس ووتویانە مەسیح جارێکی تر ناگەڕێتەوە. ئەویش دەڵێ درەنگ هاتنەوەی مەسیح، ئەوە دەگەیێنێ خودا نایەوێ کەس لەناوبچێ، بەڵکو هەموو خەڵکی لەگوناهەکانیان بگەڕێنەوەو تۆبە بکەن.*

## 1

[1]لەشەمعون پەترۆسەوە، بەندەو نێرراوی عیسای مەسیح، بۆ ئەوانەی بەهۆی ڕاست‌ودروستی خوداو ڕزگارکەرمان عیسای مەسیح باوەڕێکی بەنرخی وەك باوەڕی ئێمەیان دەسکەوتووە. [2]بابەرەکەت‌و ئاشتی زیاد بێت بۆتان، بەناسینی خوداو عیسای خوداوەندمان.

### هەڵبژاردن‌و بانگەوازی خودایی

[3]هێزە خوداییەکەی هەموو شتێکی سەبارەت بەژیان‌و خوداناسی بەئێمە بەخشیوە، بەهۆی ناسینی ئەوەی بانگی‌کردین بۆ شکۆمەندی‌و ڕەوشت‌بەرزی، [4]ئەوەی بەهۆیەوە بەڵێنە بەنرخ‌و مەزنەکانمان پێدرا، تا بەهۆی ئەو بەشداربین لەسروشتی خودایی‌و ڕابکەین لەو گەندەڵییەی جیهان کە لەئارەزووی خراپدایە.
[5]لەبەر ئەوەشە زۆر چالاکانە ڕەنج دەدەن تا لەباوەڕتان ڕەوشت‌بەرزی بکەوێتەوە، لەڕەوشت‌بەرزی زانیاری، [6]لەزانیاری خۆڕاگری، لەخۆڕاگری دانبەخۆگرتن، لەدانبەخۆگرتن خواناسی، [7]لەخواناسی هەست‌وسۆزی برایانە، لەهەست‌وسۆزی برایانە خۆشەویستی. [8]چونکە گەر ئەوانەتان تیادا بێت‌و زیاد بکات، ئەوا دەتانپارێزێت لەوەی تەمبەڵ‌و بێ بەرووبووم بن لەناسینی خوداوەندمان عیسای مەسیح. [9]چونکە ئەوەی ئەو

شـتانەی تـیادا نـەبێ ئـەوا کوێـرو کـەمبیـنە، هـەروەها لـەیادی چـووە لەگوناهە کۆنەکانی پاکبێتەوە.
[10]بۆیە بـرایـان زیـاتـر دڵگەرم بـن بـۆ چـەسـپانـدنـی هـەڵـبژاردنو بانگەوازیەکـەتان، چـونکە گـەر ئـەوەتان کـرد ئـەوا هەرگـیز ناکـەون، [11]هـەروەها پێشـوازییەکی گەرمـتان لـێ دەکرێ بۆ چوونە ناوەوەی پادشاهێتی نەمری خوداوەنـدو ڕزگارکـەرمان عیسـای مەسیح.
[12]بۆیە بەردەوام دەمەوێ بەبیرتان بێـنمەوە سـەبارەت بـەو شـتانە، هەرچـەندە ئـێوە ئێسـتا دەیانناسـنو چەسپاون لەسەر ئەو ڕاستیەی لاتانە. [13]مـن بەڕاستی دەزانم، تا لە چادری ئەم لەشەدابم، هۆشیارتان بکەمەوە بە وەبیرهاتـنەوە، [14]چـونکە دەزانم داکـەندنی ئـەم چـادرەم ﴿مـردنم﴾ نـزیکبووەتـەوە، هـەروەك خوداوەندمـان عیسـای مەسـیح بۆی دەرخستم. [15]هەروەها هەوڵدەدەم تا دوای ڕۆیشـتنم هـەموو ئەو شتانەتان وەبیربێتەوە.

**شایەتی نەگۆڕی نێرراوان**

[16]چـونکە ئـێمە دوای ئەفسانەی دروسـتکراو نەکـەوتین، کاتێ هاتنی خوداوەندمـان عیسـای مەسـیحو هێزەکەیمان پێناساندن، بەڵکو بەچاو شـایەتی مـەزنی توانـای ئـەوین. [17]لەبەرئـەوەی کـاتێ ئـەو ڕێـزو شـکۆمەندی لـەخودای بـاوك وەرگـرت، دەنگـێك لـەخودای شـکۆداری مەزنـەوە بـۆی هـاتو ووتـی: (ئەمەیە ڕۆڵەی خۆشەویستم، ئـەوەی زۆر پێی دڵشادم)، [18]ئێمەش گوێمان لەم دەنگەبوو کە لەئاسمانەوە هـات، کاتێ لەشاخی پیرۆز لەگەڵی بوویـن. [19]هـەروەها ووشـەی پێغەمـبەرانمان هەیـەو زیاتـر جـێگای مـتمانەیە. چـاك دەکـەن گـەر ئاگـاداریبنو سـەرنج بۆ ئەوە بدەن وەك بـۆ چـرایەکی گەشـاوە لەشوێنێکی تاریك، تا ڕۆژ هەڵدێتو ئەسـتێرەی بـەیانی لەدڵـتان دەردەکەوێ. [20]لەپێش هەموو شتێك پێویسـتە ئـەوە تێبگەن، کـە هـەموو ووشـەیەکی کتێـبی پـیرۆز بەلـێکدانەوەیەکی تایـبەتی یەکـێك ڕووننابێتەوە، [21]چونکە هەرگیز هیچ ووشـەیەك بەخواستی مرۆڤ نەهاتووە،

بەڵکو خەڵکی لەسەر دەستی ڕۆحی پیرۆز قسەی خودایان کردووە.

### مامۆستا درۆزنەکان

## 2

بەڵام لەنێو خەڵك پێغەمبەری درۆزن دەرکەوتن، هەروەك لەنێوانتان مامۆستای درۆزن دەردەکەون ئەوانەی لەخۆیانەوە بەنهێنی فێرکردنی چەوتی لەناوبەر دەهێننە ناوەوە، تەنانەت نکۆڵی لەخوداوەند دەکەن ئەوەی ئەوانی کڕیەوە، بەمەش لەناوچوونێکی خێرا بەسەر خۆیاندەهێنن. [2]خەڵکێکی زۆریش دوای بیروڕا لەناوچووەکەیان دەکەون، هەروەها بەهۆی ئەوان ڕێبازی ڕاستی نەفرەتی لێدەکرێ. [3] لەچاوچنۆکیان بەقسەی فڕوفێڵ بازرگانیتان پێدەکەن، ئەوانەی لەکۆنەوە حوکمیان بەسەردا دراوەو ئەمەش بەتاڵ نابێتەوەو لەناوچوونیان چاوپۆشی لێناکرێ.

[4]چونکە گەر خودا بەزەیی بەفریشتە بەدکارەکان نەهاتبێتەوە کاتێ گوناهیان کرد، بەڵکو فڕێیدانە دۆزەخو لەقوولایی تاریکی لەژێر چاودێری دایەنان تا ڕۆژی لێپرسینەوە، [5]هەروەها گەر بەزەیی بەجیهانی کۆن نەهاتبێتەوە، بەڵکو تەنها نوحی پاراست کە مزگێنیدەری ڕاستودروستی بوو لەگەڵ حەوت کەسی دیکە، کاتێ خودا لافاوی بەسەر جیهانی خوانەناسان هێنا، [6]گەر خودا بڕیاری تێکدانی بەسەر سەدۆمو عەمورە داو هەردوو شاریکرد بەخۆڵەمێشو کردنی بەپەند بۆ ئەو خوانەناسانەی دوایی دێن، [7]گەر لووتی پیاوچاکی دەرباز کرد، ئەوەی زۆر بێزار بوو لەهەڵسوکەوتی بەدکاران، [8](چونکە ئەو پیاوچاکە کە لەناویان ژیاو گوێی لەکردەوە خراپەکانیان بوو و بەچاوی خۆی بینی، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گیانی ڕاستودروستی بێزارتر دەبوو)، [9]گەر ئەمە وابێ، خوداوەند دەزانێ چۆن خوداناسان لەتەنگوچەڵەمەکانیان دەرباز بکاتو خوانەناسان بهێڵێتەوە لەژێر سزادان تا ڕۆژی لێپرسینەوە، [10]بەتایبەتی ئەوانەی کەوتوونەتە دوای هەوەسە گڵاوەکانی لەشو سووکایەتی بەدەسەڵاتداری گەورە دەکەن.

چەند چاونەترسو کەللەڕەقن سڵناکەنەوە کاتێ قسەی خراپ

سەبارەت بەشکۆداری ئاسمان دەڵێن، [11]لەگەڵ ئەوەش فریشتەکان لەوان بەتواناترو بەهێزترن، قسەی خراپی تاوانبارکردن سەبارەت بەوان ناڵێن لەبەرامبەر خوداوەند. [12]بەڵام ئەوانە وەك ئاژەڵی بێمێشکن، بەسروشت لەدایك بوونە بۆ ڕاوکردنو کوشتن، قسەی خراپ سەبارەت بەشتێك دەڵێن کە هیچی لێتێناگەن، بەگەندەڵی خۆیان لەناودەچن.

[13]بەم شێوەیە ئازار دەچێژن وەك پاداشتی کردەوە خراپەکانیان. ئەوانە بە خۆشییەکی مەزنی دەزانن گەر بەدرێژایی ڕۆژ لەناو ئارەزووەکانیان بن. ئەوانە نیشانەی شەرمەزاریو کەموکوڕین، چێژ لەئارەزووەکانیان وەردەگرن، بەشداری خوانەکانتان دەکەن. [14]ئەوانە چاویان بەرەو داوێن پیسییە، لەگوناە ناوەستن، ئەوانە بەتەڵەوە دەکەن کە نەچەسپاون، دڵیان بەچاوپیسی فێرکراوە، ئەوانە بەڕاستی ڕۆڵەی نەفرەتن. [15]لەڕێگای ڕاستی لایانداوەو وون بوون، ئەوانە دوای ڕێبازی بەلعامی کوڕی بەعور کەوتن ئەوەی حەزی لەکرێی خراپەکاری بوو، [16]بەڵام دووچاری سەرزەنشت بوو لەبەر هەڵەکانی، کاتێ گوێدرێژی لاڵ بەدەنگی مرۆڤانە هاتە دوانو شێتی ئەو پێغەمبەرەی ڕاگرت.

[17]ئەوانە کانی بێئاون، هەورن بەگەردەلوول دێنو دەچن، ڕەشایی تاریکی تاهەتایە بۆ ئەوانە هەڵگیراوە. [18]ئەوانە کاتێ بەقسەی گەورەو بەتاڵ دەدوێن، بەهەوەسەکانی لەشو بەبەڕەڵلایی، ئەو خەڵکە هەڵدەخەڵەتێنن کە تازە هەڵاتوون لەدەست ئەوانەی لەخراپی دان. [19]ئەوان بەڵێنی ئازادییان پێدەدەن، بەڵام خۆیان کۆیلەی گەندەڵین، چونکە مرۆڤ دەبێتە کۆیلەی هەر شتێك بەسەریدا زاڵبێ. [20]چونکە ئەوانە دوای ئەوەی هەڵاتن لەدەست گلاوی جیهان بەهۆی ناسینی خوداوەندو ڕزگارکەر عیسای مەسیح، دوایی دەگەڕێنەوەو تیایدا تێدەکەون، ئەو کاتە گلاوییەکە بەسەریان زاڵ دەبێو کۆتاییەکەیان خراپتر دەبێ لەسەرەتاکەیان. [21]لەبەرئەوە باشترە ڕێگای ڕاستودروستیان نەناسیبووایە لەوەی ناسیانو هەڵگەڕانەوە لەو ڕاسپاردە پیرۆزانەی پێیان درابوو. [22]

ئەوانە بەڕاستی ئەو پەندەیان لەسەر دەچەسپێ: (سەگ گەڕایەوە سەر ئەوەی ڕشاندیەوە)، هەروەها: (کاتێ بەرازیان شۆرد گەڕایەوە بۆ ناو چلپاو.)

## ڕۆژی خوداوەند
## 3

ئەمە دووەم نامەیە خۆشەویستان بۆ ئێوەی دەنووسم، لە هەردووکیان بەیادی مێشکی پاکتانم هێناوەتەوە، [2] تاکو بەیادتان بێتەوە ووتەی پێغەمبەرە پیرۆزەکانو ڕاسپاردەی خوداوەندو ڕزگارکەر بەهۆی نێرراوەکانتان.

[3] پێش هەموو شتێك پێویستە ئەوە تێبگەن، خەڵکێکی گاڵتەچیو فشەکەر لەڕۆژانی دوایی دێن، دوای ئارەزووە خراپەکانیان دەکەون، [4] دەڵێن: (کوانێ بەڵێنی گەڕانەوەی مەسیح؟ لەو کاتەی باوکانمان لەکۆنەوە مردوون، لەسەرەتای دروست بوونەوە هەموو شتێك وەك خۆیەتی.) [5] بەئەنقەست ئەم ڕاستییە پشت گوێ دەخەن، کە لەکۆنەوە ئاسمانەکان هەنو زەویش بەووشەکەی خودا لەئاو و بەئاویش پەیدابووە، [6] بەهۆی ئاوەکانیش جیهانی کۆنی داپۆشیو لەناویبرد. [7] هەروەها بەهەمان ووشە ئەم زەویو ئاسمانەی ئێستا واهەنو هەڵگیراون بۆ ئاگر، پارێزراون تا ڕۆژی لێپرسینەوەو لەناوچوونی خوانەناسەکان.

[8] بەلاّم تەنها ئەو ڕاستیەتان لەیاد نەچێ خۆشەویستان، ئەویش یەك ڕۆژ لای خوداوەند هەزار ساڵەو هەزار ساڵیش یەك ڕۆژە. [9] خوداوەند خاو نییە سەبارەت بەبەڵێنەکانی، هەروەك هەندێ کەس مانای خاوی وا تێدەگەن، بەلاّم لەسەرمان ڕادەوەستێو دان بەخۆی دەگرێ، چونکە حەز ناکات هیچ کەس لەناوبچێ، بەڵکو حەز دەکات هەموو خەڵکی ڕووەو تۆبەکردن بێن.

[10] بەلاّم ڕۆژی خوداوەند وەك دز دێت، ئەوکاتە بەدەنگێکی بەرز ئاسمان نامێنێ، بەئاگرێکی توندیش توخمەکان دەتوێنەوە، هەروەها زەویو هەموو ئەو کارانەی لەسەری کراوە دەسوتێنرێ. [11] گەر هەموو ئەو شتانە لەناوبچن، ئیتر پێویستە ئێوە چ جۆرە مرۆڤێك بن؟ دەبێ ژیانێکی پیرۆزو لەخواترس بژین، [12] لەچاوەڕوانیو

هـەوڵدان بـن بـۆ هاتـنی بەخـێرایی ڕۆژی خـودا، چـونکە لـەو ڕۆژە ئاسمـان بەئاگـر لەناودەچـێ، توخمەکانـیش بـەهۆی گـەرمی دەتوێـنەوە. [13]بەڵام بەگوێرەی بەڵێنی ئـەو ئـێمە چـاوەڕوانی ئاسمانی نوێو زەوی نوێین کە ڕاستودروستی تیادا نیشتەجێیە.

[14]بۆیـە خۆشەویسـتان، هـەوڵبـدەن لەکاتـێکدا چاوەڕوانی ئـەو ڕۆژە دەکـەن، خـودا بەئاشتی بتانبینێو هیچ کەموکوڕیەکتان تیادا نـەبێ. [15]ئـێوەش لـەخۆبوردوویی خوداوەندمـان بەهەلـێك بـزانن بـۆ ڕزگـاری، هـەروەك بـرای خۆشەویستمان پۆڵس بۆی نووسین بەگوێـرەی ئـەو دانایـیەی پـێی دراوە، [16]هـەروەها لەهـەموو نامەکانـیدا دواوە سـەبارەت بـەو شـتانە، ئـەوەی هـەندێ شتی تێدایە گـرانە بـۆ تێگەیشـتن، نەزانـەکانو نەچەسـپاوەکان لـەڕاسـتی، دەسـتی تـێوەردەدەنو دەیگـۆڕن وەك بەشـەکانی دیکەی کتێبی پیرۆز، بۆ لەناوچوونی خۆیان.

[17]بۆیـە ئـەی خۆشەویستان، ئێوە لەپێشـا دەزانن، ئاگاداری خۆتان بن تا بەدوای خراپەکاری هەڵگەڕاوەکان نەکەونو چەسپاوی خۆتان نەدۆڕێنن. [18]بـەڵکو گەشـە بکەن لـەبەرەکەتو ناسـینی خوداوەنـدو ڕزگارکـەرمان عیسای مەسیح، بۆ ئەوە شکۆمەندی ئێستاو تاهەتایە. ئامین.

*یەکەم نامەی یۆحەننا دوو مەبەستی سەرەکی هەیە:*
*1–هاندان بۆ ژیانی هاوبەشی لەگەڵ خوداو ڕۆڵەکەی عیسای مەسیح.*
*2–ئاگادارکردنەوە لەفێرکردنی پووچەڵ کە ئەم هاوبەشییە دەڕوخێنێ.*
*چونکە بەپێی ئەو فێرکردنانە ژیان لەگەڵ خەڵکی دیکە دەبێتە هۆی خراپەکاری، بۆیە نابێ ووشەی خودا بوو بێت بەمرۆڤ. هەرووەها ڕزگاربوونیش تەنها لە ڕێی ئازاد بوونە لەغەمەکانی ژیان، هیچ پەیوەندی نییە بەڕەوشت یان خۆشەویستی مرۆڤ بۆ مرۆڤ.*
*بۆ بەرپەچدانەوەی ئەم فێرکردنە پووچانە، یۆحەننا دووبارەی دەکاتەوە کە ووشەی خودا بەڕاستی بووە بەمرۆڤ، ئەوانەی باوەڕیان بەعیسا هەیەو خودایان خۆش دەوێ دەبێ یەکتریان خۆش بوێ.*

# 1

ئێمە ئەمە ڕادەگەێنین سەبارەت بەووشەی ژیان، ئەوەی لەسەرەتاوە بوو، ئەوەی گوێمان لێی بوو، ئەوەی بەچاوی خۆمان بینیمان، ئەوەی تەماشامان کردو دەستمان لێیدا، [2]ئەم ژیانە دەرکەوت، ئێمە بینیمانو شایەتی بۆ دەدەینو ژیانی هەتاهەتاییتان پێ ڕادەگەێنین، ئەو ژیانەی لەلایەن باوکی ئاسمانییەوە بۆ ئێمە دەرکەوت. [3]ئەوەی بینیمانو گوێمان لێیبوو پێتانی ڕادەگەێنین، بۆ ئەوەی ئێوەش ژیانی هاوبەشیتان هەبێ لەگەڵمان، بەڵام ژیانی هاوبەشی ئێمە لەگەڵ باوکی ئاسمانیو ڕۆڵەکەی، عیسای مەسیحە. [4]ئێمەش ئەم نامەیەتان بۆ دەنووسین تا خۆشییەکەمان پڕو تەواو بێت.

**خودا ڕووناکییە**

[5]ئەمە ئەو هەواڵەیە کە لەمەسیحەوە گوێمان لێبوو و پێتانی ڕادەگەێنین، ئەویش ئەوەیە خودا ڕووناکییەو هەرگیز تاریکی تیادا نییە. [6]گەر بلێین ژیانی هاوبەشمان لەگەڵی هەیەو بەتاریکیدا بڕۆین، ئەوا درۆ دەکەینو ڕاست ناکەین، [7]بەڵام ئەگەر بەڕووناکیدا بڕۆین بەو شێوەیەی ئەو لەڕووناکیدایە، ئەوا لەگەڵ یەکتری ژیانی هاوبەشمان

دەبێت‌و خوێنی عیسای ڕۆڵەکەی لەهەموو گوناهێك پاکمان دەکاتەوە. [8]گەر بڵێین گوناهمان نییە، ئەوە خۆمان هەڵدەخەڵەتێنین‌و ڕاستی لەئێمەدا نییە. [9]بەڵام گەر دانمان بەگوناهەکانمان نا، ئەوا ئەو سەرڕاست‌و دادپەروەرە، لەگوناهەکانمان خۆش دەبێت‌و لەخراپە پاکمان دەکاتەوە. [10]گەر بڵێین گوناهمان نەکردووە، ئەوا خودا بەدرۆزن دادەنێین‌و ووشەکەی لەئێمەدا نییە.

## مەسیح بۆمان دەپاڕێتەوە

# 2

کوڕەکانم، من ئەمەتان بۆ دەنووسم تا گوناە نەکەن، بەڵام گەر یەکێك گوناهی‌کرد، ئەوا عیسای مەسیحی بێ‌تاوان بۆمان دەپاڕێتەوە لای باوکی ئاسمانی. [2]ئەو کەفارەتی تاوانەکانمانە، نەك تاوانەکانی ئێمە بە تەنها، بەڵکو تاوانەکانی هەموو جیهان.

[3]بەم شێوەیە ئێمە بێ‌گومان دەیناسین گەر کار بەڕاسپاردەکانی بکەین. [4]گەر یەکێك بڵێ: (من دەیناسم) بەڵام کار بەڕاسپاردەکانی نەکات، ئەوا درۆ دەکات‌و ڕاستی تیادا نییە، [5]بەڵام گەر یەکێك کار بەووشەکەی بکات، ئەوا بەڕاستی خۆشەویستی خودا لەو کەسەدا تەواوە. [6]ئەوەی بڵێت من لەو چەسپاوم، پێویستە بەهەمان ڕێگای عیسا بڕوات.

## خۆشەویستی ڕاست‌و دروست

[7]خۆشەویستان، ڕاسپاردەیەکی نوێتان بۆ نانووسم بەڵکو ڕاسپاردەیەکی کۆنە، کە لەسەرەتاوە پێی ئاشنا بوون. ڕاسپاردە کۆنەکە ئەو ووتەیەیە کە گوێتان لێبوو. [8] لەگەڵ ئەوەشدا ڕاسپاردەیەکی نوێتان بۆ دەنووسم، ئەوەی لەمەسیح‌و لەئێوەدا ڕاستیەکەی دەردەکەوێ، چونکە تاریکی بەسەر چوو و ڕووناکی ڕاستەقینە ئێستا پڕشنگ دەداتەوە.

[9]ئەوەی ڕقی لەبراکەی خۆی بێتەوەو بڵێت من لەڕووناکیم، ئەوە تا ئێستا لەتاریکیدایە. [10]ئەوەی براکەی خۆش بوێت لەو ڕووناکییە دەچەسپێت‌و ئەو کەسە هیچ شتێکی تیادا نییە بی‌کەوێنێ. [11]بەڵام ئەوەی ڕقی لەبرای خۆی بێتەوە لەتاریکیدایەو بەتاریکیدا دەڕوات،

نازانێت بەرەو کوێ مل دەنێت، چونکە تاریکی چاوی کوێر کردووە. [12] بۆ ئێوە دەنووسم، ڕۆڵە بچووکەکان،
چونکە لەپێناوی ئەو گوناهەکانتان
بەخشران.
[13] بۆ ئێوە دەنووسم، باوکەکان،
چونکە ئێوە ئەوتان ناسیووە کە
لەسەرەتاوە هەیە.
بۆ ئێوە دەنووسم لاوەکان،
چونکە ئێوە بەسەر خراپەکاردا
﴿شەیتان﴾ سەرکەوتوون.
بۆ ئێوە دەنووسم ڕۆڵە بچووکەکان،
چونکە باوکی ئاسمانیتان ناسیووە.
[14] بۆ ئێوەم نووسی باوکەکان،
چونکە ئێوە ئەوەتان ناسیووە کە
لەسەرەتاوە هەیە،
بۆ ئێوەم نووسی لاوەکان،
چونکە بەهێزن، ووشەی خوداتان
تیادا چەسپاوەو
بەسەر خراپەکاردا
سەرکەوتن.

[15] نەجیهانتان خۆشبوێت، نە ئەو شتانەی تیایەتی، چونکە گەر یەکێك جیهانی خۆشبوێت، ئەوا خۆشەویستی باوکی ئاسمانی تیادا نییە. [16] چونکە ئەوەی لەجیهاندایە، ئارەزووی لەشو چاو و سەڵتەنەتی ژیان لەجیهانەوەیە نەك لەباوك. [17] جیهانو ئارەزووە پیسەکانی بەسەر دەچن، بەڵام ئەوەی بەویستی خودا دەکات تاهەتایە دەچەسپێت.

**مەسیحە فێڵبازەکان**

[18] ڕۆڵە بچووکەکان ئەمە دوا کاژێرەو وەك بیستووتانە دژەمەسیح دێت، ئێستاش لێرە مەسیحی درۆزن زۆرنو دژایەتی مەسیح دەکەن، بەمە دەزانین ئەمە دوا کاژێرە. [19] چەند کەسانێك لەناو ئێمە دەرچوون، بەڵام ئەوانە لەئێمە نەبوون، چونکە گەر ئەوانە لەئێمە بوونایە، ئەوا وەك ئێمە باوەڕی خۆیان دەپاراستو بەردەوام دەبوون، بەڵام بۆ ئەوەی دەربکەوێت ئەوانە لەئێمە نین، لەناومان دەرچوون. [20] بەڵام ئێوە لەلایەن پیرۆزەوە دەست نیشانکراون [بەڕۆحی پیرۆز]، هەموو ڕاستیەك دەزانن. [21] من بۆ ئێوە نانووسم لەبەر ئەوەی ڕاستی نازانن، بەڵکو دەیناسنو دەزانن هیچ درۆیەك لەڕاستیەوە نایەت. [22] کێ

درۆزنـە، تـەنها ئەو کەسە نەبێت کە ڕەتی‌دەکاتـەوە عیسـا مەسـیح بێت؟ ئـەوە دژەمەسـیحە بـاوکی ئاسمـانی‌و ڕۆڵەکـەی ڕەت‌دەکاتەوە. [23]ئەوەی ڕۆڵـە ڕەت‌بکاتـەوە بـاوکی ئاسمـانی نابێـت، ئـەوەش دان بەڕۆڵـە بنێـت باوکی ئاسمانی دەبێت.

[24]بـا ئـەوەی لەسـەرەتا گوێـتان لێ‌بووە تیاتاندا بچەسپێت. گەر ئەوەی لەسـەرەتا گوێـتان لێ‌بـوو تـیاتاندا بچەسـپێت، ئـەوا لەڕۆڵـەو بـاوکی ئاسمـانی دەچەسـپێن. [25]ئەوەیە بەڵێنی ئـەو، واتە ژیانی هەتاهەتایی. [26]لەبەر ئەو کەسانەی گومراتان دەکەن ئەمەم بـۆ نووسـیون، [27]بـەڵام ئـێوە کـە دەسـت‌نیشـان‌کردنـتان وەرگرتووە. ئـەم دەسـت‌نیشـان‌کـردنە تـیاتاندا دەچەسـپێ، پێویسـتتان بەکـەس نیـیە فـێرتان بکـات، هـەروەك چـۆن ئەم دەسـت‌نیشـان‌کردنە هەموو شتێکتان فـێر دەکـات، ئەمـە ڕاستەو درۆ نییە هــەروەك فــێری‌کردوون تــیایدا دەچەسپێن.

[28]ئێستا ڕۆڵە بچووکەکان، تیایدا بچەسـپێن، بـۆ ئـەوەی کـاتێ کـە دەرکـەوت باوەڕمان بەخۆمان بێت‌و لەهاتـنەکەی شەرمەزار نەبین. [29]گەر بـزانن ئەو ڕاست‌ودروستە، ئەوا هەر کەسـێك ڕاسـت‌ودروسـتی بکـات لەئەو بووە.

## ئێمە ڕۆڵەی خوداین

# 3

تەماشـا بکـەن بـاوکی ئاسمـانی چ خۆشەویسـتیەکی پێ‌داویـن، تا پێمان دەووترێـت ڕۆڵەکانی خودا. ئێمەش ئەمـەین! لەبەر ئەمە جیهان ناماننـاسێ، چـونکە جـیهان خـودا نـاناسـێ. [2]خۆشەویسـتان، ئێسـتا ئـێمە ڕۆڵـەی خودایـن تا ئێستا دەرنەکەوتووە ئێمە دەبـین بەچـی، بـەڵام دەزانین کاتێك ئـەو دەرکـەوێ ئێمە وەك ئەو دەبین، چـــونکە وەك خـــۆی دەیبیـــنین. [3]هـەروەها هـەر کەسێك ئەم هیوایەی هەبێ، خۆی پاك دەکاتەوە وەك چۆن ئەو پاکە.

[4]ئەوەی گوناه بکات دەستدرێژی دەکـات، چونکە گوناه دەستدرێژیە. [5]دەزانـــن ئـــەو دەرکـــەوتووە تـــا گوناهـەکانمان لەسـەر لاببات، خۆی گونـاهی تـیادا نییە. [6]ئەوەی لەئەودا بچەسـپێت بـەردەوام نابێـت لەگوناه کردن، ئەوەی بەردەوام بێت لەگوناه کردن نەبینیوەتی‌و نەناسیوەتی.

[7]ڕۆڵــە بچــووکەکان، باکــەس گومـــــڕاتان نـــەکات، ئــــەوەی ڕاســـــتودروســـــتی بکـــــات ڕاســـتودروســـتە، وەك چـۆن ئــەو ڕاســتودروســتە. [8]ئــەوەی گونــاه بکات ئەوە لەشەیتانە، چونکە شەیتان لەســـــەرەتاوە گونـــــاهی کـــــرد، دەرکەوتــنی ڕۆڵـــەی خــوداش بــۆ تـێکدانی کــرداری شــەیتانە. [9]ئەوەی لــەخوداوە بوویێـت بـەردەوام نابێت لــەگوناه کردن، چونکە تۆوی خودا تـــیایدا دەچەســـپێتو ناتوانێـــت بـەردەوامبێت لەگوناەکردن، چونکە لــەخوداوە بـووە. [10]بەمـە ڕۆڵەکانی خـــودا لەڕۆڵـــــەکانی شـــــەیتان جیادەکرێـــــنەوە: ئــــــــەوەی ڕاستودروستی نەکاتو برای خۆی خۆش نەوێت لـەخودا نییە.

**خۆشەویستی یەکتری**

[11]چــونکە ئەمــە ئەو هەواڵەیە کە لەســەرەتا گوێــتان لــێبووە، پێویستە هــەر یەکــەمان ئــەوی تـری خــۆش بوێـت، [12]بەپێچـەوانەی قابیل کەسەر بـە خـراپەکار [شەیتان] بوو، براکەی خـۆی کوشـت. باشـە بـۆ کوشتی؟ چـونکە کارەکانی ئەو خراپ بوونو کارەکـانی بـراکەی ڕاستودروست بـوون. [13]بـراکانم لاتـان سـەیر نەبێ گەر جیهان ڕقی لێتان بێتەوە. [14]ئێمە دەزانـین لـەمــردنەوە بــەرەو ژیـــان گواســـترابینەوە، چـــونکە بـــراکانمان خۆش دەوێت. ئەوەی براکەی خۆش نەوێـت لـەمردن دەمێنێتەوە. [15]ئەوەی ڕقی لەبراکەی بێتەوە بکوژە، دەزانن ژیـانی هەتاهـەتایی لەهـیچ بکوژێـك جـێگیر نابێـت. [16]بەمە خۆشەویستی فـێر بووین، عیسـای مەسـیح ژیانی خۆی لەپێناوی ئێمە بەخشی، پێویستە ئـێمەش ژیانی خۆمان لەپێناوی برایان ببەخشـین. [17]بــەڵام ئــەوەی مــاڵی دونـیای پێدرابێـتو بـراکەی خـۆی بەنەداری بینیو دڵی خۆی ڕەقکرد، ئایـا چۆن خۆشەویستی خودای تیادا جێگیر دەبێت؟ [18]ڕۆڵە بچووکەکانم، تـەنها بەووشـەو زمـان خۆشەویستی مەکەن، بەڵکو بەکردەوەو بەڕاستی.

[19]ئـیتر بـەم شێوەیە دەزانین چۆن ئـێمە سـەر بەڕاسـتین، هەروەها چۆن دڵمـان لــەئامادەبوونی ئـەو ئاسوودە دەبـــێ. [20]چـــونکە گـــەر دڵمـــان تاوانــبارمان بکـــات، ئــەوا خـــودا لــەدڵمان گەورەتـرەو هـەموو شتێك دەزانێـــت. [21]خۆشەویســـتان، گـــەر

دڵمـان سـەرکۆنەمان نـەکات، ئـەوا لەبـەردەم خـودا باوەڕمـان بەخۆمان دەبێت، [22]هەرچیەکی لیّ داوا بکەین بۆمان جیّبەجیّ دەکات، چونکە کار بە ڕاسپاردەکانی دەکەین‌و ئەو کارانە دەکـەین کـە بەدڵـیەتی‌و پەسـەندی دەکـات. [23]ئەمەش ڕاسپاردەکەیەتی، باوەڕمـان بـەناوی عیسـای مەسیحی ڕۆڵەکـــەی هەبێـــت‌و یـــەکتریمان خۆش‌بوێت، هەروەك ڕایسپاردووین. [24]ئـەوەی کار بەڕاسپاردەکانی خودا بکـات، ئـەوا لـەخودا دەچەسپێت‌و خـوداش لـەو دەچەسـپێت، بەمـەش دەزانـین ئـەو لەئێمە چەسپاوە، بەو ڕۆحەی پێی‌داوین.

## تاقی‌کردنەوەی ڕۆح

# 4

خۆشەویستان، بڕوا بەهەموو ڕۆحێك مەکـەن، بەڵکو تاقییان بکەنەوە بزانن ئەوانە لەلایەن خوداوەن، چونکە زۆر پێغەمـبەری درۆزن هاتوونەتە جیهان. [2]ڕۆحـی خـودا بەمە دەناسنەوە: هەر ڕۆحێك دان بـەوە بنێت کە عیسای مەسیح لە لەشەوە بۆ جیهان هاتووە، ئـەو ڕۆحـە لەلایەن خوداوەیە، [3]هەر ڕۆحێکـیش دان بەعیسـا نەنێـت لەلایـەن خـوداوە نیـیە. ئـەو ڕۆحـە دژەمەسـیحە بیسـتوتانە دێـت‌و ئێستا هاتووەتە جیهان.

[4]ئـێوە سـەر بـەخودان ئەی ڕۆڵە بچـووکەکان، ئـێوە ئـەو ڕۆحانـەتان بـەزاندووە، چـونکە ئـەو ڕۆحـەی لەئـێوەدایە مـەزنترە لـەو ڕۆحـەی لەجـیهاندایە. [5]ئـەو ڕۆحانـە سـەر بەجـیهانن، بۆیـە ئەوەی دەیلێن سەر بەجـــیهانەو جـــیهان گوێـــیان لـێ‌دەگرێـت. [6]بـەڵام ئـێمە سـەر بـەخوداین‌و ئـەوەی خـودا بناسـێت گوێمان لێ‌دەگرێت، هەروەها ئەوەی لـەخودا نەبێـت گوێمان لێ‌ناگرێت، بەمـە ڕۆحی ڕاست‌و ڕۆحی گومڕایی دەناسین.

## خودا خۆشەویستییە

[7]خۆشەویستان، بایەکتریمان خۆش بوێـــت، چـــونکە خۆشەویســـتی لـەخوداوەیـەو ئـەوەی بەرامبەرەکەی خـــۆش بوێـــت خـــودا دەناســـێت‌و لەخودا بووە. [8]ئەوەش بەرامبەرەکەی خۆش نەوێت خودا ناناسێت، چونکە خـودا خۆشەویسـتییە. [9]بـەم شێوەیە خۆشەویســـتی خـــودا لەنـــێوانمان ڕاگەیـێنرا، کـە ڕۆڵە تاقانەکەی خۆی

ناردە جيهان تا بەهۆيەوە بژين. [10] خۆشەويستى لەمە دايە، نەك لەبەرئەوەى خودامان خۆشويستووە، بەڵكو ئەو خۆشىويستووين‌و ڕۆڵەكەى خۆى نارد تا ببێتە كەفارەتى گوناهەكانمان.

[11]خوَشةويستان طةر خودا بةم شيَوةية ئيَمةى خوَشويستبيَت، ثيَويستة لةسةرمان يةكتريمان خوَش بويَت. [12]كةس هةرطيز خوداى نةديوة طةر يةكتريمان خوَشبويَت خودا دةضةسثيَت لةناومان‌و خوَشةويستيةكةى لةناومان تةواوة.

[13]بەم شێوەيە دەزانين ئێمە لەخودا دەچەسپێين‌و ئەويش لەئێمە، چونكە ئەو لەڕۆحى خۆى پێمانى داوە. [14]ئێمەش بينيمان‌و شايەتى دەدەين باوكى ئاسمانى ڕۆڵەى وەك ڕزگاركەرى جيهان ناردووە. [15] ئەوەى دان بنێت عيسا ڕۆڵەى خودايە، خودا لەئەودا دەچەسپێت‌و ئەويش لەخودا. [16]ئەو خۆشەويستيەى خودا كە تيامانداية ناسيومانەو باوەڕمان پێى كردووە.

خودا خۆشەويستييەو ئەوەى لەخۆشەويستى بچەسپێت لەخودا دەچەسپێت‌و خوداش لەئەودا دەچەسپێت. [17]خۆشەويستى بەم شێوەيە تيامان تەواوە، تا لەڕۆژى لێپرسينەوە باوەڕمان بەخۆمان هەبێت، چونكە ئەو چۆن بوو ئێمە وەك ئەو لەم جيهانەداين. [18] خۆشەويستى ترسى تيادا نييە، بەڵكو خۆشەويستى تەواو ترس دەردەكاتە دەرەوە، چونكە ترس لەسزا دايە، بەلام ئەوەى بترسێت، لەخۆشەويستى تەواو نەبووە.

[19]ئێمە خۆشەويستيمان تيادايە، چونكە ئەو پێشتر خۆشىويستووين. [20]گەر بێتوو يەكێك بڵێت: (خودام خۆش دەوێت)و ڕقى لەبراكەى بێتەوە، ئەوە درۆزنە، چونكە گەر يەكێك براكەى خۆى خۆشنەوێت كە دەيبينێ، چۆن دەتوانێ خوداى خۆش بوێت كە نەيبينيوە. [21]ئێمە لەئەوەوە ئەم ڕاسپاردەيەمان پێدراوە، ئەوەى خوداى خۆشبوێت پێويستە براكەى خۆشبوێت.

## باوەڕهێنان بەمەسيح

# 5

ئەوەى بڕواى بەوە هەبێت كە عيسا

مەسیحە، ئەوە لەخوداوە بووە، هەروەها ئەوەی باوکی خۆش بوێت، ئەوا ئەوەشی خۆش دەوێت کە لێی بووە. [2]بەمە دەزانین ئێمە منداڵەکانی خودامان خۆش دەوێت، گەر خودامان خۆش بوێتو کار بەڕاسپاردەکانی بکەین، [3]چونکە ئەمە خۆشەویستی خودایە، کار بەڕاسپاردەکانی بکەین، ڕاسپاردەکانیشی قورس نین. [4]چونکە هەر کەسێك لەخودا لەدایكبوو بێت بەسەر جیهاندا سەر دەکەوێت، ئەوەش بەسەر جیهاندا سەردەکەوێت، باوەڕمانە. [5]کێ دەتوانێت بەسەر جیهان سەربکەوێت؟ جگە لەوەی باوەڕی بەوە هەیە عیسا ڕۆڵەی خودایە.

[6]ئەمە عیسای مەسیحە، ئەوەی بەئاو و خوێن هاتووە، نەك تەنها بەئاو، بەڵکو بەئاو و بەخوێن. ڕۆحیش شایەتی دەدات، چونکە ڕۆح ڕاستییە. [7]ئەوانەی لەزەوی شایەتی دەدەن سیانن: [8]ڕۆحو ئاو و خوێن، ئەو سیانەش یەك شایەتییان هەیە.

[9]گەر ئێمە بە شایەتی خەڵك ڕازی بین، ئەوا شایەتی خودا گەورەترە، چونکە ئەمە شایەتی خودایە سەبارەت بەڕۆڵەکەی داویەتی. [10]ئەوەی باوەڕ بەڕۆڵەی خودا بهێنێ ئەم شایەتییە لە دڵیدایە، ئەوەش باوەڕ بەخودا نەکات ئەوا بەدرۆی دەخاتەوە، چونکە باوەڕ بەو شایەتییە ناکات کە خودا سەبارەت بەڕۆڵەکەی داویەتی. [11]ئەمەش شایەتیەکەیە، خودا ژیانی هەتاهەتایی پێ داوینو ئەو ژیانەش لە ڕۆڵەکەی دایە. [12]ئەوەی ڕۆڵەکەی هەبێت ژیانی هەتاهەتایی دەبێتو ئەوەش ڕۆڵەی خودای نەبێت، ئەوا ژیانی نابێت.

**دڵنیایی ژیانی هەتاهەتایی**

[13]ئەمە بۆ ئێوە دەنووسم تا بزانن ژیانی هەتاهەتاییتان هەیە، ئێوە کە باوەڕتان هەیە بەناوی ڕۆڵەی خودا. [14]ئەمەش ئەو باوەڕو متمانەیەیە کە هەمانە بەو، گەر بەپێی ویستی خۆی داوای هەر شتێك بکەین گوێمان لێ دەگرێت. [15]گەر بزانین هەرچییەك داوا بکەین گوێمان لێدەگرێت، دەزانین ئەوەی داوامان کردووە لێی دەستمانکەوتووە. [16]گەر یەکێك براکەی ببینێت گوناهێك ناکات بۆ

مردن بێت، پێویستە لەسەری لەخودا بپاڕێتەوە بۆ براکەی. خوداش ژیان بەو کەسانە دەدات کە گوناە بۆ مردن ناکەن. گوناە هەیە بۆ مردنە، لەپێناوی ئەمە نالێم داوا بکرێت. [17] هەموو تاوانێك گوناهەو گوناهیش هەیە بۆ مردن نییە.

[18] دەزانین هەر کەسێك لەخوداوە لەدایكبوو بێت بەردەوام نابێت لەگوناەکردن، چونکە ڕۆڵەی خودا دەیپارێزێ‌و ناهێڵێ بەدکار دەستی پێی بگات. [19] دەزانین ئێمە لەخوداوەین‌و هەموو جیهان لەژێر دەستی خراپەکار [شەیتان] دانراوە. [20] هەروەها دەزانین ڕۆڵەی خودا هات‌و چاوی کردینەوە تا خودای ڕاستی بناسین‌و ئێستا لەئەو دەژین، لەعیسای مەسیح کە ڕۆڵەیەتی. ئەمە خودای ڕاست‌و ژیانی هەتاهەتاییە. [21] ڕۆڵە بچووکەکان، خۆتان لەبتەکان بپارێزن.

# دووەم نامەی یۆحەننا

*ئـەم نامەیـە بانگـەوازە بـۆ هەڵـسـوکەوت کـردن لەڕاسـتی، هـەروەها ئاگادارکـردنەوەیە لـەو مامۆسـتا درۆزنانـەی دەگـەڕێن تـا بـاوەڕداران لەماڵەکانیان پێشوازییان لیّنەکەن.*

[1]لەپیرەکـەوە بـۆ ئـەو خانمـەی هەڵبژێرراوەو بۆ ڕۆڵەکـانیشی، کە بەڕاسـتی خۆشـم دەوێـن، نـەك من بەتەنها بەڵکو هەموو ئەوانەی ڕاستی دەناسـن، [2]لەپێناوی ئـەو ڕاسـتیەی لـەناومان جـێگیر دەبێـتو تاهەتایـە لەگـەڵمان دەبێـت. [3]بەرەکـەتو بـەزەیيو ئاشـتی خـودای بـاوکی ئاسمـانیو عیسـای مەسـیحی ڕۆڵەکەی، بەڕاستیو بەخۆشەویستی لەگەڵماندا دەبێت.

**ڕاستیو خۆشەویستی**

[4]زۆر دڵخـۆش بـووم کـە زانـیم هـەندێك لەڕۆڵەکانت هەڵسوکەوت لەڕاستی دەکەن، وەك ئەوەی باوکی ئاسمـانی ڕایسـپاردین. [5]ئێسـتا ئـەی خـانم، مـن ڕاسپاردەیەکی نوێـت بۆ نانووسـم، بـەڵکو وەك ئـەوەی لەسـەرەتا گوێمـان لـێبووە، داوات لێدەکـەم یـەکترمان خـۆش بوێت. [6]چونکە خۆشەویستی ئەمەیە کە بەپێی ڕاسـپاردەکانی خـودا هەڵسوکەوت بکـەین، ڕاسـپاردە ئەمەیـە، کـە لەسـەرەتا گوێـتان لـێبووە، پێویستە بەخۆشەویستی هەڵسوکەوت بکەن.

**ئاگاداری گومڕاییکەران بن**

[7]چـونکە گومـڕاییکەری زۆر هاتوونـە جیهانو دان بـەوەدا نانێن عیسای مەسیح لەلەشدا بووە، ئەوانە گومـڕاییکەرو دژەمەسـیحن. [8]تەماشـای خۆتـان بکـەن، تـا ئەوەی کـردووتانە لەدەسـتتان نەچـێت، بـەڵکو پاداشـتێکی تـەواوی لێ بەدەسـت بهێـنین. [9]هـەر کەسـێك دەسـتدرێژی بکاتو لەڕێنماییەکانی مەسیح جـێگیر نەبێت، ئەوا لەخودا نیـیە. بـەڵام هـەر کەسـێك لـەو ڕێنمایـیانە جـێگیر بێت، ئەوا باوکی ئاسمانیو ڕۆڵەکەی هەیە.

[10]گەر یەکێك بۆلاتان بێتو ئەو

ڕێنمایـیانەتان پیٚڕانەگەیٚنیٚت، ڕیٚگای پـیٚ مـەدەن بیٚـتە مالـٚتانو پیٚشوازی لـیٚمەکـەن. [11]چونکە هەر کەسیٚك پیٚشـــوازی لـــیٚبکـــات لـــەکارە خراپەکانی بەشداری دەکات.

## کۆتایی

[12]زۆر شتم هەیە بۆتانی بنووسم، بـەلاٚم پـیٚم خـۆش نییە بەمەرەکەبو لەســەر کاغــەز بیٚــت، چــونکە ئـومـیٚدەوارم بـۆ لاتـان بـیٚم، تـا ڕووبـەڕوو قسـە بکـەین، بۆ ئەوەی خۆشـیەکەمان پـڕو تـەواو بیٚت. [13]ڕۆلـــــەکانی خوشـــــکە هـەلـٚـبژیٚرراوەکەت سـلاٚوت لـیٚ دەکەن.

# سێهەم نامەی یۆحەننا

*نامەی سێیەمی یۆحەننا بۆ شوانی یەکێ لەکۆمەڵە باوەڕدارەکانە کە ناوی غایس بوو، ستایشی دەکات چونکە یارمەتی هەموو ئەو باوەڕدارانەی داوە کەخزمەتی ووشەی خودایان دەکرد، ئاگاداری دەکاتەوە لەپیاوێك ناوی دیوتریفسە.*

**هەڵسوکەوت لەڕاستی**

لەپیرەکەوە، بۆ غایسی خۆشەویست کە بەڕاستی خۆشم دەوێت.

[2]خۆشەویستم، هیوادارم لەهەموو شتێك سەرکەوتوو بیتو تەندروستیت باش بێت، هەروەك ڕۆحت باشو تەواوە. [3]چونکە زۆر دڵخۆشبووم بەوەی چەند برایەك هاتنو باسی دلسۆزی تۆیان کرد بۆ ڕاستی، هەروەها چۆن لەڕاستی هەڵسوکەوت دەکەیت. [4]خۆشی لەمە گەورەترم نیە کاتێك گوێم لێبێت ڕۆڵەکانم هەڵسوکەوت لەڕاستی دەکەن.

[5]خۆشەویستم تۆ هەموو شتێك بۆ براکانتو ئەو کەسانەی نایانناسیت بەسەرڕاستیەوە دەکەیت، [6]ئەوانەی لەبەردەم کۆمەڵی باوەڕداران شایەتییان لەسەر خۆشەویستی تۆ داوە، ئەوانەی باش دەکەیت بەو شێوەیە بەڕێیان دەکەیت کە خودا پێی خۆشە. [7]چونکە لەپێناوی ناوی مەسیح هاتوونە دەرەوەو هیچ شتێك لە بێباوەڕان وەرناگرن. [8]بۆیە پێویستە پێشوازی لەکەسانی وەك ئەوانە بکەین تا بەیەکەوە کار بکەین بۆ ڕاستی.

[9]هەندێ شتم بۆ کۆمەڵی باوەڕداران نووسیوە، بەڵام دیوتریفس کە دەیەوێت خۆی بکات بە یەکەم لەنێوانیان، پێمان ڕازی نابێت. [10]بۆیە گەر هاتم هەموو کردەوەو قسە خراپەکانی سەبارەت بەمنی ووتوە دەریدەخەم، هەروەها بەوەش نەوەستاوە، بەڵکو نایەوێ پێشوازی لەبرایان بکاتو هەر یەکێك پێشوازیان لێبکات، ڕووبەڕووی دەبێتەوەو لەکۆمەڵە

دەری‌دەکات.

**دوای خراپە مەکەوە بەڵکو چاکە**

[11]خۆشەویستم، دوای خراپە مەکەوە بەڵکو چاکە، چونکە ئەوەی چاکە بکات لەخودایە، ئەوەش خراپە بکات خودای نەبینیوە. [12]دیمتریوس لەلایەن هەموو کەسێک‌و لەلایەن ڕاستیشەوە شایەتی بۆ دراوە، منیش هەروەها شایەتی بۆ دەدەم‌و ئێوەش دەزانن شایەتی من ڕاستە. [13]زۆر شت هەبوو بۆتانی بنووسم، بەڵام نامەوێ بەقەڵەم‌و مەرەکەب بێت. [14]بەڵکو ئومێدەوارم بەم زووانە بتبینم تا ڕووبەڕوو قسە بکەین.

[15]داوای ئاشتیت بۆ دەکەم. برادەران سڵاوت لێ‌دەکەن. تۆش سڵاو لەیەکە یەکەی برادەران بکە.

## نامەی یەهوزا

*ئـەم نامەیـە ئاگادارکردنەوەیە لـەمامۆستا درۆزنەکان. هەروەها هاندانە بۆ بـاوەڕداران تابـەردەوام تێبکۆشن لـەپێناوی فێرکردنی باوەڕ، ئەو فێرکردنەی خودا بەتەواوی پێی داون.*

لـەیـەهوزای بـەندەی عیسـای مەسـیحو بـرای یـاقوب، بـۆ بـانگ کـراوە خۆشەویسـتەکانی خـودای بـاوكو پارێـزراوەکان بـۆ عیسـای مەسـیح: [2]بـەزەیی‌و ئاشـتی‌و خۆشەویستیتان بەسەردا بڕژێت.

### تێکۆشان لە پێناوی باوەڕ

[3]خۆشەویسـتانم لـەکاتـێکدا زۆر بەپەرۆشم لەبارەی ئەو ڕزگاربوونەی ئێوە هاوبەشمانن تیایدا، بۆتان بنووسم، ناچـار ئێسـتا دەربـارەی تێکۆشـان لـەپێـناوی ئـەو بـاوەڕەی جـارێك بەخوشـكو بـرا پیرۆزەکـان دراوە دەنووسـم. [4]چـونکە کەسـانێك بەدزیـەوە هاتوونـە ناوتـان، بێگومان تووشی ئەو سزایە دەبن کە لـەکۆنەوە بۆیـان نووسراوە، ئەوانە خوانەناسن‌و بەرەکـەتی خـودا دەگـۆڕن بـۆ بـەڕەڵڵایی، تەنانـەت نکۆڵی دەکەن لـەگـەورەو خوداوەندمان کە عیسای مەسیحە.

### سزای مامۆستا درۆزنەکان

[5]جـا دەمەوێـت ئـەوەتان بـیر بخەمـەوە، کـە خۆتـان دەیزانن، پاش ئـەوەی خوداوەنـد گـەلی لـەخاکی میسـر ڕزگارکـرد، ئەوانـەی بـێ بـاوەڕبوون لـەناوی‌بردن. [6]هەروەها ئەو فریشـتانەی شـوێنەکـانی خـۆیان نەپاراسـتو بەجێـیانهێشت، خودا بەکۆتی هـەتاهـەتایی تا ڕۆژی مەزنی لێپرسـینەوە لـەقوولایی تاریکـیدا دەیانهێلێـتەوە، [7]هـەروەها شـاری سـەدومو عـەمورەو شـارەکانی دەوروبـەریان لـەسـەر هـەمان ڕێگای ئـەوان داوێـن‌پیسییان کـردو دوای هەوەسبازی لـەش کەوتن بەشێوەیەکی ناسروشتی، جا بەئاگرێکی هەتاهەتایی سزادرانو بوون بەپەند.

[8]بەهـەمان شـێوە خـەیاڵخاوەکان لـەش گلاو دەکەنو دەسەلاتی خودا ڕەت دەکـەنـەوەو بوخـتان بـۆ

شکۆداره ئاسمانیەکان هەڵدەبەستن. [9] بەڵام میکائیلی سەرۆکی فریشتەکان، کاتێك دژایەتی شەیتانی کرد سەبارەت بە تەرمەکەی موسا، نەیوێرا بەووتەی ناشرین وەڵامی بداتەوە، بەڵکو ووتی: (با خوداوەند سەرزەنشتت بکات!) [10] بەڵام ئەوانە بەسووکی ناوی شتێك دەبەن کە نایزانن، بەبێ‌عەقڵی وەکو ئاژەڵ دوای ئارەزووی خۆیان دەکەون. ئەمەش دەبێتە هۆی لەناوبردنیان.

[11] خاكبەسەر ئەوانە، چونکە ئەوانە ڕێگای قابیلیان گرتووەو لەپێناوی برێك دەسکەوت خۆیان داوەتە دەست گومڕایی بەلعامەوەو* لەیاخی بوونەکەی قورەح* لەناودەچن.

[12] ئەوانە نیشانەی شەرمەزارین لەداوەتەکانی خۆشەویستی، بەچاونەترسی نانتان لەگەڵ دەخۆن، تەنها خزمەتی خۆیان دەکەن، ئەوانە هەوری بێ‌ئاون بە با دێنو دەچن، داری بێ‌بەری پایزانن، دوو جار مردوونو ڕەگیان هەڵکەنراوە، [13] شەپۆلی دەریای هەڵچوون بەکەفی شەرمەزاری، ئەستێرەی وونبوون کە تاهەتایە لەتاریکیدا دەمێننەوە.

[14] ئەخنوخی نەوەی حەوتەم لەئادەمەوە، لەبارەی ئەوانەوە پێشبینی کرد: (ئەوەتا خوداوەند لەگەڵ هەزاران لەپیرۆزکراوەکان دێت، [15] تا حوکم بەسەر هەمووان بداتو هەموو خوانەناسەکان سەرزەنشت بکات، لەبەر هەموو ئەو کردارە خوانەناسیانەی کردوویانە لەڕێبازی خوانەناسیو ئەو قسە ڕەقانەی دژی خودا ووتویانە ئەو خوانەناسانە.) [16] ئەوانە بۆڵەبۆڵکەرو گلەییکەرنو دوای ئارەزووە خراپەکانی لەشیان کەوتوونو خۆ بەگەورە دەزاننو لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیان دووڕوویی بۆ خەڵکی دەکەن.

**خۆتان بنیاد بنێن**

[17] بەڵام ئێوە ئەی خۆشەویستان، قسەکانی نێرراوانی خوداوەند عیسای مەسیح بهێننەوە یاد. [18] ئەوانە بەئێوەیان ووت: (لەکۆتایی زەمان، هەندێ گاڵتەجاڕ پەیدا دەبنو دوای مەبەستە خوانەناسەکانیان دەکەون.) [19] ئەوانە دووبەرەکی دروست دەکەن، خۆشیان خەڵکی دونیاینو ڕۆحیان تیادا نییە.

[20]بەلاَم ئێوە خۆشەویستانم خۆتان لەسەر باوەڕی پیرۆزتان بنیاد بنێن‌و لەرۆحی پیرۆزدا نوێژ بکەن، [21]لەناو خۆشەویستی خودا خۆتان بپارێزن‌و چاوەڕوانی بەزەیی عیسای مەسیحی خوداوەندمان بکەن بۆ ژیانی هەتاهەتایی. [22]بەزەییتان بەو کەسانە بێتەوە کە گومان دەکەن. [23]هەندێکیش لەئاگر بڕفێنن‌و ڕزگاریان بکەن، بۆ هەندێکیشیان بەترسەوە بەزەیی بنوێنن، تەنانەت ڕقیشتان لەو بەرگانە بێ کە بە لەش گلاَو بوون.

[24]ئێستاش بۆ ئەوەی توانای هەیە بتانپارێزێ لەکەوتن، هەروەها لەبەردەم شکۆمەندیەکەی ڕاتان بگرێ بەخۆشی‌و بەبێ کەم‌وکوڕی، [25]بۆ تاکە خودای ڕزگارکەرمان، شکۆمەندی‌و مەزنی‌و هێزو دەسەلاَت بەهۆی خوداوەندمان عیسای مەسیح، لەپێش زەمانەو ئێستاو تاهەتایە. ئامین.

# بینینی یۆحەننا

*بینینی یۆحەننا لەوکاتە نووسراوە کە باوەڕداران تووشی چەوساندنەوە دەهاتن لەبەر باوەڕیان بەعیسای مەسیح. نووسەری ئەم پەرتووکە گرنگی بەهیواو ئاوات‌و سووربوون لەسەر باوەڕ لەکاتی ئازارو گرژیدا دەدا.*

*ئەم بینینە لەزنجیرە بینینێك پێك‌دێت، نووسەر بەشێوەیەکی ڕەمزی نووسیویەتی کە تەنها باوەڕداران بەمەسیح تێیدەگەیشتن لەو سەردەمە. لەگەڵ ئەوەی جیاوازی هەیە لەڕوون‌کردنەوەی بابەتەکانی ئەم بینینە، بەڵام بیرۆکە سەرەکییەکەی دیارە. ئەویش ئەمەیە: خودا لەکۆتاییدا بەعیسای مەسیح بەسەر دوژمنی سەرەکی سەردەکەوێت کە شەیتانە، پاداشتی گەلە سەرڕاستەکەشی دەداتەوە بەبەرەکەتی ئاسمانی نوێ‌و زەوی نوێ کاتێ سەرکەوتنی تەواو بەدەست دێت.*

**پێشەکی**

# 1

ئەمە ئەو بینینەیە کە خودا بەعیسای مەسیحی داوە تا بۆ بەندەکانی ئاشکرا بکات، ئەو ڕووداوانەی دەبێ لەماوەیەکی نزیکدا ڕووبدەن، بەفریشتەیەکی خۆی بۆ یۆحەنای بەندەی خۆی نارد. [2]یۆحەننا گەواهی لەسەر ووشەی خوداو شایەتی عیسای مەسیح‌و هەموو ئەو ڕووداوانە دەدات کە بەچاوی خۆی بینیویەتی. [3]خۆزگە دەخوازرێ بەوانەی ووشەکانی ئەم پێشبینییە دەخوێننەوەو ئەوانەش کە دەیبیستن‌و ڕەچاوی دەکەن، چونکە کاتەکە نزیك‌بووەتەوە.

**سڵاو بۆ کۆمەڵە باوەڕدارەکان**

[4]لەیۆحەنناوە، بۆ حەوت کۆمەڵە باوەڕدارەکەی هەرێمی ئاسیا: بەرەکەت‌و ئاشتیتان لەگەڵ بێت، لەلایەن ئەوەی هەیەو هەبووەو دێت، هەروەها لەو حەوت ڕۆحەی لەبەردەم تەختەکەیدان. [5]هەروەها لەعیسای مەسیحی شایەتی دڵسۆزەوە، کە یەکەم کەسە لەنێو مردووواندا هەستێتەوە، سەرۆکی پادشاکانی سەر زەویە.

ئەوەی ئێمەی خۆش‌دەوێ‌و بەخوێنی خۆی ئازادی کردین لەگوناهەکانمان‌و [6]ئێمەی کردە

پادشاو کاهینی خودای باوکی، بۆ ئەوە شکۆو دەسەلاتی هەتاهەتایی! ئامین.

[7] ئەوەتا ئەو بەسەر پەڵەهەورەکانەوە دێتو هەموو کەسێك دەیبینێ، تەنانەت ئەوانەش کە لەخاچیاندا، هەروەها هەموو خێڵەکانی زەوی شیوەنی بۆ دەگێڕن. ئامین.

[8] خوداوەند خودا دەڵێ: (من ئەلفو یێم، ئەوەی هەیەو هەبووەو دێت، توانادار بەسەر هەموو شتێك.)

**بینینی مەسیحی زیندوو**

[9] من یۆحەنای براتانم، هاوبەشتانم لەتەنگانەو پادشاهێتیو دانگرتنی عیسا، لەپێناو ووشەی خوداو شایەتی عیسا لەدوورگەیەك بووم بەپەتمۆس ناودەبرا. [10] من لەڕۆژی خوداوەند لەرۆحدا بوومو لەپشتمەوە گوێم لەدەنگێکی گەورە بوو لەدەنگی کەڕەنا دەچوو، [11] دەیووت: (ئەوەی دەیبینی لەپەرتووکێك بینووسەو بۆ حەوت کۆمەڵە باوەڕدارەکە ڕەوانەی بکە، بۆ ئەفەسۆسو سمیرناو پرگامۆسو سیاتیراو ساردسو فیلادەلفیاو لاودیکییە.)

[12] ئاوڕمدایەوە تاسەرچاوەی دەنگەکە ببینم، کاتێك ئاوڕمدایەوە حەوت چرادانی زێڕینم بینی، [13] لەناوەڕاستیان یەکێکی وەك ڕۆڵەی مرۆڤم بینی، جلێکی لەبەردا بوو تاهەردوو پێی شۆڕبووبۆوەو پشتێنێکی زێڕینی لەسینگی بەستبوو، [14] سەرو قژی وەك خوریو بەفر سپیبوونو چاوەکانی وەك گڕی ئاگر وابوون. [15] قاچەکانی وەك مسێکی بریقەدار ئەوەی لەکورەیەکی داخ پوختە کرابێت وابوون، دەنگیشی وەك هاژەی تاڤگە وابوو، [16] لەسەر لەپی دەستی ڕاستی حەوت ئەستێرەی هەڵگرتبوو، شمشێرێکی دوودەمیش لەدەمیەوە دەهاتە دەرەوە، ڕووخساری وەك تیشکی بەتینی ڕۆژ دەدرەوشایەوە.

[17] کاتێك بینیم وەك مردوو لەبەردەم هەردوو پێیدا کەوتم، دەستی ڕاستی خستە سەرمو ووتی: (مەترسە، من سەرەتاو کۆتایم، [18] من ئەوەم کە زیندووم، من مردووبووم، بەڵام ئێستا تاهەتایە بەزیندوویی دەمێنمەوە. کلیلەکانی مردنو دونیای مردووان لەدەست منن. [19] لەبەرئەوە ئەوەی بینیت بینووسە

ئەوەی هەیەو ئەوەی پاش ئەویش دەبێت. [20]نهێنی ئەو حەوت ئەستێرەیەی لەدەستی ڕاستم بینیتو نهێنی حەوت چرادانە زێڕینەکە ئەمەیە: حەوت ئەستێرەکە فریشتەی حەوت کۆمەڵە باوەڕدارەکەن، حەوت چرادانەکەش حەوت کۆمەڵەکەن.

### نامەیەك بۆ کۆمەڵەی ئەفەسۆس

## 2

بۆ فریشتەی کۆمەڵە باوەڕدارەکەی ئەفەسۆس بنووسە: ئەوەی حەوت ئەستێرەکەی بەدەستی ڕاستی گرتووەو بەناو حەوت چرادانە زێڕینەکە هاتووچۆ دەکات، [2]دەڵێت: (من ئاگام لەکردارو ماندوویێتیو ئارامگرتنتە، هەروەها چۆن لەتواناتدایە خراپەکاران ڕەتبکەیتەوە، تۆ ئەوانەت تاقیکردەوە کە دەیانووت: (ئێمە نێرراوین)، نێرراویش نەبوون، پاشان بەدرۆزن دەرچوون، [3]تۆ ئارامت‌گرتو دانت‌بەخۆت گرت، ماندوونەناسانە لەپێناوی ناوی من تێدەکۆشای. [4]بەڵام گلەیی ئەوەت لێدەکەم، تۆ وازت لەخۆشەویستیەکەی جاران هێناوە. [5]بەبیرت بێتەوە لەچ پایەکی بەرز کەوتیت! تۆبە بکەو کارەکانی یەکەمجارت ئەنجام بدەوە. گەر بێتو تۆبە نەکەی، بەم زووانە دێمە لاتو چرادانەکەت لەشوێنی خۆی لادەدەم. [6]بەڵام تۆ شتێکت هەیە، وەك من ڕقت لەکردەوەکانی نیقۆلاویەکان دەبێتەوە. [7]ئەوەی گوێی هەیە، باگوێ لەووتەی ڕۆح بگرێت بۆ کۆمەڵەکان: ئەوەی سەرکەوێت من ڕێگای پێدەدەم لەبەری درەختی ژیان بخوات ئەو درەختەی لەناو بەهەشتی خودا دایە.)

### نامەیەك بۆ کۆمەڵەی سمیرنا

[8]بۆ فریشتەی کۆمەڵە باوەڕدارەکەی سمیرنا بنووسە: ئەوەی سەرەتاو کۆتاییە، ئەوەی مردوو بوو و زیندووبووەوە، دەڵێت: [9](من ئاگام لەتەنگانەو هەژاریتە، بەڵام تۆ دەوڵەمەندی، هەروەها ئاگام لەبوختانی ئەوانەیە کە دەڵێن جوولەکەینو جوولەکەنین، ئەوانە کەنیشتی شەیتانن. [10]هەرگیز مەترسە لەو ئازارانەی بۆت دێت. شەیتان خەریکە هەندێکتان بخاتە زیندانەوە تا

تاقیبکرێنەوە، هەروەها بۆ ماوەی دە ڕۆژ دووچاری ئەشکەنجە دەبنەوە. تا مردن دڵسۆزبە، منیش تاجی ژیانت پێدەبەخشم. [11]ئەوەی گوێی هەیە، باگوێ لەووتەی ڕۆح بگرێت بۆ کۆمەڵەکان: ئەوەی سەربکەوێت، مردنی دووەم ئازاری نادات.)

**نامەیەك بۆ کۆمەڵەی پرگامۆس**

[12]بۆ فریشتەی کۆمەڵە باوەڕدارەکەی پرگامۆس بنووسە: ئەوەی شمشێرە دوودەمەکەی هەیە دەڵێت: [13](من ئاگادارم تۆ لەو ناوچەیە دەژی کە تەختی شەیتانی تیادایە. لەگەڵ ئەوەشدا دان بەناوی من دەنێیتو باوەڕی منت ڕەتنەکردۆتەوە، تەنانەت لەو ڕۆژانەش کە ئەنتیپاسی شایەتی دڵسۆزم لاتان شەهیدکرا، لەو شوێنەی شەیتان تیایدا نیشتەجێیە. [14]بەڵام گلەییەکی بچووکم لێت هەیە: ئەویش هەندێ کەس لەناوچەکەت هەن پابەندن بەڕێنمایی بەلعامەوە، ئەوەی بالاقی فێردەکرد بەردی کۆسپ لەبەردەم ڕۆڵەکانی ئسیرائیل دابنێت بۆ ئەوەی ئەو قوربانیانە بخۆن کە بۆ بتەکان سەر بڕابوونو داوێن پیسی بکەن. [15]بەهەمان شێوە لای تۆش هەندێك هەن پابەندەن بە فێرکردنەکانی نیقۆلاوییەکان. [16]بۆیە تۆبە بکە، ئەگینا بەم زووانە دێمەوەو بەشمشێرەکەی دەمم لەگەڵیاندا دەجەنگم. [17]ئەوەی گوێی هەیە، باگوێ لەووتەی ڕۆح بگرێت بۆ کۆمەڵەکان: ئەوەی سەربکەوێت ڕێگای پێدەدەم لەمەنی شاراوە بخوات، هەروەها بەردێکی سپی پێدەدەم کە ناوێکی نوێی لەسەر نووسراوە جگە لەو کەسەی پێی دەبەخشرێ کەس نازانێ چییە.)

**نامەیەك بۆ کۆمەڵەی سیاتیرا**

[18]بۆ فریشتەی کۆمەڵە باوەڕدارەکەی سیاتیرا بنووسە: ڕۆڵەی خودا، ئەوەی دوو چاوی هەیە وەك گڕی ئاگرەو پێیەکانی وەك مسی بریقەدارە، دەڵێت: [19](من ئاگاداری کارو خۆشەویستیو خزمەتو باوەڕو دانبەخۆگرتنتم. کارەکانی ئەم دوایەت لەوانەی یەکەمجارت زیاترن. [20]بەڵام ئەم گلەییەم لێت هەیە: تۆ ڕێت بەو ژنە داوە کە ناوی ئیزابیلەو بانگێشتەی پێغەمبەرێتی دەکات، تا بەندەکانی من

فێر بکات‌و چەواشەیان بکات بۆ ئەوەی داوێن پیسی بکەن‌و لەو خواردنانە بخۆن کە کراون بە قوربانی بۆ بتەکان. [21]من ماوەم پێدابوو تا تۆبە لەخراپەکاری بکات، بەڵام نەیویست. [22]ئەوەتا تووشی نەخۆشی دەکەم‌و فڕێی دەدەمە ناو پێخەفەوەو ئەوانەی داوێن پیسییان لەگەڵ کردووە لەتەنگانەیەکی گەورەدان، گەر تۆبە نەکەن لەکردارییان. [23] هەروەها منداڵەکانی بەمردن لەناودەبەم بۆ ئەوەی هەموو کۆمەڵەی باوەڕداران بزانن من پشکێنەری مێشك‌و دڵەکانم‌و هەر کەس بەپێی کارەکانی خۆی پاداشتی دەدەمەوە. [24]بەڵام بەئێوەو بەوانی دیکەی سیاتیرا دەڵێم، ئەوانەی ئەم ڕێنماییەیان وەرنەگرتووەو بەقوڵایی نهێنییەکانی شەیتانیان نەزانیوە، وەك وا دەڵێن. من قورساییەکی تر ناخەمە سەرشانتان. [25]تەنها ئەوەی هەتانە دەستی پێوە بگرن، تا دەگەمە لاتان. [26]ئەوەی سەربکەوێت‌و کارەکانی من تاکۆتایی جێبەجێ بکات دەسەڵاتی پێدەدەم بەسەر میللەتان. [27]{هەروەها بەگۆپاڵێکی ئاسنین سەرپەرشتی میللەتان دەکات، وەك گۆزەیەك دەیانشکێنێت،} ئەمەش وەك ئەو دەسەڵاتەیە کە من لەلایەن باوکمەوە پێم بەخشراوە. [28]منیش ئەستێرەی بەرەبەیانی دەدەمێ. [29] ئەوەی گوێی هەیە، باگوێ لەووتەی ڕۆح بگرێت بۆ کۆمەڵەکان.)

### نامەیەك بۆ کۆمەڵەی ساردس

## 3

هەروەها بۆ فریشتەی کۆمەڵە باوەڕدارەکەی ساردس بنووسە: ئەوەی کە حەوت ڕۆحی خوداو حەوت ئەستێرەکەی هەیە دەڵێت: (من ئاگاداری کارەکانتم، تۆ بەناو زیندووی، بەڵام تۆ مردووی. [2] ئێشك‌بگرەو ئەوەی ماوە بەهێزی بکە، ئەوەی لەمردن نزیك‌بووەتەوە، چونکە کارەکانتم بەناتەواوی بینی لەبەردەم خودا. [3]بیربکەوە، ئەوەی وەرت‌گرت‌و گوێت لێبوو کاری پێبکەو تۆبە بکە، چونکە گەر بێتو ئێشك‌نەگری ئەوا وەك دزێك دێمە سەرت‌و کاتی هاتنیشم نازانیت. [4] خەڵکێکی کەم لەساردسدا هەن جل‌و بەرگەکانیان گڵاو نەکردووە، ئەوانە شایانی ئەوەن بەبەرگی سپییەوە لەگەڵ من ملی ڕێبگرن. [5]ئەوەی

سەربکەوێت بەرگی سپی دەپۆشێت‌و ناوی لەپەرتووکی ژیان ناسڕمەوەو دان بەناوەکەی‌دا دەنێم لەبەردەم باوکم‌و فریشتەکانی. [6]ئەوەی گوێی هەیە، باگوێ لەووتەی ڕۆح بگرێت بۆ کۆمەڵەکان.)

**نامەیەك بۆ كۆمەڵەی فیلادەلفیا**

[7]هەروەها بۆ فریشتەی کۆمەڵە باوەڕدارەکەی فیلادەلفیا بنووسە: ئەوەی پیرۆزو ڕاستە، کلیلەکەی داودی لەدەستە، ئەوەی دەیکاتەوەو کەس نابێ دایبخات، دایدەخات‌و کەس نابێ بیکاتەوە، دەڵێت: [8](من ئاگاداری کارەکانتم، ئەوەتا دەرگایەکی کراوەم لەبەردەمت کردووەتەوەو کەس ناتوانێ دایبخات. دەزانم تۆ هێزێکی کەمت هەیە، لەگەڵ ئەمەش تۆ بەووشەی من کار دەکەیت‌و ناوی منت ڕەت‌نەکردۆتەوە. [9]من ئاوها لەوانەی کەنیشتی شەیتان دەکەم، ئەوانەی دەڵێن جوولەکەین‌و ئاواش نین، چونکە ئەوانە درۆ دەکەن، وایان لێ‌دەکەم بێن لەبەردەم پێیەکانت کڕنۆش ببەن‌و بزانن تۆم خۆشویستووە، [10]چونکە تۆ بەووشەی دانبەخۆگرتنی من کاردەکەی، منیش لەکاتی هاتنی تاقیکردنەوە بەسەر هەموو جیهان دەتپارێزم، تا دانیشتووانی زەوی تیایدا تاقی‌بکرێنەوە. [11]ئەوەتا من بەخێرایی دێم، دەست‌بگرە بەوەی هەتە، تا کەس تاجەکەت لێ‌نەستێنێ. [12]ئەوەی سەربکەوێت دەیکەمە کۆڵەکەی پەرستگای خودای خۆم‌و لێی ناچێتە دەرەوە، هەروەها ناوی خودای خۆم‌و ناوی شاری خودای خۆم، واتە قودسی نوێ، ئەوەی لەلایەن خودای خۆم لەئاسمان دێتەخوارەوە لەسەری دەنووسم، هەروەها ناوی نوێی خۆمیشی لەسەر دەنووسم. [13]ئەوەی گوێی هەیە، باگوێ لەووتەی ڕۆح بگرێت بۆ کۆمەڵەکان.)

**نامەیەك بۆ كۆمەڵەی لاودیكییە**

[14]بۆ فریشتەی کۆمەڵە باوەڕدارەکەی لاودیکیە بنووسە: ئامین‌و شایەتی دڵسۆزو سەرڕاست کە سەرچاوەی هەموو دروستکراوەکانی خودایە دەڵێت: [15](من ئاگام لەکردەوەکانتە، تۆ نەساردو نەگەرمی. خۆزگە سارد یان

گەرم بووایەی. [16]چونکە تۆ شلەتێنی، نەساردی‌و نەگەرمی، من نیازم وایە لەدەممەوە بتتفێنمەوە. [17] چونکە تۆ دەڵێی: من دەوڵەمەندم‌و پێویستیم بەکەس نییەو پێویستیم بەهیچ شتێك نییە، بەڵام بێ‌ئاگای لەوەی تۆ چەقاوەسوو و نەگبەت‌و هەژارو کوێرو ڕووتی. [18]بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم زێڕی پوختەکراو بەئاگر لەمن بکڕیت تا دەوڵەمەند بیت، جلی سپی لەمن بکڕەو لەبەری بکە، تا شەرمەزاری ڕووتیت داپۆشی، هەروەها مەرهەم بکڕە بۆ چاوەکانت تا ببینی. [19]ئەوانەی خۆشم بوێن سەرزەنشتیان دەکەم‌و تەمێیان دەکەم، بۆیە تۆش دڵگەرم‌بەو تۆبە بکە. [20]ئەوەتا من لەبەر دەرگا وەستاوم‌و لەدەرگا دەدەم، گەر یەکێك گوێی لەدەنگم بوو و دەرگاکەی لێ‌کردمەوە، دێمە ژوورەوەو نانی لەگەڵ دەخۆم، ئەویش لەگەڵ من. [21]ئەوەی سەربکەوێت ڕێگای پێ‌دەدەم لەسەر تەختەکەم لەگەڵ من دانیشێ، هەروەك من سەرکەوتم‌و لەگەڵ باوکم لەسەر تەختەکەی دانیشتم. [22] ئەوەی گوێی هەیە، باگوێ لەووتەی ڕۆح بگرێت بۆ کۆمەڵەکان.)

## بینینی تەختی پادشایانەی خودا

# 4

پاشان تەماشام کرد دەرگایەکی کراوەم بینی لەئاسماندا، ئەو دەنگەش کە یەکەمجار وەك کەڕەنا هاتە بەرگوێم، پێی ووتم: (سەرکەوە بۆ ئێرە تا ئەوەت پیشانبدەم کە دوای ئەمە ڕوو دەدات.) [2]یەکسەر کەوتمە ڕۆحەوەو تەختێکم بینی لەئاسمان دانرابوو، لەسەر تەختەکە یەکێك دانیشتبوو. [3]دانیشتووەکە لەڕوخساردا لەبەردی یەشب‌و یاقوت دەچوو، پەلکە زێڕینەیەکیش لەشێوەی زمرود بەدەوری تەختەکەدا بوو. [4]لەدەوری تەختەکەش بیست‌و چوار تەختی لێ‌بوو. بیست‌و چوار پیریش کە تا هەردوو پییان جلی سپییان لەبەردابوو لەسەر تەختەکان دانیشتبوون‌و تاجی زێڕینیان لەسەر نابوو. [5]لەتەختەکەوە بروسك‌و هەورە تریشقەو دەنگەدەنگ دەهاتن، لەبەردەم تەختەکەش حەوت چرای ئاگرینی بەتین دانرابوو، کە حەوت ڕۆحەکەی خودان. [6]هەروەها لەبەردەم تەختەکە دەریایەکی

شووشـەیی هـەبوو، وەك کریسـتال بوو.

لەدەوروبـەری تەختەکەش چوار زیـندەوەر هـەبوو، لەپـێش‌و لـەپاش بەچـاو داپۆشـرابوون. [7]زیـندەوەری یەکـەم وەکـو شـێر وابـوو، دووەم وەکـو گا، سێیەم دەموچاوێکی وەك مـرۆڤی هەبوو، چوارەم وەك داڵێکی فـڕیو وابـوو. [8]چـوار زیـندەوەرەکە هەریەکـەیان شـەش بـاڵی هـەبوو دەوروبـەرو ناوەوەیـان داپۆشـرابوو بەچـاو، شـەو و ڕۆژ بێ‌وەسـتان دەڵێن: (پیرۆزە، پیرۆزە، پاك‌وپیرۆزە خوداوەنـد خـودای توانـادار بەسەر هـەموو شـتێك، ئـەوەی هەیـەو هـەبووەو دێـت!) [9]لەکاتـێکدا زیـندەوەرەکان سوپاسی دانیشتووی سەر تەختەکە دەکەن‌و شکۆمەندی‌و ڕێـزی بۆ ڕادەگەێنن، ئەوەی تاهەتایە زیـندووە، [10]ئینجا ئەو بیست‌و چوار پـیرەی لەبـەردەم دانیشـتووی سـەر تەخـتەکە دان دەکەونـە سەرچـۆك‌و کـڕنۆش بـۆ زیـندووی هەتاهـەتایی دەبـەن‌و تـاجـەکـانیـان لەبـەردەم تەخـتەکە فـڕێ دەدەن‌و دەڵـێن: [11] (ئـەی خوداوەندمـان‌و خودامان، تۆ شـایانی ئـەوەی شـکۆمەندی‌و ڕێزو توانـا وەرگـری، چـونکە تـۆ دروسـتکەری هـەموو شتێکیت، ئەو شـتانەش بەخواسـتی تۆ بوونی هەیەو دروست بووە.)

## پەرتووك‌و بەرخە سەربڕاوەکە

# 5

لەلای دەستە ڕاستی دانیشتووی سەر تەخـتەکەوە پەرتووکـێکم بیـنی کـە لـەناوەو لەپشـتییەوە نووسـرا بوو و بەحـەوت مۆر مۆرکرابوو. [2]هەروەها فریشـتەیەکی بەهێزم بینی بەدەنگێکی بەرز هاواری دەکرد: (کێ شایستەی ئەوەیـە پەرتووکەکـە بکاتـەوەو مۆرەکـانی بکاتەوە؟) [3]کەس نەبوو نە لـەئاسمان‌و نە لـەسەر زەوی‌و نە لەژێر زەوی بـتوانێ پەرتووکەکـە بکاتـەوە یـاخود تەماشـای ناوەوەی بکات. [4] لەبەرئـەوە دەسـتم بەگریانـێکی زۆر کـرد، چـونکە کەس شایستەی ئەوە نـەبوو پەرتووکەکـە بکاتـەوە یـاخود تەماشـای نـاوەوەی بکات. [5]یەکێك لـەپیرەکان پێی‌ووتم: (مەگری، ئەوەتا ئـەو شـێرەی سـەرکەوت، ئـەوەی لـەهۆزی یەهوزایـەو لەڕەچـەڵەکی داوده، پەرتووکەکـە دەکاتـەوەو حەوت مۆرەکەی دەکاتەوە.)

[6]سەیرم کرد لەنێوان تەختەکەو چوار زیندەوەرەکە، لەناوەڕاستی پیرەکان، بەرخێکم بینی ڕاوەستا بوو وەك ئەوەی سەر بڕابێت، بەرخەکە حەوت شاخو حەوت چاوی هەبوو، ئەوانەش حەوت ڕۆحی خودان کە بۆ هەموو زەوی نێردراون. [7] بەرخەکە چوو، پەرتووکەکەی لەدەستە ڕاستی دانیشتووی سەرتەختەکە وەرگرت. [8]کاتێ بەرخەکە پەرتووکەکەی وەرگرت، چوار زیندەوەرەکەو بیستو چوار پیرەکە لەبەردەم بەرخەکەدا کەوتنە سەر چۆك، هەر یەکەیان قیسارەو جامی زێرینی پڕ بخوریان پێبوو، ئەوەش نوێژکردنی خوشكو برا پیرۆزەکانە، [9]هەروەها سروودێکی نوێیان دەووت: (تۆ شایستەی ئەوەی پەرتووکەکە ببەیتو مۆرەکانی بکەیتەوە، چونکە تۆ سەر بڕایتو مرۆڤی سەر بەخێڵو زمانو نەتەوەو میللەتی جیاجیای جیهانت بۆ خودا بەخوێنی خۆت کڕییەوە، [10]هەروەها لەوان کاهینو پادشاهێتیت بۆ خودامان دروستکرد، ئەوانیش حوکمڕانی زەوی دەکەن.) [11]ئینجا تەماشام کردو گوێم لەدەنگی فریشتەیەکی زۆر بوو لەدەوری تەختەکەو زیندەوەرەکانو پیرەکان، ژمارەیان هەزار هەزارو دەهەزار دەهەزار دەبوو، [12]فریشتەکان بەدەنگێکی بەرز دەیانووت: (بەرخە سەربڕاوەکە شایستەی وەرگرتنی هێزو دەوڵەمەندیو دانایيو تواناو ڕێزو شکۆداریو ستایشە.)

[13]لەوکاتەدا هەموو زیندەوەرەکانی ئاسمانو زەویو ژێر زەویو ناو دەریاش هەموویان دەیانووت: (با ستایشو ڕێزو شکۆمەندیو توانا، بۆ دانیشتووی سەر تەختو بەرخەکە بێت تاهەتایە.) [14]چوار زیندەوەرەکەش دەیانووت: (ئامین)، بیستو چوار پیرەکەش کەوتنە سەرچۆكو کرنۆشیان برد.

### حەوت مۆرەکە

## 6

تەماشام کرد کاتێك بەرخەکە مۆرێکی لەحەوت مۆرەکە کردەوە، گوێم لێبوو یەکێك لەچوار زیندەوەرەکە بەدەنگێکی وەك هەورە تریشقە ووتی: (وەرە!) [2]سەیرم کرد ئەسپێکی سپیم بینی سوارەکەی

کەوانێکی بەدەستەوە بوو و تاجێکی پێدرابوو، بەسەرکەوتوویی دەرچوو بوو تاسەر بکەوێت.

[3] کاتێك مۆری دووەمی کردەوە، گوێم لەزیندەوەری دووەم بوو ووتی: (وەرە!) [4] سەیرمکرد ئەسپێکی تر، سووری درەوشاوە بوو، هاتە دەرەوە. سوارەکەی دەسەلاتی پێدرا بوو تا ئاشتی لەسەر زەوی هەلگرێتو وا لەخەلکی بکات لەناو خۆیان یەکتری بکوژن. هەروەها سوارەکە شمشێرێکی گەورەی پێ درابوو.

[5] کاتێك مۆری سێیەمی کردەوە، زیندەوەری سێیەم ووتی: (وەرە!) سەیرمکرد ئەسپێکی ڕەشم بینی سوارەکەی تەرازوویەکی بەدەستەوە گرتبوو. [6] دەنگێك لەناوەڕاستی چوار زیندەوەرەکەوە دەیووت: (یەك ڕبە گەنم بەرۆژانەی کرێکارێك، سێ ڕبە جۆ بەهەمان نرخ، بەلام ڕۆنو مەیەکە زیانیان پێمەگەیەنە.)

[7] کاتێك مۆری چوارەمی کردەوە، گوێم لەدەنگی زیندەوەری چوارەم بوو ووتی: (وەرە!) [8] سەیرم کرد ئەسپێکی زەرد هەلگەڕاوم بینی سوارەکەی ناوی مردنبوو. دونیای مردووان دوای کەوتبوو، هەردووکیان دەسەلاتیان پێدرابوو چارەکی دانیشتوانی زەوی بکوژن بەشمشێرو برسێتیو نەخۆشی کوشندە، هەروەها بەدڕندە کێویەکانی سەر ڕووی زەوی.

[9] کاتێك مۆری پێنجەمی کردەوە، لەژێر قوربانگەدا ڕۆحی ئەو کەسانەم بینی کە لەپێناو ووشەی خوداو لەپێناو ئەو شایەتییەی دابوویان کوژرا بوون. [10] بەدەنگێکی بەرز هاواریان کردو ووتیان: (هەتا کەی ئەی خوداوەندی پاكوپیرۆزو ڕاست، تۆلەی خوێنی ئێمە لەدانیشتووانی زەوی ناسێنیتو حوکمیان بەسەردا نادەیت؟) [11] ئینجا هەریەکەیان جلێکی سپییان پێدراو پێیان ووترا تا ماوەیەك بحەوێنەوە تا ژمارەی بەندە هاوەلەکانو براو خوشکەکانیان کە وەك ئەوان دەکوژرێن، تەواو دەبێت.

[12] کاتێك بەرخەکە، مۆری شەشەمی کردەوە. سەیرمکرد بوومەلەرزەیەکی گەورە ڕوویداو خۆر وەك جلی ماتەمدار ڕەش هەلگەڕا، مانگیش وەك خوێن سوور هەلگەڕا، [13] ئەستێرەکانی ئاسمان دەکەوتنە سەر زەوی وەك بەری دار

هـــەنجیر کاتــێك بایـــەکی تونـــد دەیهاژێـــنیّو بەرەکـــەی دەکەوێـــتە خـــوارەوە. [14]ئاسمـــان وەك پەڕەیـــەك لـــوول‌کـــرا، هـــیچ چـــیاو دوورگەیەك لەشـــوێنی خـــۆی نـــەما. [15]پادشاکانی زەوی‌و گـــــــــەورە پـــــــــیاوان‌و دەوڵەمـــەندەکان‌و دەســـەڵاتدارەکان‌و هـــەموو کوێلـــەو ئـــازادێك، خۆیـــان لـــەناو ئەشکەوت‌و بەردە گەورەکانی چـــیا حەشاردا، [16]بەچیاو بەردەکانیان دەووت: (بکـــەون بەســـەرماندا تـــا لـــەڕووی ئـــەوەی لەســـەر تەخـــت دانیشـــتووەو لـــەتووڕەیی بەرخەکـــە بمانشـــارنەوە، [17]چونکە ڕۆژی تووڕە بوونە گەورەکە هاتووەو کێ دەتوانێ خۆی لەبەرامبەری ڕابگرێت؟)

## پاراستنی کۆیلەکانی خودا

# 7

پـاش ئەمە چوار فریشتەم بینی لەسەر هـــــەر چـــــوار گۆشـــــەی زەوی وەســـتابوون، چـوار بایەکەی زەوییان ڕاگرتـبوو تـا لـەسـەر زەوی‌و لـەسەر دەریـــاو لەســـەر هـــیچ درەختـــێك هەڵـــنەکەن. [2]هـــەروەها فریشـــتەیەکی تـرم بینی لـەڕۆژهەڵاتەوە دەرکەوتبوو مـۆری خـودای زیـندووی پیّبـوو، بەدەنگـــێکی بـــەرز بـــانگی چـــوار فریشـتەکەی تـری کـرد کە ڕێگایان پیّدرابـــوو زیـــان بـــەزەوی‌و دەریـــا بگەیـەنن، ووتـی: [3](زیـان بـەزەوی‌و دەریـاو درەخـتەکان مەگەیەنن تا ئەو کاتـــەی نێوچـــەوانی بـــەندەکانی خودامـــان مـــۆر دەکـــەین.) [4]گوێـم لەدەنگی مۆرکراوەکان بوو کەسەدو چـلو چـوار هـەزار کـەس بـوون، ئەوانـەش لەهەموو هۆزەکانی نەوەی ئسـیرائیل بـوون. [5]لـەهۆزی یـەهوزا دوانـزە هەزار مۆرکرابوون، لەهۆزی ڕائوبـین دوانزە هەزارو لەهۆزی گاد دوانـزە هـەزار، [6]لـــەهۆزی ئەشـــیر دوانزە هەزار، لەهۆزی نەفتالی دوانزە هەزار، لەهۆزی مەنسا دوانزە هەزار، [7]لـەهۆزی شـەمعون دوانـزە هەزار، لـــەهۆزی لاوی دوانـــزە هـــەزار، [8]لـەهۆزی یەسـاکر دوانـزە هەزار، لـەهۆزی زەبولـون دوانـزە هـەزار، لـەهۆزی یوسـف دوانـزە هـەزار، لەهۆزی بنیامین دوانزە هەزار.

## خەڵکێك لەهەموو نەتەوەکان

[9]پاشـــان ســـەیرم‌کـــرد کۆمەڵـــە خەڵـکـێکی نەژمـێردراوم لەهـــەموو نەتـــەوەو مـــیللەتان‌و هـــۆزو گـــەل‌و

زمانێك بینی، هەموویان لەبەردەم تەختی خوداو بەرخەکە ڕاوەستابوون، جلی سپییان لەبەربوو لقی دار خورمایان بەدەستەوە گرتبوو، [10]بەدەنگێکی بەرز هاواریان دەکردو دەیانووت: (ڕزگاربوون تەنها لەلایەن خودای سەر تەختو بەرخەکەوەیە.) [11]هەروەها هەموو فریشتەکانی چواردەوری تەختەکەو پیرەکانو چوار زیندەوەرەکە وەستابوون، لەبەردەم تەختەکە بەدەمدا کەوتنو کڕنۆشیان بۆ خودا برد، [12]دەیانووت: (ئامین! باستایشو شکۆمەندیو داناییو سوپاسو ڕێزو هێزو توانا بۆ خودامان بێت تاهەتایە! ئامین.)

[13]دوایی یەکێك لەپیرەکان لێی پرسیم (ئەو سپی پۆشانە کێنو لەکوێوە هاتوون؟) [14]لەوەڵامدا ووتم: (ئەی گەورە تۆ دەزانیت.) ئەویش پێی ووتم: (ئەو سپی پۆشانە ئەوانەن کە لەتەنگانە گەورەکەوە هاتوونو جلەکانیان بەخوێنی بەرخەکە شۆردووەو سپی کردووە. [15]لەبەر ئەوەیە ئێستا لەبەردەم تەختی خوداو شەو و ڕۆژ لەپەرستگاکەی خزمەتی دەکەنو دانیشتووی سەر تەختەکەش بەسێبەری چادرەکەی دایان دەپۆشێ. [16]ئەوانە لەمەولا نەتینوو دەبنو نەبرسی، نەخۆر لییان دەداتو نەهەست بەگەرمایی دەکەن. [17]چونکە بەرخەکەی ناوەڕاستی تەختەکە دەبێتە شوانیان، هەروەها بەرەو کانیەکانی ئاوی ژیانیان دەباتو خوداش هەموو فرمێسکەکانی چاویان دەسڕێتەوە.)

## مۆری حەوتەم

# 8

کاتێك بەرخەکە مۆری حەوتەمی کردەوە بێدەنگییەك نیو کاژێر باڵی بەسەر ئاسماندا کێشا. [2]حەوت فریشتەکەم بینی کە لەبەردەم خودا ڕادەوەستن، حەوت کەڕەنایان پێدرابوو. [3]فریشتەیەکی تر هاتو لەبەردەم قوربانگاکەدا وەستا. فریشتەکە بخوردانێکی زێڕینی پێبوو بخوورێکی زۆریشی پێدرا بوو تا لەگەڵ نوێژەکانی خوشكو برا پیرۆزەکان پێشکەشی بکات لەسەر قوربانگا زێڕینەکەی بەردەم تەختی خودا، [4]پاشان لەگەڵ نوێژەکانی خوشكو برا پیرۆزەکان دووکەڵی بخوور لەدەستی فریشتەکە لەبەردەم

خودا بەرز بووەوە. [5]پاشان فریشتەکە بخووردانەکەی بردو لەقوربانگاکە پڕی کرد لەئاگرو فڕێیدایە سەر زەوی، ئینجا بوو بەهەورەتریشقەو دەنگی چەخماخەو بروسکەو بوومەلەرزە.

### حەوت کەڕەناکان

[6]لەوکاتەدا حەوت فریشتەکەی کەڕەنایان پێبوو خۆیان بۆ لێدانی کەڕەنا سازکرد.

[7]فریشتەی یەکەم کەڕەناکەی لێدا، تەرزەو ئاگری تێکەڵ بەخوێنیان لێپەیدابوو، ئاگرو تەرزەکە فڕێدرانە سەرزەوی لەئەنجامدا سێیەکی زەوی سووتاو سێیەکی درەختەکانیش سووتانو هەموو گیایەکی سەوزی سووتاند.

[8]فریشتەی دووەم کەڕەناکەی لێداو لەئەنجامدا چیایەکی گەورەی بەئاگر سوور هەڵگەڕاو فڕێدرایە ناو دەریاوە، دەریاکەش سێیەکی بوو بەخوێن، [9]لەئەنجامدا سێیەکی زیندەوەرەکانی دەریا مردنو سێیەکی کەشتییەکانیش تێك شکێنران.

[10]فریشتەی سێیەم کەڕەناکەی لێدا، لەئەنجامدا لەئاسمانەوە ئەستێرەیەکی گەورەی پرشنگدار وەك چرا کەوتە خوارەوە بۆ سەر سێیەکی ڕووبارەکانو سەرچاوەکانی ئاو. [11]ئەستێرەکەش ناوی (تاڵاو) بوو، لەبەرئەوە سێیەکی ئاو تاڵبوو، خەڵکانێکی زۆریش لەبەر تاڵی ئاوەکە مردن.

[12]پاشان فریشتەی چوارەم کەڕەناکەی لێدا، لەئەنجامدا سێیەکی خۆرو سێیەکی مانگو سێیەکی ئەستێرەکان لێدران، سێیەکی ڕۆژ ڕووناکی لێبڕاو شەویش بەهەمان شێوە.

[13]پاشان تەماشام کرد داڵێکی هەڵفڕیوم لەناوەڕاستی ئاسماندا بینی بەدەنگێکی بەرز هاواری دەکردو دەیووت: (قوڕبەسەرتان، قوڕبەسەرتان، ئەی دانیشتوانی سەر زەوی، کاتێ ئەو سێ فریشتەیەی تر کەڕەناکانیان لێدەدەن چی بەسەر زەوی دەهێنن!)

# 9

پاشان فریشتەی پێنجەم کەڕەناکەی لێدا، تەماشام کرد ئەستێرەیەك لەئاسمانەوە کەوتە سەر زەویو ئەستێرەکە کلیلی بیری بێبنی

پێدرابوو. [2]بیری بێبنی کردەوەو دووکەڵێك وەك دووکەڵی کوورەیەکی گەورە لێی بەرزبووەوەو دووکەڵەکە ئاسمانو خۆری تاریك کرد. [3]لەدووکەڵەکەوە کوللەیەکی زۆر هاتنە سەر زەویو توانایەکی وەك دووپشکی زەویان پێدرابوو. [4]کوللەکان فرمانیان پێدرابوو زیان بەگیای سەر زەویو هیچ شتێکیسەوزو هیچ درەختێك نەگەێنن، تەنها زیان بەو کەسانە بگەێنن کە مۆری خودایان بەنێوچەوانەوە نییە، [5]ڕێیان پێ نەدرابوو بیانکوژن، بەڵکو بۆ ماوەی پێنج مانگ ئازاریان بدەن، بەئازارێك وەك ئازاری دووپشك کاتێ بەمرۆڤەوە دەدات. [6]لەو ڕۆژانەدا خەڵك داوای مردن دەکەن بەڵام دەستیان ناکەوێت، حەز لەمردن دەکەن بەڵام مردن ڕادەکات لەدەستیان.

[7]شێوەی کوللەکانیش وەك ئەسپێك وان خۆیان بۆ شەڕ ئامادەکردبێت، لەسەر سەریان شتێکی وەك تاجی زێڕینیان لەسەرناوەو دەموچاویان وەك دەموچاوی مرۆڤ وایە. [8]قژیان وەك قژی ئافرەت وایەو ددانەکانیان وەك ددانی شێرن. [9]سپەرەکانیان وەك سپەری ئاسنین وایە، دەنگی باڵەکانیان لەهەراو دەنگی ئەو عەرەبانەو ئەسپانە دەچێ کە لەمەیدانی جەنگدا هێرش دەبەن. [10]هەروەها چەند کلکێکی چزووداری وەك دووپشکیان هەبوو، لەکلکەکانیشیان توانایان پێدرابوو بۆ ماوەی پێنج مانگ خەڵك ئازار بدەن. [11]هەروەها ئەو فریشتە بەدکارەی بیری بێبن کە بەعیبری پێی دەووترێت (ئەبەدون)و بەیۆنانی پێی دەووترێت (ئەپۆلیۆن) پادشا بوو لەسەریان.

[12]ئەوەتا نەگبەتی یەکەم بەسەرچوو و دوو نەگبەتی تریش ماون، دوای ئەمە دێن. [13]پاشان فریشتەی شەشەم کەڕەناکەی لێداو دەنگێك لەچوار شاخەکەی قوربانگا زێڕینەکەی بەردەم خوداوە هاتە بەرگوێم، [14]بەفریشتەی شەشەمی دەووت کە کەڕەناکەی پێبوو: (چوار فریشتە باڵ بەستراوەکەی تەنیشت ڕووباری مەزنی فورات ئازاد بکە.) [15]چوار فریشتەکەی ئامادەکرابوون بۆ ئەو کاژێرو ڕۆژو

مانگو ساڵە، ئازادکران تاسێیەکی مرۆڤ بکوژن. [16]ژمارەی سەربازە سوارچاکەکان دووسەد ملیۆن بوونو من گوێم لەژمارەکەیان بوو. [17]بەم شێوەیە ئەسپەکانم لەبینینێکدا بەدی‌کردو سوارەکانیان سپەری ئاگرینو مرواری‌دارو گۆگردیان لەبەربوو، سەری ئەسپەکانیش وەك سەری شێر وابوونو لەدەمیانەوە ئاگرو دووکەڵو گۆگرد دەردەچوو. [18]بەو سێ دەردە سێیەکی مرۆڤ کوژران واتە بەئاگرو دووکەڵو گۆگرد. [19]چونکە هێزی ئەسپەکان لەدەمو کلکیان بوو، کلکیشیان وەك مار سەری هەبوو، بەمەش خەڵکیان ئازار دەدا. [20]بەڵام پاشماوەی ئەو کەسانەی بەو لێدانانە نەکوژران، تۆبەیان نەکردو کرنۆشیان بۆ ڕۆحە پیسەکانو بتەکان کە لەزێڕو زیوو مسو بەردو دار دروستکراون دەبرد، ئەوانەی ناتوانن نەبیستنو نەبیننو نەبڕۆن. [21]هەروەها لەکوشتنو فاڵچێتیو داوێن‌پیسیو دزی‌کردن تۆبەیان نەکرد.

### فریشتەو پەرتووکێکی بچووك

## 10

پاشان فریشتەیەکی تری بەهێزم بینی لەئاسمانەوە هاتەخوارەوەو بەپەڵە هەورێك خۆی پۆشیبوو، پەلکە زێڕینەیەك لەسەرسەری بوو، دەمو چاویشی وەك خۆر وابوو، قاچەکانیشی وەك دوو ستوونی ئاگرین وابوون. [2]نووسراوێکی بچووکی کراوەی بەدەستەوە بوو. قاچی ڕاستی لەسەر دەریاو قاچی چەپی لەسەر ووشکایی دانا. [3]بە دەنگێکی بەرز وەك نەڕەی شێر هاواری کرد، پاش ئەوەی هاواری کرد، حەوت هەورە تریشقەکە بەدەنگەکانی خۆیان هاتنە دوان، [4]پاش ئەوەی حەوت هەورە تریشقەکە هاتنە دوان، نیازم وابوو دەست بکەم بەنووسین، بەڵام دەنگێك لەئاسمانەوە هاتە بەرگوێمو پێی ووتم: (ئەوەی حەوت هەورە تریشقەکە ووتیان مۆری بکە، بەڵام مەیان نووسە.) [5]ئەو فریشتەیەی بینیم لەسەر ووشکاییو دەریا ڕاوەستابوو دەستی ڕاستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو [6]سوێندی بەزیندووی هەمیشەیی خوارد، ئەوەی ئاسمانو زەویو دەریاو هەموو ئەو شتانەی تیایاندایە

دروستی کردووە، کە هیچ دەرفەتێکی تر نەدات، [7]بەڵکو لەو ڕۆژانەی فریشتەی حەوتەم کەڕەناکەی خۆی لێدەداو دەنگی لێدێت، نهێنی خودا پێویستە بێتەدی، وەك چۆن خودا بۆ پێغەمبەرەکانو خزمەتکارەکانی خۆی ڕاگەیاندووە. [8]هەروەها ئەو دەنگەی لەئاسمانەوە هاتە بەرگوێم دیسان قسەی لەگەڵ کردمو پێی گوتم: (بڕۆ نووسراوە بچووکەکە لەو فریشتەیە وەربگرە ئەوەی لەسەر دەریاو لەسەر ووشکایی وەستاوە.) [9]بۆ لای فریشتەکە چوومو پێمووت نووسراوە بچووکەکەم بدەرێ، فریشتەکە پێی ووتم: (وەری بگرەو بیخۆ، گەدەت تاڵ دەکات، بەڵام لەدەمتدا وەك هەنگوین شیرین دەبێت.) [10]نووسراوە بچووکەکەم لەدەستی فریشتەکە وەرگرتو خواردم، لەدەممدا وەك هەنگوین شیرین بوو، بەڵام پاش ئەوەی خواردم گەدەی تاڵ کردم. [11]هەروەها فریشتەکە پێی ووتم: (پێویستە بەووتەی خودا بدوێی دەربارەی میللەتانو نەتەوانو زمانەکانو پادشاکان.)

### دوو شایەتەکە

## 11

پاشان قامیشێکی وەك ڕاستەی پێوانەم پێدرا، پێمووترا: (هەستە، پەرستگای خوداو قوربانگا بپێوەو ئەوانەی تیایدا کڕنۆش دەبەن بیانژمێرە. [2]بەڵام واز لەگۆڕەپانی پەرستگا بهێنەو مەیپێوە، چونکە ئەو گۆڕەپانە بەناجوولەکان دراوە، هەروەها بۆ ماوەی چلو دوو مانگ شاری پیرۆز پێشێل دەکەن. [3]هەروەها دەسەڵات بەدوو شایەتەکەی خۆم دەدەم بۆ ماوەی هەزارو دووسەدو شەست ڕۆژ بەبەرگی ماتەمەوە بەووتەی خودا بدوێن.)

[4]ئەمانە ئەو دوو دار زەیتونەو ئەو دوو چرادانەن کە لەبەردەم خوداوەندی زەوی دانراون. [5]گەر یەکێك بیەوێت زیانیان پێبگەێنێت، ئاگرێك لەدەمیانەوە دێتە دەرەوەو دوژمنەکانیان دەخوات، هەروەها گەر یەکێك بیەوێت ئازاریان بدات دەبێت ئاوها بکوژرێت. [6]ئەم دووانە دەسەڵاتیان پێدراوە لەڕۆژانی لێدوانەکەیان بەووتەی خودا ڕووی ئاسمان دابخەن تا باران نەبارێت، هەروەها دەسەڵاتیان هەیە ئاو بکەن بەخوێنو بەهەموو جۆرە دەردێك

لەزەوی بدەن، هەر کاتێك بیانەوێ. 7 کاتێك شایەتییەکەیان تەواوکرد ئەو درندەیەی لەبیری بێبن دێتەدەرەوە، جەنگیان لەگەڵ بەرپا دەکاتو بەسەریاندا زاڵدەبێتو دەیانکوژێتو 8 تەرمەکانیان فڕێدەدرێتە سەر شەقامی ئەو شارە گەورەیەی ناوە ڕۆحییەکەی سەدومو میسرە، ئەو شوێنەی خوداوەندیانی تیادا لەخاچدرا. 9 خەڵکی لەهەموو گەلانو هۆزو زمانو نەتەوەکان بۆ ماوەی سێ ڕۆژو نیو سەیری تەرمەکانیان دەکەنو ناهێڵن تەرمەکانیان بنێژرێن. 10 دانیشتووانی زەوی تانەوتوانجیان لێدەدەنو هاواری خۆشیان لێ بەرزدەبێتەوە، هەروەها دیاری بۆ یەکتری دەنێرن، چونکە ئەم دوو پێغەمبەرە دانیشتووانی سەر زەوییان زۆر ئازار دابوو. 11 بەلام پاش سێ ڕۆژو نیو هەناسەیەکی ژیان لەخوداوە دەچێتە ناو لەشیان، لەئەنجامدا لەسەرپێیان دەوەستنو ترسێکی زۆریش دەنیشێت لەسەر ئەوانەی تەماشایان دەکردن. 12 ئینجا دەنگێکی بەرز لەئاسمانەوە هاتە بەرگوییانو ووتی: (بۆ ئێرە سەربکەون)، ئەوانیش لەبەرچاوی دوژمنەکانیان بەسواری پەڵە هەورێك بۆ ئاسمان سەرکەوتن. 13 لەو کاتەدا بوومەلەرزەیەکی گەورە ڕوویداو دەیەکی شارەکە لەناوچوو، حەوت هەزار کەس بەبوومەلەرزەکە کوژران. ئەوانی تر لەترسو لەرز، ستایشی خودای ئاسمانیان کرد.

14 نەگبەتی دووەم بەسەر چوو، ئەوەتا نەگبەتی سێیەم وا بەخێرایی دێ بەڕێوە.

**کەڕەنای حەوتەم**

15 پاشان فریشتەی حەوتەم کەڕەناکەی لێداو دەنگێکی بەرز لەئاسماندا دەنگی دایەوەو دەیووت: (پادشاهێتی جیهان بوو بەپادشاهێتی خوداوەندمانو مەسیحەکەی، ئەوەی فەرمانڕەوایی دەکات.) 16 ئەو بیستو چوار پیرەی لەسەر تەختەکان دانیشتبوون، لەبەردەم خودا خۆیان بەدەمداداو کڕنۆشیان برد، ووتیان: 17 (سوپاست دەکەین ئەی خوداوەند خودای توانادار بەسەر هەموو شتێك، ئەوەی هەیەو هەبووە، چونکە تۆ توانای مەزنی خۆت وەرگرتو دەستت بەفەرمانڕەوایی کرد. 18 میللەتان تووڕەبوون، تووڕەیی تۆش هات،

ئێستا کاتی لێپرسینەوەی مردووانە، بۆ ئەوەی پاداشتی بەندەکانت لەپێغەمبەرو خوشکو برا پیرۆزەکانو ئەوانەی لەناوت دەترسن بەگەورەو بچووکەوە بدرێتەوە، هەروەها تا ئەوانە لەناوببەی کە زەوی لەناودەبەن.)

[19] پاشان پەرستگای خودا لەئاسماندا کرایەوەو سەندوقی پەیمانەکەی لەناو پەرستگاکە دەرکەوت، لەئەنجامدا بووە بروسکەو دەنگە دەنگو هەورە تریشقەو بوومەلەرزەو تەرزەی گەورە بارین.

## ژنو ئەژدیها

# 12

دوا بەدوای ئەوە نیشانەیەکی گەورەی سەیر لەئاسمانەوە دەرکەوت، ئافرەتێکی خۆر پۆش، مانگ لەژێر پێی‌داو تاجێکیش لەسەر سەری بوو لەدوانزە ئەستێرە پێکهاتبوو، [2] ئافرەتەکە سك پڕبوو و بەدەست ژانی منداڵ بوونەوە دەینالاند. [3] نیشانەیەکی تری سەیر لەئاسماندا دەرکەوت، ئەژدیهایەکی گەورەی سووربوو، حەوت سەرو دە شاخی هەبوو، هەروەها حەوت تاجی لەسەر سەر بوو. [4] کلکیشی سێیەکی ئەستێرەکانی ئاسمانی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشاو ئەستێرەکانی بەزەویدا دا، ئەژدیهاکە لەبەردەم ئافرەتەکە وەستا، تا کاتێ منداڵ دەبێت منداڵەکە بخوات. [5] ئافرەتەکە منداڵێکی نێرینەی بەهێزی‌بوو، ئەوەی بەگۆپاڵێکی ئاسنین فەرمانڕەوایی هەموو نەتەوەکانی سەر زەوی دەکات. بەڵام منداڵەکە بۆ لای خوداو تەختەکەی ڕفێندرا. [6] ئافرەتەکەش بەرەو دەشتودەر ڕایکرد بۆ ئەو شوێنەی لەلایەن خوداوە بۆی ئامادەکراوە، تا بۆ هەزارو دووسەدو شەست ڕۆژ بەخێو بکرێت.

[7] پاشان لەئاسماندا شەڕێك بەرپابوو میکائیلو فریشتەکانی دژی ئەژدیهاکە جەنگان، ئەژدیهاکەو فریشتە بەدکارەکانیشی دژی ئەوان، [8] بەڵام ئەژدیهاکە ئەوەندە بەهێز نەبوو، شوێنیان لەئاسمان نەماو [9] ئەژدیها گەورەکە فڕێدرایە خوارەوە، کە هەمان مارە دێرینەکەیە، بەئیبلیس* و شەیتان ناودەبرێتو هەموو جیهان گومڕا دەکات، لەگەڵ فریشتەکانی فڕێدرایە زەوی. [10] ئینجا

گوێم لەدەنگێکی بەرزبوو لەئاسمانەوە ووتی: (ئێستا ڕزگاریو هێزو پادشاهێتی خودامانو دەسەلاتی مەسیحەکەی هاتەکایەوە، چونکە ئەو شکاتکەرەی شەو و ڕۆژ لەبەردەم خوداماندا شکاتی لەخوشکو براکانمان دەکرد، درا بەزەویدا. [11] ئەوان بەخوێنی بەرخەکەو بەووشەی شایەتییان بەسەریدا زاڵبوونو تا مردنیش ژیانی خۆیان خۆش نەدەویست. [12] لەبەرئەمە ئەی ئاسمانو ئەوانەی تێیدا نیشتەجێن، دڵخۆشو شادومان بن، بەلام قوڕ بەسەر دانیشتووانی زەویو دەریا، چونکە شەیتان هاتۆتە خوارەوە بۆ ئێوەو تووڕەییەکی گەورەی پێیە، چونکە کاتێکی کورتی بەدەستەوە ماوە. [13] کاتێك ئەژدیهاکە خۆی بینی دراوە بەزەویدا، ئەو ئافرەتەی ڕاونا کە منداڵە نێرینەکەی لێبوو. [14] لەبەرئەوە ئافرەتەکە دوو باڵی داڵە گەورەکەی پێدرا تا بۆ شۆێنە دیاری کراوەکەی خۆی لەدەشتودەر بفڕێت بۆ ئەوەی بۆ ماوەی سێ ساڵو نیوی‌تر دوور لەمارەکە بەخێوبکرێت. [15] مارەکە لەپشت ئافرەتەکە لەدەمیەوە ئاوێکی وەك ڕووباری هەڵدا، تا ئافرەتەکە بەلافاو ڕاماڵ بکات. [16] زەوی یارمەتی ئافرەتەکەیدا، دەمی کردەوەو ئەو ڕووبارەی قووتدا کە ئەژدیهاکە لەدەمیەوە فڕێی دایە دەرەوە. [17] ئەژدیهاکە لەئافرەتەکە تووڕەبوو، دەستی‌کرد بە دژایەتی‌کردنی پاشماوەی وەچەکەی، ئەوانەی کار بەڕاسپاردەکانی خودا دەکەنو دەستیان بەشایەتی عیسا گرتووە. [18] جا ئەژدیهاکە لەسەر لمی دەریا وەستا،

## دەرکەوتنی دڕندەیەك لەدەریا

## 13

ئینجا دڕندەیەکم بینی لەدەریاکە دەهاتە دەرەوە، حەوت سەرو دە شاخی هەبوو، دە تاجیش لەسەر شاخەکانی بوو، لەسەر هەر سەرێك ناوی کفرکردن نووسرابوو. [2] ئەو دڕندەیەی بینیم لەپڵنگ دەچوو لەپێ پێیەکانی لەلەپی پێی وورچ دەچوو دەمیشی وەك دەمی شێر وابوو. ئەژدیهاکەش تواناو تەختو دەسەلاتی گەورەی خۆی دا بەدڕندەکە. [3] سەرێك لەسەرەکانی دڕندەکەم بینی، لەوە دەچوو برینێکی کوشندەی پێوەبووبێت، بەلام برینە

کوشندەکە چاك بووبۆوە. هەموو زەویش بەسەر سوورمانەوە دوای دڕندەکە کەوتن. [4]خەڵکی کڕنوشیان بۆ ئەژدیهاکە دەبرد، ئەوەی دەسەڵاتی بەدڕندەکە بەخشیبوو، هەروەها کڕنۆشیان بۆ دڕندەکەش بردو ووتیان: (کێ وەکو دڕندەکە وایە؟ کێ دەتوانێت دژی بجەنگێت؟)

[5]دڕندەکە دەمێکی پێدرابوو، بەلەخۆباییو کفر دەدوا، بۆ ماوەی چلو دوو مانگ دەسەڵاتی پێدرابوو ئەو کارانە ئەنجام بدات. [6]دڕندەکە دەمی کردەوەو کەوتە کفرکردن بەخوداو جنێوی بەناوی خوداو ماڵەکەیو دانیشتووانی ئاسماندەدا. [7]هەروەها ڕێگای پێدرابوو دژی خوشكو برا پیرۆزەکانی زەوی جەنگ بەرپا بکاتو سەربکەوێ بەسەریان، دەسەڵاتی بەسەر هەموو نەتەوەو هۆزو زمانو میللەتێکدا پێدرابوو. [8]لەبەرئەوە تەواوی دانیشتووانی زەوی کڕنۆشیان بۆ دەبرد، ئەوانەی ناویان لەوەتای دروستبوونی جیهانەوە لەپەرتووکی ژیانی بەرخە سەربڕاوەکە نەنووسراوە. [9]ئەوەی گوێی هەیە باگوێ بگرێت: [10]گەر یەکێك خەڵك بەدیلی ڕاپێچ بکات، ئەوا خۆشی ڕاپێچ دەکرێ. هەروەها گەر کەسێك کەسێکی تر بەشمشێر بکوژێت پێویستە بەشمشێر بکوژرێتەوە. ئەمە بانگەوازە بۆ دانبەخۆگرتنو باوەڕی خوشكو برا پیرۆزەکان.

**دەرکەوتنی دڕندەیەك لەزەوی**

[11]پاشان دڕندەیەکی ترم بینی لەزەوییەوە هاتەدەرەوە، دوو شاخی وەك شاخی بەرخی هەبوو، بەڵام وەك ئەژدیها دەدوا. [12]هێندەی دەسەڵاتی دڕندەی یەکەم دەسەڵاتی هەبوو، وای لەدانیشتوانی زەوی دەکرد کڕنۆش بۆ دڕندەی یەکەم ببەن کە برینە کوشندەکەی چاك ببۆوە. [13]نیشانەی سەرسوڕهێنەری گەورەشی دەکرد بەو ڕادەیەی ئاگری لەئاسمانەوە دەهێنایەخوارەوە بۆ سەر زەوی لەبەرچاوی خەڵکی. [14]هەروەها بەو کارە سەرسوڕهێنەرانەی کە ڕێگای پێدرابوو لەبەردەم دڕندەی یەکەمدا بیکات خەڵکی دانیشتووی زەوی گومڕا دەکردو بەخەڵکی زەوی دەووت وێنەیەك بۆ ئەو دڕندەیە دروست بکەن کە

بەشمشێر بریندارکراو هەر بەزیندووش مایەوە. [15]هەروەها توانای پێدرابوو هەناسەیەك بداتە وێنەی دڕندەکە بۆ ئەوەی وێنەی دڕندەکە قسە بکاتو وابکات ئەوانەی کڕنۆش بۆ وێنەی دڕندەکە نابەن بکوژرێن. [16]واشی لەهەمووان دەکرد بەگەورەو بچووکو دەوڵەمەندو هەژارو ئازادو کۆیلەوە نیشانەیەك لەسەر دەستی ڕاستیان یاخود لەسەر ناوچەوانیان دروست بکرێت، [17]بۆ ئەوەی کەس نەتوانێت بکڕێتو بفرۆشێت تەنها ئەوانە نەبێت کە نیشانەکەیان پێوەیە، نیشانەکەش ناوی دڕندەکەیە یان ژمارەی ناوەکەیەتی. [18]دانایی لێرەیە: ئەوەی توانای تێگەیشتنی هەیە باژمارەی دڕندەکان بژمێرێت، چونکە ئەوە ژمارەی مرۆڤە کە ژمارەکەی شەشسەدو شەستو شەشە.

### بەرخەکەو گۆرانی جەماوەر

## 14

پاشان تەماشامکرد بەرخێك لەسەر چیای شاری داود ڕاوەستابوو، سەدو چلو چوار هەزار کەسی لەگەڵبوو، هەموویان ناوی بەرخەکەو ناوی باوکی بەرخەکە لەسەر ناوچەوانیان نووسرابوو. [2]هەروەها لەئاسمانەوە دەنگێك وەك دەنگی خوڕەی ئاوێکی زۆرو دەنگی چەخماخەیەکی گەورە هاتنە بەرگوێم، هەروەها دەنگی قیسارە دەهاتە بەرگوێم کە مۆسیقاژەنەکان لییاندەدا. [3]لەبەردەم تەختی خوداو چوار زیندەوەرەکەو بیستوچوار پیرەکە سروودێکی نوێیان دەووت. جگە لەو سەدو چلو چوار هەزار کەسەی بەخوێن لەزەوی کڕابوونەوە کەس نەیدەتوانی ئەو سروودە فێربێ. [4]ئەو کەسانە لەبەرئەوەی پاکن، لەگەڵ ئافرەت داوێنپیسییان نەکردووە، ئەوانە شوێن بەرخەکە دەکەون بۆ هەر کوێ بڕوات، ئەوانە وەك پێشەبەرە بۆ خوداو بەرخەکە، لەنێو خەڵك بەخوێن کڕاون. [5]هەروەها درۆ لەدەمی ئەوان نییە، ئەوانە بێ لەکەن.

### سێ فریشتەکە

[6]ئینجا لەناوەڕاستی ئاسمان فریشتەیەکی هەڵفڕیوم بینی، مزگێنییەکی هەتاهەتایی پێبوو بۆ ئەوەی مزگێنی بەدانیشتووانی زەویو هەموو نەتەوەو هۆزو زمانو

میللەتێك بدات. [7]فریشتەكە بەدەنگێكی بەرز دەیووت: (لەخودا بترسن و شكۆمەندی پێببەخشن، چونكە كاتی لێپرسینەوەكەی هاتووە، هەروەها كڕنوش بۆ دروستكەری ئاسمان و زەوی و دەریاو سەرچاوەكانی ئاو ببەن.)

[8]فریشتەیەكی تریش بەدوای ئەوەوە دەیووت: (كەوت، بابلی مەزن كەوت، ئەوەی وای كرد هەموو میللەتان لەشەرابی ئارەزووە گڵاوەكانی بخۆنەوە.)

[9]فریشتەی سێهەم بەدوای ئەمانەوە بەدەنگێكی بەرز دەیووت: (گەر یەكێك كڕنۆش بۆ دڕندەكە یاخود وێنەكەی بباتو ڕازی‌بێت نیشانەكەی لەسەردەستی یاخود نێوچەوانی بدات، [10]دەبێ بەهەمان شێوە شەرابی توڕەیی خودا بخواتەوە، ئەو شەرابەی بێ‌خەڵتەیەو لەجامی تووڕەیی خودا كراوە، هەروەها ئەو كەسە لەبەردەم فریشتە پیرۆزەكانو بەرخەكەدا بەئاگرو گۆگرد ئازار دەدرێت. [11]دووكەڵی ئازاریان بۆ هەتاهەتایە بەرزدەبێتەوە. هەروەها ئەوانەی كڕنۆش بۆ دڕندەكە یاخود وێنەكەی دەبەنو ئەوانەی ڕازی دەبن نیشانەی ناوەكەی هەڵگرن شەو و ڕۆژ حەوانەوەیان لێ‌هەڵدەگیرێت.)

[12]ئەمە بانگەوازە بۆ دانبەخۆگرتنی خوشكو برا پیرۆزەكان، ئەوانەی ڕاسپاردەكانی خوداو باوەڕی عیسای مەسیح دەپارێزن.

[13]دوای ئەوە لەئاسمانەوە گوێم لەدەنگێك بوو پێی‌ووتم: (ئەمە بنووسە: خۆزگە دەخوازرێ بەو مردووانەی لەئێستاوە لەبەر خوداوەند دەمرن!)

ڕۆحی پیرۆز دەڵێ: (بەڵێ، بۆ ئەوەی لەماندووبوونیان بحەسێنەوە، چونكە كردەوەكانیان شوێن پێیان دەكەون.)

**دروێنەی زەوی**

[14]پاشان تەماشامكرد پەڵە هەورێكی سپیم بینیو لەسەر پەڵە هەورەكە یەكێك لەشێوەی ڕۆڵەی مرۆڤ دانیشتبوو، تاجێكی زێڕینی لەسەری نابوو و داسێكی تیژی بەدەستەوە بوو. [15]فریشتەیەكی‌تر لەپەرستگاكەوە هاتەدەرەوەو بەدەنگێكی بەرز بانگی دانیشتووی سەر پەڵە هەورەكەی كرد:

(داسـەکەت هەڵگـرەو بـدرووەوە، چـونکە کـاتی درویـنە هـاتووەو خـەرمانی زەوی زەرد هەڵگـەڕاوە.)
[16]لەبەرئـەوە دانیشـتووی سـەر پەڵە هەورەکـە داسـەکەی بەسـەر زەوی وەشاندو زەوی دروێنەکرا.
[17]فریشتەیەکی تر لەپەرستگاکەی ئاسمانـەوە هاتـەدەرەوەو ئـەویش داسـێکی تـیژی پێبـوو. [18]ئیـنجا فریشـتەیەکی تر لەقوربانگەکەوە هاتە دەرەوەو دەسـەڵاتی بەسـەر ئاگـردا هەبوو. بەدەنگێکی بەرز هاواریکرد بۆ ئەوەی داسە تیژەکەی پێیەو ووتی: (داسـە تـیژەکەت هەڵگرەو هێشووە تـرێی ڕەزەکـانی زەوی کۆبکـەوە، چـونکە تـرێکەی پێگەیشتووە.) [19]
ئـەویش داسە تیژەکەی وەشاندە سەر زەویو هێشـووە تـرێکانی زەوی کۆکـردەوە، هێشـووە تـرێکانی فـڕێدایە نـاو گوشـەری گـەورەی توورەیـی خـودا. [20]گوشـەرەکە لـەدەرەوەی شار گوشرا، بەبەرزی تا لغاوی ئەسـپ بـۆ مـاوەی هـەزارو شـەش سـەد سـتادیە*، خوێـنی لێهاتەدەرەوە.

## گۆرانی موسا
# 15

ئیـنجا شـتێکی تـری گـەورەو سەرسـووڕهێنەرم لـەئاسماندا بیـنی، حـەوت فریشـتە حـەوت دەردی کۆتایـیان پێبـوو چـونکە بەوانـە توورەیی خودا تەواو دەبێت.
[2]پاشـان ئـاوێك وەك دەریایـەکی شووشـەیی تـێکەڵ بەئاگـرم بیـنیو ئەوانـەی بەسەر دڕندەکەو وێنەکەیو ژمـارەی ناوەکـەی سـەرکەوتبوون لەکـەنار دەریـا شووشـەییەکە ڕاوەسـتابوونو چـەند قیسـارەیەکی خودایـان پێبوو، [3]سروودی موسای بەندەی خوداو سروودی بەرخەکەیان دەچـڕیو دەیـانووت: (مـەزنو سەرسـووڕهێنەرە کارەکانـت ئـەی خوداوەنـد، خـودای توانـادار بەسەر هـەموو شـتێك، ڕێگاکانـت ڕاستو دادپـەوەرە ئـەی پادشای میللەتان. [4]
کـێ لـەتۆ ناترسێتو ستایشی ناوت ناکـات ئـەی خوداوەنـد؟ چـونکە

---

*هەزارو شەش سەد ستادیە: نزیکەی سێسەد کیلۆمەتر دەکات

بەتەنها خۆت پاكوپیرۆزیت، لەبەرئەوە هەموو نەتەوەكان دێنو كڕنووشت بۆ دەبەن، چونكە حوكمە دادپەروەریەكانت دەركەوتوون.)

[5]پاش ئەوە سەیرم كرد بینیم پەرستگای چادری شایەتی لەئاسمان كرایەوە. [6]حەوت فریشتەكە لەپەرستگاكە هاتنەدەرەوەو حەوت دەردەكەیان پێبوو، حەوت فریشتەكە بەجلی كەتانی پاكو پرشنگدار بەرگ پۆش كرابوونو چەند پشتێنێكی زێڕینیشیان لەسنگ بوو. [7]یەكێك لەچوار زیندەوەرەكە حەوت جامی زێڕینی دا بەحەوت فریشتەكەو جامەكانیش بەتوڕەیی خودا ئەوەی تاهەتایە زیندووە پڕكرابوون، [8]پەرستگاكە بەدووكەڵێ شكۆمەندی دەسەڵاتی خودا پڕبوو و هەتا حەوت دەردەكەی حەوت فریشتەكەش تەواو نەبوو كەس نەیتوانی بچێتە ناو پەرستگاكە.

### حەوت جامی تووڕەیی خودا

## 16

ئینجا لەپەرستگاكەوە گوێم لەدەنگێكی بەرز بوو بەحەوت فریشتەكەی دەووت: (بڕۆن حەوت جامی تووڕەیی خودا بەسەر زەوی‌دا بڕێژن.)

[2]یەكەمیان ڕۆیشتو جامەكەی خۆی ڕشت بەسەر زەوی‌دا، لەئەنجامدا دومەڵێ پیسی پڕ ئازار لەوكەسانە دەركەوت كە نیشانەی درندەكەیان هەڵگرتبوو كڕنووشیان بۆ وێنەكەی بردبوو.

[3]پاشان فریشتەی دووەم جامەكەی خۆی ڕشتە ناو دەریاوەو ئاوی دەریا وەك خوێنی مردووی لێهات، هەروەها هەموو زیندەوەرێكی ناو دەریا مرد.

[4]فریشتەی سێهەم جامەكەی خۆی ڕشتە ناو ڕووبارەكانو سەرچاوەكانی ئاو و بوون بەخوێن. [5]گوێم لەفریشتەی ئاوەكان بوو دەیووت: (تۆ دادپەروەری ئەی ئەوەی هەیەو هەبووە، چونكە تۆ بەو شێوەیە حوكمت‌داوە. [6]چونكە ئەوانە خوێنی پێغەمبەرانو خوشكو برا پیرۆزەكانیان ڕشتو تۆش لەپاداشت‌دا خوێنت پێشكەش كردن تا بیخۆنەوە، چونكە ئەوان شایانی ئەوەن.) [7]گوێم لەو فریشتەیەی قوربانگاكە بوو دەیووت: (بەڵێ ئەی خوداوەند خودای توانادار بەسەر

هەموو شتێك، حوكم دانی تۆ ڕاستو دادپەروەرە.)

[8]پاشان فریشتەی چوارەم جامەکەی خۆی ڕژاند بەسەر خۆرداو دەسەلاتی پێدرابوو خەلکی بەئاگر بسووتێنیٚ. [9]خەلك بەئاگرێکی مەزن سووتان، بەلام تۆبەیان نەکرد تا ستایشی خودا بکەن، بەلکو کفریان بەناوی خودا کرد ئەوەی دەسەلاتی بەسەر ئەم دەردانەدا هەیە.

[10]پاشان فریشتەی پێنجەم جامەکەی ڕژاند بەسەر تەختی درندەکەداو پادشاهێتیەکەی تاریك بوو، دانیشتووانی لەتاو ئازار زمانی خۆیان دەگەست. [11]لەتاو ئازارو برین کفریان بەخودای ئاسمان دەکردو تۆبەیان لەکردەوەکانیان نەکرد.

[12]فریشتەی شەشەم جامەکەی بەسەر ڕووباری گەورەی فوراتدا ڕشت، لەئەنجامدا ئاوەکەی ووشکی کرد تابێتە ڕێگا لەبەردەم ئەو پادشایانەی لەڕۆژهەلاتەوە هاتبوون. [13]هەروەها سیٚ ڕۆحی گلاوم بینی وەك بۆق وابوون لەدەمی ئەژدیهاکەو لەدەمی درندەکەو لەدەمی پێغەمبەرە درۆزنەکە دەهاتنە دەرەوە، [14]ئەوانە ڕۆحە شەیتانیەکانن، نیشانەی سەرسوڕهێنەر بۆ هەموو پادشاکانی جیهان ئەنجام دەدەن، تا بۆ جەنگی ئەو ڕۆژە گەورەیە کۆیان بکاتەوە، ڕۆژی خودای توانادار بەسەر هەموو شتێك.

[15][مەسیح دەلیٚ:] (ئەوەتا من وەکو دزێك دێم، خۆزگەدەخوازریٚ بەوانەی شەونخوونی دەکەن تا پارێزگاری لەجلو بەرگەکانیان بکەن، نەوەك خەلك بیانبینیٚ بەڕووتی بڕۆن.)

[16]ئینجا ڕۆحەکان پادشاکانیان لەو شوێنەدا کۆکردەوە کە بەعیبری پێی دەووترێت (هەرمەگەدون).

[17] فریشتەی حەوتەم جامەکەی خۆی ڕژاند بەهەوادا، دەنگێکی بەرز لەپەرستگای ئاسمانەوە لەتەختی خوداوە ووتی: (جیٚبەجیٚکرا!) [18] پاشان دەنگو چەخماخەو هەورە تریشقە پەیدابوونو بوومەلەرزەیەکی بەهێز ڕوویدا، بەشێوەیەك شتیوا ڕووی نەداوە لەوەتەی خەلك لەسەر زەوی دەژین، بوومەلەرزەکە زۆر بەهێزبوو. [19]شارە گەورەکە بوو بەسیٚ بەشەوەو شارەکانی نەتەوەکانیش ویران بوون. خوداش

شاری گەورەی بابلی بەبیرهاتەوە تا جامی شەرابی تورەیی بەتینی خۆی پێبدات. [20] هەموو دوورگەکان رایانکردو چیاکان لەبەرچاو نەمان. [21] تەرزەیەکی گەورە کە قورساییەکەی پەنجا کیلۆ دەبوو لەئاسمانەوە باری بەسەر خەڵکی، خەڵکی لەتاو لێدانی تەرزەکە کفریان بەخوداکرد، چونکە لێدانەکەی زۆر گەورەو ترسناك بوو.

## بابل دایکی داوێن پیسانە
## 17

دوایی یەکێك لەو حەوت فریشتەیەی حەوت جامەکەیان پێبوو پێی ووتم: (هەستە با سزای ئەو ژنە داوێن پیسە گەورەیەت پیشاندەم کە لەسەر ئاوە زۆرەکان دانیشتووەو [2] ئەوەی هەموو پادشاکانی زەوی داوێن پیسییان لەگەڵدا کردووەو دانیشتووانی زەوی بەشەرابی داوێن پیسییەکەی سەرخۆشبوون.) [3] ئینجا فریشتەکە لەرۆحدا بردمی بۆ دەشتودەر، سەیرم کرد ژنێك لەسەر درندەیەکی قرمزی کە پڕبوو لەناوی کفر دانیشتووە، درندەکە حەوت سەرو دە شاخی هەبوو. [4] ژنەکە بەمرواریو قرمز بەرگ پۆش بوو سەرتاپاشی بەزێڕو بەردی گرانبەهاو مرواری رازابۆوەو جامێکی زێڕینشیی بەدەستەوە بوو کە پڕبوو لەپیسیوگڵاوی داوێن پیسییەکەی. [5] لەسەر ناوچەوانیشی ناوێکی نهێنی نووسرابوو: (بابلی گەورە، دایکی داوێنپیسانو گڵاوەکانی زەوی.) [6] هەروەها ژنەکەم بینی بەخواردنەوەی خوێنی خوشكو برا پیرۆزەکانو خوێنی شەهیدەکانی عیسای مەسیح سەرخۆش ببوو. بەبینینی ژنەکە سەرسوورمانێکی گەورە دایگرتم.

[7] بەڵام فریشتەکە پێیووتم: (بۆ وا سەرت سوورما؟ من نهێنی ژنەکەو ئەو درندەیەی هەڵیگرتووە، کە حەوت سەرو دەشاخی هەیە بۆت ئاشکرا دەکەم. [8] ئەو درندەیەی بینیت هەبووەو ئێستا نییە، لەبیری بێبن دێتەدەرەوەو بۆ لەناوچوون دەڕوات. ئەو کەسانەی لەسەر زەوی دانیشتوون، ئەوانەی لەوەتای دروستبوونی جیهان ناویان لەپەرتووکی ژیان نەنووسراوە سەریانسوور دەمێنێ کاتێك دەبینن درندەکە هەبووەو ئێستا نییە،

هەرچەندە دێتەوەش. [9]دانایی مێشك لێرەدا دەردەكەوێت: حەوت سەرەكە ئەو حەوت گردەن كە ژنەكە لەسەریان دانیشتووە، [10]هەروەها حەوت پادشان، پێنجیان كەوتن‌و یەكێكیان هەیەو ئەوی تریان هێشتا نەهاتووە، كاتێكیش دێت پێویستە كەم بمێنێتەوە. [11]ئەو درندەیەی هەبووەو ئێستا نییە هەشتەمە، بەلاّم لەحەوتەكەیەو بەرەو لەناوچوون دەڕوات. [12]ئەو دە شاخەی بینیت دە پادشان تا ئێستا شانشینیان وەرنەگرتووە، بەلاّم بۆ ماوەی یەك كاژێر لەگەڵ درندەكە دەسەلاّتی پادشا وەردەگرن. [13]ئەوانە یەك مەبەستیان هەیەو تواناو دەسەلاّتی خۆیان دەدەنە درندەكە. [14]ئەوانە لەگەڵ بەرخەكە دەجەنگێن‌و بەرخەكە سەر دەكەوێت بەسەریاندا، چونكە بەرخەكە گەورەی گەورەكانەو پادشای پادشاكانە، ئەوانەی لەگەڵیدان بانگ‌كراو و هەڵبژێرراو و دڵسۆزن.)

[15]پاشان فریشتەكە پێی‌ووتم: (ئەو ئاوانەی بینیت كە ژنە داوێن‌پیسەكە لەسەری دانیشتبوو، ئەوە گەلو كۆمەڵو نەتەوەو زمانی جیاجیان. [16]بەلاّم درندەكەو دە شاخەكەی سەری، ڕق لەژنە داوێن‌پیسەكە هەڵدەگرن‌و ویران‌و ڕووت‌وقووتی دەكەن، ئێسك‌و گۆشتەكەی دەخۆن‌و بەئاگر دەیسووتێنن، [17]چونكە خودا خستوویەتیە دڵیان بەمەبەستی ئەو بكەن، هەروەها ڕێك بكەون‌و دەسەلاّتی خۆیان بدەن بەدرندەكە تا ووشەكانی خودا بێتەدی. [18]ئەو ژنەش كە بینیت ئەو شارە گەورەیەیە كە دەسەلاّتی بەسەر هەموو پادشاكانی زەویدا هەیە.)

### كەوتنی بابل

## 18

پاش ئەوە فریشتەیەكی ترم بینی لەئاسمانەوە هاتەخوارەوەو دەسەلاّتێكی گەورەی هەبوو، بەپرشنگداری ئەو زەوی ڕووناكبووەوە. [2]فریشتەكە بەدەنگێكی بەرز هاواری‌كردو ووتی: (كەوتەخوارەوە! كەوتەخوارەوە بابلی گەورە! بووە جێنشینی جنۆكەكان‌و ماڵی هەموو ڕۆحە پیسەكان‌و ماڵی هەموو باڵندەیەكی پیسی نەفرەت لێكراو. [3]چونكە

هەموو نەتەوەكان لەشەرابی داوێنپیسی ژنەكەیان خواردۆتەوەو پادشاكانی زەوی داوێنپیسییان لەگەڵدا كردووەو هەموو بازرگانەكانی زەوی دەوڵەمەندبوون بەنازو نعمەتی ئەو.)

[4]پاشان گوێم لەدەنگێكی تر بوو لەئاسمانەوە دەیووت: (لێی وەرنەدەرەوە ئەی گەلەكەم تابەشداری نەكەن لەگوناهەكانیو دەردەكانی نەگرن. [5]چونكە گوناهەكانی تا ئاسمان بەرزبوونەوەو بەبیری خودا هاتوونەتەوە. [6]سزای بدەن بەپێی ڕەفتارەكانیو دوو هێندەی كردارەكانی بدەنەوە، لەو جامەی تیایدا تێكەڵی كردبوو دوو هێندەی بۆ تێكەڵ بكەنەوە. [7]هێندەی ئەوەی شكۆی بەخۆی داوەو لەنازونعمەت ژیاوە، ئازارو غەمی بدەنێ، چونكە لەدڵی خۆیدا دەڵێ: (من وەك شاژن دانیشتووم، قەد نابم بەبێوەژنو غەمیش نابینم، [8]لەبەرئەوە هەموو دەردەكانی لەیەك ڕۆژدا دێن، مردنو برسێتیو غەم، هەروەها دەبێ بەئاگر بسووتێت، چونكە بەهێزە خوداوەند خودا ئەوەی تاوانباری دەكات.)

[9]هەموو پادشاكانی زەوی بۆی دەگرینو شیوەنی بۆ دەكەن، ئەوانەی لەگەڵی داوێن پیسییان كردووەو ڕایان بواردووە، كاتێك سەیری دووكەڵی سووتانەكەی دەكەن، [10]لەترسی ئازاردانەكەی لەدوورەوە دەوەستنو دەڵێن: (قوڕت بەسەر، قوڕت بەسەر شاری بابلی مەزن! شارە بەهێزەكە! لەیەك كاژێردا سزادانت هات.)

[11]بازرگانەكانی زەوی دەگرینو شیوەنی بۆ دەكەن چونكە ئیتر كەس كەلوپەلیان لیناكڕێت، [12]كەلوپەلی وەك زێڕو زیو و بەردی گرانبەهاو مروارىو كەتانو ئەرجەوانو حەریرو قرمزو هەموو دارێكی بۆندارو هەموو قاپێكی لەعاج دروستكراو و هەموو قاپێكی دروستكراو لەگرانبەهاترین تەختەو مسو ئاسنو مەڕمەڕو [13]دارچینو بخوورو شیرنەمەنیو شەرابو ڕۆنو ئاردو گەنمو مەڕو ماڵاتو ئەسپو عەرەبانەو لەشو گیانی مرۆڤ. [14]بازرگانەكان دەڵێن: (هەموو ئەو بەروبوومانەی حەزت لێی بوو لەدەستت چوو، هەروەها هەموو دەوڵەمەندیو سەڵتەنەتت لێسەندرایەوەو ئیتر نایاندۆزیتەوە.)

[15]بازرگانەکانی ئەم شتانە ئەوانەی بەهۆی ئەوەوە دەوڵەمەند بوون لەترسی ئازاردانەکەی لەدوورەوە دەوەستن، دەگرینو شیوەن دەگێڕنو دەڵێن: ([16]خاك بەسەرت، خاك بەسەرت ئەی شارە گەورەکە ئەوەی بەقوماشو قرمزو کەتان پۆشرابووی، بەزێڕو بەردی گرانبەهاو مرواری ڕازابوویەوە. [17]چونکە لەیەك کاژێردا دەوڵەمەندییەکی ئاوها وێرانبوو.)

هەموو کەشتیوانو هەموو گەشتکەرانو هەموو کرێکارانی کەشتیو هەموو ئەوانەی لەدەریا کار دەکەن لەدوورەوە وەستان. [18]کاتێك چاویان بەدووکەڵی سووتانەکەی کەوت هاواریان کردو وتیان: (چ شارێك وەك شارە مەزنەکە وابوو؟) [19]خۆڵیان بەسەری خۆیاندا کردو بەگریانو شیوەنەوە هاواریان کردو وتیان: (خاكبەسەر! خاكبەسەر شارە گەورەکە! ئەوەی هەموو خاوەن کەشتی دەریا سوودمەند بوون لەدەوڵەمەندی ئەو! چونکە لەیەك کاژێردا شارەکە وێرانبوو.) [20]دڵشادبە ئەی ئاسمان بەوێرانی ئەو، ئەی نێرراو و خوشكوبرا پیرۆزەکانو پێغەمبەران، چونکە خودا ئەوی سزادا بەو شێوەیەی ڕەفتاری لەگەڵ کردن.

[21]ئینجا فریشتەیەکی بەهێز بەردێکی بەرزکردەوە وەك بەردی ئاش وابوو، بەردەکەی فڕێدایە ناو دەریاو وتی: (بەمشێوەیە بەیەك پاڵ شاری بابلی مەزن فڕێ دەدرێو ئاسەواری نامێنێو [22]دەنگی ئەوانەی قیسارە دەژەنن‌و گۆرانی دەڵێنو بلوێرو زوڕنا لێدەدەن ئیتر لەشارەکەوە نابیسترێت، هەروەها وەستای هیچ پیشەسازییەکی تیایدا نابێتو ئیتر دەنگی بەردی ئاشی تیادا نابیسترێت. [23]هیچ چرایەك تیایدا هەڵناکرێتو ئیتر دەنگی بووكو زاوا تیایدا نابیسترێت، چونکە بازرگانەکانت گەورەی زەویبوونو بەسیحری تۆ هەموو نەتەوەکان گومڕابوون. [24]لەناو شارەکەدا خوێنی پێغەمبەرانو خوشكو برا پیرۆزەکانو هەموو ئەوانەی لەسەر زەوی کوژران بینراوە.)

**هەلیلویا! حوکمڕانی بۆ خوداوەند**

# 19

پاش ئەمە دەنگێکی بەرز لەکۆمەڵێکی زۆر لەئاسمانەوە هاتە بەرگوێم دەیووت: (هەڵیلویا*! ڕزگاری‌و شکۆمەندی‌و هێز بۆ خودامانە، 2 چونکە حوکمەکانی ڕاست‌و دادپەروەرن، ئەوەتا ژنە داوێن‌پیسە گەورەکەی تاوانبارکرد کە هەموو زەوی بەداوێن‌پیسیەکەی پیس‌کرد بوو، تۆڵەی خوێنی خزمەتکارانی خۆی لیٚ‌کردەوە کە بەدەستی ئەو خوێنیان ڕژابوو.) 3 کۆمەڵە زۆرەکەی ئاسمان دووبارە ووتیان: (هەلیلویا! دووکەڵەکەی بۆ هەتاهەتایە بۆ ئاسمان بەرزدەبێتەوە.) 4 بیست‌و چوار پیرەکەو چوار زیندەوەرەکە کەوتنە سەر چۆک‌و کڕنۆشیان بۆ خودای خاوەن تەخت بردو ووتیان. (ئامین. هەلیلویا!) 5 لەتەختەکەوە دەنگێك هاتەدەرەوە ووتی: (ستایشی خودامان بکەن ئەی هەموو خزمەتکارانی کە ترسی ئەوتان لەدڵدایە بەگەورەو بچووکەوە.) 6 پاشان دەنگێك وەك دەنگی کۆمەڵێکی زۆرو خوڕەی ئاوێکی زۆرو دەنگی هەورە تریشقەی بەهێز هاتە بەرگوێم دەیانووت: (هەلیلویا! حوکمڕانی بۆ خوداوەند خودامان، توانادار بەسەر هەموو شتێکدا. 7 بادڵخۆش‌و شادومان بین، شکۆداری بکەین، چونکە کاتی زەماوەندی بەرخەکە هاتووەو بووکەکەشی خۆی ئامادەکردووە، 8 کراسێکی کەتانی پاك‌و پرشنگداری پێدرابوو تا لەبەری بکات، ئەم کەتانەش هێمای کردەوە ڕاست‌ودروستەکانی خوشك‌وبرا پیرۆزەکانە.)

9 فریشتەکە پێی ووتم: (ئەمە بنووسە، خۆزگەدەخوازرێ بەوانەی بۆ زەماوەندی بووك گواستنەوەی بەرخەکە بانگکراون.) هەروەها پێی ووتم: (ئەمە ووشە ڕاستەکانی خودان.) 10 ئینجا لەبەردەم پێی فریشتەکەدا کەوتمە سەر چۆك تا کڕنۆشی بۆ ببەم، بەڵام فریشتەکە پێی ووتم: (وامەکە! منیش وەکو تۆ و براکانت خزمەتکارم، ئەوانەی شایەتی عیسایان هەیە. کڕنۆش بۆ خودا ببە.) چونکە شایەتی عیسا ڕۆحی پێغەمبەرایەتییە.)

### سواری ئەسپێکی سپی

11 پاشان ئاسمانم بەکراوەیی بینی، ئەسپێکی سپیم بینی‌و سوارەکەی بەدڵسۆزو ڕاستگۆ ناودەبرا،

بەدادپـــەروەری حوکـــم دەداتو دەجەنگێت. [12]چاوەکانی وەك گڕی ئاگـر وابوونو ژمارەیەکی زۆر تاجی بەســەرەوەبوو، نـاوێکی نووسـراوی هەیـە، خـۆی نەبێت کەس نایزانێت. [13]سـوارەکە جلێکی سەرتاپا لـەخوێن هەڵکێشـراوی لەبەربوو، ئەو ناوەش کـە پێی بانگدەکرا (ووشەی خودا) بـوو. [14]ئـەو سەربازانەی لەئاسماندان بەسـواری ئەسـپی سـپی شـوێنی دەکـەوتنو جلـێکی کـەتانی سـپی پاکـیان لەبـەردا بـوو. [15]لــەدەمی ســـوارەکەوە شمشــێرێکی تــیژ دەهاتـــەدەرەوە، تـــا بـــۆ لـــێدانی نەتـــەوەکان بـــەکاری بهێـــنێ، ئـــەو بەگۆپاڵـێکی ئاسـنین سەرپەرشـتییان دەکـاتو پێشـی دەنێت بەگوشەری شـەرابی توڕەیـی خـودای توانـادار بەسـەر هەموو شتێك. [16]لەسەر جلو ڕانـی سـوارەکە ئـەم ناوە نووسراوە: پاشای پاشایانو گەورەی گەورەیان.

[17]دوایـی فریشـتەیەکی تـرم بینی لەبـەر خـۆردا وەسـتابوو. فریشتەکە بەدەنگـێکی بـەرز هـاواری لەهەموو باڵـــندە هەڵفـــڕیوەکانی ناوەڕاســـتی ئاسمـان کـردو ووتـی: (وەرن بۆ نان خواردنـی ئـێوارەی خـودای مـەزن کۆببـنەوە، [18]بـۆ ئـەوەی گۆشـتی پادشاکانو سەرۆکەکانو بەهێزەکان، گۆشـتی ئەسـپەکانو سـوارەکانیان، گۆشتی هەموو ئازادێكو کۆیلەیەكو گەورەو بچوکێك بخۆن.)

[19]هـەروەها دڕندەکەو پادشاکانی زەویو ســـــەربازەکانیانم بیـــــنی کۆببووبوونـەوە بـۆ ئـەوەی جەنگێك دژی ســـوارەکەو ســـەربازەکانی بەرپابکـەن. [20]دڕندەکـەو پێغەمـبەرە درۆزنەکـەی لـەگەڵی دابوو دەستگیر کـران. ئـەو پێغەمـبەرەی بەووتەکانی ئـەو کەسـانەی گومـڕا کـردبوو کە بەنیشـانەی دڕندەکە ڕازی بووبوون، هــەروەها ئەوانــەی کڕنۆشـیان بـۆ وێـنەکەی بـرد بـوو. هەردووکـیان بەزیـندوویی فـڕێدرانە دەریاچـەی ئاگرەوە کە بەگۆگرد داگیرساوە. [21]پاشماوەکـەی تـر بـەو شمشـێرەی سـوارەکە کـوژران کـە لەدەمـیەوە دەهاتـە دەرەوەو هـەموو باڵـندەکان لـەگۆشتەکانیان تێربوون.

## دەستگیرکردنی شەیتان

# 20

فریشـتەیەکی تـرم بیـنی لەئاسمانـەوە هاتـەخوارەوەو کلیـلی بـیری بێبنی

پێ‌بوو، هەروەها زنجیرێکی گەورەی بەدەستەوە بوو. [2]فریشتەکە ئەژدیهاکەی دەستگیرکرد، کە مارە دێرینەکەیە، کە شەیتانو ئیبلیسە، هەزار ساڵ بەستییەوەو [3]فڕێی دایە بیری بێ‌بنو دەرگای لەسەر داخستو مۆرێکی لێدا تا ئیتر میللەتان گومڕا نەکات تاماوەی هەزار ساڵەکە تەواو دەکات. پاش ئەمە بۆ ماوەیەکی کەم دەبێ ئازاد بکرێت.

### حوکمی هەزار ساڵەی مەسیح

[4]چەند تەختێکم بینی ئەوانەی لەسەری دانیشتبوون دەسەڵاتی دادگاییکردنیان پێدرابوو. هەروەها گیانی ئەوانەم بینی کە لەپێناوی شایەتی عیساو ووشەی خودا سەربڕابوون، ئەوانەش کە ڕازی نەبوون کڕنۆش بۆ دڕندەکە یاخود وێنەکەی ببەنو ڕازیش نەبوون نیشانەکەی لەسەر دەستیان یاخود لەسەر ناوچەوانیان بدەن، ئەوانە هاتنەوە ژیانو بۆ هەزار ساڵ لەگەڵ مەسیح دەسەڵاتیان پێدرا. [5]بەلاَم مردووەکانی تر تا هەزار ساڵەکە تەواو نەبوو نەژیان. ئەمە هەستانەوەی یەکەمە. [6]ئەوەی لەهەستانەوەی یەکەمدا بەشی هەبێت پیرۆزەو خۆزگەی پێ‌دەخوازرێت. ئەوانە مردنی دووەم دەسەڵاتی نییە بەسەریاندا، چونکە دەبنە کاهینی خوداو مەسیح، لەگەڵ مەسیحیش هەزار ساڵ حوکمڕانی دەکەن.

### کەوتنی شەیتان

[7]هەروەها پاش تەواو بوونی هەزار ساڵەکە شەیتان لەزیندان ئازاد دەکرێت. [8]دێتە دەرەوە تا نەتەوەکانی چوارگۆشەی زەوی گومڕا بکات، ئەمەش جوجو ماجوجە بۆ ئەوەی کۆیان بکاتەوە بۆ جەنگ، ئەوانەی ژمارەیان هێندەی لمی دەریایە. [9]سەرکەوتن بۆ سەر پانتایی زەویو شارە خۆشەویستەکەو ئۆردوگای خوشكو برا پیرۆزەکانیان گەمارۆدا، لەئەنجامدا ئاگرێك لەلایەن خوداوە هاتەخوارەوەو خواردنی. [10]هەروەها ئەو شەیتانەی گومڕای کردبوون فڕێ درایە ناو دەریاچەی ئاگرو گۆگردەکە بۆ هەمان شوێنی دڕندەکەو پێغەمبەرە درۆزنەکە. ئەوانە شەو و ڕۆژ تاهەتایە ئازار دەدرێن.

## تاوانبارکردنی مردووان

[11]پاشان تەختێکی گەورەی سپیم بینی، ئەوەی لەسەری دانیشتبوو ئاسمانو زەوی لەبەر ڕووی هەڵاتبوونو شوێنی تریان نەدۆزیەوە بۆ خۆیان. [12]مردووەکانم بینی بەگەورەو بچووکەوە لەبەردەم تەختەکە وەستابوونو چەند پەرتووکێك کرابوونەوە، پەرتووکێکی تریش کە پەرتووکی ژیانبوو کرابووەوە مردووەکان بەپێی کردەوەکانیان ئەوەی لەپەرتووکەکان نووسرابوو حوکمدران. [13]دەریاش مردووەکانی ناوخۆی دەرکرد، هەروەها مردنو دونیای مردووان مردووەکانی خۆیان دایەدەستو هەریەك بەپێی کارەکانی خۆیان حوکمدران. [14]ئینجا مردنو دونیای مردووان فڕێدرانە ناو دەریاچەی ئاگرەکەوە. ئەمە مردنی دووەمە، [15] هەروەها هەر کەسێك ناوی لەپەرتووکی ژیاندا نەنووسرابوو، فڕێدرایە ناو دەریاچە ئاگرەکەوە.

## ئاسمانێکی نوێو زەویەکی نوێ

# 21

پاشان ئاسمانێکی نوێو زەویەکی نوێم بینی، چونکە ئاسمانی یەکەمو زەوی یەکەم بەسەر چوونو دەریاش ئیتر ئاسەواری نەما. [2]هەروەها شارە پیرۆزەکە، قودسی نوێم بینی لەئاسمانەوە لەلایەن خوداوە هاتەخوارەوەو وەك بووکێکی ڕازاوە کە خۆی بۆ زاواکەی ئامادە بکات. [3]گوێم لەدەنگێکی گەورە بوو لەئاسمانەوە ووتی: (ئەوە چادری خودایە لەناو خەڵکداو خودا لەگەڵیان نیشتەجێ دەبێتو ئەوان دەبن بەگەلی خودا، خوداش لەگەڵیان دەبێت. [4]خودا هەموو فرمێسکەکانی چاویان دەسڕێتەوەو مردن ئیتر نامێنێت، ئیتر غەمو هاوارو ئازار نامێنن، چونکە شتەکانی پێشوو بەسەرچوون.)

[5]دانیشتووی سەر تەختەکە ووتی: (ئەوەتا من هەموو شتێك نوێ دەکەمەوە.) هەروەها پێی ووتم: (بنووسە، چونکە ئەم ووتانە ڕاستەو مایەی متمانەن.) [6]پاشان پێی ووتم: (ئەوا هاتەدی، من ئەلفو یێم، من سەرەتاو کۆتاییم، من لەسەرچاوەی ئاوی ژیان بەخۆڕایی ئاو بە تینوو دەدەم. [7]ئەوەی سەر بکەوێت ئەو میراتەی بۆ دەمێنێتەوەو من دەبم

بەخودای ئەو، ئەویش دەبێتە ڕۆڵەی من. [8] بەڵام ترسنۆکەکانو گڵاوەکانو بێ باوەڕەکانو داوێن پیسەکانو بکوژەکانو جادوکەرەکانو بتپەرستەکانو هەموو درۆزنەکان، پاداشتیان فڕێدانە بۆ ناو ئەو دەریاچەیەی بەئاگرو گۆگرد داگیرساوە، ئەوەی مردنی دووەمە.)

**قودسی نوێ**

[9]پاشان فریشتەیەك لەو حەوت فریشتەیەی ئەو حەوت جامەیان پێیە کە بەحەوت دەردەکەی کۆتایی پڕ کراون بۆ لام هاتو لەگەڵم دوا، ووتی: (با بووکەکە، ژنی بەرخەکەت پێ نیشان بدەم.) [10] پاشان بەڕۆحی پیرۆز بردمی بۆ سەر چیایەکی گەورەی بەرزو شارە گەورەکە قودسی پیرۆزی نیشاندام، ئەو شارەی لەئاسمانەوە لەلایەن خودا دەهاتەخوارەوەو [11] شکۆمەندی خودای هەبوو، شارەکە وەك بەردی گرانبەها دەدرەوشایەوە، وەك یەشب بوو، ڕوون بوو وەك کریستاڵ. [12] شارەکە شوورەیەکی گەورەی بەرزی هەبوو و دوانزە دەرگای هەبوو لەسەر دەرگاگان دوانزە فریشتە هەبوونو لەسەر دەرگاکان ناوی دوانزە هۆزەکەی ڕۆڵەکانی ئیسرائیل نووسرابوو. [13] لەلای ڕۆژهەڵاتەوە سێ دەرگاو لەلای باکورەوە سێ دەرگاو لەلای باشورەوە سێ دەرگاو لەلای ڕۆژئاواوە سێ دەرگا. [14]شوورەی شارەکە دوانزە بناغەی هەبوو، لەسەر ئەو بناغانە ناوی دوانزە نێراوەکەی بەرخەکە نووسرابوو.

[15]ئەوەی لەگەڵم دەدوا دارێکی پێوانی زێڕینی پێبوو تا شارەکەو دەرگاکانیو سنورەکەی پێ بپێوێت. [16]شارەکە بەچوار گۆشەیی دانرابوو، درێژیەکەی هێندەی پانیەکەی بوو، فریشتەکە شارەکەی بەدارەکە پێوا، بینی هەر لایەکی دوانزە هەزار ستادیەیە*، درێژیەکەیو پانیەکەیو بەرزیەکەی هێندەی یەکتر بوون. [17] پاشان فریشتەکە شوورەی شارەکەی

*دوانزە هەزار ستادیە: نزیکەی دوو هەزارو دوو سەد کیلۆمەترە.

پێوا دەرچوو سەدو چلو چوار قۆڵ بوو بەقۆڵی مرۆڤ، ئەو پێوانەی فریشتەکە بەکاریهێنا. [18]شوورەکە لەبەردی یەشب دروست کرابوو، شارەکەش لەزێڕی پوختەکراو دروستکرابوو وەك شووشە ڕووناكو پاك بوو. [19]بناغەکانی شوورەی شارەکە بەهەموو گەوهەرێکی گرانبەها ڕازاندرابووەوە. بناغەی یەکەم بەیەشبو دووەم یاقووتی شینو سێهەم یاقووتی سپیو چوارەم زومرودو [20]پێنجەم شیلانەی ڕەنگینو شەشەم یاقووتی سوورو حەوتەم زەبەرجەدو هەشتەم زمرودی سەوزو نۆهەم یاقووتی زەردو دەیەم یاقووتی سەوزو یانزەهەم فەیروزو دوانزەهەم جەمشت. [21]هەروەها دوانزە دەرگای شارەکەش دوانزە مرواریبوو، هەریەك لەو دەرگایانە لەیەك دەنکە مرواری دروستکرابوو، شەقامی گشتی شارەکەش لەزێڕی پوختەی وەك شووشەی تەنك دروستکرابوو.

[22]بەلاّم لەناو شارەکە هیچ پەرستگام بەرچاونەکەوت، چونکە خوداوەند خودای توانادار بەسەر هەموو شتێك، لەگەڵ بەرخەکە پەرستگای شارەکە بوون. [23]هەروەها شارەکە پێویستی بەخۆرو مانگ نەبوو بەسەریدا بدرەوشێتەوە، چونکە شکۆمەندی خودا ڕووناکیەکەیەتیو بەرخەکەش چراکەیەتی. [24]میللەتان بەهۆی ڕووناکی ئەوەوە بەڕێگادا دەڕۆنو پادشاکانی زەویش شکۆمەندی خۆیانی بۆ دەهێنن، [25]دەرگاکانی شارەکە بەڕۆژ داناخرێنو شارەکە [26]شەوی بەسەردا نایەت، شکۆمەندیو ڕێزی میللەتانیشی بۆ دەهێنن. [27]بەلاّم نەهیچ شتێکی پیسو نەهیچ کەسێکی داوێن پیسو درۆزن ناچنە ناو شارەکە، تەنها ئەوانە دەچنە ناو شارەکە کە ناویان لەپەرتووکی ژیانی بەرخەکە نووسراوە.

## ڕووباری ژیان

## 22

پاشان فریشتەکە ڕووباری ئاوی ژیانی پیشاندام، پرشنگدار بوو وەك کریستال، لەتەختی خوداو بەرخەکەوە هەڵدەقولاّ [2]بەناوەڕاستی شەقام، هەروەها لەسەر هەردوو ڕۆخی ڕووبارەکە درەختی ژیان ڕووا

بـوو کە دوانزە جۆر بەری دەگرت، هـــەموو مانگـــێك بەرەکـــەی پێدەگەیشـــتو گـەڵاکانی درەختەکە وەك دەرمـــان بەکاردەهێـــنران بـــۆ چـاکبوونەوەی گەلان. [3]ئیتر نەفرەت لـیٚکـردن نامێنێـتو تەختـی خوداو بەرخەکـە لـەناو شـارەکەدا دەبـنو بـــەندەکانی خـــزمەتی دەکـــەن. [4]بـــەندەکان تەماشـــای دەموچـــاوی بەرخەکـە دەکـەنو نـاوی بەرخەکـە لەسـەر نێوچـەوانیان نووسـراوە. [5]لــەویٚ شــەو دانایــەتو خەڵکـیش پێویسـتییان بەچـراو خـۆر نابێـت، چـونکە خوداوەنـد خـودا بەسەریان دەدرەوشـێتەوەو ئەوانـــە تاهەتایـــە حوکمڕانی دەکەن.

[6]پاشان فریشتەکە پێی ووتم: (ئەم ووشـانە جـێی مـتمانەیەو ڕاسـتن، خوداوەنـد ئـەو خودایـەی ڕۆحـی بەپێغەمـبەرەکان داوە، فریشـتەکەی خـۆی نـارد بـۆ ئـەوەی ئـەو شـتانە پیشـانی بـەندەکانی خـۆی بدات کە پێویستە بەم زووانە ڕووبدەن.)

**من بە پەلە دێم**

[7](ئـەوەتا مـن بەپەلـە دێـم! خۆزگـــەدەخوازریٚ بەوانـــەی ووشـەکانی پێشبینی ئەم پەرتووکەیان لایە.)

[8]مـن یۆحەننام، ئەم شتانەم بینیو بیستم. کاتێك بینیمو بیستم، کەوتمە سەرچـۆك تـا کـرنۆش بۆ فریشتەکە ببەم، ئـەو فریشـتەیەی ئـەم شتانەی پیشـان دەدام، [9]فریشتەکە پێی ووتم: (وامەکـە! چـونکە منیش وەکـو تۆ بـەندەم لەگـەڵ بـرا پێغەمـبەرەکانو هـەموو ئەوانـەی بەووشـەکانی ئـەم پەرتووکـە کـار دەکـەن. کرنۆش بۆ خودا ببە!)

[10]هـەروەها پـێی ووتم: (مـۆر لە ووشـەکانی پێشـبینی ئـەم پەرتووکـە مـەدە، چـونکە کات نزیكبووەتەوە. [11]ئـیتر ئـەوەی سـتەمکارە بابەردەوام بێـت لەسـتەمکاری خـۆیو ئـەوەی گـلاٚوە بابـەردەوام بێـت لـەگلاٚوی خـۆی، ئـەوەی ڕاسـتودروسـتە بابـەردەوام بێـت لەڕاسـتودروستی خۆیو ئەوەی پاكوپیرۆزە بابەردەوام بێت لەپاكوپیرۆزی خۆی.)

[12](ئەوەتا من بەپەلە دێم! پاداشتی خـۆم پێـیە، بـۆ ئـەوەی پاداشتی هەر کەسێك بەپێی کارەکەی بدەمەوە. [13]مـن ئـەلفو یێـم، یەکـەمو دوایـی، سەرەتاو کۆتاییم.)

[14]خۆزگــەدەخوازریّ بەوانــەی جلەکانــیان پــاك کــردووەتەوە، تــا مافــیان لەدرەخــتی ژیــان هەبیّــتو لەدەرگاکانەوە بچنە ناو شارەکە. [15]بــەلاّم ســەگەکانو جادووکەرەکانو داویّــــنپیســــەکانو بکوژەکــــانو بــتپەرستەکانو هەموو درۆزنەکانو ئەوانــەی حــەز لــەدرۆ دەکــەن لەدەرەوەی شارەکە دەبن.
[16](مـن عیسام، فریشتەکەی خۆم بۆتــان نــارد تــا لەبارەی ئەم شتانە بۆ کۆمەلّە باوەڕدارەکان شایەتیم بۆ بدا. مــن لەڕەچــەلّەكو پشــتی داودم، ئەستێرەی بەرەبەیانی پرشنگدارم.)
[17]ڕۆحــی پــیرۆزو بــووك دەلّیّن: (وەرە!) ئــەوەی گوێــی لیّــیە بــابلیّ (وەرە!) ئــەوەی تیــنوویەتی بابیّــت، ئــەوەی دەیەویّــت بائــاوی ژیــان بەخۆرایی ببات.
[18]مـن ئاگاداری ئەوانە دەکەمەوە کــە گوێیان لەووشەکانی پیّشبینی ئەم پەرتووکــە دەبــیّ، هــەر کەسیّك ووشەیەك بۆ ئەم پیّشبینییە زیاد بکات خــودا ئــەو دەردانــەی لەســەر زیــاد دەکات کە لەم پەرتووکە باسکراوە، [19]ئــەوەش ووشــەیەك لەووشــەکانی پیّشــبینییەکەی ئــەم پەرتووکە لابدات خودا بیّبەشی دەکات لەداری ژیانو لەشــارە پیرۆزەکــە ئــەوەی لــەم پەرتووکەدا باسکراوە.
[20]شایەتی ئەم شتانە دەلّیّ: (بەلّیّ من بەپەلە دیّم.)
ئــامین! وەرە، ئــەی عیســای خوداوەند.
[21]بەرەکــــەتی خوداوەندمــــان عیســای مەســیح لەگــەلّ هــەموو خوشكو برا پیرۆزەکان بیّت. ئامین.

*ڕوونکردنەوەی زاراوەکان*

ئەرتامیس: (کردار 19:24)

خوداوەندی دایك بوو لای خەڵکی ئەفەسۆس، وایاندەزانی پەیکەرەکەی لەئاسمانەوە کەوتۆتەخوارەوە.

ئەشعیا: (مەتتا 3:3)

یەکێکە لەپێغەمبەرە ناودارەکانی خودا لەپەیمانی کۆن، لەسەدەی هەشتەمی پ.ز. لەشاری قودس (ئۆرشەلیم) ژیاوە. لەکتێبی پیرۆزدا نووسراوێکی گەورەی هەیە بەناوی خۆی، سەدان ساڵ پێش هاتنی عیسا پێشبینی هاتنی کردبوو.

ئەلیاس: (مەتتا 11:14)

یەکێکە لە پێغەمبەرە ناودارەکانی خودا لە پەیمانی کۆن، لەسەدەی نۆیەمی پ.ز ژیاوە. لەکتێبی پیرۆزدا ناوی هاتووە، چەندەها کاری گەورەو سەرسوڕهێنەری کردووە، تا ئێستاش نەمردووەو بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان. لەکوردەواری ئەلیاس پێغەمبەری پێدەوترێ.

ئەنتاکیا:

لەسەردەمی مەسیح دوو شار هەبوون بەناوی ئەنتاکیا، یەکێکیان لەناوچەی پیسیدیە بوو، بۆیە بەئەنتاکیای پیسیدیە ناوی دەرکردبوو (کردار 11:19). ئەوی دیکەیان لە سەر سنوری سوریایە، تا ئێستا ماوەو سەر بە تورکیایە (کردار 14:26).

ئەنجوومەنی باڵای جوولەکە:

یان سەنهیدرین (مەتتا 5:22) لەسەردەمی ژیانی عیسا ئەم ئەنجوومەنە هەبوو، بریتی بوو لە 71 ئەندام، سەرۆکی کاهینەکان یەکێك بوو لەوانو سەرکردایەتی ئەنجوومەنەکەی دەکرد، ئەم ئەنجوومەنەش بوو مەسیحی گرتو دادگایی کرد.

ئیبراهیم: (مەتتا 1:1)

سەرەتا ناوی ئەبرام بوو، واتە باوکی پایەبەرز. بەڵام پاش ئەوەی خودا بەڵێنی پێدا نەوەی زۆر بکات، پێی ووت ناوی خۆت بکە بەئیبراهیم، واتە باوکی کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر. لەئینجیل بەباوکی باوەڕداران ناوی براوە، لەکوردەواریش بەحەزرەتی ئیبراهیم.

ئیبلیس: (بینین 12:9)
بڕوانە ووشەی (شەیتان).

ئیرمیا: (مەتتا 2:17)
یەکێکە لە پێغەمبەرەکانی خودا لەپەیمانی کۆن. لەسەدەی حەوتەمی پ.ز. ژیاوە، بەچەند سالێك پاش (587 پ.ز.) کۆچی دوایی کردووە. لەکتێبی پیرۆزدا دوو نووسراوی هەیە، پێشبینی زۆری هەیە لەسەر هاتنی مەسیح.

ئیسرائیل: (مەتتا 2:6)
ناوێکی عیبریە واتە (خودا دەجەنگێ)، خودا ئەم ناوەی بەیاقوبی کوڕی ئیسحاق بەخشی، لەبەرئەوە نەوەی یاقوب بەنەوەی ئیسرائیل یان گەلی ئیسرائیل ناوی دەرکرد.

ئینجیل: بڕوانە پێشەکی.

بابل: (بینین 17:5)
ووشەیەکی ئەکەدیە واتە (دەرگای‌خودا)، پایتەختی پادشایەتی بابلیەکان بووە لەسالانی (605-539) پ.ز. ناوی بابل بوو بەهێما بۆ ئەو دەسەلاتەی بەرەنگاری خودا دەبێتەوە. لەپەیمانی نوێ ناوی بابل وەك هێما بۆ شاری ڕۆما بەکار هێنراوە.

باجگر: (مەتتا 9:10، 11)
ئەو کەسە بوو کە باجی لەخەلکی وەردەگرت بۆ ڕۆمەکان. هەندێ لەجوولەکەکانی فەلەستین هەلدەستان بەئەنجامدانی ئەم کارە بۆ ڕۆمەکان بەرامبەر ئەوەی باجێکی زیاتر لەخەلکی وەرگرن بۆ خۆیان. لەبەر ئەوە خەلکی ڕقیان لەباجگران دەبووەوە، بەچاوێکی سووك تەماشایان دەکردن.

بەرەکەت: (ڕۆما 3:24)
لەووشەی (خارس)ی یۆنانی وەرگێڕدراوە، بەواتای هەموو ئەو شتە چاکانەیە کە بێ ئەوەی شایانی بین خودا بەخۆڕایی دەمان داتێ، وەك: بێ‌تاوان بوون، پیرۆزکردن، پارێزگاری‌کردن، .. هتد)، لەسەرووی هەموویانەوە ئەو بەزەییو خۆشەویستیەی کە هەیەتی بۆمان، لەپلانی ڕزگارکردنمان لەمردن دەردەکەوێت بەقوربانی مەسیح،

لەکاتێکدا هەموو شایانی دۆزەخ بووین.

بەرۆژوو بوون: (مەتتا 6:16)
لەئامۆژگاریەکانی مەسیح دەربارەی ڕۆژووگرتن هیچ یاسایەکی دیاری کراو نییە، بەڵکو باوەڕدار ئازادە لەدیاری کردنی کاتو ماوەو جۆری ڕۆژووگرتن، چونکە ڕۆژووگرتن شتێکە پەیوەندی بەباوەڕدارو خودای خۆی هەیە.

بەعلەزبول: (مەتتا 12:24)
یەکێکە لەناوەکانی شەیتان، سەرۆکی ڕۆحە پیسەکانە.

بەیتلەحم: (مەتتا 2:5)
شارێکی بچووکە لەدووری 8 کم لەباشووری ڕۆژئاوای قودسە، عیسای مەسیحو حەزرەتی داود لەم شارە لەدایكبوون.

بیری بێبن: (بینین 9:11)
بەیۆنانی (ئابۆسۆس) هەر کەسێك بەبێ باوەڕ بە لەش بمرێ دەخرێتە بیری بێبن، لەو شوێنەش هیچ پەیوەندییەکی نابێ لەگەڵ خوداو لەتاریکی دەبێ، تا ڕۆژی لێپرسینەوە بەرەو دۆزەخ دەنێررێ.

بێتاوانکردن: (ڕۆما 3:24)
ئەم زاراوەیە تەنها دادوەر بۆی هەیە کاری پێبکات. خوداش گوناهبار بێتاوان دەکات کاتێ دان بەتاوانی دەنێو باوەڕ دەهێنێ مەسیح لەسەر خاچ تاوانەکانی ئەوی هەڵگرتووەو بێتاوانی خۆی داوەتێ.

پادشاهێتی ئاسمان: (مەتتا 4:17)
یان پادشاهێتی خودا، ئەو پادشایەتیە لەئاسمانە، خودا خۆی پادشایە تیایدا. خواستی تەواوی خودای تیادا پەیڕەو دەکرێ. مرۆڤیش کاتێ باوەڕ دەهێنێو لەڕۆح لەدایكدەبێتەوە، دەبێ بە ئەندامو ناردەستی خودا لەو پادشاهێتیەو بەپێی خواستی خودا دەژی. پاش ئەوەی مزگێنی بە هەموو گەلان دەدرێ، لەدووەم هاتنەوەی مەسیح، ئەم پادشاهێتیە دێتە سەر زەوی. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە بڕوانە (بینین21).

پەردەی پەرستگا: (مەتتا 27:51
)

مەبەست لەو پەردەیە کە شوێنی پیرۆز لەشوێنی هەرە پیرۆز جیادەکاتەوە لەناو پەرستگا. ڕەمزی داخراوی ڕێگایە لەنێوان خوداو خەڵك بەهۆی گوناه، بەڵام بەخۆبەختکردنی عیسا لەسەر خاچ، پەردەکە دڕا، نیشانەی بوونی عیسا بەڕێگا بۆ ئاسمان.

پەرستگا: (یۆحەننا 2:14، 15)
حەزرەتی سلێمان لەساڵی چوارەمی حوکمڕانیدا (نزیکەی 968پ.ز.) بەفەرمانی خودا پەرستگایەکی دروست کرد بۆ ئەوەی جوولەکەکان قوربانی تیادا پێشکەش بکەن بۆ خودا. لەکاتی ڕاپێچکردن بۆ بابل تێکدرا، بەڵام پاشان چاککرایەوە. لە ساڵی 70ز. بەدەستی ڕۆمەکان وێرانکرا، لەو کاتەوە چاك نەکراوەتەوە. ئەم پەرستگایە پیرۆزیەکی تایبەتی هەیە لای جوولەکەکان تا ئێستاش.

پەیمان: (غەلاتیە 3:15)
بەو پەیوەندییە دەوترێ دوولایەن یان زیاتر بەیەکەوە دەبەستێ کە پێویستیان بەیەکەو سوودی هەموو لایەکی تیادایە. بەڵام پەیمان لەنێوان خوداو مرۆڤ جیاوازە، چونکە خودا پێویستی بەمرۆڤ نییە، تەنها لەبەرئەوەی مرۆڤی خۆشدەوێ پەیمانی لەگەڵ دەبەستێ کە هەموو سوودەکەی بۆ مرۆڤە.

پەیمانی کۆن: (2کۆرنسۆس 3:14)
باوەڕداران بەمەسیح بەپەرتووکە پیرۆزەکانی جوولەکەکان دەڵێن پەیمانی کۆن کە دەکرێ بەسێ بەشەوە، بەعیبری (تەورا، نەبییم، کەتوبیم)، واتە: تەورات، نووسراوی پێغەمبەرەکان، زەبووری حەزرەتی داود، لەگەڵ چەند نووسراوێکی دیکە. پێغەمبەران، ئیرمیاو حەزقیال لە(نەبییم) پێشبینی ئەوەیان کرد کە خودا پەیمانێکی نوێ بەهۆی مەسیح لەگەڵ هەموو میللەتان دەبەستێ. لەکتێبی پیرۆزدا ئەم نووسراوانە بەپێی مێژوو یەك لەدوای یەك ڕێکخراون. باوەڕداران بەمەسیح باوەڕیان وایە هەموو کتێبی پیرۆز ووتەی خودایەو بەسوودە بۆ فێرکردنو شایەتیدان لەسەر ژیانو مردنو هەستانەوەی عیسای مەسیح. بڕوانە (

2تیمۆســـــاوس 3:16)، (لۆقـــا 24:44).

پەیمانی نویێ: (لۆقا 22:20)

ئــەو پەیمانەیــە کــەخودا لەگــەڵ بــاوەڕداران بــە عیســای مەســیح بەستوویەتی، لەبەر ئەمە بە ئینجیل دەووتـریێ پەیمانی نویێ، بەرامبەر ئەمە بـە نووسـراوی پێغەمـبەرە کۆنـەکان دەووتریێ پەیمانی کۆن.

پیر:

لــەناو جوولەکەکان بە سەرۆکی خێزانەکـانو هۆزەکان دەووتریێ، کە بەشـێکی زۆری ئەنجوومـەنی بـاڵای جوولەکـە پێك دێنن. ووشەی پیران لەپەیمـانی نـویێ بـۆ ئەندامانی سیێ کۆمەڵی جیاواز بەکار هێنراوە:

– لەئینجـیل پـیران ئــەندامانی ئــەنجـوومـەنی بـاڵای جوولەکـەن، (مەتتا 16:21).

– لــەکــرداری نــێرراوان ئــەو باوەڕدارانەن کە ڕابەرایەتی کۆمەڵەی بــاوەڕداران دەکەویێــتە ئەســتۆیان، نامەکانیش ئاڕاستەی ئەوان کراوە، (1تیمۆساوس 5:17).

– لـە بینیـنی یۆحەنـنا، ئـەو 24 پـیرەی لــە دەوری تەخـتی خـودان، نوێنەرایەتی گەلی خودا دەکەن، (بینین 5:8).

پیرۆز:

دوو مانای هەیە:

– هــەموو ئەو شتانەی تایبەتن بە خـودا، بە عەرەبی (القداسّە). بڕوانە (ڕۆما 1:2).

– ژیانــێکــی پــڕ لەخـۆشــیو ئاسـودە، بــە عــەرەبـی (البركّە). بڕوانە (غەلاّتیە 3:14).

پیلاتۆس: (لـۆقـا 3:1)

فەرمانڕەوایەکی ڕۆمی بوو لەسەر یەهودیاو سامیرەو ئەدوم، لەسالاّنی (26–36)ز، بەدڵــڕەقیو تونــدی ناوبــانگی دەرکــردبوو بەتایــبەتی بەرامبەر بەجوولەکەکان.

تۆبەکردن: (مەتتا 3:2)

واتـە گۆڕانـی دڵو بیر سەبارەت بەخراپەکاری، یان وازهێنان لەڕێگای شەیتانو گرتنەبەری ڕێگای خودا.

جەژنی تێپەڕبوون: (لۆقا 22:7)

بەیەکـــێك لەگەورەتـــرین جەژنـــەکانی جـوولەکــــە دادەنــریێ، یـادی ئــەو شـــەوە

دەکــەنــەوە چــۆن فریشــتەی مردن هـــەموو نۆبـــەرەی میســـریەکانی کوشـــــت، بــــەڵام نۆبــــەرەی جوولـەکـەکان ڕزگــاربوون، چونکە بەقســـەی خـــودایـــان کـــردو چوارچــێوەی دەرگــای ماڵەکانــیان بەخـــوێــنی ئـــەو بەرخـانــە ڕەنـگ کـــردبوو کە کردبوویان بەقوربانی. ئـەم جەژنە لەبەهار دێت، لەم جەژنە بـوو عیسـا لـەخــاچـدرا، دوایــی هەســـتایەوەو بەســـەر مـــردن زاڵـبوو، بۆیــە بـاوەڕداران بەمەسیح لەم جەژنەدا ئاهەنگ دەگێڕن.

جەژنی فەتیرە: (مەتتا 26:17)
جەژنـێکی جوولـەکەیـە لـەڕۆژی تێپەڕبوون دەست پێدەکاتو حەوت ڕۆژ دەخایــەنێ. تــیایدا نــابێ نــانی بەهەویرتـرش بخوری، یـادی ڕزگار بوونـی جوولـەکەکانـە لـەکۆیلایــەتی لەمیسر.

چاودێر: (تیتۆس 1:7)
ئـەو کەسانەن کە لەلایەن ڕۆحی پــــیرۆزەوە هەڵدەبژێـــــررێن بـــــۆ چـــــاودێریکردنی کۆمەڵـــــەی باوەڕدارانو یارمەتیدانی باوەڕدارانو گەشە پێکردنیان.

خاچ: (مەتتا 27:32)
دوو دارە لـەســـــەر شـــــێوەی نیشــانەیکۆکردنەوە (+) بەیەکــەوە بەســتراون لای خــوارەوەی درێژتــرە لەلایـەکانی تر لـەسەردەمی ڕۆمەکان دزو پــیاو خـــراپ لـەســـەرەوە بـــۆ خـــوارەوە بەدەســـت کــراوەیی بـــە بـزماری گـەورە پیایدا کوتراوەو بە بەرزیـەوە هەڵواسـراوە تـا هەناسەی لـێبڕاوە. بـەڵام دوای لـەخاچـدانی عیســـا، خـــاچ بـــوو بەنموونــــەی گـیانفـیدایی. ئـەو بەمـردنی لـەسەر خـــاچ بـــوو بــــەقوربانی بــــۆ دەســـتپـــێکردنەوەی ژیـــانو بەدەستهێنانی ژیانی هەتاهەتایی.

خەتەنەکردن: (کردار 7:8)
یـــان ســـونەتکـــردن، کـــاتێ حـەزرەتی ئیـبراهیم تەمـەنی 99ساڵ بـوو، خـودا خـــۆی بۆ دەرخستو پـێیووت، ئەگەر لـەڕێی من لانەدەی پەیمانـت لـەگەڵ دەبەســتم، نـەوەت زۆر دەکــــــەم، زەوی کـــــەنعان (فەلەســتین) بــەخۆتو نەوەکانــت دەدەم. نیشـانەی پەیمانیش ئەوە دەبێ کـە هـەموو کوڕێکـت لـەتەمـەنی 8

ڕۆژی خەتەنەبکەی.

خەرتەلە: (مەتتا 13:31)

بە عەرەبی (خەردەل). تۆوێکی بچووکە بەهاراتی لێدروست دەکرێ. جۆرێکی هەیە لەفەلەستین‌و دەورووپشتی دەڕوێت، نزیکەی دوومەتر بەرزدەبێتەوەو باڵندەیەکی زۆری لەسەر دەنیشێتەوە بۆ خواردنی بەرەکەی.

خوداوەند، (الرب): (فیلیپی 2:11)

بەیۆنانی (کوریۆس)، واتە خاوەن دەسەڵات یان خاوەن توانا. عیسای مەسیحیش بەهەڵسانەوەی لەمردن سەلماندی کە دەسەڵاتی هەیە بەسەر مردن‌و ژیان. باوەڕدارانی یەکەم ئەم ڕاستییەیان زانی بۆیە ڕازیبوون عیسا بکەن بەخوداوەند لەسەر ژیانیان.

داود: (مەتتا 1:1)

داودی پادشا ئەو کەسەیە زەبووری نووسیوەتەوە، لەکوردەواری حەزرەتی داودی پێ دەوترێ. دووەم پادشای ئیسرائیل بوو، لەساڵی 1010پ.ز. هاتە سەر تەختی پادشایەتی. بەمەزنترین پادشای ئیسرائیل دادەنرێ.

دە شارەکە: (مەتتا 4:25)

بەیۆنانی (دیکاپۆلیس). ئەو شارانە بوون کە یۆنانی تیایدا دەژیان بەسەربەخۆیی، دەکەوتنە ڕۆژهەڵاتی دەریای جەلیل، پەیوەندی نەتەوایەتی‌و ئابووری بەیەکیەوەی بەستبوون.

دەریای جەلیل: (مەتتا 4:18)

دەریاچەیەکی گەورەیە ڕووباری ئوردنی پیادا تێپەر دەبێ، کەوتۆتە ناوچەی جەلیل لەباکوری فەلەستین. درێژی نزیکەی 23کم‌و پانیەکەشی 13کم، قوڵیەکەی لەنێوان (20-45)م ئەم دەریاچەیە 204م نزمترە لەئاستی دەریا، ئاوەکەی شیرینە. لەسەر کەنارەکانی شاری گرنگ هەیە وەك: بەیتسەیدا لەڕۆژهەڵات‌و جنیسارت‌و کەفەرناحوم‌و مەجدەل‌و تەبەریە لەڕۆژئاوا. ناوی تریشی هەیە وەك: دەریاچەی جەنیسارت بە ناوی دەشتی جەنیسارتی بەپیت لەسەر کەناری باکوری ڕۆژئاوا. هەروەها دەریاچەی تەبەریە بەناوی شاری تەبەریە.

دونیای مردووان: (بینین 6:8)
بەیۆنانی پێی دەووترێ (هادیس)، ئەو شوێنەیە کە ڕۆحی مردووان چاوەڕێ دەکەن تیایدا.

دینار: (مەتتا 22:19)
ووشەی دینار لەووشەی (دیناریۆسی) لاتینییەوە هاتووە. لەسەردەمی ڕۆمەکانەوە مامەڵەی پێ‌کراوە، لەزیو بووەو قورسایی سێ گرام بووە. لەسەردەمی عیسا دینار وێنەی قەیسەری ئەوسای لەسەربووەو ڕۆژانەی کرێکارێك نزیکەی دینارێك بووە.

ڕاحاب: (یاقوب 2:25،26)
ژنێکی داوێن پیس بوو لەشاری ئەریحا دەژیا. دوای ئەوەی ئەو دوو سیخوڕەی یەشوعی‌کوڕی نوون ناردبوونی بۆ ئەریحا ئاشکرا بوون، ڕاحاب ئەو دوو پیاوەی شاردەوە، چونکە باوەڕی وابوو خودا ئەریحا دەخاتە ژێردەستی جوولەکەکان، بەم جۆرە ڕاحاب ڕزگاری بوو.

ڕاست‌ودروستی:
ئەمە وەرگێڕانی ووشەی (دیکایۆسونێ)ی یۆنانیە، هەندێ جار لەزمانی کوردی بەمانای دادپەروەریش دێت (ڕۆما 1:17، 3:21، 3:25)، هەروەها بەمانای بێ‌تاوان‌کردنیش دێت (ڕۆما 3:22). کەس نییە بەتەواوی ڕاست‌ودروست بێ تەنها خودا نەبێ، چونکە ڕاست‌ودروستی گەورەترە لەوەی مرۆڤ تەنها مرۆڤێکی باش بێ، بەڵکو ئارستەکردنی ژیانە بەتەواوی بەرەو خودا، بۆیە تەنها بەبەرکەتی خودا مرۆڤ ڕاست‌ودروست دەبێت.

ڕۆحی پیرۆز: (یۆحەننا 1:33)
سروشتی خودایە، ئەم ڕۆحە لەعیسای مەسیحدا بوو، ئێستاش لەهەموو باوەڕدارێکە بەمەسیح، باوەڕدار پیرۆز دەکات‌و یارمەتی‌دەدات بۆ ئەوەی بگۆڕێ بۆ شێوەی مەسیح، هەروەها ڕێنمایی دەکات‌و فێری دەکات.

ڕۆژی‌دوایی: (یۆحەننا 6:39،40)
ڕۆژی کۆتایی هێنانی جیهان‌و ڕۆژی لێپرسینەوەیە. هەروەها ڕۆژی دووەم هاتنەوەی عیسایە

بەشـــــــكۆداریەوە، لـــــــەم ڕۆژەدا خراپەكاران سزا دەدرێنو باوەڕداران خەڵات دەكرێن .

ڕۆژی لێپرسینەوە: (ڕۆما 2:16
)

بڕوانە ڕۆژی دوایی.

ڕۆڵەی داود: (مەتتا 21:9)

بەمەسـیح ووتـراوە چـونكە لــە دایكــەوە (لــە مـریەم) ڕەچــەڵەكی دەگەڕێــتەوە بــۆ حـــەزرەتی داود، هەروەها لە یوسفی مێردی مریەمیش.

ڕۆڵەی خودا: (لۆقا 1:35)

بــەمەسـیح دەووتـرێ، ئەمــەش مانـای ئـەوە نیـیە مەسـیح لەئەنجامی پەیوەندیەكی سێكسی لەنێوان خوداو مریەـــم هـــاتووەتــە دونیا، چـونكە ئـــەمــــە گەورەتـرین كفـرە. بەڵكو لـــــەڕۆح ڕۆڵــەی خودایــە، چونكە مەسیح هەموو سروشتی خودای تیادا بـــــوو، وەك: پـــــاكوپـــیرۆزیو دەســـــــــــەڵاتو بــــــــــەزەییو خۆشەویستیو...هتد.

ڕۆڵەی مرۆڤ: (مەتتا 16:13)

بەمەســـیح ووتـــراوە چـــونكە سرووشـتی مرۆڤی تێدا بوو، لەبرسی بـوونو تیـنوو بـوونو ئازار چەشتنو غەم خواردن...هتد.

زەكەریا: (لۆقا 11:51)

یەكـێكە لەپێغەمـبەرەكانی خـودا لەپـەیمانی كـۆن. لەسەدەی شەشەمی (پ.ز) ژیـــاوە، لەكتێـــبی پـــیرۆز نووسـراوێكی هەیـە بـەناوی خـۆی، پێشـبینی هاتـنی مەسـیحی كردووە. هەروەها باوكی یەحیای خەڵك لەئاو هەڵكـیش ناوی زەكەریا بوو. بڕوانە (لۆقا 1:5).

سامریەكان: (یۆحەننا 4:9)

تێكەڵـــــێكن لەجوولەكـــــەو ئاشـــــووری، دوای گەڕانـــــەوەیان لـــەبابل لەســـەدەی هەشـــتەمی پ.ز دەســـتیانگـــرت بەســـەر ناوچـــەی ســـامیرە، باوەڕیـــان تەنـیا بــەو پێـنج پەرتووكەیـە كـە موسـا نووسـیویەتی (تـەورات). پەرسـتگایەكیان لەســەر چیای سامیرە دروست كرد. لەگەڵ جوولەكەكان دوژمنایەتیەكی توندیان هەبوو، چونكە جوولەكەكان ئەوانیان بەكافر دادەنا.

سامیرە: (یۆحەننا 4:4)

بەشـــی ناوەڕاســـتی فەلەســـتینە پایتەخـتەکەی سامیرەیە، ناوی گۆڕا بۆ (مبســـەتە) لەســـەردەمی هیرۆدســـی گەورە.

ساوفیلۆس: (لۆقا 1:1)

نـــاوێکی یۆنانیـــیە بـــەمانای (خۆشەویســـتی خـــودا) ئەمـیش ئـەو پیاوە ڕۆمەیە کە لۆقا هەواڵی مزگێنی پـێیداوە، لـــەوە دەکـــات پـیاوێکی نـاودار بـوو بێـت زۆر کـەس دەڵێن پارێـــزەر بـــووەو لەســـەر پۆڵســـی نـێرراوی عیســـای کـردۆتەوە کـاتێ زیندانی کراوە لەڕۆما.

سەدوم: (لۆقا 10:12)

لەســـەردەمی پێغەمـــبەر لـــووت دانیشـــتوانی شـــاری ســـەدوم هـەموو خـراپەکار بوون، بۆیە بەر ڕقی خودا کـەوتن، تەنها حەزرەتی لووت‌و دوو کچەکەی ڕزگاریان بوو. سەدوم بوو بەنموونـەی ئەو شارانەی خراپەکاریان زۆرە.

سەدوقیەکان: (مەتتا 22:23)

کۆمـــەڵێ جوولەکـەن زۆربـــەی ئـەندامانی کاهینن. سـەرۆك کـاهین لـــەوان بـــوو لەســـەردەمی مەسـیح. باوەڕیـــان بەفریشـــتەو هەڵســـانەوەی مـردووان نـیـە، لایەنگـری ڕۆمەکان بـوون. هـەردەم لـەگـەڵ فەریسیەکان نـــاکۆك بـــوون بـــەلام لەگەڵـــیان ڕێککـەوتن لەسـەر دژایـەتی‌کردن‌و کوشتنی مەسیح.

ســـەرۆك کـــاهین: (عـــبرانیەکان 7:27)

سـەرۆکی هـەموو پیاوە ئاینیەکانە لەپەرســـتگای قـــودس (ئۆرشـــەلیم)، هـــەروەها ســـەرۆکی ئەنجوومـــەن‌و بەرپرسی یەکەمە دەربارەی ژیانی ئاینی جوولەکـەکان. پەیوەندی‌ڕێکخـەری نێوانـیان‌و خودایـە، تەنها ئەو دەیتوانی بچـێتە شـوێنی هـەرە پیرۆز. (حەنان) لەو سەرۆك کاهینانە بوو، بۆ ماوەیەك لەســـەر ئـــەم پایـــە مایـــەوە دوایـــی فەرمانـڕەوایان لایـان برد، قیافا لەجێی ئـەو دانــرا. بـەلام لای جوولـــەکان هەردووکـــیان بەســـەرۆك کـــاهین دادەنران.

سینا: (کردار 7:30)

ناوچـەیەکی بیاباناویـیە دەکەوێتە نێوان میسرو فەلەستین، چیای سیناش کـە موسـا لەسـەری خـودای بیـنی لەدەوەنە گڕدارەکە، دەکەوێتە هەمان

ناوچــه. لـــەوێ خـــودا وەحـــی بـــۆ گەلەکـەی نـارد، هـەروەها بەچیای حۆرەبیش بەناوبانگە.

شاریداود: (ڕۆما 9:33)
شـــاری قودســـە (ئورشـــەلیم)، شـــاری پادشـــای مەزنیشـــی پـــێ دەووترێ.

شەریعەت: (مەتتا 5:17)
ئەو ڕاسپاردانەیە کە خودا لەسەر چیای سینا لەڕێگای موساوە بەگەلی ئیسـرائیلی ڕاگـەیاند، لـەو پێـنج نووسـراوەش کە بەتەورات ناودەبرێ تۆمارکراوە.

شەممە: (مەتتا12:2)
لای جوولەکـــەکان ڕۆژێکـــی پیرۆزە، بەپێی شەریعەت هەموو جۆرە کارێك قەدەغەیە، تەنیا بەخواپەرستیو نوێـژو خوێـندنەوەی کتێـبی پـیرۆزو فێربوونی ئاینی خەریك دەبن.

شەیتان: (بینین 12:9)
ووشـــەیەکی عیـــبرییە بـــەمانای دوژمـن یان شکاتکەر. لەپەیمانی نوێ ئـەم ووشـەیە بـۆ دوژمـنی خـوداو مەسـیحو بـاوەڕدارانو مـرۆڤایەتی بـەکار هێـنراوە. ڕۆحـی هـەموو خراپەکاریـیەکە. کـاتێ عیسا لەسەر خاچـــەکەی مـــرد، بـــاوەڕدارانی ڕزگارکرد لەکۆیلایەتی شەیتان.

شوێنیهەرە پیرۆز:
بڕوانە نامە بۆ عیبرانیەکان 9:3-7.

عیبرانیەکان: ( فیلیپی 3:5)
مەبەسـت لـە جوولـەکەکانە، بۆیە بەزمانەکەشیان دەووترێ عیبری.

عیسا: (مەتتا 1:21)
لـــە (ئیســـوس)ی یوٚنـــانی وەرگـیراوە، بەعیـبری (یەشـوعی) پیٚدەوترێ واتە خودا ڕزگارکەرە.

فەریسیەکان: (مەرقۆس 7:3)
کۆمەڵـێکی ئایـنی جوولـەکـەن، تونـدڕەون لەگرتنی ئەرکە ئاینیەکانو ڕاســـپاردەکانی شـــەریعەت. زۆر لەمـامۆسـتایانی شـەریعەت لەوان بـوون پۆڵـسیش یەکـێك بوو لەوان بەرلـەوەی بـاوەڕ بهێـنێ. باوەڕیـان بەفریشـتەو هەڵـسانەوەی مردووانو بەهـــەمـوو نووسـراوەکانی پـەیمانی کـۆن هـەبوو. زۆر بـەتوندی دژی

مەسیح وەستانو کاریان کرد بۆ کوشتنی.

قوتابی مەسیح: (لۆقا 14:26،27)

ئەو دوانزە پیاوەی عیسا هەڵیبژاردن تا ببنە نێرراو، یان ئەو کۆمەڵەی دوای عیسا دەکەونو باوەڕی پێدەهێنن. بڕوانە (یۆحەننا 8:31 ، 13:35 ، 15:8).

قوربانگە: (لۆقا 1:11)

لەسەر شێوەی مێزێك بوو، قوربانییان لەسەری پێشکەش دەکرد، گۆشەکانی لای سەرەوەی بەپیرۆزترین شوێن دادەنرا. لەقودس دوو قوربانگە هەبوو:

- قوربانگەی بووخورد.
- قوربانگەی قوربانی.

قوربانی: (عیبرانیەکان10:10)

فەرمانی خودا بوو بۆ جوولەکەکان کە قوربانی پێشکەش بکەن بۆ کەفارەتی گوناهەکانیان. بە زۆر جۆر قوربانی پێشکەش دەکرا بەلام لەهەمووی باوتر پێشکەش کردنی ئاژەڵ بوو، بۆ ئەوەی بزانن کە بۆ هەموو گوناهێك پێویستە خوێن بڕژێ. مەسیحیش هات بۆ تەواوکردنی ئەم یاسایە. وەك نووسراوە لە (عیبرانیەکان 9:11-27).

کاهین: (لۆقا 1:5)

لە ووشەی (کوهن)ی عیبری وەرگیراوە، ئەمەش پلەیەکی ئایینی جوولەکەیە، هەڵدەستا بەپێشکەش کردنی ئەو قوربانیانەی بۆ لێخوشبوون لەگوناهەکانی خۆیو هەموو گەل بوون. هارونی برای موسا یەکەم کاهینی جوولەکەکان بوو، لەهۆزی لاویبوو، بۆیە ئەم کارە تایبەتبوو بەلاویەکان.

کەپرەشینە: (یۆحەننا 7:2)

لەپازدەیەمین ڕۆژی مانگی حەوتی ساڵنامەی جوولەکە دێت. هەشت ڕۆژ دەخایەنێ ڕۆژی یەکەمو ڕۆژی هەشتەم ئاهەنگی ئایینی گەورە دەگێڕن. یادی لەناو چادر ژیان دەکەنەوە پاش دەرچوونیان لەمیسر.

کەفارەت: ( ڕۆما 3:25)

واتە داپۆشینی گوناهبار

لەتووڕەیی خودا، چونکە شایانی ئەو تووڕەییەیە، بۆیە لەپەیمانی کۆن بەسەربڕینی بەرخێك یان گایەکی بێ کەموکوڕ کەفارەتیان دەکرد. مەسیحیش بوو بەکەفارەت بۆ هەموو ئەوانەی باوەڕ بەو قوربانیە دەهێنن، بۆیە کاتێ یەحیای کوڕی زەکەریا عیسای مەسیحی بینی لەسەر ڕووباری ئوردن، ووتی: (ئا ئەوەتا بەرخی خودا، ئەو قوربانییەی گوناهی جیهان هەڵدەگرێت.) بڕوانە (یۆحەننا 1:29)، هەروەها (عیبرانیەکان 2:17، 1یۆحەننا 2:2 ، 4:10).

کەفەرناحوم: (مەتتا 4:13)

شارێکە لەسەر دەریاچەی جەلیل.

کەنیشت: (لۆقا 4:16)

لە هەر شارێك (10) خێزانی جولەکە یان زیاتر هەبووایە، شوێنێکیان تەرخان دەکرد بۆ نوێژکردنو فێرکردنی ئاینی.

کتێب: (یۆحەننا 2:22)

مەبەست پەیمانی کۆنە لەکتێبی پیرۆز.

کڕینەوە بەخوێن: (بینین 5:9)

واتە ڕزگارکردنی ژیانی کەسێك بەخۆبەختکردن بۆی.

گوناه: (1یۆحەننا 3:4)

یاخیبوونە دژی خوداو لەناخی مرۆڤدا ڕەگی داکوتاوە، بۆیە پەیوەندی بەمێشك هەیە، دەرئەنجامەکەشی ئەو بیرکردنەوەو ووتەو کارانەیە کە دەبنە مایەی دڵتەنگی خودا، بۆیە خودا تووڕەیی خۆی ئاراستەی گوناه کردووە (مەرقۆس 7:20–23).

لاوی: (کردار 4:36)

ناوێکی پیاوانەی عیبریە. یەکێ لەکوڕەکانی حەزرەتی یاقوب ناوی لاوی بوو، بۆیە یەکێ لەهۆزەکانی ئیسرائیل بەم ناوەیە. بڕوانە ووشەی کاهین.

لەئاوهەڵکێشان: (مەتتا 3:11)

بە عەرەبی (تعمید)، واتە تۆبەکردنو دووبارە لەدایك بوونەوە. کاتێ لەناو ئاوەکە نوقم دەبی لەژیانە کۆنەکەت دەمری،

کـاتیَ هەڵدەسـتیتەوە ژیانـێکی نـویَ دەسـت پیَدەکەیت. لەئاوهەڵکێشان ڕەمـزێکی دەرەکـیە بـۆ گۆڕانـێکی نـاوەکی کـاتیَ بـاوەڕدار لـەڕۆح لەدایك دەبێتەوە.

ماری ناو بیابان: (یۆحەننا 3:14 )

کاتیَ جوولـەکەکان لەبیابانی سینا بـوون نارەزایـیان بەرامـبەر خـودا دەربـڕی، بۆیـە خـودا مـاری نـاردە سـەریان، بەمـە ژمارەیەکی زۆریان لیَ مرد. کاتیَ هەموو تۆبەیان کرد، خودا بەموسـای ووت مـارێك لـە مـس دروست بکەو بەرزی بکەوە، تاوەکو هـەر کەسـێك مـار پـێوەی بـدات تەماشای مارەکە بکاتو چاك بێتەوە، لـەو کاتـە مـار ڕەمـزی خراپە بوو، ئـەوەی سەیری دەکرد گوناهەکەی خـۆی دەبیـنیو چاك دەبووەوە. لەو کاتـەی مەسیحیش بـەسـەر خـاچ هەڵواسـرا بـوو، گونـاهی هـەموو جـیهانی بەسـەر شانەوە بوو، جا هەر کەسـێك سەیری خاچەکەی مەسیح بکـاتو گوناهەکانی خۆی بەسەرەوە ببیـنیو تۆبـە بکـات، خـودا لەگوناهەکانی خۆش دەبێت.

مەسیح: (مەتتا16:16)

لەووشـەی (مەشـییای) عیبریەوە هـاتووە بـەواتای دەستنیشانکراو. تـەنها پادشـاو پێغەمـبەرو کاهین لای جوولـەکـەکان دەستنیشان دەکران ئـەویش بـە چـەورکردنیان. بەپـێی پێشـبینیەکانی پـەیمانی کـۆن، جوولەکەکان چاوەڕێی ئەو کەسەیان دەکـرد کـە دێـت وەکـو ڕزگارکـەرو لـە هـەمان کات کاری پادشـاو پێغەمـبەرو کـاهینـیش دەکـات، بـەڵام کـە هـات بـاوەڕیان پێی نەکرد، چـونکە لایان وابوو لەدەستی ڕۆمەکان ڕزگـاریان دەکـات، نەیانـزانی هـاتووە لـە گوناهەکانیان ڕزگاریان بکات.

مەلکیسادق: (عیبرانیەکان 5:6 )

لەپـەیمانی کـۆن باسـیکراوە، پادشـای شـاری سـالیم بـوو، مانای ناوەکـەی پادشای چاکە، سالیم واتە ئاشـتی. سـەرۆك کاهینی خودا بوو، کاهینێتـیکەی هەمیشـەیی بـوو، سـەرەتاو کۆتـایی بـۆ نەبوو. ئەوەش ڕەمـزە بـۆ مەسـیح، بـۆ زیاتـر

ڕوونکـردنەوە بـڕوانە (عیـبرانیەکان 1:7-8).

مەن: (یۆحەننا 6:31)

ووشــەیـەکـی عیـبریە واتـە (ئەمــە چــییە؟) یــان (بەخشــین). بەشـێوەی شــەونـم لەئاسمانــەوە دەهاتە خوارەوە بۆ جـوولەکـەکان لەبیابانی سینا. خـودا ڕۆژانە دەیدا پێـیانو نـەیان دەتوانـی پاشماوەکـەی هەڵـبگرن بۆ ڕۆژی پـاشتر، چونکە بۆگـەن دەبـوو. بـۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر بڕوانە (یۆحەننا 6:31-35).

مور: (مەتتا 2:11)

ئـاوێکی بـۆن خۆشـە لەگـەڵای جـۆرە گوڵـێك دەردەچـێ. هـەندێ جـار لەگـەڵ مەی تێکەڵاو دەکرا بۆ کـــەم کــــردنەوەی ئـــازار. وەك دیاریـیەکی پێشـکەش کـراو بەپادشا، پێشـکەش کـرا بەعیسای مەسیح پاش لــەدایك بوونی، هەروەها پاش مردنی لەشـی پێچـەورکرا وەك نەریتـێکی جوولەکە لەمردوو ناشتن.

ناوچەی جەلیل: (مەتتا 2:22)

لــەو سەردەمەدا زەوی فەلەستین کـرابوو بـە سـێ ناوچـە، لەسەرەوە جەلــیل، لەناوەڕاســت ســامیرە، لەخوارەوە یەهودیا.

نوێژ: (1تیمۆساوس 2:1)

گفــتوگۆی نـێوان بــاوەڕدارو خودایـە. کاتێ باوەڕدار نوێژ دەکات سـوپاسو ستایشـی خـودا دەکـات، داواکاریـەکانی دەخاتـە بـەر دەستی خـودا، خـوداش گوێی لێدەگرێت. لەهەمان کاتدا ووتەکانی کتێبی پیرۆز کـە ووتـەی خودایە بەیارمەتی ڕۆحی پیرۆز دەکەوێتەوە بیری بەم شێوەیەش گـوێ لەخودا دەگرێ. زۆر جاریش لــەکاتی نوێژکـردن خـودا خواسـتی خۆی بۆ باوەڕدار ئاشکرا دەکات.

نێرراو: (ڕۆما 1:1)

نازناوێکـە بۆ ئەو کەسەی مەسیح دەینـێرێ مزگێـنی بـدات بەخەڵکی، لەپـەیمانی نوێـدا ئەم نازناوە بەدوانزە قوتابــیەکەی عیســا بەخشــراوە، دواتریش بەپۆڵس.

ئێسـتا هـەندێ جـار بەو کەسانە دەوتـرێ کــە لەلایــەن کۆمەڵــەی باوەڕدارانـەوە بەیارمەتی ڕوحی پیرۆز دیــاری دەکــرێنو دەنــێردرێن بــۆ بلاوکردنەوەی مزگێنی عیسا.

بڕوانە (کردار 1:13-3).

هارۆن: (لۆقا 1:5)

بـــراگەورەی مووســـا بـــوو، بەفـەرمانی خودا بوو بەیەکەم سەرۆك کاهین، بەباوکی کاهینان دادەنریٚ.

هەلیلویا: (بینین 1:19)

ووشـەیەکی عیبریە واتە (ستایشی خـودا بکـەن). ئـەم ووشـەیە بـۆ سـتایش‌کـردن‌و شـکۆدارکردنی خوداوەنـد بەکاردیٚـت، لەپـەیمانی کۆنـدا لەسـەرەتا یـان لـەکۆتایی زەبوورەکـان‌و گۆرانییەکان دادەنراو لەجەژن‌و بۆنە ئاینیەکان دەووترایەوە. ئیٚسـتاش ئـەم ووشـەیە لـەکۆڕو کۆبوونەوەکانی باوەڕداران بۆ هەمان مەبەست بەکاردەهیٚنریٚ.

هۆسانا: (مەرقۆس 9:11)

ئـەم ووشـەیە لـە(هوشـیعنای) عیـبرییەوە هـاتووە، بـەمانای (ڕزگارکـەر). بـەکار هـاتووە بـۆ دەربڕیـنی خۆشـی‌و پیٚشوازی‌کردن، وەکـو ئـەو کاتـەی خەڵکەکـە ئـەم ووشـەیان بـۆ خۆشـحاڵی دەربڕین‌و بەخیٚرهاتن کـردنی عیسا بۆ شاری قودس بەکار هیٚنا.

هیرۆدس: (مەتتا 2:3)

لـە ئینجـیل سـیٚ کـەس بەم ناوە ناوبراون:

– هیرۆدسی گەورە، لەسەردەمی ئـەو عیسـا لـەدایك بوو، بە ڕەگەز ئـادۆمی‌بوو لەلایـەن ڕۆمەکانـەوە کـرابوو بەپادشا لەسەر فەلەستین. بە دڵـڕەقی‌و فیٚڵـبازی ناوبـانگی دەرکردبوو. هەوڵیدا بەمنداڵی عیسا بکـوژیٚ بۆیـە فـەرمانی‌دا هـەموو مـنداڵەکانی بەیـت‌لـەحم ئەوانـەی تەمەنـیان دوو سـاڵو بچـووکتر بوو، بکوژن. بڕوانە (مەتتا 1:2-22).

– هـیرۆدس ئەنتیـباس، کـوڕی هیرۆدسـی گەورە بوو لە ملتاقە. پاش مـردنی بـاوکی بـوو بـە حوکمـڕانی ناوچـەی جەلـیل. بەشـدار بـوو لـەو حوکمی مردنەی کە بەسەر عیسا درا. بڕوانە (لۆقا 7:23).

– هـیرۆدس ئەغریـبای یەکـەم، کـوڕەزای هیرۆدسـی گەورە بوو، لە سـاڵی (37ز.) بـوو بەحوکمـڕانی باکووری فەلەستین، پاشان لەساڵانی (41-44ز.) بـوو بەپادشـای هـەموو فەلەسـتین. یـاقوبی بـرای یۆحەنـنای

بەشمشێر کوشت.

بڕوانە (کردار 12:1-24).

ووشەکە: (یۆحەننا 1:1)

مەبەست لەووشەی خودایە کە لەسەرەتاوە لەگەڵ خودا بووە، هەموو شتێکیش بەم ووشەیە دروست بووە. ئەم ووشەیەش لەعیسای مەسیح بەرجەستە بوو.

یارمەتیدەر: (یوحەننا 14:16)

واتە ڕۆحی پیرۆز. بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر بڕوانە ڕۆحی پیرۆز.

یەشوع: (کردار 7:45)

مەبەست لە یەشوعی کوڕی نوونە کە خزمەتکاری مووسا بوو، پاش مردنی مووسا ئەو ڕابەرایەتی گەلی ئیسرائیلی کرد بەرەو فەلەستین. لە پەیمانی کۆن نووسراوێك هەیە بە ناویەوە.

یەهودیا: (مەتتا 2:1)

ناوی بەشێکە لەبەشەکانی فەلەستین لەو سەردەمە، کەوتۆتە خوارووی ڕۆژهەڵاتی شاری یافاوە.

یونس: (مەتتا 12:39)

یان نەبی یونس، خودا فەرمانی پێدا بەرەو نەینەوا بڕوات، بەلاّم یونس

ویستی سەرپێچی خودا بکات بۆیە بەرێی دەریا بەرەو تەرشیش کە دەکەوتە ئیسپانیاوە چوو، لەرێ کەشتییەکەیان تووشی ڕەشەبا دێت، پاش ئەوەی کەشتیوانەکان دەزانن خودا بەهۆی یونسەوە ڕەشەبای ناردۆتە سەریان، یونس فڕێ دەدەنە ناو دەریاوە، بەفەرمانی خودا ماسییەکی گەورە یونس قووت دەدات بۆ ماوەی سێ شەو و سێ ڕۆژ، پاشان یونس تۆبە دەکات خوداش دەیگەڕێنێتەوە سەر ووشکانی. لەپەیمانی کۆن نووسراوێك هەیە بەناوی یونس.

خودا یەکە، دروستکەری هەموو شتێکە لەگەردوونو مرۆڤی دروستکرد بۆ ئەوەی بەخۆشییەوە هاوبەشی لەگەڵ خودا بکاتو کڕنۆشی بۆ ببات.
(ئەی خوداوەندمانو خودامان، تۆ شایانی ئەوەی شکۆمەندیو ڕێزو توانا وەرگری، چونکە تۆ دروستکەری هەموو شتێکیت، ئەو شتانەش بەخواستی تۆ بوونی هەیەو دروست بووە.)

بینین 4:11

هەروەها بڕوانە: مرقۆس 12:29 ، ڕۆما 3:30 ، 1تیمۆساوس 2:5 ، عیبرانیەکان 11:3

*بۆچی پەیوەندی نێوان خوداو مرۆڤ پچڕاوە؟ بۆچی خراپە بەم ڕادەیە دەستی گرتووە بەسەر جیهان؟*

مرۆڤ گوناهبارە، واتە لەخودای دروستکەری یاخیبووە، کەس نییە یاخی نەبووبێ.
({هیچ مرۆڤێك ڕاستودروست نییە، تەنانەت یەکێکیش! هەروەها یەکێك نییە تێبگاتو یەکێك نییە بەدوای خودا بگەڕێ. هەموو خۆیان لەخودا دوورخستەوە، جا لەبەرئەوە هەموو بێسوود بوون، کەس کاری چاك ناکات، نەخێر تەنانەت یەکێکیش نا.})

ڕۆما 3:10-12

هەروەها بڕوانە: مرقۆس 7:18-23 ، یۆحەنا 3:19-20، 8:34، 16:8،9 ، ڕۆما 1:18-31

*کاردانەوەی خودا چییە سەبارەت بەگوناهی مرۆڤ؟ ئایا زۆرداری تاسەر دەمێنێ؟*

خودا دادپەوەرە، بەدادپەروەرییەکی تەواوەوە لەڕۆژی لێپرسینەوە حوکمی خۆی دەدات، بەم شێوەیە هەموو گوناهبارێکیش شایانی لەناوچوونی هەتاهەتاییە.

(هەروەك چۆن دواڕۆژی مرۆڤ ئەوەیە جارێك بمریّ، دوایی ڕۆژی لێپرسینەوە دێت.)

عیبرانیەکان 9:27

(سزای ئەوانە لەناوچوونی هەتاهەتاییە، دەرکردنیانە لەبەر ڕووی خوداوەندو بیّبەش بوونە لەشکۆو توانای ئەو.)

2تسالۆنیکی 1:9

هەروەها بڕوانە:مەتتا 25:31-46 ، لۆقا 3:9 ، یۆحەننا 5:22 ، کردار 17:30-31 ، 2پەترۆس 3:9-13.

*ئایا کەس هەیە منی خۆش بویّ؟ بۆچی پەیامی ئینجیل، هەواڵێکی خۆشە؟*

خودا خۆشەویستییە، بۆیە حەزرەتی عیسای نارد، کە ووشە هەتاهەتاییەکەیەتی، هەتا لەجیاتی مرۆڤ بمریّو مرۆڤ لەگوناهەکانیو لەو سزایەی شایانیەتی بەبەرەکەتی خۆی بەخۆڕایی ڕزگار بکات.

(خۆشەویستی لەمە دایە، نەك لەبەرئەوەی خودامان خۆشویستووە، بەڵکو ئەو خۆشیویستووینو ڕۆڵەکەی خۆی نارد تا ببێتە کەفارەتی گوناهەکانمان.)

1یۆحەننا 4:10

(چونکە مەسیح لەپێناوی گوناە جارێك بۆ هەمووان مرد، واتە بێتاوان بۆ تاوانباران مرد، تا لەخودامان نزیكبکاتەوە، مردوو بەلەشو زیندوو بەرۆح.)

1پترۆس 3:18

هەروەها بڕوانە: مەرقۆس 8:31، 9:31 ، 10:31-34، 45 ، لۆقا 19:10 ، کردار 13:38-39 ، یۆحەننا 3:16-18، 17:23 ، ڕۆما 3:21-26 ، 5:8، 2 کۆرنسۆس 5:14-15 ، غەلاتیە 2:20، 6:14 ، کۆلۆسی 1:19-20 ، 1پەترۆس 2:22-24 ، 1یۆحەننا 2:1-2.

*دوای ئەوەی مەسیح بەرگەی ئابڕووچوونی خاچی گرت. ئایا مەسەلەکە کۆتایی هات؟*

*ئایا زیندووبوونەوە هەیە پاش مردن؟*

**خـودا زیـندووە، حـەزرەتی عیسای لـەنێو مردووان هەستاندەوە، هەتا مرۆڤ بـزانێ حـەزرەتی عیسـا خوداوەنـدەو لـەڕۆژی دواییشـدا ئـەو لـەمـرۆڤ دەپرسێتەوە، هەروەها تا ژیانێکی نوێ بەباوەڕدار ببەخشێ.**

**(ئـەو عیسـایەی خودا لـەنێو مردووان زیندووی‌کردەوە، ئێمە هەموو بۆ ئەوە شایەتین... کەواتە باهەموو ڕۆڵەکانی ئیسرائیل بەتەواوی بزانن، ئەو عیسایەی ئێوە لـەخاچتاندا، خودا کردی بەمەسیحو بەخوداوەند.)**

کردار 2:32، 36

**(بۆیە خودا بەرزی‌کردەوەو ناوێکی دایە کە لـەسەرووی هەموو ناوێکە، تاکو بـۆ نـاوی ئـەو هـەمووان چۆك دابدەن، لەئاسمانو سەر زەوی‌و ژێر زەویش، هـەروەها تـا هـەموو زمانـێك دانبنێـت کـە عیسای مەسیح خوداوەندە، بۆ شکۆمەندی خودای باوك.)**

فیلیپی 2:9-11

هەروەها بڕوانە: لۆقا 24:1-49 ، یۆحەننا 20:1-31 ، کردار 2:24، 3:15 ، 13:30-37، 17:31 ، ڕۆمـا 4:25، 6:4، 8:9-11، 10:9-10 ، 1کۆرنسۆس 6:14، 15:3-20

*ئەو ڕێگایانەی لـەپێش مرۆڤن چییە؟ ئایا هیچ ڕزگارییەك هەیە بۆ من؟*

دوو ڕێگا لـە بەردەم مرۆڤە:

1- **ڕێگای مردنی هەتاهەتایی ئەنجامی یاخی بوونە لـەخودا.**

2- **ڕێگـای ژیـانی هەتاهـەتایش ئـەنجامی گەڕانەوەیـە بـۆ خوداو داننان بـەوەی حـەزرەتی عیسـا خوداوەنـدەو پشـت‌بەستن بە مردنەکەی بۆ لێخۆش‌بوونی گوناه.**

(ئەوەی باوەڕ بەڕۆڵەکە بهێنێ، ژیانی هەتاهەتایی هەیە. ئەوەش کە گوێڕایەڵی ڕۆڵەکە نابێ ژیان نابینێت، بەڵکو تووڕەیی خودای بەسەردا دەچەسپێ.)
یۆحەننا 3:36
(ئەوەی گوێ لەووشەکەم بگرێو باوەڕبهێنێ بەوەی ناردوومی ژیانی هەتاهەتایی دەبێ، لەڕۆژی دوایدا حوکم نادرێ بەسەری، چونکە ئەو لە مردنەوە پەڕیوەتەوە بۆ ژیان.)

یۆحەننا 5:24
(تۆبەبکەن، با هەر یەکەتان بەناوی عیسای مەسیحەوە لەئاوهەڵبکێشرێ بۆ لێخۆشبوونی گوناەو بەخشینی ڕۆحی پیرۆزتان دەسکەوێ.)
کردار 2:38
هەروەها بڕوانە: مەتتا 4:17، 3:7-13، لۆقا 24:47، کردار 17:30، 20:21

*چۆن مرۆڤ دەچێتە سەر ڕێگای ژیانی هەتاهەتایی؟ چۆن ڕزگار دەبم؟*

لەدایکبوونەوە، ئەمە تەنها ڕێگای خودایە بۆ گواستنەوەی مرۆڤ لەمردنی هەتاهەتاییەوە بۆ ژیانی هەتاهەتایی.
(کەس ناتوانێت پادشاهێتی خودا ببینێت گەر لەئاسمانەوە لەدایك نەبێت...
کەس ناتوانێ بچێتە ناو پادشاهێتی خودا گەر لەئاو و لەڕۆح لەدایکنەبێتەوە.)

یۆحەننا 3:3،5
(کە ڕزگاری کردین، ئەمە بەهۆی کاری ڕاستودروستی خۆمان نەبوو، بەڵکو بەپێی بەزەیی خۆی، بە شوشتنی لەدایکبوونەوەی دووەمو تازەبوونەوەی ڕۆحی پیرۆز.)

تیتۆس 3:5
(گەر یەکێك سەر بە مەسیح بێ، ئەوا دەبێتە بوونەوەرێکی تازە.)
2کۆرنسۆس 5:17

هەروەها بڕوانە: یۆحەننا 12:1-13 ، 5:21 ، ڕۆما 2:12،6:4 ، ئەفەسۆس 1:2-5 ، یـاقوب 1:18 ، 1پەتـرۆس 1:3،23 ، 2پەتـرۆس 1:4 ، 1یۆحەنـنا 3:9، 4:7، 5:1،4

*چۆن باوەڕداری تازە لەدایکبوو لەڕوح گەشە دەکات؟*

## چۆن باوەڕدار بەگوێرەی ئینجیل گەشە دەکات

(گەشە بکەن لەبەرەکەتو ناسینی خوداوەندو ڕزگارکەرمان عیسای مەسیح.)
2پەترۆس 3:18
بەسـوپاس کـردنی خـودا بۆ بەزەییەکەی (ڕۆما 2،12:1) کە بەهۆی عیسای مەسیحەوە بێتاوانی کردین بەخۆڕایی بەبەرەکەتی خۆی، باوەڕدار گەشەدەکات:

بـەهۆی ووشـەی خودا گوێمان لەدەنگی خودا دەبێتو پەیوەندیمان لەگەڵ خودا بەهێزتر دەبێ بەیارمەتی ڕۆحی پیرۆز، هەروەها ووشەی خودا بەسوودو کاریگەرە بۆ گەشەکردنی باوەڕدار لەڕۆح.
(هـەموو کتێـبی پیرۆز بەوەحی لەخودا هاتووەو سوودبەخشە بۆ فێرکردنو سەرزەنشتو ڕاستەڕێکردن، هەروەها بۆ تەمێکردن بۆ ڕاستودروستی.)
2تیمۆساوس3:16
بـڕوانە: یۆحەنـنا 15:7، 17:17 ، کـۆلـۆسـی 3:16 ، عیـبرانیەکان 4:12 ، یـاقـوب1:21-25 ، 1پـەتـرۆس 2:2

بـەهۆی نوێژ لـەگەڵ خودا دەدوێن سەبارەت بەهەموو شتێك هەروەکو چۆن منداڵ لەگەڵ بـاوکی دەدوێ، هـەروەها هـێز بەدەسـتدەهێـنین بـۆ گەشـەکردن لـەژیانی ڕۆحیو بۆ بەهێزبوونی پەیوەندیمان لەگەڵ خودا بەیارمەتی ڕۆحی پیرۆز.
(هەموو کاتێك لەنوێژکردن بن بەڕۆح، بۆ هەموو نوێژکردنو پاڕانەوەیەك شەوارە بگرنو هەر بەردەوامبن لەسەر پاڕانەوەکەتان لەخودا لەپێناوی خوشكو برا پیرۆزەکان.)
ئەفەسۆس 6:18

بڕوانە: لۆقا 1:11-12 ، ڕۆما 12:12 ، 1تسالۆنیکی 5:17 ، یاقوب 5:13-16 ، یەهوزا20.

بەهۆی ژیانی هاوبەش باوەڕداران کۆدەبنەوە، بەشداری یەکتری دەکەن لەفێرکردنو نوێژکردن لەپێناوی یەکتری، هەروەها لەلایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیان.
(واز لەکۆبوونەوەکانتان مەهێنن، هەروەك هەندێکتان لەسەری ڕاهاتوون، بەڵکو یەکتری هانبدەن بۆ ئامادەبوون، لەمەش زیاتر چونکە دەبینن ڕۆژی خوداوەند نزیكبووەتەوە.)
عیبرانیەکان 10:25
بڕوانە: کردار 2:42-47، 4:32-34 ، 1کۆرنسۆس 12:12-27 ، فیلیپی 1:2-4 ، عیبرانیەکان 3:13.

بەهۆی خزمەتکردن خۆشەویستی بۆ خوداو بۆ خەڵك بەهۆی کردار دەردەکەوێ، ئەمەش بەهۆی بەشداریکردنی خەڵك لەمزگێنیو فێرکردنیان سەبارەت بەڕێگای ژیانو یارمەتیدانیان لەپێویستیەکانیان بەرجەستە دەبێ.
(با لەکاری چاکە نەکەوین، چونکە گەر وورە بەرنەدەین لەکاتی خۆی دروێنەی زۆر دەکەین. جا تا دەرفەتمان هەیە، با چاکە لەگەڵ هەموو کەسێك بکەین، بەتایبەتی لەگەڵ خوشكو برایانی باوەڕدار.)
غەلاتیە 6:9-10
بڕوانە: مەتتا 28:19-20 ، یۆحەنا 13:14-17 ، ڕۆما 12:1-21 ، 1کۆرنسۆس 15:58 ، 16:1.